# ئایینەکانی جیهان

خوێنـەری خۆشەویسـت لـە وەرگێڕانـی ئـەم کتێبـەدا تـەنها سـودم لـە دەقـە عەرەبیەکە وەرگرتوە، ئەوەی لەم کتێبەدا نوسراوە تەنها بیروباوەڕی ئەو جۆرە ئایینانـە دەخاتـە ڕوو کـە بەدرێـژایی مێـژووی مرۆڤایـەتی پـەیڕەوی کـراون. . مەبەستی من لێرەدا تەنها خستنەڕووی کامڵی و بێ کەموکوڕی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە بە بەراورد بە ئایینەکانی تر، هیوادارم بەهەڵە لە مەبەستم تێنەگەن لـە نوسـینەوەی دەقـی ئـەو ئایینانـەی هـاوڕانین لەگـەڵ ئـایینی پـیرۆزی ئیسـلامدا، چـونکە پێدەچـێت بەشـێك لـە بیروبـاوەڕی پـەیڕەوکراو لـەو ئایینانـەدا لەگـەڵ بیروباوەڕی ئایینی ئیسلامدا نەگونجێن. . .

سوپاس بۆ تێگەیشتنتان.

وەرگێڕی کوردی

نوسینی: د. هوستن سمیث

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: سعد رستم

وەرگێڕانی بۆ کوردی: کارزان حسێن

**ژیانی ئایین بەگشتی لە گرنگترین ئەرکە مرۆییەکانە**

**ولیەم جەیمس** William James

**گەوهەری پەروەردە پێویستە ئایینی بێت**

**ئەلفرید نۆرس وایتهید** Alfred North Whitehead

**پێویستمان بە بوێری هەیە لەگەڕانەوەدا بۆ یاسای دانایی مرۆیی**

**ئی. ئێف. شوماخەر** E. F. Shumacher

**لە ساڵی**1970 **دا لەبارەی دنیای دوای یاسا ئایینیەکان دا نوسیومە تەنها یاسا ئایینیە زیندوەکان دەتوانن لە بنەڕەتدا جیهانێکی نمونەییمان بۆ فەراهەم بهێنن**

**ڕۆبەرت ئێن. بێلا** Robert N. Bellah

**پێشەکی نوسەر لەسەر چاپی یەکەمی کتێبەکە**

چیرۆکی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ زنجیرە وانەیەك لەبارەی ئایینەکانی مرۆڤەوە، لە بەهاری ساڵی 1955 دا لە کەناڵی تەلەفزیۆنی پەروەردەیی لە شاری سانت لویس وتمەوە، دەنگدانەوەیەکی باشی بەخۆوە بینی، بۆیە هەستم بەوەکرد ئەمریکیەکان ئارەزوویەکی ڕاستەقینەیان هەیە بۆ ناسینی ئایینە دنیایە گەورەکان کە گەلانی دنیای هەژاندوە، تائەمڕۆ لە ورووژاندنی گەلاندا بەردەوامە. زیاتر لە هەزار و دوسەد ژن و پیاو ناویان تۆمارکرابوو لەو کۆبونەوە ڕۆشنبیریەدا وەك خوێندکاری هەمیشەی بەڵام ژمارەی زۆری بینەر و بیسەری ئەم وانانە سەد هەزاریان تێپەڕاند. بەڵام شتێکی تر کە ئەم ئامادەبوونە جەماوەریە بۆی دەرخستم، پێویستە کتێبێك لە جۆرێکی نوێدا هەبێت لەبارەی ئایینەکانی جیهانەوە، بۆئەوەی نەوەستێن لەبەردەم ڕونکردنەوەی بیروباوەڕە ئایینیەکانەوە بۆ دەرخستنی ئەو واتایەی هەمووو ئایینەکان دەیبەخشێت. هەمووو ئەو نامانەی کە بە دەستم گەیشتبوون لە شوێنە جیاوازەکانی جیهانەوە بوون لەبارەی دەرخستنی زنجیرە وانەکان لە کەناڵە تەلەفزیۆنیەکانەوە کە پەخشکرابوو، لە نزیکەی 20 شاری ترە وە داوایان لێدەکردم کۆپیەك لەو وانانە و کتێبێك کە لەسەر هەمان پرۆگرام بڕوات بگەیەنمە دەستیان بەڵام وانەکان لەچوارچێوەی دەقێکی نوسراودا نەبوو و نەدەخرایە دوتوێی نوسراوێکەوە، هەروەها کتێبێك نەبوو لەسەر ئەو وانانە، ئەو کتێبانەی لەو بارەیەوە نوسراون ژمارەیان زۆرە بەڵام نازانم کام لەو کتێبانە ئامانجن بۆ گەیاندنی پەیامە مرۆڤایەتیەکە، لەو بارەیەوە پسپۆڕێك نیە بۆ خستنەڕوی گەوهەر و ڕۆحی ئایینە زیندوەکان بۆ خەڵك، تیایدا بتوانێت هەست بەوەبکات بۆچی و چۆن ئەم ئایینانە ڕێبەرایەتی شوێنکەوتوانی دەکات و پابەند بن پێوەی و لەگەڵی بژین و چۆن دەیانورووژێنێت و چۆن ژیانیان دەبوژێنێتەوە. . ئەمە بەتەواوی ئەو شتەیە کە هەوڵمداوە بینوسمەوە. لەم بوارەدا یارمەتیەکی زۆر بەنرخم وەرگرتوە لە هەندێك لە سەرۆکەکانی **سوامی ساتبراکاشانندا** و سەرۆکی ڕۆحی کۆمەڵەی **فیدانتا** لە **سانتالویس** تەنها لەبارەی هیندۆسیەتەوە هاوکارم نەبوو بەڵکو بەتەواوی توانایەوە یارمەتیدەرم بوو لە نوسینی ئەو بەشەی بەم ناونیشانەوەیە.

نوسینەکانی **ئارسەر والەی Arthur Waley** یارمەتیدەرم بوون لە زیادبوونی ئەو هەست و سۆزەی هەمبوو بەرامبەر بە چین، لەماوەی ئەو حەڤدە ساڵەدا لەو شوێنە مامەوە کەتیایدا لەدایك بووبووم. دکتۆر **هینری پلاتۆڤ Henry Platov** چەند هەڵەیەکی ڕەشنوسی تاویەت و بودیزم بۆ ڕاستکردمەوە. جگەلەوەش لە ڕەشنوسەکەمدا لەبارەی **بودیزمی زنەوە**. پرۆفیسۆر **جۆزیف کیتاگاو** Joseph Kitagaı لە زانکۆی شیکاگۆ، هەستا بەکاری هەڵەچنی لە هەردو بەشی کۆنفۆشیەت و ئیسلامدا، هەروەها بۆ بەشی ئیسلام سودم وەرگرت لە بۆچونەکانی پروفیسۆر فؤاد الاهواني کە وانەبێژە لە زانکۆی قاهیرە، هەروەها سودم وەرگرت لە وتەکانی ڕۆبەرت جاکۆب Robert Jacob و قەشە بێرنارد Bernard و دکتۆر ئالین میلەر Allen Miller لە سانت لویس لەو بەشانەی پەیوەندیان هەبوو بە یەهودیەت و مەسیحیەتەوە بەڵام لە تەواوی کتێبەکەدا پشتم بەست بە لویس هانLewis Hahn . هوستن سمیث Huston smithسانت لویس: ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٥٧

## خاڵی دەستپێکردن

ئەم دێڕانە دەنوسمەوە لەکاتێکدا مەسیحیەکان لە سەرتاسەری جیهاندا ئاهەنگ دەگێڕن. لەبابەتی مەسیحیەتدا وتاری ئەو قەشەیەی ئەمڕۆ تیایدا ئامادەبووم باسمکردوە وەك دیاردەیەکی جیهانی. لە خانوە قوڕینەکانی

ئەفەریقاوە هەتا خانوە سەهۆلینەکانی ئەسکیمۆ لە لابرادور هەموویان دەچەمینەوە بۆ سوپاسگوزاری یەزدان.
. ئەمە وێنەیەکی زۆر کاریگەر بوو لەسەرم. لەکاتێکدا بەنیوەی مێشکم گوێمدەگرت و بە نیوەکەی ترم مەلەم دەکرد لەگەڵ قوتابیانی یەزداندا. . بیرم لە جولەکە ڕاستڕەوەکان دەکردەوە، بۆ ماوەی شەش مانگی تەواو لە پەرستگاکەیان لە قودس مامەوە، پیاوەکان ئەو جبانەیان لەبەرکردبوو کەلە باوباپیرانیانەوە بۆیان مابوویەوە، کاتێك باوباپیرانیان لەسەر پشتی حوشترەکانیان بوون بەبیانباندا تێپەڕ دەبوون جارێك بۆ پێشەوە و جارێك بۆدواوە دەجووڵانەوە لەکاتی سەرقاڵبوونیان بە خوێنەوەی تەوراتەوە، جوولەکەکانی ئێستا هاوشێوەی ئەوان بۆ پێشەوە و دواوە دەجووڵێنەوە بەیانیان و ئێواران لەکاتێکدا کە تەورات دەخوێننەوە بێئەوەی هەست بکەن ئەم ڕەفتارەیان لە باوباپیرانیانەوە بۆ ماوتەوە، لەو کاتەوەی سواربوونی حوشتریان لێ قەدەغەکرا وەك دڵدانەوەیەك بۆ خۆیان ئەم شێوازی جووڵکردنەیان داهێنا. بیرم لەیەلسین دەکردەوە کە ئەندازیارێکی بیناسازی موسوڵمانبوو لە مزگەوتی شین لە ئەستەنبول بەیەکەوە بووین ڕێنیشاندەرم بوو، تازە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی تەواو کردبوو، هەروەها لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار کرنوشی بۆ یەزدان بە ئاراستەی مەکە دەبرد. سوامی راماکریشنا لە ماڵە بچوکەکەیدا لەسەر کەناری ڕوباری گانج لەهیمالایا ئەمڕۆ قسەناکات، ئەو بەردەوام دەبوو لە پەرستنی بێدەنگی، ماوەی پێنج ساڵ دەستی بە بێدەنگی دەکرد تەنها سێ ڕۆژ نەبێت. لە هەمان کاتدا یۆنۆ بەرەوڕوی وەفدەکانی ئەنجومەنی وەزیران دەبوویەوە لەکاتی کۆبوونەوەدا، ئەمەش قەدەری هەموو سەرۆك وەزیرانێکە، یۆنۆ پێش ئەوەی ڕۆژ دەست پێبکات بە هەموو کێشەکانیەوە لەکاتژمێر چوار بۆ شەشی بەیانیان لە خەڵوەتدابوو لە پەرستگایەکی بوزیدا لەماڵەکەی خۆیدا لە ڕانغۆن [1]دائی جۆ و لائی سان قەشەی مەزهەبی بوزیەتی زن بوون لە کاتژمێر سێی ئەو ڕۆژەدا هەڵدەسان بۆئەوەی زۆربەی کاتی ئەو ڕۆژە بەسەربەرن بە دانیشتنی چوارچەنچکی بەبێ جوڵە هەتا کاتژمێر یانزەی شەو، داواکاری سروشتی بوزای شاردراوە لە چەقی بوونیاندا هەیە لە ڕێگەی ڕۆچوون لەبیرکردنەوە و سەرنجداندا. چەندە هاوەڵیەکی سەیرە! قوتابیانی یەزدان لە هەموولایەکەوە بەشێوەیەك ناکریت وێنابکرێت دەنگیان بۆ یەزدانێکی تاك و تەنها و بۆ هەموو ئادەمیزادەکان بەرز دەکردەوە. ئیترچۆن دەردەکەوێت؟ وەکو نەخۆشخانەیەك ؟! یان بەشێوەیەکی نهێنی لە گونجانێکی تەواودا دەردەکەوێت؟ ئایا هیچ یەکێکیان ئاوازێکی بێوێنەیان هەیە؟ یان لەچەند بەشێکدا وەڵامدانەوەیەکی دەنگی زیادکراو هەیە. . هەموو ئەوەی لەتواناماندایە ئەنجامی بدەین، هەوڵدانە تا بەئاگاییەکی تەواوەوە گوێ بۆ هەموو دەنگێك بگرین، بە جیاکراوەیی کاتێك لە قودس نزیك دەبیتەوە. هەر ئەمەشە ئامانجی ئەم کتێبە. پێدەچێت مایەی سەرسام بوون بێت کاتێك سەیری قەبارەی ئەم کتێبە دەکەیت قەبارەکەی هێندە گەورە نیە لەکاتێکدا باس لە سەرجەم ئەو ئاییانە دەکات کە لە سەرتاسەری جیهان بە تەواوی ناوچەکانیەوە پەیڕەو کراون لە هەزار ساڵ پێش ئێستاوە، هێشتا کاریگەری ئەو جۆرە ئایینانە ماوە لەسەر ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە خەڵك ئەگەر بەراورد بکرێت بە کاتی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە ئایینانە لە ڕابردوودا.

ئایا دەکرێت هەمو ئایینەکانی جیهان کۆبکەینەوە لە چوارچێوەی ئەم کتێبەدا؟ بەڵێ دەکرێت. لەبەرئەوەی هەڵدەستین بەچارەسەرکردنی ئەم ئایینانە لەنێو چەند ئامانجێکی تایبەتی دیاریکراودا. لەبەرئەوە پێویستە ئەم ئامانجانە بەباشی بناسرێنەوە و گرنگیان پێبدرێت ئەگەرنا ئەو وێنەیەی لاپەڕەکانی تری ئەم کتێبە دەیدەنەوە وێنەیەکی ناتەواودەبێت. پێش ئەوەی ڕونیکەینەوە ئەم کتێبە چیە، یان بەلایەنی کەمەوە هەوڵ

---

[1] ڕانغۆن پایتەختی میانمارە (بۆرماله ڕابردودا، بەندەرێکە دەکەوێتە سەر کەنداوییمرتیان.

دەدات چی بڵێت؟ باڵەسەرەتاداباس لەو شتانە بکەین کە ئامانجی نوسەری ئەم کتێبە نیە هەتا خوێنەر بەهەڵە شیکردنەوەی بۆ نەکات هەوڵ دەدەین بەپێی توانا ئەو شتانە بخەینەڕوو:

١. ئەم کتێبە لە مێژووی ئاینەکاندا کتێبێکی ئەکادیمی نیە. ئەمەش کەمی ناو و مێژو و ڕەوتە کۆمەڵایەتیە ئۆپۆزسیۆنەکان شیدەکاتەوە کە لەدوای دەرکەوتنی هەمووو ئاینێکدا دروستبووە. چەندین کتێبی زۆر چاك هەن بەشێوەیەکی تایبەت گرنگی بەم بابەتە دەدەن(١). چەند کتێبێك هەن بەهایان ناخەمڵێندرێت. دەکرا ئەو بابەتانە لەم کتێبەدا باسبکرێن بەڵام ئەوکات قەبارەی کتێبەکە زۆرگەورە دەبوو بەڵام ئامانجی ئەم کتێبە ئەوە نیە، سەرباری ئەو پەیامەی دەیەوێت بیگەیەنێت. لەبەرئەوە ڕووداوە مێژوییەکان کورتکراونەتەوە بۆ نزمترین ئاست، کە پێویستمان باکگراوندێکی شوێنی و کاتی هەیە، کە بیرۆکە وروژێنراوەکانمان پێبدات. ئەوەی لە پشت ئەم بیرۆکانەوە وەستاوە ڕزگاری نەبووە لە سڕینەوەی ڕوداوە مێژوییەکان، تەنها ئەو ڕوداوانە ڕزگاریان بووە لە سڕینەوە کە جیاوازی بەرجەستەکراوی یەکێك لە ئاینەکان دەخاتەڕوو. ئەم کتێبە نوسراوەتەوە بە پشتبەستن بەو زانیاریانەی کە زانایان و توێژەرەوەکانی بواری مێژوو پەردەیان لەسەر لاداوە، لەبارەی مێژوی ئایینەکانەوە، پێکهاتنی ئەم کتێبە بەشێوەیەك بونیادنراوە کە ڕێگەی بە باگراوندە مێژوویەکە داوە، هەتا ئەو واتایە بشارێتەوە کە ئەم ئایینانە هەڵگری بوون و هێشتا دەیبەخشن بۆ ژیانی مرۆڤەکان.

هەمووو هەوڵێك دراوە بۆ پاراستنی ئەم پڕۆسەیە لە بنەڕەتدا، ئەم پڕۆسەیە پێویستە بۆ هێزی بنیاتنان.

٢. ئەم کتێبە لە بواری واتادا هەوڵنادات تێڕوانینێکی تەواو بەدەستەوە بدات لەبارەی ئایینەکانەوە وەك بابەتێکی توێژینەوەکە، چونکە بۆ ئەم کارە پێویستە کتێبێکی گەورەتر بنوسرێتەوە، تەنانەت ئەو کەسانەی لەیەك جۆر شارستانیەتدا پەروەردەکراون کۆك نین لە بیروڕاکانیاندا، کاتێك ئایین دەبێتە زامنکەری چارەسەری کێشەکان بەگشت لەو کاتەدا پێویستە کارئاسانی بکرێت لە جێبەجێکردنی ڕیوڕەسمە ئایینیەکاندا نەك کارگرانی.

با هەریەك لە ئێمە بەتەنها سەیری مەسیحیەت بکەین. مەسیحیە ئۆتۆدۆکسە ڕۆژهەڵاتیەکان مەراسیمەکانی پەرستن ئەنجامدەدەن لە کڵێسا ناوەندیەکاندا، لەکاتێکدا گروپی لەرزێنەرەکان[2]، تەنانەت سەیرکدنی بورجی کلێساکان بە بێ ڕێزی دەزانن. قەشە تۆماس وادادەنێت هیچ جۆرە بیروباوەڕێکی ئایینی نیە ڕازی بێت بە بەریەککەوتن لەگەڵ ئەقڵدا، لەکاتێکدا تیرتولیان tertullian بەدەنگی بەرز هاوار دەکات، باوەڕم وایە بیروباوەڕ شتێك نیە ئەقڵ پێی ڕازی ببێت! چەند سۆفیەکی مەسیحی هەن[3]، هەندێکیان تەسەوف ڕەتدەکەنەوە و بە شتێکی داهێنراوی دادەنێن. ئالبێرتۆس ماگنۆس دەڵێت ئەنجامدانی کارە قورسەکان بە دڵسۆزیەوە بەڵگەیە لەسەر پاراستنی بیروباوەڕە ئایینیەکان، بەڵام قەشە فرانسیس St. Francis واتای ئایینی دەبینێت لە دروستکراوەکانی وەکو باڵندە و گوڵەکاندا! کۆمەڵە مەسیحیەکی توندڕەو هەن لە کۆمەڵە سۆفیگەریەکان(وەکو گروپی لاڤ پیرۆز holy roller[4] و چەند مەسیحیەکی هاوچەرخی یەکتاپەرست هەنUnitarians، [5]ئیتر چۆن بتوانین لەیەك بەشدا لەسەر هەمووو مەسیحیەکان هەمووو ئەمانە کۆبکەینەوە؟

---

[2] لەرزێنەرەکان: :Quakers گروپێکی مەسیحین خۆیان دەلەرزێنن لەکاتی نوێژکردندا، جەختدەکەنەوە لەسەر سادەیی لە جلوبەرگدا و ڕقیان لە مەراسیمە دەرەکیەکانە. بەرگری لە جەنگ دەکەن.

[3] سۆفیە مەسیحیەکان :christian mystics چەند گرۆپێکی مەسیحین جەخت دەکەنەوە لەسەر تێفیکرین و سەرنجدان و وەرزشی ڕۆحی وەك ڕێگایەك بۆ گەیشتن بە نهێنیە نادیارەکان

[4] لاڤی پیرۆزHoly Roller : یەکێکە لە گروپەکانی جەژنی مەسیحی، بەوە ناونراون لەبەر لەخواترسی لەڕادەبەدەریان لە میانەی هەستان بە مەراسیمە ئایینیەکاندا.

[5] یەکتاپەرستەکانUnitarians: گروپێکی مەسیحین سەربەخۆن بەخواچواندنی مەسیح ڕەتدەکەنەوە لەگەڵ نەسرانیەت و بیروباوەڕی خۆ فیداکردن و کەسانی لیبرالین لە مامەڵەکردنیاندا، ژمارەیان کەمە، بەشێوەیەکی سەرەکی لە بەریتانیا و نەتەوە یەکگرتوەکان هەن.

وەڵامی ئەم پرسیارە بریتیەلەوەی ئەم کارە ئەستەمە، هەبژاردن کارێکە خۆدزینەوە لێی نیە. ئەو کێشەیەی ڕوبەڕوی نوسەر دەبیتەوە ئەوە نیە ئایا چەند تێڕوانینێك هەڵبژێرێت لەنێو تێڕوانینە جیاوازەکاندا یان نا؟، کێشەکە بریتیە لەوەی: چەند و کام لە تێڕوانینەکان بخاتەڕو؟ لەم کتێبەدا وەڵامی پرسیاری یەکەم دراوەتەوە بە کورتی. لەکاتێکدا ناچاربووم هەڵبژێرم لەنێوان چەند تێڕوانینێکدا، هەوڵمداوە یەکسانبم، بۆیە ژمارەیەکی کەم لە تێڕوانینەکانم خستۆتەڕو لەبری لێشاوێکی زۆر لە تێڕوانینی ئاڵۆز بەشێوەیەکی دورودرێژ. لەهەندێك حاڵەتدا بۆ نمونە ئیسلام ئەو واتایەم کورتکردوەتەوە بەبێ گوێدانە جیاوازیەکان نێوان سوننە و شیعە یان لەنێوان موسوڵمانە پەیوەستەکانئوسولیەکان و موسوڵمانە دانەمەزراوەکانهاوچەرخەکان. لەچەند حاڵەتێکی تری وەکو جیاوازیە گەورە و بچوکەکانی ناو بوزییەتدا تەنها دوو یان سیانم باسکردووە لەنێو گرنگترین جیاوازیەکانی یەك ئاییندا. بەم شێوەیە ژمارەی تێڕوانینە جیاوازەکان سێ دانەی تێنەپەڕاندوە بۆ خۆپاراستن لە سەرقاڵ بوون بە لقەکانەوە.

کێشەکە بەم شێوەیە دەخەینەڕوو: ئەگەر ویستت مەسیحیەت باسبکەیت بۆ کەسێکی تایلەندی ڕۆشنبیر بەڵام سەرقاڵ ئەوا چەند باسی جیاوازی بۆ دەگێڕیتەوە؟ جیاوازیەکانی نێوان ڕۆمە کاسۆلیکەکان و یۆنانیە ئۆرتۆدۆکسیەکان و پرۆتستانتەکان تێناپەڕێنیت. بێگومان هەوڵنادەیت بەیەك دانیشتن ئەو جیاوازیانەی بۆ بخەیتەڕوو کە پرۆتستانتەکان جیادەکاتەوە لە مەشیخیەکان[6] و معمدانیەکان[7] و مێسۆدیەکان[8] و ئەسقەفیەکان[9].

پرسیاری دووەم: پێویستە کام لەو تێڕوانینانە بخەمەڕوو، ئەو بنەمایەی لەبەرچاوم گرت لەم بوارەدا بریتی بوو لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی خوێنەرە پەیوەندیدارەکان. ئەم بەرژەوەندیە لەبەرچاوگیراوە و بە سێ دەربڕین خراوەتەڕوو:

دەربڕینی یەکەم:

ژمارەییە. ژمارەیەك لە ئایین هەن پێویستە لەسەر هەموو هاوڵاتیەکی جیهانی ڕۆشنبیر بیانناسێتەوە لەبەر هیچ نا تەنها لەبەرئەوە نەبێت ملیۆنەها لە ئادەمیزاد لەگەڵیدا دەژین.

دەربڕینی دووەم:

پەیوەندی تێڕوانینەکان بە ئەقڵی نوێوە، چونکە ئەم کتێبە هەوڵدەدات ئەوپەڕی سود و چاکە بگەیەنێت بە خوێنەر، سەرەڕای سود و تێگەیشتن لە جیهان، یارمەتی خوێنەر دەدات لە ڕێکخستنەوەی ژیانی تایبەتی خۆیدا. لەبەرئەوە بەپلەی یەکەم گرنگی دراوە بە دەربڕینە هاوچەرخەکانی ئەم ئایینانە.

دەربڕینی سێیەم:

جیهانیە. هەموو ئایینێك پێکدێت لە چەند بنەمایەکی جیهانی و چەند سونەتێکی خۆجێی. لەکاتێکدا بنەما جیهانیەکان گفتوگۆ لەگەڵ مرۆڤدا دەکات، بەبێ گوێدانە شوێن و کاتەکەی بەڵام سونەتە خۆجێیەکان پێکهاتەیەکی دەوڵەمەندن بە ئەفسانە و مەڕاسیمە ئایینیەکان، بۆیە هەرگیز ناتوانرێت ڕێگاکەی بدۆزێتەوە بۆ

---

[6] مەشیخیەکان: Presbyterians کڵێسایەکی پرۆتستانتی خاوەن بیروباوەڕی تایبەتە چەند کەسێکی بەتەمەن تیایاندا هەڵبژێردراون بۆ بەڕێوەبردنی کاری کڵێساکە هەموویان لەیەك ئاستدان.

[7] معمدانیەکان: Baptists مەزهەبێکی پرۆتستانتی چەپڕەوە شوێنکەوتوانی دەڵێن پێویستە مەعمودیەت جێبەجێ نەکرێت تەنها کاتێك نەبێت مرۆڤێك لە واتاکەی تێبگات، هەروەك داوای ئازادکردنی کۆیلەکان دەکات لەگەڵ سەربەخۆیی لە بیروباوەڕدا.

[8] میسۆدیەکانMethodist بزوتنەوەی ئایینی پرۆتستانتی چاکسازیە لە ئۆکسفۆرد لەساڵی ١٧٢٩دا چارلز و جۆن ویزلی بەڕێوەیان برد هەوڵیاندا تیایدا کڵێسای ئینگلتەرا زیندوبکەنەوە، بەتوندی جەخت دەکالتەوە لەسەر گرنگی ئاکاری تاك و کۆمەڵ بۆ دەربازبوون لە داهاتودا.

[9] ئەسقەفیەکان :Episcopalians کڵێسایەکی ئەسقەفی ئەنکلیکانیە وابیردەکاتەوە دەسەڵاتی ئایینی گەمارۆنەدراوە بە تاك بەڵکو ئەسقەفەکان دابەشی دەکەن.

ژیانی سۆزداری دەرەکی، هەروەك بگات بە تێگەیشتنەکەی تەنها بە یارمەتی شاعیرێك یان زانایەکی شارەزا نەبێت لە مێژوی مرۆڤدا.
یەکێك لە گرنگترین بیرۆکە ئەقڵیەکان بریتیە لە بیرکردنەوە لەوەی بنەما جیهانیەکانی ئایین گرنگترنین لەو رێوڕەسمانەی کە ئەو بنەمایانە گەشەیان سەندوە تیایاندا. ئەمە وەك ئەو وتەیە وایە کە دەڵێت: درەخت گرنگترە لە خۆر و ئەو خاکەی تیایدا گەشەی سەندوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بنەما جیهانیەکانی ئەم کتێبە گرنگترن لە بنەما خۆجێییەکانی. هۆکاری ئەمە تەنها بریتیە لەوەی نوسەر مەشقیکردوە لەسەر سەرقاڵ بوون بە بنەماکانەوە. چەند کتێبێکم خوێندۆتەوە کە هەمان ژینگەی گواستووەتەوە و ژینگە ڕۆحیە تەواوەکەی زیندوکردوەتەوە کە پەیوەندیەکی تایبەتی هەیە بەو بوونەوەرانەی کە تێیدا هەن، وەك کتێبی nectar in a Sieve گوڵاوی یەزدانی لە پەردەدا لەبارەی هیندەوە، کتێبی my country and my people (نیشتیمانەکەم و میللەتەکەم) لەبارەی چینەوە، کتێبی The old Country (نیشتیمانە کۆنەکەم) لەبارەی جوولەکەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتیەوە. زۆر کات خوازیار بووم کتێبێك بنوسرێت لەبارەی ئایینەکانی ئادەمیزادەوە، تیایدا ژینگە تایبەتەکان بخاتەڕوو کە ئایینەکان تیایدا گەشەیانسەندوە. ئەمە کتێبێکە نایینوسمەوە بەڵکو دەیخوێنمەوە بۆتان. من سنوری زانیاریەکانم دەزانم و پابەندم بەو تێڕوانینانەوە کە تیایدا ڕەگەزی ئایدیۆلۆژی بەربڵاوە یان بەلایەنی کەمەوە دەشێت بە ئاسانی ئەو ڕەگەزانەی تیا دەربهێنرێت.
٣. ئەم کتێبە نیگایەکی هاوسەنگ نادات بەدەستەوە بۆ بابەتە خوازراوەکەی. ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکی گرنگە. من بێشبینی ئەو خورپەیە دەکەم کە توشی خوێنەر دەبێت ئەگەر بەشی هیندۆسیەت بەتەواوی بخوێنێتەوە، یەکسەر بەرەو هیند بڕوات بەو شێوەیەی نهرۆ باسی دەکات: ئایینێکە دەتپەرستێت، لەدوای ئەوە ڕۆیشت و پەرستگای کالی بینی لە شاری کەلکوتا، لەوێدا نەفرەتی سیستمی چینایەتی بینی، دوو ملیۆن مانگای بینی پارێزراون تا ڕادەی ڕشانەوە، هەژارە هیندۆسیەکانی بینی جەستەیان دەکەنە قوربانی. یان چی ڕودەدات ئەگەر خۆی بینیەوە لە شەقامە سەرەکیەکانی بالیدا لەیەکێك لە سینەماکاندا، ناونراوە هۆلیودی خوداوەندی فشنو! لە کاتێکدا ئەم یەزدانە دووەمینە لە سێکوچکەی هیندۆسیەتدا، بە هاوکاریکرنی کتێبفرۆشەکان بۆ بازرگانیەکی چالاك و ئاسان لەو کۆمیدیە کلاسیکیانەدا کەتیایدا خوداوەندەکانی هیندۆسیەت هەڵدەستن بە کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە ئەهریمەنە ناشیرینەکان لەڕێگەی تیشکە گەردونیەوە.
من هەست بەوجیاوازیە گەورەیە دەکەم، هەروەها زۆر بەڕوونی هەست بەو جیاوازیەی دەکەم لەنێوان ئەوەی نوسیومە لە بارەی تاوییەت و ئەو تاوییەتەی کە کارگەری لەسەرم هەبوو لە ماوەی ساڵەکانی گەنجێتیمدا لە چین، کە بەتەواوی لە سیحر و ئەفسانە و جادوودا نوغرۆببووبوو. ئەم جیاوازیە وەکو جیاوازی نێوان مەسیحیەکی لەسەرخۆ و سەرۆکی دادگایەکانی پشکنین بوو، نێوان پەندی شاخ و جەنگە خاچپەرستەکان، لەنێوان ئارامی و بێدەنگی بەیت لەحم و ژاوەژاوی کۆمەڵگا بازرگانیەکان لە شەوی سەری ساڵدا کە قەرەباڵغیەکی زۆری بەخۆوە دەبینی لەبەر کڕینی پێداویستی جەژنی کریستمس!
چیرۆکی تەواوی ئایین هەمووی گوڵ و گوڵزار نیە، هەمووی ئیلهامبەخش نیە، بەڵکو زۆربەی کات بێڕێزی تێدایە، چاکە و ژێری دوو شتی دەگمەنن تیایدا. لەسەر ئەم تێڕوانینە فیداکاری و قوربانیدان دەگرێتەوە، هەروەك چەوساندنەوە و ڕەگەزپەرستی دەگرێتەوە، لەسەر جەنگی مەسیحیە خاچ پەرستەکان و جەنگە پیرۆزەکانی ئیسلام. پێویستە ئەو تاوانە هەڵبەستراوانە بگرێتەوە کە لە ئایین دەرچوون کە ئەمەش بەربڵاو بوو لە هەرێمی ماساتشوسیت Massachusetts و دادگایی کردنی جۆن تۆما و وتنەوەی بیردۆزی داروین، لەسەر

دادگاییکردنەکانی مەیمون لە هەرێمی تینیسی Tennesse ، لەسەر دادگایی کردنی مارپەرستەکان لە شاری ئۆزارک[١٠] Ozarks. . . ئەمە لیستێکە کۆتایی نایەت.
کەواتە بۆچی ئەم شتانە باسنەکراون لە لاپەڕەکانە ئەم کتێبەدا؟ وەڵامی ئەمە ئاسانە بەڕادەیەك لەوانەیە گێلانە دەربکەوێت، لەبەرئەوەی ئەمە کتێبی بەهاکانە. با نمونەیەك بهێنینەوە:
بێگومان مێژوی بەرهەمهێنانی مۆزیکی ئادەمیزاد، مێژوویەکی دوور ودرێژی هەیە، تێیدا مۆزیکی خراپی لەخۆگرتوە، لەبەرامبەردا مۆزیکی باشیشی لەخۆگرتوە، بەڵام هیچ کەسێك داوای خولێکی وانەوتنەوە ناکات بۆ هەڵسەنگاندنی موزیك تا ڕوبەرێکی یەکسان بە هەردوو جۆرەکە بدات لەبارەی بە هەدەردانی کاتەوە پێشبینی ئەوە ناکەین لێمان ببورن. هەمان هەڵوێستم وەرگرت لەکاتی باسکردنی ئاییندا. لەم دواییانەدا کتێبێك نوسرا لەبارەی زانستی یاساوە، نوسەر دانی بەوەداناوە ئەم کتێبەی لە خۆشویستنی یاساوە نوسیوە. ئەگەر شتێکی وەك یاسا، توانیبێتی تا ئەو ڕادەیە کاریگەری هەبێت لەسەر نوسەر، ئەوا سەیر نابێت ئەگەر ئایین کاریگەری هەبێت لەسەر دڵی نوسەرێکی تر. ئەگەر لەلای هەندێك هەوڵێك هەبێت بۆ چاودێریکردنی لیستی ئایینەکان تا هاوسەنگیەك هەبێت لەنێو لایەنە چاك و خراپەکانی ئاییندا، بۆئەوەی بەشێوەیەکی گشتی دیاریبکات ئایین چاکەی زیاترە لە خراپەکەی یان بە پێچەوانەوە؟ لەبەرئەوە هاوشێوەی ئەم چاودێریکردنە لەلام گرنگ نەبووە.
٤. ئەم کتێبە بۆ بەراوردکاری نیە لەنێوان ئایینەکاندا، ئەگەر بە باش زانینی شتێك بە بەراورد بە شتەکانی تر ناشیرین بێت، کە مرۆڤ کە شانازی بەو شتانەوە دەکات، ئەوا بەباش زانینی ئایینێك بە بەراورد بە ئایینەکانی تر ناشیرین ترە. لەم کتێبەدا هەوڵ نەدراوە ئاینێك بەباشتر بزانرێت و ئەوی دی خراپ. لەڕاستیدا بەراوردکاری لەنێوان ئایینەکاندا گرنگی بەم ئامانجە دەدات و زۆربەی کات دەگۆڕێت بۆ ڕکابەری لەنێوان ئایینەکاندا. گەشەسەندنی زانست و زانیاری ڕکابەری لەنێوان ئایینەکاندا زیاد دەکات لە ساتی دەرکەوتنی ڕێبازێکی نوێ لە ئایینێکی دیاریکراودا، پێوەرەکان دەگۆڕێت بۆ هەڵسەنگاندن و جیاکردنەوەیان لەیەکتر واتە ئەم پێوەرانە بە شێوازێکی نەگۆڕ نامێننەوە بەڵکو گۆڕانکاریان بەسەردا دێت. ئارنۆڵد توینبیArnold Toynbee دەڵێت: (لەئەمڕۆدا کەسێك نیە لەسەر ڕوی زەوی کە زانستی پێویستی پێ بیت بۆ ئەوەی بە متمانەوە بڵێت تاکە ئایینێك هەیە مەزنترە لە هەموو ئایینەکانی تر). وتەیەکی لەو جۆرە لە هەرکەسێکەوە بێت دادەنرێت بە بەڕێزترین کەس لەسەر هەڵبژاردنی ئەو ئایینە، ئەگەر هەبێت ئەوا کێشێکی گەورەی پێدەدات. لەلاپەڕەکانی داهاتوی ئەم کتێبەدا هەستاوم بە چارەسەرکردنی مێژووی هەمووو ئایینەکان وەك مێژوویەکی پیرۆز، بەڵام بۆ پێدانی پلە بۆ ئایینەکان لەگەڵ تونبیدا هەستمان بەوەکرد ئێمە خاوەنی هێزی تێگەیشتنی یەزدانی نین هەتا ڕێگە بە خۆمان بدەین بەو کارە هەستین. هەوڵمداوە باشترین لایەنەکانی هەریەك لە ئایینەکان بخەمەڕوو، کاری بەراوردکاریم بۆ خوێنەر جێهێشتوە بە پشت بەستن بەو زانیاریانەی بۆم ڕوونکردونەتەوە. تائێرە ئەو شتانەمان باسکرد کە ئامانجی نوسەر نەبووە کە بە خوێنەری بگەیەنێت، ئێستا کاتی ئەوە هاتوە ڕونیبکەینەوە ئەم کتێبە چیە: ١-ئەمە کتێبێکە هەوڵدەدات بۆ لەباوەشگرتنی جیهان. ئەگەر ئەم وتەیەمان بە تەواوی ماناکەیەوە وەرگرت ئەوا بەدڵنیاییەوە ئارەزویەکە بەدیهێنانی ئەستەمە، چونکە مرۆڤ بونەوەرێکی سنورداره، دەستەکانی تا دووریەکی دیاریکراو دەتوانن درێژببنەوە، پێویستە پێیەکانی بچەقن بە زەویەکدا، واتە زەویەك هەبێت هەتا لەسەری بوەستێت بۆ بەجێهێنانی ئەم کارە. با بە شتێکی ڕوون دەست پێبکەین، ئەم کتێبە بە زمانی ئینگلیزی نوسراوە، ئەمەش هەر لە سەرەتاوە تاڕادەیەك کۆت و بەندی دەکات. دواتر ئەو گەواهیانە دێن بۆ گەیاندنی

---

[١٠] ozark: شارێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی ئەلابامای ئەمەریکی

بیرۆکەکان بە خوێنەر. چەند نمونەیەکی میللی دروست هەن لە گەلی چینەوە، لەگەڵ چەند ئەفسانەیەك لە هیندەوە، چەند پەندێك لەوجۆرەی ڕوکارەکەی ناوەڕۆکەکەی پوچەڵ دەکاتەوە لە ژاپۆنەوە، بەڵام زۆربەی گەواهیەکانی ئەم کتێبە لە ڕۆژهەڵاتەوەن، وەك دێڕێکی شکسپیر، یان ئایەتێك لە کتێبی پیرۆز، یان پێشنیازی زانایەکی دەروونناسی ڕۆژئاوایی، هەروەها دەستەواژە زمانەوانیەکانی ئەم کتێبە ڕۆژئاواییین. جگەلە دەستەواژە زمانەوانیەکان، لە بەنەڕەتدا پشتگیریەك نەبوو بۆ بە ڕۆژئاوایی کردنی کتێبەکە لەکاتێکدا ئاڕاستەکراوە بۆ ئەقڵیەتی خوێنەری ڕۆژئاوایی هاوچەرخ. لە ڕاستیدا ئەمە دەرئەنجامی ئەوەیە نوسەر خاوەنی ئەقڵیەتێکی ڕۆژئاواییە، لەبەرئەوە نەدەکرا کتێبێك بنوسێتەوە کە ڕوپۆش نەکرابێت بەو شێوازە لە بیرکردنەوە. ئەمە ئەگەر کارێك بێت پێویست بێت سەیری بکرێت بەوەی کۆتکردنی ئەم کتێبەیە و پێویستە خوێنەر بزانێت ئەگەر قەشەیەکی زنی بوزی یان سۆفیەکی موسوڵمان یان جوولەکەیەکی پۆڵەندی ئەم کتێبەی بنوسیایە ئەوا جیاواز دەبوو. کەواتە ئەم کتێبە نیشتیمانێکی هەیە، بەڵام نیشتیمانەکە دەرگاکەی بە ئازادی کراوەیە بۆ ناوەوە و بۆ دەرەوە، ئەمە یاسایەکە مرۆڤ لێیەوە دەستپێدەکات بۆ گەشتکردن بۆ پێشەوە دواتر دەگەڕێتەوە، لە ڕاستیدا بۆئەوە نیە ئەم گەشتە دوبارە دەستبکاتەوە بە توێژینەوە و خەیاڵ لە کاتێکدا ناتوانێت بەو کارە هەستێت. دەکرێت ئادەمیزاد خولیای نیشتیمانی هەبێت بۆ جیهان، تەنانەت ئەو شوێنانەی تائێستا نەیبینیون و پێشبینی ئەوە دەکات هەرگیز نەیانبینێت، ئەم کتێبە زادەی ئەوجۆرە خولیا نیشتیمانییە. ئێمە لە سەردەمێکی خەیاڵی ناوازەدا دەژین. لەگەڵ ئەو دۆزینەوە زانستیانەدا دەژین کە جێگەی باوەڕپێکردن نین، لەگەڵ ناوبڕێکی تەسکی وەك تاڵە مویەك لەنێوان تیاچون و بەدیهێنانی هەموو ئارەزوەکاندا کە ئەو دۆزینەوە زانستیانە پەلکێشیان کردوین بەرەو ڕوویان، تەنها سەبارەت بە بارێکی نوێ دەدوێم لەنێوان خەڵکدا. هەموو وڵاتەکانی جیهان بوونەتە هاوسێمان، چین هێندە نزیك بۆتەوە هەروەك لە بەری ئەوبەری شەقامەکە بێت، میسر لە بەردەگاکەمانە. ڕادیۆ و جموجوڵی ئاسمانی دوریەکانی کورتکردوەتەوە بەجۆرێك تاکە بەربەست لەنێوان مرۆڤ و هەر وڵاتێکی تردا تەنها بڕی ئەو پارەیە کە پێویستە بۆ گەشتکردن بۆی[11]. تەنانەت لەکاتێکدا بلیتی فڕۆکە بەردەست نەبێت ئەوا لێشاوێکی ناکۆتا هەیە لە کتێب و بەڵگەنامەی ئەو کەسانەی لەو شوێنانەوە هاتون. لە هەمووو لایەکەوە دەبیستین کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ئێستا بەیەکگەیشتون. لەڕاستیدا ئەم وتەیە زۆر کەمترە لەو ڕاستیەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە بەخێراییەکی زۆر ـ

بەرەو ڕووی یەکتر دێن، لە ڕوانگەی مێژوییەوە لەوانەیە ئەمە لە گرنگترین ڕاستیەکانی سەدەی بیستەم بێت. لەکاتێکدا مێژونوسەکان لە داهاتووەوە سەیری ئەم سەردەمەمان دەکەن، زۆربەی کات یادی دەکەنەوە لەبەرئەوە نیە سەردەمی دۆزینەوەی چەکی ئەتۆمی و سەردەمی بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم بێت.[12] بەڵکو لەبەرئەوەی سەردەمێکە نەتەوەکان وایان لێهات بەپێی پێویست هەست بەوە بکەن بیربکەنەوە و گرنگی بەوانی تر بدەن. ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەو ڕۆڵەدا داوامان لێدەکات لە چوارچێویەکی دیاریکراودا جیهان بچووك نەکەینەوە. لەپێش دوهەزار و پێنجسەد ساڵ پێش ئێستادا پیاوێکی نمونەیی بەناوی سوقرات لەکاتێکدا لەسەر پێخەفی مەرگ بوو وتی: من نە ئەسینایم و نە یۆنانیم. من هاوڵاتیەکی جیهانیم. ئەمڕۆ پێویستە لەسەر هەموومان هەوڵبدەین بۆئەوەی بەدواداچون بکەین بۆ واتای ئەم دەستەواژەیە. ئێستا گەیشتوین بە ئاستێك تیایدا ئەو کەسەی تەنها ژاپۆنیە یان ئەمەریکی یان ڕۆژهەڵاتیە یان ڕۆژئاواییە، مرۆڤێکی تەواو نیە بەڵکو نیوەیە، ئەوەی

---

[11] نوسەر ئەمەی نوسیوە لەساڵی ١٩٥٧ز. دا واتە لەپێش بڵاوبوونەوەی مانگە دەستکردەکان و ئەو شۆڕشەی دروستیکرد لە جیهاندا و پەخشی تەلەفزیۆنی ئاسمانی کە بەردەستخراوە بۆ هەموو مرۆڤێك لە بینینی سەدان کەناڵی جیاواز لە ناوچە جیاوازەکانی جیهانەوە! لە پێش سەردەمی ئینتەرنێت و شۆڕشی زانیاریەکاندا

[12] نوسەر ئەم وتانەی نوسیوەتەوە لە ساڵی ١٩٥٧ز. دا لەکاتێکدا کۆمۆنیزم بڵاوبوبویەوە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا

ماوەتـەوە لەسـەر نیـوەی دووەمـی مرۆڤایەتیەکـەی، کـە دڵـی بـە ترپـەی هـەمووو مرۆڤایـەتی لێدەدات. ئەگـەر ویستمان دەربڕینەکـەی نیچە بـەکاربهێنین، ئـەوا هـەموووومان بانگهێشـتکراوین بـۆ ئـەوەی ببینـە سـەماکەری گـەردونی. هەریەکـەمان تێڕوانینـی تایبـەت بـەخۆی هەیـە بـەڵام لـەدوای ئـەوە نـاتوانین خۆمـان ڕابهێـنین لەسـەر لـەبیرکردنی ئـەوانی تـر. سـەماکەری گـەردونی یـان هاوڵاتیـەکی جیهـانی کـە ببێتـە نەوەیـەکی ڕەسـەن بـۆ شارستانیەتی دایك و باوکی، بـەڵام خاوەنی پەیوەندیـەکی توندوتۆڵـە بـە هەموانـەوە، چونکە ناسنامەکەی بەگشتی لە هەر شوێنێکی جیهاندا هەرچەندە خۆشەویست بێت. ئەگـەر شانازی کـرد بـە شارستانیەتەکەیەوە یـان نەتەوەکەیـەوە، هـەروەك لەوانەیـە بەباشـی بـەو کـارە هەسـتێت، ئـەوا ئـەوەی دەیـەوێت شـانازیکردنێکی پۆزەتیڤانەیە زادەی سوپاسگوزاریە بۆ ئەو بەهایانەی بەدەستیهێناوە نەك بۆ شانازیکردنێکی بەرگریکارانـە کـە پشتدەبەستێت بە لەدەستدانی مافەکانی ئەوانی تر لە ڕێگەی بەراوردکاریـەوە، وەك ئامڕازێك بـۆ بەدەسـتهێنانی پەسـەندبوون بەسـەر ئـەوانی تـردا. لـەم دواییانـەدا لەڕێگـەی هێلیکۆبتـەرێکی سـەربازیەوە چـووم بـۆ بنکـەی سـەرۆکایەتی هێـزە ئاسمانیـەکان و کۆلێـژی ئـەرکان لـە بنکـەی ماکسـوێڵ maxwell بـۆ هێـزە ئاسمانیـەکان لەدەرەوەی شاری مۆنتیگۆمری Montgomery لـە ویلایـەتی ئـەلاباما Alabama بۆئەوەی وانـە بڵێمـەوە بەهـەزاران فەرمانـدە کـە هەڵبـژێردرابوون، لـەبارەی ئاییـنی نەتـەوەکانی جیهانـەوە. لەژیانمـدا خوێنـدکاری لـەو جۆرەم نەدیبوو کە بەپەرۆش بن بۆ فێربوون. پاڵنەرەکەیان چی بوو؟ بەدڵنیاییەوە وەك تاکەکانی یەکەیـەکی سەربازی گرنگیان دەدا بەو بابەتە چونکە پێشبینیان دەکرد ناچاربن مامەڵەبکەن لەگەڵ هەندێك لەو نەتەوانەدا، چ وەکو هاوپـەیمانێك بێـت یـان وەکـو دوژمـن یـان وەکـو چـەند نەتەوەیـەك کـە داگیریـان بکـەن. بێگومـان لـە هاوشێوەی ئەو هەلومەرجانەدا ئەمە کارێکی یەکلاکەرەوە دەبێت بۆیان هەتا پێشبینی چۆنیەتی هەڵسوکەوتیان بکەن، هەتا وڵاتەکەیان داگیربکەن ئەگەر شەڕ و خراپە لەناویاندا گەیشتە لوتکە، دواتر ڕێکیان بخەنەوە لەماوەی بونیادنانـەوەدا. مـن دڵنیـا بـووم لـەوەی زۆربـەی ئـەو فەرماندانـە پاڵنـەری زیاتریـان هـەبوو جگەلـە پاڵنـەرە سەربازیەکە بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئێمە هیواخوازین پاڵنەری باشتر و جوانتر هـەبێت بـۆ ناسینەوەی نەتـەوەکانی تر جگەلە پاڵنەری ئاسایشی نەتەوایەتی. هەر ئەمە بوو سەرۆك ئایزنهاوەر ئاماژەی پـێ کـرد کاتێك وتیلەگـەڵ هەموو دۆڕاوێکدا لـە هـەر جەنگێکدا لـە هـەمو کاتێك زیـاتر پێویسـتە تێگەیشـتن هـەبێت لـەنێو نەتـەوە و گـەلانی جیهاندا. ئەمە ڕستەیەکی سادەیە بـەڵام زۆربـەی ئامانجـە نەتەوەییـەکان دەخاتـەڕوو لـەبارەی ئـەو مەترسیانەی بەرەورووی جیهان دەبنەوە. لێرەدا پاڵنـەرێك هەیـە بـۆ تێگەیشـتن لـەوەی کـاری سـەربازی پێویسـت نیـە، بـەڵکو ئاشتەوایی باشترین پاڵنەرە. بەڕادەیەك جوانە ئەم وشەیە وامان لێدەکات بیکەینـە دوا ئامانجمـان بـەڵام وشـەی ئاشتەوایی واتە نەبوونی جەنگ، دواتـر وێـڕای ئـەوەی خـوازراوە وەك وشـەیەکی نێگـەتیڤ دەمێنێتـەوە. بـەوەی دوا بیانو بۆ تێگەیشتن لە ئەوانی تر تەنها هیواخواستنە بۆئەوەی نەکەوینە کێشەوە لەگەڵیاندا، بـەڵکو پێویسـتە دوا ئامانج لەوە گەورەتر بێت بەوەی ئەم تێگەیشتنە دابینی دەکات لە توانای بینینی هەموو نەتەوەکان لە گۆشە نیگایـەکی فـراوانترەوە. ئەمـە بینینێکـە دەکرێـت هـەزاران سـود لەگـەڵ خۆیـدا بهێنێـت، بـەڵام سـودی بنـەڕەتی بریتیە لە خودی بینینەکە. وێڕای ئەوەی ئێمـە دەدوێین لـە بـارەی بینینـەوە بـە واتـا ئەقڵیەکـەی، بـەڵام دەکرێـت ئەمـە پێوانـە بکـەین بـەپێی بینینـی جەسـتەیی. تاقیکردنـەوەکانی زانسـتی دەروونناسـی بنیـاتنراوە لـەبارەی دەرکپێکردنی هەستەکانەوە بەبێ بەکارهێنانی چاوەکان، واتـە حاڵـەتی بیـنین بـە تـەنها چاوێك، ناکرێـت ئاگـایی ڕوبدات بە دوری سێیەمی بۆشایی. هەرچەندە هێزی چاوێك چەندجارێك زیـادکرا، ئـەوا بـەبێ بـوونی هێڵـەکانی نزیك بونەوەی ناوچەکان لە چەند گۆشەیەکی جۆراوجۆرەوە تا یەکبگرنەوە لەیەك خاڵدا، ئەوکاتە جیهانت دێتـە

بەرچاو وەك بلیتێكی پۆستەی وێنەدار! ئەوكاتە سەر و ژێر، ڕاست و چەپ بوونی هەیە، بەڵام ئەو كاتە دور و نزیك بونی نابێت، نە ئەستوری زەوی شێوە بازنەییەكەی نامێنێت. سەیركردن بە دوو چاو سودی زۆرە. ئەو دەمانپارێزێت لە بەركەوتن لەگەڵ شتەكاندا، دەتوانین بڕی خێرایی ئۆتۆمبێلەكان بزانین كە لێمان نزیك دەبنەوە، بەڵام گەورەترین سودی بینین بە دو چاو بریتیە لە بینینێكی قووڵكراوە بۆ جیهان، دیمەنێكی تەواو لە هەموو ئاڕاستەیەكەوە، ئەمەش ئەو ئاسۆیەیە كە بڵاویدەكاتەوە لەبەردەم پێكانماندا. هەمان كار جێبەجێ دەكرێت بەسەر بینینی ئەقڵیەوە. هەروەك وتەكە دەڵێت: چی لەبارەی ئینگلتەراوە دەزانیت ئەو كەسەی هیچ شوێنێك ناناسێتەوە جگەلە ئینگلتەرا؟. ئەو سودانەی بە دەستیان دەهێنین لە سەیركردنی جیهاندا لەڕێگەی چاوی نەتەوەكانی ترەوە لە ژماردن نایەن، یارمەتی پیشەسازی دەدات بۆ نمونە لە بەستنی ڕێكەوتننامە لەگەڵ ئێراندا، یارمەتی گەلان دەدات لە كەوتن لەم جیهانە قەرەباڵغ و ئاڵۆزەدا. بەڵام گەورەترین سود و قازانج ناكرێت كۆبكرێنەوە لە لیستێكدا: سەیركردنی ئەو واتایەی خێزان و كەسە نزیكەكان لە چیندا دەیبەخشێت، هەستكردن بەوەی لە ژیاندا دەڕوات و ئەوەی دەمێنێتەوە تیایدا، دەرك پێكردنی هیندیەكانە بۆ كەسایەتی كە وەكو دەمامكێك بۆ شاردنەوەی ڕووی ڕاستەقینەی مرۆڤەكان، زانینی ئەوەی چۆن هیندۆسیەك بیردەكاتەوە لەوەی سەیركردنی یەزدان بەوەی كەسێكە و سەیركردنی بەوەی كەسێك نیە، هەدوكیان بە دروست دەزانێت، شیكاری هێماكانی ژیری و پەندە دژبەیەكەكان لەلای قەشەیەكی بوزییەتی زن كە جیاوازیەك نابینێت لەنێوان دزی و چاكەكردندا وێڕای ئەوەی بۆ خۆی هەرگیز بیر لە دزی ناكاتەوە. ئەگەر توانی دەركبكات بە هاوشێوەی ئەم شتانە وتێگەیشتن لێیان بەوەی ڕەهەندێكی نوێ دەبەخشن بە ژیری خۆڕسك و بینینی ڕۆحی. ئەمە بەدەستهێنانی زانستێكی نوێیەكە تیایدا دەژین. تاكە شت كە هەمیشە خێر و چاكەیە بەبێ هیچ مەرجێك، وەك ئەوە نیە كە كانت باسی دەكات بەوەی (نیەتێكی چاكە)، چونكە دەكرێت نیەت بە چاك دابنرێت تەنانەت ئەگەر لە نێو سنورێكی زۆر بەرتەسكدا بێت. بەڵكو تاكە شت كە هەمیشە چاكەیە بریتیەلەوەی (فراوانبوونی تێگەیشتنی مرۆڤ، ئاگاییەكەی بەوجۆرەی لەڕاستیدا لەسەریەتی لە كۆتاییدا). ئەم بیرۆكانەی كەلەبارەی تێگەیشتنە لە جیهان، پێویستیەكەی، پاڵنەر و سودەكانی، كە ڕێنیشاندەرم بوون بۆ نوسینی ئەم كتێبەئاینەكانی جیهان. باشترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە دڵی هەر نەتەوەیەك ناسینی ئاینەكەیەتی، ئەمە ئەگەر وامان دانا كە ئاینەكەی هێشتا بەزیندوویی ماوەتەوە و نەگۆڕاوە بۆ چەند چیرۆكێكی مێژوویی. جیاكردنەوەی ئاینی زیندوو لە ئاینی مردوو، ئاینی زیندوو ڕێنیشاندەرمان دەبێت بۆ تایبەتمەندیەكی پشتڕاستكەرەوەی تری ئەم كتێبە.

٢-ئەمە كتێبێكە ئاین بەشێوەیەكی هەتەری وەردەگرێت. بەواتایەكی تر ئەم كتێبە ڕێبەرێكی گەشتیاری نیە. خوێنەر ڕیكلامێكی بازرگانی تیادا نابینێت بۆ ئاینەكانی ئادەمیزاد كە تیایدا تیشك بخرێتەسەر شتە سەیر و سەمەرەكان. لەبەر ئەوە هیچ شتێك باسنەكراوە ئەو هیندیانەی ڕادەكشێن لەسەر پێخەفێكی بزمارڕێژكراو، نە لەبارەی لە خاچدان لەلای هیندیەكانی نیومەكسیكۆ، نە لە بارەی تاوەرە بەرزەكانی زەردەشتیەكان كە جەستەی مردوانی تیادادەنرێت بۆئەوەی ببنە خۆراك بۆ داڵەكان، نە گرنگیدان بە پەرستنە سەیرەكانی وەك چەند مەڕاسیمێكی هیندی كە تیایدا سێكس بەكاریەت وەك كەرەستەیەك بۆ دەربازبوون. هاوشێوەی ئەم بابەتانە چەند مادەیەكن لەوانەیە ئاماژەیان پێكرابێت لە كتێبی ئاینەكانی جیهاندا تەنها بە هێما. بەڵام گرنگیپێدانیان و دەرهێنانیان لە چوارچێوەكەیاندا سوكایەتی پێكردن نەبوو بۆ پیرۆزی ئاینەكان. هەروەها چەند ڕێگایەكی باشتر هەن بۆئەوەی ئاینەكان بەوجۆرە هەتەریانە وەرنەگیرێن. یەكێكیان گرنگیەكەیەتی بۆ نەتەوەكانی تر:

نەتەوەکانی ڕابردوو، یان نەتەوەی شارستانیەتەکانی تر، چەند نەتەوەیەك کە واسەیریان دەکرێت پێویستیان بەوەیە لەخۆبایی بوونی خود یان منی باڵا بەهێزبکەن. تەنانەت ئەمە نابێتە بەرنامەمان لە تێگەیشتن و چارەسەرکردنی ئایینەکان. دروستە چەند دێڕێکی وتەکانمان لە بارەی ئایینەکانەوە دەستپێدەکات بە ڕاناوی کەسی نادیار. واتە لەکاتێکدا دەدوێین لەبارەی هیندۆس و بوزییەکان و کۆفوشیەکان و موسوڵمانەکانەوە، بەڵام گرنگیپێدانی سەرەکی کە تێیگەیشتوین لەکاتی قسەکردنماندا بریتیەلەوەی ئاڕاستەی ئێمە کراوە. هۆکاری سەرەکی کە وایلێکردم گرنگیبدەم بە ئایینەکانی جیهان بریتیە لە شیکاری زۆربەی پرسیارەکان کە هاتونەتە ڕێم، هەرچەندە هەوڵ بدەم پشتگوێیان بخەم نەمتوانی لێیان دەرباز ببم، لەکاتێکدا هەموو ئادەمیزادەکان هاوبەشن لە هەمان سروشتی مرۆییدا، سروشتی بوو وادابنێم ئەم پرسیارانە بە هەمان شێوە بە مێشکی خوێنەردا هاتون. هەروەها ڕێگایەکی تر ناگرینەبەر کەلە گرنگی ئایینەکان کەمبکاتەوە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لە کاتێکدا جەختدەکاتەوە لەسەر گرنگی ئایین، بەڵام ئەمجارە وەکو کەرەستەیەك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خودی ئایین، وەکئەوەی ئایین بخوێنرێت وەك سەرچاوەیەکی ئیلهامە هونەریەکان، یان وەك ڕێگایەك بۆ بەدیهێنانی سودە تەندروستیەکان و سەرکەوتن لە ئیش و کاردا، یان وەك بەرنامەیەك بۆ چاککردنی باری تایبەتی و وەفاداری دابینکردن بۆ کۆمەڵ. ئەم کتێبە کە لەبارەی ئەو ئایینەوەیە کەلە ژیانی ئادەمیزادایە نەك وەك نەریتێکی بێڕەنگ وەکو ویلیام جەیمز william games لە بەراوردکرنەکەیدا دەڵێت–بەڵکو وەکو تایەکی توندە. ئەمە کتێبێکە لەبارەی ئایینی زیندوەوە. لەو جێگایەی ئایین هاتە دنیاوە ئەوا بەها و ئاکاری جوان بەرهەم دەهێنێت، دەستدەگرێت بەسەر شتەکاندا، هەموو شتێك جگەلە ئەو ئەگەر نەتوانرا بێدەنگ بکرێت، ئەوا ملکەچ دەکرێت. ئایینی زیندوو بەرەوڕوی مرۆڤ دەبێتەوە بە مەترسیدارترین چارەسەکان کە دەکرێت جیهان پێشکەشی بکات. ئەو ڕۆح بانگ دەکات بۆ بڵندترین سەرکێشی کە بتوانێت پێی هەستێت، بانگی دەکات بۆ گەشت کردن بەنێو دارستانەکان و لوتکە و بیابانەکانی ڕۆحی مرۆڤایەتیدا. ئەمە بانگەوازێکە بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی ڕاستیەکان و دەستگرتن بەسەر خوددا. ئەوانەی دەوێرن گوێبگرن و دوای ئەم بانگەوازە نهێنیە بکەون بەخێرایی فێری مەترسیەکانی ئەم گەشتە دەبن. ئەمە وەکو لای تیژکراوەکەی تیغە، ئەستەمە بەسەریدا بڕۆیت ئەمە ڕێگایەکی قورسە، شاعیر دەڵێت! (٢) زانست چەند خزمەتگوزاریەکی مەزن پێشکەش دەکات بۆ پێداویستیە بچوکەکان بەوتەی دادوەر هۆڵمز holmesبەڵام ئایین ئەگەر بگات بە ئامانجەکەی یان نا، ئەوا بەلایەنی کەمەوە مامەڵەدەکات لەگەڵ پێداویستیە مەترسیدار و گرنگەکان زیاد لەهەموو شتێکی تر لە ژیانی ئادەمیزاددا. لەبەرئەوە لەکاتێکدا ڕۆحی تاکە کەسێك سەرکەوتو دەبێت لە گەیشتن بە سەرکەوتنە مەزنەکان لە ئاییندا ئەوا دەبێتە زیاتر لە پادشایەك، ئەو دەبێتە ڕزگارکەری هەموو جیهان. کاریگەریەکەی درێژدەبێتەوە بۆ سەردەمی دوو هەزاری پیرۆز بە پیرۆزرکردنی ڕێگای شێواوی مێژوی مرۆڤایەتی. توینبی Toynbeeدەپرسێت: کێن مەزنترین چاکەکارانی مرۆڤایەتی بەدرێژایی نەوەکان؟ لە وەڵامدا دەڵێت: (پێویستە بڵێم ئەوانە: کۆنفوشیۆس، لائوتسو، بوزا، پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل و یەهوزا، زەردەشت، عیسا، موحەمەد، سوقرات)(٣). پێویستە ئەم وەڵامە هیچ کەسێك سەرسام نەکات. ئایینی ڕەسەن ڕوونترین و پیرۆزترین پەنجەرەیە لەڕێگەیەوە وزەکانی گەردون دەتوانن بڕژێنەناو قەوارەی مرۆڤایەتیەوە. کەواتە ئەو شتە چیە دەتوانێت ڕکابەری ئایین بکات لە کارکردنەسەر قوڵترین ناوەندە دروستکەرەکان لە قەوارە و ئیلهامی مرۆڤدا؟ لەکاتێکدا ئایین دەجوڵێت لەو ناوەندانەوە بۆ دەرەوە بەرەو ئەفسانەکان و مەڕاسیمە ئایینیەکان ئەوا ئەو هێمایانەمان پێدەدات کە مێژوو دەگوازێتەوە بۆ لاپەڕەیەکی تر، هەتا ئەم ئەفسانە و ڕێوڕەسمە ئایینیانە

لاببات، لە کۆتاییدا وزەکەی بخاتەگەڕ بۆ پاککردنەوەی جیهان، هەتا ژیان چاوەڕوان بێت بۆ ڕزگارکردنێکی نوێ. ئەمە نمونەیەکی دوبارەیە تەنانەت کەسێکی بێباوەڕی وەك جۆرج بێرناردشۆ بگەیەنێت بەو سەرئەنجامەی کە ئایین تاکە هێزی بزوێنەری ڕاستیە لە جیهاندا. ئایین بەم واتایە دەبێتە بابەتی باسەکەمان لە بەشەکان داهاتوی ئەم کتێبەدا.

3-دواجار ئەم کتێبە هەڵدەسێت بە هەوڵدانێکی ڕاستەقینە بۆ بەیەکگەیاندنی نەتەوەکان. من دایدەنێم بەجۆرێك لە وەرگێڕان، چونکە ئەمە کارێکە گرنگی داوە بە دەسەڵاتی هیندۆسی وبوزی و موسوڵمانەکان نەك هەر ئەوە، بەڵکو گرنگی داوە بە دۆزینەوەی پردێکی پەیوەندی لەنێوان خۆی و جیهانی خوێنەردا. توێژینەوەی ئایینەکان دەکرێت ئەکادیمی پوخت بێت وەك توێژینەوە لە هەر بابەتێکی تردا، بەڵام من هەوڵمداوە ئەو هێزی تێگەیشتنە لەدەست نەدەم کە ئەم بابەتە پێشکەشی دەکات لە چارەسەری کردنی ئەو کێشانەی بەرەوڕوی مرۆڤ دەبێتەوە لەئەمرۆدا. ئەمە گرنگیپێدانێکی سەرەکیە بە گەیاندن و وەرگێڕان هەڵوێستی ئەم کتێبە شیدەکاتەوە لە توێژینەوەیەکی مێژوییدا. هێندەی دەزانم، لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا هیچ شتێکی دژ بە ڕوداوە مێژوییەکان بوونی نیە کە مێژونوسان دۆزیویانەتەوە. بەڵام وێڕای گرنگیدانم بە وردەکاریەکان لەو زانیاریانەی خستومنەتەڕو، پەیوەندی لەنێوان گێڕانەوەم بۆ ئایین و زانیاریە مێژوییەکان وەك پەیوەندیەکی زۆر سادە مایەوە. زۆربەی ڕوداوە مێژوییەکانم لابردوە و بابەتەکانم ئاسانکردوە لەکاتێکدا وادەردەکەوت وردەکاریە مێژوییەکان ئەو واتایە دەشێوێنێت کە ویستومە سەرنجی خەڵکی بۆ ڕابکێشم. هەندێکجار دەرئەنجامە سروشتیەکانم باسکردوە ئەگەرچی بەڕوونی دەرکەوتوە، بەڵام وێڕای ئەوە گرنگیمداوە بە باسکردنی، هەروەك هەندێکجار چەند نمونەیەکم باسکردوە کە بە گونجاوم زانیوە لەبەر گونجانی لەگەڵ بابەتە باسکراوەکەدا.

ئەم سەربەخۆییە لە نوسیندا لەوانەیە وای لە هەندێك مێژونوس کردبێت واهەست بکەن ئەم کتێبە لاوازە لەڕوی خستنەڕوی ڕوداوەکانەوە. بەڵام کێشەکە بەبیرکردنەوەی من لەبارەی مێژوەیە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ. ئایین لە بنەڕەتدا پێکنایەت لە ڕوداوەکان بەواتا مێژوییەکەی. ئەو چەند واتایەکە. ئەکرێت بۆ گێڕانەوەی ڕاستیەکانی ئایین بە شێوەیەکی ناکۆتا بدوێت لەبارەی خوداوەند و مەڕاسیمە ئایینیەکان و بیروباوەڕەکانەوە، بەڵام ئەگەر ئەم گێڕانەوەیە وایلێنەکردین ببینین و دەربکەین ئیتر چۆن ئەو کارانە یارمەتی مرۆڤ دەدەن لەسەر بەرەنگاربوونەوەی کێشەکانی وەك گۆشەگیری و تراژیدیا و مەرگ، تێگەیشتنیان پێویستی بە چەند زانیاریەکی وردە بەجۆرێك نەبێتە دەستێوەردان بۆ ئایین بە هیچ جۆرێك. لەبەرئەوە هەوڵمداوە گێڕانەوەکەم بۆ ئایینەکانی مرۆڤ بە جۆرێك لێبکەم دەربڕاو بێت بەشێوەیەکی ڕۆحی.

بەکورتی، من هەوڵدەدەم والەم کتێبە بکەم دەرکپێکردنێکی ئایینی پێشکەش بکات بەبێ دەستدرێژی کردنە سەر هیچ دەرکپێکردنێکی تر. ئایین نە مێژوە نە چیرۆکێکی خەیاڵیە، کتێبی ئایینەکانی جیهان هەروەك ڕێگەی پێنەدراوە دەستدرێژی بکاتە سەر مێژوو، بەهەمان شێوە ڕێگەی پێنەدراوە دەستدرێژی بکاتە سەر ڕۆحی ئایین و ڕۆحی مرۆڤبەوەی بیانشارێتەوە لەژێر ڕوداوە مردوەکاندا. سەرکێشەیە بنەڕەتیەکەی بەدڵنیایی دەمێنێتەوە لە گرنگیدان بە ڕوداوەکان و ڕۆح بەیەکەوە. ئێمە ئێستا لەسەرەتای دەستپێکردنی گەشتێکداین بەنێو شوێن و کات و هەتاهەتاییداز شوێنەکان زۆربەی کات دوور دەبن، کاتەکان بێ بن، بابەتەکان لەپشت کات و شوێنەوەن. ناچاردەبین چەند دەستەواژەیەکی بیانی بەکاربهێنین-سنسکریتی و چینی و عەرەبی-. حاڵەتەکانی ڕۆح باسدەکەین بەشێوەیەك وشەکان تەنها دەتوانن ئاماژەیان پێبکەن. ناچاردەبین لەسەر بەکارهێنانی لۆژیك بۆئەوەی هەوڵ بدەین تێڕوانینەکان ڕوونبکەینەوە کە تێگەیشتنیان ئەستەمە. لە کۆتاییدا

شکست دێنین! لەبەرئەوەی ئێمە سەر بە شێوازێك لە بیرکردنەوەین کە جیاوازە لەوان، هەرگیز ناتوانین بەشێوەیەکی تەواو تێبگەین لەو ئایینانەی کە هی ئێمە نین. بەڵام ئەگەر ئەو ئایینانەمان وەرگرت بەشێوەیەکی هەتەری، لەوانەیە بەتەواوی شکست نەهێنین. بۆئەوەی ئەو ئایینانە بەشێوەیەکی هەتەری وەربگرین پێویستە لە دوو شت تێبگەین: یەکەم: پێویستە سەیری شوێنکەوتوانی ئەو ئایینانە بکەین بەوەی ئەوانیش وەك ئێمە ژن و پیاون هەمان ئەو کێشانە بەرەوڕوویان دەبنەوە کە بەرەوڕوی ئێمە دەبنەوە. دووەم: پێویستە مێشکمان ئازادبکەین لە هەموو بیرکردنەوەکان و یاساکانی پێشوو کە لەوانەیە ببنەهۆی لاوازکردنی ئاگاییمان بۆ تێڕوانینە نوێکان. کەواتە ئێمە بیرکردنەوەکانمان وەلاناوە کە پێشتر پێکهێنراوە لەبارەی ئەو ئایینانەوە بەوەی کاری چەند کەسێکە هەوڵیانداوە بۆئەوەی شتێك ببینن واتایەك بداتە ژیانیان، دواتر هەوڵماندا ئەو شتانە ببینین کە ئەوان بینیویانە، ئەگەر بە کارە هەستاین ئەوا ئەو بەربەستەی لەنێوانماندایە بەرەو نەمان دەچێت.

پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی خاڵی دەستپێکردن١ لەوانەیە یەکێك لە باشترین کتێبەکان کتێبی: man's religion بێت لە نوسینی: john b. noss (بڵاوکراوەی: نیویۆرك، کاۆرگەی مکمیلان، ١٩٥٦)، لەبەرئەوەی ئەم کتێبە ئەو ڕاستیانە دەخاتەڕوو کە گرنگ بوون بەلامەوە لەم کتێبەدا چەند واتایەکم لێدەرهێناوە، لەبەرئەوەی دەبێتە هاوەڵێکی باش بۆ ئەم کتێبە کاسا ئۆپانیشاد بەرگی ١ بەشی ٣ بەندی ٣، ٤

## ٢

### هیندۆسیەت

ئەگەر لێیان پرسیم: لەچ شوێنێکی زەویدا ئەقڵی مرۆڤ هەستا بە قوڵترین تێڕوانینەکانی لەبارەی گرنگترین کێشەکانی ژیانەوە، چارەسەری دۆزیەوە بۆ هەندێکیان کە شایەنی گرنگی پێدانە لەلایەن هەمووو مرۆڤێکەوە، تەنانەت گرنگی بە ئەوانەی ئەفڵاتون و کانتیان خوێندۆتەوە بدەین؟ ئەوا پێویستە ئاماژە بۆ هیند بکەم.

ئەگەر لە خۆمم پرسی: لە چ ئەدەبێکی جیهانەوە دەتوانین ئەو ڕاستکردنەوەیە دەربهێنین کە پێویستە والە ژیانمان بکات ببێتە ژیانێکی ڕۆحی. لەڕاستیدا مرۆڤانە ترە، لەبەر ئەم ژیانە نا بەڵکو لەبەر ژیانی هەتاهەتایی؟ ئەوا پێویست بوو بۆ جاری دووەم ئاماژە بدەمەوە بە ئەدەبی هیند.

ماکس مۆللەر: لە شانزەی تەموزی ١٩٤٥ ز. دا، لە دوورترین ناوچە بیابانیەکانی نیومەکسیکۆ ڕووداوێك ڕوویدا، لەوانەیە گرنگترین ڕوداو بووبێت لە سەدەی بیستەمدا. چەند کاریگەریەکی یەك لەدوای یەکی بۆ دۆزینەوە زانستیەکان هەبوو، کە لە زانکۆی شیکاگۆوە دەستی پێکرد و دواتر چڕکرایەوە لە ناوچەی وای لە شاری لۆس ئالاموس، ئەمڕۆ گەیشتە لوتکە کە یەکەمین بۆمبی ئەتۆمی دروستکرا، ئەوەش بە سەرکەوتنێکی گەورە دادەنرا!ڕۆبەرت ئۆپنهیمەر Robert oppenhiemer: بەڕێوبەری لۆس ئالامۆس بوو کە دەستی هەبوو لەم بەدیهێنانەدا.

چاودێرێك سەیری بەوردی سەیری ڕۆبەرت ئۆپنهیمەری دەکرد، لەو بەیانیەدا کە یەکەمین تاقیکردنەوەی تەقاندنەوەی ئەتۆمی ئەنجامدرا وتی: (لەکاتێکدا زەنگی دواهەمین چرکە لێدرا، ئۆپنهیمەر دڵەڕاوکێیەکی زۆری هەبوو، خەریك بوو هەناسەی دەبڕا. . بەتوندی خۆی جێگیرکرد لەسەر مێزەکە. . لەکاتێکدا بێژەرەکە ڕایگەیاند: ئێستا ئەو تەقینەوەیە ڕوویدا و بوویەهۆی دروستبوونی ڕوناکیەکی زۆر و ناڵەیەکی زۆر گەورە، لەوکاتەدا ڕۆبەرت هێوربوویەوە و بە تەواوی پشوی دا). ئەمە ڕوکاری دەرەوەی ئەم ڕوداوە بوو بەڵام ئەوەی بە مێشکی ئۆپنهیمەردا هات لەو کاتەدا، بریتی بوو لە دوو دێڕی کتێبی بهاگافاد گیتا، تێیدا یەزدان لەبارەی خۆیەوە دەدوێت و دەڵێت: (بوومە مەرك لەناوبەری جیهانەکان. کات چاوەڕێی هاتنی تیاچوونی کوشندەیە!).

لەم سەردەمەدا ئەم ڕووداوە واتایەکی قووڵی هەیە. وەك ئەوانەی پێشو ئەم نەوەیەمان لەسەری پەروەردە کراوە، لەسەرئەوەی نیوەی یەکەم بڕیاری لەسەر دەدا، بەتەنها لە چوارینەکەی کیپلینگ kipling دایە کە دەڵێت: ڕۆژهەڵات ڕۆژهەڵاتە و ڕۆژئاوا ڕۆژئاوایە oh، east is east and west is west دووانن هەرگیز بەیەك ناگەن ...and never the twin shall meet ئێمە ئەمڕۆ تەواوکەری ئەو چوارینەیە دەدۆزینەوە کە دەڵێت: هەتا بەنزیکەیی ئاسمان و زەوی دەوەستێت، till earth and sky stand presently لەبەردەم کورسی مەزنی لێپێچینەوە و دادگایی یەزداندابن at god's great judgment seat خەریکە ئەو کاتەدێت کە چوارینەکەی کیبلینگج ئاماژەی پێداوە. چەکە ئەتۆمیەکان بەدڵنیاییەوە هەمووو زەوی و ئاسمانی گەیاندوە بە جۆرێك لە لێپێچینەوەی یەزدانی.

ئەوەی جێگای سەرنجدانە لە ڕاستگۆیی پێشبینیکردنی شاعیردا بریتیە لەوەی بیرۆکەی شیعرەکەی هەڵقوڵاوە لە مێشکی مرۆڤێکدا کە هێمای هێڵی ڕۆژئاوایی دەنوێنێت لەو ساتەوەختە شومەدا. ئەمە بیرۆکەیەك نیە

وەرگیرابێت لە کلتورە ئاینییەکەیەوە بەڵکو لە کتێبە پیرۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی دوورەوە وەرگیراون، لە کتێبی هیندۆسی بهاگافادگیتا واتە سرودی یەزدان.

لە ڕاستیدا دروست نیە بڵێین هیند و ڕۆژئاوا هەرگیز بەیەک نەگەیشتون بەدرێژایی هەمووو ئەو کاتەی ڕابردو. سەدەیەک پێش ئێستا زۆرو Thoreau دانی بەوەداناوە ئەم بیرۆکەیە پێکهاتوە لە دوو کتێب: کتێبی ئیمیرسۆن emerson ڕاپۆرتێك لەبارەی سروشتەوە essay on nature و کتێبی بهاگافاد گیتا. لە هەمان کاتدا ئارسەر شۆپنهاوەر Arthur Schopenhauer لەبارەی کتێبە پیرۆزە بنەڕەتیەکانی هیندۆسیەتەوە نوسی وتی: (لە هەمووو جیهاندا توێژینەوەیەکی جوان نیە پەلکێشمان بکات بەرەو بڵندبوون هەروەك ئۆپانیشاداتopanishads بەو کارە هەڵدەسێت، ئۆپانیشادات دڵنیاکەرەوە بوو لە ژیانمدا بەهەمان شێوە دەبێت لەکاتی مردنمدا). ئەم جۆرە لە پیاوان دەگمەن بوون، ڕووینەداوە لە م نەوەیەماندا کە بەشێوەیەکی بەرفراوان بەهۆی بوونی مەزنێکی ڕۆحیەوە لە هیند هەست پێکردنێك لە ڕۆژئاوا گەشەی سەندبێت، هێشتا پێویستە لەسەرمان کە لێی تێبگەین، دەکرێت لە ڕاستیدا سودی لێوەربگرین. گرنگترین کەس کە ڕۆڵی هەبوو لە بەئاگاهێنانەوەی ئەم هەستە لە ڕۆژئاوادا، پیاوێکی بچکۆلە بوو، کێشی نەدەگەیشتە سی کیلۆگرام، لەکاتی مردنیدا ئەوەی لەدوای خۆی مایەوە لە ماڵ و موڵکەکەی نەدەگەیشتە دوو دۆلار! ئەگەر دەکرا وێنەکەی بڵاوبکرێتەوە لەم لاپەڕەیەدا ئەوا یەکسەر هەموومان دەماننناسیەوە. بەم بۆنەیەوە چەندین کەس بە وێنەکەیان دەناسرێنەوە لە هەموو جیهاندا؟ پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر یەکێکیان وەڵامی دایەوە و وتی سێ کەسن: چارلی چاپلن و میکی ماوس و مەهاتما گاندی واتە: گاندی کە گەوهەرەکەی زۆر مەزن بوو واتای مەهاتما. لەم سەردەمەدا زیاتر لە هەمووو کاتێك کە تیایدا توندوتیژی و ئاشتەوایی ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، ناوی گاندی وای لێهات ببێتە دژی ستالین و هیتلەر. ئەو بەدەست هێنانە بووە هۆی پێدانی ئەم پلەوپایەیە و وای لە بەریتانیا کرد هیند چۆڵ بکەن بە شۆڕشێکی ئاشتیانە. بەڵام بەدەستهێنانەکەی تری نەزانراوە، کە لابردنی بەربەستەکانە لەنێوان تاکەکانی نەتەوەکەیدا و کۆتایی هێنان بە جیاکاری ڕەگەزیانە لە ویلایەتە یەکگرتوەکاندا، ئەمە لەکاتێکدا شاربەدەرکراوەکانی ناونا هاریجان، واتە نەتەوەی یەزدان، بەرزیکردنەوە بۆ ئەو پلەو پایە مرۆییە پیرۆزە. ژەنەڕاڵ مارشال marshall لەکاتێکدا هەواڵی تیرۆرکردنی بیست وتی: (مەهاتما گاندی وتەبێژ بوو بەناوی ویژدانی مرۆڤایەتیەوە). مەسیحیەکان خۆڕسکانە دەدوێن لەبارەی گاندیەوە وەك یەکێك لەو پیاوانە سەیری دەکەن کە تاڕادەیەکی زۆر لە مەسیح دەچێت. لە ڕاستیدا زۆر کاریگەر بوون بە پەندی شاخەکەی بەڵام سەرچاوەی ئیلهامەکەی لە نیشتیمانەکەیەوە بوو. گاندی لەبارەی خۆیەوە لە وەرگێڕانە تایبەتەکەیدا وتی: (. . . ئەو هێزەی کە هەمە لەکارکردنمدا لە بواری ڕامیاریدا، لە تاقیکردنەوەکانمدا لەبواری ڕۆحیدا بەدەستم هێناوە). و دواتر دەڵێت: (لە بواری ڕۆحیدا، ڕاستی بنەمایەکە دەست بەسەر هەمووو شتێکدا دەگرێت، کتێبی بهاگافادگیتا کتێبێکی زۆرباشە بۆ زانینی ڕاستی). بەدڵنیاییەوە ناکرێت بەوردی کاریگەری مەهاتما گاندی بزانین لە سەرنجڕاکێشانی ڕۆژئاواییە هاوچەرخەکان بەرەو کلتوری ڕۆحی هیند، بەڵام ئەوەی پێویستە لێرەدا باس بکرێت بەشێوەیەکی ڕوون ڕۆژئاواییەکان گرنگیان پێداوە. ژمارەیەك لە نوسەری ئەمەریکی دیار هەن، ئەو ڕاستیە ناشارنەوە بیرۆکە تایبەتیەکانیان لە کلتوری هیندەوە وەرگرتووە، هێندەی ئەوە لە کلتوری نیشتیمانیەکەیانەوە وەرگرتووە. لەو نوسەرانە: ئەلدۆس هیکسلی Aldus huxley، کریستۆفەر ئیشەروود Kristopher isherwood، ڤینسینت شیان sheean Vincent و لویس فیشەر لە زانکۆی کۆلۆمبیا، کتێبێکی بە ناونیشانی فەلسەفەکانی هیندەوە نوسیوەphilosophies of India، بەپێی

**وتەکانی ئەو کتێبەکە گرنگی بە دوبارەکردنەوەی نەڕەی ناو دارستانەکانی هیند لە لایەن هەموو جیهانەوە دەدات. بەم وتانە دەست پێدەکات: ((ئێمەی ڕۆژئاوایی ئێستا نزیك دەبینەوە لە گەیشتن بە چەند ڕێگایەك کە پێشتر ڕوناکبیرەکانی هیند پێی گەیشتون، پێش لەدایکبوونی مەسیح بە حەوسەد ساڵ)).**

**ئارنۆڵد تینبی** Arnold Toynbee **لە وانەیەکدا ساڵی ١٩٥٢ لە زانکۆی ئەدنبرە پێشبینی ئەوەی کرد لەماوەی پەنجا ساڵدا جیهان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاوە بەڵام لە سەدەی بیست و یەکدا، لەکاتێکدا ئایین جێگای تەکنەلۆژیا دەگرێتەوە، ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە کە ئێستا هیند شکست خواردوە جارێکی تر سەرکەوتن بەدەست بهێنێتەوە.**

**کاری ئێمە لەم بەشەدا بریتیە لەوەی لە هیندۆسیەت بگەین بەو جۆرەی کە ژیانی گاندی توانیویەتی سەرنجی پیاوێکی وەك هوکسلی** huxly **ڕابکێشێت و والە توینبی** Toynbee **بکات بەجۆرێك بیربکاتەوە کە هیند داهاتوویەکی چاوەڕوانکراوی هەیە لە جیهانی ڕۆژئاوادا.**

## ئارەزوەكانی ئادەمیزاد

ئەگــەر ویســتمان هیندۆســیەت بەگشــتی بخوێنینــەوە. ئەدەبــە فراوانەكــەی هیندۆســیەت و مەڕاســیمە تێروتەسەلەكانی و نەریتە میللیە بەربڵاوەكانی، ئەگەر ویستمان هەموو ئەمانە بەشێوەیەكی گشتی وەربگرین و بە وشەیەك كورتیدەكەینەوە كە هیندۆسیەت بە ئادەمیزاد دەڵێت: (دەتوانیت هەمووو ئەو شتانە بەدەست بهێنیت كە ئارەزوی بەدەستهێنانیان دەكەیت).

ئەمە باش دەردەكەوێت، بەڵام بۆ جاری دووەم تۆپەكە دێتەوە نێو یاریگاكەمان. چیە ئەو شتەی كە دەمانەوێت؟ دەكرێت بە ئاسانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، بەڵام ئەستەمە بتوانین وەڵامێكی باشی ئەم پرسیارە بدەینەوە. هیند لە دێر زەمانەوە بیری لەم پرسیارە كردوەتەوە، زۆر چاوەڕوانی كردووە پێش ئەوەی بگات بەو وەڵامە. هیندۆسیەت دەڵێت ئارەزوەكانی ئادەمیزاد چوارن:

١-یەكەمین شت كە ئادەمیزاد ئارەزوی بەدەستهێنانی دەكات چێژە، ئەمە شتێكی سروشتیە، چونكە هەموومان كاتێك لەدایك دەبین هەڵگری هەستی چێژوەرگرتن و هەستكردنین بە ئازار، ئەگەر پشتگوێمان خست و دەستمان دانا لەسەر فڕنێكی گەرم، یان خۆمان فڕێدایە خوارەوە لە پەنجەرەی قاتی دووەمی بینایەكەوە، ئەوا لەناودەچوین. كەواتە چ شتێك لەوە ژیرانە ترە كە شوێنی ئارەزوە چێژبەخشەكان بكەوین بۆ جەستەمان، بیكەین بە بنەمای ڕێنیشاندەر و دواهەمین ئامانجمان؟.

زۆربەمان بیستومانە ئایینی هیند لەبنەڕەتدا گرنگی بە جیهانەكەی تر دەدات، ئەم جیهانە ڕەتدەكاتەوە، ئەمەش بیركردنەوەی زۆرینەی ڕۆژئاواییەكانە لەسەر هیند، پێشبینی ئەوە دەكرێت ئەمە هەڵوێستی ئەو ئایینە بێت بۆ مرۆڤێك كە گرنگی بە چێژ بدات، بەدەستهێنانی ئارەزوەكانی دەكاتە دوا ئامانجی لە ژیاندا، كە سەرزەنشتكردن و ناشیرین كردنە بەڵام بەم شێوەیەش نیە. ڕاستە هیند چێژی نەكردوە بە بەهادارترین شت لە ژیاندا، بەڵام ئەمە جیاوازە لە ئیدانەكردنی چێژ وەرگرتن و دانانی بە كارێكی خراپ. لەڕاستیدا هیند بەو مرۆڤەی كە چێژی دەوێت دەڵێت: دوای بكەوە. چونكە یەكێكە لە چوار ئامانجە ڕێگەپێدراوەكەی ژیان. جیهان چەندین شتی مەزنی تیایە بۆ چێژ وەرگرتن. جیهانێكی لێوان لێوە لە جوانی و ئەو شتانەی چێژ دەبەخشنە هەمووو هەستەكانمان. وێڕای ئەوە چەند جیهانێكی بڵندتر هەیە، ملیۆنەها جار چێژ تیایدا زیاترە، ئەو جیهانانە تاقیدەكەینەوە لە دوائاستەكانی تەواوبوونماندا. بەدڵنیاییەوە بنەمای چێژ وەك هەر بنەمایەكی تر پێویستی بە ژیری هەیە لە بیروڕادا، لەبەرئەوە ناكرێت شوێنی هەمووو ئارەزویەكی كتوپڕ بكەوین بەبێ ئەوەی توشی سزا بین، هەروەك پێویستە لە داهاتودا ئامانجە بچوكەكان بكەینە قوربانی لەپێناو گەیشتن بە ئامانجە گەورەكاندا. هەروەها پێویستە واز لەو ئارەزوانە بهێنین كە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنن، تەنانەت ئەگەر بۆ خۆپاراستن بێت لە دوژمنایەتی لە جیهانی دەرەكیدا یان سەرزەنشتكردنی ویژدان بێت لە ناوەوەدا. تەنها كەسی نەزان درۆ و دزی و فڕوفێڵ دەكات لە پێناو گەیشتن بە بەرژەوەندیە ساختەكانیدا، كەسی نەزان ڕێگە بەخۆی دەدات بكەوێتە نێو ئالودەبوونێكی مەترسیدارەوە بەڵام لە سنوری چاودێریكردنی یاسا ئاكاریە بنەڕەتیەكاندا، دەتوانیت داوای هەمووو چێژ و لەزەتەكان بكەیت كە ئارەزویان دەكەیت. دەقەكانی هیندۆسیەت زۆر دوورن لە ئیدانەكردنی چێژەوە، بەڵكو چەند دەقێك هەن ڕێگاكانی زیادكردنی چێژ دەخەنەڕوو بۆ بەرزترین ئاست. سەبارەت بە جوتیارێكی سادە، هەر ئایینێك بێت هەر لە شێوازەكانی پەرستن و مەڕاسیمەكانی و ڕێنمایە ئاكاریەكانی هیچ نین جگەلە كۆمەڵە شتێك كە دەتوانن سەركەوتن و پەرەسەندن بۆ ژیانی جوتیارەكە دابین بكەن، ژیانێكی ئارام و ڕزق و ڕۆزیەكی باشی پێ دەدات و بارانی بۆ دەهێنێت، نەخۆشی بۆ چاك دەكاتەوە، بەشێوەیەكی گشتی

ژیانێکی ئارام و پڕ لە خۆشی بۆ مسۆگەر دەکات. بۆ کەسێکی ڕۆشنبیر لە فەلسەفەی هیندۆسیەتدا مەزهەبێك بۆ چێژ هەیە سەرنجی مرۆڤی ڕۆژئاوایی ڕادەکێشێت. هیند دەڵێت: ئەگەر چێژت بوێت، ئەوا ئەو ئارەزوە سەرکوت مەکە، بەڵکو تێری بکە بە جوانترین شێوە. هیند ئەمە دەڵێت و چاوەڕوانە. چاوەڕوانی ئەو کاتەیە کە تیایدا مرۆڤ دەرك بەوە دەکات چێژ هەموو ئەو شتانە نیە کە ئارەزوی دەکات، ئەمە شتێکە بێگومان بەسەر هەموو مرۆڤێکدا دێت بەڵام مەرج نیە لە ژیانی ئێستایدا بێت. گەیشتنی مرۆڤ بەم دۆزینەوە و باوەڕپێکردنە هۆکارەکەی ئەوە نیە خودی چێژ شتێکی گەندەڵ و خراپە بێت، وەك پێشتر باسمان کرد چێژ بەو جۆرە نیە، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوەیە چێژ لاوازکەری مرۆڤە و تێربوونی نیە. چێژ بەپێی سروشتەکەی شتێکی تایبەتە (واتە خودیە) و خود زۆر لەوە بچوکترە ببێتە بابەتێکی خرۆشاندنی هەمیشەیی. گیرکەگۆر kierkeggard ماوەیەك هەوڵیدا بۆ ڕونکردنەوەی ئەو ئاکارەی ناوی نا بە ژیانی جوان کە بنەماکەی تەنها بەدەستهێنانی چێژە، سەرەنجام گەیشت بەوەی لە ڕەگ و ڕیشەوە ئەزمونێکی شکستخواردوە کە لە کتێبەکەیدا نەخۆشی هەتا مردن sickness unto death باسیکردووە لەکاتێکدا وتی: ((گەڕام بەنێو دەریای چێژدا کە بیٚ بنە، بۆ شوێنێك هەتا تیایدا جێگیر بم نەمدۆزیەوە)). هەروەها لە گۆڤارەکەیدا نوسیویەتی: ((بەتوندی هەستم بەوەکرد، چێژەکان یەك لەدوای یەك بە ئاڕاستەی خۆیان کێشم دەکەن، لە جۆرێك هەڵچونی دروێنەوە بۆ بەدەستهێنانی ژاوەژاو بەڵکو ئازار و ئەشکەنجەشە)). تەنانەت لەبارەی شوێنە جۆراو جۆرەکانی چێژ وەرگرتنەوە لە نیویۆرك، لەبەرئەوەی جیمی واڵکەر jimmy walker گرنگی بە هەموو شتێك دەدات جگەلە قووڵی بیرکردنەوە، لەم بارەیەوە لە دوا ساتەکانی ژیانیدا دەڵێت: (ئەمڕۆ هیچ سیحر و ئەفسونێك نابینم جگەلە شتێکی بێمانا). هاوشێوەی ئەم دۆزینەوانە، هیند بە نمونەیی دادەنرێت. هەمووو مرۆڤێك زوو بێت یان درەنگ، دەیەوێت زیاتر لەوە بێت تەنها شێوەی شتەکان بگۆڕێت، ئەگەر چی جوان و ڕازاوەش بن.

٢–کاتێك ئەم کاتە دێت، گرنگی تاك دەگوازرێتەوە بۆ ئامانجێکی گەورەتری ژیان کە سەرکەوتنی دونیاییە(١) بە هەرسیٚ دیمەنەکەیەوە: دارایی، ناوبانگ، پلەوپایە. ئەمانە ئامانجێکی گەورە و شایستەن، ناکرێت بەکەم بزانرێن. وێڕای ئەوە گەیشتن بە هاوشێوەی ئەم ئامانجە، هەستی ڕەزامەندی و تێربوون دەداتە مرۆڤ زۆر زیاتر لەوەی چێژە هەست پێکراوەکان دەیدەنیٚ. چونکە سەرکەوتنی دونیایی دەسکەوتێکی کۆمەڵایەتیە، بەشێوەیەکی گەورە جەنجاڵە لەگەڵ ئەوانی تردا. لەم گۆشەنیگایەوە گرنگیەك بەدەست دەهێنێت ناکرێت بەراوردبکرێت بە ڕۆچوون لە چێژە هەست پێکراوەکاندا.

سەبارەت بە خوێنەری ئەمەریکی، ئەم ڕاستیە پێویستی بە بەڵگە نیە. چونکە زانا ئەنجلو زانایەکی ئەمەریکی هەوەسباز نیە، میوانەکانی لە شوێنکەوتوانی شارستانیەتەکانی تر هەموویان بەنزیکەیی لە هەڵسکەوتیاندا هاوبەشن بەتایبەت ئەو نەتەوانەی بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکەن، وێڕای چەند دیاردەیەك کە پێچەوانەی ئەمە دەردەخەن کە چەند نەتەوەیەکن چێژ وەرناگرن لە شتەکان بەپێی پێویست چونکە لەژێر کاریگەری پرۆتستانیەتدان١٢. ئەوەی ڕۆژئاوای ئازادکرد ئینجیلی هەستپێکراو نەبوو، بەڵکو ئینجیلی سەرکەوتن و پەرەسەندنی دونیایی بوو. ڕۆژئاوا پێویستی بە کەسێك نیە هەتا بۆی بسەلمێنێت دەستکەوتەکان هەڵگری سودێکی زۆر گەورەترن کە چێژە هەستپێکراوەکان پێی دەبەخشێت. ڕۆژئاوا پێویستی بە کەسێکە بۆی بسەلمێنێت سەرکەوتنی دونیایی سنوری خۆی هەیە، مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بەتەنها بە نان بژی، پرسیاری: لێهاتویی چۆنە؟ زۆر لەوە قووڵترە لە پرسیاری چەندی هەیە؟.

هیند دانبەوەدا دەنێت پاڵنەرەکانی خاوەنداریّتی و بەدەستهێنانی ناوبانگ و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بەرز، چەند پاڵنەرێکن ڕەگوڕیشەیان بە قووڵی لە دەرونی مرۆڤدا داکوتیوە و پێویستە هەرگیز بە کەم نەزانرێت. دارایی و سامان پێویستن بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە خێزاندا و پێکهێنانی بەشێوەیەکی دروست، سەرکەوتنی دونیایی هەستی کەرامەت دەهێنێت بۆ زۆربەی تاکەکان بەڵام لە کۆتاییدا ئەم ئامانجانە بێ کەموکوڕی نین، چونکە لەژێر هەریەکەیانەوە ئەم سنورانە شاردراوەتەوە:

١- بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دارایی و ناوبانگ و پلەوپایە کۆمەڵێك شتێکی گەمارۆدراون، دواتر بە ڕکابەری بەدەست دەهێنرێن و بە مەترسی دەورەدراون، بەپێچەوانەی بەها وابەستەکان بە ئەقڵ و ڕۆحی مرۆڤەوە، ئەم سێ شتە: دارایی و ناوبانگ و پلەوپایە، تاکەکەسین و ناکرێت کەسانی تر تیایدا بەشدار بن واتە بە بەشداربوونی کەسانی تر تیایدا کەمدەکەن. بۆنمونە من دۆلارێکم هەیە بەو واتایەی هی منە و تۆ نیتە. هەتا لەسەر کورسیەك دانیشتبم تۆ ناتوانیت لەسەری دابنیشیت. بەهەمان شێوە ناوبانگ و پلەوپایە دوو شتی گەمارۆدراون، بۆ نمونە نەتەوەیەك بهێنە پێشچاوت هەموو تاکێك تیایدا بەناوبانگ بێت، وێناکردنێکە دژ بە واتای بەناوبانگیە، ئەگەر پلەوپایە بەیەکسانی دابەشکرا بەسەر خەڵکیدا، واتاکەی ئەوەیە هیچ سەرۆکێکیان نیە. ناوبانگ واتە جیاکردنەوەی کەسێك لەوانی تر، هەروەك سەرۆکایەتی واتە بەڕێوەبردنیان و بوونی دەسەڵات بەسەریاندا. لێرەوە دەبینین ماوەی نێوان ڕکابەری ئەم شتانە بە مەترسی دەورەدراوە. هەنگاوێك تێناپەڕێنێت، لەبەرئەوەی کەسانی تری لێهاتو هەن ئارەزوی بەدەستهێنانی ئەم شتانە دەکەن، کێ دەزانێت کەی سەرەی ئەوان دێت؟. هیچ کەسێك ناتوانێت بەتەواوی دڵنیا بێت لەوەی ڕکابەرەکانی پێشی ناکەون لە ساتێك لە ساتەکاندا، دواتر گەیشتن بە پلەو پایەیەکی دونیایی بەبێ ئەوەی ترسی لێسەندنەوەت هەبێت کارێکی ئەستەمە.

٢-ناچونیەکی دووەم کە سەرکەوتنی دونیایی لەناو خۆیدا هەڵیدەگرێت، لەکاتێکدا دەکرێتە دوا ئامانجی ژیان.

. ئەم هەستکردنە چاوچنۆکیە و تێربوونی نیە. ئەگەر هەڵە بێت، بڵێین مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت ئەو بڕە پارە و پلەوپایەیە بەدەست بهێنێت کە تێری بکات، کەواتە دروستە بڵێین مرۆڤ هەرگیز تێر نابێت لە دارایی و پلەوپایە لەکاتێکدا بە چاوچنۆکانە داوایان دەکات، واتە کاتێك چاوچنۆکی دەکاتە بزوێنەری ژیانی. لە ڕاستیدا ئەمانە ئەو شتانە نین مرۆڤ داوایان دەکات. مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت هەست بە تێربوون بکات لە بەدەستهێنانی شتێکدا کە لەڕاستیدا نایەوێت. هەروەك هیندۆسیەك دەڵێت: (هەوڵدان بۆ کوژاندنەوە و دامرکاندنەوەی پاڵنەری بەدەستهێنانی دارایی، وەك هەوڵدانە بۆ کوژاندنەوەی ئاگرێك بە پێداکردنی زەیت بەسەریدا!).

بە دڵنیاییەوە بەباشی ڕۆژئاوا لەم خاڵە تێگەیشتون. لە فەیلەسوفەکاندا ئەفلاتون دەڵێت: ((هەژاری مرۆڤ کەمی کەلوپەلەکانی نیە بەڵکو هۆی چاوچنۆکیەکەیەتی). لە پیاوە ئایینیەکانیشدا قەشە گریگۆری نازیانزین st. gregory nazianzen لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت: (ئەگەر هەموو موڵك و ماڵی جیهان بەدەست بهێنیت، هێشتا زۆر شت ماوە هی تۆ بێت، لەبەرئەوە هێشتا هەر هەژاریت!). لە زانایانی دەروونناسیشدا ئابرام کاردینر abram kardinner دەڵێت: (سەرکەوتنی دونیایی ئامانجێکە خاڵی تێربوونی تیادا نیە). لەکاتێکدا لیندیەکان the lynds لە یەکەمین توێژینەوەی کۆمەڵایەتیاندا لەبارەی شاری میدڵ تاونەوە middletown دەڵێن: (بازرگانەکان و کرێکارەکان هەردووکیان بەبێ جیاوازی، وادەردەکەون ڕادەکەن بەرەو ژیانێکی باشتر، هەتا قازانجەکەیان زۆرتر بێت، ئارەزوەکانیان زۆرتر دەبێت و چاوچنۆکیان بۆ کۆکردنەوەی پارە زیاتردەبێت).

بەوشێوەیە هەریەکەیان لە تێڕوانینی تایبەتیەوە گەواهی دا بۆ جروستی ئەو بیرۆکەیەی هیند مە بەنمونەیەك

ڕونیکردوەتەوە بەم نمونەیە: (نمونەی ئەو گویدرێژەی خاوەنەکەی گێزەرێکی شۆڕکردەوە لەبەردەمیدا کەبەسترابوویەوە بە دارەکەی دەستیەوە. هەرچەندە گوێدرێژەکە ڕاییکردایە بۆئەوەی قەپ بکات بە گێزەرەکەدا نەیدەتوانی پێی بگات).

٣-سێیەمین خاڵی لاوازی سەرکەوتنی دونیایی وەکو خاڵی لاوازی چێژە hidonism، وێڕای ئەوەی بێمانایی سەرکەوتنی دونیایی کەمتر دیارە بەبەراورد بە بێمانایی چێژ بەڵام سەرکەوتنی دونیایی گرنگی دەدات بە واتا لە خوددا کە لە کۆتاییدا هەستی پێدەکرێت، لە بێدەنگی خودیدا کە زۆر بچوکترە لەوەی ببێتە جێی متمانە و دڵنیابوونی هەمیشەیی. نە دارایی و نە پلە و پایە ناتوانن ئاگایی تێر بکەن و وای لێبکەن هەست بەوە نەکات کە هێشتا لە زۆر شتی کەمە. لە کۆتاییدا هەمووو کەسێك هەست بەوە دەکات داوای لە ژیان کردوە باخچەیەکی گەورەی تیادا هەبێت لە دەرەوەی شاردا لەگەڵ دوو ئۆتۆمبێل و گەراجێك و موچەیەکی بەرز.

٤- دوا هۆکار بەهۆی بێ توانایی سەرکەوتنی دونیاییەوەیە بۆ ڕازیکردنی مرۆڤ و تێرکردنی بەشێوەیەکی تەواو، چونکە دەسکەوتەکانی کاتین و زوو لەناو دەچن. مرۆڤ بەباشی دەرك بەوە دەکات دارایی و ناوبانگ و پلەوپایە لەدوای مردنی جەستە کۆتایی پێدێت. هەروەك زۆرینەی خەڵك لە ڕۆژئاوا دەڵێن: (ناتوانیت لەگەڵ خۆتدا بیبەیتە ناو گۆڕ). ئەمە دەرك پێکردنێکە لەلایەن مرۆڤێکەوە کە نەتوانێت ئەو شتانە تا کۆتایی لای خۆی بهێڵێتەوە و بیانپارێزێت. ئەمە ڕێگری لێدەکات لەوەی بگات بە تێربوونێکی تەواو. مرۆڤ خۆڕسکانە دەرك دەکات بە نەمری لەبەرئەوە دڵتەنگە بە بێبایەخکردنی بەهای سەرکەوتنە دونیاییەکەی لەکاتی مردنیدا.

پێش ئەوەی دەست بکەین بەو دوو ئامانجە، ماوەتەوە بڵێین هیندۆسیەت وابیردەکاتەوە مرۆڤ ئارەزوی بەدەستهێنانیان دەکات، باشتروایە ئەو شتانە کورتبکەینەوە کە پێشتر باسکراون.

هێندۆسیەکان چێژ و سەرکەوتنی دونیایی دادەنێن بە دوو ئامانج. . ڕێگایەکیان هەیە ناوی دەبەن بە ڕێگای چێژ، ئەوان ئەم دەربڕینە بەکاردەهێنن چونکە ئارەزووە تایبەتەکانی مرۆڤ هەتا ئێستا کێشانی هێڵی ڕێگای ژیانیەتی. چەند ئامانجێکی تر هەن لە پێش ئەوەوەن، بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت هەڵوێستەکەمان لەم دوو ئامانجە باسکراوەدا نێگەتیڤانە بێت، چونکە ناتوانین بە شێوەیەکی تەواو هیچ شتێك بەدەست بهێنین بە سەرکوتکردنمان بۆ ئەو ئارەزوانە. لەبەرئەوەی وابیردەکەینەوە چێژ و سەرکەوتنی دونیایی ئەو دوو شتەن پێویستمان پێیانە، لەبەرئەوە پێویستە هەوڵبدەین بۆ بەدەستهێنانیان هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد. بەکورتی، هیندۆسیەت سەیری دوو ئامانجەکەی ڕێگای چێژ دەکات وەك ئەوەی یاری منداڵانەبن. گەر لە خۆمان بپرسی ئایا شتێکی هەڵە لەیاری منداڵاندا هەیە؟ پێویستە لەوەڵامدا بڵێین، بەپێچەوانەوە، بەڵکو شتێکی خەمناك هەیە لە دیمەنی ئەو منداڵانەی یاریکردنیان لێ قەدەغەکراوە بەڵام لەوە خەمناکتر دیمەنی گەورەکانە کاتێك شکست دەهێنن لە گرنگی پێدانی زیاتر بە یاری منداڵان. مرۆڤی تەواو گرنگی دەدات بەو جۆرە یاریانە لەبەر خۆی نا بەڵکو لەبەر ئەو منداڵانەی خۆشی دەوێن و گرنگیان پێدەدات لەبەرئەوە دەیانوروژێنێت لەڕێگەی چێژوەرگرتن لێیەوە بۆ خاڵێکی دورتر لێی، بەگشتی سەبارەت بە ژیانی مرۆڤ، ئەوەیە کە مرۆڤ لە پەرەسەندن بەردەوامە، ڕێگاکەی دەگرێتە بەر بەرەو چێژوەرگرتنی تەواو بە سەرکەوتن و چێژە هەستپێکراوەکان بۆ ئەو خاڵەی کە تیایدا گەورە دەبێت لەو تایبەتمەندیانەدا. ئەگەر ئەم کارە نەکات تواناکانی بە قەتیسماوی دەمێننەوە بۆ هەمیشە.

کەواتە ئەو ئامانجانە کامانەن کە ژیان پێشکەشیان دەکات و مەترسیدارترن؟؟ هیندۆسیەت لە وەڵامدا دەڵێت دووانن. بە پێچەوانەی ڕێگای چێژ و ڕێگای سۆفیگەریەوە. وشەی سۆفیگەری کاریگەریەکی نێگەتیڤانەی

هەیە. لەبەرئەوەی هیند بەزۆری بەکاری دەهێنێت، بێ گومان یەکێکە لەو هۆکارانەی وای لە ئایینی هیند کردوە بەجۆرێك دەربکەوێت کە ڕەشبینە و ژیان ڕەتدەکاتەوە. ڕاستە پاڵنەری بوون بە سۆفی لەوانەیە بێ هیوایی و نائومێدی بێت، کە ڕەنگدەداتەوە بە پاشەکشەکردنی دەروونی مرۆڤایەتی لە ژیاندا، بەڵام لەوانەیە سۆفیگەری هێمایەکی ڕوونتر بێت لەسەر بەئاگابوون و متمانە بەهۆی بوونی پاڵنەرەکان بۆ ژیانێکی بڵندتر لە ڕۆچوونی کاتی لە ئارەزوەکاندا و دەچێتە ناو ئەم شێوازە لە سۆفیگەریەوە و پابەندبوون لە شێوازە جیاوازەکانیدا، سۆفیگەری قوربانیدانە بە شتی بێمانا لە ئێستادا لە پێناو شتی گەورە لە داهاتودا، وازهێنان لەم شوێن و کاتە لەبەر کاتێك کە دێت. سۆفیگەری ئایینی لەکاتێکدا لانادات لە ڕێگاکەی، وەك ئەو وەرزشەوانە وایە کە هەموو ڕۆچوونێك لە چێژەکاندا لەخۆی قەدەغە دەکات کە دووری دەخاتەوە لە بەدەستهێنانی خەڵاتەکە. سۆفیگەری لێرەدا بەپێچەوانەی نائومێدیەوەیە، تاکە بەڵگەیەك کە دەکرێت پێشکەش بکرێت لەسەر متمانەی ژیان بە بوونی بەهای بڵندتر لەوەی تاقیدەکەینەوە لەم ساتەوەختەدا. پێویستە هەرگیز ئەوە لەیاد نەکەین کە ڕێگای سۆفیگەری لە هیندۆسیەتدا لەدوای ڕێگای چێژەوە دێت. ئەگەر خەڵکی لە بەدەستهێنانی ئارەزوە سەرەتاییەکانی تێرکرا کە لە بیرۆکەی سۆفیگەریدا بۆ بوون لە بنەڕەتدا دەرکەوتووە، یان کارەکە کورتدەکرێتەوە لە دەرکەوتنی ئەو کەسانەی شکستیان هێناوە لە ڕێگای یەکەمدا ڕێگای چێژ، وەکو گەنجێك کە دەچێتە ناو پەرستگای قەشەکانەوە لەبەرئەوەی توشی خورپەیەکی سۆزداری بووە، لەکاتێکدا ئەو کیژەی خۆشی دەویست پەیمان شکێن بووە لەگەڵی و وازیلێهێناوە، دەکرێت لەلایەنی سۆفیگەریەوە ئەمە قوبوڵ بکەینەوە وەك ئەوەی ئەم مرۆڤە پەنای بۆ سۆفیگەری نەبردووە تەنها لەبەر ئەو بارەی کە بەسەریدا هاتووە. ئەوەی ناچارمان دەکات بۆ گوێ بگرین بۆ بیردۆزی هیندۆسیەت کە جەختدەکاتەوە لەسەر بوونی ئامانجی تر بۆ سۆفیگەری، بەڵگەهێنانەوە بە وتەی ئەو کەسانەی چێژوەرگتنیان هەڵبژاردوە لە ژیاندا وەك خۆیان دەڵێن سەرکەوتوو بوون، بۆئەوەی دواتر خۆیان ببیننەوە لەوەدا ئاواتەخوازن ژیان بتوانێت لەوە زیاتریان پێبدات. ئەو کەسانەی لەژیاندا شتێکی بڵندتر نابینن هەتا ڕێگای سۆفیگەری بگرنە بەر بۆ گەیشتن پێی بەم هۆیەوە کەسانی ڕەشبینن لە ژیانیاندا، بەپێچەوانەی ئەوانەوە کەسانێك هەن دەیانەوێت ببنە سۆفی، بۆئەوەی بەردەوامی بە ژیانیان بدەن پێویستە باوەڕیان بەشتێك هەبێت تا لەپێناویدا بژین. ئەگەر هیچ بێماناییەك نەبینن لە چێژ و سەرکەوتنی دونیاییدا ئەوا باوەڕیان بەوەدەهێنا، ئەمانە چەند شتێکن پێویستە هەموو ژیان لەپێناویاندا بەسەربەرین بەڵام هەروەك تولستوی tolstoy لە یەکێك لە دانپیانانەکانیدا دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ باوەڕی نەما بە بەهای سنوردار، ئەوا باوەڕ دەهێنێت بە بێسنوریی یان دەمرێت. با ڕوونتر بدوێین. هیندۆسیەت بانگەشە بۆ ئەوە ناکات کە هەموو مرۆڤێك لەم ژیانەی ئێستایدا هەست بەوە بکات ڕێگای چێژ ڕێگایەکی نمونەیی نیە، لەبەرئەوەی هیندۆسیەت بە پشتبەستن بە پێوەرە کاتیە فراوانەکەی، جیاکردنەوەیە لەنێوان تەمەنی کاتی و تەمەنی دەروونی (ڕۆحی)دا، ئەمە جیاکردنەوەیەکە هەموومان بەباشی دەیزانین. دوو کەس هەریەکەیان تەمەنی ٤٦ ساڵ بێت، لە ڕووی کاتەوە یەك تەمەنیان هەیە، بەڵام لەڕووی حاڵەتی دەرونیەوە لەوانەیە یەکێکیان هێشتا منداڵ بێت لەکاتێکدا ئەوی تر پیاوێکی تەواوە. هیندۆسیەت ڕازیە بەم جیاکردنەوەیە بەڵام فراوانی دەکات بۆئەوەی ڕەهەندەکانی ژیان بگرێتەوە، ئەم خاڵە بەتێروتەسەلی لەبارەیەوە دەدوێین کاتێك دەگەین بە بیرۆکەی بەرجەستەکردنی ڕۆحەکان riencarnation. بەپێی ئەمە چەندین پیاو و ژن دەبینین یاری چێژ ئەنجام دەدەن بەو جۆش و خرۆشەی منداڵە تەمەن ٩ ساڵەکان یاری دز و پۆلیس ئەنجامدەدەن، لەگەڵ ئەوەدا دەمرن و هەست بەوە دەکەن بەباشترین شێوە ژیانیان بەسەربردوە، کۆچی دواییان کردوە لەکاتێکدا ژیانیان بەشتێکی باش

زانیوە. لەکاتێکدا دەبینین ئەوانی تر هەمان یاری چێژ دەکەن بەڵام بە نمونەیی دانانێن. ئەم جیاوازیە لەبەرچی هیندۆسیەکان دەڵێن جیاوازیەکە شاردراوەتەوە لەو ڕاستیەی ئەوانەی سەرەتا پێی فریودراون بە باقوبریقی چێژ، لەکاتێکدا ئەوانی تر هەستیان بە تینویەتی دەرونیان دەکرد بۆ جیهانەکانی تر هەتا بچنەناوی و تیایدا سەرکەوتوبن. با چاکترین نمونەی شێوازی دووەم لەخەڵك ڕونبکەینەوە. ئەمە شێوازێکە هێشتا بەخشینەکانی جیهان بەرەولای خۆیان کێشی دەکەن. خۆی دەخاتە نێو جیهانی چێژەوە، هەمووو هەوڵێکی دەخاتەگەڕ بۆ زیادکردنی داراییەکەی و موڵك وماڵەکەی و بەرزکردنەوەی پلەوپایە کۆمەڵایەتیەکەی، بەڵام نە دواکەوتنی ئەم ئامانجانە، نە بەدەستهێنانیان دڵخۆشی ڕاستەقینە دەهێنێت. ئەمانە کۆمەڵە شتتێکن ئارەزوی دەکات بەڵام شکست دەهێنێت لە بەدەست هێنانیدا لەبەرئەوە خەمبار دەبێت. چەند ئارەزویەکی تر بەدەست دێنێت بۆ ماوەیەك و لەپڕ لەدەستیان دەدات، لەبەرئەوە دوبارە خەمبار دەبێتەوە. . . چەند ئارەزویەکی تر بەدەست دێنێت و دەیانپارێزێت بەبێ ڕکابەر بەڵام لە کۆتاییدا هەست بەوە دەکات ئەو دڵخۆشیەی بۆ ناهێنن کە پێشبینی دەکرد. زۆربەی ئەو ئەزمونانەی سەرنجراکێشن لە یەکەمجاردا، بێ مانان لە جاری سەدهەمدا. لە میانەی هەمووو ئەم شتانەدا گەیشتن بە چێژ بەدەست نایەت تەنها داگیرساندنی ئاگری ئارەزویەکی تر نەبێت. هیچ یەکێك لەو ئارەزوە بەدیهێنراوانە بەتەواوی تێری ناکەن، هەمووویان باقوبریقەکەیان بەتێپەڕبوونی کات لەدەست دەدەن. لەکۆتایدا دەکەوێتە گومانەوە کە لەوانەیە بووبێتە کۆیلەی ڕۆتینێکی بەردەوام، کە ناچاری دەکات پەلە بە هەنگاوەکانی بکات و بەرەو ئەو دەسکەوتانەی بەهاکەیان سەبارەت بە ئەو کەم و کەمتر دەبێتەوە. کاتێك مرۆڤ دەگات بەم حاڵەتە، گوێی لە دەرونی دەبێت هاواردەکات: بێ هودەیە بێ هودەیە، هەمووو شتێك بێ هودەیە، لەوانەیە بۆی دەربکەوێت نهێنی کێشەکەی حەشاردراوە لەوەی ئەو تێربوونانەی بەدەستی دەهێناوە بۆ خۆی، سنورداره بە بچوکی ئەو دەرونەی کە پاڵی پێوەنراوە بە هەمووو هێزێکەوە بۆ خزمەتکردنی. ئەگەر ناوەندی گرنگی پێدانی گۆڕا چی ڕودەدات؟ ئایا ناکرێت کۆتایەکەی ببێتە بەشێکی فراوانتر و بە ماناتر، هەتا دەربازی بکات لەو ژیانە بێمانایە؟ دەرکەوتنی ئەم پرسیارانە، سەرەتای ئایین لەگەڵ خۆیاندا دێنن. چونکە وێڕای ئەوەی بە زیادەڕەویەکی زۆرەوە دەتوانرێت ئایینێك هەبێت وا لە خودی مرۆڤ بکات ببێتە خوداوەند (واتە خودی مرۆڤ و دڵخۆشیەکەی و ببێتە جێی گرنگیپێدانی، هەروەك لە ڕۆژئاوا پەیڕەو دەکرێت)، بەڵام ئایینی ڕاستەقینە کاتێك دەست پێدەکات کە مرۆڤ دەگەڕێت بەدوای واتا و بەهای تایبەت بەخۆیەوە، واتە لەکاتێکدا وازدێنێت لە بانگەشەی ئەوەی کە منی باڵا ڕاستیەکی ڕەهایە. بەڵام ئایا ئەو شتە چیە پێویستە بەهۆیەوە وازبهێنین لە خودپەرستی؟ ئەم پرسیارە دەمانبات بۆ لای دوو ڕەگەز کە ڕێگای سۆفیگەریان پێکهێناوە. لێرەدا خودی کۆمەڵگەی مرۆیی یەکەمین پاڵێوراوە. واتە خزمەتکردنی ژیانی ئێمە و ژیانی سەدان ملیۆن لە ئەوانی تر. گومانی تیا نیە مرۆڤایەتی گرنگیەکی هەیە ژیانی تاکەکەس نیەتی. کەواتە بە گشتی با وەفاداریمان بگوازینەوە بۆ مرۆڤایەتی، داواکاریەکانی بخەینە پێش داواکاریەکانمانەوە. ئەمە یەکەمین هەنگاوی گەورەیە لە ئاییندا. ئەمە ئایین بەرهەم دێنێت بۆ خزمەتکردنی خەڵك، ئەمە سێیەمین ئامانجی گەورەی ژیانە لە ڕوانگەی هیندۆسیەتەوە. ئەمە ئامانجێکە، هێزی ڕاکێشانەکەی زۆر گەورەیە سەبارەت بەوانەی پێگەیشتون بە ڕادەیەك کە دەتوانن هەستی پێبکەن. ژمارەیەکی لە ڕادەبەدەر لە خەڵك ئارەزوی بەدەستهێنان و وەرگرتنیان تێپەڕاندوە بۆ ئارەزوی خزمەت کردن و بەخشین. گەورەترین ئامانجیان ژیانە، مەبەست لە سەرکەوتن نیە! بەڵکو خزمەتکردنە بەوپەڕی توانایەوە بۆ هەستان بە هەمووو کارێك کە بۆی دێتە پێش لە ژیاندا. هیندۆسیەت لێوان لێوە لە چەندەها ڕێنمایی تایبەت بەو پیاو و ژنانەی ئارەزوی ئەوە دەکەن ژیانیان

تـەرخان بکـەن بۆخزمـەتکردنی پرۆژەیـەکی مرۆیـی. ئـەوە سیسـتـەمێکی تێـر و تەسـەل لـەو ئەرکانـە دەخاتـە بەردەمیان کە بەپێی تەمەن و دەسەڵات و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت. بەرەوڕووی ئەم ئەرکانە دەبینەوە لە دێرەکانی داهاتوی ئـەم بەشـەدا. لێـرەدا تـەنها دەمانـەوێت ئـەوە دوبـارە بکەینـەوە کـەباسمانکرد لـەبارەی دوو ئامانجەکـەی پێشـوەوە. ئەمـە ئامانجێکـە دەروون ڕازی دەکـات، بـەڵام لەکۆتاییـدا بەتـەواوی شکسـت دێنێـت لـە تێرکردنی دڵی مرۆڤدا. دەسکەوتە ڕۆحیەکانی ئەم ئامانجە پێویستیان بـە تەواوبوونـە هـەتا بەهاکـەی بزانرێـت، ئەگـەر ئەمـە دابینکـرا ئـەوا دەسـکەوتەکان گـەورە دەبـن. دەسـتکەوتی ئـەم ئەرکـە پیاهەڵـدان دەداتـە هـەمووو تاکەکانی کۆمەڵگە، بەڵام زیاترین شت کە ڕێـز دەهێنێـت بـۆ خـودی مـرۆڤ و هەسـتکردنی بـەوەی بەشـداربووە لـە بەجێهێنانی ئەو ئەرکەدا. بەڵام داواجار ئەم دەرکپێکردنە ناتوانێت شادومانی بداتـە مـرۆڤ بـەو بـڕەی کـە ڕۆحـی تێربکـات. لەبەرئـەوەی کۆمەڵگـەی مرۆیـی، هـەتا خـۆی بەتـەنها بوەسـتێت، بەشـێوەیەکی خـەمناك دەمێنێتـەوە، لەبەرئەوە نیە پێویستە بگات بە کۆتاییەکەی، بەڵکو خەمناکە لە بەرەنگاربوونەوەی بۆ تەواوبوون. پێویستە دوا پێداویستی مرۆڤ لە شوێنێکی دیکەدا بێت.

## مرۆڤ لەڕاستیدا چی دەوێت

ئالدۆس هوکسلی aldos huxley دەڵێت: ((بۆ هەمووو مرۆڤێك كاتێك دێت دەپرسێت لەبارەی هەمووو ئەو شتانەی لەبەردەستیدان، تەنانەت لەبارەی ئیشە جوانەكانەوە وەك كارەكانی شكسپیر یان بیتهۆڤن. . . ئینجا دەڵێت: دواتر چی؟ ئایا ئەمە هەمووو شتێك بوو؟)). دەمانەوێت ڕستەیەكی سادەتر بنوسین، كە هەڵوێستی هیندۆسیەت ڕونبكاتەوە بۆ جیهان. شتەكانی ئەم جیهانە بەگشتی خراپ نین، بەڵكو زۆربەی جوانن، تەنانەت هەندێكیان بەجۆرێك جوانن دەتوانێت سەرنجی مرۆڤ ڕابكێشێت بۆ چەندین نەوە لەدوای خۆی بەڵام لە كۆتاییدا هەموو مرۆڤێك دەگات بە ئاستێك دەرك بەوە دەكات وەك سیمۆن وێل simon well دەڵێت: ((لە جیهانی خوارووودا شتێك نیە بەڕاستی باش بێت، هەموو ئەو شتانەی بە باش دێنە پێشچاو لە كۆتایدا سنوردارن و پێویستن بۆ بەردەوامیدان بەژیانی مرۆڤەكان)). لەكاتێكدا مرۆڤ دەگات لەم خاڵە دەپرسێتەوە لەبارەی بڵدترین و مەزنترین شتەوە كە ئەم جیهانە پێشكەشی دەكات، تەنها لەبارەی لوتكەی ئەزمونە هونەریەكانەوە ناپرسێت، بەڵكو لەبارەی بەرزترین ئاستەكانی خۆشەویستی و زانین و هەستان بە ئەركەكانەوە دەپرسێت: ئایا ئەمە هەمووو شتێكە؟. ئایا ئەمە ئەو ساتەیە كە هیندۆسیەت چاوەڕوانی بوو. هەتا مرۆڤ ڕازی بێت بە بەدەستهێنانی ئامانجەكانی وەك چێژ و سەركەوتنی دونیایی و ژیانی تەرخانكراو بۆ خزمەتكردن، چونكە دانایی هیندی هەراسانی ناكات بەهیچ شێوەیەك، تەنها بە پێشكەشكردنی هەندێك لە ئامۆژگاریەكان لەبارەی چۆنیەتی بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە بەشێوەیەكی باشتر و چالاكتر. لێرەوە ساتەوەختێكی ئاڵۆز دەست پێدەكات لەكاتێكدا ئەم شتانە بریسكەكەیان لەدەست دەدەن، دواتر مرۆڤ خۆی دەبینێتەوە لەوەی ئارەزو دەكات شتێكی تر لەلای ژیان بەدەست بهێنێت. ئایا ژیان شتێكی تری هەیە پێشكەش بە مرۆڤەكانی بكات؟. وەڵامی هیندی لەبارەی ئەم پرسیارەوە ئاشكرا و ڕوونە، بەڵێ ژیان چەند توانایەكی تری هەیە، بۆ زانینی ئەم توانایانە پێویستمان بە ئەو پرسیارە هەیە كە ئادەمیزاد چی دەوێت؟. هیندۆسیەت دەڵێت هەمووو ئەوەی لە وەڵامدا دەوترێت لەبارەی ئەم پرسیارەوە، چەند وەڵامێكی زۆر سادەیە. چێژ و سەركەوتنی دونیایی دەمانبات بە ئاڕاستەی ئەو شتەی لە ڕاستیدا دەمانەوێت. ئەوەی مرۆڤ لەڕاستیدا دەیەوێت كۆمەڵە شتێكی قووڵترن.

یەكەم: ئادەمیزاد بوونی دەوێت، هەریەكە لە ئێمە پێی باشە بوونی هەبێت، هیچ كەسێك ئارەزوی فەنابوون ناكات لە كۆتاییەكانی ژیانیدا. . پەیامنێرێكی گەورەی جەنگی جیهانی دووەم ئێرنی بایل erni pyle، باسی كەش وهەوای ئەو ژورەی دەكرد كە تیایدا سی و پێنج سەرباز تیایدا كۆبووبوونەوە، ئەركی بۆردومانكردنیان پێدرا بۆ ڕۆژی دووەم، ئەمە ئەركێكە كاتێك دەچن بۆ ئەنجامدانی تەنها چواریەكی كەسەكان دەگەڕێنەوە، ئەو هەستەی تێبینیم كرد، لەلای ئەو سەربازانە لەڕاستیدا ترس نەبوو، بەڵكو ڕقێكی قووڵ بوو بۆ وازهێنان لە داهاتوو. هیندۆسیەت دەڵێت ئەم هەستە بەسەر هەموواندا دەسەپێنرێت. هیچ كەسێك لە ئێمە پێی خۆش نیە بمرێت و هێشتا دونیا كۆتایی نەهاتبێت. دروستە هەندێك كەس خۆی دەبینێتەوە كە بەرەو خۆكوژی دەڕوات بەهۆی نائومێدی و بێهیواییەوە، بەڵام هیچ مرۆڤێك دڵخۆش نابێت بەبێ هۆ بمرێت.

دووەم: مرۆڤ زانستی دەوێت، هەمووومان دەمانەوێت بەجۆرێك بین، دەرك بە هەمووو شتێك بكەین. خۆشەویستی زانین لەلای خەڵك بێ سنورە، لەو كاتەدا زانای فیزیا كە بە خۆشەویستیەوە دەگەڕێت بە دوای نهێنیەكانی سروشتدا، ئەو بازرگانەی كە بە چاوچنۆكانە ڕۆژنامەی ڕۆژانە دەخوێنێتەوە، ئەو هەرزەكارەی دانیشتوە لەبەردەم شاشەی تەلەفیزۆنەوە دەیەوێت لایەنی براوە بزانێت لە یاری تۆپی پێدا، ئەو هاوسێیەی لە ژنە دراوسێكەی دەپرسێ لەبارەی دوایین هەواڵی كۆمەڵگەوە، لەكاتێكدا سەرقاڵی خواردنەوەی كوپێك لە

قاوەیە. لەلای هەمووان خۆشەویستی زانین هەیە، بەڕادەیەك تێرناکرێت. تاقیکردنەوەیەك سەلماندویەتی مەیمونەکان هەوڵ دەدەن بۆ زانینی ئەوەی لەپشت تەڵەکانەوە چی هەیە، زیاتر لەو هەوڵەی دەیدات بۆ بەدەستهێنانی خۆراك یان سێکس. ئەگەر خۆشەویستی زانین بەهێز بێت بەو ڕادەیە لەلای مەیمەنەکان، ئاخۆ دەبێت چەندە بەهێز بێت لەلای مرۆڤەکان؟

سێیەمین شت کە خەڵك داوای دەکات بریتیە لە شادمانی. دڵخۆشی کۆمەڵێك هەستە، گرنگترینیان دژ بە بێ هیوایی و نائومێدیە. ئەمانە ئارەزوە ڕاستەقینەکانی مرۆڤن. ئەگەر ویستمان وێنەکە تەواو بکەین پێویستە ڕاستیەکی تری گرنگ زیادبکەین، لەڕاستیدا ئەوەی مرۆڤ دەیەوێت تەنها ئەو سێ شتە نیە، بەڵکو بە شێوەیەکی ناکۆتا ئەمانە داوادەکات. یەکێك لە گرنگترین تایبەتمەندیەکانی مرۆڤ بریتیە لەوەی بوونەوەرێکە دەتوانێت بیرۆکەی ناکۆتا وێنا بکات، ئەم توانایە هەمووو ژیانی ڕەنگ دەکات، هەروەك وێنە زەیتیەکەی چیریکۆ chirico ئەمە بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر ڕوون دەکاتەوە کە ناوی ناوە سوز بۆ ناکۆتا. باس لە هەر چاکەیەك بکەیت دەبینیت مرۆڤ دەتوانێت کەمێك لەوە زیاتر وێنابکات، لەکاتێکدا بەو کارە هەڵدەسێت بەشێوەیەکی زیاتر ئارەزوی دەکات. زانستی پزیشکی تەمەنی مامناوەندی مرۆڤی زیادکردوە، بەڵام ئایا مرۆڤ ئامادەیە بۆ مردن لەکاتێکدا دەگاتە ئەو تەمەنە؟ کەواتە ئەگەر ویستمان بڕیار بدەین لەسەر ئەو ڕاستیە بەتەواوی دەڵێین، ئەوەی مرۆڤ دەیەوێت لە ڕاستیدا بوونی ناکۆتایە، زانستی ناکۆتایە، شادمانی ناکۆتایە. واتە بە چاوپۆشیکردن لەوەی ئێستا بڕیاری لەسەردراوە. ئەوەی مرۆڤ ئارەزوی دەکات لەڕاستیدا بوونی ئەو سێ شتەیە، ئەگەر ویستمان ئەو سێ شتە کۆبکەینەوە لەیەك وشەدا ئەوا دەمانوت ئەو شتەی لەڕاستیدا مرۆڤ ئارەزوی دەکات بریتیە لە ئازادی (بە سنسکریتی موکتی mukti). واتە ئازادی تەواو لە کۆت و بەندەکان کە ناژمێردرێن کە بوونی ئێستای بەستوەتەوە.

(١) چێژ.

(٢) سەرکەوتنی دونیایی

(٣) هەستان بە ئەرکی پێویست (بەئاڕاستەی مرۆڤایەتی

(٤) ئازادی.

بەمشێوەیە لەوانەیە بازنەکەمان تەواو کردبێت لەبارەی ئەو شتانەی مرۆڤ بەڕاستی دەیەوێت بەدەستیان بهێنێت. ئێستا دەگەڕێینەوە سەر دەرئەنجامە خرۆشێنەرەکە کە باسی هیندۆسیەتمان پێ کردەوە، (ئەو شتەی مرۆڤ دەیەوێت کە پێداگری دەکات بۆ بەدەستهێنانی، بریتیە لەو شتەی دەتوانێت بەڕاستی بەدەستی بهێنێت)). واتە بوونی ناکۆتا و زانستی ناکۆتا و شادومانی ناکۆتا، هەموویان لەبەردەستی مرۆڤدان. ئەو هەواڵەی تری هیندۆسیەت کە وروژێنەرترە ئەمەیە: ((ئەوەی تەنها مرۆڤ دەیەوێت لەبەردەستیدا نیە، بەڵکو لە ئێستادا خاوەنیەتی!)). بابپرسین مرۆڤ چیە؟ ئایا جەستەیە؟ بەدڵنیاییەوە. لێرەدا شتێکی تر هەیە، ئایا کەسایەتیەکە ئەقڵ و یادەوەریەکانی و ئارەزوەکانی دەگرێتەوە کە لەلای دروست بوون لە ئەزمونەکانیەوە لەبارەی شێوازێکی تایبەت لە ژیان کە تیایدا ژیاوە؟ بەڵێ بەو شێوەیە. ئایا شتێکی تر هەیە؟ هەندێك خەڵك بە نەخێر وەڵامدەدەنەوە. بەڵام هیندۆسیەت لەگەڵیاندا هاوڕانیە. هیندۆسیەت دەڵێت بنەڕەتی کەسایەتی مرۆڤ و زیندوکردنەوە تیایدا بەشێك لە بوون دەدۆزرێتەوە کە مردن ناناسێت و هەرگیز تەواو نابێت، بوونێکە سنور بۆ زانینی نیە، بوونێکە شادومانیەکەی بێسنورە. ئەمە ناوەندی لۆژیکی ناکۆتایە بۆ هەمووو ژیان، ئەمە دەرونی شاردراوەیە یان ئاتمان atman، هیچ نیە جگە لە خودی براهمان brahman واتە یەزدان. کەواتە: جەستە،

کەسایەتی، ئاتمان-براهمان. . ئەو سێ ڕەگەزەن ئەگەر باس نەکرێن بەیەکەوە ئەوا ڕاستی تەواوەتی مرۆڤمان باس نەکردوە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەگەر بە ڕاستی لە بوونماندا ناکۆتاین، بۆچی ئەوەمان تێدا دەرناکەوێت؟ بۆچی بەجۆرێك مامەڵە ناکەین بگونجێت لەگەڵ ئەو ڕاستیەدا؟ ئایا ناکرێت یەکێك لە ئێمە بڵێت: ( ئەمڕۆ هەست بەوە ناکەم کە بێسنورم! تێبینی ئەوە ناکەم هەڵسوکەوتی هاوسێکەم بە یەزدانی بزانرێت؟!). کەواتە چۆن بەئەگەردانانی هیندۆسیەت خۆڕاگر دەبێت بەرامبەر ئەم بەڵگانەی کە بەشێوەیەکی ئاشکرا دژیەتی؟ هیندۆسیەت دەڵێت لەوانەیە وەڵامی ئەمە شاردرابێتەوە لە ئاستی ئەو قووڵیەی تیایدا ئەزەلیەت بەخاکسپێردراوە، لەژێر بڕێکی زۆر لە ڕابواردن و بێئاگایی و سەرقاڵبوون و بیرۆکە هەڵەکان و سەرقاڵبوون بەو پاڵنەرانەی دەست دەگرێت بەسەر بوونماندا، وەکو ئەو چرایەی بڕێکی زۆر لە تۆز و خۆڵ لەسەری نیشتوە و بووەتەهۆی بەرگرتن لە ڕوناکیەکەی. ئەو کێشەیەی ژیان دەیخاتە بەردەم مرۆڤ بریتیە لە خاوێنکردنەوەی پیسیەکانی ناو بوونی، هەتا ئەو خاڵەی تیایدا بەشێوەیەکی تەواو چەقەکەی دەردەکەوێت. ئەم ئەگەرە بێگومان پێویستی بە دۆزینەوەیەکی زیاترە، کە بابەتی ئەم بەشەی داهاتوە.

## ئەوەی لەپشت ناخەوەیە

دادوەر هۆڵمز justice holmes ڕاهاتوە لەسەرئەوەی بڵێت: ((ئامانجی ژیان بریتیە لەوەی مرۆڤ بەپێی تواناکەی دەربازی ببێت لە کەموکوڕیەکانی)). بەڵام بەگشتی هیندۆسیەت ئامانجەکەی دەربازبوونە لە کەموکوڕی ناو دەروونی مرۆڤ.

ئەگەر ویستمان لیستێك دروست بکەین لەجۆرەکانی کەموکوڕی کە ژیانمان سنوردار دەکەن. پێویستمان بە هێز و توانا هەیە بۆ بەدیهێنانی خەونەکانمان، نەخۆش دەکەوین، ماندوو دەبین، هەڵە دەکەین، بە ژمارەیەکی لەڕادەبەر شت نازانین، شکست دێنین و نائومێد دەبین، پیردەبین و دەمرین. لیستێك بە هاوشێوەی ئەم کەموکوڕیانە بۆ ناکۆتا درێژ دەبێتەوە، بەڵام پێویستمان پێی نیە، چونکە زۆربەی ئەو کەموکوڕیانە دەگەڕێتەوە بۆ سێ جۆری بنەڕەتی: ئێمە لە بوونماندا، لە زانینماندا، لە شادومانیماندا سنورداریین، واتە لە هەریەکە لەو سێ ئارەزوەدا مرۆڤ دەیەوێت لە قووڵاییەکانیدا ئەو شتە پێك بهێنێت. ئایا دەکرێت زاڵ ببین بەسەر ئەو لایەنە لاوازانەی ڕێگرن لەبەردەممماندا بۆ گەیشتن بەو ئارەزوانە؟ ئایا دەکرێت هەوڵبدەین بۆ گەیشتن بەو جۆرە ژیانە، کە تیایدا ژیان ڕاستەقینە بێت بەوەی کۆت و بەندی کەمتری تیابێت؟ لایەنە لاوازەکان دابەشدەکرێن بۆ سێ کۆمەڵە: (١)ئازاری جەستەیی

(٢)ئازاری نائومێدی لەئەنجامی شکستهێنان لە بەدیهێنانی ئارەزویەکدا

(٣)بێزاربوون لە ژیان بەگشتی.

یەکەمیان کەمێك هەراسانکەرە. چونکە توندی ئازار زۆربەی کات هۆکارەکەی ئەو ترسەیە کە لەگەڵ ئازارەکەدایە، لەبەرئەوە تا ڕادەیەکی زۆر زاڵبوون بەسەر ترسدا دەکرێت ئازار کەم بکاتەوە، هەروەك دەشێت مرۆڤ بە ئازار ڕازی ببێت ئەگەر دەرك بەوە بکات ڕێگایەکە ناچارە بیگرێتەبەر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی گەورەتر، هەروەك مرۆڤ پێشوازی دەکات لە گەڕانەوە بۆ ژیان و هەستکردن بە باڵە سڕبووەکانی وێڕای ئەوەی ئەم کارە زۆر بەئازارە. هەروەك دەکرێت ئازار لەیادبکرێت لە خێرایی گەیشتن بە ئامانجەکە. لە خراپترین حاڵەتەکانی ئازاردا، واتە ئەو ئازارەی کە هیچ سودێکی نیە، بە ئاسانی دەکرێت لەناوی ببەین لەڕێگەی سڕکردنەوە، ئایا سڕکردنی دەرەکی بێت لەڕێگەی بەبەکارهێنانی دەرمانەکانەوە یان سڕکردنی هەناوی بە دەستگرتن بەسەر ئاگایی و هەستی مرۆڤدا. ڕاما کریشنا rama krishna (مەزنترین قەشەی هیندۆسی) لەسەدەی نۆزدەیەمدا بەهۆی کاریگەری شێرپەنجەی قورگەوە کۆچی دوایی کرد، لەکاتێکدا پزیشکەکە ویستی ئەو شانەیەی قوڕگی بپشکنێت کە توشبووە ڕاما کریشنا هەستی بەئازارکرد، پزیشکەکە وتی خولەکێك دانبەخۆتابگرە، دواتر پێی وت ئێستا ئازادبە. لەو کاتەدا پزیشەکەکە توانی شانە توشبووەکە بپشکنێت بەبێ بەرگریکردن لەلایەن کریشناوە، خۆی خستە حاڵەتێکی ئەقڵیەوە کە تیایدا نەهێڵێت دەمارە خانەکانی ئازارەکە بگەیەننە ئاگایی ئەگەر بەبڕێکی کەمیش بێت، کەواتە دەکرێت بەڕێگەیەك یان یەکێکی تر بگەین بە خاڵێك کە تیایدا ئازای جەستە دەوەستێت تاڕادەیەکی زۆر هەتەریانە. ئازاری هەتەریانە بریتیە لە ئازاری دەرونی کە مرۆڤ هەراسان دەکات لەکاتێکدا ناتوانێت ئارەزوە تایبەتەکانی بهێنێتەدی. بۆ نمونە دەمانەوێت لە خولێکی یاری گۆڵفدا براوە بین، سەرئەنجام شکست دێنین. هیواخوازدەبین بڕێك پارە بەدەست بهێنین بەڵام لەدەستی دەدەین. دەمانەوێت ئاستی بەرز بەدەست بهێنین بەڵام ناتوانین. ئاواتەخوازین بانگهێشت بکرێین بۆ ئاهەنگێك بەڵام پشتگوێ دەخرێین. بەمجۆرە ژیان پڕدەبێت لە نائومێدی و بێ هیوایی، بە ڕادەیەك مەیلی ئەوە دەکەین بیکەینە کارێکی پێویست لەبەرئەوەی مرۆڤین. ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو نائومێدیانە ئەوا لەنێوان هەمووویاندا

خاڵێکی هاوبەش دەبینین. هەریەکەیان ڕەتکردنەوەیە بۆ یەکێك لە هیوا تایبەتەکانی منی باڵا تیاماندا. ئەگەر منی باڵا هیچ جۆرە هیوا و ئاواتێکی نەبێت، ئەوا هیچ بوارێکی نیە بۆ بێ هیوایی. لەوانەیە ئەمە وەکو چارەسەرکردنی ئازاری نەخۆشیەك بێت بە کوشتنی نەخۆشەکە! لەبەرئەوە پێویستە هەمان خاڵ ڕوونبکەینەوە بەچەند دەربڕینێکی پۆزەتیڤانەتر. . . لەبەرئەوە دەڵێین چی ڕودەدات ئەگەر گرنگی پێدانەکانی دەرونمان فراوان بوو هەتا خاڵێك کە تیایدا سەیرکردنی شانۆی ژیان نزیك دەبێتەوە بۆ جۆرە سەیرکردنێك بە چاوی یەزدانیەوە؟ ئەگەر هەموو شتێك تەماشاکرا بە دوربینی ئەزەلیەت، ئەو کات ڕازی دەبێت بە شکست هێنان بەوەی دیاردەیەکی تەواو سروشتیە لە درامایەکی مرۆیی گەورەدا، هەروەك سەرکەوتن؟ چونکە پێویستە لە درامای مرۆییدا بەڵێ و نەخێر، پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ، هەڵکشان و داکشان. . . هتد هەبێت. دواتر هیچ هۆکارێك لە شکستدا نابینێت بۆ خەم و خەفەت، هەروەك ئەکتەر غەمبار نابێت بەهۆی لەدەستدانی شتێك کە لە شانۆکەدا، وەك ڕۆڵی کەسێکی دۆڕاو کە پێی سپێردراوە. شکستهێنان چۆن دەبێتەهۆی نائومێدی ئەگەر مرۆڤ هەست بە دڵخۆشی بکات بە زاڵبوونی دوژمنەکەی بەسەریدا هەروەك خۆی سەرکەوتو بووبێت؟ دۆڕان چۆن مرۆڤ ئازار دەدات ئەگەر مرۆڤ چێژی وەرگرت بە سەرکەوتنی ڕکابەرەکەی بەسەریدا، بەهەمان ڕادەی چێژی بردنەوەی خۆی؟ ئەی خوێنەر لەبری ئەوەی هاوار بکەیت بە دەنگی بەرز ئەمە ئەستەمە ڕوودەدات! کەمێك سەرنجبدە لەگەڵم لەو جیاوازیە گەورەیەی لە ژیانماندا دەبێت لەم حاڵەتەدا و ئەو ژیانەی خەڵکی بەشێوەیەکی سروشتی بەسەری دەبەن، با باوەڕ بهێنین بە ڕودانی ئەم کارە چونکە ژیانی زۆربەی کەسە ڕۆحیە مەزنەکان لە جیهاندا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە و بەتەواوی بەرزبوونەتەوە بۆ ئەم ئاستە. ئایا دەکرێت تەنها گومانی ئەوە ببەین مەسیح دوڕوویی دەکرد کاتێك وتی: بەڕاستی پێتان دەڵێم، هەر شتێکتان کرد بەرامبەر بە یەکێك لە بچوکترین براکانم ئەوە بەرامبەر بە منتان کردوە[١٣]؟. دەگێڕنەوە جارێك ڕاما کریشنا: ((لە ئازاردا هاواریکرد کاتێك خاوەنی دوو بەلەمی بینی دەجەنگان. وا نیشانی دا ئەمە هەمووو خەمەکانی جیهانە، هەرچەندە ئەو بەڵایانە کوشندەبن تا ئەو ڕادەیەی دڵ لەت لەت بکەن. بەڵام دەیزانی تەنانەت ئەو ناکۆکیانەی دەبنەهۆی ململانێ لەنێوان مرۆڤەکاندا، هیچ نیە جگە لە چەند دیوێکی تری ئەو بەڵا و خەمانە، ئەوەی بەسەر هەمووو شتێکدا باڵادەستە خودی یەزدانە، پێویستە یەزدانمان خۆشبوێت لە هەمووو هەلومەرجە جیاوازەکاندا، هەرچەندە دژیەك و ناچونیەکیش بن، لە هەمووو شێوازەکانی بیرکردنەوەدا کە دەست دەگرێت بەسەر بوونی مرۆڤەکاندا و زۆربەی کات دەیانخاتە ناکۆکی و دوبەرەکیەوە))(٢). لەکاتێکدا لێکترازان ڕوودەدات لە دەرونی سنوردار یان چونەپاڵ ڕاستی و پابەندبوون پێوەی، دەکرێت وادابنێین ئەمە دوو دەربڕینی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤن، بەم جۆرە ژیان سەرکەوتو دەبێت بەسەر بێهیوایی و نائومێدیدا، هەروەك سەردەکەوێت بەسەر بێزاریدا، چونکە بینەری درامای گەردونی گەورەترە لەوەی ڕێگە بدات بە بێزاری ئەم بارەی لێ تێك بدات. دووهەمین کەموکوڕی ژیان نەزانینە. هیندۆسیەت دەڵێت لە توانامدایە ئەم کەموکوڕیە لابدەم. کتێبی ئۆپانیشادات دەدوێت لەبارەی جۆرێك لە زانینەوە کە زانیاری دەداتە مرۆڤ لەبارەی هەمووو شتێکەوە. ئەستەمە بزانین ئایا ئەمە بەو واتایە دێت کە دۆزینەوەیەك هەیە ئەگەر مرۆڤ پێی بگات، ئەوا بەتەواوی زانینێکی تێر و تەسەلە لەبارەی هەمووو

---

[١٣] ئاماچەکردن بە ئایەتی ٤٠ لە بەندی ٢٥ی ئینجیلی مەتا کە باس لە پەیوەندی مەسیح دەکات کە کۆیدەکاتەوە لەگەڵ هەموو مرۆڤێکی کەم دەرامەتدا: ((دواتر بەوانە دەڵێت کە باوەڕیان پێیەتی: وەرن ئەی ئەو کەسانەی باوکم پیرۆزی کردون ئەو موڵکە وەرگرن کە بۆتان ئامادەکراوە هەر لە سەرەتای بنیاتنانی جیهانەوە. چونکە کاتێك برسیم بوو خۆراکتان پێدام، کاتێك تینوم بوو ئاوتان دامێ، کاتێك بێ لانە و جێگە بووم جێگەتان پێدام، کاتێك بێ پۆشاك بووم داتانپۆشیم و کاتێك نەخۆش بووم یارمەتیتان دام، کاتێك زیندانی کرابووم سەردانتان کردم. ئەوانیش لەوەڵامدا پێی دەڵێن: ئەی یەزدان! کەی تۆمان بە برسیەتی دیوە و نانمان پێداویت یان تینوت بووبێت و ئاومان پێدابیت، کەی بێ جێگە بوویت و جێمان کردیتەوە یان بێ پۆشاك بیت و پۆشاکمان پێدابیت، کەی تۆمان بە نەخۆشی دیوە یان زیندانی هەتا بێینەلات؟ لە وەڵامدا پێیان دەڵێت: بەڕاستی پێتان دەڵێم، هەرکاتێك شتێکی لەو جۆرەتان ئەنجامدا بەرامبەر بە یەکێك لە براکانم ئەوا بۆ منتان کردوە)) ئینجیلی مەتا: ٢٥\٣٤-٤٠.

بوونەوەریکەوە. بەڵام باشتروایە ئەم دەستەواژەیە ئاماژەبکات بۆ جۆری ئەو ژێریە خۆرسکەی کە شانۆی گەردونی ڕوناکدەکاتەوە و نهێنیە گەورەکەی ئاشکرادەکات. بە بوونی ئەم تێڕوانینە تێکشکاوە بۆ شتە لاوەکیەکان، ئەوکاتە گرنگیدان بە شتە لاوەکیەکان هیچ مانایەکی نابێت، هەروەك گرنگیدان بە ژمارەی پەڵە شینەکان لە وێنەیەکی زەیتی بیکاسۆدا، یان گرنگیدان بە ژمارەی شەپۆلەکانی ژێر ژێیەك لە ژێکانی کۆرسێکی بیٚ وێنەی باخدا! ئەگەر دەرککرا بە ڕاستی ئیتر کیٚ گرنگی دەدات بە شتە لاوەکیەکان؟ ئایا زانینی ئەوەی لەپشت مرۆڤایەتیەوەیە بەردەستخراوە بۆ مرۆڤ؟ بەدڵنیاییەوە. . . سۆفیەکان لە ڕاپۆرتەکانیاندا هاوڕان لەسەر ئەمە بەڵام زانستی دەروونناسی ئەکادیمی جەخت ناکاتەوە لەسەر ئەم لایەنە. زۆرجار وادەردەکەوێت سەیری ئاڕاستەی پێچەوانە دەکات، بەڵام ئەویش بە هەمان شێوە باوەڕی وایە کە لە مێشکماندا بڕێکی زۆر لە زانیاری هەیە بەشێوەیەکی زۆر زیاتر لەوەی لەسەر ڕووەکەی دیارە. زانایانی دەروونناسی مێشکان دەچوێنن بە شاخە سەهۆڵینەکان کە بەسەر ڕووی دەریاکانەوەن، ئەوەی دەردەکەوێت تەنها بەشێکی زۆر کەمە لە قەبارە ڕاستەقینەکەی، بەڵام بەشە گەورەکەی نابینرێت چونکە لەژێر ئاوەکەدایە. چی لەو کیشوەرە فراوانەی ئەقڵدایە کە شاردراوەتەوە و ناوی دەبەین بە جیهانی پشت ئاگایی؟ بەبیرکردنەوەی هەندێکیان پشت ئاگایی هەمووو یادەوەریەك و ئەزمونێك لەناو خۆیدا دەپارێزێت کە مرۆڤ پێیدا تێپەڕدەبێت، ئەو هیچ شتێکی نەخستوەتە سەر ئەقڵی هەناوی. ئامانجی شیکاری دەرونی هیچ نیە جگەلە ڕوناکی خستنەسەر ئەو ناوچە فراوانانەی ئەقڵ کە شەفاف نین و نابینرێن تەنها ئەگەر لێیان نزیك نەبینەوە و چارەسەریان نەکەین بەشێوەیەکی تایبەت. وادابنیٚ ئێمە توانیمان بچینە نێو ئەو کیشوەرەوە کە کەوتۆتە ژێر ئاوەوە، ئەو کاتە کیٚ دەتوانێت پێشبینی ئەوە بکات ڕەهەندی زانینەکانمان سەر بە کام ڕابردووە؟!

سێیەمین کەموکوڕی ژیان بریتیە لە کۆتایی هاتنی، بۆئەوەی بتوانین ئەمە چارەسەر بکەین بەشێوەیەکی سودبەخش، پێویستە یەکەمجار بپرسین: چۆن سنوری خود دیاری دەکرێت؟ بەدڵنیاییەوە مەبەستمان لەبڕی ئەو بۆشاییە مادیە نیە کە جەستەمان داگیری دەکات، یان بڕی ئەو ئاوە نیە کە لادەدرێت لە حەوزی خۆشتن لەکاتێکدا دەچینە ناویەوە! کەواتە لۆژیکانەترە کە سنوری بوونی مرۆڤ بپێوین بەپێی بڕی قەبارەی ڕۆحەکەی (خود)، واتە بە بواری ئەو ڕاستیەی دەبینرێت ناسنامە ڕاستەقینەکەی دەنوێنێت. بۆ نمونە: ئەو مرۆڤەی ناسنامەی خودی خۆی دیاریدەکات بەوەی خێزانەکەیەتی، شادومانە بەهەمووو ئەو شتانەی دەرونی شادومان دەکەن، بەوجۆرە بوونێکی دەبێت بەپێی ئەو بڕە. ئەگەر مرۆڤ توانی ناسنامەکەی دیاری بکات بەوەی بەڕاستی مرۆڤایەتی، بوونەکەی فراوانتر دەبێت لەوەی پێشوتری. بەهەمان پێوەر ئەگەر مرۆڤ توانی ناسنامەی بوونی خۆی ببینێت، واتە بوون بەگشتی، ئەوکاتە بوونی مرۆڤ بیٚ سنور دەبێت. هێشتا ئەم قسەیە وادەردەکەوێت دووربێت لە ڕاستیەوە. کەواتە هەرچەندە مرۆڤ فراوان بوو لە دیاریکردنی ناسنامەکەیدا، ئەمە نابێتە ڕێگر لەنێوان ئەم و مەرگدا، لەو کاتەدا بوونی بەشێوەیەکی کتوپڕ دەپچڕێت و دەوەستێت. کەواتە بابەتی گرنگی پێدانی بەردەوام دەبێت بەڵام ئەوکاتە ڕۆیشتوە. بەپێی ئەمە پێویستە کێشەی بوون چارەسەر بکەین تەنها لەڕووی ناوەندەوە نا بەڵکو لەڕووی کاتەوە. ئەزمونی ڕۆژانەمان چەند بەڵگەیەکمان دەداتیٚ کە پاڵپشتی ئەم ئاڕاستەیە دەکات. هەمووو ساتێك لە ژیانماندا مردنێکە. منی باڵا لە ساتەوەختی ڕابردودا مردوە، بۆ هەتایە ناژی بەڵام وێڕای ئەو ڕاستیە ئەزمونی ژیانم هیچ نیە جگەلە ماتەمینیەك، هەست بەوە ناکەم لە هەمووو ساتێکدا بەڕاستی ئەمرم، چونکە دەرونم یەکسان ناکەم بە هیچ یەکێك لە ئەزمونەکانم. بەڵکو دەرونم بە جۆرێك دەبینم بەو ئەزمونانەدا تێپەڕدەبێت، یەك لەدوای یەك دەیانبینێت، بەبیٚ ئەوەی ناسنامەکەم دیاری بکەم و ڕاستی خۆم

ببینم، بە گشتی کام لەو ئەزمونانەم. هیندۆسیەت پاڵ بەم دەرکپێکردنەوە دەنێت بۆ دواوە بەرەو ئاستێکی تر. ئەمەش بوونی خود بە جۆرێك دادەنێت کە حەشاردراوە لەپشت ژیانی ئێستامەوە. ئەم بوونە جێگیرە و دەمێنێتەوە لەنێو هەمووو ئەزمونە تایبەتەکانمدا. دڵی منداڵێك تێکدەشکێت لە کۆمەڵە شتێکدا، ئێمە بە بێمانای دەزانین. ئەو دەرونی دیاری دەکات بەوەی هەمووو ڕوداوێك، بەبێ سەیرکردنی ڕوداوەکان تەنها وەك کۆمەڵە شتێکی نمایشکراو لە چوارچێوەی تەمەن و ژیانی ئاوەژوکراودایە بەگشتی. پێویستە منداڵ بەچەندین ئەزموندا تێپەڕبێت هەتا دووربکەوێتەوە لە دیاریکردنی ناسنامەکەی هەتا دەبێتە پیاوێکی تەواو. ئێمە بە بەراورد بە منداڵەکان بە تەواو دادەنرێین، بەڵام بە بەراورد بە قەشەکان بە منداڵ دادەنرێین. چونکە توانای هەریەکەمان بۆ بینینی دەرون بەگشتی بەپێی پەیوەندیە دروستەکانی و گرنگیەکەیەتی، زیاتر نیە لە توانای بینین لەلای منداڵێکی سێ ساڵان کاتێك بوکەشوشەکەی شکێندراوە!، چونکە هەمووو ئاگاییمان چڕکراوەتەوە لەسەر ماوەی ژیانی ئێستامان لەسەر زەوی. ئەگەر توانیمان گەورە ببین و پێبگەین بۆ زانینی ئەوەی بوونی گشتیمان زۆر فراوانترە لەوەی بیری لێدەکەینەوە، بەوەی دەبینین بوونمان بێسنورە و ناکۆتایە، ئەمە خاڵی بنەڕەتیە لە هەڵسەنگاندنی هیندۆسیەتدا بۆ ڕاستی بایەخی مرۆڤ. زانستی دەروناسی هاوچەرخ ڕایهێناوین لەسەر ئەو ڕاستیەی خودی خۆمان زۆر شت دەگرێتەخۆی زیاتر لەوەی دەیزانین. ئەقڵی مرۆڤ لە ئێستادا هەروەك زەوی پێش سەد ساڵ چەندین شوێنی گرتوەتەخۆی کە هێشتا مرۆڤ نەیدۆزیوەتەوە، هێشتا چەندین شتی نەزانراوی تیایە وەك شوێنە نەزانراوەکانی ئەفەریقا و دارستانەکانی دورگەی بورینو و گۆمەکانی ئەمازۆن. دروستە بەشی هەرە زۆری مێشکمان هێشتا چاوەڕێی ئەوەیە بدۆزرێتەوە. لە هیندۆسیەتدا ئەقڵ شاردراوەتەوە هەتا بگات بە ناکۆتا بەڵام جیهانە سنوردارەکان لە بوونیدا ناکۆتایە لە زانینیدا چونکە بوونی نیە لەبنەڕەتدا، شتێك لەدەرەوەیدا چاوەڕێی ئەوەیە کە بناسرێتەوە، ناکۆتایە لە شادومانیەکەیدا، چونکە هیچ شتێکی دەرەکی ناتوانێت بچێتە ناوی بۆئەوەی ئارامیەکەی لێ بشێوێنێت. ئەدەبیاتی هیندی چەندین پەندی لەخۆگرتوە کە ئامانجی چاوکراوەییمانە بۆ سەر ئەو بوونە ناکۆتایە، کە شاردراوەتەوە لە قووڵاییەکانی هەمووو ژیاندا. ئێمە وەك ئەو پادشایەین کەتوشی لەبیرچونەوە بووە و بە جلوبەرگێکی دڕاوەوە بە کیشوەرەکەیدا دێت و دەچێت بەبێ ئەوەی ڕاستی خۆی بزانێت. ئێمە وەك ئەو بێچوە شێرەین دایکی لەدەستداوە لەدوای لەدایکبوونی، بە ڕێکەوت گەورە بووە لەگەڵ کۆمەڵە مەڕێکدا، ئیتر وای لێهات لەگەڵیان گیای دەخوارد و دەیباڕاند، وای دەزانی ئەویش مەڕێکە وەك ئەوانی تر. ئێمە وەك ئەو دڵدارەین کەلە خەویدا بە جیهاندا دەگەڕێت بەدوای خۆشەویستەکەیدا بەبێئەوەی بیدۆزێتەوە، لەبیری چوە کەلەپاڵیدا ڕاکشاوە!. بەهەر جۆرێك بێت، تەنها تێپەڕبوون بە ئەزمونی پراکتیکیدا دەتوانێت ئاگایی و دەرککردن بە ڕاستی بوونمان پێببەخشێت. هەروەك ناتوانین باس لە هەڵهاتنی خۆر بکەین بۆ کەسێکی نابینا بە هەمان شێوە ناتوانین ئەو دەرك پێکردنە باس بکەین بۆ کەسێك کە تێپەڕنەبووبێت بەو ئەزمونە ڕۆحیەدا. بەڵام ژیانی ئەوانەی گەیشتون بەو دەرکپێکردنە چەند کلیلێکی گرنگمان پێدەدات بۆ تێگەیشتن لەو ڕاستیە. ئەوان چەند کەسێکی لێوانلێون لە دانایی و ژیری، هێزی کەسایەتی و شادومانیان زۆر زیاترە لەوانی تر، ئەوان سەربەخۆ دەردەکەون، بەو واتایە نا کە هەمیشە هەڵدەسن بە تێکشکاندنی یاساکانی سروشت، بەڵام سەربەخۆن بەو واتایەی هەرگیز شتێك نادۆزنەوە کە نائومێدکەر بێت بۆیان لە سیستمی سروشتی ژیاندا. لەبەرئەوە هیچ شتێك ناتوانێت بیانکاتە کۆیلەی خۆی، هیچ شتێك ناتوانێت ئارامیان لێ بشێوێنێت کە تیایدا دەژین. ئەوان وا هەست دەکەن کە پێویستیان بەهیچ شتێك نیە، هەرگیز هەست بە نائومێدی ناکەن و ناترسن، هۆکارێك نابینن بۆ ململانێ و

**دڵتەنگی. ئەوان هەمیشە دڵخۆش دەردەکەون. تێکەڵ بوون لەگەڵیاندا هێزمان پێدەبەخشێت و هاندەرمانە بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانمان.**

## چوار ڕێگا بۆ بەدیهێنانی ئامانج

کەواتە هەموومان لەسەر ڕۆخی زەریایەکی بێسنورین لە هێزی داهێنەری ژیان. هەموومان لەناو خۆماندا هەڵمانگرتون: هێزی شکۆدار، دانایی تەواو، شادومانی نەبڕاوە، ناتوانێت توشی نائومێدی ببێت یان تێکبشکێت، بەڵام لە قووڵاییەکاندا شاردراوەتەوە، ئەمە ژیان دەکاتە کێشە. ناکۆتایە لە قووڵاییەکاندا، لە تاریکترین و قووڵترین ژێرزەمینی بوونمادا و لەو چاڵە قووڵەدا لەبیرکراوە. چی ڕودەدات ئەگەر بەبێ وەستان ئەو ناکۆتایە سەرلەنوێ بدۆزینەوە و لێی ڕابکێشین ؟. خودی ئەم پرسیارە بەربەستی هیندە و سەرقاڵی کردوە. نەتەوەکەی داوای ئایینی کردوە تەنها لەبەر زۆرکردنی خەزێنەی زانیاریەکانیان نا، بەڵکو داواکردنی ئایین وەك بەرنامە و ڕێگایەك کە ڕێنمونی دەکات بۆ حاڵەتێکی شکۆدارتر. چونکە هیندۆسی باوەڕدار ئەو کەسەیە هەوڵدەدات بۆ گۆڕینی سروشتی خۆی، کاردەکات لەسەر دوبارە بنیادنانەوەی خودی خۆی بۆئەوەی ببێتە مرۆڤێکی بەهێز، دەکرێت ناکۆتا لەڕێگەیەوە تیشکبداتەوە بەبێ ئەوەی ڕوبەڕوی بەربەستی زۆر ببێتەوە. یەکێکیان هەست دەکات بە پێداگریکردنی ئەم هەوڵە کە بەزۆری چاومان پێی دەکەوێت لە دەقەکانی هیندۆسیەتدا بە چەند دەستەواژەیەکی جۆراوجۆرەوە، هەروەك ئەو مرۆڤەی لەسەر سەری بارێك داری پێیە و ئاگری تێبەربووە، لەبەرئەوە ڕادەکات بەرەو نزیکترین گۆمی ئاو بۆئەوەی ئەو ئاگرە بکوژێنێتەوە، بە هەمان شێوە وەك ئەو کەسەی بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت، ئەو کەسەی ئازارە سوتێنەرەکانی ئاگری ژیانی چەشتوە لەم جیهانەدا، لەدایکبوون، مردن، بێ مانایی ژیان، فریودانی خود، ڕادەکات بەرەو مامۆستایەك بۆئەوەی شتە گرنگەکانی ژیانی فێربکات. هەموو ئاڕاستەکانی هیندۆسیەت کە پەیوەندیان هەیە بۆ چالاککردن و بەدیهێنانی سروشتی تەواوی مرۆڤ کۆدەبنەوە لەژێر یەك ناونیشاندا ئەویش یۆگایە yoga. لەلای ڕۆژئاوا یۆگا وشەیەکی سەیر نیە، چونکە هەموویان بیستویانە و وێنەی ئەو کەسانەیان بینیوە ئەنجامی دەدەن. ئەم وشەیە پێکهاتوە لە چاوگێك کە هەمان چاوگی ئینگلیزی فەرمانی to yake ی هەیە، ئەمە فەرمانێکە دوو واتای هەیە، یەکەمیان واتە یەکی خست to unite together و دووەمیان خستیە ژێر مەشقێکی تایبەتەوە. to bring under the yoke هەردو واتاکە بوونیان هەیە لە بنەڕەتی سنسکریتی وشەکەدا. بەپێی ئەمە پێناسەی گشتی یۆگا بریتیە لە بەرنامەیەك یان ڕێگای ڕاهێنانێك، ئامانجی ڕێنیشاندانی مرۆڤە بەرەو تەواوبوون یان یەکگرتن بەڵام تەواوبوونی چی؟. هەندێك کەس بەشێوەیەکی سەرەکی گرنگی دەدەن بە ڕێکوپێکی جەستەیان. بێ گومان هاوشێوەیان هەیە لە هیند، ئەو هیندیانەی گرنگی پێدانیان چڕکردوەتەوە لەسەر کۆنترۆڵکردنی جەستەیان. هیند بەدرێژایی سەدەکان گرنگیان داوە بە سەیرترین خوێندنگای ڕۆشنبیری جەستە کە مرۆڤایەتی ناسیویەتی(٣). ئەمە بەو مانایە نایەت هیند گرنگی زیاتری داوە بە جەستە بەبەراورد بە ڕۆژئاوا، بەڵکو مەبەست لەمە ئەوەیە گرنگیپێدانی هیند بە جەستە ڕێچکەیەکی تری گرتوەتەبەر. چونکە لەکاتێکدا ڕۆژئاوا گرنگیداوە بە پەرەپێدانی هێزی جەستە و جوانیەکەی، هیند گرنگیداوە بە ڕێکخستنی جەستە و دەست بەسەراگرتنی، لە حاڵەتێکی نمونەییدا دەستبەسەراگرتنی تەواو بەسەر هەریەکە لە ئەرکەکانی جەستەدا. چەند بانگەشە لە بانگەشەکانی هیندۆس لەم بوارەدا دەکرێت پاڵپشتی لێبکرێت و بەشێوەیەکی زانستی بسەلمێنرێت؟ ئەمە کارێکە پێویستی بە توێژینەوە هەیە. تەنها ئەوەندە بەسە لێرەدا ئاماژە بکەین بۆئەوەی تەنانەت کەسێکی بە ئەزمونی وەك جولیان هوکسلی julian huxley ناچاربوو بوێرانە بڵێت ((وادەردەکەوێت هیند هەندێك شتی دۆزیوەتەوە کە دەتوانێت والە جەستە بکات بتوانێت بەوە هەستێت کە هێشتا ڕۆژئاوا هیچی لەبارەوە نازانێت)). ئەم ڕێنماییە جەستەییانە هەستێکی سروشتیە یۆگای بنەڕەتی پێکدێنێت کە بریتیەلە یۆگای هاتها

hatha yoga واتە یۆگای هێز. ئەمجۆرە یۆگایە ئەنجام دەدرا وەك ڕێخۆشكەرێك بۆ یۆگای ڕۆحی، بەڵام فراوان بوو ئەم پەیوەندیەی لەدەستدا، لەبەرئەوە جێگای گرنگیپێدانمان نیە لێرەدا. بیركردنەوەی دانایانی هیند لەم بوارەدا دەكرێت هەمان بیركردنەوەی ئێمە بێت: ئەوان بە مرۆڤ دەڵێن: بەڵێ، دەكرێت جەستەت هەستێت بە چەند كارێكی سەرسامكەر، ئەگەر ئەمە ئەو شتە بێت گرنگە بەلاتەوە و دەتەوێت ژیانت تەرخان بكەیت بۆ گەیشتن پێی. بەڵام ئەم شتانە گرنگیەكیان نیە كە شایەنی باسكردن بێت لەبابەتی ڕوناكبوونەوەی هەناویدا، بەڵكو لەڕاستیدا، ئەگەر ئامانجت پەرەپێدانی توانا جەستەییەكانت بێت بۆ خۆدەرخست و شانازی كردن پێوەی، ئەوا ئەو دەستبەسەراگرتنە سەیرە لەسەر جەستەت شانازی پێوەكردنێكت دەداتێ زیانێكی ئاشكرای هەیە لەسەر شكۆداری ڕۆحیت. ئەو یۆگایەی گرنگە بەلامانەوە بریتیە لەو یۆگایەی ئامانجی بەدەستهێنانی یەكگرتنی ڕۆحی مرۆڤە لەگەڵ یەزداندا لە قووڵترین جێگاكانی ڕۆحدا. ((لەكاتێكدا هەموو ڕاهێنانەكان و وەرزشە ڕۆحیەكانی هیند بەشێوەیەكی هەتەری تەرخانكراوە بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەبەستە، لەبەرئەوە دەكرێت سەیری بكەین بەوەی یەكێك لە گرنگترین بیركردنەوە زانستیەكان دەگرێتەخۆی، كە ئەقڵی مرۆیی خستیە قالبێكی پراكتیكیەوە))(٤). چۆن دەگەین بە براهمان و پەیوەندیمان پێوەی دەمێنێتەوە؟ چۆن یەكدەگرین لەگەڵ براهمان و تیایدا دەژین؟ چۆن شكۆدار دەبین لەكاتێكدا هێشتا لەسەر زەوین؟ چۆن دەگۆڕێین، سەرلەنوێ لەدایكدەبینەوە لەدایكبوونێكی ئەڵماسی پتەو وێڕای ئەوەی هێشتا خاك و خۆڵین لەسەر ڕووی زەوی؟ ئەمە گەڕانی ڕۆحی مرۆڤە لە هیند بە درێژایی نەوەكان. ئەو ڕێگا ڕۆحیانەی هیند دۆزیەوە و كردیەوە بۆ مرۆڤ بەرەو ئەم ئامانجە، چوار ڕێگان. لەوانەیە ئەمە بۆ یەكەمجار لەناكاو دەربكەوێت. چونكە ئەگەر تاكە ئامانجێك بووایە، ئایا نەدەكرا ڕێگای ڕۆیشتن بۆی تاكە ڕێگاكەیەك بێت؟! بەڵێ ئەمە دروستە، ئەگەر هەموومان لەیەك خاڵەوە دەستپێبكەین، ئەمە وێڕای ئەوەی هاوشێوەی ئەم بەئەگەردانانە لەوانەیە ببێتەهۆی بەكارهێنانی كەرەستە جیاوازەكانی وەك بەپێ ڕۆیشتن و سواربوونی كەشتی و فڕۆكە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە كۆمەڵە كەسێكن نزیكدەبنەوە لەو ئامانجە لە چەند ئاڕاستیەكی جیاوازەوە، خاڵەكانی دەستپێكردنیان دیارە داوادەكات لە شوێنكەوتوانی چەند ڕێگایەكی جیاواز بگرنەبەر ئەگەر ویستیان بگەن بە هەمان لوتكە. سروشتی هەموو مرۆڤێك خاڵی دەستپێكردنی تایبەت بەخۆی دیاری دەكات. مەبەست لە سروشتی مرۆڤ پێكهاتەیەكی تایبەتە بۆ لێهاتویی و شێوازی هەڵسوكەوتكردنی و هیوا و ئاواتەكانی كە هەموویان بەسەریەكەوە كەسایەتی ئەو مرۆڤە پێكدێنێت. لەڕاستیدا بیرۆكەی بوونی چەندین ڕێگای جیاواز بەرەو یەزدان بەپێی بوونی چەند شێوازێكی جیاواز لە مرۆڤ بیرۆكەیەكی ناسراوە بەباشی لەنێو سەركردە ڕۆحیەكانی ڕۆژئاوادا. قەشە سورین surin لە كورتە ئایینیەكەیدا نوسیویەتی: ((چەند سەرۆكێكی ڕۆحین بیرۆكەیەك دەخەنە مێشكیانەوە زۆر بیری لێدەكەنەوە، دواتر جێبەجێی دەكەن لەسەر هەموو ئەو ڕۆحانەی دێنە لایان، وابیردەكەنەوە سەركەوتنێكی مەزن بەدەست دەهێنن ئەگەر سەركەوتن بەوجۆرەی هەموویان لەسەر ئەو هێڵە دەڕۆن كە كێشاویانە. دواتر ئامانجێكی تریان نابێت جگەلە جێبەجێكردنی ئەوەی وێنایان كردوە، ئەوانە وەكو ئەو مرۆڤەن كە ئارەزو دەكات هەموو خەڵك وەك ئەو جلوبەرگ لەبەردەكەن!)). قەشە یۆحەنای خاچ st. john of the cross ئاماژەی كرد بۆ هەمان خاڵ لە كتێبەكەیدا گڕە زیندوەكە the living flame لەكاتێكدا وتی: ((پێویست ناكات ئامانجی ڕێنمونیكەری ڕۆحی ڕابەرایەتی ڕۆحەكان بێت بەرەو یەزدان بە چەند ڕێگایەك كە لەگەڵ ڕێنمونیكەرەكەدا بگونجێت بەڵكو پێویستە لەسەری خۆڕاگر بێت لە ڕێگاكەیدا بەرەو یەزدان. )). ئەو شتەی هیندۆسیەتی پێ جیادەكرێتەوە بریتیەلە وردی و بڕی ئەو ئاگاییەی داویەتی بە پڕۆسەی ناسینەوەی ڕێگا

جۆراوجۆرەکان بۆ هەڵسوکەوتی مرۆڤ و دیاریکردنی ئەم ڕێگایانە. بەپێی شیکاری هیندۆسی، بەشێوەیەکی گشتی چوار جۆر مرۆڤ هەن: هەندێك لە خەڵك ئەقڵانین بەشێوەیەکی بنەڕەتی. ئەوانی تر بەپلەی یەکەم ئەڤینن. هەندێکی تریان لەبنەڕەتدا کەسانی کردارین. دواجار هەندێك لە خەڵك دەناسرێنەوە بەوەی ئەزمونین. بۆ هەریەکەیان جۆرێك لە یۆگا هەیە دانراوە بۆ وەبەرهێنانی بەهرە تایبەتەکان کە بوونی هەیە لەلای تاکەکانی کۆمەڵگە. هەریەکە لە چوار ڕێگاکە بە چەند ڕێ خۆشکەرێکی ئاکاری پێویست دەستپێدەکات، سەیر نیە لەکاتێکدا ئامانجی هەمووان گۆڕینی ڕووکاری دەروون بێت بۆ ئەوەی ڕوون و شەفاف بێت بۆئەوەی ڕێگا بدات بە هەڵاتنی خودایی کە شاردراوەتەوە لە قووڵاییەکانیدا، پێویست بوو دەروون پاکبکرێتەوە لە کەمومکوڕی و ئاکارە پیسەکانی. گومانی تیا نیە ئایین هەمیشە کورت ناکرێتەوە لەسەر ڕێنماییە ئاکاریەکان، بەڵام کاتێك دەیەوێت ڕاشکاویەکەی بنیادبنێت پێویستە لەسەر زەمینەیەکی ئاکاری پتەو بێت. خودپەرستی دەرونی کۆتادار بەهێز دەکات، خوو ڕەوشتە ناشیرینەکان، ئەقڵ و جەستە دەهێڵێتەوە لە حاڵەتی بیرکردنەوە و دڵەڕاوکێدا، لەبەرئەوە یەکەمین هەنگاوی هەریەکە لە چوار یۆگاکە پێویستی گەڕانەوەی خوێنکارە بۆ خووڕەوشتە جوانەکانی وەك: ئازارنەدانی خەڵك، ڕاستگۆیی، دزی نەکردن، دەستگرتن بەسەر خوددا، پاك و بێگەردی، خۆشنوودی، ئارەزوی گەیشتن بە ئامانجەکە. ئەگەر پێویستی ئەم هەنگاوە ئاکاریەمان پاراست لە مێشکماندا لە هەریەکە لە چوار جۆرە یۆگاکەدا، ئەوکاتە ئامادەین بۆ ناسینەوەی تایبەتمەندیە جیاکەرەوەکانی هەربەکەیان.

## ڕێگای چوون بەرەو یەزدان بە زانست

یۆگای زانست جنانا یۆگا jnana yoga تایبەتە بە داواکارە ڕۆحیەکان، ئەوانەی ئامادەکاری ئەقڵی و توانایەکی ئەقڵی بەهێزیان هەیە، ئەمە ڕێگای یەکگرتنی یەزدانیە لەڕێگەی زانینەوە. چەند کەسێکی فەلسەفی هەن بە سروشت و ڕەفتاریان، بیرۆکەکان لەلای ئەوان گرنگیەکی لەڕادەبەدەریان هەیە. ئەگەر باوەڕیان هێنا بە شتێك ئەوا کاریگەریەکی دیاری دەبێت لە ژیانیاندا، واتە ژیانیان هەمیشە ئەو ڕێگایە دەگرێتەبەر کە ئەقڵیان ڕێنمونیکەرە بۆی. سوکرات و بوزا دوو نمونەی باشن بۆ ئەم جۆرە لە خەڵك. ئەو کەسانەی ئەم جۆرە ئامادەکاریەیان تیایە، هیندۆسیەت پێشنیازیان بۆ دەکات هەستن بە ئەنجامدانی چەند سەرنجدانێکی فیکری کە ئامانج لێیان باوەڕهێنانی ڕوناکبیرە بەوەی کە دەرونی لەوە گەورەترە سنوردار بکرێت. تەنها بە باوەڕهێنانی کەسەکە بەو جۆرە ڕاستیە ئەوا گرنگیدانی دەگوازێتەوە بەرەو چەند ڕەهەندێکی قووڵتر بۆ بوونی. ئامانجی ئەم یۆگایە لەتکردنی جیهانی نەزانینە بە شمشێری جیاکاری. ئەوەی پێویستە بریتیە لە توانای جیاکاری لەنێوان دەروونی ڕوکاری کە بوونمان لێوانلێو دەکات، دەرونی فراوانتر کە لە پشتیەوە شاردراوەتەوە. ئەو ڕێگایەی ڕێنمونیمان دەکات بەرەو ئەم توانایە پێکدێت لە سێ هەنگاو:

هەنگاوی یەکەم: گوێگرتن. لێرەدا لەڕێگەی گوێگرتن لە داناکان و کتێبە پیرۆزەکان و توێژینەوە فەلسەفیەکانەوە شوێنکەوتو بیردۆزە بنەڕەتیەکان دەناسێتەوە کە زۆرینەی خەڵك هیچیان لەبارەوە نازانێت، جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی لە ناوەندی بوونیدا کانگایەك هەیە لە بوونی ناکۆتا کە هەرگیز بێ هیوا نابێت.

هەنگاوی دووەم: بیرکردنەوە. لەڕێگەی بیرکردنەوەی ئەقڵی دورو درێژەوە، ئەو بیرۆکەیەی لە هەنگاوی یەکەمدا تەنها بیردۆزێك بوو دەبێتە تایبەتمەندی ژیانیان. ئاتمان لە چەمکێکی بێماناوە دەگۆڕێت بۆ ڕاستی. چەندین هێڵ لەبیرکردنەوەی ئەقڵی هەن کە پێشنیاز دەکرێن لەم بوارەدا. بۆ نمونە، کەسی شوێنکەوتو ئامۆژگاری دەکرێت کە ئەو زمانە بپشکنێت کە هەمووو ڕۆژێك بە کاری دەهێنێت و سەرنج بداتە ئەو واتایانەی هەڵیدەگرێت. ڕاناوی خاوەنداری م جگەلە واتای خاوەنداری تایبەتمەندیەکی جیاکراوەی هەیە لە خاوەنی ڕاناوەکە، واتە خاوەن، شتی خاوەندار. واتە کاتێك دەدوێم لەبارەی کتێبەکەمەوە یان جاکێتەکەم ئەوا بواری بیرکردنەوە نیە بەوەی من ببمە کتێبەکە یان جاکێتەکە. دواتر کاتێك دەدوێم لەبارەی جەستە و ئەقڵمەوە و لەبارەی کەسایەتیەکەمەوە، ئەوا بەو واتایە دێت خودی شتێکی ترە بەتەواوی جودایە لێی. کەواتە منی باڵا چیە، کە جەستەم و ئەقڵم موڵکی ئەوە، بەڵام ناکرێت ببێتە خودی جەستە و ئەقڵ؟؟. هەروەك بەتێپەڕبوونی تەمەنم ئەقڵ و جەستەم گۆڕانی ڕیشەیی بەسەردا دێت، بەڵام لەگەڵ ئەم هەمووو چاککردنەدا من لە ئاستێکی دیاریکراودا هەمان کەسم. ئەو کەسەی خاوەنی ئەم جەستیە بوو لە یەکێك لە سەردەمەکاندا، هەر هەمان کەسە کە جەستەیەکی جیاوازی هەیە لە ئێستادا، ئەو کەسەی جاران گەنج بوو، هەر هەمان کەسە ئێستا پیر و لاواز بووە. کەواتە ئەو شتە چیە لە بوونماندا کە قووڵترە لە جەستە و کەسایەتی، ئەوەی باوەڕی بە بەردەوام بوونی هەمان کەس هەیە لەنێو ئەم گۆڕانەی کە وەستانی نیە؟؟ ڕاپۆرتێکی تر: وشەی کەسایەتی personality لە وشە لاتینیەکەوە وەرگیراوە persona کە بە مانای ئەو دەمامکە دێت و دەدرێتە ئەکتەر کاتێك دەچێتە سەر تەختەی شانۆ بۆئەوەی بە ڕۆڵەکەی هەستێت، واتە ئەو دەمامکەی بەهۆیەوە per ڕۆڵی sonat ڕادەگەیەنرێت لە شانۆگەریەکەدا. ئەم دەمامکە ڕۆڵێك هەڵدەگرێت کە ئەکتەر لەپشتیەوە خۆی حەشارداوە، نەناسراوە و دابڕاوە لەو هەڵچون و هەستانەی دەیانوێنێت. هیندۆسیەت دەڵێت ئەمە نمونەییە، ئەمە تەواوی ئەو شتەیە کە کەسایەتیمان دەینوێنێت. ئەو ڕۆڵانەیە کە دابەشکراوە بەسەرماندا لە گەورەترین شانۆگەریەکاندا، شانۆگەری

ژیانی خەمناك كە تیایدا ڕۆڵی نوسەر و ئەكتەر پێكەوە دەبینیت، بەشێوەیەكی هاوسەنگ. هەروەك ئەكتەری باش ئەو كەسەیە كە ڕۆڵی خۆی دەبینێت بەباشترین شێوە، لەبەرئەوە پێویستە ئێمە بە هەمان شێوە ڕۆڵی خۆمان ببینین بە باشترین شێوە. بەڵام لێرەدا ڕاستیەكی هەراسانكەر هەیە ئەویش بریتیە لەوەی ئێمە توانای جیاكردنەوەمان لەدەستداوە لەنێوان خودی ڕاستەقینە و دەمامكی كەسایەتیدا كە ئێستا بەكاریدەهێنێت، ئەو دەمامكەی بەم زوانە لادەدرێت كاتێك شانۆگەریەكە كۆتایی دێت. بەشێوەیەكی تەواو كەوتوینەتە نێو دوڕوویی سیناریۆكەی ئێستاوە بە ڕادەیەك ناتوانین بیربكەینەوە لە ڕۆڵەكانی پێشوو كە بینیومانن و هەروەها ناتوانین پێشبینی ڕۆڵەكانی داهاتوو بكەین. ئیشی یۆگیكار بریتیە لە ڕاستكردنەوەی ئەو وێناكردنە هەڵەیەی مرۆڤ لەبارەی خۆیەوە و لەبارەی ناسنامە ڕاستەقینەكەیەوە. ئەگەر شوێنكەوتو ویستی ئاگایی خۆی بخاتە سەر هەناوی پێویستە چەندین چینی كەسایەتی دەرەكی ببڕێت كە لە ژماردن نایەن، لەدوای ئەوەی هەموو چینەكانی دەمامكەكە دەبڕێت لە كۆتاییدا دەگات بە ئەو ئەكتەرە نەناسراوەی بەشێوەیەكی سەیر لە بیركردراوە. دەكرێت ئەم جیاكردنەوەیە ڕوونبكەینەوە لەنێوان دەروونی گشتگیری ڕاستەقینە و دەروونی ڕوكاریدا، بە وێنەیەكی تر: وێناكردنی كەسێك یاری شەترەنج دەكات. تەختەی شەترەنجەكە جیهانەكەیەتی. چەند بەردێك هەیە پێویستە بجوڵێنرێت، چەند پیاوێك یاریەكە دەبەنەوە و ئەوانی تر دەیدۆڕێنن، لێرەدا ئامانجێك هەیە پێویستە پێی بگەین. یاریەكە نەك خودی یاریزانێك لەوانەیە براوە بێت یان دۆڕاوبێت، لەوانەیە بەردەكانی یاریزانێك بخورێن یەكلەدوای یەك، بەڵام كاتێك یاری دەكات بەوپەری توانایەوە ئەوا شارەزاییەكەی زیاتر كردوە. لەڕاستیدا لەوانەیە سود وەربگرێت لەو دۆڕانە، زیاتر لەو سودەی بەدەستی دەهێنێت لە بردنەوەدا. ئەم پەیوەندیە ئاڵوگۆڕكراوە لەنێوان یاریزان و دەرونی مرۆڤ و كەسایەتیە گشتگیرەكەیدا، بەتەواوی وەكو پەیوەندی نێوان دەرونی كۆتاداری هەر ژیانێك یان تەمەنێكی تایەت یان ئاتمانە atman. هەندێكجار یۆگیكار ئامۆژگاری دەكرێت بە وازهێنان لە بەڵگە، گۆڕینی ئاڕاستەی ئەقڵی بەرەو پەند و ئامۆژگاریەكان. یەكێك لەو پەندانە كەلە ئۆپانیشاداتدا باسكراوە بەهەمانشێوە بە ڕێكەوتێكی سەیر لەلای ئەفلاتونیش باسكراوە. سوارڕەوی عەرەبانەیەك بەبێدەنگی دادەنیشێت لە عەرەبانەكەیدا بەبێ ئەوەی عەرەبانەكەی بجوڵێنێت. كاتێك كارێكی پێسپێردرا توانی دانیشێت لەپشت عەرەبانەكەیدا بە سەربەخۆیی، هەموو ئاگاییەكی چڕكردبوویەوە لەسەر ئەو دیمەنانەی بەبەردەمیاندا تێدەپەڕی. ئەم وێنەیە بەگشتی واتای ژیان دەبەخشێت. جەستە عەرەبانەكەیە و ئەو ڕێگایەی كە عەرەبانەكەی پیادا دەڕوات شتە دەرك پێكراوەكانە لەلایەن هەستەكانەوە و ئەو ئەسپانەی كە عەرەبانەكە ڕادەكێشن بەسەر ڕێگاكەدا خودی هەستەكانە و ئەو ئەقڵەی دەست دەگرێت بەسەر هەستەكاندا لەكاتێكدا ڕێكخراون لغاوی ئەسپەكانە كە عەرەبانەكە ڕادەكێشن و هێزی خواست و ویست كە ئەقڵ خاوەنیەتی سوارڕەوەكەیە، خاوەنی عەرەبانەكە كە لەپشتەوە دانیشتوە و دەسەڵاتی تەواوی هەیە بریتیە لە دەرونی زانا بە هەموو شتێك omniscient. ئەگەر یۆگیكار شارەزا و لێهاتو بێت، ئەوا ئەم جۆرە بیركردنەوانەی لەلا دروست دەبێت لەكاتی داواكراودا، دەبێتە هەستپێكردنێكی زیندو بە دەرون كەلە پشت كەسایەتی ڕوكاریەوەیە، لە مێشكیدا بەتەواوی جیاوازی نێوان هەردو كەسایەتیەكەی بۆ ڕووندەبێتەوە كە وابەستەن بەیەكەوە، وەك پەیوەندی نێوان ئاو و زەیت نەك پەیوەندی شیر و ئاو هەروەك لە ڕابردودا هەبووە[14]. لەوكاتەدا لەوانەیە ئامادەبێت بۆ هەنگاوی سێیەم كە بریتیە لە گواستنەوە و لە دیاریكردنی ناسنامەكەیدا

[14] ئەوەی نوسەر دەیەوێت بیگەیەنێت بریتیەلەوەی كەسی یۆگیكار دەتوانێت دەرونی هەناوی و دەرونی ڕوكاری لەیەكتر جیابكاتەوە، هەروەك زەیت جیادەبێتەوە لە ئاو و دەكەوێتە بەشی سەرەوەی قاپێكەوە كاتێك دەمانەوەێت تێكەڵ بەیەكتریان بكەین، بەڵام لە پێشودا هەردو كەسایەتیەكە تێكەڵ بوون لە بیركردنەوەیدا هەروەكگ تێكەڵبوونی ئاو لەگەڵ شیردا

بەوەی بەشێکی فەنا بووە بۆ ناسینەوەی و بەوەی ڕاستی بەشێکی ئەزەلیە لە بوونیدا. بەدڵنیاییەوە ئەو ڕێگایەی ڕاستەوخۆ بەکاردێت بۆ هەستان بەو کارە: بیرکردنەوەیە بە قووڵترین شێوە بەوەی ناسنامە ڕاستەقینەکەی بریتیە لە ڕۆحی ئەزەلی، هەوڵدەدات بۆئەوەی بەهەمان شێوە خۆی ببینێت تەنانەت کاتێك بە کارەکانی ڕۆژانەی هەڵدەسێت. بەدڵنیاییەوە ئەمە کارێکی ئاسان نیە بەڵکو هونەرێکی ناوازەیە و پێویستی بە شارەزایی و وردەکاری لەڕادەبەدەرە. یەکەمین شت کە شوێنکەوتو پێویستی پێیەتی بریتیە لە زەمینەیەك بۆئەوەی ناسنامە ڕاستەقینەکەی و جەستە و کەسایەتیەکەی پێکەوە کۆبکاتەوە. ڕێگای چالاك بۆ هەستان بەم کارە بریتیە لەوەی بیربکاتەوە لە دەرونە کۆتادارەکەی وەك کەسی ڕاناوی سێیەمی نادیار. بۆنمونە ئەگەر یۆگیکار ڕۆیشت بە شەقامێکدا، لەبری ئەوەی بڵێت من ئەڕۆم، پێویستە بەخۆی بڵێت فڵانە کەس دەڕوات لە شەقامی فڵاندا، پێویستە هەوڵبدات بۆئەوەی بەجۆرێك سەیری خۆی بکات وەك بینینێك لەدورەوە. ئایا کڕیار بێت یان فەرمانبەرێك، پێویستە مامەڵەکردنی لەگەڵ هەمووو ئەزمونەکاندا بەبێ شەپۆلدان بێت. من گەواهیدەرم و ئەو تێبینیەی مێژوە نادیارەکەی دەکات بە جودابوونەوەیەکی بێدەنگ، هەروەك کەسێك ڕێگە بدات با قژی بڵاو بکاتەوە. هەروەك چرا گرنگی بە ڕوناککردنەوەی ژورێك دەدات بۆئەوەی بزانێت چی تیادا ڕوودەدات، بەهەمان شێوە گەواهیدەر، سەیری ئەوە دەکات ڕوودەدات لە ماڵی پرۆتۆپلازمادا، یان سەیری ئەوە دەکات دەمامکدارەکە ئەنجامی دەدات لەسەر تەختەی شانۆکە. بەوپەڕی سادەییەوە ڕێگە دەدات بەو کەسە کە کەسی ڕاناوی سێیەمە، بە بەردەوامبوونی پرۆسەکەی بەشێوەیەکی نمایشتکراو. تەنانەت لەحاڵەتی نەجوڵاندا، پێویستە هەستی پێ بکات وەك شتێکی جودا نەك وەك بەشێك لە دەرونی ڕاستەقینەی کە ناکۆتایە. بەهەمان شێوە بۆ ئازار پێویستە لەسەری، تەنانەت لەکاتێکدا دادەنیشێت لەسەر کورسی پزیشکی ددان، تەنها وەکو بینەرێك بێت، بەخۆی بڵێت ئەو کەسەی دانیشتوە داماوە، زۆر ئازار دەچێژێت، کێشە نیە سبەی چاکدەبێتەوە! ئەم کارە دەبێتە هۆی جودابوونەوەیەکی سەرسامکەری کتوپڕ لە مرۆڤدا. لەوانەیە هەست بە ئازار بکات بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز، چونکە ئازار لێرەدا دەست وەرناداتە خواست و ئیرادەی. لەکاتێکدا ئازار سێ بەشی لە ترس پێکهاتبێت، ئەوا لەدوای هەستان بەم کارە کەمتر دەبێتەوە. لەسەر یۆگیکار پێویستە هەتەری بێت لە ئەنجامدانی کارەکەیدا، هەمان پابەندبوونی تێدا بێت، تەنانەت لەو حاڵەتانەی کە قەدەر بۆی پێدەکەنێت، بەپێی هەڵسوکەوتی مەیلی دیاریکردنی ناسنامەکەی دەکات بەوەی هێندە ڕێزی لێگیراوە. بیرکردنەوە لە دەرون وەك کەسی ڕاناوی سێیەمی نادیار، دەشێت دوو سودی هەبێت. لە زەمینەیەکدا ناسنامەی خودی ڕاستەقینە و دەرونی ڕوکاری کۆدەکاتەوە. لە هەمان کاتدا ئەم دیاریکردنە خودیە پاڵدەنێت بەناسنامەکەیەوە بۆ ئاستێکی قووڵتر. هەتا لە کۆتاییدا مرۆڤ تەواو دەبێت، لەڕێگەی بەراوردکردنی دەرون لەگەڵ بووندا بەگشتی، زیندو دەمێنێتەوە بەو بیرۆکەیەی کە پێشتر تەنها وێناکردنێکی ئەقڵی بوو، واتە بیرۆکەی تۆ ئەو کەسەی هیچ کەسێکی تر نیە هێندەی تۆ بیستەر و بینەر و بیرمەند و بکەر بێت(٥).

## ڕێگای چوون بەرەو یەزدان بە خۆشەویستی

ئەگەر یۆگای زانست دابنرێت بە کورتترین ڕێگا بەرەو یەزدان، ئەوا لە هەمان کاتدا دادەنرێت بە قورسترین و وردترین ڕێگا بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، چونکە پێویستی بە کۆبوونەوەی ئەقڵانی و ڕۆحانیە لە شوێنکەوتودا، ئەمە شتێکە دابین ناکرێت تەنها لە ژمارەیەکی کەمی خەڵکدا نەبێت. بەڵام گۆشەگیری بە ڕەوتی ئەقڵانی لەلای زۆرینەی خەڵك لاوازترە لەوەی بەدەست بێت تەنها لەڕێگەی مەشق و وەرزشەکانیەوە، هەتا بیانگەیەنێت بە یەزدان. ژیان بەشێوەیەکی گشتی ڕێنمونی ناکرێت بە ئەقڵ بەو هێندەیەی بە ئەڤین ڕێنمونی دەکرێت، لەنێو هەست و بیرکردنەوە زۆرەکاندا کە ژیانی مرۆڤ لێوان لێو دەکات، هەستی خۆشویستن بەهێزتر و قووڵترە لەژیان و بوونی مرۆڤدا، تەنانەت هەستی ڕق و قینە دەکرێت شی بکرێتەوە بەوەی کاردانەوەیەکی ڕاستەوخۆ و خۆڕسکە بۆ شکستهێنان لە سۆزی خۆشەویستیدا. وێڕای ئەوە ئادەمیزاد بەپێی سروشتی مەیلی ئەوە دەکات وەك ئەو کەسە بێت کە خۆشی دەوێت، بەوەی ناوی دڵدارەکەی بەشێوەیەکی پلەبەندی دەنوسرێت لە نێوچاوانیدا. ئامانجی بهەکتی یۆگا bhakti yoga (واتە یۆگای خۆشویستنی یەزدان)، ئاڕاستەکردنی ئەو کانگا هەڵقوڵاو و گەرموگوڕەی خۆشەویستیە بۆ خۆشەویستی، کە بوونی هەیە لە قووڵاییەکانی هەموو دڵێکی مرۆییدا بەرەو یەزدان. یەزدان لە کتێبی بهاگافاد بورانادا دەڵێت: ((هەروەك ئاوی ڕوباری گانج کاتێك هەڵدەقوڵێت بەبێ وەستان بە ئاڕاستەی زەریا، بەهەمان شێوە لەگەڵ بیستنی خۆشەویستان بۆ تایبەتمەندیەکانم، دڵیان بەبەردەوامی و بەبێ وەستان بەئاڕاستەم دەخرۆشێت و بەرەو بوونەوەری شکۆدار لە دڵیاندا)). بەپێچەوانەی جنانا یۆگا (یۆگای زانست) بهەکتی یۆگا شوێنکەوتوی زۆرە، بەڵکو لەنێو هەر چوار جۆر یۆگاکەدا جەماوەری لە هەموویان زیاترە. وێڕای ئەوەی لە دەست پێکردنیەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دێرین بەڵام باشترین سەرخەرەکانی ناسراون. شاعیرێکی سۆفی لە سەدەی شانزەیەمی زایینیدا ناوی تولسیداسە tulsidas. ئەم شاعیرە لەسەرەتاکانی ژیانی هاوسەرگیریدا، زۆر ئاڵودەی هاوسەرەکەی بووە بەڕادەیەك نەیدەتوانی لێی دوور بێت تەنها ئەگەر بۆ ڕۆژێکیش بێت، لە ڕۆژێکدا هاوسەرەکەی ڕۆیشت بۆ سەردانی کەسوکاری خۆی، پێش ئەوەی نیوەی ڕۆژەکە تێپەڕ بێت، تولسیداس ئۆقرەی لێبڕا و نەیتوانی چیدی بەرگەی دووری هاوسەرەکەی بگرێت، بۆیە چووە لای کەسوکاری هاوسەرەکەی بۆئەوەی لەوێ بیبینێت، کاتێك هاوسەرەکەی چاوی کەوت بە مێردەکەی هاواری کرد و وتی: ((تۆ چەندە پەیوەستی بەمنەوە! ئەگەر هێندە پەیوەست بویتایە بە یەزدانەوە ئەوا بەساتێك پێی دەگەیشتی. )). لەوکاتەدا تولسیداس بەئاگاهاتەوە و بەخۆی وت: ((هەر ئەو کارەیە من پێی هەڵدەسم)). بەڕاستی بۆ ئەو مەبەستە هەوڵیدا و سەرئەنجام سەرکەوتو بوو. هەموو بنەما بنەڕەتیەکانی بهەکتی یۆگا، هاوشانی هەیە لە مەسیحیەتدا، لەڕاستیدا لە ڕوانگەی خودی هیندۆسیەتەوە، مەسیحیەت دادەنرێت بە ڕێگایەکی ڕۆشن و مەزن وەك یەکێك لە ڕێگاکانی بهەکتی یۆگا کە ڕێنیشاندەری مرۆڤەکانە و ڕۆشنکەرەوەی ڕێگاکەیانە بەرەو یەزدان. ئەمە بەو واتایە نایەت هیندۆسیەت بێ ئاگایە لە ڕۆڵی ئایینەکانی تر لەم بوارەدا، بەڵام ئاماژەیان پێ ناکات بەو جۆرەی کە ئاماژە دەکات بە مەسیحیەت. بەدرێژایی ڕێگاکە پێویستە دەرك بکرێت بە یەزدان بەجۆرێکی جیاواز بێت لە بیرکردنەوەی یەزدان و دەرکپێکردنی لە یۆگای زانستدا. لە یۆگای زانستدا وێنەی یەزدان ئاشکرا بوو، کە شوێنکەوتو ڕێنمونی دەکات بە درێژایی ڕێگاکە، وەك وێنەی دەریایەکی ناکۆتا لە بوون کە شاردراوەتەوە لەژێر شەپۆلە ڕوکاریە بچوکەکاندا کە خودی کۆتادارمان دەنوێنێت. شوێنکەوتو لەو جۆرە یۆگایەدا بیریدەکردەوە لە یەزدان وەك ڕۆحێکی گشتگیر کە بوونی هەیە لە هەمووو شتێکدا کەلە هەناوماندایە، هەروەك لە ڕووکاری دەرەوەماندایە.

ئامانجی ئەو یۆگایە دەرككردن بوو بەوەی ئێمە ئەوین. وێڕای ئەوە بیركردنەوەی شوێنكەوتو لە یۆگای زانستدا لەبارەی یەزدانەوە، بەشێوەیەكی سەرەكی بیركردنەوەیە لە یەزدانێكی ناتاكدا. لەبەرئەوەی تایبەتمەندی ڕاستی هەتەرییە كاردەكاتەسەر فەیلەسوف زیاتر لە تایبەتمەندیەكانی تری كە ناكۆتان. ئەمە بەپێچەوانەی ئەوەیە كە پێویستە هەبێت لە بیركردنەوەی هەبوونی یەزدانێكی تاكدا، كە یەزدان دیاری دەكات لە چەند لایەنێكەوە، لەكاتێكدا بیٚ هاوەڵی و تاكوتەنهای یەكێكە لە تایبەتمەندیەكانی یەزدان و نەهیكردن لەوانی تر. لێرەوە سەبارەت بەو كەسانەی خۆشەویستی لای ئەوان گرنگترە لە ئەقڵ، دەكرێت بیركردنەوەیان لەبارەی یەزدانەوە بیركردنەوەیەكی جیاواز بێت لە هەریەك لەم دەربڕینانەدا:

یەكەم: بەوەی خۆشەویستی لە حاڵەتە دروستەكەیدا سۆزێكی ئاڕاستەكراوە بەرەو دەرەوەی خود، ئەوا بەهاكتی (واتە ئەو دڵدارەی خۆی تەرخان كردوە بۆ یەزدان) هەمووو پێشنیازێك ڕەتدەكاتەوە كە بۆ خۆی ببێتە ئەو یەزدانەی كە خۆشی دەوێت، یان تەنانەت یەزدان بكاتە ڕاستی دەرون كە شاردراوەتەوە لە قووڵترین قووڵاییەكانیدا، بەڵكو لەبری ئەوە پێداگری دەكات لەسەر خۆنەویستی (لەنێوانی ئەو و دڵدارەكەیدا، یەزدان)، هەروەك یەكێك لە گۆشەنشینە هیندیە كلاسیكیەكان ئەمەی دەربڕیوە كاتێك وتویەتی: ((دەمەوێت تامی شەكر بكەم نەك ببمە خودی شەكر!)).

ئایا دەكرێت ئاو خۆی بخواتەوە؟

ئایا دەكرێت درەختەكان لەو بەرەی خۆیان بخۆن كە هەڵیدەگرن؟ ئەوەی یەزدان دەپەرستێت پێویستە لە یەزدان جیاواز بێت تەنها بەم كارە دەتوانێت خۆشەویستی یەزدان بناسێتەوە كە لێوانلێوە لە شادومانی و كامەرانی چونكە ئەگەر وتی من و یەزدان یەك كەسین ئەوا ئەو شادومانی و كامەرانیە یەكسەر شیدەبنەوە دوای ئەوە هەرگیز ناگات بە یەكگرتنی تەواو لەگەڵ یەزداندا كوانیٚ جوانی ئەگەر گەوهەر و بەرد یەك شت بن؟ سێبەر و گەرمی دوو شتی جیاوازن ئەگەر نا پشودان لەسێبەردا چۆن دەبێت؟ دایك و منداڵ دووانن ئەگەر نا خۆشەویستی لەكویٚ بوو؟ لەكاتێكدا دوای دابڕانێكی دورودرێژ بەیەك دەگەن ئایا هەست بە چ خۆشی و شادومانیەك دەكەن خۆشی لە كوێیە ئەگەر یەك كەس بن نەك دووان؟ لەدوای ئەوە مەپاڕەوە بۆ یەكگرتنی تەواو لەگەڵ یەزداندا(٦)

دووەم: بە دەست پێكردن لەم دەرككردنە بە خۆنەویستی یەزدان، ئامانجی بهاكتی (شوێنكەوتوی یۆگای خۆشەویستی) جیاواز دەبێت لە ئامانجی جنانی (شوێنكەوتوی یۆگای زانست)، چونكە ئامانجی بهاكتی دەرككردن نیە بە یەكبوونی لەگەڵ یەزداندا، بەڵكو پەرستنی یەزدان و فەنابوونە لە خزمەتكردنیدا بەهەمووو گەردیلەكانی بوونیەوە. وشەكانی بیدی فرۆست bede frost وێڕای ئەوەی نوسراونەتەوە لەبارەی ئایینێكی ترەوە بەتەواوی جێبەجیٚ دەكرێت بەسەر ئەم لایەنەی هیندۆسیەتدا، ئەمە لە كاتێكدا دەڵێت: ((یەكگرتن. . . فەنابوون نیە یەكگرتوویی، بوونی مرۆڤە لە یەك كەسدا. . بەڵكو لەبنەڕەتدا ئەمە بەپێی سروشتەكەی تایبەتیە. . . ئەگەر ئەم یەكگرتنە لەڕێگەی خۆشەویستیەوە بێت، بەشێوەیەكی ئاشكرا، ئەوا جۆری زانستی داواكراو بۆ یەزدان، بریتیە لە هاوڕێیەتی و خۆشەویستی بە بڵندترین واتا وێناكراوەكانی))(٧). دواجار: لە هاوشێوەی ئەم چوارچێوەیەدا، ئەوا تاكی یەزدان پێویستیەكی حەتمیە، ئەمە دوورە لە دۆزینەوەی سنورێك بۆ یەزدان. ئەوەی ئادەمیزاد خۆشیدەوێت لە حاڵەتی سروشتیدا پێویستە كەسێك بێت، هەرچەندە شكۆدار بێت لە خەسڵەتەكانی و دانایی و ڕەحم و بەزەییەكەیدا. بەڵیٚ دەشێت فەیلەسوفەكان بوونی هەتەریان خۆشبوێت كە لە سەرو هەمووو خەسڵەتێكەوەیە، بەڵام ئەو جۆرە كەسانە نمونەیین. هەمووو ئەو شتانە پێویستە لەسەرمان ئەنجامی بدەین لەم

جۆرە یۆگایەدا بریتیە لەوەی یەزدانت خۆشبوێت بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر، تەنها بەوە نا بە زمانمان بڵێین ئێمە یەزدانمان خۆشدەوێت، بەڵکو بەڕاستی خۆشمان بوێت، تەنها ئەومان خۆشبوێت، بێجگە لەو شتێکی ترمان خۆشنەوێت تەنها لەبەر ئەو نەبێت، خۆشمان بوێت لەبەر خودی خۆی نەك لەبەر مەبەستێکی تر، تەنانەت ئەگەر بەهۆی ئارەزوی ئازادبوونەوە بێت، بەڵکو تەنها لەبەرخۆی خۆشمان بوێت. سەرکەوتنمان لەم کارەدا دڵخۆشیمان پێدەبەخشێت، چونکە هیچ ئەزمونێك نیە بتوانرێت بەراورد بکرێت بە ئەزمونێك کە بە خۆشەویستیەکی تەواو و ڕاستەقینەوە بژی. وێڕای ئەوە هەتا پەیوەوست بوونمان بە یەزدانەوە بەهێزتر بوو خۆشەویستیمان بۆ ئەو زیاتر دەکات، دەست گرتنی جیهان بەسەرماندا لاواز دەبێت. بەڵێ دەشێت قەشەیەك دونیای خۆش بوێت، بەڵکو لەڕاستیدا خۆشی دەوێت زیاتر لە خۆشەویستی ئاڵودەبوویەك بە دونیا، بەڵام خۆشەویستی بۆ دونیا بە تەواوی جیاوازە لە خۆشەویستی ئەوانی تر بۆی. ئەو خۆشیدەوێت چونکە ڕەنگدانەوەی سەرکەوتنی یەزدانی تیادا دەبینێت کە دەیپەرستێت. چۆن ئەم خۆشویستنی یەزدانە گەشەی پێدەدرێت لە دەرونی مرۆڤدا؟ گومانی تێدا نیە ئەم کارە ئاسان نابێت. ئەو هێزە توندەی شتەکانی ئەم دونیایە ئاگایی مرۆڤ بوشێوەیەکی بەردەوام کێش دەکات، ئەمە دەکاتە کارێکی سەیر و سەمەرە کە بوونەوەرێکی نەبینراو نە گوێمان لێیەتی نە دەیبینین ببێتە ڕکابەرێك بۆی. لێرەوە دەچینە نێو جیهانی ئەفسانەکانی هیند و هێما مەزنەکانیەوە، سەدان پەیکەر کە دروستیانکردوە بۆ یەزدان، ئەو مەڕاسیمانەی بە شەو و ڕۆژ بەردەوامە، هەروەك ڕەوڕەوەیەك بێت لە نزا و پاڕانەوە کەلە سوڕانەوە بەردەوامە. ئەم شتانە، ئەگەر وەك چەند ئامانجێك دابنرێن، ئەوا بەبێ گومان دادەنرێن بە داگیرکەری پلەوپایەی یەزدان. بەڵام بۆ ئەو مەبەستە بەکارنایەن. ئەمانە چەند کەرەستەیەکن بۆ نزیککردنەوەی ژن و مێردەکان لەیەکتر، ئامانجی بریتیە لەوەی دڵی مرۆڤ ئاڕاستەی ئەوە بکرێت کە هاوشێوەیەتی نەك بەرەو خودی خۆی. کارێکی ژیرانە نیە پەیکەرەکانی هیندۆسیەت تێکەڵبکرێن بە هاوەڵدانان بۆ یەزدان، چونکە ئەمانە تەنها کۆمەڵە دەربڕینێکن لەڕێگەیانەوە ڕۆحی مرۆڤ کە قورسکراوە بە هەستەکان بفڕێت لەیەکێکەوە بەرەو دانەیەکی تر. تەنانەت قەشەی گوندە هیندیەکان دەست بە پەرستن دەکات لە پەرستگادا بەم نزایە: ((ئەی یەزدان! لە سێ تاوانم خۆش ببە کە لە سنوری مرۆییمەوە ڕویانداوە. تۆ لە هەموو جێگایەکدایت بەڵام من لێرەدا دەتپەرستم. تۆ بێ شێوە و بێ جەستەیت، بەڵام من ئەتپەرستم لەم شێوانەدا. تۆ پێویستت بە پیاهەڵدان نیە بەڵام من ئەم نزا و پاڕانەوانەت پێشکەش دەکەم. ئەی یەزدان! لە سێ تاوانم خۆش ببە کە لە سنوری مرۆییمەوە ڕویانداوە. )). هێمای پەیکەری کەسێك کە چەندین دەستی هەیە، بەجۆرێك وێنا دەکرێت کە وزەبەخشی ژیانە، فرەجۆری لە لایەنەکان و لێهاتوییەکانی خودی یەزدانی و هێزە لە ڕادەبەدەرەکەی کە لە سەروو توانای مرۆییەوەیەن بەم جۆرە وێنادەکرێت بەشێوەیەکی بچوککراوە، لەڕێگەی چڕکردنەوەوە، ئەمە فەلسەفەیەکی تەواوە. بەهەمان شێوە ئەفسانەکان سەرنج دەدات بۆ گەڕان بەشێوەیەك کەسی ڕۆشنبیر نایبینێت تەنها ئەگەر مەیلی لێ نەبێت. پەندەکان و چیرۆکە ئەفسانەییەکان بەشێوەیەکن گوێگر بەرەو لای خۆیان کێش دەکەن، وای لێدەکات کاربکات لەسەر بەرجەستەکردنی ئەو پەندانە لە ژیانی تایبەتیدا. ئەمە پاڵپشتی دەکات لە بیروباوەڕی ئیروین ئیدمان irwin edman بەوەی: ((خەڵك کاریان تێدەکرێت و دەجوڵێن بە ئەفسانە نەك بە ڕێسا فەرمیەکان، کاریان تێدەکرێت بە چیرۆکە پڕوپوچەکان (کە زۆربەی کات لەسەر زمانی گیاندارەکانە) نەك بە لۆژیکیانە)). کەواتە بایەخی ئەو شتانە شاردراوەتەوە لە تواناکەیدا لەسەر ئاگادارکردنەوەی مێشکمان لە بێ ئاگایی سەرقاڵبوونمان بە دونیاوە، بۆئەوەی بیگوێزێتەوە بۆ بیرکردنەوە لە یەزدان، دواتر پلەبەپلە بەرەو خۆشویستنی یەزدان. بە نوێژکردن بۆیەزدان، بە بەرزکردنەوەی

پاڕانەوەکان بۆ یەزدان بە چەند دڵێك لێوانلێون لە خۆشەویستی و وەفاداری، بەبیرکردنەوە لە مەزنی یەزدان، بەخوێندنەوەی ئەوەی نوسراوەتەوە لە کتێبی پیرۆزدا، بە تێڕامان لە گەردوندا بەوەی هەمووی داهێنانی یەزدانە و بەدەستی خۆی دروستیکردوە، بەمە خۆشەویستی و بیرکردنەوەمان زیاتر دەکەین بەشێوەیەکی بێ سنور بۆ یەزدان. بهاگافاد گیتا دەڵێت: ((ئەوانەی بیر لە من دەکەنەوە و دەمپەرستن و بە هیچ شتێکەوە پەیوەست نین جگەلە من، درەنگ بێت یان زو دەریان دەهێنم لە دەریای مەرگدا)). سێ خەسڵەتی دیار هەن بۆ ڕێگای بەهاکتی یۆگا پێویستە باسبکرێن: ستایش کردن (جابام)، خۆشەویستی بە هەمووو شێوازەکانی خۆشەویستیەوە، پەرستنی نمونەی باڵا کە ئادەمیزاد هەڵیدەبژێرێت. جابام: jabam بریتیە لە دوبارەکردنەوە و ستایشکردنی ناوی یەزدان. ئەم کارە هاوشێوەی هەیە لە مەسیحیەتدا، هەروەك باسکراوە لەیەکێك لە پارچە ئەدەبیەکانی ئۆرسۆزێکسی ڕۆسیدا، کتێبی ڕێگای حاجی(٨). ئەم کتێبە باس لە چیرۆکی جوتیارێك دەکات کە هەموو خەمێکی جێبەجێکردنی ئەو ڕاسپاردانەیە کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتوون. . بە نوێژکردنی بەردەوام، بۆ ئەو مەبەستە دەستی بەگەڕان کرد بەناو ڕوسیا و سیبریادا بە تێشووەکەی سەرشانیەوە کە تەنها نانی وشکی تێدایە، ڕوویدەکردە ئەو شوێنەی چاکەکارانی تێدایە، پرسیاری دەکرد لە چەندین قەشە و پیاوی ئایینی فەرمی، بەبێئەوەی هیچی دەستبکەوێت. هەتا لە کۆتاییدا ڕێی کەوتە لای قەشەیەك فێریکرد کە: (( کە بەبەردەوامی لە یەزدان بپاڕێتەوە، بە ناوی یەزدانی پیرۆزی یەسوع، بەلێوەکانی، بە ڕۆحی، بە دڵی. . . لە هەمووو کات و شوێنێکدا، تەنانەت لەکاتی خەوتندا)). ئەو مامۆستایە مەشقیکرد بە جوتیارەکە هەتا وای لێکرد لە توانایدا بێت ناوی یەسوع دوبارە بکاتەوە بۆ زیاتر لە ١٢٠٠٠ جار لە ڕۆژێکدا. ((ئەم کارە دوبارەبووەی لێوەکان، بەشێوەیەکی پلەبەندی بەبێ هەستپێکردن بووبە نزا و پاڕانەوەیەکی ڕاستەقینەی دڵ، ئەو نوێژە بوویە ئامادەبوونێکی جێگیر و گەرموگوڕی یەسوع لە ناخیدا کە دڵخۆشیەکی لەڕادەبەدەری پێبەخشی)). ئەمە بەتەواوی ڕاسپاردەی هیندۆسیەتە بۆ بهاکتی لەکاتێکدا پێی دەڵێت: ((ناوی یەزدانت لەیادبێت بەشێوەیەکی هەمیشەیی و لە کاتی کارکردنتدا. چ سەرقاڵی شوشتن بیت یان چنین، لە بازاڕ بیت یان بە کاری چاندنەوە سەرقاڵ بیت. دڵوپی وشە نەبڕاوەکان لەگەڵ هەمووو دەرونێکدا، بەشێوەیەکی نائاگایی درزە دەکاتە ناو مێشك و هەستەکانەوە بۆئەوەی کاریان تێبکات، بەشێوەیەك لەوێدا جێگیر دەبێت لە جیهانی نائاگاییدا و هەمووو دەرونی ئاڕاستەی یەزدان دەکات. )). لێرەدا خۆشەویستی بەهەمووو جۆرەکانیەوە بەشێوەیەکی ئایینی دادەمەزرێنرێت، چونکە خۆشەویستی ڕەنگ و شێوازی جیاوازی هەیە دەگۆڕێت بەپێی جۆری پەیوەندی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان هەردو لاکەدا، چونکە خۆشویستنی دایك و باوك بۆ منداڵەکەیان تێکەڵ بووە لەگەڵ سۆزی پەیوەست بوون، خۆشویستنی هاوڕێکان جیاوازە لە خۆشویستنی نێوان ژن و مێرد. جۆرە خۆشەویستیەکی تر هەیە جیاوازە لە هەمووو ئەو جۆرانەی باسکران، ئەوە خۆشویستنی کۆیلەیە بۆ خاوەنەکەی. هیندۆسیەت وابیردەکاتەوە ئەگەر ئادەمیزاد ویستی شتێکی خۆشبوێت بەهەمووو توانایەکیەوە ئەوا پێویستە لەسەری هەمووو وزەکانی خۆشەویستی ناو دەرونی بەکار بهێنێت. واتە هانی بهاکتیەکان دەدات لەسەرئەوەی یەزدانیان خۆشبوێت بە هەمووو جۆرە باسکراوەکانەوە. زانستی دەروونناسی هیندۆسیەت پۆلێن دەکات بۆ ئاستەکانی پەرستن و فەنابوون لە خۆشویستنی یەزداندا، بە پۆلێنکردنێکی شێوە هەرەمی هەتا بەرەو سەرەوە بڕۆین خۆشەویستی ئاڵوگۆڕکراو زیاد دەکات لە هەمووو ئاستێکدا. یەکەم: هەڵوێستی پارێزراو دێت بۆ پارێزەر، وەرگر بۆ بەخشەر، کۆیلە بۆ خاوەنەکەی. لەم ئاستەدا پێویستە بیربکەینەوە لە یەزدان وەك دایك و باوك. دوابەدوای ئەوە ئاستی هاوڕێیەتی دێت. لێرەدا نزیکبوونەوە لە یەزدان وێنەیەکی سۆزدارانەتر

وەردەگریت لەکاتێکدا یەزدان وەك هاوڕێیەك دەبینین. لە ئاستی سێیەمدا هەڵوێستی باوك و دایك دێت بەجۆرێك کەسی شوێنکەوتو سەیری یەزدان دەکات وەك سەیرکردنی دایکێك بۆ منداڵەکەی. دواجار هەڵوێستی دڵدار دێت کە تیایدا یەزدان ڕۆڵی خۆشەویستی ئەو دڵدارە دەبینێت. لەنێو ئەم ڕۆڵانەی یەزداندا، لەوانەیە ئەو ڕۆڵەی ویژدانی ئایینی ڕۆژئاوا گرنگی پێداوە ڕۆڵی باوك بێت بەڵام ڕۆڵەکانی تر بەتەواوی پشتگوێ نەخراون. چونده دەربڕینی یەسوع چەندە هاوەڵێکی باشە بۆمان سرودێکی مەسیحی ناسراوە. سرودێکی تر هەیە جەخت دەکاتەوە لەسەر دوو ڕۆڵی یەزدان، ئەمە سرودێکە کۆتایی دێت بە ڕستەی خاوەن و هاوڕێم. لەوانەیە تێڕوانین بۆ یەزدان وەك منداڵ لەلای ڕۆژئاوا سەیرترین تێڕوانین بێت، لەگەڵ ئەمەدا زۆربەی سیحری کریستماس (جەژنی لەدایکبوونی مەسیح) بگەڕێتەوە بۆ دیاریکردنی ئەو ڕاستیە بۆ تەنها جارێك لە ساڵێکدا کە تیایدا یەزدان دەچێتە نێو دڵەوە وەك منداڵێك، بەم کارەی سۆزی تایبەت بە پاڵنەری باوکایەتی خۆڕسك. لە کۆتاییدا دێینە سەر پەرستنی یەزدان وەك نمونەی باڵای هەڵبژێردراو لەلایەن ئادەمیزادەوە. هیندۆسیەت یەزدانی وێناکردوە بە چەندین شێوە کەلە ژماردن نایەن. ئەمە شتێکی گونجاوە بەپێی بیروباوەڕی هیندۆسیەت. چونکە هەمووو شێوەیەك هیچ نیە جگەلە هێمایەك کە ئاماژە دەکات بۆ شتێکی نادیار، لەکاتێکدا هیچ یەکێك لەو شێوانە توانای ئاماژەکردنی نەبێت بۆ سروشتی ڕاستەقینەی یەزدان، ئەوا دەشێت هەمووو ئەمانە بەیەکەوە دابنرێن بە شێوەکانی یەزدان وێڕای ئەوەی دەکرێت لەڕێگەی چەند پەیکەرێکەوە ئاماژە بکرێت بۆ یەزدان بەشێوەیەکی یەکسان، بەڵام کەسی شوێنکەوتو پێویستە بۆ تەواوی ژیانی پەیوەست بێت بەیەکێك لەو شێوانەوە. چونکە تەنها بە واتای ئەم دیمەنە دەتوانێت سود وەربگرێت لە تەواوی تواناکانی. ئەم دیمەنە ئەو نمونە باڵایەیە کە مرۆڤ هەڵیبژاردوە. ئەمە بەو واتایە نایەت کە پێویستە لەسەر بهاکتی هەمووو شێوەکانی تری یەزدان پشتگوێ بخات. هەمووو ئەوەی لەم کارەدایە ئەوە دەسەپێنێت بەسەریدا کە واز نەهێنێت لەو وێنەیەی هەڵیبژاردوە وەك نمونەی باڵای هەمووو ژیانی. پێویستە بۆ ئەو وێنەیە پلەوپایەیەکی یەکەمی بمێنێتەوە لە دڵیدا. باشترین نمونەی باڵا بۆ زۆربەی خەڵك یەکێکە لە بەرجەستەکردنەکانی یەزدان. چونکە دەکرێت یەزدانمان خۆشبوێت بەشێوەیەکی ئاسانتر لەکاتێکدا خۆی نیشان دەدات لە وێنەیەکی مرۆییدا، چونکە دڵمان پێکهێنراوە لەسەر خۆشەویستیەکی هاوشێوەی یەکتر لە مرۆڤایەتیدا. زۆربەی هیندۆسیەکان دانبەوەدا دەنێن کە مەسی یەزدانی بەرجەستەکراوە لە شێوەی مرۆڤدا، بەڵام وابیردەکەنەوە چەند بەرجەستەکردنێکی تری یەزدان هەن وەکو: ڕاما و کریشنا و بوزا. درێژی لیستی بەرجەستەکردنەکانی یەزدان دەگۆڕێت بەپێی مەزهەب و خوێندنگا جۆراوجۆرەکانی هیندۆسیەت. هەتا جیهان بکەوێتە نێو گەندەڵی و نادادپەروەریەوە بەرزبوونەوەی مرۆڤ بەرەو یەزدان لەژێر مەترسیدایە، لەبەرئەوە یەزدان دێتە سەر زەوی بۆئەوەی ڕەوڕەوە بێجوڵەکانی مێژوو دەرباز بکات. ((کاتێك خێر و چاکە لاواز دەبێت و خراپەکاری زۆر دەبێت خۆم بەرجەستە دەکەم لە هەمووو کاتێکدا دێم بۆئەوەی چاکەکاران ڕزگار بکەم خراپەکاری و تاوان دەڕمێنم بۆئەوەی چاکەکار سەربخەم. ))(٩)

## ڕێگای چوون بەرەو یەزدان بە کردار

سێیەمین ڕێگا بەرەو یەزدان، تایبەتە بەو کەسانەی مەیلی کارکردن و چالاکیان هەیە، بریتیە لە کارما یۆگا karma yoga واتە ڕێگای چوون بەرەو یەزدان بە کردار. پشکنینی توێکاری و فیسیۆلۆجی بۆ ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ ڕاستیەکی سەرنجڕاکێش ئاشکرا دەکات. هەریەك لە کۆئەندامی هەناسەدان و هەرسکردن، کاردەکەن لە دابینکردنی مادە و کانزاکان و ڕەگەزە خۆراکیەکان بۆ خوێن کە کۆئەندامی سوڕان دابەشی دەکات بەسەر هەمووو ناوچەکانی جەستەدا بۆئەوەی پێداویستی ئێسك و جومگە و ماسولکەکان دابین بکات. ئێسکەکان ئەو پەیکەرە دروستدەکەن کە بەبێ ئەو ماسولکەکان ناتوانن کاربکەن، لەکاتێکدا جومگەکان توانای چەماندنەوە دابین دەکەن کە پێویستن بۆ جووڵە. مێشك ئەو جوڵانە وێنادەکات کە پێویستە پێیان هەستین، دڕکەپەتك هەڵدەسێت بە جێبەجێ کردنی. دواجار کۆئەندامی دەماری نائاگایی هەڵدەسێت بە پاراستنی بەیەکەوە گونجانی ئەندامەکان لەگەڵ یەکتردا، ئەو ئەندامانەی هەمووو ماسولکە جوڵێنەرەکان پشت دەبەستن بەو خۆراکەی لەوانەوە وەریدەگرن. بەکورتی هەمووو جەستە، جگەلە کۆئەندامی زاوزێ، بەیەکدەگات بە جموجوڵی ماسولکەکان. هەمووو ژیانی مرۆڤایەتی کاتێك سەیری دەکرێت لە گۆشەنیگای جەستەوە، کورتدەکرێتەوە و کۆدەکرێتەوە لە کرداردا. هەروەك پزیشکێکی هاوچەرخ نوسیویەتی: ((ئامێری مرۆڤ وادەردەکەوێت بەڕاستی بۆ مەبەستی کارکردن دروستکراوە))(١٠). کەواتە کردار ڕاگری ژیانی مرۆڤایەتیە. ئەم خاڵە لێرەدا بەسادەیی پێویست نیە لەسەر هەمووو خەڵك کار بکەن. خاڵەکە لێرەدا بریتیە لەوەی پاڵنەری کارکردن بێت، لەکۆتاییدا هاندەدرێت لەڕووی دەرونیەوە نەك لەڕووی ئابوریەوە. لەبەرئەوە زۆرینەی خەڵك ئەگەر ناچارکران لەسەر کارنەکردن ئەوا زۆر زوو تووڕە دەبن، ئەگەر ناچارکران لەسەر خانەنشین کردن، لاوازدەبن و لەناودەچن. هیندۆسیەت بەهەمووو ئەو کەسانە دەڵێت کاردەکەن: هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان ئەو کەسانەی کاربەدەستن و لە کارێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوێزرێنەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی بازرگانن، ئێوە پێویستتان بەوە نیە خۆتان جیابکەنەوە لە جیهان و گۆشەنشین بن لە پەرستگاکاندا هەتا دەرکبکەن بە بوونی یەزدان. بەڵکو دەتوانن بیدۆزنەوە لە جیهانی کارکردنی ڕۆژانەتاندا بە هەمان ئەو خێراییەی لەهەر جێگایەکی تردا دەرکی پێدەکەن(١١). خۆت سەرقاڵ بکە لە کارەکەتدا بە هەمووو توانا و هێزێکتەوە، تەنها پێویستە لەسەرت بەم کارە هەستیت بەشێوەیەکی ژیرانە، بە کارکردن هەمووو سودێکت بۆ دابین دەکرێت، نەك خۆت سەرقاڵ بکەیت بە قسەی هەڵیت و پەڵیتەوە. نهێنی کارکردن فێر ببە کەلە ڕێگەیەوە هەمووو جوڵەیەك دەتوانێت بتبات بەرەو یەزدان هەتا کاتێك کە سەرقاڵیت بە بەدەستهێنانی ئامانج و کارەکانی ترەوە. ئادەمیزاد چۆن دەتوانێت بەو کارە هەستێت؟ ئەمە پشت دەبەستێت بە چەند پێکهاتەیەکی تری کرێکارەکەوە. لەسەرەتادا: یۆگیکار ئاماژەی کردوە بۆ کردار، بە هەڵبژاردنی ئەم ڕێگایە، ئەو سروشتەی دەستی بەسەردا دەگرێت بریتیە لە خۆشەویستی کردار و چالاکی. پرسیارەکە دەمێنێتەوە لەسەر لایەنەکانی تر بەرەو ئاڕاستەی تێڕامانی فیکری یان ئاڕاستەی ئەڤینی؟ چونکە ڕێگای کردار چەند هەڵبژاردنێکی هەیە دەگۆڕێت بەپێی مامەڵەکردن شوێنکەوتو لەگەڵ ئەم ڕێگایەدا: ئایا فەلسەفیە یان دەرهاویشتەی حاڵەتێکی خۆشەویستەیە؟ ئەگەر ویستمان بدوێین بە زمانی هەر چوار یۆگاکە ئەوا دەڵێین دەکرێت یۆگای کردار ئەنجام بدرێت لەژێر شێوازی یۆگای زانست یان یۆگای خۆشەویستیدا. وەك پێشتر بینیمان ئامانجی ژیان بریتیە لە سەرکەوتن بەسەر دەروونی تاکی سنوردار، وەك باسمان کرد دەکرێت ئەمە بەدەست بێت بە گواستنەوەی ئاڕاستەی گرنگیدانی مرۆڤ و بابەتی خۆشەویستیەکەی و پەیوەستبوونی دەروونی بەرەو خۆشویستنی یەزدان، یەزدان ئەو کەسەی شوێنکەوتو

هەستی پێدەکات جیاوازە لێی. یان دەرککردنی شوێنکەوتو بەوەی ناسنامەی ڕاستەقینەی بریتیە لەوەی هەتەریەکی ناکەسیە جێگیرە لە گەوهەری بوونیدا. ڕێگای یەکەم: ڕێگای بەهاکتیە و دووەم: ڕێگای جنانی. لە هەردو شێوازەکەدا دەکرێت کردار بکرێتە کەرەستەیەك بۆ شکۆداربوون و بەرزبوونەوە بەسەر دەرونی کۆتادارردا. بەپێی بیروباوەڕی هیندۆسیەت، هەمووو کارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات لە دەرەوەدا، ڕەنگدانەوەی هەیە و دەگونجێت لەگەڵ هەناوی بکەرەکەیدا. بۆ نمونە: ئەگەر تەورێکم کێشا بە درەختێکدا بۆئەوەی بیبڕمەوە، لەبەرئەوەی بەرچاوی گرتوم، ئەوا هەمووو پیاکێشانێك بە تەورەکە، لە هەمان کاتی لەرینەوەی درەختەکەدا شوێنەوارێك جێدەهێڵێت لە ناخمدا، بەوەی قووڵدەبێتەوە لەناو بوونمدا بۆ پێدانی وزە بۆ بڕینی ڕێگاکەم لە جیهاندا. هەموو کارێك کە ئەنجامی دەدەم لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆم، بەرگێکی تر زیاددەکات بۆ منی باڵا کە دەبێتەهۆی ئەستوربوونی، بەم شێوەیە زیاتر جیادەکرێتەوە لە یەزدان کە لە ناوەوەمدایە یان دەرەوەمدایە، بەپێچەوانەوە هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەم بەبێ بیرکردنەوە لە خودی خۆم دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی چڕی دەرونم، هەتا لە کۆتاییدا هیچ بەربەستێك نامێنێت کە بەرچاوی مرۆڤ بگرێت لە بینینی یەزداندا. باشترین ڕێگا کە مرۆڤی ئەڤینی بیگرێتەبەر بۆئەوەی کارەکەی دووربێت لە بەرژەوەندی خود، بریتیە لەوەی هەمووو سروشتی ئەڤینی خۆی تەرخان بکات بۆ یەزدان، تەنها لە پێناوی ئەودا نەك بۆ خۆی. ((هەر کەسێك کاربکات بەبێ گوێدانە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، تەواو خۆی تەرخان بکات بۆ یەزدان، ئەوا سەرکەوتنی دونیایی و دواڕۆژ بەدەست دێنێت))(١٢)، پەرستن و خۆتەرخانکردن بۆ یەزدان. ئەو بە کارەکانی ڕۆژانەی هەڵدەسێت بەبێ گوێدانە دەرئەنجامی ئەو کارانە لەسەر خودی خۆی. ئەو بە کارەکەی هەڵناسێت وەك پەرستنی یەزدان، بەڵکو لە کارەکەیدا جێبەجێکردنی ویستی یەزدان دەبینێت، هەر ویستی یەزدان هانیدەدات بۆ ئەم کارە، بەم شێوەیە ڕەزامەندی یەزدان بەدەست دێنێت، هەروەك بەم کارە هەڵدەسێت بە هێزی یەزدان کە کاردەکات لەڕێگەی ئەو کەسەی خۆی تەرخان کردوە بۆ یەزدان، لەکاتێکدا دەڵێت تۆ بەم کارە هەستاویت من تەنها کەرەستەیەکم. لەکاتێکدا کارەکان جێبەجێ دەکرێن بەم ڕۆحیەتەوە ئەوا کێشی منی باڵا سووکتر دەکات لەبری قورسکردنی. بەم ڕۆحیەتەوە هەمووو کارێك دەبێتە پەرستشێکی پیرۆز، بە هەمووو خۆشەویستیەکەوە جێبەجێ دەکرێت، هەروەك قوربانیەکی زیندوو بێت کە پێشکەشی یەزدان دەکرێت، بەبێ گرنگیدان بە هەر بەرژەوەندیەکی تایبەتی. ((ئەو کارەی ئەنجامی دەدەیت هەر چیەك بێت، یان ئەو خواردنەی دەیخۆیت، یان ئەو قوربانیەی پێشکەشی دەکەیت، یان ئەو شتەی دەیبەخشیت، یان ئەو پەرستشەی ئەنجامی دەدەیت، ئەی کوری کونتی! ئەنجامی بدە تەنها لەپێناومدا، خۆت ئازاد بکە لەو کۆت و بەندانەی کە هەڵگری شوێنەواری چاك یان خراپن))(١٣). ئەو گەنجەی تازە چووەتە ژیانی هاوسەرێتیەوە کەلە حاڵەتێکی خۆشەویستیدا دەژی تەنها بۆ خۆی کارناکات. چونکە کاتێك بە کارەکانی هەڵدەسێت، لە بیرکردنەوە لە خۆشەویستەکەی جودانابێتەوە. ئەم سەرقاڵبوونە بە خۆشەویستەکەیەوە مانا دەبەخشێتە هەمووو کارەکانی و ئامانجەکەی دیاریدەکات. هەروەك حاڵەتی بەندەیەکی وەفادار کە خۆی تەرخان کردوە بۆ خزمەتکردنی خاوەنەکەی، کە داوای هیچ شتێك ناکات بۆ خۆی، بەڵکو بە ئەرکەکەی هەستێت لەبەر ڕەزامەندی خاوەنەکەی بەهەر شێوەیەك بێت. بە هەمان شێوەی شادومانی کەسێك کە خۆی تەرخانکردوە بۆ یەزدان تاکە خەمی ڕەزامەندی یەزدانە. لەکاتێکدا خۆی داوەتە دەست یەزدان بەگشتی، وای لێهاتوە لەکاتی پاڕانەوەدا توشی گومان و دڵەڕاوکێ دەبێت لەو ژیانەی کە توانای نیە بەسەریدا. وەك ئەو کەسانەی کە هەرگیز توشی نائومێدی نابن، چونکە هەوڵنادەن بۆ بەدەست هێنانی شتێك هەتا نائومێد بن لەکاتی لەدەستدانیدا! بەڵکو هەمووو ئەوەی داوای دەکەن بریتیە لەوەی لەگەڵ ئەو

کەسەدا بن کە لایەنگیری دەکەن. ئەوان بە باشی کاردەکەن، ئەگەر مێژوو لەکاتێکدا گۆڕا ئەوا خەڵك نین کە دەیگۆڕن، بەڵکو مێژوونوسە دەیگۆڕێت لەکاتێکدا خەڵکی دەبینێت گەیشتون بەو خاڵەی کە دەیانەوێت بیگۆڕن. خەڵکی لە مێژوودا کاتێك توشی دڵەڕاوکێ دەبن لەبارەی دەرئەنجامی کارەکانیان، بیرکردنەوەیان لەبارەی ئەزەلیەتەوە لەدەست دەدەن، ئەگەر کارەکانیان دایە دەست یەزدان ئەوا دەرباز دەبن لە کۆیلایەتی دەریای مەرگ. ((بەو کارە هەستە کە پێویستی ئەنجامی بدەیت بەبێ ئەوەی پەیوەست بیت پێوەی. . . هەمووو کارەکانت بدەرە دەست من. . . خۆت دەرباز بکە لە چاوچنۆکی و خۆپەرستی. بجەنگە بەبێ ئەوەی بشڵەژێیت و نیگەران بیت. ))(١٤). تەنها بە وازهێنانی مرۆڤ لە داواکاریەکانی لەبارەی کارەکانیەوە، بە داواکردنی سەرکەوتنەوە، ئەوا کارەکانی یۆگیکاری کارما (واتە ئەنجامدەری یۆگا لەجۆری کردار) شوێنەواری نابێت لەسەر خاوەنەکەی هەتا منی باڵا بەهێز بکات. ئەو هیچ جێ پەنجەیەك جێناهێڵێت لە مێشکیدا کە شوێنەوارێکی باش یان خراپی هەبێت لە داهاتودا. بەم کارە کەسی شوێنکەوتو کاردەکات لەژێر کاریگەری هەڵسوکەوتە کەڵەکەبووەکانی کارەکانی پێشووی بەبێ ئەوەی هەڵسوکەوتی نوێ بەدەست بهێنێت. کاردانەوەی مرۆڤ بەئاڕاستەی ئەم بیرکردنەوانە هەرچیەك بێت ئەوا ئەستەم نیە ڕاستی دەرونی ببینێت بۆ هاوشێوەی ئەم شێوازانە. ئادەمیزادی گوێڕایەڵ بۆ ئەوانی تر بەتەواوی بەهیچ شێوەیەك بوونی نیە. لەکاتێکدا یەکێك لە کۆیلە ڕەشپێستەکان دەستی یان قاچی برینددار دەبوو دەیوت: گرنگ نیە! ئەمە دەستی خاوەنەکەمە. کە لەناو خودیدا هەستی خاوەنداریێتی نیە. یەکێك لە ئیسپانیەکان ئەم خاڵەی ڕوون کردوەتەوەو دەڵێت: ((ئایا دەتەوێت نەبینراو بیت؟ بیر لە خۆت مەکەرەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ، ئەوسا هەست بەوە دەکەیت کەس ناتبینێت!)). تائێستا لەبارەی یۆگای کردارەوە دواوین سەبارەت بە کەسە ئەڤینیەکان، بەڵام سەبارەت بە کەسانی ئەقڵانی یۆگای کردار (وەك ڕێگایەك بەرەو یەزدان) ئاڕاستەیەکی تر دەگرێتەبەر. بەڵێ کلیلەکە لای ئەوان بەهەمان شێوە: ئەو کارەی دەبێتەهۆی دروستبوونی مرۆڤێکی خۆنەویست. بەڵام چوارچێوەی دەرونی بۆ کردار لێرەدا جیاوازە. فەیلەسوفەکان مەیلی بینینی بیرۆکەی بوونی ڕەهای بوونەوەر دەکەن لە قووڵاییەکانی خودی مرۆڤ، بیرۆکەیەکی بەماناتر لە بیرۆکەی باوکی ئاسمانی، شکۆدار لە هەڵسوکەوتیدا، باڵادەستە بەسەر خەڵکی و جیهاندا فەرمانڕەواییان دەکات بە خۆشەویستیە هەمیشەییەکەی. دواتر شایستەترە کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یۆگای کرداردا مامەڵەکردنێك بێت تێڕوانینی یەکەمیان بۆ بەدیبهێنێت. نهێنی ئەم دەستپێکردنە شاردراوەتەوە لە جیاکردنەوەیان لە یەکتر. بەشێوەیەکی تایبەت شاردراوەتەوە لە کێشانی هێلێکی جیاکەرەوە لەنێوان دەرونی ڕۆچوو لە کاردا، دەرونی هەمیشەیی کە دوورە لێوەی. گرنگیدانی مرۆڤ بە جۆرێك لە کار، زۆرجار هەڵقوڵاوی سودێکی خوازراوە کە دەرون بەدەستی دێنێت لە کارکردندا، واتە لەو بەروبوومی مادیەی بەدەستی دەهێنێت لەڕێگەی ئەم کارەوە. ئاشکرایە هاوشێوەی ئەم هیوا و خەونانە دەشێت فووبکاتە منی باڵا و ئەستوری نێوان دەرونمان زیاددەکات کە دەرکیپێدەکەین بە ئاگاییمان کەلە ژێرەوەیدا حەشاردراوە. ئەو ڕێگایەی دەمانبات بەرەو ڕوناکبوونەوە بریتیەلەو کارەی ڕۆح دەبات بەرەو جودابوونەوەی تەواو لە دەرونی بکەری کارەکە. . کاربەدەستەکە لێرەدا دەست بە کارەکەی دەکات بە دیاریکردنی ڕاستی دەرونی بەوەی بوونەوەرێکی هەمیشەییە، ئەوەی بە کارەکەی هەڵدەسێت دەرونی ئەنجامدەری کارەکەیە بە تەنها، بەڵام خودی ڕاستەقینەی پەیوەست نیە بە کارەکەیەوە و پێی هەڵناسێت. پێویستە لەسەر ئەو کەسەی دەرکدەکات بە ڕاستی بەم شێوەیە بیربکاتەوە: من هەرگیز بەهیچ کارێك هەڵناسم، وێڕای ئەوەی دەبینم و دەبیستم و هەستدەکەم و بۆن دەکەم و دەچێژم و دەڕۆم و دەخەوم و هەناسەدەدەم و دەدوێم و چاوەکانم

دەکەمــەوە و دایاندەخــەم، بــەو بــاوەڕەی هەســتەکان کاردەکــەن و جموجوڵدەکــەن لــەنێو شــتە هەســت پێکراوەکاندا(١٥). لەگەڵ بەرەوپێشچونی یۆگیکار لە دیاریکردنی ناسنامە ڕاستەقینەکەی لە دەرونی کۆتادارەوە بۆ ناسینەوەی بەوەی لەڕاستیدا دەرونی ناکۆتایە، بەمجۆرە گرنگی نادات بەو دەرئەنجامانەی لە کارەکەیەوە بەدەستی دەهێنێت لەسەر دەرونی کۆتادار، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەرکپێکردنی زیاددەکات بۆ ڕاستی وتەکەی گیتا gita: خاوەنداریێتی ڕەوایەتی تەنها بەکارکردنە، نەك بە بەروبوومەکانی، دواتر گرنگی کارکردن سەبارەت بە ئەو ئەرکێکە لەبەر ئەرکێکی تر. ((ئەوەی بە کارەکەی هەڵدەسێت ئەوەی پێویستە جێبەجێی بکات وەك ئەرکێك گرنگی نادات بە بەروبومی کارەکەی ئەو کەسە یۆگیکاری ڕاستەقینەیە))(١٦) لێرەوە چیرۆکی ئەو یۆگیکارە دەستپێدەکات کە دانیشتبو لەسەر کەناری ڕوباری گانج دوپشکێکی بینی لەبەردەمیدا کەوتە ناو ئاوەکەوە. بەوهۆیەوە دەستی درێژکرد و لە ئاوەکە دەریهێنا سەرئەنجام پێوەیدا. دوای ئەوە بەچەند ساتێك دوپشکەکە بۆ جاری دووەم کەوتەوە ناو ئاوەکە، دوبارە یۆگیکارەکە لەئاوەکە دەریهێناو ڕزگاری کرد بەڵام دوبارە پێوەی دا! ئەم کردارە بۆ دوو جاری تر دوبارەبوویەوە، لەوکاتەدا کەسێك کە سەیری ئەم دیمەنەی دەکرد سەرسام بوو، لە یۆگیکارەکەی پرسی: بۆچی بەردەوامی لە ڕزگارکردنی دوپشکەکە لەکاتێکدا تاکە پاداشتی بۆ تۆ پێوەدانەکەیەتی؟ یۆگیکارەکە لە وەڵامدا پێیووت: کاری دوپشك پێوەدانە و کاری یۆگیکار ڕزگارکردنی ئەوانی ترە هەتا لە توانایدا بێت. ئەنجامدەری یۆگای کردار هەوڵ دەدات هەموو کارێك بکات وەکئەوەی ئەمە تاکە شتێك بێت کە پێویستە لەسەری ئەنجامی بدات، ئەگەر ئەنجامی دا یان ناچاربوو وازی لێبهێنێت بۆئەوەی بە کارێکی تر هەستێت، بەهەمان جۆش و خرۆشەوە بەو کارە هەستا. ئەو هەوڵ دەدات بۆ تێرامان بەشێوەیەکی تەواو لەسەر هەموو کارێك، بەتەواوی خۆی تەرخان دەکات بۆ ئەو کارە و بیرناکاتەوە لە هیچ کارێکی تر لەو کاتەدا(١٧). ئەو هەموو هێزی خۆی بەکاردێنێت بۆ لە جێبەجێکردنی هەموو کارێك کە بۆی دانراوە، چونکە ئەنجامنەدانی واتە خۆبەدەستەوەدانی بۆ ئەو تەمەڵیەی بە سادەیی هاوواتای خودپەرستیە. بەڵام تەنها بە هەستانی بەو کارە، بەتەواوی خۆی جیادەکاتەوە لە کارەکەی و شوێنەواری کارەکەی جێدەهێڵێت ئیدی هەرچیەك ڕودەدات با ڕوبدات. کەسێکم قازانج و زیانم هەیە کەسێکم پلەوپایە و شورەیم هەیە کەسێکم چێژ و ئازارم هەیە(١٨) هەروەك کەسی پێگەیشتو بێزار نابێت بە ڕەخنە و ڕاستکردنەوە، چونکە ناسنامەی خۆی دیاری دەکات بەوەی تەمەن درێژە، کە تەواو نابێت و پێناگات تەنها بە ڕەخنەلێگرتن و ڕاستکردنەوە نەبێت، زیاتر لەوەی ئەو دەرونەیە کە ئێستا ئیدانە دەکرێت، بەهەمان شێوە یۆگیکار ئازار و شکستهێنان و شورەیی قوبوڵدەکات بەبێ هیچ شڵەژانێك، بەوەی ئەم کارانە تەنها کاردەکاتە سەر دەرونی ڕوکاری، لەکاتێکدا لە دیاریکردنی ناسنامەکەیدا بەرەوپێش چووە بۆ دەرونێکی جێگیر کە شایەنی گۆڕان نیە، بوونەرەرێکە لەژێر چینی دەرونی ڕوکاریەوە، ئەو دەرونە جێگیرە هەمیشەییە کە گۆڕانکاریەکانی قەدەر ناتوانێت بیهەژێنێت و شادومانیەکەی بشێوێنێت کە سنوری نیە. لەکاتێکدا دیاریکردنی نانامەکەی جێگیر دەبێت بە بەردەوامی لەبەرئەوەی خاوەن خودێکی هەمیشەییە، ئەوا هەست بە ئارامی دەکات تەنانەت لەنێو چالاکیەکی چڕ و پڕدا، هاوشێوەی چەقی جێگیری ڕەوڕەوەیەك کە بەخێرایی دەسوڕێتەوە، لەکاتێکدا ئارام دەردەکەوێت لەنێو زیاترین هەوڵەکانەکاندا. وێڕای ئەوەی چوارچێوەی بیرکردنەوەکانم کە سروشتی فەلسەفی مامەڵەی پێدەکات لەگەڵ یۆگای کرداردا بەشێوەیەکی توند جیاوازە لەو شێوازەی سروشتی ئەڤینی مامەڵەی پێدەکات، بەڵام ئەستەم نیە تێبینی ئەوە بکەین کە هەردو سروشتەکە ئامانجیان گەیشتنە بە هەمان سەرئەنجام. هەردوکیان سیستمی پارێزکردن بەکاردێنن بۆ برسیکردنی کەسایەتی سنوردار هەتا مردن لە سەرئەنجامی ئەو کارانەی کە خۆراکیان

لێوەردەگرێت. هەروەها هەردوکیان وازناهێنن لە نزمترین ئاستی خۆشەویستی خۆڕسکی دەرون، کە هەموو جیهان بە خودپەرستیەکی دروستی دادەنێت کە پێویستە هەبێت ئەگەر هەر بوونەوەرێکی زیندو ویستی تێبکۆشێت بۆ مانەوەی لە ژیاندا. هەردوکیان خوازیاری بەدەستهێنانی خەڵاتێکن کە بەرزبێتەوە بەسەر بوونی کەسیەتیدا. بهاکتی واتە دڵداری یەزدان هەوڵدەدات بۆ خوێنەدان بە خود و پێشکەشکردنی دڵی بە خۆشەویستە هەمیشەییەکەی. جنانی واتە شوێنکەوتوی یۆگای تێڕامان و زانست هەوڵدەدات بۆ فرێدانی خود بەو باوەڕەی بەو کارەی ناخی بوونمان ئاشکرا دەبێت بۆ ئەوانەی دەیانەوێت بیبینن، هیچ کاتێك کاریگەر نیە بە شتێك کە پەیوەندی هەبێت بە کەسایەتیە تایبەتەکەیەوە. ناخی دەرون ((بوونێکی ئارامگرتو و شکۆدارە، بەرزدەبێتەوە بەسەر ناوچەکانی چالاکی سیستمی ئاگایی و نائاگاییدا، گۆشەگیرە، گوێنادات بە ململانێکان کە پێشتر پاڵپشتی کردوە لە ژیانی تایبەتی تاکەوە)). ئەم بوونە ئەڵماسیە کە هیچ ناوێکی نیە، هەرگیز ئەو شتە نیە کە شانازیمان پێوە دەکرد و نازمان دەکێشا لە کەسایەتیە تایبەتەکەماندا، چونکە ئەمە بوونێکە بەرزدەبێتەوە بەسەر هەموو ئاسۆیەکی ئاگاییدا، ئایا ئاگایی دیار بێت یان شاردراوە. ئەم بوونە ئەڵماسیە داپۆشراو بوو بە بەرگەکانی جەستە و کەسایەتی، جگەلە چینە تاریکەکانی دەرونی ڕوکاری کە وێنەکەی شاردبوویەوە. گەوهەری نیوەدیاری دەروون کە هەموو ئارەزوە تایبەتیەکان تیایدا لەناوبراوە، ڕێگەی پێدەدرێت کە بینراو بێت هەروەك چۆن بنی گۆمێك دەبینرێت. دواتر لەو کاتەی دەرکدەکرێت بەم بوونە ئەڵماسیە، ئەوا دەرکەوتن و دەرکپێکردنی زانینێکی ڕاستەوخۆی پێدەبەخشێت بەوەی کە ئەمە ناسنامەی ئادەمیزادی ڕاستەقینەیە. لەو کاتەدا گەوهەری ژیان یاددەکرێتەوە و پێشوازی لێدەکرێت، وێڕای ئەوەی جیاکراوەتەوە لە هەموو شتێك لەم پێکهاتە بینراوەدا: جەستە و دەروون کە بە هەڵە دامان دەنان لەژێر کاریگەری خەیاڵ و فریوخواردندا بەهۆی نەزانیمانەوە کە ئەمە گەوهەری ڕاستەقینە و هەمیشەیی بوونمانە(١٩).

## ڕێگای چوون بەرەو یەزدان لەڕێگەی وەرزشە دەروونیەکانەوە

بەهۆی لوتکە دیارەکەوە کە ئەم یۆگایە ڕێنمونیمان دەکات بۆی، ناسراوە لە هینددا بەناوی ڕاجا یۆگا raja yoga واتە: یۆگای پادشایانە یان ڕێگای پادشایی بەرەو تەواوبوون و یەکگرتن. ئەم ڕێگایە تایبەتە بەو کەسانەی لە بەنڕەتدا کردارین، بریتیە لە چوون بەرەو یەزدان لەڕێگەی وەرزشە ڕۆحیەکانەوە. ڕۆژئاوا ڕێزیگرتوە لە زانای ئەزمونکار لە تاقیگەکەیدا، بەڵام گومانی هەبووە لە هەمان زانایە لەکاتێکدا توێژینەوە دەکگات لەو شتانەی پەیوەندیان هەیە بە ڕۆحەوە(٢٠)، تاوانباری دەکات بە مەزنکردنی ئەزمونە تایبەتیەکانی لەکاتێکدا دایدەنێت بە دوا تاقیکردنەوەی ڕاستی. بەڵام هیند هاوشێوەی ئەم ترسەی نەبوو، بەوەی وابیری دەکردەوە دەشێت کێشەکانی ڕۆح چارەبکرێت بە هەمان بەرنامەی ئەزمونی بەکارهێنراو لە توێژینەوە لە شتەکانی جیهانی دەرەکی، جگەلەوە هاندەر بووە بۆ ئەو کەسانەی مەیلی پابەندبوون دەکەن بە ڕۆیشتن بەرەو یەزدان بەم ڕێگایەدا. ئەم ڕێگایەیان چوارەمین ڕێگا پێکدەهێنێت لە چوون بەرەو ئامانج، ئەمە ڕاجا یۆگایە واتە یۆگای پادشایانە. هەموو ئەوەی پێویستە تیایدا لەسەر شوێنکەوتو بریتیە لەوەی گومانێکی بەهێزی هەبێت کە دەرونی ڕاستەقینەمان زۆر جوانتر و فراوانترە لەوەی دەرکیپێدەکەین لە ئێستادا، دووەم: پێویستە تامەزرۆی چەشتنی ڕاستەوخۆی ئەم تاقیکردنەوەیە بێت. بەبێ ئەم دوو شتە، لەلای شوێنکەوتو خۆڕاگری تەواو بوونی نابێت کە یارمەتیدەریەتی بۆ گەیشتنی بە ئامانجەکەی، یان تاقیکردنەوەکانی ئاڕاستەی جیهانی دەرەکی دەکات بۆئەوەی ببێتە خوێنکارێکی ڕاستەقینە. بەڵام ئەگەر ئاڕاستەکردنی بنەڕەتی هەبوو ئەوا هەموو ئەوەی پێویستە لەسەر یۆگیکار بریتیە لە ئەنجامدانی زنجیرەیەك لە تاقیکردنەوە بەهەمان خۆڕاگری و وردی پێویستەوە بۆ توێژەرەوەی فیزیایی، دواتر تێبینیکردنی دەرئەنجامەکە زۆر بەوردی. ئەگەر دەرئەنجامەکە سفر بوو، تاقیکردنەوەکان بە لێهاتویی ئەنجامدرا بوو، مانای ئەمە سەلماندنی مایەپوچی بیردۆزەکەیە، یان بەلایەنی کەمەوە سەلماندی مایەپوچیەکەیەتی لەلای ئەو تاقیگەیە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو تاقیکردنەوانە دەبێتەهۆی دروستبوونی شارەزاییەك وردەوردە پاڵپشتی لێدەکرێت هەتا پرۆسەکە زیاتر بەرەوپێش بچێت. بەپێچەوانەی زۆربەی تاقیکردنەوە پراکتیکیەکانی ڕۆژئاوا کە ئەنجام دەدرێن لەسەر جیهانی دەرەکی، لە یۆگای پادشایانەدا ئەم تاقیکردنەوانە ئەنجامدەدرێت لەسەر دەرونی مرۆڤ. تەنانەت کاتێك زانستی ڕۆژئاوایی بەرەو پشکنینی خود هەروەك لە زانستی پزیشکیدا ئەنجام دەدرێت، بەوەی ئاکار بە پێویستی دەزانێت کە تاقیکردنەوە مەترسیدارەکان ناکرێت ئەنجام بدرێن تەنها لەسەر خودی کەسەکە نەبێت، چونکە جەختکردنەوەی هیندی جیاوازە. چونکە تاقیکردنەوەکان لە یۆگای پادشایانەدا ئەنجام نادرێت لەسەر جەستەی مرۆڤ (وێڕای ئەوەی جەستە بە دڵنیاییەوە بەشدار دەبێت لەو تاقیکردنەوانەدا) بەڵکو لەسەر ڕۆح ئەنجام دەدرێت!. ئەم ئەزمونانە شێوەی ئەنجامدانی کۆمەڵێکی دیاریکراو لە مەشقی ئەقڵی وەردەگرێت کە شوێنەوارەکەی تێبینی دەکرێت لەسەر حاڵەتی ڕۆحی مرۆڤ. داواناکرێت لە یۆگیکاری یۆگای پادشایانە کە باوەڕبهێنێت بە هەر بیروباوەڕێکی پێشوتر. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ناکرێت هیچ تاقیکردنەوەیەك بەڕێوەببرێت بەرەو بەدەستهێنانی ئەنجامێکلی باش تەنها لەسەر بنەمای ئەگەرەکانە نەبێت کە سەرئەنجامەکان لەدواییدا پاڵپشتیان لێدەکات یان ڕەتیان دەکاتەوە. ئەو ئەگەرەی دەکرێت لێوەی دەست بکەین بە ئەنجامدانی یۆگای پادشایانە بریتیە لە بیروباوەڕی هیندۆسیەت لەبارەی مرۆڤەوە. هەروەك پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە زیاتر لە جارێك، بەڵام پێویستی بە دوبارە ڕونکردنەوەیە چونکە باکگراوندێکی تێگەیشتن پێکدێنێت کە بە پشتبەستن پێی تاقیکردنەوەکانی ڕاجا یۆگا ڕێکخراوە. تێگەیشتنی هیند لەبارەی مرۆڤەوە بونیاددەنرێت لەسەر بیردۆزێکی بنەڕەتی دەڵێت مرۆڤ بوونەوەرێکی فرەچینە. ئەم باسکردنە هونەری و تەکنیکی و ئاڵۆزە هەتا ڕادەیەکی زۆر دوور، لەوانەیە لە کۆتاییدا

بســەلمێنرێت لــەژێر ڕونــاکی زانیاریــە زانســتیە نوێکانــدا، ئەمــە واتایــەکی ژمــارەیی هەیــە زیــاتر لــە مانــا ڕاستەقینەکەی. هێندە بەسە بۆ ئەم مەبەستە بیردۆزەکەمان کورتبکەینەوە بەی چوار چینە سەرەکیەکە. یەکەم: کەلە هـەموویان دیـارترە، جەسـتەی مرۆڤـە. دووەم ئـەو بەشـەی ئەقڵیـەتی کـە ئاگـای لێیـەتی، واتـە کەسـایەتی دەرکپێکەر کە مرۆڤ لەڕێگەیەوە هەست بە شتەکان دەکات. لەژێر ئەم دوو چینەوە چینی سێیەم دێت بریتیەلە کێڵگەی پشت ئاگایی تاك، کە پلەبەپلە دروستدەبێت، بە درێـژایی ساڵەکان، لـە ئەزمونـە تایبەتیـەکانی مـرۆڤ لـە ڕابردودا. ئەم پشت ئاگاییە وێڕای ئەوەی نادیارە لە ئاگاییەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە ژیانی پێکدەهێنێت بە ڕێگایەکی قووڵ، زانستی دەروونناسی هاوچەرخ دەستیکردوە بە ئاشکراکردنی وردەکاریەکانی. ئەم سێ بەشەی مـرۆڤ، هاوشـانیان هەیـە لـە شـیکاری ڕۆژئـاوایی هاوچـەرخدا بـۆ مـرۆڤ. بـەڵام ئـەو خاڵـەی بەئەگەردانانەکـەی هیندۆسیەتی پێ دەناسرێتەوە بریتیە لە ئەگەری بوونی بەشی چوارەم، کە دەکەوێتە ژێر سێ چینەکەی ترەوە، کە بریتیەلە خودی بوون، بوونی ناکۆتا کە توشی نائومێدی نابێت و هەمیشەییە. ((من بچوکترم لە بچوکترین گەردیلە، هەروەها گەورەترم لە گەورەترین تاوان. من هەموو شتێکم، گـەردونی جۆراوجـۆر، فرە شێوە و ڕەنگ، جوان و شادومان، سەیر و سەرسامکەرم. من دێرینم، من مرۆڤی یەزدانمز من گەوهەری ئاڵتونم. من پلەوپایەی جوانی یەزدانیم))(٢١). هیندۆسەت هاوڕایە لەگەڵ زانایانی شیکاری دەرونـی بـەوەی ئەگـەر توانیمـان بەشێك لـە گوێچکەماسی نـاو قوڵـایی بوونمـان بدۆزینـەوە، واتـە لـە ڕوکاری سێیەمی بوونمانـەوە، ئـەوا چێژوەردەگرین لـە فراوانبـوونی وزەکانمـان بەشـێوەیەکی بەرچـاو، تازەکردنەوەیـەکی لەڕادەبـەدەر بـۆ ژیانمـان، بـەڵام هیندۆسـیەت وابیردەکاتەوە ئەمە تەنها سـەرەتایە بۆ بەئەگەردانانەکـەمان. هیندۆسـەت دەڵێـت: چـی ڕودەدات ئەگـەر شتێکی لەبیرکراو و مردو زینـدو بکەینـەوە تـەنها لەڕێگـەی خۆمانـەوە نـا، بەڵکو لـە ڕێگـەی مرۆڤایەتیـەوە بەگشـتی، وەك شتێك کە کلیلی مەتەڵی پاڵنەرەکانمان پێنادات کە بەرگەی تایبەتمەندیە جەستەییەکانمان ناکات بە تەنها بەڵکو بە کلیلی مەتەڵی هەموو ژیان و هەموو بوون، لەوکاتەدا پێشبینی چی دەکەین؟ ئایا شتێکی مێژویی گرنگمـان نەدۆزیوەتەوە؟ ئایا بەخشندە نین بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا؟ ئەمە بانگەوازێکی ئاشکرایە لـە پاشەکشـەکردن لـە پانۆرامای جیهانی نالۆژیك (واتـە کـە پەیوەنـدی نێـوان شـتەکان ڕون ناکاتـەوە یـان هۆکارەکـانی. . . ) بۆ شـوێنە هۆکاریە قووڵەکانی دەرون کە لەوێدا پرسیار و وەڵامی ڕاستەقینە هەیە. بەڵام جگەلەوە، ناکرێـت وەڵامدانـەوەی ڕاجا یۆگا باسبکرێت بەوەی تـەنها وەڵامدانەوەیەکەوە و هیچـی تـر، بـۆ هـەر بانگـەوازێکی تایبـەت و دیاریکـەری دەربڕینـەکان. ئەمـە بـە واتایـەکی تـر ڕەتکردنەوەیـە بـۆ ڕێگەپێـدان بـە داواکاریـەکانی بوونی ڕۆژانـی کـە مـرۆڤ سەرقاڵ بکات لە هەندێك داواکاری کە لە ناویدا بەبێ هودە چاوەڕوانە. ئەمە جۆرە لێدانێکە بۆ بوونی بێزارکـەرز یۆگیکاری سەرکەوتو بریتیە لەوەی سەرکەوتو دەبێت لە گواستنەوەی کێشـەی ژیـان بـۆ ئـەم ئاستە لـە گـەورەیی بۆئەوەی لەوێدا چارەسـەری بکـات. ژیـری خۆڕسـکی ئـەم جـۆرە کەسـە سودمەند دەبێـت بـۆ تێپەڕانـدنی کێشـە کۆمەڵایەتیـەکان نیـە، هێنـدەی دەبێتـە کانگایـەك کـە تـەواوبوونی نیـە هـەموو کۆمەڵگـەکان و هـەموو مرۆڤایـەتی بەهۆیەوە نوێ دەبنەوە، چونکە ئەم گەیەنەرە وازدێنێت لە پەیوەندی ڕاستـەوخۆ بـەم کانگا سـەرەتاییەوە. ئـەو وەك بەشێك لە جەستە دەمێنێتەوە، بەڵام دەبێتە مرۆڤێکی هەمیشەیی، گشتگیر و جیهـانی لـە ڕوحدا. ئامـانجی ڕاجا یۆگـا سـەلماندنی ڕاستودروستی ئەگـەری چوار چینەکەی مرۆڤـە، بـە بردنـی توێـژەرەوە بـەرەو چەشـتن و ئەزمونکردنی کەسایەتی ڕاتەوخۆ لە جیهانی پشت ناخمانەوە. ئەمە ڕێگای دوورەپـەرێزی خۆویستانەیە، ئەمـە یەکێکە لە جێبەجێکردنە کلاسیکیەکان بۆ بلیمەتی مرۆڤ لە هەریەکە لە هێڵەکان و سەرکێشیەکاندا، بەڵام لێرەدا بەردەوامە هەتا تەواوبوونی بە تـەواوی. ئامـانجی هیچ کـەمتر نیـە لـە پەلکێشـکردنی وزەی دەرونـی مـرۆڤ بـەرەو

بەشێکی قووڵتر لە بوونی و مەزنترین بەشی، چالاککردنی ئەو کیشوەرە ونبووەی خودی ڕاتەقینە. گومانی تیادا نیە ئەم ڕێگایە چەندین مەترسی تێدایە، ئەگەر کەسی شوێنکەوتو پابەند نەبێت بە مەرجەکانی سەرکێشیەکەوە، ئەوا کاتەکانی بەفیڕۆداوە بەبێ هودە، ئەمە لە باشترین حاڵەتەکاندا، بەڵام لە حاڵەتە خراپەکاندا لەوانەیە ببێتەهۆی توشبوونی بە شڵەژان لە کاری دەمارە خانەکاندا neurosis. بەڵام ئەگەر شوێنکەوتو هەستا بەم سەرکێشیە بەشێوەیەکی دروست و لەژێر چاودێری بەڕێوبەرێك کە ڕاستی ڕێگاکە بزانێت، ئەوا کەسایەتی دەتوانێت هێزە نوێکان هەڵبمژێت کە تازە هەستی پێکردون. بەمجۆرە بەڕادەیەك ئەمە تاقیدەکەیتەوە و دەیچێژیت خەریکە دەچێتە سەرو مرۆڤایەتیەك لە ئاگایی خود و کۆنترۆڵکردنی تەواو. لەدوای ئەوەی ئەم ئەگەرەمان زانی کە ڕاجا یۆگا دەیخاتە بەردەممان، ئێستال ئامادەین بۆ ناسینەوەی هەشت هەنگاوەکە بۆ خودی پڕۆسەی تاقیکردنەوەکە: ١ و ٢-دوو هەنگاوی سەرەتایین پەیوەندیان هەیە بە چەند کارێکی ڕێخۆشکەری ئاکاریەوە: هەریەکە دەست دەکات بە کارێك بۆ دۆزینەوەی خودی ڕاستەقینەی، لەڕێگەی دەروون پشکنینەوە introspection، یەکسەر هەست بەوە دەکات لە هەموو لایەکەوە دەورەدراوە بە لێشاوێك لە شتی فریودەر کە دەیانەوێت ئاگایی بپچڕێنن و ڕێگری لێ بکەن لە بەرەوپێش چوونی. دیارترینیان لەو فریودەرانە دوو شتن: ئەو ئالودەبووانەی جەستە لەسەری ڕاهاتوە، هۆکارەکانی دڵەڕاوکێ و شڵەژانە کۆمەڵایەتیەکان. بۆ نمونە دانیشتنی تێرامان خەریکە دەچێتە ئاستێکی هەتەریەوە، بەڵام لەپڕ هەست بەوە دەکات جەستەی پێداگریەکی بێ مانا دەکات بۆ کێشانی جگەرەیەك یان خواردنەوەی مەی. یان وا هەست دەکات دانیشتنی تێرامانەکە لەپڕ لە جوڵ دەوەستێت بەهۆی بیرکردنەوەی لەو کاتانەی کە زوڵمی لێکراوە، یان هەنستکردن بە چاوچنۆکی یان ئازاری ویژدان. کەواتە دوو هەنگاوە سەرەتاییەکەی ڕاجا یۆگا هەوڵ دەدەن بۆ پاککردنەوەی ئەو کەشوهەوایە و داخستنی دەرگامان بەڕووی دەستێوەردانە دەرەکیەکانەوە هەتا ئەو خاڵەی دەتوانین لێوەی دەست بکەین بە پشکنینی هەتەریانەی دەرون. هەنگاوی یەکەم خۆ ڕاهێنانە لەسەر پێنج شتی قەدەغەکراو: وازهێنان لە ئازاردانی خەڵك، لە درۆ، دزی، لە هەوەسبازی[١٥] و چاوچنۆکی.

هەنگاوی دووەم: پێنج کرداری گرنگ دەگرێتەخۆی: پاکوخاوێنی(جەستە و ئەقڵ)، ڕازیبوون و خۆشنوودی، ڕێکخستنی دەروون، هەوڵ و تێکۆشان، تێرامانی یەزدانی. هەردو هەنگاوەکە پێکەوە پێنج ڕاهێنانە ڕۆحیەکە پێکدەهێنن، بە وازهێنان لەو پێنج شتە ئالۆزە. تەنانەت فەرماندە ژاپۆنی و چینیەکان ڕاهاتون لەسەر ئەنجامدانی ڕاجا یۆگا لە پەرستگا بوزیەکان، بەبێ هیچ گرنگی پێدانێکی ئایینی بەڵکو تەنها لەبەر زیادکردنی چالاکی ئەقڵی و جەستەیی، ئەوەیان بۆ دەرکەوت پابەندبوون پێویستە وەك مەرجێك بۆ سەرکەوتنیان لەم تێرامانەیاندا.

٣-ڕاجا یۆگا جەستە بەکاردەهێنێت وێڕای ئەوەی دوا ئامانجی بریتیەلە ئەقڵ. بەواتایەکی تر ئەو کاردەکات لە ڕێگەی جەستەوە بۆئەوەی لە ڕێگایەوە بگات بە ئەقڵ. گرنگی پێدانی سەرەکی بە جەستە، وێڕای تەندروستیەکەی بەشێوەیەکی گشتی، بریتیە لەوەی بیپارێزێت لە حاڵەتی قەدەغەکردنی دەستێوەردانی بۆ سەر ئەقڵ و تێرامانی. لەڕاستیدا ئەم کارە ئاسان نیە، چەونکە جەستەی ڕانەهاتو ناتوانێت ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە بەبێ جووڵە یان داواکردنی شتێك. هەموو هەستپێکردنێکی دەستێوەردانی جەستە داواکردنە لە ئەقڵ تا ئاگای لێی بێت، دواتر سەرگەرم کردنمانە بۆ وازهێنان لە گرنگی پێدانی ناوەندی. کەواتە ئامانجی ئەم

١٥ مەبەست لە هەوەسبازی sensuality: ڕۆچوون لە چێژە هەستپێکراوە جەستەییە حەرامکراوەکانی وەك زینا و نێربازی و مێبازی، ئەمە پێویستە وازلێبهێنرێت بەڵام ئەمە مەبەست لێی وازهێنان نیە لە ژنهێنان.

سێیەمین هەنگاوە، دەرگا داخستنە بەڕووی ئەم جۆرە سەرگەرمیە. لێرەدا حاڵەتێکی جەستەیی داواکراوە لەنێو پشونەدان، دواختی خەوتن. دۆزینەوە هیندۆسیەکان ناودەنرێت بە بارە جەستەییەکان کە دەکرێت هاوسەنگی دابین بکات لەم خاڵە ناوەندیەدا: ئەسانا asanas وشەیەکی سنکریتیە ماناکەی بارە جەستەییە تایبەتیەکان postures، بەڵام لە ڕاستیدا هەڵگری واتای پشودانە. جیهان لە ئەمڕۆدا دانی ناوە بە سودە جەستەیی و دەرونیەکانی هەندێك لەم بار و شێوازە جەستەییانە، ئاماژەکردنی هیند بە ٨٤ باری پشودانی جەستەیی، لێهاتویی و ئەزمونە هیند پیشان دەدات لەم بوارەدا، بەڵام نزیکەی پێنج شێوازیان دادەنرێن بە یارمەتیدەر و ڕێخۆشکەر بۆ تێڕامان. یەکێك لەم پێنج شێوازە، ئەو شێوازەیە سەلمێندراوە کە زۆرترین جەماوەری هەیە، شێوازی للوتس کە تیایدا یۆگیکار دادەنیشێت لە حاڵەتێکی نمونەییدا باشتروایە دابنیشێت لەسەر پێستی بەرخ وەك هێمایەك بۆ ئارامی بەشێوەیەك هەر قاچێکی دەخاتە سەر ڕانی تەنیشتی و بڕبڕەی پشتی ڕێك دەکاتەوە پێویستە هیچ چەمانەوەیەکی تیا نەبێت لە سەرەتاکەیەوە واتە لە خوارەوە هەتا ناو مێشك، دەستەکانی ختوەتە سەر باوەشی، دەتەکانی دەهاتە ەر یەکتر بەجۆرێك پەنجەی گەورەی بەیەکتر تەریب بنز بەپێچەوانەی مەسیحیەتەوە کە داوای چاو داختن دەکات لەکاتی نوێژکردندا بۆ دەرگا داخستن بەڕووی ئەو شتانەی سەرقاڵمان دەکەن، چونکە ڕۆژهەڵات بەهۆی ترسانی لە شتە فریودەرە دەرەکیەکان وا بە باش دەزانێت چاوەکان نیوە داخراو بن واتە بە

تەواوی دانەخرێت و سەیرکردن چڕبکەنەوە لەسەر خاڵێك دەکەوێتە نێوان چاوەکانەوە لەسەر بنکەی لووت یان شوێنی دەم(٢٢). ئەو کەسانەی دەستدەکەن بە ئەنجامدانی ئەم جۆرە دانیشتنە شێوازی للوتس بۆ یەکەمینجار لە ژیانیاندا دوای ئەوەی جەستەیان گەشەی کردوە و گەیشتونەتە ئاستی تەواوبوون، دانیشتن بەم شێوەیە بە کارێکی ئازاربەخش دادەنێن، چونکە دەبێتەهۆی ڕەقبوونی ماسولکەکانیان کە پێویستی بە چەند مانگێك هەیە هەتا خۆیانی لەسەر ڕابهێنن. بەڵام کاتێك جەستە ڕادێت لەسەر ئەم شێوازە دانیشتنە بەشێوەیەکی سەرسامکەر بە ئارامبەخشی دادەنێت، هۆکاری ئەمە بریتیەلەوەی لەم دانیشتنەدا ناوەندی دەمارەخانەکانی هەردو پەلی خوارەوە سڕدەبن بەشێوەیەکی کاتی، کە دەبێتەهۆی خاوبوونەوەیەکی ئارامبەخش بۆ جەستە بەم کارە کەشوهەوایەکی گونجاو دروست دەبێت بۆ مێشك بۆئەوەی هەستێت بە تێڕامان. ئەگەر دەرك بەو ڕاستیە بکەین ڕاکشان پەلکێشمان دەکات بەرەو نوستن، ئەوا هیچ بارێکی تر نیە بتوانێت وا لە جەستە بەکات بەبێ جوڵە بمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ مانەوەی بە ئاگایی لە هەمان کاتدا.

٤-بارەکانی یۆگا ئامانجیان پاراستنی ئاگایی تێڕامانە لە دەستێوەردانەکانی کۆئەندامی ماسولکە کە دەیەوێت ئەم حاڵەتی ئارامیەی بپچڕێنێت. بەڵام کێشەکە بریتیەلەوەی هەندێك جموجوڵی ماسولکەیی پێویستە هەبێت، وەك جوڵەی هەناسەدان. چونکە بەدڵنیاییەوە ناکرێت یۆگیکار لە ژیان بەردەوام بێت ئەگەر ویستی لە هەناسەدان بوەستێت، لە هەمان کاتدا لەوانەیە هەناسەدانی ناڕێك ئارامیە ئەقڵیەکەی لێ بشێوێنێت. ئەوانەی هێشتا هەوڵدانی تێڕامانیان تاقینەکردوەتەوە ناتوانن تێبگەن لەوەی هەناسەدانی ناڕێك چەندە بیرکردنەوە دەشێوێنێت. چونکە خرۆشاندنی بۆریەکانی هەوا و هەوکردنی لەوانەیە ببێتەهۆی کۆکەکردن و ئامانجی پاککردنەوەی قورگە. هەتا هەناسەدان قوڵتر بێت زیاد لە پێویست، ئەمە دەبێتەهۆی پچڕاندنی پێڕامانی یۆگیکارەکە و شێواندنی بیرکردنەوەی. تەنها ئەمانە هەراسانکەر نین لەم پرۆسەیەدا. لەماوەی ئارامی تێڕامانی ناخی ئاگاییدا دەکرێت هەناسەدان کاربکات وەك مشارێك ئەم ئارامیە ببڕێتەوە و بیشێوێنێت. کەواتە ئامانجی مەترسی چوارەمی ڕاجا یۆگا بریتیەلە ڕێگریکردن لەم دەستێوەردانانە، لەڕێگەی تەواو کۆنترۆڵکردنی

هەناسەدانەوە. ئەو كۆمەڵە ڕاهێنانەی پێویستە ئەنجامبدرێن بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە زۆرن و هەمەچەشننز هەندێكیان وادەردەكەون وەك فێربوونی هەناسەوەرگرتن لە یەكێك لە كونە لوتەكانەوە و هەناسەدانەوە لە كونەلوتەكەی ترەوە، ئەمە كارێكی سەیرە بەڵام ئەگەر بیربكەینەوە لە دەستبەسەراگرتنی تەواو ئەمە كارێكی سەیر نابێت. وێڕای ئەوە بەشێوەیەكی گشتی، زۆربەی ڕاهێنانەكان كاردەكەن بۆ هەناسەدرێژكردنەوە، ڕێكخستنی هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوە، كەكردنەوەی بڕی ئەو هەوایەی لەش پێویستی پێیەتی. بۆ نمونە ڕاهێنانێكی نمونەیی هەیە داوای هەناسەدان دەكات بە نەرمی و ئارامی و شێوەیەكی ڕێكخراو، بەشێوەیەك هەست بەوە نەكرێت ئایا كەكە هەناسەوەردەگرێت یان دەیداتەوە؟ وەستاندنی كاتی هەناسەدان گرنگیەكی تایبەتی هەیە، چونكە تەنها لەكاتێكدا هەناسەدان دەوەستێت دەكرێت جەستە بگات بە لوتكەی ئارامی. بۆ نمونە كاتێك یۆگیكار هەڵدەسێت بەسوڕێك كە پێكدێت لە ١٤ یەكەی هەناسەوەرگرتن و ٦٤ وەستاندنی هەناسەدان و ٣٢ یەكەی هەناسەدانەوە ئەوا ماوەیەك هەیە تیایدا چالاكی و كاری ڕاستەقینە دەوەستێت و دواتر ئەقڵ ئازاددەبێت لە دەەڵاتی جەستە بەشێوەیەكی بەرچاو، ئەمە دەبێتە ساتەكانی هەلی ئەنجامدانی كارە داواكراوەكە. بهاگافاد گیتا دەڵێت: ((لە شوێنێكدا كە هەوای تیا نیە، ڕوناكی چرا نالەرزێت))(٢٣).

٥-ئارامە و جەستەی پشودەدات، هەناسەدانی ڕێكخراوە، كەسی یۆگیكار ئێستا دادەنیشێت بۆئەوەی سەرقاڵی تێرامان بێت. لەپڕ گوێی لە دەنگی جیڕەی دەرگاكە دەبێت یان ڕوناكی مانگ دەبینێت دەدرەوشێتەوە لەبەردەمیدا لەسەر زەوی ژورەكە، یان هەست بە مێشولەیەك دەكات كە بە ملیەوە دەدات، بەمجۆرە دوبارە دێتەوە ناو ئەم جیهانە.

((ئەقڵی مرۆڤ جێگیر نابێت

سەركێشە تا ڕادەیەكی زۆر

لەژێر چەپۆكی هەستەكاندا (كە بەتەواوی دەستی بەسەریدا گرتوە)

بەڕاستی وابیردەكەمەوە

ملكەچكردنی قورسترە لە ڕێگەگرتن لە بای بەهێز))(٢٤)

هەستەكانی مرۆڤ ڕودەكاتە جیهانی دەرەكی. بەهای هەستەكان لە ژماردن نایەت چونكە وەك كۆمەڵە پردێكن مرۆڤ دەبەستنەوە بە جیهانی سروشتەوە. بەڵام گرنگیپێدانی یۆگیكار لەسەر شتێكی ترە. ئەو دەوەستێتەوە لەسەر ڕێگایەك دەمانبات بەرەو جیهانێكی سەرنجڕاكێشتر، ئەوە جیهانی ناخی خودی مرۆڤە، كە تیایدا دوا نهێنی ژیان هەیە، ئەو ئێستا بێزارە لە دەستێوەردانە بەردەوامە پێشبینی نەكراوەكانی هەستەكانی. گومانی تیا نیە جیهانی دەرەكی سیحر و جوانی خۆی هەیە، بەڵام سەبارەت بەو كێشەیەی كە ئەو تیایدا ڕۆچووە لە ئێستادا، جیهانی دەرەكی هیچ ڕۆڵێكی نیە، جگەلە كات بەفیڕۆدان، چونكە ئەوەی كەسی یۆگیكار هەوڵدەدات ئاشكرای بكات دەكەوێتە پشت ڕوكاری دەرەوەی ژیان. ئایا لەپشت ڕوكاری دەرەوەی ئەم جیهانە دەرەكیەوە ژیانێكی قوڵتر هەیە كە مردنی تیا نەبێت؟ ئایا لەپشت دەركپێكردنی ڕوكاریمانەوە بۆ بابەت و شتەكان، ڕەهەندێك لە ئاگایی هەیە كە تەنها لە ئاستدا جیاواز نەبێت بەڵكو تەنانەت لە جۆریشدا؟ یۆگیكار ئەگەردانانێك تاقیدەكاتەوە دەڵێت: ڕاستی قووڵە كراوەیە بە تەنها لەڕووی ئەو كەسانەی ئاگاییان ئاڕاستەدەكەن بەرەو ناوەوەیان. لەم تاقیكردنەوەدا هەستەكان لەدەرەوەی ئەم چوارچێوەیەدا دەستێوەردەرن.

ئۆپانیشادات دەڵێت: ((هەستەکان ڕوودەکەنە جیهانی دەرەکی، لەبەرئەوە مرۆڤ ڕودەکاتە دەرەوەی و بوونی ناخی خۆی نابینێت. چەندە دەگمەنن ئەو مرۆڤانەی ژیرن، چاوەکانیان دادەخەن لەبەردەم شتە دەرەکیەکان، بۆئەوەی سەرکەوتنی ئاتمان ببینێت لە ناخیدا؟!)). دوای پێنجسەد ساڵ بهاگافاد گیتا هەمان وتەی دوبارە کردەوە و وتی:

((تەنها ئەو یۆگیکارەی

شادومانی وکامەرانیەکەی دەبینێتەوە لە ناخیدا

ئاشتەواییەکەی لە ناخیدا

ژیری خۆڕسکی لە ناخیدا

دەگات بە یەزدان برهمان

هەست بە ئازادبوون و دڵخۆشی لە ڕادەبەدەر دەکات نیرڤانا))(٢٥).

لێرەوە، مەهاتما گاندی پێنیازەکەی خۆی خستەڕو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەم سەردەمەمان، بەپشت بەستن بە باکگراوندی سێ هەزارساڵی ئەم ئەگەردانانە، لەکاتێکدا بە سادەیی وتی: ((تیشك بخەرەسەر ناخ)).

کەواتە هەنگاوی کۆتایی لە پرۆسەی بەدیهێنانی گواستەوەی ڕیشەیی لە جیهانی دەرەکیەوە بۆ جیهانی ناوەکی بریتیەلە داخستنی پەنجەرەی هەستەکان بەتەواوی، چونکە تەنها بەم کارە دەکرێت دەرگا دابخرێت بەرەوڕووی ژاوەژاوی جیهانی دەرەکیدا. بەم داخستنە دەرگایە بەڕووی هەستەکاندا کارێکی پراکتیکیە دەکرێت ئەنجام بدرێت بەبێ پێویستی ئەنجامدانی نەشتەرگەری، ئەمە کارێکە هەریەك لە ئێمە تاقیکردوەتەوە. ژنێك مێردەکەی بانگ دەکات بۆ نانخواردنی ئێوارە، بەڵام دوای پێنج خولەك مێردەکەی سورە لەسەرئەوەی هیچی نەبیستوە لە ژورەکەی تەنیشتیدا، لەکاتێکدا ژنەکە جەخت دەکاتەوە لەسەرئەوەی بانگکردنەکەی بەتەواوی بیستراو بووە، بەدڵنیاییەوە گوێی لێبووە. هیچ یەکێکیان درۆ ناکات. ئەمە کێشەی پێناسەکردنیەتی. ئەگەر واتای بیستن لێدانی چەند شەپۆلێکی دەنگی دیاریکراو بێت بۆسەر پەردەی گوێیەکی تەندروست ئەوا بەڕاستی گوێی لێبووە. بەڵام ئەگەر واتاکەی گواستنەوەی دەنگ بێت بۆ ئاگایی ئەوا گوێی لێ نەبووەو هیچ شتێکی ناوەکی نیە لەم دیاردەیەدا. شیکردنەوەکەی شاردراوەتەوە زۆر بەسادەیی لە پرۆسەی تێڕاماندا. مێردەکەی بەتەواوی ڕۆچوبوو لەو شتەی دەیخوێندەوە. هاوشێوەی ئەم کارە، لە هەنگاوی پێنجەمی ڕاجا یۆگادا هیچ مەتەڵێك بوونی نیە. ئەو دەیەوێت یۆگیکار بگوازێتەوە بۆ پشت ئەو خاڵەی مێردەکە پێی گەیشتبوو. یەکەم: بەگواستنەوەی ڕۆچوونی تەواو لە دیاردەیەکی بەڕێکەوتەوە بۆ وزەیەك دەکرێت بخرێتەگەڕ یان بوەستێنرێت هەرکاتێك ویستراز دووەم: بە بەرزکردنەوەی ئاستی شارەزاییەکەی بۆ ئەو حاڵەتەی دەیخاتە بێئاگاییەکی تەواو ئەگەر ویستی تەنانەت لەکاتی تەپڵ لێدان لە ژورەکەیدا کە تیایدا دانیشتوە، هەمان تەکنیك: ئەگەر مرۆڤ گرنگیدا بە شتێك بەشێوەیەکی ورد، ئەوا ئاگاییەکەی دادەخرێت و دەوەستێت لە هەموو شتێك جگەلەو شتە.

٦–دواجار یۆگیکار بەتەنهایە لەگەڵ بیرکردنەوەکانی. ئامانجی پێنج هەنگاوەکەی پێشو گەیاندنی یۆگیکار بوو بۆ ئەم سەرئەنجامە، دەستێوەردانەکان وەستێنراون کە دەرهاویشتەی ئەو هەڵسوکەوتانەن کە مرۆڤ ئاڵودە بووە پێوەی و لەبارەی ویژدانی شڵەژاو و دەستێوەردانەکانی جەستە و هەناسەدان و هەستەکان یەکلەدوای یەك. بەڵام جەنگەکە لێرەدا کۆتایی نایەت، بەڵکو جەنگی ڕاستەقینە ئێستا دەستپێکردوە، چونکە دڕندەترین دوژمنەکانی ئەقڵ خودی ئەقڵەن وێڕای ئەوەی ئەقڵ تەنا ماوەتەوە لەگەڵ خۆیدا، بەڵام هێشتا ئارەزوی ئارامی و بێدەنگی ناکات بۆ ئەو کارەی لێی داواکراوە. یادەوەریەکان، پێشبینیەکان، زیندە خەونەکان، زنجیرە

بیرکردنەوە خەیاڵیەکان یان هیوا خوازراوەکان کە بەدیهێنانیان ئەستەمە. هیچ پەیوەندیەك لە نێوانیاندا نیە جگەلەوەی بەڕێکەوت لە یەك کاتدا هاتون، بە جێبەجێکردنیان لەسەر ئەقڵ بەیەکەوە لە هەزار لاوە بۆئەوەی بیخاتە حاڵەتی شەپۆلدانی بەردەوام وەك ڕووی دەریاچەیەك کە شەپۆل دەدات لەژێر شنەبادا، بۆئەوەی بەجێی بهێڵێت لەحاڵەتی داگیرسان و کوژانەوەدا بە بیرکردنەوەی ناجێگیر و شپرزەیی و نائارامی مێشك. بەتەنها ئەو ئەقڵە، ناتوانێت وایلێبکات ئارامبگرێت و لەسەرخۆ بێت وەك شوشە یان ڕوون بێت وەك شووشەز چونکە بۆ گەیشتن بەم حاڵەتە لە ئارامی و بێدەنگی، دانانی بەربەست لەبەردەم جۆگەلەکاندا بەس نیە کە دەڕژێنەناو دەریاچەی ئەقڵەوە، ئەمە ئەو کارەیە پێنج هەنگاوەکەی پێشوو ئەنجامدانی گرتەئەستۆ بەباشترین شێوە، بەڵکو پێویستە چاوگەکانی ناو بنکەی دەریاچەکە دابخەین، واتە فشارە ئەڤینیەکان و بیرکردنەوە خەیاڵیەکان، لەگەڵ شنەبای ئەو کارانەی پەیوەندیان بە هیچ شتێکەوە نیە. ئاشکرایە هێشتا زۆر شت ماوە پێی هەستین.
هیندۆسیەت دەڵێت ڕێکخستنی جووڵەکانی ئەقڵی ئاسایی وەك ڕێکخستنی جووڵکانی مەیمونێکی شێتە کە دێت و دەچێت لە قەفەسەکەیدا. بەڵکو لەوە زیاتر وەك جێگیرکردنی مەیمونێکی شێت و سەرخۆشە. بەڵکو تەنانەت ئەمە بەس نیە بۆ ڕونکردنەوەی بڕی نائارامی ئەقڵ، ئەقڵ لە جموجوڵەکانیدا وەك مەیمونێکی شێتی سەرخۆشە کە سەمادەکات، بەڵکو ئەگەر ویستمان وردتر بین بەشێوەیەکی گشتی بۆ وێناکردنی شێتی ئەقڵێکی سروشتی پێویستە هەنگاوێکی تر بنێین و بڵێین: ئەو وەك مەیمونێکی شێتی سەرخۆشە سەمادەکات لەدوای ئەوەی دەرزیەکی لێدراوە.
زۆر کەمن ئەو کەسانەی هەوڵیانداوە بەشێوەیەکی هەتەری تێڕامان ئەنجام بدەن، ئەو نمونەیەی باسمان کرد بە زیادەڕەوی دەزانن. ئەو کێشەیەی دروست دەبێت بەهۆی وازهێنان لە ئەقڵ بە تەنها بەتەواوی ئەو شتەیە کە باسمان کرد، ئەو دیمەنەیە کە بەزەییمان دەجوڵێنێت. من فەرمان دەکەم بە دەستەکانم کە بەرزببنەوە و گوێڕایەڵیم دەکەن، بەڵام کاتێك فەرمان دەکەم بە ئەقڵم کە ئارام بێت گاڵتەم پێدەکات بە ناشیرینترین شێوەز ئەو ماوەیە چەندە کە ئەقڵێکی ئاسایی دەتوانێت بەبەردەوامی و بەتەنها بیر لە یەك شت بکاتەوە، بەبێئەوەی هەڵبخلیسکێت بەرەو بیرکردنەوە لە شتێکی تر، جگەلە بیرکردنەوە لە زنجیرە شتێکی بێ بنەما کە هیچیان پەیوەندیان بەوی ترەوە نیە نە لە نزیکەوە نە لە دوورەوە؟؟ زانایانی دەرونناسی وەڵامدەدەنەوە بەوەی ماوەکە سێ چرکە و نیو تێناپەڕێنێت. مێشك وەك تۆپی تێنسە لەو شوێنەوە هەڵدێت کە خاوەنەکەی ئاڕاستەی دەکات، بەڵام هەر خێرا لەو شوێنەدا بەرزدەبێتەوە بەبێ ویستی خۆی.
چی ڕودەدات ئەگەر ئەقڵ لە تۆپێکی تێنسەوە گۆڕا بۆ تۆپەڵە هەویرێك ئەگەر خاوەنەکەی هەڵیدا دەلکێت بەو شوێنەی بۆی ئاڕاستەکراوە و لێی نابێتەوە تەنها ئەگەر خاوەنەکەی نەیەوێت؟ ئایا توندیەکەی زیادناکات هەروەك ڕوناکی چرا زیاددەکات ئەگەر لە چەند لایەکەوە بە ئاوێنە دەوردەدرا؟ دەکرێت ئەم شتانە دەستبگرێت بەسەر ئاگایی ئەقڵی سروشتیدا و جێگیربوونی تا ماوەیەکی دیاریکراو بەڵام ئەقڵی شێواو بە خەون و خەیاڵ ناتوانێت جێگیر بێت لەسەر شتێك بەڵکو هەر خێرا دەفڕێت بەرەو خەیاڵەکان کە ناتوانێت دەستیان بەسەردابگرێت. چی ڕودەدات ئەگەر توانیمان حاڵەتی سێیەمی مێشك بدۆزینەوە لەسەروو ئاستی ئەقڵی ئاساییەوە، بەجۆرێك تاك بتوانێت ئەقڵی جێگیر بکات لەسەر بابەتێك بۆ ماوەیەکی درێژ بۆئەوەی بتوانێت قووڵتر بچێتەناوی؟ ئەمە تێڕامانە کە بەتەواوی ئامانجی هەنگاوی شەشەمی ڕاجا یۆگایە. جەستەی فیل بەلای ڕاست و چەپیدا دەکەوێت لەکاتی ڕۆیشتنیدا بەر ئەو شتانە دەکەوێت کە لە هەردو لایەوە هەیە، بەڵام جەستەی جێگیرە

لەکاتێکدا تۆپێکی ئاسنینی قورس دەخرێتەسەری، بە هەمان شێوە ئامانجی تێڕامان بریتیە لە فێرکردنی ئەپڵی نائارامە کە پەیوەست بێت بەو بابەتانەی دەخرێنەبەردەمی.
دانای هیندی دەڵێت: ((لەکاتێکدا هەموو هەستەکان بێدەنگ دەبن، کاتێك ئەقڵ جێگیر دەبێت. کاتێك مێشك شەپۆل نادات. . . لە پلەوپایەی یەکەمدا دەبێت))(٢٦). ئەو ڕێگایەی پێشنیازکراوە بۆ گەیشتن بەم حاڵەتە سەیر و سەمەرە نیە، بەڵێ دروستە قورسە و پێویستی بە هەوڵدانە. پێویستە کەسەکە دەستپێبکات بە خاوکردنەوەی ئەقڵ بۆئەوەی ڕێگا بدات بەو بیرۆکانەی دەیانەوێت بەرزببنەوە بۆ لای لە نائاگاییەوە ئازادبن هەتا بۆ خۆیان دەرباز ببن، دواتر مرۆڤ شتێك هەڵدەبژێرێت هەتا تێڕامانی لەسەر بکات بۆ نمونە سەری بخورێك، یان تێڕامان دەکات لەسەر دەریایەکی خەیاڵی لە ڕوناکی ناکۆتا. جۆری شتەکە هەرچیەك بێت گرنگ نیە، دواتر مەشق دەکات لەسەر پاراستنی ئاگایی ئەقڵ لەسەر ئەو شتە هەتا سەرکەوتنی پلەبەپلە زیادبکات.
٧-دوو هەنگاوەکەی کۆتایی ئەم پڕۆسەی تێڕامانە تیایدا قووڵدەبێتەوە بەشێوەیەکی پلەبەپلە. لە هەنگاوی پێشودا ئەقڵ گەیەنرا بە خاڵێك کە تیایدا دەکرێت جێگیر ببێت لەسەر شتێك بەبێئەوەی ئاگایی لەدەست بدات. لەم هەنگاوەدا تێڕامان قووڵدەبێتەوە تا دەگاتە ئاستی سەرنجدان، یەکەیەك کەسی سەرنجدەر و شتە سەرنجدراوەکە پێکەوە دەبەستێتەوە لە خاڵێکدا تیایدا جیابوونەوە شیدەبێتەوە: ((خودی بکەر یەکدەگرێت لەگەڵ ئەو شتەی کاری لەسەر دەکرێت بەشێوەیەکی تەواو بەجۆرێك تاك ئاگای لە خۆی نامێنێت))(٢٧).
لەم ساتەدا دووانی بوون شیدەبێتەوە. بە وشەکانی سکێڵینگ schelling: ((خودی دەرکپێکەر یەکدەگرێت لەگەڵ خودی دەرکپێکراو. لەو ساتەدا شوێن و کات نامێنێت، ئێستا لەناو کاتدا نین بەڵکو کات بە خودە هەمیشەییەکەیەوە لە ئێمەدایە)).
٨-ئەو دوا کەشوهەوایەی کە بەهۆیەوە پێویستە وشەی سنسکریتی سەمەدهی samadhi مان بیربکەوێتەوە. واتای sam: هاوشێوەی واتای syn ە لە زمانی ئینگلیزیدا کە بە واتای لەگەڵ دێت هەروەك لەم وشانەدا دیارە synthesis، syndrome، synopsis. بەڵام ادهی adhi لە زمانی سنسکریتیدا واتاکەی یەزدانە lord. کەواتە سەمەدهی واتە لەگەڵ یەزدان واتە ئەو حاڵەتەی مێشك بەتەواوی ڕۆچوە لە یەزداندا.
لە هەنگاوی حەوتەمدا هەنگاوی سەرنجدان گرنگیدراوە بە تێڕامان هەتا ئەو ئاستەی دەرون تەواوی ئاگایی لەدەست داوە و بەتەواوی جێگیر بووە لەسەر ئەو شتەی تێڕامانی لەسەر ئەنجام دەدرێت. ئەوەی تازەیە لە هەنگاوی سەمەدهیدا: نەمانی هەموو شێوەیەکە لەسەر ئەو شتەی تێڕامانی لەسەر کراوە، چونکە شێوە دیاریکردنە لەکاتێکدا بابەتی زانینەکەمان لە ئێستادا: بوونی ناکۆتایە.
ئەقڵ لەئێستادا بیر لە هیچ دەکاتەوە بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت کە بیر لە هیچ ناکاتەوە، ئەقڵ وەڵامی مەتەڵی بینینی نەبینراوی دۆزیەوە بەشێوەیەکی تەواو. لێوانلێوە لەو شتەی کە: خاڵیە لە هەموو خەسڵەتێك، چونکە نە ئەمەیە نە ئەوە، بێ شێوە و بێ ناوە(٢٨).
زۆر دورکەوتینەوە لە دانپیانانەکەی لۆرد کلفین بەوەی ناتوانێت هیچ شتێك وێنابکات کە نەتوانرێت نمونەیەکی میکانیکی بۆ دروست بکرێت! بەو ڕێگایەی زانا یەکدەگرێت لەگەڵ زانراودا، تاك گەیشتوە بە ئاستێك لە ناسینی بوونی گشتی و توانەوە تیایدا. دواجار دەریایەکی ڕاستی بڕی، لە ناوەندێکی لێوانلێو لە بوون، کە سنوری نیە وەك ئاسمان، دابەشنابێت و بە دابەشبوون ڕازی نابێت و سنوردارنیە(٢٩).

گەیشتوە بەو مەبەستەی هەر لە سەرەتاوە هەوڵیداوە بۆ گەیشتن پێی: بەڵگەی تایبەتی لەسەر بوونی براهمن (یەزدان) و لەسەر جێبەجێکردنی ناسنامەکەی لەسەر خودی براهمن. تاقیکردنەوەکە گەیشت بە دوا ژێری خۆڕسك بەوەی: بەڕاستی تۆ ئەو کەسەیت.

ئەم چوار جۆرەی یۆگامان پێشکەشکردن وەك چەند ڕێگایەکی ئارەزومەندانە بەرەو یەزدان. بەڵام ئەمە ەو مانایە نایەت کە سنورداره، چونکە لە ڕاستیدا مرۆڤێك نیە ئەقڵانی بێت بە پوختی، یان ئەڤینی بێت بەشێوەیەکی پوخت، یان چالاك بێت و هەمیشە کارکردنی خۆش بوێت، یان ئەزمونی بێت بە پوختی. هەروەك هەلومەرجە جیاوازەکان پێویستیان بە وەڵامدانەوەی جیاواز هەیە. لەکاتێکدا زۆرینەی خەڵك بە شێوەیەکی گشتی وابیردەکەنەوە گەشت کردن لەسەر تاکە ڕێگایەك باشترە لە گەشتکردن لەسەر یەکێك لە ڕێگاکانی تر، دواتر مەیلی نزیکبوونەوەی زیاتر دەکەن لەو ڕێگایەی هەڵیانبژاردوە و پەیوەست بوون پێوەی، هیندۆسیەت هانی خەڵك دەدات لەسەر تاقیکردنەوەی هەر چوار ڕێگاکە، بەپێی تێڕوانینی هیندۆسیەت کۆکردنەوە لە نێوانیاندا دەگونجێت لەگەڵ پێداویستیەکانی مرۆڤدا. ناکۆکی سەرەکی لەنێوان جنانا یۆگا و بهکتی یۆگادایە لەسەر ئاستی ئەقڵانی و ئەچینی بەشێوەیەکی یەکلەدوای یەك. بەڵام یۆگای کردار وەك بینیمان دەکرێت بیگونجێنین لەگەڵ هەریەك لە ڕێگای جنانا و بهکتیدا، هەروەك هەندێك تێڕامان سودبەخشە لە هەموو حاڵەتێکدا. کەواتە تاکی نمونەیی ئەو کەسەیە ڕێگا ئایینیەکەی دەڕژێنێتە ناو قاڵبێکی فەلسەفی یان قاڵبی پەرستنی ئەڤینی، یان کارەکەی بگونجێنێت لەسەر ئەو قاڵبەی هەڵیبژاردوە، تێڕامان ئەنجام بدات بەوپەڕی توانای و بەو ڕادەیە لە کات کە بۆی بڕەخسێت.

لە کتێبی بهافاد گیتادا دەخوێنینەوە: ((هەندێك دەرکیانکردوە بە ئاتمان لەڕێگەی سەرنجدانەوە، ئەوانی تر دەرکیان پێکردوە بە فەلسەفیانە، هەندێکی تر دەرکیانپێکردوە بە شوێنکەوتنی یۆگای کرداری دروست، ئەوانی تر یەزدانیان پەرستوە دەاودەق بەپێی ئەو ڕێنماییانەی فێری بوون لە باووباپیرانیانەوە. ئەگەر ئەوانە بە وەفاداریەکی تەواوەوە ئەم کارەیان جێبەجێکرد، ئەوا هێزی مەرگ تێدەپەڕێنن. )).

## چوار ئاستەکەی ژیان

خەڵکی جیاوازن. ئەمە ڕاستیەکە هەموو خەڵك تێبینی دەکات بەشێوەیەکی ڕووکاری. بەڵام ئاگاداری هەتەری بۆ ئەم ڕاستیە یەکێکە لە هێما دیارەکانی هیندۆسیەت. لەوانەیە بەشەکانی پێشوو سوربوون و جەختکردنەوەی هیندۆسیەتی ڕوونکردبێتەوە لەبارەی جیاوازی شێوازەکانی خەڵك، ئەم جیاوازیە لە هەڵسوکەوتی مرۆڤەکاندا پێویستی بە چەند ڕێگایەکی جیاوازە بۆ هەریەك لە شێوازەکان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی ژیان بەتەواوی. ئێستا پێویستە ئاماژەبکەین بە هەمان ئەم پێداگریە کە هیندۆسیەت جەختی لەسەردەکاتەوە بەڵام لە ڕەهەندێکی ترەوە، ئەمە لەوکاتەدا نیە کە ژیانی هەموو خەڵك بەگشتی وەردەگیرێت دەبینین سروشتی هەندێك جیاوازە لە سروشتی ئەوانی تر، بەڵکو گرنگی بە تاکە کەس دەدرێتن لەکاتێکدا ژیانی بەتەنها وەردەگیرێت، دەبینین سروشتی دەگۆڕێت لە ئاستە جیاوازەکانی ژیانیدان دواتر هەموو ئاستێك لە ژیانی وەڵامدانەوەی تایبەتی هەیە کەلەگەڵی دەگونجێت. هەروەك لە یەك ڕۆژدا بە چەند ئاستێکی جیاوازدا تێپەڕدەبێت: بەیانی دواتر نیوەڕۆ ئینجا عەسر دواتر ئێوارە، بەهەمان شێوە ژیانی تاکە مرۆڤێك بە چوار ئاستدا تێپەڕ دەبێت، لە هەر ئاستێکدا مەیل و ئامادەکاریەکی جیاوازی دەبێت کە پێویستی بە ڕێگایەکی تایبەتە لە هەڵسوکەوت هەتا بگونجێت لەگەڵیدا. لەبەرئەوە ئەگەر پرسیمان: پێویستە چۆن بژین؟ ئەوا هیندۆسیەت لە وەڵامدا دەڵێت: ئەمە دەگۆڕێت، تەنها بەپێی جۆری پرسکەرەکە نا بەڵکو بەپێی ئەو ئاستەی تەمەنی پرسکەر کە پێیدا تێپەڕ دەبێت.

١-یەکەمین ئاست لە چوار ئاستەکەی ژیانی مرۆڤ، بەپێی ئەوەی هیندۆسیەت دایدەنێت، ئاستی ئارەزوومەند یان خوێندکارە. ئەم ئاستە دەستپێدەکات لەدوای مەڕاسیمی فێرکردنی بنەماکانی ئەو ڕێبازەی زۆرجار ئەنجامدەدرێت لە تەمەنێکدا لەنێوان هەشت بۆ دوانزەساڵیدا، ئەم ئاستە درێژدەبێتەوە بۆ ماوەی دوانزە ساڵی تر، زۆربەی کات خوێندکار لە ماڵ مامۆستاکەی دەژی، خزمەتی دەکات لە بەرامبەر ئەو فێرکاریەی لێی وەردەگرێت. یەکەمین لێپرسراویەتی ژیان لەم ئاستەی تەمەندا فێربوونە، بریتیەلەوەی خوێنکار مێشکی بکاتەوە بۆ هەموو ئەو شتانەی مامۆستاکەی دەیەوێت بۆی بگوازێتەوە. کاتی پێویست دەبێت بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگە، بەڵام لە ئێستادا گەورەترین خزمەت کە مرۆڤ دەتوانێت پێشکەش بە کۆمەڵگای بکات بریتیەلەوەی زۆرترین بڕی زانست وەربگرێت بۆ داهاتوو کە کۆمەڵگە چاوەڕوانی زۆر شتی لێدەکات. بەڵام ئەو زانستەی پێویستە فێری ببین کۆمەڵە زانیاریەکی ڕاستەقینە لەخۆ دەگرێت، بەڵام تەنها هەر ئەوە نیە. هیندی ناپراکتیکی هەرگیز گرنگی نادات بە زانست لەبەر خودی زانست. لەبەرئەوە خوێندکاری سەرکەوتو ئەو کەسە نیە دەبێتە ئینسایکلۆپیدیایەك کە لەسەر پێی خۆی بڕوات، بەڵکو پێویستە خووڕەوشتی بەرز و ئاکاری جوان بەدەستبهێنێت. لەڕاستیدا پەروەردەکردن و مەشپێکردن بەگشتی وەك جۆرە فێرکردنێکە هەموو زانیاریەکان تیایدا بەرجەستە دەکرێت بەوێنەی لێهاتوییەکی بێوێنە. خوێنکاری سەرکەوتو لە فێربوونەکەیدا ئەو کەسەیە دەردەچێت و ئامادەیە بۆ دروستکردنی ژیانێکی نوێ و بەرهەمهێن، هەروەك گۆزەکەری شارەزا لەتوانایدایە گۆزەی ڕازێنراوە بە وێنە و نەخش دروست بکات.

ئاستی دووەم بە ژنهێنان دەستپێدەکات، بریتیەلە ئاستی خاوەن ماڵ. لەم ئاستەی کە پشتی ژیان دەنوێنێت، کە شارەزاییە جەستەییەکانی مرۆڤ تیایدا لە لوتکەدایە گرنگیپێدانەکانی ئادەمیزاد و وزەکەی بەشێوەیەکی سروشتی ڕوودەکاتە دەرەوەی دەروونی. سێ لایەن هەیە دەکرێت وزەکانی تیادا بەکاربێت بەشێوەیەکی ڕازیکەر: خێزانەکەی، پیشەکەی، ئەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژی. زۆرجار ئەم سێ شتە دەگرێتەوە پێکەوە. ئەم

ئاستە بریتیەلە کاتی بەدیهێنان و تێرکردنی سێ ئارەزوە یەکەمینەکەی مرۆڤ: چێژوەرگرتن لەڕێگەی هاوسەرەکەی و خێزانەکەی بەشێوەیەکی سەرەکی، سەرکەوتنی دونیایی لەڕێگەی پیشەکەیەوە، خزمەتکردنی مرۆڤایەتی لەڕێگەی لێپرسراویەتیەکانیەوە وەك هاوڵاتیەك.

هیندۆسیەت پێدەکەنێت بۆ بەدەستهێنانی ئەم سێ ئارەزوە بەڵام هەوڵ نادات کە دوبارە وزەیان پێبداتەوە کاتێك سارد دەبنەوە، بەڵکو وا بە باش دەزانێت کە ئەم ئارەزوانە دابمرکێنەوە لەکاتی دیاریکراودا، چەندە خورپەیەکی گەورەیە ئەگەر پێویست بێت لەسەر ژیان بوەستێت لەکاتێکدا کار و ئارەزوو لەوپەڕی هێز و توانایاندان. بەڵام ئەمە نەسەپێنراوە بەسەر مرۆڤدا. ئەگەر لەگەڵ وەرزەکاندا ڕۆیشتین بەو شێوەیەی کە دێن، تێبینی ئەوە دەکەین کاتێك دێت کە سێکس و چێژوەرگرتن و بەدەستهێنانی سەرکەوتنی دونیایی هیچ گرنگیەکیان نامێنێت، دواتر کاتێك دێت کارە جێبەجێ کراوەکان بە تەواوی باقوبریقی جارانیان نامێنێت، چونکە دەبنە شتێکی دوبارەبووە. لەکاتێکدا ئەم وەرزە دێت کاتی ئەوە هاتوە تاك بەڕێ بکەوێت بەرەو ئاستی سێیەم لە گەشتی ژیان.

هەندێك هەرگیز بەو کارە هەڵناسن. دیمەنیان جوان نیە، چونکە کەوتنەدوای ئارەزوەکان گونجاوە لە ئاستێکی دیاریکراوی تەمەندا، ئەگەر لەمە زیاتر درێژکرایەوە دەبێتە کارێکی قێزەون و بێزراو. لەوانەیە ڕابواردن و چێژوەرگرتنی سێکسی بۆ نمونە بریسکەیەی تیژی هەبێت کە تەمەن پانزە ساڵان بەرەو لای خۆی کێش بکات، بەڵام چەندە ناشیرینە کەسێکی تەمەن پەنجا ساڵ ڕۆبچێت لەم ڕابواردن و چێژوەرگرتنە سێکسیەدا! پێویستە چەندە هەوڵ بدات بەهۆی باری تەمەنەکەیەوە، چەندە بێ بەهایە ئەو دەسکەوتەی وەری دەگرێت. بەهەمان شێوە بۆ ئەو بەساڵاچوانەی ڕازی نین ئەو کورسی دەسەڵاتە چۆڵ بکەن تەنانەت کاتێك هەست بەوە دەکەن پێویستە بدرێتە گەنجێك کە چالاکترەو بیرۆکەکانی نوێترن.

وێڕای ئەوە، ناکرێت ئەو کەسانە لۆمە بکرێن، چونکە لەکاتێکدا هیچ نابینن جگەلەو سنورە ناسراوەی ژیان، هیچ هەڵبژاردنێکیان لەبەردەمدا نەبووە جگەلە سوربوون لەسەر ئەوەی دەیزانن. ئەو پرسیارەی دەیکەن بەسادەیی: ((ئایا تەمەنی پیری شایەنی ئەوەیە مرۆڤ گرنگی پێبدات؟)). لەگەڵ پێشکەوتنی بواری پزیشکی و زۆربوونی ڕێژەی تەمەنی مرۆڤ، ژمارەی ئەو کەسانە زیاددەکەن کە ئەو پرسیارە دەکەن. شاعیرەکان هەمیشە تیرەکانیان هاویشتوە بە ئاراستەی: ((ساڵەکانی ئاوابوون)) و ((ڕەنگی سوری پاییزی تەمەن))، بەڵام ڕستەکانیان جێگەی گومانن. زۆر بە سادەیی ئەم دێڕە شیعرە:

گەورە ببە و لەگەڵم بمێنەوە ئەوەی باشترینە هێشتا دێت

هەڵگری نیوەی ئەو باوەڕە نیە کە ئەم دێڕە شیعرە هەڵیدەگرێت:

ئێمە لە ڕێگەماندایین بەرەو پوکانەوە وەرە مۆرینا وەرە با ئاهەنگ بگێڕین بە بوونی جەژنی مایەوە

بەڵام لەکۆتاییدا، شیعر نابێتە دیاریکەری ئەوەی ئایا ژیان داهاتوویەکی هەیە لەدوای پاییزی تەمەن یان نا، بەڵکو ئەوەی ئەم شتە دیاری دەکات ڕاستیە. کە بریتیە لە بەها ڕاستەقینەکانی ژیان. ئەگەر شکۆدارترین بەهای ژیان بەڕاستی بەهای جەستە و چێژوەرگرتنی هەستەکان بێت ئەوا پێویستە دانبەوەدابنێین کە هەموو ئەزمونەکانی دوای تەمەنی گەنجێتی بریتیەن لە گەڕانەوە بۆ دواوە نەك بەرەوپێشچوون لەو بوارەدا. ئەگەر چالاکی جموجوڵ لە کاروبارەکانی پیاودا بریتین لە گرنگترین بەهاکان لە ژیاندا، چونکە مامناوەندی تەمەن،

واته تەمەنی خاوەن ماڵ، دەبێتە لوتکەی ژیان. بەڵام ئەگەر ژیری خۆڕسك و ناسینەوەی دەروون بەبایەختر بن لە هەموو ئەو شتانەی باسکران، ئەوا واتای ئەمە بریتیەلەوەی تەمەنی پیری هەلی خۆی هەیە کە پێویستە بیقۆزێتەوە، ئەمە تەمەنێکە تیایدا دەکرێت بگەینە لوتکەی شادومانی لە هەمان ئەو کاتەی ژیانی جەستەییمان دەست دەکاتە بە پوکانەوە و سیس بوون.

بەڵام ئایا ژیری خۆڕسك و ناسینەوەی دەروون بەڕاستی هەڵگری ئەو پاداشتەن یان نا؟ ئەمە پشت دەبەستێت بەو دیمەنەی کە دەردەکەوێت لەکاتێکدا کە پەردەی نەزانین لادەدرێت. لەوکاتەدا ئەگەر ڕاستی تەنها زەویەکی خەمناك نەبێت، دەروون هیچ نەبێت جگەلە ئامێرێکی ورد بۆ جووڵە، ئەوا پاداشتەکانی ژیری خۆڕسك و ناسینەوەی دەروون نابێتە ڕکابەری پاداشتەکانی چێژوەرگرتن و سەرکەوتنی کۆمەڵایەتی. بەڵام وەك پێشتر بینیمان هیندۆسیەت سوورە لەسەر ئەوەی مرۆڤ لەوە زیاترە. ئۆپانیشاد دەڵێت: ((واز لە هەمووان بێنە و دوای ئەو بکەوە و چێژوەربگرە بەو دەوڵەمەندیەی کەلە سەروو باسکردنەوەیە)). شادومانیەك بوونی نیە بگات بە شادومانی ژیری خۆڕسك، هەروەها مەزنی ناسینەوەی دەروون و ئاشکراکردنی ڕاستی خود لە ئاستێکدایە کە بە وشە باسناکرێت. سەرئەنجامی ئەمە هیندۆسیەت بەوپەڕی متمانەوە ئاستی سێیەمی ژیان دیاری دەکات.

٣-ئاستی تەنهایی.

لە هەر کاتێکدا، دوای لەدایکبوونی یەکەمین نەوەی مرۆڤ، تاك دەتوانێت پشوو وەربگرێت لە ژیان، پاشەکشەبکات لە ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان، کە هەتا ئەو کاتە بەباشترین شێوە جێبەجێی کردون. بەدرێژایی ٢٠ بۆ ٣٠ساڵ ڕۆڵی خۆی بینیوە لە دونیادا، ئێستا کاتی ئەوەی هاتوە کە ئەرکەکەی بگۆڕێت، لەپێش ئەوەی ژیان کۆتایی بێت بەبێ ئەوەی مرۆڤ دەرك بە واتاکەی بکات. تائێستا کۆمەڵگا داوای ئەوەی کردوە لە تاك کە پسپۆڕ ببێت، تەنها کاتێکی کەم هەبوو بۆ خوێندنەوە و بیرکردنەوە و گەڕان بەدوای مانای ژیان و تێڕامانی بەردەوام. ئەمە هیچ شتێکی بێزارکەری تێدا نیە، چونکە یاریەکە ڕۆڵی خۆی بینی لە تێرکردنی دەروونـدا. بەڵام ئایا پێویستە ڕۆحی مرۆڤ پابەند بێت بە خزمەتکردنی کۆمەڵگەوە بۆ هەمیشە؟ ئێستا کاتی ئەوە هاتوە تاك دەستبکات بە پەروەردەکردنی ئەقڵی ڕاستەقینە. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە تا بزانێت ئەو کێیە، ڕاستی ژیان چیە، نهێنی منی باڵا چیە کە هاوڕێیەکی خۆشەویستی بوو هەتا ئەو ڕادەیەی بە درێژایی ئەو ماوەیە تێپەڕیوە لە تەمەنی، وێڕای ئەوەی هێشتا نەناسراوە، لێوانلێوە لە پاڵنەری نالۆژیکی؟ چی خۆی حەشارداوە لە پشت جیهانەوە کە ڕێکی دەخات و دەیجوڵێنێت؟ بۆ چ مەبەستێك بەو کارە هەڵدەسێت؟ لەپشت دیمەنە ڕووکاریەکانی ڕۆتینی ژیانەوە، کە بووەتە شتێکی بێزارکەر، ئەقڵ دەشێوێنێت، ئەم پرسیارانەی کە لە بارەی نهێنیە شاراوەکانە، لە مێشکیدا ئەو دوا ڕکابەری دێت کە ئەقڵی مرۆیی کۆت و بەند دەکات بە جوانیەکەی.

ئەوانەی بەتەواوی وەڵامی ئەم فریودانەیان دەوەتەوە بە سەرکێشی ڕۆحی ناسراون بە ناوی دانیشتوانی دارستانەکان، ئەمە جۆرە دەربڕینێکە وەکو ئەو ژن و پیاوەیە کە ژنەکە ئارەزووی تەنهایی دەکات لەگەڵ مێردەکەیدا کە بچنە ناو دارستانەوە، یان ئەو پیاوە دەگرێتەوە کە بەتەنها دەیەوێت بڕوات، لەدوای ئەوەی پێداویستیەکانی هاوسەرەکەی دابینکردوە، لە کاتێکدا هاوسەرەکەی ڕازی نیە لەگەڵیدا ئەو گەشتە بکات. ئەو کاتە کەسەکان لە پیشەکانیان و ماڵەکانیان دووردەکەونەوە و خۆیان تەرخان دەکەن بۆ ڕۆچوون لە جیهانی تەنهایی لە دارستاندا، بۆئەوەی دەست بکەن بە بەرنامەی دۆزینەوەی خود. دواجار لێپرسراو نین تەنها لە خۆیان نەبێت. بازرگانی و خێزان و ژیانی شارستانیان بەجێهێشتوە لەدوای خۆیان لەگەڵ جوانی و هیواکانی گەنجێتی و پلەوپایەی تەمەنی تەواوبوون. ئێستا تەنها ئەزەلیەت لەبەردەمیاندا ماوەتەوە، لەبەرئەوە هەموو

گرنگیەکیان پێداوە و خۆیان بۆ تەرخان کردوە لەدوای ئەوەی کە مێشکیان وەستاوە لـە گرنگیدان و بیرکردنـەوە لە شتە دونیاییەکان، ئەو ژیانەی کە تێپەڕیوە وەك خەون وایە(٣٠). تەنهایی دەڕوانێتە پشت ئەستێرەکان، نەك ڕێگاوبانی لادێکە. ئێستا کاتی گەیشتنە بە فەلسەفە دواتـر جێبەجێکردنی ئـەو فەلسـەفەیە لەسـەر خـود، کـاتی شکۆداربوونە بەسەر هەستەکانی ویژدانی تاکدا.

٤-دوای ئاسـتی تـەنهایی دوا ئاسـت دێـت کـە تیایـدا ئامانجەکـە بەدیـدەهێنرێت، ئەمـە حاڵـەتی سانیاسـین sannyasin (٣١) کـە بهاگافـاد گیتـا ناسـاندویەتی بـەوەی: ئـەوەی کـە ڕقـی لـە هـیچ شـتێك نیـەو هـیچ شـتێکی خۆشناوێت. ئەو ووشکەسۆفیەیە کە ئێستا سەربەخۆیە لە گەڕانەوەدا بۆ جیهان، چونکە مەبەست لـە سیسـتمی تەنهایی و تێڕامان لە دارستاندا بەدەستهاتوە، کات و شوێن کۆنترۆڵیـان لەدەسـتداوە بەسـەریدا. چ شـوێنێك لـە جیهانـدا دەکرێـت مـرۆڤ تیایـدا سـەربەخۆ بێـت زیـاتر لـەوەی هـەر جێگایـەك بێـت گـرنگ نـەبێت بەلایـەوە؟ هیندۆسیەکان سانیاسین دەچوێنن بە قازی کێوی کە: ماڵێکی جێگیری نیە بەڵکو دێت و کۆچ دەکات لـەکاتی بـاران بارینـدا بـەرەو بـاکور بـە ئاڕاسـتەی شـاخەکانی هیمالایـا دواتـر دەگەڕێتـەوە بـۆ باشـور بۆئـەوەی هـەر دەریاچەیەك بێت ببێتە نیشتیمانێك بۆی لەگەڵ ئەو ئاسمانەی هیچ سنورێکی نیە.

سانیاسین زۆر دورە لـەوەی ببێتـە کەسێکی دیـاریکراو، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە ئـەو ئـارەزوی مانـەوە دەکـات لـە ڕووکاری دەرەوەدا بە حاڵـەتی نـەبوونی تـەواو، بـە قووڵاییدا ڕۆبچێت بەلایەوە باشـترە لـەوەی لەگـەڵ هەمووانـدا بمێنێتـەوە. کەواتـە چۆن دەتوانێـت جارێکی تـر ببێتـەوە بـە تاکێك لـە کۆمەڵگـەدا، دوبـارە ئـەو دەمامکـە بـەکار بهێنێت کە پاکێتی ناخی دەشارێتەوە؟

باشترین ژیان لە جیهانی دەرەکیدا دەگونجێت لەگەڵ ئەم سەربەخۆبوونەدا، ژیانی ئەو سواڵکەرەی کە هیچ جێ و شوێنێکی نیە. زۆربەی خەڵك هەوڵدەدەن سـەربەخۆ بن لـە ڕووی داراییـەوە لـە تەمـەنی پیریدا، بـەڵام سانیاسـین هەوڵدەدات لەو تەمەنەدا سەربەخۆ بێت و وازبهێنێـت لـە سـامان و دارایـی لـە بنەڕەتدا. کاتێك مـرۆڤ جێگایـەکی تایبەتی نیە لەسەر زەویدا، هیچ ئەرکێکی لەسەر نیە هەروەها نە ئامانجی هەیە لە ژیانـدا نـە خێـزان و کەسـوکار، ئەوکاتـە جەسـتە هـیچ داواکاریـەکی نابێـت. هـەروەها ئاواتـە کۆمەڵایەتیـەکان هـیچ زەمینەیـەکیان نابێـت هـەتا لەسەری گەشە بکەنز هەروەك بوار نامێنێت بۆ بوغرابوون و لـەخۆبایی بـوون لـەو کەسـەی بـەپێوە دەوەسـتێت و کاسەی سواڵ بەدەستەوەیە لەپشت دەرگای کەسێك کەلە ڕابردودا خودی سواڵکەرەکە گەورەی ئەو کەسـە بـووە، باش دەزانێت چیدی ئەو گەورەی نیە.

لـە جینیەتـدا کـە لقێکـە لـە هیندۆسـیەت قەشـە سـواڵکەرەکان دەگەنـە ئاسـتی وازهێنـان لـە لەبـەرکردنی هـەموو جلوبەرگێك و بە جەستەیەکی ڕووتەوە دێن و دەچن و دەڵێن پۆشاکی ئاشتیمان بەسە. بەڵام بوزیەت کە لقێکی تری هیندۆسیەتە، شوێنکەوتوانی داپۆشیوە بە قوماشێکی زەرد، ئەمە ڕەنگی ئەو جلەیە کحەسـانی دەرکـراو لـە کۆمەڵگە لەبەری دەکەن کە بە لەسێدارەدان مەحکوم کراون.

شتێکی زۆرباشە بە تەنها یەك لێدان هەموو مەدالیا و نازناوەکان ڕابماڵیت کە مرۆڤ خاوەنیـەتی، چونکە هـەموو ئەمانـە لـە ڕاسـتیدا دزیکردنـە لەڕێگـەی دیاریکردنـەوە(٣٢)، دواتـر ئەمـە ڕێگـرە لـە خۆگونجانـدنی تـەواو لەگـەڵ زەمینە گشتگیرەکەدا، هەمیشەییە بۆ بوون بەگشتی.

لە دەقە پیرۆزەکانی هیندۆسیەتدا دەخوێنینەوە کە سانیاسین: ((بیرناکاتەوە لە داهاتوون هەروەك گرنگی نادات بە ئێستا، بە گونجاوی دەژی لەگەڵ خودی هەمیشەییدا، هیچ شتێك نابینێت جگەلە ئەو. ئەو چیدی گرنگی نادات بەوەی ئەگەر جەستەی تیابچێت یان بمێنێتەوە، بە زیاتر لە گرنگیدانی مانگا بۆ تاجە گوڵینەیەك کە

**بەڕێکەوت کەسێك کردویەتە ملی، چونکە تەواوی ئەقڵی جێگیر بووە لەسەر ئارامی ڕەها، لە خودی پیرۆزدا، گەوهەری شادومانی بێسنور))**(٣٢).

## جێگاکانی ژیان

خەڵکی جیاوازن. ئەمە جاری سێهەمە کە دەگەڕێینەوە سەر ئەم بیروباوەڕە گەوهەریەی هیند. پێشتر هەستمان کرد بە گرنگی ئەم ڕاستیە لەلای هیندۆسیەت لە چەند ڕێگایەکی جۆراوجۆردا بۆ چوون بەرەو یەزدان، دواجار لە شێوازە ژیانیە جیاوازەکاندا بۆ ئاستە جیاوازەکان بینیمان کە مرۆڤ پیایدا تێپەڕ دەبێت لە تەمەنیدا. ئێستا دێینە سەر ئاسەواری ئەم ڕاستیە لەسەر ئەو جێگایەی کە پێویستە تاك پڕی بکاتەوە لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا، ئەمە ڕێنیشاندەرمان دەبێت بۆ بنەمای سیستمی چینایەتی کە بەناوبانگە لە هیندۆسیەتدا.

سیستمی چینەکان بەناوبانگترین شتی هیندۆسیەتە، لە هەمان کاتدا یەکێکە لەو بنەمایانەی ڕووبەڕووی زۆرترین ڕەخنە بووەتەوە لە دەرەوەی هیندۆسیەتدا. سیستمی چینایەتی چەند خاڵێکی ڕەسەن دەگرێتەخۆی لەگەڵ چەندین خراپ بەکارهێنان، هەموو شتێك لە گفتوگۆ کردن لەبارەی ئەم بابەتەدا پشت دەبەستێت بە توانای جیاکردنەوەیان لەیەکتر. سیستمی چینایەتی ئەو پرسیارە چۆن دەبینێت کە دادەنرێت بە یەکێك لە ئاڵۆزترین بابەتەکانلە مێژودا. گومانی تیا نیە شەپۆلی کۆچکردنی نەتەوە ئاریەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زایینیدا بۆ هیند کە لەگەڵ خۆیدا زمان و چەند شارستانیەتێکی جیاواز و چەند شێوازێکی جەستەیی جیاوازی هێنا وەکو (باڵا بەرزی و ڕەنگی پێستی سپی و چاوی شین و قژی خاو) ئەمانە دادەنرێن بە خاوەن جێگایەکی گرنگ لەم بابەتەدا، بەریەککەوتنی ناکۆکیەکانی نێوان داگیرکەران و خەڵکانی ناوچەکە کاریکردەسەر ئەو کۆچە، یارمەتیدەربوو بۆ گەشەسەندنی ئەم سیستمی چینایەتیە، ئەمە ئەگەر ئەو لە بنەڕەتدا ئەم سیستمەی دروست نەکردبێت، لەوانەیە گەیشتبێت بە ڕێگا چارەیەك باوەڕپێکراو بۆ ئەو ئاستەی هەموو جیاوازیانە یارمەتیدەر بوون لە دەرخستنی شێوازی سیستمی چینایەتی وەك فرە ڕەچەڵەکی و جیاکردنەوە تەندروستیەکان لەنێوان ئەو کەسانەی بەرگری زیاتریان هەیە بۆ نەخۆشیەکان و قەدەغەکردنی جادووگەری ئاییني. سەرئەنجامی هەموو ئەمانە کۆمەڵگایەکی دابەشکراو بوو بەشێوەیەکی دیاریکراو بۆ سێ کۆمەڵە: (١)قەشە پێشبینیکەرەکان. (٢)فەرمانڕەواکان. (٣)بەرهەمهێنەکان. (وەك جوتیاران و خاوەن پیشە دەستیەکان). (٤)شوێنکەوتوان.

با لێرەوە دەست بکەین بە تۆمارکردنی ئەو خراپ بەکارهێنانەی هاتە ناو ئەم سیستمەوە بە کتوپڕی، وێڕای ئەوەی دوور نیە هەر لە سەرەتاوە هەبووبێت. یەکەمین شت کە دەستدەکەین بە باسکردنی بریتیە لەوەی کۆمەڵەی پێنجەم هەیە کە دەرکەوت ئەویش کۆمەڵەی شاربەدەرکراوەکان. بەڵام تەنانەت لەکاتی باسکردنی ئەم چینەدا چند خاڵێك هەیە پێویستە باسی بکەین: هیند لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ نزمترین چینی کۆمەڵایەتیدا واتە چینی شاربەدەرکراوەکان نەگەیشتوەتە ئاستی کۆیلایەتی کە لە زۆربەی شارستانیەتەکانی تردا هەبووە. چونکە هەندێك لە شاربەدەرکراوەکان کە ڕێگای چوون بەرەو یەزدانیان گرتەبەر چوارەم ئاستی ژیانیان تێپەڕاند، ئاستی وازهێنان لە دونیا، شاربەدەرکراوەکان بەوانەی کە لەبەر یەزدان ئەم کارە دەکەن، هیند سەیری کردون وەك کەسانێك لە لوتکەی کۆمەڵگەدا، پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت و شتیان لێوە فێرببین تەنانەت لەلایەن براهمەکانەوە(٣٤).

خاڵی دووەم بە دەستپێکردن لە بوزاوە و تێپەڕین بە دیاناندا و تەنانەت گاندی، زۆربەی چاکەخوازە ئایینیەکان هەوڵیانداوە بۆ لابردنی پیسی لە سیستمی چینایەتی، هەروەك دەستور و یاسای هیندی هاوچەرخ شاربەدەرکرنی پوچەڵکردەوە، وێڕای ئەوە دەڵێین ناکرێت بەرگری بکەین لە چارەنوسی شاربەدەرکراوەکان لە بەشی زۆرینەی مێژووی هینددا. بەڵام پێویستە سەیری چارەنوسیان بکەین وەك لادانێکی بنەڕەتی کە هاتوەتە سیستمی چینایەتیەوە.

بەڵام شڵەژانی دووەم بەرەو خراپتر لە سیستمی چینایەتیدا شاردراوەتەوە لە دابەشبوونی چوار چینەکە بۆ سەدان چینی لاوەکی تر، ئێستا سێ هەزار چینە، سێیەمین شتی نێگەتیڤ: یاسای قەدەغەکردنی ژن و ژنخوازی و نانخواردنی هاوبەشە لەنێوان چینە جیاوازەکاندا، کە بووەتە هۆی شڵەژانێکی گەورە لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی هینددا، ئەمە ئەو خاڵەیە ئەو هەستە قێزەونەی خرۆشاندوە لەلای سەرۆك وەزیرانی هیند نهرو دژی سیستمی چینایەتی. چوارەم: ئەوەی ئەم کارەی زیاتر شێواندوە زۆربوونی ئەو سەرکەوتنانەیە کە چینە بەرزەکان بەدەستی دێنن لەسەر حسابی چینە نزمەکان. دواجار سیستمی چینایەتی بووەتە شتێکی بۆماوەیی، چونکە مرۆڤ هەرچیەك بکات لەو چینەدا دەمێنێتەوە کە لێوەی لەدایکبووە.

لەدوای ئەم ڕەخنەگرتنە گرنگانە بۆ سیستمی چینایەتی، لەوانەیە شتێکی کتوپڕ بێت کە هەندێك لە هیندیە هاوچەرخەکان ببینین بەوردی هەوڵدەدەن بۆ دۆزینەوەی جێگرەوەی ڕۆژئاوایی، بەرگری دەکەن لە سیستمی چینایەتی بە هەموو ئەو شتانەی کە تێیدایە!(٣٥). کەواتە بەها ڕاستەقینە جیگیرەکان کامانەن کە دەکرێت لەم سیستمەدا هەبێت؟

ئەوەی پێویستە لێرەدا نانی پیابنرێت بریتیەلەوەی خەڵك دابەشدەبن بەپێی ئەو ڕێگایانەی یارمەتیان دەدات بۆ بەشداریکردن لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەدا و تیایدا بەهرەکانیان بەکاربهێنن و پەرەبدەن بە توانا شاراوەکانیان بەباشترین شێوە، بۆ چوار کۆمەڵە:

(١)کۆمەڵەی یەکەم هیند ناوی دەنێت بە براهمە یان قەشەکان. ئەمانە کۆمەڵە بیریارێکن ئارەزوی تێگەیشتن دەکەن لەسەر زانین و دەرککردن بە بەها کاریگەر و گرنگەکان زیاتر لە هەر شتێکی تر لە ژیاندا. ئەمانە زۆرینەی کات پیاوانی فیکر و ڕۆشنبیری و سەرۆکە ڕۆحیەکانن لە هەموو شارستانیەتێکدا. لە ناوچەکەیاندا ئەو ئەرکانە هەیە کە کۆمەڵگە هاوچەرخەکەمان دابەشیکردوە لەنێوان: فەیلەسوف و هونەرمەند و سەرۆکە ئایینیەکان و مامۆستاکاندا.

(٢)ئەوانی تر بە فەرمانڕەوایی لەدایك دەبن(٣٦) کە لێهاتوون لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکیدا بە ڕێگایەك دەبێتەهۆی بەدەستهێنانی باشترین دەرئەنجام لە مادە مرۆییە ڕێکخراوەکان.

(٣)کەسانێکی تر خۆیان دەبیننەوە پاڵیان پێوەدەنرێت بۆ کارکردن وەك بەرهەمهێن، ئەوان خاوەن پیشەی دەستی و جوتیارن. . . ئەوان شارەزان لە بەرهەمهێنانی ئەو شتانەی ژیانی مرۆڤ پشتیان پێدەبەستێت.

(٤)دواجار، شوێنکەوتوەکان دێن. ئەوان کۆمەڵە کسێکن ئەگەر ویستیان قازانج بکەن بە هەوڵدانی بەردەوام لە کارێکدا، ئەوا پێویستە لەسەریان ماوەیەکی درێژ تەرخان بکەن بۆ فێربوون مەشقکردن، یان ئەگەر چون بۆ کارێکی بازرگانی بۆ خۆیان ئەوا شکست دێنن. هەستکردنیان بە کات کورتە، ئەمە وای لێکردون ئارەزوی قوربانی دان نەکەن لە ئێستادا بۆ داهاتویەکی باشتر. بەڵام وێڕای ئەوە دەتوانن بە کاری قورس هەستن لەژێر چاودێریدا بەوپەڕی وەفاداریەوە. وەکو ئەو کەسانەی کاتێك کار دەکەن بۆ ئەوانی تر لە بار و هەلومەرجێکی باشتردان، لەڕاستیدا کاتێك شادومانن کە بۆ خۆیان کاردەکەن. ئێمە بەهۆی هەستکردنی دیموکراتیمانەوە حەزناکەین دانبنێین بە بوونی هاوشێوەی ئەم جۆرە لە تاکەکان لە کۆمەڵدا. بەڵام هیندۆسی ەت لە وەڵامدا دەڵێت: گرنگ نیە حەزبکەین خەڵکی چۆن بن، کێشەکە بریتیەلەوەی ئەوان چۆنن لە ڕاستیدا؟.

ژمارەیەکی کەم لە هیندۆسیە هاوچەرخەکان بەرگری دەکەن لەو ماوەیەی کە هیند بەردەوام بوو لە پاراستنی جیاکردنەوەی چینایەتی، شتە قەدەغەکراوەکانی وەکو قەدەغەکردنی ژن و ژنخوازی لەنێوان تاکی چینە جیاوازەکاندا، یان قەدەغەکردنی نانخواردنی تاکەکانی چینێك لەگەڵ تاکەکانی چینەکانی تردا، چەندین

قەدەغەکردنی تر لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەنێوان تاکەکانی چینە جیاوازەکاندا، وای لە نهرو کرد لە یەکێك لە گفتوگۆکانیدا بڵێت: هیند یەکێکە لەو نەتەوانەی کەمترین لێبوردەیی هەیە لە کلتور و نەریتەکاندا، وێڕای ئەوەی یەکێکە لەو نەتەوانەی زۆرترین لێبروردەیی هەیە لە جیهانی بیرکردنەوەکان و بیروباوەڕەکاندا!. وێڕای ئەوە تەنانەت لێرەدا هۆکارێك هەیە لەپشت زۆربوونە نەخوازراوەکان. توندی لە قەدەغەکردنەکاندا لەبارەی ئاوخواردنەوەی تاکەکانی چەند چینێکی جیاواز لە یەك کانیدا، ئەوەمان بۆ دەردەخات بەشێك لە هۆکاری ئەم قەدەغەکردنانە خۆی حەشارداوە لە جیاوازی ئاستەکانی بەرگری دژ بە نەخۆشیەکان. بەڵام بەهەرحاڵ، هۆکاری گشتی ئەم قەدەغەکردنانە شتێکە لەمە فراوانترە. ئەگەر تاکە نایەکسانەکان نەپارێزران لە تێکەڵ بوون بەیەکتر ئەوا بەبەردەوامی ڕکابەری و بەراوردکاری دەکرێت لەنێوان بەهێز و لاوازدا، بەدڵنیاییەوە هەمیشە کەسی لاواز هەلی سەرکەوتن لە ژیانیدا لە دەست دەدات. دروستە ڕەوایەتی نیە لەنێوان تاکەکانی چینە جیاوازەکاندا، بەڵام لەناو یەك چیندا، مافەکانی تاك پارێزراو بوو، بەوەی ناچاربوو چاکسازی بکات لە مافەکانیدا بە تەنها لەم جیهانە فراوانەدا. هەموو چینێك خۆی فەرمانڕەوایی خۆی دەکات بەمجۆرە هەموو مرۆڤێکی ناو چینێکی تایبەت کاتێك دەکەوێتە ناو کێشەیەکەوە دڵنیایە لەوەی دادگایی دەکرێت لەلایەن هاوشانەکانیەوە. لەنێو هەموو چینێکدا دڵدانەوە و پێدانی هەل و گەرەنتی کۆمەڵایەتی دابینکراو بوو.

بەڵام جیاوازی کۆمەڵیەتی لەنێوان خودی چینەکاندا، ئامانجەکەی لەدەستدا بۆ قەرەبووکردنەوەی گونجاو لەگەڵ ئەو خزمەتگوزاریانەی کە جێبەجێ دەکران. ئەمە پێویستی بە چاکسازی کۆمەڵگەیە بەوەی هەندێك لە تاکەکان خۆیان بکەنە قوربانی و بەرگەی لێپرسراوێتی گەورەتر بگرن لە قەبارەی ئاسایی. لەکاتێکدا زۆربەی گەنجەکان لەکاتێکی زوودا دەچنە سەر کار و بژێوی پەیداکردن و ژنهێنان، پێویستە لەسەر هەندێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە کە چێژ و خۆشیەکان دوابخەن بۆ ماوەیەکی دوور، هەتا بتوانن بچنە سەر توێژینەوە تایبەتیەکانیان. لەکاتێکدا کرێکار لە کارەکەی تەواو دەبێت لە کاتژمێر پێنجدا، ئەوا بە هەموو ئەو کارە هەستاوە کە پێی سپێردراوە. لەکاتێکدا پێویستە لەسەر بەکارهێنەرانی کاری بەڕێوەبردن ئەنجام بدەن. کێشەکە لەوەدا نیە ئایا ئەو کەسە پسپۆڕانە ئامادەن یان نا بۆ بەردەوام بوون لە خزمەتکردندا بەبێ کرێیەکی ماددی باش، هێندەی ئەوەی ئایا کۆمەڵگە مافی ئەوەی هەیە ئەوەیان لێ داوا بکات یان نا؟. هەرگیز هیند دیموکراتی تێکەڵ نەکردوە بە دڵدانەوە. پێناسەی دادپەروەری بریتیەلەوەی هەموو کەسێك هێندەی ماندوبوون و قەبارەی لێپرسراویەتیەکەی پێ بدرێت، واتە سەربەرزی بگونجێت لەگەڵ قەبارەی لێپرسراویەتیەکاندا. لەبەرئەوە لەڕووی مووچەی مانگانەوە بەڕێوبەرە کارگێڕیەکان لە لوتکەدان سەبارەت بە هەموو چینەکان، لەکاتێکدا قەشەکان واتە براهمە لەسەر لوتکەی کۆمەڵگەن لەڕووی پلەوپایە و ڕێزگرتنەوە، بەڵام ئەمە تەنها لەبەرئەوەیە لێپرسراویەتیەکەیان گەورەتر و مەترسیدارترە.

بەتەواوی بەپێچەوانەی بیروباوەڕی ئەوروپیەوە کە دەڵێت پادشا نابێت هەڵە بکات، هیندۆسیەت وابیردەکاتەوە شودری یان چینی چوارەم یان خوار چینی چوارەم نابێت هەڵەبکەن، چونکە نەوەکانی ئەم چینە وەك ئەو منداڵانە دادەنرێن کە ناکرێت پێشبینی زۆر شتیان لێبکرێت. لەبەرئەوە کاتێك یەکێك لە بەرهەمهێنەکان دەستگیردەکرێت بەهۆی تاوانێکەوە، سزادەدرێت دوو هێندەی کەسێك لە چینی شوێنکەوتوان لەکاتێکدا هەمان تاوان ئەنجامدەدا. بەڵام ئەگەر فەرمانڕەوایەك هەمان تاوانی ئەنجام دا، ئەوا سزاکەی دوو هێندەی سزای بەرهەمهێنەکە دەبێت، بەهەمان شێوە ئەگەر برهمیەك هەمان تاوانی ئەنجامدا ئەوا سزاکەی دوو هێندەی بەرهەمهێنەکە دەبێت بەڵکو هەندێکجار چوار ئەوەندە.

لە هیندنا، لێخۆشبوون هەیە بۆ چینی نزم واتە شودری لەبارەی خۆنەویستیەوە کە داواکراوە لە نەوەی چینەکانی تر. بۆ نمونە بێوەژنی شودری دەتوانێت شوو بکات لەدوالی مردنی مێردەکەی، هەروەك لە حەرامکردنەکان کە پەیوەندیان هەیە بە خواردنی گۆشتەوە ئاسانکاری تیایە بۆ شودری.
ئەگەر ویستمان بیرۆکەی یتمی چینایەتی بخەینەڕوو بە زمانی سەردەمی نویٚ ئەوا بەمشێوەیە دەردەکەوێت: چینی ڕۆتینیەکان دەکەونە دوا چینی کۆمەڵگەوە: واتە خاوەن کارە ڕۆتینیە ناسراوەکان، ئەو کرێکارانەن کە دەتوانن خۆڕاگربن لەەر یەك شێوازی کارکردن، بەڵام پابەندبوونی خودیان هێندە لاوازە کاتێك دەچنەسەر کار، پێویستە کاتی هاتن و ڕۆیشتن تۆماربکەن، واتە کاتژمێەکانی مانەوە لەشوێنی کاردا، هەستکردنیان بە کات کورتە بە ڕادەیەك ناکرێت پشتیان پێببەسترێت لە پرۆسەی قوربانیدان بە هەندێك لە چێژەکانی ئێستا بۆ چەند دەستکەوتێك لە داهاتودا. لەسەروو ئەوانەوە چینی تەکنیکیەکان دێت: ئەوان خاوەن ئیشی دەستین لە کۆمەڵگەی پێش پیشەسازیدا، بەڵام لە سەردەمی پیشەسازیدا ئەوان ئەو کەسانەن دەزانن چۆن کاربکەن بە ئامێرەکان و چاکیان دەکەنەوە ئەگەر لەکارکەوتن و دوزانن چۆن والە ئامێرەکان بکەن لە حالەتی کارکردنی بەردەوامدا بن، دواتر چینی بەڕێوبەرەکان دێت، ئەم چینە لە باڵە رامیاریەکەیدا لێپرسراوانی دەوڵەت و وەزیرەکان دەگرێتەخۆی، لەگەڵ کارمەندە شارستانیەکان، لە باڵە سەربازیەکەیدا، ژەنەڕاڵەکان و سەرۆك ئەرکانەکان دەگرێتەوە، لە باڵە پیشەسازیەکەیدا: شارەزایانی دابەشکرد و بەڕێوبەرە کارگێڕیەکان و بەڕێوبەری کارگەکان دەگرێتەوە کە کاری بەرهەمهێنان دەکەن و پێشبینی بڕی بەکارهێنراو دەکەن و پلان دادەنێن بۆ فراوانبوون. ئەگەر لەسەر کۆمەڵگە پێویست بێت کە تەواو بێت، ئەوا پێویستە چینێکی تر هەبێت لەسەروو چینی کارگێڕیەکانەوە لەڕووی پێزانین و ڕێگرتنەوە نەك لەڕووی مادیەوە، چونکە گرنگترین نیشانەی ئەم چینە گرنگیدانە بە بەهاکانی پشت ماددە. ئەم چینە لە کۆمەڵگەدا ئەمانە دەگرێتەوە: مامۆستایان و سەرۆکە ڕۆحیەکان و نوسەران و هونەرمەندانی تر. هاوشێوەی ئەو کەسانەی کە هیند ناویان دەبات بە پێشبینیکەران، چونکە ئەوان چاوی خەڵکن. هەروەك سەر، واتە کارگێڕیەکان، جەستە واتە کرێکار و تەکنیککارەکان، چاوەکان واتە پێشبینیکەرەکان(٣٧).
پێویستە ئەندامانی ئەم چینە ئامادەکراو بن بە هێزی توانای پێویست بۆ سەرکوتکردنی خودپەرستی، لەگەڵ سەرکوتکردنی پاڵنەرەکانی دەروون کە لەوانەیە بینین و ژیری خۆڕسك لاواز بکات. ئەوان دەستدەگرن بەسەر ڕێزی ئەوانی تردا یەکەمین شت دەرکدەکەن بە لاوازی خۆیان لە هەستان بەم سەرکوتکردنی دەروونە، دووەم دەرکدەکەن بە ڕاست و دروستی ئەوەی قەشەکان بۆیان دەگوێزنەوە لە جیهانی شتە نەبینراوەکان. قەشە ئەو شتانە دەبینێت کە نەوەکانی تر نایبینن (بەپێی بیروباوەڕی هیندۆسیەت).
لەبەرئەوە کاتێك قەشە پێویستی بەوەیە دوور بکەوێتەوە لە کارکردن بۆئەوەی سەرقاڵی تێڕامان و بیرکردنەوە بێت، پێویستە قەشە بپارێزرێت لە سەرقاڵبوون بە پێداویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەوە چونکە ئەمە کاردەکاتە سەر بیرکردنەوەی و دەیشێوێنێت.
لە هەموو ئەمانە گرنگتر بریتیەلە پێویستی پاراستنی پیاوانی ئەم چینە لە کارکردن بۆ دەسەڵات، ناکرێت نەوەکانی ئەم چینە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیان پێبدرێت. پێویستە برهمانیەکان سەرقاڵی خوداپەرتن بێت و گرنگی نەدات بە دونیا. لەکاتێکدا برهمانی ئەم پەیمانەی لەبیرچوو ئەوا گەندەڵی دەچێتە ناو چینەکەیەوە. چونکە لە دەسەڵاتی کاتیدا توشی فریوخواردن و فشار دەبێت کەلەوانەیە یاساکانی مرۆڤ بشێوێنێت. دواتر ئیشی قەشە سەپاندنی سیستم نیە لەڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە، بەڵکو ئیشەکەی بریتیەلە پێدانی ڕاوێژی

دروست. ئیشی سەرکردایەتی نیە بەڵکو ڕێنیشاندانە. هێزی لە باوەڕپێهێناندایە نەك لە بەكارهێنانی هێزدا. ئەو وەك دەرزی قیبلەنمایە دەپارێزرێت بۆئەوەی هەمیشە بەرەو ئاڕاستەی باكور بێت، هەروەها كاری قەشە ئەوەیە هەمیشە ئاماژە بكات بۆ واتای ژیان و ئامانجەكەی.

كاتێك سیستمی چینایەتی مرد بۆگەنی كرد. تایبەتمەندی و خەسڵەتی سیستم هەرچیەك بێت لە سەرەتادا ئەوا بە تێپەڕبوونی كات لەبیردەكرێت و پشتگوێ دەخرێت. هەروەك وتەكەی ئەرستۆ كە دەڵێت: ((لەوانەیە دایك و باوكێكی ئاڵتونی نەوەیەكی زیویان ببێت، لەوانەیە دایك و باوكێكی زیوی نەوەیەكی ئاڵتونیان ببێت. لەبەرئەوە پێویستە پلەوپایەكان بگۆڕدرێن، دەبێت كوڕە دەوڵەمەند دابەزێت و كوڕە هەژار سەربكەوێت بەسەر پەیژەی كۆمەڵایەتیدا، چونكە یەكێك لە پەندەكان دەڵێت: ئەو دەوڵەتەی مرۆڤی دڵڕەق فەرمانڕەوایی دەكات زۆر درێژە ناكێشێت)). هەروەك یەكێك لە بیریارە بەرگیكەرەكان لە سیستمی چینایەتی دەڵێت: ((لەوانەیە پێشبینی ئەوە بكەین سیستمی چینایەتی پەرەبسێنێت و ڕێگەبدات بە ژن و ژنخوازی لەنێوان تاكەكانی چینە جیاوازەكاندا یان گۆڕینی پیشەیەك لەژێر چەند هەلومەرجێكدا، بەڵام لەڕاستیدا تێبینی ئەوە دەكەین خەڵكی ئارەزوی ئەوە دەكەن هاوشانی خۆیان بهێنن لە چینە كۆمەڵایەتیەكەیاندا، زۆربەیان بەو كارە هەڵدەسن كە باوباپیرانیان ئەنجامیان داوە))(٣٨).

هێندەی ئەوەی سیستمی چینایەتی بووەتە نمونەیەك بۆ چەقبەستن و جیاوازی كردن و پێدانی پلەوپایە بەوانەی شایەنی ئەوەن، هێندەی ئەوەی هیندۆسیەت كاردەكات لە ئەمڕۆدا بۆ پاككردنەوەی سیاسەتەكانیان لەم سیستمەدا. بەڵام هێشتا زۆر كەس هەن باوەڕیان هەیە بە كێشەی چینەكان ئەوانە نا كە تایبەتن بە هیند بەڵكو ئەمە كێەیەكی جیهانیە، هێشتا هیچ میللەتێك نەیتوانیوە چارەسەری بكات بەشێوەیەكی ڕەگوڕیشەیی، لەدوای دۆزینەوەی بنەمای ڕێكخستنی كۆمەڵگە، هەریەكە لە دادپەروەری و داهێنان وبەرهەمهێنان لەلای بیردۆزی سیستمی چینایەتی هێشتا شتێكی یارمەتیدەرن بۆ بیری نوێ.

هەتا ئێرە، باسی هیندۆسیەتمان كرد لە گۆشەنیگای گرنگیە پراكتیكیەكەی بۆ مرۆڤ، بەوەی دەستمانپێكرد بە شیكردنەوەی هیندۆسیەت بۆ ئارەزوەكانی مرۆڤ، دواتر ئەو ڕێگایانەمان ڕوونكردەوە كە دەیانخاتە بەردەم مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی ئەو ئارەزوانە، لەگەڵ وەڵامدانەوە گونجاوەكان بۆ ئاستە جیاوازەكانی ژیان، لەگەڵ جێگا جۆراوجۆرەكان ژیان، بەڵام ئەوەی ماوە باسی بكەین بریتیەلە چەمكە فەلسەفی و بیروباوەڕیە سەرەكیەكانی ئایینی هیندۆسیەت.

## ئەو زاتەی هەموو وشەکان لەبەردەمیدا دەچنە دواوە

ئارنۆڵد توینبی دەگێڕێتەوە جارێکیان ڕەخنەی لەدایکی گرتوە کاتێك بینیویەتی وردەکاریەکانی بەشی پێشەوەی وێنەی دیمەنێکی سروشتی دەسڕیەوە کە دەیکێشا، ئەویش لە وەڵمدا پێی وت یەکەیم بنەمای فێربوونی وێنەکێشان برتیەلەوەی: چی پشتگوێ دەخەیت و چی لادەدەیت؟

هیندۆیەت پێداگری دەکات لەسەر ئەوەی ئەمە یەکەمین بنەمایە پێویستە فێری ببین لەکاتێکدا لەبارەی یەزدانەوە دەدوێین. مرۆڤ هەمیشە هەوڵدەدات ڕاستی بەدەست بهێنێت لەڕێگەی وشەکانەوە، بۆئەوەی لە کۆتاییدا لەوە تێبگات نهێنی یاخی دەبێت لە وشەکان و ڕستەکان سەرکۆنە دەکات، تێدەگات لەوەی بەشە زمانەوانیەکەی بێدەنگی دەیبڕێت.

کێشەکە لەوەدانیە کە مێشکمان بەتەواوی ڕۆشن نەبووەتەوە، کێشەکە زۆر لەمە قووڵترە. مێشکمان بە ئاگاییەکەی و هەستپێکردنیەوە ئامێرێکی هەڵەیە بۆ هەستان بەم پرۆژەیە. لەبەرئەوە کارکردنەکەی بۆ دەرککردن بە یەزدان وەکو هەوڵدانە بۆ هێشتنەوەی ئاو لە ژوورێکدا لەڕێگەی تۆڕەوە. نوێژی شانکارا (قەشەی هیندۆسی کە هاوشانی توما ئەکوینیە لە مەسیحیەتدا) کە ترسان لە یەزدان دەخرۆشێنێت لە دەروونندا، بەم دەستەواژەیە دەستپێدەکات: ((ئەی ئەو زاتەی هەمووو وشەکان لەبەردەمتدا دەچنە دواوە!. . )).

مێشکی مرۆڤ پەرەپێدراوە بۆئەوەی بەردەوامی بدات بە مانەوەی لەم جیهانە سروشتیەدا، لەبەرئەوە گونجێندراوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شتە مادیە سنوردارەکاندا، لەکاتێکدا یەزدان بەپێچەوانەی ئەمەوە، بوونەوەرێکی بێسنوورە، بوونێکە لە ڕەگوڕیشەوە جیاوازە لەوەی کە دەشێت ئەڵمان دەرکیپێبکات. لەبەرئەوە پێشبینیکردنمان بۆ دەرککردنی ئەڵی مرۆیی بۆ ڕاستی یەزدان، وەکو داواکردنمانە لە سەگێك کەلەڕێگەی لووتیەوە تێبگات لە بیردۆزی ئەنیشتاین!. لەوانەیە ئەم چواندنە گومراکەر بێت ئەگەر بەشێوەیەکی تر خراپەڕوو، ئەوا بەو واتایە دەهات مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت یەزدان بناسێت. ئەمە لەکاتێکدا کێشەکە بریتیەلەوەی یۆگاکان تزواناي زانینی ئەقڵی تێدەپەڕێنن، لەبەرئەوەی دەچێتەناو قووڵاییەکانی ئاگاییەوە(٣٩). کەواتە تاکە باسکردنی ورد بۆ ئەو زاتەی دەرکپێناکرێت، کە ئەقڵی ڕووکاری مرۆیی بەتوانایە بەسەریدا بریتیەلەوەی: ((بەمشێوەیە نیە. . . بەمشێوەیە نیە. . )). ئەگەر هەموو گەردون گەڕایت بە درێژی و پانی لەبارەی هەموو شتێکەوە کە دەیبینیت و دەرکیپێدەکەیت دەڵێیت: ((ئەمە یەزدان نیە. . . ئەمە یەزدان نیە. . )) ئەوەی لەدوای ئەمانە دەمێنێتەوە یەزدانە(٤٠).

وێڕای ئەوە ناکرێت خۆمان بپارێزین لە وشە و چەمکەکان، لەبەرئەوەی تاکە کەرەستەن لەبەردەستی مێشکماندا، چونکە هەر پێشکەوتنێك بۆ ئاگایی بەئاڕاستەی یەزدان پێویستە ئەنجام بدرێت بە یارمەتی ئەو. چەمکەکان ئەگەر ئەقڵ نەبەن بەرەو شوێنی مەبەستی هەر بەسودن لە ئاماژەکردن بۆ ئاڕاستەی دروست.

دەکرێت بەسادەیی بەناوی یەزدان دەستپێبکەین، لەبەرئەوەی تەوەرێك بدەینە بیرکردنەوەکانمان بۆ جێگیربوون لەدەوری. ئەو ناوەی هیندۆس دەینێت لە ڕاستی شکۆدار، بریتیە لە برهمان، لە چاوگی برە واتە گەورە. خەسڵەتە سەرەکیەکان کە پەیوەندیان هەیە بەم ناوەوە بریتین لە: سات، و ئەناندا، واتە یەزدانی بوون، ئاگایی (زانست)، شادومانی و ئاسودەیی.

ڕاستی پوخت، ئاگایی پوخت، ئەو زاتەی کەلەسەروو هەموو توانایەکی نائومێدیەوەیە، بەشێوەیەکی پوخت. ئەمە بیردۆزی سەرەکی هیندۆسیەتە لەبارەی یەزدانەوە. بەڵام تەنانەت ئەم وشانە ناتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن

کەتوانیویانە باسی یەزدان بکەن بەشێوەیەکی تەواو. چونکە ئەو واتایانەی هەڵیدەگرن بۆناو مێشکمان بەتەواوی جیاوازە لەو واتایانەی دەچەسپێنرێن بەسەر یەزداندا. چونکە ئێمە تەنها خاوەنی بیرۆکەیەکی زۆر نادیارین کە واتای بوونی پوخت دەیبەخشێت، بوونی ناکۆتا کە هیچ سنورێکی نیە. هەمان شت سەبارەت بە زانست و ئاگایی، شادومانی و ئاسودەیی. هەروەك سبینوزا وتی: ((ئەگەر ئەم وشانەی دەیڵێین لە سروشتی یەزدان بچن ئەوا ورچی گەورەی ئەستێرەیی وەك ورچی ڕاستەقینە وایە!)). ئەوەی دەکرێت بوترێت لەبارەی ئەم وشانەوە هیچ نین جگەلە چەند ئاماژەیەك، هەندێکیان بە ئاڕاستەی پێچەوانە دەجوڵێن. واتە یەزدان دەکەوێتە لایەنی بەرزترین لەو بوونەی کە لێی تێدەگەین، بەڵام هیچیەتی نیە، دەکەوێتە سەروو ئەقڵەکانەوە هەروەك دەیناسین، دەکەوێتە سەروو مەستیەوە، بەڵام خەم و بێزاری نیە.

ئەمە ئەو برە پێویستەیە هەتا هەندێك ئەقڵ بە ئاڕاستەی دروستدا بڕۆن لە وێناکردنیان لەبارەی یەزدانەوە: بوونی ناکۆتا، زانستی ناکۆتا، شادومانی ناکۆتا.

هەندێك فەرمانڕەوا هەن دەتوانن بژین لەم کەشوهەوا سادە و شکۆدارەی ڕۆحدا، وەك بزوێنەرێك دەیبینن، دەتوانن لەگەڵ شانکارادا لەوە تێبگەن کە: ((خۆر تیشك دەداتەوە تەنانەت ئەگەر شتێك نەبێت تیشکی بخاتەسەر)). بەڵام لەلای زۆرینەی خەڵك ناکرێت ئەم ئاستە بەرزەی نەویستی دەستیان بەسەردا بگرێت.

پرۆفیسۆر ئێس. ئیس. لویس لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەو کەسانەیە، ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە ئەقڵیان لە نزمترین ئاتدا نیە بەڵکو تەنها جیاوازە. پرۆفیسۆر لوی پێما دەڵێت کاتێك منداڵ بووە باوك و دایکی ئاگاداریان نەکردوەتەوە لەوەی یەزدان وێناکردن باش نیە لە هەر شێوەیەکدا بێت، چونکە هەموو شێوەیەك واتە سنردارکردن و کۆتادارکردنیەتی. ئەو دەڵێت هەوڵمدەدا پابەندبم بە ڕێنماییەکانیانەوە بەڵام نزیکترین شت لەو بیرۆکەیەی یەزدان بێ شێوەیە، هیندۆسیەت دەڵێت: ئەم چیرۆکە بەشێوەیەکی ئاشکرا ئاماژە دەکات بۆ حاڵەتی ژن و مێردێك ئەقڵیان تەنها پەیوەستە بەشتێکی بەرجەستەکراوەوە بۆئەوەی ئەگەر ئەقڵیان ویستی واتایەك بدۆزێتەوە ئەوا بەها دەبەخشێتە ژیان.

زۆرینەی خەڵك وابیردەکەنەوە کە کارێکی ئەستەمە تا تێبگەن و شتەکان وێنابکەن، ئەگەر بە هەر شتێك بجوڵێنرێن کە لابراوە لەو شتەی ئەزمون و شارەزاییان هەیە تیایدا. وەکو ئەو کەسانەی هیندۆسیەت ئامۆژگاریان دەکات کە بیر لە یەزدان نەکەنەوە وەك بوون و ئاگایی، بەڵکو بیری لێبکەنەوە وەك نمونەی ڕاستیەکی شکۆدار کە دەیبینن لە جیهانی سروشتیدا. ئەمە واتە بیرکردنەوە لێی وەك: کەسی شکۆدار (ئیشورا یان بهاگافان)، چونکە تاکەکان لوتکەی شکۆداری سروشتن. هەروەك پێشتر باسمان کرد لە بەشی بهاکتی یۆگادا بەمشێوەیە لە تێگەیشتن لە یەزدان و وێناکردنی لە هیندۆسیەتدا. ئەمە بەکارهێنانی دەستەواژەی ڕۆژئاوایی باسکالە: خوداوەندی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب، نەك خوداوەندی فەیلەسوفەکان، ئەمە یەزدانە، میهرەبانە، بەبەزەیی و بەخشندەیە، زانایە بە هەموو شتێك، بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، هەمیشەییە، مەزنترین هاوەڵی مرۆڤە کە تێی بگات و دەرکیپێبکات.

لە هیندۆسیەتدا کاتێك لە یەزدان تێدەگەن و وێنادەکرێت بەمشێوەیە ناوی ساگونا براهمان saguna brahman یان یەزدانی خاوەن خەسڵەتەکان بە جیاکردنەوەی لە خوداوەندی فەیلەسوفەکان کە ناودەبرێت بە نیرگونا براهمان nirguna brahman واتە یەزدانی بێ خەسڵەت. چونکە نیرگونا براهمان دەریایەکی بێ شەپۆلە، لەکاتێکدا ساگونا براهمان هەمان دەریایە بەڵام شەپۆلدەدات. لە زمانی زانستی ئایینیدا، جیاکردنەوە لەنێوان چەمکی کەسی و ناکەسی یەزداندایە. هیند پشتیوانانی هەردو بیردۆزەکەی لە خۆگرتوە، لەکاتێکدا

شانكارا سەبارەت بە پشتیوانانی یەزدانی ناكەسیە، ڕاما نوجا سەبارەت بە پشتیوانانی یەزدانی كەسیە، بەڵام دوا بڕیار كە مێژووی هیند بەگشتی پۆلێن دەكات، ئەوانەی كە پشتیوانی ئاشكرای هەیە وەك: ڕاما كریشنا لە هەردو تێڕوانینەكەدا وەك یەك دروستە. لەوانەیە ئەمە بۆ یەكەمجار وەك سوكایەتی كردن بێت بە یاسای بوون و نەبوون یان مردن و ژیاندا. ئێمە پێداگری دەكەین لەسەرئەوەی یەزدان كەسیە یان ناكەسیە، ناكرێت هەردوكیان بێت لە یەك كاتدا! بەڵام ئایا ئەم شتە بەڕاستی وایە؟ هیندۆسیەت ناڕازیە بە جوداكردنەوەی ئەم دوو چەمكە بە ماوەیەكی دوور كە لۆژیكی ئەقڵمان و یەزدان جیادەكاتەوە بەوشێوەیەی ناسیومانە و بێنامانكردوە. خودی یەزدان لەوانەیە نەكرێت دوو شتی دژبەیەك بێت. دەڵێم لەوانەیە چونكە لەوانەیە لۆژیك بتوێتەوە لەژێر وزی پرشنگدانی یەزدانیدا. بەڵاك تێگەیشتنمان لە یەزدان بڕێكی زۆر لە بیركردنەوەی تێكەڵاو لەخۆدەگرێت، لەوانەیە دوان لەو شتانەی دژبەیەكن ڕاستگۆبن تیایدا ئەگەر سەیركران لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە، هەروەك هەردو دەستەواژەی شەپۆلەكان و گەردیلەكان دوو ئامڕازی ورد و ڕاستگۆن بەهەمان ئاست، لە باسكردن و ڕوونكردنەوەی سروشتی ڕوناكیدا(٤١).

بەشێوەیەكی گشتی، هیند باوەڕیوایە پێویستە بەندە هانبدرێت بۆ تێگەیشتن و وێناكردنی براهمان یەزدان وەك كەسێك یان ناكەس، ئەمە بەپێی ئەو وێناكردنانەی هەیەتی بۆ مانا و ئاڕاستەو مەیلی ئەقڵی تایبەت بە شوێنكەوتوەكە. سەركەوتن و شكۆداری فیكر ڕاستیە، بەڵام ئەو هێمایانەی شكۆداری دێنن چەند ڕێگایەكە ڕۆحەكان بەرەو فڕین دەبات، تەنانەت ئەگەر ئاماژەبكات بۆ چەند ئاڕاستەیەكی جیاواز. كەواتە ئاگاداربە لە ئیدانەكردنی شتە دژبەیەكە ڕوكاریەكان، چونكە لەوانەیە ڕاست بن بۆ كەسێكی دیاریكراو.

بەهەمان شێوە پەیوەندی یەزدان بە جیهانەوە دەگۆڕێت بەپێی ئەو شێوەیەی وێنادەكرێت و وێنادەكرێت. ئەگەر یەزدان وێنا بكەیت بەوەی بوونەوەرێكی كەسیە ئەوا بەپەیوەندیەكەی بە جیهانەوە وەك پەیوەندی نێوان هونەرمەند و كارە هونەریەكەیەتی ئەوا: بەدیهێنەر (براهما) و پارێزەر (فشنو) و تێكشكێنەر (شیفا)یە كە هەموو شێوە كۆتادارەكان شیكاردەكەن و دوبارە دەیگەڕێنێتەوە بۆ سروشتی یەكەمین كە لێوەی سەرچاوەی گرتوە. بەڵام ئەگەر دەركرا بە یەزدان بە شێوەی ناكەسی، ئەوا لە سەروو ململانێیەكەوەیە ناكۆتایە لە هەموو ڕوخسارەكان. ((هەروەك خۆر نالەرزێت كاتێك وێنەكەی دەلەرزێت لەسەر ڕووی دەفرێكی پڕ لە ئاو ئەگەر لەرزێنرا، بەهەمان شێوە یەزدان كاری تێناكرێت بە ئازار وێڕای ئەوەی ئەمە بەشێكە لێیكە ناونراوە بە ڕۆحی تاكی كە هەست بە ئازار دەكات))(٤٢). جیهان بەبەردەوامی پشت بە یەزدان دەبەستێت. ((ئەو پرشنگی دا، بەهۆیەوە خۆر و مانگ و ئەستێرەكان درەوشانەوە، بە ڕوناكیەكەی هەموو شتێك ڕۆشن بوویەوە. . . كەواتە ئەو ئەقڵی ئەقڵ و گوفتاری گوفتار و ژیانی ژیان و چاوی چاوە))(٤٣). بەڵام لەم تێڕوانینەوە جیهانی نەویستوە، هێندەی كاریگەر بووە بە نادیاری جیهان و ناتەواوبوونی و سنورەكەی كە پەیوەستە بە سروشتەكەیەوە.

ئایا ئەمە مردنی ئایین نیە كاتێك دڵی مرۆڤ زەوت دەكرێت لە گەنجینە بەنرخەكەی: گەوهەرەكەی خۆشەویستی یەزدانە بۆ ئێمە؟ وەڵامەكە بریتیەلەوەی ناكەسیەتی یەزدان بەكارێكی زۆر جیاوازتر هەڵدەسێت. ئەگەر یەكێكتان هەوڵ بدات مەلەبكات دژ بە ئاڕاستەی ڕۆیشتنی ئاو، ئەوا واباشترە كە مامۆستایەكی مەلەوانی لەگەڵدابێت كە ڕزگاری بكات ئەگەر نوقمی ئاوەكە بوو. لەهەمان كاتدا پێویستە كەنارێكی ڕەق و ئارامگرتووی هەبێت، وەك خاڵی كۆتایی كە تیایدا بحەسێتەوە لەدوای ماندوبوونێكی زۆر. لەڕاستیدا ئەو كەسەی بیر لە یەزدان دەكاتەوە بە وێناكردنێكی ناكەسی لەوانەیە ئامانجەكەی هەموو بوونی داگیركردبێت و توانای ئەوەی

**نەمابێت گرنگی بدات بە خۆی، تەنانەت بۆئەوەی بپرسێت ئایا ئەو کارە بکات یان چاوەڕی ئەوە بکات یەکێك لە هاوڕێکانی لە کەنارەکەی ترەوە هانی بدات.**

## گەیشتنی ڕۆح بە سوڕی تەواوبوون لە گەردوندا

لـەدوای ئـەوەی پلەوپایـەی یـەزدانمان زانـی لـە هیندۆسـیەتدا، دەتـوانین بگەڕێینـەوە بـۆلای مـرۆڤ بۆئـەوەی بەشێوەیەکی ڕێکخراو وێنەی بکێشین بۆ تێگەیشتنی لە یەزدان سەبارەت بە هیند لەبارەی سروشتی مرۆڤ و چارەنوسیەوە.

هیندۆسیەت وابیردەکاتەوە ڕۆحە تاکەکان کە ناویان دەبات بە جیڤا jivas، هاتۆتەناو جیهانەوە بەشێوەیەکی نهێنی، دەڵێت: دەتوانین دڵنیابین کە ئەوە جێبەجێکراوە بەهێزی یەزدان، بەڵام بەشێوەیەکی تەواو لەتوانامانـدا نیە، کە ئەمە شیبکەینەوە بۆ چ مەبەستێك ئەمە جێبەجێکرا؟. ئەم ڕۆحانە وەکو ئەو بڵقانەیە کە بەرزدەبنەوە لەکاتی کوڵانی ئاودا، کە بەناو ئاوەکەدا (گەردون) بەرزدەبنەوە بۆئەوەی سەربەخۆ بێت لە بۆشایی بێسنوردا بۆ پرشنگدان و ڕوناکبونەوەی ڕۆحی (سەربەخۆبوون). ئەمانە دەستپێدەکەن وەك ڕۆحێك لە سادەترین شێوەی ژیان، بەڵام شی نابێتەوە و بە مردنی جەستە یەکەمیەکانیان فەنانابێت. لەتێڕوانینی هیندۆسیەتدا، پەیوەندی ڕۆح بە جەستەوە زیاتر نیە لە پەیوەندی جەستە بەو پۆشاکانەی دەیەوێت لەبەریان بکات یان ئەوماڵەی کەتیایدا دەژی. لەکاتێکدا گەورە دەبێت بۆ ئەو پۆشاکەی لەبەریکردوە یان وابیردەکەینەوە کە ماڵەکەمان بەرتەسك بووەتەوە لەپێشچاومان، چونکە ئێمە پۆشاکەکانمان دەگۆڕین بۆ پۆشاکی گەورەتر و ماڵەکەمان دەگۆڕین بۆ ماڵێکی فراوانتر بۆئەوەی سەربەخۆیی زیاتر بۆ جەستەمان فەراهەم بکەین بۆ جموجوڵێکی زیاتر.

جلوبەرگە ڕزیوەکان لادەدرێن لەلایەن جەستەوە

جەستە ڕزیوەکان لادەدرێن لەلایەن ئەو ڕۆحانەی تیایاندا نیشتەجێن

((بهاگافاد گیتا))

ئەم پرۆسەیەکە ڕۆحی تاك پیایدا تێپەڕ دەبێت ((جیڤا)) لەلایەن زنجیرەیەکی یەکلەدوای یەك لە جەستە کە ناودەبرێن بە ((لەبەرگرتنەوەی ڕۆحەکان))، لە سنسکریتیدا ناودەبرێت بە: سامسارا samsara، ئەمە وشەیەکە بەواتای: ((ئازار و ئەشکەنجەی توند دێت)).

لە ئاستی خوار مرۆییدا، گواستنەوە ئەنجام دەدرێت لەڕێگەی کۆمەڵێك لە جەستەوە کە ئاڵۆزیەکەی زیاددەکات هەتا دەگاتە جەستەی مرۆیی. هەتا ئەم خاڵە، گەشەسەندنی ڕۆح لە ڕاستیدا خۆڕسکانەیە. ئەمە وەك ئەوەیە ڕۆح لەو گەشەسەندنەیدا بێت، گەشەدەکات بەهەمان سروشتی ڕووەکێك، لە هەموو بەرجەستەکردنێکی یەکلەدوای یەکدا جەستەیەك بەدەست دێنێت کە توانای پێداویستی دەداتیّ بۆ بەدەستهێنانی داخوازیە نوێکانی.

لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕۆح و گەیشتنی بە جەستەی مرۆیی، ئەم بەرزبوونەوە خۆڕسکەی ڕۆح دەوەستێت. تایبەتکردنی ڕۆح بۆ ئەم جێگا شکۆدارە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ڕۆح گەیشتوە بە ئاستی ئاگایی خود، لەم پلەوپایەدا سەربەخۆیی بەدەست دێنێت (واتە ئیرادە و سەربەخۆیی لە هەڵبژاردندا) و لێپرسراوێتی (واتە هەوڵدان و تێکۆشان).

ئەو ئالیەتەی هەندێك لەم دەسکەوتە نوێیانە دەبەستێتەوە بەیەکەوە بریتیەلە یاسای کارما. واتای وشەی کارما بریتیەلە کارکردن، بەڵام کارما وەك بیروباوەڕ بەنزیکەیی واتە: یاسای هۆکار و دەرئەنجام. زانستی زانای ڕۆژئاوایی ئاگاداریکردوینەتەوە لەسەر گرنگی پەیوەندی هۆکاری یان یاسای هۆکار لە جیهانی سروشتدا. ئێمە باوەڕمان وایە کە هەموو ڕوداوێکی سروشتی پێویستە هۆکارێکی هەبێت، هەروەك هەموو هۆکارێك دەرئەنجامێکی دیاریکراوی هەیە، هیندۆسیەت هەوڵیداوە کە چەمکی شکۆداری گەردونی ژیانی ڕۆحی و

ئاکاری مرۆڤ بگرێتەخۆی. ڕۆژئاوا هەمان بیروباوەڕی هەیە: ((مرۆڤ چۆن دەچێنێت ئاوها دەدورێتەوە))، یان هەروەها ((بیرۆکەیەك بچێنە و کارێك دروێنە بکە، کارێك بچێنە و خووڕەوشتێك دروێنە بکە، خووڕەوشتێك بچێنە و ئاکارێك دروێنەبکە، ئاکارێك بچێنە و چارەنوسێك دروێنە بکە)). ئەمە شێوازەکانی ڕۆژئاوایە لە خستنەڕووی ئەم ڕاستیەدا. بەڵام جیاوازیەکە لەوەدایە هیند کاری پێدەکات لە یاسا ئاکاریەکەیدا و فراوانی دەکات بۆئەوەی بیبینێتبەشێوەیەکی تەواو پابەندە. حاڵەتی هەناوی یان ڕۆحی هەموو تاکێك بەرهەمێکی تەواوی ئەو شتانەیە ئارەزوی دەکردن و بەدەستی هێناون لە ڕابردودا، بەهەمان شێوە بیرکردنەوەکانی و تواناکانی ئێستای حاڵەتە ڕۆحیەکەی دیاری دەکەن لە داهاتوودا. هەموو کارێك کە تاك ئاڕاستەی دەکات بۆ جیهانی دەرەکی ڕەنگدانەوەی هەیە لەبەرامبەردا، لەسەر خودی مرۆڤ و دەروونی. هەموو بیرۆکەیەك و کارێك کە پێی هەڵدەسێت، وەکو پیاکێشانێکە بۆ سەر پەیکەری چارەنوسی.

ئەم بیرۆکەی کارمایە، هەڵگری ئەو ئاکارە تەواوەیە کە دوو دەرئەنجامی دەروونی گرنگ بەدوایدا دێت.

یەکەم: پەیوەستە بەئەو هیندۆسیەی دەرك بە ڕاستی لێپرسراوێتی کەسایەتی تەواو دەکات. هەموو مرۆڤێك بەتەواوی لێپرسراوە لە حاڵەتەکەی ئێستای. هەروەك داهاتوی بەتەواوی ئەو شتەیە ئێستا دروستی دەکات. زۆربەی خەڵك نایانەوێت بەم ڕاستیە ڕازی ببن. ئەوان پێیان باشە لێپرسراویەتی لەسەر خۆیان لابدەن، سەرچاوەی کێشەکانیان دیاری بکەن لەناو خودیاندا. ئەوان حەز بە پاساو هێنانەوە دەکەن، کەسێکیان دەوێت لۆمەی بکەن لەسەر ئەو شتەی خۆیان تێیدان بۆئەوەی پاکانە بۆ خۆیان بکەن. هیندۆسیەت دەڵێت: ئەمە زۆر بە سادەیی ناوی ناتەواوبوونە. هەموو مرۆڤێك بەتەواوی ئەو شتە بەدەست دێنێت کە شایەنیەتی. ئێمە بەدەستی خۆمان خێزانەکەمان دروست دەکەین و پێویستە لەسەری بحەسێینەوە. بەپێچەوانەی ئەمەوە، بیرۆکەی گەردونی ئاکاری دەرگاکەی دادەخات لەبەردەم هەموو بەختێکدا، ئایا بەدبەختی بێت بۆ پاساوهێنانەوە بۆ شکستەکەیان، یان خۆشبەختی بێت بۆ پێشبینیکردنی بەدەستهێنانی هەلی سەرکەوتن لە داهاتوودا. زۆرن ئەوانەی لێرەو لەوێ ڕاپێچدەکرێن لە ژیاندا، تەنها چاوەڕێی ئەوەن کە گۆڕنکاریەکی کتوپڕ ڕوبدات، یان چاوەڕێی ئەو ساتەوەختەن کە بانگیان دەکرێت بەناوی خۆیان بۆئەوەی ناوبانگ و دارایی بەدەست بهێنن. هیندۆسیەت دەڵێت: لەکاتێکدا مامەڵە لەگەڵ ژیانتدا دەکەیت بەم شێوەیە، ئەوا هەڵە دەکەیت لە هەڵسەنگاندنی ئەو بارەی تێیدایت. لەڕاستیدا بەختە باشە کتوپڕەکان هیچ پەیوەندیەکیان نیە بە شادومانی ڕاستەقینەوە، تەنانەت ئەوەی ناودەبرێت بە خۆشبەختی بەڕێکەوت ڕوونادات. ئێمە لە جیهانێکدا دەژین هیچ جێگایەکی تیانیە بۆ بەخت یان ڕێکەوت، ئەم وشانە (بەخت، ڕێکەوت) هیچ نین جگەلە پۆشاکێك بۆ بێئاگاییمان لە ڕاستی ڕوداوەکان.

ئەمە لەکاتێکدا کارما پێویستی بە جیهانێکی یاسایی بەزەبر هەیە، زۆربەی جار شیکاری بۆ کراوە وەك جۆرێك لە بڕوابوون بە قەزاوقەدەر. بەڵام وێڕای ئەوەی هیندۆسیەکان لەوانەیە بەتەواوی زۆربەی کات خۆیان دابێتەدەست ئەم شیکارە بۆ بڕوابوون بە قەزاوقەدەر، بەڵام دروست نیە بوترێت ئەمە خودی بیروباوەڕی کارمایە. کارما دەڵێت هەموو بڕیارێك دەرئەنجامی یەکلاکەرەوەی هەیە، بەڵام خودی بڕیارەکان دواهەمین شیکارن. ئەگەر ویستمان کێشەکە چارەسەربکەین لەلایەکی ترەوە ئەوا دەڵێین دەرئەنجامی بڕیارەکانی ڕابردووی مرۆڤ بریتین لە جۆرێك لە پێکهێنانی ئەم حاڵەتەی ئێستای، بەهەمان ئەو بڕەی یاریزانی وەرەق خۆی بە مەحکومکراوی دەبینێتەوە بەو وەرەقەی بەسەریدادابەشکراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا سەربەخۆیە لە یاریکردن بەو وەرەقانە بە چەندین ڕێگای جۆراوجۆر. ئەمە واتا خودی هەڵبژاردنەکانی ڕۆح ڕێنمونی ئەم ڕۆحە دەکات لە ژیانیدا،

ڕێگاکەی بۆ دەبڕێت بەناو ژمارەیەکی لەڕادەبەدەر لە جەستەی مرۆیی، بەڵام ئەو بەم ڕۆڵەی بڕیار دەدات لەسەر ئەوەی ڕۆح ئارەزوی دەکات لە هەریەکە لە ئاستەکانی گەشتە دوورودرێژەکەیدا. بەڵام ئایا ئەم ئارەزوانە چین؟ ئەو ڕیزبەندیە کامەیە کە تیایدا دەردەکەوێت؟ ئەمە خراوەتەڕوو بەوردی لە بەشەکانی پێشودا. لەبەرئەوە لێرەدا تەنها بەکورتی باسی دەکەین. لەکاتێکدا جیڤا واتە ڕۆحی تاك هاتە ناو جەستەی مرۆییەوە بۆ یەکەمجار، تەنها ئارەزوی چەشتنی چێژە هەستپێکراوەکان دەکات کە کەرەستە جەستەییە نوێکانی دەستەبەری دەکات بۆی. لێرەدا دوبارەی دەکەینەوە زۆرترینی ئەو چێژە هەستپێکراوانە بەرەو جەنگە کۆمەڵایەتیەکان بۆئەوەی ژیان ڕزگاربکات لە بێمانایی، بەڵام ئەم جەنگانە بەهەرسێ جۆرەکەیەوە: دارایی و ناوبانگ و پلەوپایە، دەتوانن مرۆڤ سەرقاڵ بکەن بۆ ماوەیەکی درێژ، خەڵاتەکانی گەورەن، بەدەستهێنانیان ڕازیکردن و تێرکردنی دەروونە، وێڕای ئەوە لە کۆتاییدا هەموو بەرنامەکانی ئەم کەسایەتیە بەگشتی دیوە ڕاستەقینەکەی دەردەکەوێت بۆ مرۆڤ، واتە دەردەکەوێت ئەمە تەنها گەمەیەکە. بەڵێ ئەمە گەمەیەکی چێژبەخشە بەڕادەیەکی زۆر و سەرنجڕاکێش و مێژوویی، بەڵام تەنها گەمەیەکە و هیچ تر نیە.

لەبەرئەوەی ئەم یاریە مرۆڤ سەرقاڵ دەکات، ئەوا سەرکەوتن تیایدا دەبێتەهۆی تێرکردنی دەروون. بەڵام کاتێك هیچ هۆکارێك یان هاندەرێك نیە تالەسەر بنەمای ئەو بکرێتە یاریەکی سەرنجڕاکێش تەنانەت کاتێك سەرکەوتو تیایدا هەست بەوە دەکات بە چەند سەرکەوتنێك گەیشتوە کە پێشتر بەدەستی هێناوە، ئەوکاتە وابەباش دەزانێت بەدوای شتێکی نوێدا بگەڕێت بۆئەوەی دەروونی تێربکات بەشێوەیەکی قووڵتر. لێرەدا هەستان بە ئەرك و تەرخانکردنی دەروون بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگە لەم ساتەدا ئامانجێکە بۆ دابینکرددنی ئەو پێداویستیە. بەڵام گاڵتەپێکردنەکانی مێژوو ئەم ئامانجە دەکاتە دەرگایەکی سوڕاوە. هەرکات مرۆڤ پشتی پێبەست لەژێر دەستی دەردەچێت و دەکەوێت، بەتێپەڕبوونی کات مرۆڤ هەست بەوە دەکات دەسوڕێتەوە و دەسوڕێتەوە لە بازنەیەکی بەتاڵدا. لەدوای فەنابوون لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەدا، تاکە چاکە کە دەتوانێت خودی مرۆڤ ڕازی بکات لەڕووی ڕۆحیەوە تێری بکات، بریتیە لەو زاتەی تاکوتەنهایە ناکۆتایە، بۆ هەمیشە بوونی هەیە و نامرێت، کە بە دەرکپێکردنی دەتوانێت هەموو تاقیکردنەوەکان بگۆڕێت، تەنانەت ئەزمونی کات و چەشتنی شکستهێنانی ڕووکاری، بۆ مەزنی و شکۆداری، هەروەك چۆن گەردەلوول و بەرزبوونەوەی کتوپڕی هەورەکان ڕاپێچدەکرێت بەرەو قووڵایی دۆڵێك لەکاتێکدا مرۆڤ سەیری دەکات لە لوتکەی شاخێکی ڕووناککراوە بە تیشکی خۆر.

بڵقەکان گەیشتونەتەسەر ڕووکاری ئاوەکە و ئێستا دەیانەوێت بۆ دواجار ڕزگاریان بێت.

بەرەوپێش چوونی ڕۆحی بەرزبوەوە بەنێو ئەم سوڕانەی ئارەزووەکانی مرۆڤایەتیدا شێوەی هێڵێکی ڕێك وەرناگرێت بە ئاڕاستەی سەرەوە، بەڵکو ڕێگای ڕۆح پێچاوپێچ دەبێت کاتێك بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات کە مەبەستیەتی پێی بگات. بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ ئاڕاستەکەی بەرەو سەرەوەیە، مەبەست لە سەرەوە لێرەدا خاوبوونەوەی پلەبەپلەیە بۆ وابەستەبوون بە ئامانجەکان و هاندەرە مادی و جەستەییەکان، بەرەبەرە دووردەکەوێتەوە لە بوونی سنورداری دەروون بەرەو ئامانجێك کە زیاتر دەمێنێتەوە. ئێمە دەتوانین کاری کارما ببینین لەوەی پێشکەشی دەکات لە دەرئەنجامەکان کە ڕۆح لە هەوڵداندایە بۆ گەیشتن پێیان. ئەم کارە وادەردەکەوێت کە هەموو ئارەزویەك ئامانجی ڕازیکردن و شادومانکردنی منی باڵایە کە دەبێتەهۆی زیاتر دابڕینی تاك لە دەریای بوونی ناکۆتا کە دەوریداوە. لەکاتێکدا هەموو پاڵنەرێك بە ئاڕاستەی بەشداریکردن لەو ژیانە فراوانەدا ئەو نهێنیە ئاشکرادەکات کە بوونی مرۆڤ کۆت و بەند دەکات. چونکە پاشەکشەکردنی یەکێك لە تاکەکان لەژیان بۆئەوەی بچێتە پەرستگاوە بۆلای ڕاهیبەکان، هەموو کاتەکانی تەرخان بکات بۆ تێڕامان

بەڵگەیەك نیە بۆئەوەی بەسەر خۆیدا زاڵ بووە و بەتەواوی بەسەریدا سەرکەوتوە یان زاڵبووە بەسەر ئارەزو و هەوەسەکانیدا، چونکە لەوانەیە لە وێناکردنەکانی دڵیدا سووربێت لەسەر تێرکردنی ئارەزوەکانی. بەپێچەوانەی ئەمەوە لەوانەیە مرۆڤێك هەبێت بەتەواوی ڕۆچووبێت لە دونیادا و بە سامان و دارایییەکی لەڕادەبەدەر دەورەدرابێت بەڵام ئەگەر بەڕاستی لەم شتانە دابڕابێت وەك هیندۆسیەت دەڵێت: ((لەنێو ئەو شتانەدا دەژی هەروەك چۆن ماسی ناو قوڕاو لە قوڕاودا دەژی بەبێئەوەی قوڕاوی بێت)) ئەوا دەتوانێت ئەم ناوەندە بەکاربهێنێت بەو کەرەستە یارمەتیدەرانەی بەکاریدەهێنێت لە گەشتە ڕۆحیەکەیدا.

ڕۆحی مرۆڤ لەمیانەی گەشتە ڕۆحیەکەیدا بەتەنها نیە یان بەبێ ڕێنسشاندەر نیە بەڵکو گەردیلەکانی هەر لە سەرەتاوە تا کۆتاییئاتمانە. لەپشت هەستەکانیەوە کە وەکو ئەو گێژاوی ئاوەیە هەموو شتێك بەرەو خۆی کێش دەکات بەرەو خاڵێکی جێگیری ڕوناك کە ڕوناکیەکەی لە خودی خۆیەتی خودی یەزدان. وێڕای ئەوەی نێژراوە لە قووڵترین قووڵاییەکانی مرۆڤدا، قووڵتر لەوەی بتوانرێت تێبینی بکرێت بەشێوەیەکی ئاسایی، بەڵام تاکە زەمینەی بوونی مرۆڤ و ئاگاییەکەیەتی. ((هەروەك خۆر جیهان ڕوناك دەکاتەوە تەنانەت کاتێك لەبەرچاو دیار نیە بەهۆی پەڵە هەورەکانەوە، بەهەمان شێوە جێگیر و نەگۆڕە. . . هەرگیز نابینرێت، بەڵام ئەو بینەرە بە هەموو شتەکان، هەرگیز گوێمان لێی نیە، بەڵام ئەو بیستەرە بە هەموو شتەکان، هەرگیز بیری لێناکرێتەوە بەڵام ئەو بیریارە، هەرگیز ناناسرێت بەڵام ئەو زانایە بەهەموو شتەکان، هیچ بینەرێك نیە جگەلە ئەو، هیچ بیستەرێك نیە جگەلە ئەو، هیچ بیریارێك نیە جگەلە ئەو، هیچ زانایەك نیە جگەلە ئەو))(٤٤).

بەڵام یەزدان تەنها هێزی دەرونی ڕوکاری دابین ناکات بەڵکو لە کۆتاییدا تیشکدانەوەکەی ئەو دیوارە ئەستورەی ڕۆح دەتوێنێتەوە کە هەرلە سەرەتاوە سەرکەوتنەکەی دەشاردەوە بەشێوەیەکی تەواو، بەڵام لە کۆتاییدا بوویە توانا و هێزی پوختی یەزدان.

دوای ئەوە چی ڕوودەدات؟ هەندێك دەڵێن ڕۆحی تاك دەگوازرێتەوە بەرەو گونجانی تەواو لەگەڵ یەزداندا، هەموو شوێنەوارێکی دابڕانی لە یەزدانی تیانامێنێت. ئەوانی تر، ئەوانەن دەیانەوێت شیرینیەکە تام بکەن نەك ببنە خودی شیرینیەکە، هیواخوازن بۆ ئەگەری مانەوەی هەندێك جیاوازی سادە لەنێوان ڕۆح و یەزداندا، هێندەی دەزوویەکی باریك لەسەر ڕووی زەریایەك کە ئەو ناسنامە تایبەتیە دیاری بکات کە هەندێکیان دایدەنێن بەشتێك پێویستە هەبێت بۆ ژیریی خۆڕسك و دۆزینەوەی سۆفیگەری.

کریستۆڤەر ئیشروود چیرۆکێکی نوسیوە بە پاڵپشتی چیرۆکێکی هیندی ئەفسوناوی واتادار، گەشتی تەواوبوونی ڕۆح کورتدەکاتەوە لەنێو چەند سوڕێکدا هەتا دەگات بە سوڕی دوا تەواوبوونی گەردون. ئەمە چیرۆکی پیاوێکی بەتەمەنە دانیشتوە لەسەر سەوزاییەك لەگەڵ کۆمەڵە منداڵێك قسەیان بۆ دەکات لەبارەی درەختی ئەفسوناوی کلباتاروkalpataru کە هەموو ئارەزوەکان دێنێتەدی. ((ئەگەر لەگەڵی دوان، پێتان وت چیتان دەوێت یان لەژێریدا ڕاکشان و تەنها بیرتان کردەوە یان خەونتان بە ئارەزویەکەوە بینی ئەوا ئەو ئارەزوەتان دێتەدی)). دواتر پیاوە بەتەمەنەکە لە قسەکردن بەردەوام بوو ووتی: ((جاێکیان لە دێرزەماندا درەختێکی وەهام بەدەست هێنا و لە باخچەکەمدا چاندم لەڕاستیدا ئەو درەختەی لەوێدایە درەختی کلباتاروە.

لەوکاتەدا منداڵەکان بەپەلە ڕایانکردە لای درەختەکە و دەستیانکرد بە هیواخواستن. زۆربەی ئارەزوەکانیان ناژیرانە بوون بە بەدهەرسی یان گریان کۆتایی دەهات. بەڵام درەختی کلباتارو داواکاریەکانی جێبەجێ دەکرد بەبێ هیچ جیاوازیەك. ئەو ئامۆژگاری نەدەکردن.

چەند ساڵێك تێپەڕی، منداڵەکان کلباتارویان لەیاد نەما. ئێستا منداڵەکان گەورە بوون ئەوان ئێستا ژن یان پیاون دەیانەوێت ئارەوی نویێ بەدەستبهێنن. لەسەرەتادا هەوڵیان دەدا ئارەزوەکانیان بەدەستبهێنن بەڵام دواتر ئامانجەکەیان پێچەوانە بوویەوە، ئارەزوی بەدەستهێنانی ئەو شتانەیان دەکرد کە بە ئەستەم بەدەستدەهاتن.
مەبەست لە چیرۆکەکە بوونی درەختێکی مەزنی ئارەزوە، لقوپۆپەکانی بگاتە هەموو دڵێك. جوڵەیەکی گەردونی بڕیاردەدات لەو کاتەدا یان کاتێکی تردا، درەنگ بێت یان زوو، لەم ژیانەی ئێستادا بێت یان ژیانێکی تردا، هەریەکە لەم ئارەزوانە دێنەدی لەگەڵ دەرئەنجام و پێداویستیەکانیاندا.
چیرۆکەکە کۆتایی دێت بەوەی وێڕای ئەوەی تەنها یەك منداڵ لەنێو ئەو کۆمەڵە منداڵەدا ساڵەکانی تەمەنی بەسەرنەبردوە بەوەی لە ئارەزویەکەوە بۆ یەکێکی تر بازبدات، چونکە هەر لەسەرەتاوە تێگەیشتوە سروشتی ڕاستەقینەی درەختی کلباتارو چۆنە. ((سەبارەت بەئەو درەختی کلباتاروی ئەفسوناوی چیرۆکەکەی مامی بۆئەوە نەبوو هەتا ئارەزوە بێماناکانی منداڵەکان بهێنێتەدی، بەڵکو ئەو بە ڕادەیەك جوانە باسکردنی ئەستەمە. خودی ئەم درەختە باوك و دایکی بوون، ڕەگوڕیشەکانی باوەشی بە جیهاندا کردوە و بەیەکەوەی بەستوە، لقوپۆپەکانی گەیشتۆتە پشت ئەستێرەکان. ئەم درەختە سەرەتادا بوو، هەروەها بوونەوەرێکە بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە. ))(٤٥).

## جیهانی پێشوازی و ماڵئاوایی کردن

ئەگەر ویستمان وێنەیەکی ئەندازەیی گەردون بکێشین، بەوجۆرەی هیندۆسیەت دەیبینێت، ئەوا بەمشێوەیە دەبوو: ژمارەیەکی لەڕادەبەدەر لە گالاکسی[16] دەبینین کە هاوشێوەی گالاکسیەکەمانە، هەموو گالاکسیەك چەقێکی هەیە کە گۆی زەویەلەسەر ڕووەکەی کۆمەڵە مرۆڤێك دەژین ڕێگادەبڕن بۆ چوون بەرەو یەزدان. هەموو گۆیەکی زەوی دەورەدراوە بە چەند جیهانێکی ژوورو، شکۆدارتر و ناسترن لە زەوی، چەند جیهانێکی خواروو کە نزمترن لە زەوی ڕۆحەکان سەردانیان دەکەن لەمیانەی بەرجەستەکردنەکانیدا، بەپێی شایستەیی هەر ڕۆحێك بەهۆی ئەو کارانەی ئەنجامیداوە لە دوا بەرجەستەکردنیدا، ((بەتەواوی هەروەك چۆن جاڵجاڵۆکە دەزوەکانی دروست دەکات لە خودی خۆیەوە و دواتر قووتی دەداتەوە. . . بەهەمان شێوە زاتی هەمیشەیی فەنابوونی نیە گەردون بەرهەم دێنێت و دروستی دەکات))(٤٦).

بەڵام ئەم گەردونە دووبارە بەدەست دەهێنرێتەوە بەشێوەی سوڕێکی دوبارەبووە، چونکە تۆڕی گەردونی تێکدەشکێنرێت بۆ لیل براهما بۆئەوەی هەموو بوونەوەرەکان بگەڕێنەوە بۆ حاڵەتی (وزەی شاردراوە)ی پوخت. چونکە گەردون وەکو ئامێرێکی ئۆکۆردیۆنی زەبەلاحە فووی تێدەکرێت و گەورە دەبێت دواتر دەچێتەوە یەك و دەپوکێتەوە، ئەمە بە تایبەتمەندیەکی هەمیشەیی بوون دادەنرێت، چونکە گەردون سەرەتایەکی نیە هەتا کۆتایی هەبێت.

سیستمی کات لە کوزمولوجیا (واتە زانستی گەردونناسی) ی هیندۆسیەتدا ئارامدەگرێت لە وێناکردندا، لەوانەیە ئەمە پەیوەندی هەبێت بەوەی ڕۆژهەڵات ناوبانگی پێدەرکردوە لە ئارامی و گوێنەدان بە خێرایی و پەلەکردن. لەکاتێکدا هیندۆسیەت ویستویەتی بکێشێت بە ناکۆتایی کاتدا وتی: شاخەکانی هیمالایا کە دەوترێت لە گرانێتی ڕەق پێکهاتوە ئەگەر هەموو هەزارساڵێك چۆلەکەیەك فڕی بەسەریدا، بە دەنوکی پارچە قوماشێکی هەڵگرتبێت بۆئەوەی شاخەکەی پێ بسڕێت کاتێك کە دەفڕێت بەسەریدا، ئەوا یەك ڕۆژ لە سوڕی کاتی گەردون تێپەریوە!

ئەگەر لە باسکردنی کات و شوێنی گەردونەوە چووینەسەر خەسڵەتە فەلسەفیەکەی، ئەوا دەبینین یەکەمین کێشە کە بەرەوڕووی دەبینەوە بریتیەلەوەی لە بەندی پێشودا ئاماژەمان پێکرد، گەردون جیهانێکی ئاکاریە هەموو مرۆڤێك ئەوە بەدەست دێنێت تیایدا کە شایستەیەتی، هەموو مرۆڤێك بەدەستی خۆی تیایدا داهاتویەك بۆ خۆی دروست دەکات.

دووەم شت کە پێویستە لێرەدا باسی بکەین بریتیەلەوەی گەردون جیهانێکی ناوەندە. تەنها لەبەرئەوە نیە کە هەڵواسرراوە لەنێوان بەهەشت لە سەرەوە و دۆزەخ لە خوارەوە، بەڵکو ناوەندە بەو مانایەی مامناوەندە لە هەموو شتێکدا، چونکە ئەمە جیهانێکە تیایدا بە ڕێژەی یەکسان: چاکە و خراپە، چێژ و ئازار، زانست و نەزانینی تێدایە، بۆ هەمیشە بەمشێوەیە دەمێنێتەوە، کەواتە بوار نیە بۆ قسەکردن لەبارەی شکۆدارری کۆمەڵایەتیەوە، یان لەبارەی پاککردنەوەی جیهان و گۆڕینی زەوی بۆ بەهەشت، بەکورتی بوار نیە بۆ هەموو خەونە نمونەییەکان، چونکە چارەنوسەکەی نائومێدی نیە بەتەنها بەڵکو بە بەدحاڵی بوون دادەنرێت بۆ ئامانجی ژیان.

جیهان سەباەرت بە ڕۆح وەك هۆڵی یاری وەرزشیە بۆ جەستە، خوێندنگایەکە بۆ فێرکردن و مەشقکردنی ڕۆح. ئەو شتەی لە جیهاندا ئەنجامی دەدەین گرنگە بەڵام لە کۆتاییدا تەنها گرنگە بەپێی ئەوەی کارەکانمان

---

[16] گالاکسی مجرە: کۆمەڵە ڕژێمێکی ئەستێرەییە.

دەیبەخشێت بە ڕۆح لە پابەندبوون، خۆمان فریو دەدەین ئەگەر پێشبینی ئەوەمان کرد کە دەتوانین جیهان بگۆڕین بەشێوەیەکی ڕیشەیی. ئیشی مرۆڤ لەم جیهانەدا وەك هەڵدانی تۆپی بۆڵینگ وایەلە ڕێڕەوێکی لێژی یاری بۆڵینگدا. سودی ئەم یاریە بریتیەلەوەی ماسولکەکانمان پەروەردەدەکەین بەشێوەیەکی زۆر باش، بەڵام چەندە هەڵەیە وابیربکەینەوە بە پێکانی تۆپەکە بۆ نیشانەکان گۆڕانێکی یەکلاکەرەوە ئەنجام دەدەین، والە نیشانەکان دەکەین بۆ هەمیشە بکەون و تۆپەکە بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەلاکەی تر دەمێنێتەوە! لەڕاستیدا تۆپەکە خل دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ خوارەوە لەوانەیە بەر منداڵەکانمان بکەوێت ئەگەر ئێمە لەوێدا نەمابین. دەشێت ئەم جیهانە پەرەبدات بە خەسڵەتە بەشەکان تیاماندا، خەڵکی فێربکات کە سەیری دوای خۆیان بکەن بەڵام ناکرێت ئەم جیهانە بگۆڕێت بۆ بەهەشت، مرۆڤ تیایدا هەست بەوە بکات کە ئاسودەیە هەروەك لە ماڵی خۆیدابێت. ((یەسوع خوا لێی ڕازی بێت وتی: ئەم جیهانە وەك پردێك وایە، پیایدا تێپەڕببە بەڵام ماڵی لەسەر بنیات مەنێ)). فیکری هیندی وادادەنێت ئەم ڕستەیە یەکەمجار لە هیند وتراوە.

ئەی تایبەتمەندی میتافیزیکی جیهان چیە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر باسکردنی ئەو ناکۆکیەی کە هیندۆسیەتی دابەشکردوە بۆ دوو هێڵی سەرەکی، مەبەستم لە تێڕوانینی دوانەیی و یەکبوون. ئەم ناکۆکیە هیندۆسیەتی دابەشکردوە بۆ بەرنامەی ژیان و چوون بەرەو یەزدان، بۆ جنانا یۆگا (یۆگای زانست) و بەهاکتی یۆگا (یۆگای خۆشەویستی). لەڕووی باوەڕبوون بە یەزدان دابەشیکردن بۆ ئەو هیندۆسانەی کە یەزدان وێنا دەکەن وەك کەسێکی خاوەن چەندین خەسڵەت، ئەو هیندۆسانەی دەرکی پێدەکەن کە نە کەسێکە و نە خاوەنی چەند خەسڵەتێکە، لەڕووی باوەڕبوون بە ڕزگارکردن دابەشیکردن بۆ بەرگریکەران لە بیرۆکەی فەنابوون لە یەزداندا، ئەوانی تر هیواخوازن هاوەڵ و خۆشەویستی یەزدان بن. دواجار لەڕووی سەیرکردنیان بۆ ڕاست و دروستی گەردون و سەرچاوەکەیەوە دابەشیکردون بۆ ئەو هیندۆسانەی سەیری جیهان دەکەن وەك شتێکی خەیاڵی و درۆینە، ئەو هیندۆسانەی جیهان دەبینن وەك شتێکی ڕاستەقینە لە هەموو لایەکەوە.

هەموو شێوازەکانی فیکری ئایینی هیندۆسی ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە جیهانی سروشت و مادەکەی سەربەخۆ بێت و لەبوونیدا پشتی نەبەستبێت بە یەزدان، واتە یەزدان جیهانی ڕاگرتوە، ئەگەر وادابنێین یەزدان ڕاینەگرێت ئەوا هەموو گەردوون بەجارێك دەبێتە هیچ و بوونی نامێنێت. لەدوای ئەم ڕاستیەوە دوو بیردۆز دێن: دوانەیی و یەکبوونی گەردون. بیردۆزی دوانەیی گەردوون دەڵێت گەردوون بوونی هەیە هەروەك چۆن یەزدان بوونی هەیە، ئەگەرچی بوونی گەردوون بەدوای بوونی یەزداندا دێت و لە شکۆداریدا لەو کەمترە، وابیردەکاتەوە کە یەزدان و ڕۆحی تاك و سروشت هەریەکەیان شێوازێکی تایبەتە لە بوون و لەیەکتر ناچن، ناکرێت هیچ یەکێکیان بگۆڕێت بۆ ئەوی تر.

لەکاتێکدا یەکبوونەکان جیهانیان وەرگرتوە لەنێو سێ شێوازی ئاگایی مرۆییدا:

یەکەم: حاڵەتی وڕێنەکردن لەکاتێکدا کەسێك گوڵە مێخەکێك دەبینێت وادەزانێت فیلە یان چۆن دار لەناو ئاودا وادەردەکەوێت کە چەماوەتەوە لەکاتێکدا ڕێکە. ئەم دیمەنە فریودەرانە بەخێرایی ڕاستدەکرێنەوە بە ئاگایی و تێڕامانی زیاتر لەگەڵ تێبینی ئەوانی تردا.

دووەم: جیهانێك هەیە هەروەك دەردەکەوێت بۆ دەرکپێکردنی سروشتی و هەستەکانمان. ئەم جیهانە خۆڕاگرە لەبەردەم تاقیکردنەوە دوبارەبووەکاندا، هەروەك بەیەك شێوە دەردەکەوێت بۆ هەموو ئەو کەسانەی هەستی مرۆیی تەندروستیان هەیە.

دواجار: جیهانێك هەیە مرۆڤ دەرکیپێدەکات کاتێك لەڕێگەی ئەنجامدانی یۆگاوە بەرزدەبێتەوە بۆ پلەوپایەی ئاگایی نائاسایی. ئەگەر ویستمان لێرەدا بە وردی بدوێین ئەوا دەڵێین ئەوەی لەم حاڵەتەدا دەردەکەوێت بەهیچ شێوەیەك جیهان نیە، چونکە لەم بینینەدا هەموو شوێنەوارێکی خەسڵەتە جیاکەرەوەکانی جیهانی سروشتی دیارنامێنن: زۆریەکەی، مادی بوونەکەی. ((تەنها یەك ڕاستی بوونی هەیە وەکو دەریایەکی فراوانە. . . وەك ئەو ئاسمانەیە کە سنورێکی نیە، سادەیە بە دابەشبوون ڕازی نیە، بیٛ پایانە. وەکو ڕووی ئاوێکی فراوانی ئارامگرتوە کە هیچ کەنارێکی نیە)).

یەکبوونیەکان وادادەنێت ئەم تێڕوانینی سێیەمە دروستترە لەوانی تر. لەم تێڕوانینەدا جیهان ناودەنرێت بە ((مایا)): وشەیەکی سنسکریتیە واتاکەی خەیاڵە، بەڵام ئەمە وەرگێڕانێکی گومڕاکەرە چونکە بەو واتایە دێت پێویست ناکات گرنگی بدەین بەم جیهانە ئەمە کارێکە هیندۆسیەت ڕەتی دەکاتەوە کاتێك دەڵێت: لەبەرئەوەی جیهان وەك شتێکی ڕاستەقینە دەبینین پێویستە قوبوڵی بکەین و لەسەر ئەم بنەمایە مامەڵەی لەگەڵ بکەین، بەڵکو لەوە زیاتر هیندۆسیەت وابیردەکاتەوە گەردون لەڕاستیدا جۆرێکی لە ڕاستی سنوردار.

ئەگەر پرسیمان: ئایا خەونەکان ڕاستین؟ پێویستە وەڵامەکەمان سنوردار بێت. خەونەکان ڕاستین بەو واتایەی دەیانبینین، ناڕاستن بەو واتایەی ئەو شتانەی لە خەوندا دەیانبینین بەو جۆرە نین کەلە جیهانی دەرەکیدا بینیمان. ئەگەر ویستمان بدوێین بە شێوازێکی زانستیانە ئەوا دەڵێین خەون بینایەکی دەرونیە، شتێکە ئەقڵ دروستی دەکات لە حاڵەتێکی تایبەتیدا. ئەمە بەتەواوی ئەو شتەیە هیندۆس مەبەستیەتی لەکاتی وتنی وشەی مایادا. لەکاتێکدا ئەقڵی مرۆیی لەحاڵەتە سروشتیەکەیدایە جیهان بەو شێوەیە دێتەپێشچاوی کە ئێستا دەیبینین بەڵام مافی ئەوەمان نیە بڵێین ئەمە خودی ئەو ڕاستیەیە کە بۆمان دەردەکەوێت. بۆ نمونە: ئەو منداڵەی سەیری فیلمێکی سینەمایی دەکات بۆ یەکەمین جار وابیردەکاتەوە ئەو شتانەی تیایدا دەیبینێت-شێر، پادشاکان، سەربازەکان. . . هتد-بەڕاستی لەبەردەمیدان، ئەو وابیرناکاتەوە ئەم شتانە تەنها کۆمەڵە وێنەیەکن دەخرێنە پێشچاوی لە پڕۆجێکتەری سەروو شانۆی سینەماکەوە.

هەمان شتە سەبارەت بە ئێمە، ئێمە وادادەنێین ئەو جیهانەی دەیبینین لەڕاستیدا بەو جۆرەیە کە دەیبینین، لەکاتێکدا ڕاستیەکەی ئەوەی دەیبینین وابەستەیە بە حاڵەتێکی دەرونی تایبەتیەوە کە مێشکمان تیایدا دەژی لە ئێستادا. ئەگەر ویستمان ئەم نمونەیە بگۆڕین بۆ نمونەیەکی تر ئەوا دەڵێین وەرگری هەستەکانمان تەنها چەند شەپۆلێکی درێژی دیاریکراو وەردەگرێت کە هەستەکانمان ئامادەکراوە بۆ وەرگرتنی. بە یارمەتی بڵندگۆکان دەتوانین چەند شەپۆلێکی تر وەربگرین کەلە درێژیدا جیاوازن. بەڵام دەرك بە ڕاستی ناکەین بەو جۆرەی کە هەیە، تەنها کاتێك نەبێت کە بەرزدەبینینەوە بۆ ئاستی ئاگایی سەروو توانای مرۆیی، چونکە لەم حاڵەتەدا هەستەکانمان دەوەستێت لە شکاندنەوەی ڕوناکی بوونی پوخت، بۆ چەند تارماییەك، بەڵکو ڕاستی دواجار بۆمان دەردەکەوێت بەو جۆرەی کە هەیە: تاکە، بیٛ پایانە، پوختە.

وشەی مایا لە زمانی سنسکریتیدا پێکهاتوە لە هەمان چاوگی وشەی جادوو. لەکاتێکدا هیندۆسیەتی یەکبوونی دەڵێت: جیهانی مایا بەو واتایە دێت شتێکی فریودەر هەیە تیایدا بۆ بینین. فریودانەکە شاردراوەتەوە لەو ڕێگایەی جیهان مادی بوونی و زۆریە درۆینەکەی پێشکەش دەکات بەو واتایەی ئەمانە چەند ڕاستیەکی سەربەخۆن و جودان لەو حاڵەتە ئەقڵیەی دەیبینێت و دەرکی پێدەکات، لەکاتێکدا خودی ڕاستیەکە لە هیچ شتێکدا جودا نیە لە براهمان یەزدان، بەتەواوی هەروەك گوریس کاتێك ڕۆچووە لە خاکدا هەر گوریسە تەنانەت کاتێك وادەزانین مارە.

بەڵام ئەگەر جیهان ڕاستەقینە بێت بەشێوەیەکی سنوردار و کاتی، ئایا لەوکاتەدا مرۆڤ گرنگی پێدەدات بەپێی پێویست؟ ئایا ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە نابێتەهۆی ئەوەی مرۆڤ کەمتر هەست لە لێپرسراویەتی بکات؟ هیندۆسیەت وابیرناکاتەوە. کتێبی tripura raharsya باس لە کۆمەڵگەی نمونەیی دەکات-هاوشێوەی کۆماری ئەفلاتون-شازادەیەك گەیشت بە ئاستی ئەو ژیریە خۆڕسکە بۆ جیهان و دەربازبوون لە کێشەکان بەوەی جەستە دابنرێت بە دەرونی ڕاستەقینە. ئەو شازادەیەی گەیشتبووە پلەوپایەی ئازادبوون بەکاری خۆی هەڵدەسا بە چالاکی و دور لە هەموو سستیەك، بەڵام بە ئاررامی و بێ هیچ جۆرە هەڵچونێك، ((هەروەك ئەکتەری سەر تەختەی شانۆ)). بەهەمان شێوە شوێنکەوتوەکانی ڕێنماییەکانیان جێبەجێدەکرد، گەیشتن بە ڕۆشنبوونەوە و ئازادبوونێکی ڕۆحی هاوشێوەی ئەو چیدی شوێنکەوتەی هەوەس و ئارەزوەکانیان نەبوون وێڕای ئەوەی هێشتا تیایاندا بوو. کاروباری شارستانی بەردەوام دەبێت وێڕای ئەوەی هاوڵاتیان هەستیان بە دڵتەنگی نەدەکرد بەهۆی بەدبەختیەکەیانەوە لە ڕابردودا، هەروەها بە پەلکێشکردن بەرەو چێژەکانی داهاتوو لەگەڵ ئازارەکانی. ((ئەوان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، شادومان بن یان نیگەران یان بێزارو توڕەبن، لە هەموو حاڵەتەکاندا وەك مەست وان کە گوێ نادەن بە کاروباری تایبەت بە خۆیان))، لەبەرئەوە کاتێك فەرمانڕەواکان ئەم شارەیان بینی ناویاننا ((شاری ژیری بریقەدار)).

ئەگەر پرسیمان: بۆچی ڕاستی بە چەند ڕوویەکەوە دەبینین بە شێواوی وێڕای ئەوەی یەك ڕاستی هەیە؟ بۆچی ڕۆح خۆی بە جوداکراوەیی لە یەزدان دەبینێت وێڕای ئەوەی لەڕاستیدا بەتەواوی پێکەوە بەستراون؟ بۆچی گوریس وەك مار دێتە پێش چاومان؟ ئەگەر ئەم پرسیارانەمان کرد ئەوا ڕوبەڕوی ئەو پرسیارە دەبینەوە کە وەڵامێکی نیە ئەوەندەی پرسیارێك هەیەتی، کە هاوشانیەتی لە مەسیحیەتدا کە دەڵێت: ((بۆچی یەزدان جیهانی دروستکردوە؟)).

هیندۆسیەت دەڵێت: باشترین شت دەکرێت بوترێت لەم بوارەدا بریتیەلەوەی جیهان لیلای یەزدانە. (لیلا وشەیەکی سنسکریتیە بەواتای گەمە و یاری دێت)، واتە جیهان یاری یەزدانە. لەکاتێکدا منداڵان یاری چاوشارکێ دەکەن هەریەکەیان بە ڕۆڵێك هەڵدەسن کە هیچ ڕاستیەکی نیە لە ژیانیاندا لە دەرەوەی یاریەکەدا. ئەوان خۆیان دەخەنە حاڵەتێکەوە کە مەترسیدارە و خۆیان وا پیشان دەدەن پێویستیان بەوە هەیە ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی ڕابکەن لەو مەترسیە بەرەو ئازادبوون. بۆچی ئەو کارە دەکەن لە کاتێکدا هەریەکەیان بە چاوتروکاندنێك ئازاد دەبێت زۆر بە ئاسانی ئەگەر لە یاریەکە دەرچێت؟ تاکە وەڵام بریتیەلەوەی: ئەم یاریە داواکراوە ئەمە گەمەیەکە پێکهاتوە لە لێشاوێکی خەیاڵکردنەوەی دروستکەر. ئەم جیهانە هاوشێوەی ئەمەیە بەڵام بەشێوەیەکی نهێنی. وەك ئەو منداڵەی بەتەنها یاری دەکات بەهەمان شێوە یەزدان (برهمان) تاکە سەماکەری گەردونیە کە ڕێگاکەی دوبارەدەبێتەوە بە بەردەوامی و بەبێ کۆتایی هاتن بۆ هەم و بوونەوەرەکان و هەموو جیهانەکان لە تەزوی وزە گەردونیەکەیەوە کە ماندونەناسە و بێزاربوونی نیە، ئەو لە جموجوڵە خێراکانی بەردەوامە بەبێ وەستان. ئەوانەی پەیکەرەکانی خوداوەندی کالییان بینیوە سەما دەکات بەسەر مرۆڤی نائومێددا لە حاڵەتی کڕنوشبردندا، لەکاتێکدا بە دەستێکی شمشێرێك و بەدەستەکەی تری سەرێکی لێکراوەی پێیە، ئەوانەی بیستویانە پەرستگاکانی هیندۆسیەت تایبەتە بۆ خوداوەندی شیفا: دیمەنی لەناوبەری یەزدان، کە جێگای هەمیشەیی شوێنی سوتاندنی تەرمی مردوەکانە، زۆربەی پەرستگاکانی هیندۆسیەت تایبەتە بە یەزدان بە دیمەنە بەدیهێنەرەکەی براهما یان بە دیمەنە پارێزەرەکەی فیشنو، پێویست ناکات ڕاستەوخۆ بازبدات بۆ ئەو دەرئەنجامەی جیهان لە دیدگای هیندۆسیەتەوە جیهانێکی پڕلە خێر و خۆشی نیە. چونکە ئەگەر ئەو

کارەیان کرد ئەوا بێئاگا دەبن لەو ڕاستیە گرنگەی کە خوداوەندی شیفا و خوداوەندی کالی بە تێکشکاندن و فەناکردنەکەیەوە، سیستمێکی سنوردارە بۆ ڕێگاخۆشکردن بۆ بێ پایانی:

لەبەرئەوەی زەوی سوتاندنی تەرمی مردوانت خۆشویستوە

دڵم کردوە بە زەوی سوتاندنی تەرمی مردوەکان

لەوانەیە تۆ تاکە کەسی تاریك بیت، کەلەم زەویەدا بژی

سەما هەیشەییەکەت تیادا ئەنجام دەدەیت (سرودێکی بەنگالیە)

بەڵام هەرکەسێك سەیری جیهانی کرد بە شێوەیەکی گشتگیر، بتوانێت ئەو شتانەی تیا ببینێت بەپێی پەیوەندیە دروستەکانی و گرنگیە سنوردارەکانی، ئەوا لەکۆتاییدا جیهان بەشێوەیەکی پڕ لە چاکە و خۆشی دێتە بەرچاوی. دۆزەخێکی هەمیشەیی تیا نیە، هەڕەشەی ئیدانەکردنی هەمیشەیی ناکات، دەکرێت خۆشمان بوێت بێ هیچ ترسێك، دەکرێت هەموو شتەکانیمان خۆش بوێت: گەردەلولەکانی، ئاسمانە فراوانە زیویەکانی، دارستانەکانی، ڕووەکە هەمەجۆرەکانی، بەمەرجێك مرۆڤ وابەستە نەبێت بەم شتانەوە بۆ هەمیشە. چونکە جیهان بە هەموو ئەو شتانەی تێیدایە: ((مایا)) و هەروەها ((لیلا)): واتە سەمای جادویی گەردونی ئەو چاکەیە لە پشتیدا حەشاردراوە کە بێ سنورە و هەمووان پێی دەگەن لە کۆتاییدا. کەواتە ڕێکەوت نیە کە تاکە هونەر کە هیند شکستی هێناوە لە بەرهەمهێنانیدا تراژیدیا بێت.

کورتەی ئەوەی باسکرا بریتیەلەوەی هیند لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکەدا: چ جۆرێکە ئەو جیهانەی تیایدا دەژین؟ بەم شێوەیە دەدوێت:

١-ئەو تەنها جیهانێك نیە بەڵکو چەندین جیهانە، بەشێوەی ئاسۆیی لە چەندین گالاکسی پێکهاتوە بەشێوەی ستونی لە ژمارەیەکی لە ڕادەبەدەری چینی سەروو و خواروو پێکدێت، لەڕووی کاتەوە لە چەندین سوڕی کاتی پێکدێت.

٢-ئەو جیهانێکی ئاکاریە یاسای کارما کاری تیادا دەکات بەشێوەیەکی جیاکاری تیا نیە.

٣-ئەو جیهانێکی ناوەندیە، بۆ خۆی جێگای بوونەوەری شکۆدار ناگرێتەوە: دوا مەبەستی ڕۆحی مرۆیی.

٤-جیهانی مایا فریودەرە بەشێوەیەکی گومڕاکەر لەکاتێکدا والە بینەر دەکات زۆریەکەی و مادی بوونەکەی شەپۆلی پێ دەدات لە دوانی بوونەکەیدا ئەمە لەکاتێکدا هەمووی کاتیە و سنوردارە.

٥-ئەو خوێندنگای فێربوون و هۆڵی مەشقکردنە دەکرێت\ مرۆڤ تیایدا پێشبکەوێت بەرەو بوونەوەری شکۆدار.

٦-ئەو جیهانی لیلایە واتە گەمەی یەزدانی لە سەما گەردونیەکەیدا، کە ماندونەناسە و بێزاربوونی نیە هەروەها بێ پایانە، بەڵام لە کۆتاییدا جیهانێکی پڕ لە چاکەو خۆشیە، لێوانلێوە لە بەزەیی بێ پایان.

## چەندین ڕێگا بەرەو یەك لوتكە

لەڕاستیدا هیندۆسیەت بەشداربوو لەگەڵ زەردەشتی و بوزی و موسوڵمان و سیخ و مەسیحیەكان لە زەویەكەیدا بۆ چەندین سەدە كە یارمەتیدەرمانە بۆ شیكردنەوەی دوا بیرۆكە كە لە هیندۆسیەتدا دەردەكەوێت بەشێوەیەكی ڕوونتر لە هەموو ئایینێكی تری هاوچەرخ، مەبەستم لە بیروباوەڕی جێگیری هیندۆسیەتە بەوەی ئایینە گەورەكان جۆراوجۆرن و چەندین ڕێگایەكی تاڕادەیەك یەكسانن بەرەو یەزدانی تاكو تەنها. هیندۆسیەت وادەبینێت بانگەشەكردن بۆ ئایینێك بەتەنها دەستبەسراگرتنی ڕێگای ڕزگاربوونە، وەك ئەوەیە وادابنێین ویژدانی یەزدان لەم ژورەدا هەیە و لە ژورەكەی تەنیشتیدا نیە، یان لەم پۆشاكەدا هەیە و لەوی دیكەدا نیە.

لە حاڵەتی سروشتیدا هەموو تاكێك ڕێگای چوونە سەر شاخی ژیان دەگرنەبەر لەسەر ئەو ڕێگایەی ڕۆشنبیری و ئایینەكەی بۆی كێشاوە كە لەگەڵی گەورە بووە و لەسەری پەروەردەكراوە و لەگەڵیدا ژیاوە، بەڵام ئەوانەی لە دەوری شاخەكە دێن و دەچن هەوڵدەدەن ئەوانی تر بۆلای خۆیان كێش بكەن ئەوان لە حاڵەتی سەركەوتن بەسەر شاخەكەدا نین.

ئەمە لەڕووی تیۆریەوە بەڵام لەڕووی پراكتیكیەوەزۆربەی كات گروپە هیندۆسیەكان لێبوردنیان نیە و دەمارگیرن، ئەگەر لەڕووی بنەماو بیركردنەوە بێت هێشتا كراوەیە. دەقەكانی ڤیدا vedas لە دێرزەمانەوە ڕایگەیاندوە: ((ئایینە جۆراوجۆرەكان هیچ نین جگەلە چەند زمانێكی جیاواز كە یەزدان پێی دواوە لەگەڵ دڵی مرۆڤەكاندا)) ((تەنها یەك ڕاستی هەیە، هەرچەندە فەرمانڕەواكان بە ناوی جۆراوجۆر ناوی بنێن)).

لە هەر ڕێگایەكەوە بێت دەشێت سەربكەوین بەسەر شاخی ژیاندا، بەڵام كاتێك شاخەوانەكە دەگاتە لوتكە ڕێگاكان هەموویان یەكدەگرن. هەتا ئایینەكان لە گردۆلكەكان بن: واتە بیروباوەڕەكان زانستی ئایینناسی و مەڕاسیمەكان و ڕێكخستنی ناو كڵێساكان بەشێوەیەكی جودا لەیەكتر دەمێننەوە. هەروەها ناكۆكیەكانی ناو شارستانیەتەكان و مێژوو و جوگرافیا و هەڵسوكوتی كۆمەڵە مرۆییەكان، هەموو ئەمانە چەند خاڵێكی دەستپێكردنی جیاوازە بۆ چوون بەرەو یەزدان. ئەم شتە پێویست بە دڵگرانی ناكات، بەڵكو بە پێچەوانەوە شتێكی باشە، ئەزمونی ئایینی هەموو مرۆڤێك دەوڵەمەند دەكات بەشێیوەیەكی گشتگیر. ئایا ژیان سەرنجڕاكێشتر نیە بەهۆی هاوبەشیكردنی جۆراوجۆری كونفوشیەكان و تاوییەكان و بوزییەكان و مەسیحیەكان و جولەكەكان؟ یەكێك لە هیندۆسیە هاوچەرخەكان دەڵێت: ((بوار ڕەخساندن بۆ هاوشێوەی ئەم فرەجۆریە لە ژیانی ئایینی مرۆڤدا كارێكی هونەری ناوازەیە لێهاتویی پیشان دەدات. چەندە دەوڵەمەندە ئەو قوماشەی لە چنینیدا چەندین جۆر دەزوو بەكارهاتووە. ئایا جۆراوجۆری ڕێگاكان سەرنڕاكێشتر نیە لەوەی یەزدان بڕیاڕ بدات تاكە ڕێگەیەك هەبێت بۆ پەرستنی؟ وادەردەكەوێت یەزدان وێڕای ئەوەی تاكو تەنهایە داهێنان لە فرەجۆریدا دەبینێت))(٤٧). بەڵام لەپشت ئەم ناكۆكیانەوە تەنها یەك ئامانج هەیە.

یەكێك لە قەشە هیندۆسیە گەورەكان لە سەدەی نۆزدەیەمدا بەناوی ڕاما كریشنا داوای یەزدانی كرد لەڕێگەی چەندین ئایینی جیهانیەوە. دوای یەزدانی كرد لەلایەن خودی مەسیحەوە، دواتر لەڕێگەی ڕێنماییە یەزدانیەكانی قورئانەوە، دواتر لەڕێگەی بەرجەستەكردنە جیاوازەكانی هیندۆسیەتەوە. لە هەموو حاڵەتەكاندا بە هەمان دەرئەنجام دەگەیشت، ئەزمونە جیاوازەكان یەك یەزدانی بۆ ئاشكرا دەكرد، جارێك بەبەرجەستەكراوی لە مەسیحدا، دواتر وەك قسەكەرێك لەلایەن پێغەمبەرەكەیەوە موحەمەد (درودی خوای لەسەر بێت)، جارێك بەبەرجەستەكراوی لەسەر شێوەی فیشنو یان شیفا. ئەم ئەزمونانە كۆمەڵێك ڕێنمایی ئاشكراكرد لەبارەی یەكگرتویی گەوهەری ئایینە مەزنەكان كە جوانترین بانگەوازی هیندۆسیەتە لەم بابەتەدا. ئەمە لە كاتێكدا

گرنگی بیرۆکە و شێوازی خستنەڕووی لە گرنگیەکەی کەمناکەنەوە، وەك بینیمان نزیکتر دەبین لە هەڵوێستی ڕاستەقینەی هیندۆسیەت لەم بوارەدا ئەگەر پاشکۆی بەندەکەی ڕاما کریشنامان جێهێشت و کورتمانکردەوە بەم چەندوشەیە:

((یەزدان چەندین ئاییني جیاوازی بە پەیامبەرەکانیدا ناردوە بۆ بەندەکانی کە دەگونجێت لەگەڵ شێوازە جیاوازەکانی مرۆڤ و کات و شوێندا. هەموو بیروباوەڕەکان هیچ نین جگەلە چەند ڕێگایەکی جیاواز بەڵام ئەم ڕێگایانە هیچ کات نابنە خودی یەزدان. لەڕاستیدا مرۆڤ ناتوانێت بگاتە لای یەزدان تەنها ئەگەر بەوپەڕی وەفاداریەوە یەکێك لەو ڕێگایانە نەگرێتەبەر. دەتوانیت کێکێك بخۆیت چ لەلایەکیەوە بێت یان پارچە پارچە بێت، لە هەردو حاڵەتەکەدا هەست بە هەمانتام و چێژ دەکەیت.

هەروەك نەتەوە جیاوازەکان ناوی جۆراوجۆر لە ئاو دەنێن هەندێك ناوی دەنێن water و ئەوانی تر ناوی دەنێن eau و هەندێکیان بە aqua ناوی دەبەن و ئەوانی تر ناوی دەنێن بانی لەکاتێکدا هەر ئاوە بە هەمان شێوە یەزدان بە چەند ناوێکی جیاواز ناودەبرێت هەندێك پێی دەڵێن god و ئەوانی تر بانگی دەکەن بە الله و گروپی سێیەم ناوی دەبەن بە براهمان.

هەروەك مرۆڤ دەتوانێت بچێتە ناو ماڵەکەی لەڕێگەی پلیکانەوە یان لەڕێگەی پەیژەی تەختەوە یان لەڕێگەی گوریسەوە، بەهەمان شێوە ڕێگاکانی چوون بەرەو یەزدان دەگۆڕێت هەریەکە لە ئایینەکان یەکێك لە ڕێگاکانی چوون بەرەو یەزدان ڕووندەکاتەوە. هەروەك ئەو ئافرەتەی چووەتە نێو خێزانێکی نوێوە خۆشەویستی نیشان دەدات بۆ باوك و دایکی مێردەکەی و هەموو تاکەکانی تری خێزانە نوێکەی بەڵام لە هەمان کاتدا مێردەکەی لە هەمووان زیاتر خۆشدەوێت، بەهەمان شێوە مرۆڤ لەگەڵ وەفاداری تەواو و فەنابوونی لە پەرستنی یەزداندا، سوکایەتی ناکات بە پەرستراوی ئەوانی تر بەڵکو ڕێزیان لێ دەگرێت.

کڕنوشبەرە لەو شوێنەدا کە خەڵکیت بینی کڕنوش دەبەن چونکە یەزدان بەخشندەیە لەوێدا خۆی نیشان دەدات.

بەندەی شەیدا کە یەزدانی بە یەك شێوە بینیوە، نەیناسیوە تەنها لەو شێوەیەدا نەبێت. بەڵام ئەوەی بە چەندین شێوە بینیویەتی مافی ئەوەی هەیە بڵێت: ((هەموو ئەم شێوانە موڵکی تاکە یەزدانێکن ئەویش اللهیە، چونکە الله فرەشێوەیە)). ئەو بێ شێوەیە و شێوەی هەیە، شێوەکانی زۆرن کە هیچ کەس نایانزانێت.

ڕزگارکەری وەفادار پەیامبەری اللهیە. ئەو وەکو جێگری پادشایەکی مەزنە، هەروەك کاتێك ئاژاوە ڕوودەدات لەیەکێك لە هەرێمە دورەکانی شانشینەکەدا پادشا هەڵدەسێت بە ناردنی جێگرەکەی بۆ سەرکوتکردنی ئەنجامدەرانی ئەو ئاژاوەیە، بەهەمان شێوە کاتێك ئایین سوکایەتی پێدەکرێت لە هەر بەشێکی جیهاندا یەزدان ڕزگارکەرێکی بۆ دەنێرێت. ئەو هەمان ئەو ڕزگارکەرەیە دوای ئەوەی دەریای ژیانی بڕی لە هەمان شوێن دەرکەوت کە ناسرابوو بە ناوی کریشنا (بەرجەستەکردنی سەرەکی یەزدان لە هیندۆسیەتدا) دواتر جارێکی تر دەرکەوت لە شوێنێکی تری جیهاندا تیایدا ناسرابوو بە ناوی مەسیح.

پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێك شوێنکەوتوی ئاییني تایبەت بە خۆی بێت. مەسیحی پێویستە لەسەری شوێن بنەماکانی مەسیحیەت بکەوێت، موسوڵمان دوای ئیسلام بکەوێت بەم شێوەیە. . . سەبارەت بە هیندۆسی باشترین ڕێگا بۆی ڕێگا دێرینەکەیە: ڕێگای دانا ئارییەکان.

نەتەوەکانی سەر زەوی دابەشکراون بەهۆی ئەو سنورانەی دەوڵەتەکانیان دایاننناون، بەڵام هیچ کەسێك ناتوانێت ئاسمان دابەش بکات، کە سێبەری دروستکردوە بەسەر هەموو خەڵکدا. ئاسمان بە دابەشکردن ڕازی نابێت

دەوری هەمووانی داوە بەفراوانیەکەی گشتگیرە. بەهەمان شێوە کەسی نەزان دەڵێت: ئایینەکەی من تاکە ڕێگایە بەرەو یەزدان، ئایینەکەم باشترینە، بەڵام کاتێك دڵی ڕوناك دەبێتەوە بە زانینی ڕاستی، دەرك بەوە دەکات لەپشت هەموو جەنگ و ملمانێکانەوە تەنها تاکە پیرۆزیەکی هەمیشەیی هەیە ناکرێت دابەشبکرێت، زانایە بە هەموو شتەکان.

هەروەك چۆن دایك کاتێك منداڵە نەخۆشەکانی چارەسەر دەکات: برنج دەداتە یەکێکیان، نان و کەرە دەداتە ئەوی تر، بەهەمان شێوە یەزدان چەندین یاسا و بەرنامەیەکی جۆراوجۆری داوەتە مرۆڤەکان کە دەگونجێت لەگەڵ هەڵسوکەوت و شێوازی ڕەفتارکردنیاندا.

هەروەك مافی ئەوەت هەیە لەسەر بیروباوەڕەکەت جێگیر بیت، هەمان ماف بدەرە ئەوانی تر هەتا سەربەخۆ بن لە بەرگری کردن لە بیروباوەڕەکەیان، باش بزانە بە گفتوگۆ هەرگیز ناتوانیت باوەڕ بەوانی تر بهێنیت کە بیروباوەڕەکەیان هەڵەیە. تەنها کاتێك نەبێت کە یەزدان ڕێنمونی دەکات و وای لێدەکات دەرکبکات بە هەڵەکانی.

پیاوێك شیفای دەپەرست و ڕقی لە هەموو خوداوەندەکانی تر بوو، ڕۆژێکیان شیفا خۆی پیشاندا و پێی گوت: هەرگیز لێت ڕازی نابم هەتا خوداوەندەکانی ترت خۆشنەوێت. بەڵام پیاوەکە کەللەڕەق و گەمژە بوو بەو کارە ڕازی نەبوو. دوای چەند ڕۆژێك دوبارە خۆی نیشاندا و پێی وت: هەرگیز لێت ڕازی نابم هەتا خوداوەندەکانی ترت خۆش نەوێت. پیاوەکە بە بێدەنگی مایەوە. بۆ جاری سێیەم دوای چەند ڕۆژێك شیفا خۆی نیشاندا بەڵام ئەمجارە نیوەی جەستەی شیفا و نیوەکەی تری فیشنو بوو، بەندەکە نیوە شادومان و نیوە دڵتەنگ بوو، قوربانیەکانی پێشکەشکرد بەو نیوەیەی شیفایە بەتەنها، بۆ نیوەکەی تر هیچی نەکردە قوربانی. لەوکاتەدا شیفا پێی وت: کەللەڕەقیە کوێرانەکەتناکرێت زاڵبم بەسەریدا. بەم شێوە بەرجەستەکردنە هەوڵمدا ڕازیت بکەم بەوەی هەموو خوداوەندەکان هیچ نین جگەلە شێوەکانی براهمانێکی تاکوتەنها))(٤٨).

## پاشكۆیەك لەبارەی سیخیەتەوە

هیندۆسیەكان مەیلی ئەوە دەكەن سەیری سیخەكان (وشەیەكە بەمانای قوتابیان دێت) بكەن وەكو چەند ئەندامێكی یاخی بوو لە خێزانە فراوانەكەیان. بەڵام خودی سیخەكان ئەم جۆرە خوێندنەوەیە ڕەتدەكەنەوە. ئەوان ئایینەكەیان وەك هەڵقوڵاوی وەحیەكی یەزدانی سەربەخۆ دەبینن كە ئایینێكی نوێی كردوەتەوە.

ئەم وەحیە بەپێی بیروباوەڕی سیخ دابەزیوەتە سەر گورو نانك guru nank، وشەی گورو بەم مانایە دێت: گو لەناوبەری نەزانی، رو ڕۆشنایی هێنە. نانك هەر لەكاتی لەدایكبوونیەوە لەساڵی ١٤٦٩ز دا مرۆڤێكی لەخواتر و دیندار بوو نزیكەی ساڵی ١٥٠٠ز بەشێوەیەكی سەیر دیارنەما لەكاتێكدا مەلەی دەكرد لەیەكێك لە ڕووبارەكاندا، لەپاشئەوەی دوابەدوای سێ ڕۆژ دەركەوت وتی: ((ئەمە نە ڕێگەی هیندۆسەكانە نە هی موسوڵمانەكان. شوێن چ ڕێگایەك بكەوم؟ كە ڕێگای یەزدان بێت. یەزدان نە موسوڵمانە نە هیندۆسی، ئەو ڕێگایەی دەیگرمە بەر ڕێگای یەزدانە)). بە وتەی خۆی لەماوەی دیارنەمانی لەو سێ ڕۆژەدا یەزدان بردویەتیە لای خۆی، دەفرێكی داوەتێ لە گوڵاوی یەزدانی ئمریت (كە ناوی ئمریستاری لێوەوەرگیراوە: شاری پیرۆزی سیخیەكان) پێی وتوە: (ئەمە دەفری پەرستنی ناوی یەزدانە. بیخۆرەوە من لەگەڵتدام. پیرۆز و شكۆدارت دەكەم. هەركەسێك باست بكات چاكە دێنمەڕێی و لە بەخششەكانم بەهرەمەندی دەكەم. بڕۆ شادومان بە بەناوم و بەوانی تر بڵێ هەمان كار بكەن. با ئەمە بانگەوازەكەت بێت)).

نانك دەستیكرد بە بڵاوكردنەوەی بانگەوازەكەی جیاواز لە هیندۆسیەت و ئیسلام، جەختدەكاتەوە لەسەر ئەوەی سیخیەت هەڵقوڵاوی ناوەندێكە كە تیایدا هیندۆسیەت ملكەچی دەسەڵاتی ئیسلام بووە، هیچ سەیر نیە كە نانك لەدایك بووە لە چینی كیشتریای هیندۆسی واتە چینی جەنگاوەران لە زەوی بەنجابدا زەوی پێنج ڕووبارەكە باكوری ڕۆژئاوای هیند، دواتر بوویە شوێنی نیشتەجێبوونی سەرەكی سیخیەكان، لەكاتێكدا موسوڵمانەكان بەشێوەیەكی توند دەستیان گرتبوو بەسەر ئەو ناوچەیەدا. نانك میراتی هیندۆسی دەوڵەمەند كرد لە هەمان كاتدا دانیناوە بە مەزنی و پیرۆزی ئیسلامدا. دوو ئایین بوون یەزدان بە وەحی دایبەزاندبوون، بەڵام كاتێك ڕوویانكردە هیند بوونەهۆی خرۆشاندنی ڕقوكینە دژ بەیەكتر. ئەگەر هەردو لایەنەكە ڕێكدەكەوتن لەبارەی ناكۆكیەكانیانەوە، ئەوا ناگەن بە لەیەكگەیشتنی ئایینی باشتر لەوەی بنەما ئایینیەكانی سیخیەت پێشكەشیكردوە.

ئەو وەحیەی هات بۆ نانك جەختدەكاتەوە لەسەر بێ هاوتایی یەزدان هەروەها لەدەرەوەی توانای دەرككردنی مرۆییەوەیە لەگەڵ پاراستنی بنەمای ڕاستەقینەیی و هەمیشەیی لە هیندۆسیەتدا ساناتانا دهارما sanatanadharma بەڵام لەلایەكی ترەوە ئەم وەحیە هاوڕا بوو لەگەڵ وەحیی ئیسلامیدا لە ڕەتكردنەوەی بنەمای ئاڤاتەرەكان: واتە بەرجەستەكردنە یەزدانیەكان، هەروەك سیستمی چینایەتی ڕەتكردەوە لەگەڵ پەرستنی وێنە و پەیكەرەكان وەك یارمەتیدەرێك لەسەر پەرستنی یەزدان، پیرۆزی كتێبەكانی ڤیدای ڕەتكردەوە. بەڵام وەحیی سیخی هاوڕایە لەگەڵ هیندۆسیەتدا لە بیروباوەڕی لەبەرگرتنەوەی ڕۆحەكان بەپێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسلام.

بیروباوەڕی سیخیەت تاڕادەیەك یەكسانە لە باوەڕهێنان بە هیندۆسیەت و ئیسلام، ئەمە بووەهۆی ئەوەی ژمارەیەك لە بیانیەكان گومانی ئەوە ببەن نانك لە قووڵاییەكانی و ئەقڵیدا هەوڵدەدات بیروباوەڕێك بهێنێتە كایەوە بۆئەوەی لەڕێگەیەوە ئەو ململانێ ئایینیە چارەسەر بكات كەلە ناوچەكەیدا بەرپابووە لەنێوان هیندۆسیەت و ئیسلامدا. بەڵام خودی سیخیەكان جەختدەكەنەوە لەسەر سروشتی ئاشتیخوازانەی ئایینەكەیان

بەڵام دەیگەڕێننەوە بۆ خودی یەزدان. بەشێکیان دەڵێن نانک بەشێوەیەکی خوازراو بە گورو ڕێنیشاندەر دادەنرێت، چونکە گوروی ڕاستەقینە و تاکوتەنها یەزدانە. بەڵام ئەوانی تر دایدەنێن بە خودی گورو لەبەرئەوەی یەزدان لە ڕێگەیەوە دواوە لەگەڵ مرۆڤەکاندا (لەڕێگەی وەحیەوە).

ژمارەیگورو فەرمیەکان دە دانەیە. یەکەمینیان گورو نانک، هۆزی سیخ شێوەی ئەویان وەرگرتوە لەڕێگەی پێغەمبەرایەتیەکەیەوە. بەڵام گوروی دەیەم لەم زنجیرەیەدا گورو گوبیند سینگە guru gubind singh (١٦٦٦-١٧٠٨ن) ڕایگەیاند کە ئەو دوا گورویە، لەدوای مردنی ئەو دەقە پیرۆزە پەیڕەوی دەکرێت کە هەتا ئەو کاتە دروستبووە وەك ڕێنیشاندەری کۆمەڵی سیخەکان.

لەوکاتەوە سیخەکان ئەو کتێبەیان بە پیرۆزی ڕاگرتوە کە ناسرابوو بە گورو گرانت ساحب guru granth saheb یان کۆمەڵە وتەیەکی پیرۆز وەك گورویەکی زیندو لە ناویاندا. بەوواتایەی ویستی یەزدان و وشەکانی زیندوە لەناویاندا. ئەم کتێبە زۆربەی لە سرودی ئایینی پێکهاتوە کە دابەزیوەتە سەر شەش لە گوروکان لەکاتێکدا بیریان لە یەزدان دەکردەوە لە بێدەنگیەکی قووڵی دڵەکانیاندا، دواتر دەرکەوت لەسەر زمانیان بۆئەوەی بەوپەڕی شادومانیەوە بیڵێنەوە لە سوپاسگوزاری یەزداندا.

سیخیەت لە زۆربەی ماوەکانی مێژویدا ڕوبەڕوی دژایەتی کردن بووەتەوە، لەوکاتەی ئەم ئایینە نوێیە بەرەورووی فشاربوویەوە گوروی دەیەم داوای لە شوێنکەوتوانی ئەم ئایینە کرد بۆئەوەی خۆیان بەخت بکەن لە پێناو ئایینەکەیاندا[17]. ((پێنج خۆشەویستەکە))هاتن بەدەم ئەم بانگەوازەوە سەرئەنجام گورو بەرنامەی کارە نوێکەی پێدان کە ناسرابوو بەناوی خالسا khalsa واتە برایەتی کە تا ئەمڕۆ بەردەوامە. ئەم سیستمە کراوەیە بۆ پیاوان و ژنان بەبێ هیچ جیاوازیەك بۆ هەموو ئەوانەی ئارەزوی پابەندبوون بە یاساکانیەوە دەکەن، ئەو کەسەی دێتە ناو ئەم سیستەمەوە پێویستە بەتەواوی وازبهێنێت لە خواردنەوەی مەی و مادە هۆشبەرەکان، خواردنی گۆشت، جگەرەکێشان، هەروەها پێویستە شەش کافەکە بپۆشێت پێنج شتن دەست پێدەکەن بە پیتی ك لە زمانی بەنجانبیدا:

(١)قژی نەبڕدراو

(٢)شانە

(٣)خەنجەر

(٤)بازنێکی کانزایی

(٥)دەرپێی ژێرەوە.

لەڕاستیدا هەریەکە لەم پێنج پێویستیە لایەنی خۆپاراستن، لایەنی هێمایی تایبەت بە خۆی هەیە، قژی نەبڕدراو لەگەڵ شانەدا کەلەژێر سەرپێچدا کۆدەکرێتەوە پارێزگاری لەسەر دەکات، وێڕای ئەوە بەپێی بیروباوەڕی یۆگی قژی نەبڕدراو چالاکی دەپارێزێت و پێی بەرزدەبێتەوە. بەڵام شانە ئاماژە بۆ پاکوخاوێنی دەکات. بازنە کانزاییەکە لە دەستدا بۆ خۆپاراستنە لەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە کەسەکە دەبەستێتەوە بە یەزدانەوە. وەك جۆرێك لە بیرخستنەوە بۆئەوەی دەست پێویستە هەمیشە لە خزمەتکردنی یەزداندا بەکاربێت. ئەو دەرپێیەی جێگای جلوبەرگی هیندۆسی دەهوتی دەگرێتەوە ئاماژە دەکات بۆئەوەی مرۆڤ هەمیشە ئامادەبێت بۆ کارکردن. خەنجەرەکەش کەرەستەیەکە بۆ بەرگریکردن.

---

[17] هەمان چەمك و تێگەیشتن لە ئیسلامدا هەیە بۆ تێکۆشان لە پێناو یەزداندا مەبەستم لە جیهاد.

به پەیوەستبوون لەگەڵ بونیادنانی خالسادا گورووی دەیەم پیاوانی باوەڕداری ناونا سینگ کەبەمانای ئەو کەسە دێت کە بیروباوەڕی جێگیرە لەکاتێکدا ئافرەتانی باوەڕداری ناونا کەور kaur واتە خاتون.

ئەوەی باسکرا پەیوەندی هەیە بە دیمەنە ئایینیەکەیەوە بەڵام لەڕووی ناوەکیەوە گەوهەری ئایینی سیخ بریتیەلە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ڕزگاربوون لەڕێگەی یەکگرتن لەگەڵ یەزداندا بە دەرککردنیان بە یەزدانی ئارامگرتوو لە قووڵترین قووڵاییەکانی بوونیاندا، ئەو دەرکپێکردنەی کە بەدەست دێت لەڕێگەی خۆشویستنی یەزدانەوە و دووبارەکردنەوەی ناوی یەزدان بەبەردەوامی، لەگەڵ خۆبەدەستەوەدانی تەواو بۆ ویستی یەزدان. یەکگرتن لەگەڵ یەزداندا بەرزترین و دوا ئامانجە، ژیانی دوور لە یەزدان هیچ مانایەکی نیە. دابڕان لە یەزدان هۆکاری هەموو ئازارێکی مرۆییە. بە وشەکانی نانك: ((چەندە ترسناکە ئەم جودابوونەوەیە، مرۆۋ جودابێت لە یەزدان، چەندە یەکگرتنێکی پیرۆزە کە مرۆۋ یەکبگرێت لەگەڵ یەزداندا!)).

وازهێنان لە دونیا و جیهان لە بنەماکانی ئەم ئایینەدا بوونی نیە. لە ئایینی سیخدا نە گۆشەنشینی نە قەدەغەکردنی ژنهێنان بوونی هەیە. سیخیە باوەڕدارەکان سەرۆکی خێزانن و کاردەکەن بۆ پەیداکردنی بژێوی خێزانەکەی، دەیەکی داهاتەکەیان دەکەنە خێر بۆ هەچاران و کەمدەرامەتەکان.

ژمارەی سیخەکان لەئەمڕۆدا نزیکەی سیانزە ملیۆن کەسە، زۆربەیان لە هیند دەژین، ناوەندی سەرکردایەتی ئایینەکەیان پەرستگایەکی ئاڵتونی بەناوبانگە دەکەوێتە ناوەڕاستی دەریاچەیەك لە شاری ئەمریستار پایتەختی بەنجابی ڕۆژهەڵات.

**کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر:**

**١-پێشئەوەی دەستبکەم بە باسکردنی ئەو کتێبانە، با ئاماژەبکەم بۆ دوو کاسێتی ڤیدیۆییهیند و بێ پایانی: ڕۆحی نەتەوە، کە تۆمارمکردوە لەگەڵ (ئیلدا هارتلی) بەماوی نیو کاتژمێر کە هەڵدەسێت بە ڕوونکردنەوەی بیرۆکەکانی ئەم بەشە لە چوارچێوەیەکی بینراو و بیستراودا، هەر کەسێك دەیەوێت بینینێت ئەمە ناونیشانەکەیەتی:**

.ct 0680 ،cos cob ،cat road ،Hartley film foundation

**٢-کتێبی هیندۆسیەت: دیمەنێکی شارستانی لە نوسینی دیڤید کینسلی تێڕوانینێکی ڕوون و ئاشکرامان دەداتێ لەبارەی هیندۆسیەتەوە. بنەماکانی شیدەکاتەوە لە چوارچێوە جوگرافیەکەیدا، هێەکانی پەرەسەندنە مێژوییەکەی دەکێشێت، باس لە فرەجۆریەکی فراوان دەکات کەلەم ئاییندا هەیە.**

**٣-٤-ئەم دوو کتێبە ڕەهەندە فەلسەفی و ئایینیەکانی هیندۆسیەت دەخەنەڕوو بەشێوەیەکی درێژتر لەوەی باسمانکرد.**

،nj princeton university press ،Hienrich zimmer's the philosophies of india (princeton ca: ،1969). & swami prabhavananda's the spiritual heritage of india (hollywood .1980) ،vedanta press

**٥-کتێبی دیانا ئێکی دارشن وێنەی یەزدانی هیند پیشاندەدات بەشێوەیەکی هەستپێکراو لە هیند:**

pa: anima ،Diana eck's darshan: seeing the divine image in india (chambersburg .1985) ،books

**٦-٧-٨-گومانی تیانیە کتێبە هیندۆسیە پیرۆزەکان فرەڕەنگن، بەڵام دوانیان گرنگ و گشتگیرن:**

**یەکەمیان: کتێبی بهاگافاد گیتا بووە کتێبێکی جیهانی، وەرگێڕانی بربرا ستولر میللر** barbara stoler miller **بە وەرگێڕانێکی بەسود دادەنرێت:**

.1986) ،barbara stoler miller's translation (new york: bantam books ،Bhagavad-gita

**دووەمیان: ئۆپانیشاداتە** upanishads **کە پێویستی بە شیکردنەوەی زیاترە، وەرگێڕانی سوامی نیکهی لاناندا** swami nikhilanandas **باشترینە کەلە چوار بەرگ پێکهاتوە لەگەڵ شیکردنەوەدا:**

with running ،Upanishads: swami nikhilanandas four-volume translation .1975-79) ،vivekannanda center ،commentary (new york: ramakrishna

**ئەگەر وەرگێڕانی ئۆپانیشاداتت ویست لە یەك بەرگدا بەبێ شیکردنەوە، بەڵام لەگەڵ پێشەکیەکی بەسود ئەوا وەرگێڕانی جوان مساکارو بخوێنەوە:**

.1965) ،penguin books ،Upanishads: traslation by juan mascaro (new york

**٩-دواجار سەبارەت بە سیخیەت کتێبی سیخ: بیروباوەڕی ئایینیان، هەڵسوکەوتیان**

the sikhs: their relegious beliefs and practices by w. owen cole and piarra singh .1986) ،chapman & hall ،sambhi (new york: routledge

**بەشێك لەبارەی بیروباوەڕی سیخەوە** the faith of the sikhs **لە کتێبی گڕێگای هیند لە نوسینی جون کوللەر:**

،macmillan ،the faith of the sikhs chapter in john koller's the indian way (new york .1982)

**چەند سەرچاوەیەکی تر لەبارەی هیندۆسیەتەوە بەزمانی عەرەبی:**

١-الأديان القديمة في الشرق، د. عبدالرؤوف، دار الشروق، بيروت، قاهرة، ط٢، ١٤٠٣ ه-١٩٨٣م.

٢-الأسفار المقدسة (في الأديان السابقة للأسلام)، ط٣، تأليف: د. علي عبدالواحد وافي، قاهرة، نهضة مصر للطباعة و النشر، ٢٠٠١م.

٣-أشهر الأديان القديمة، تأليف: لطفي وحيد، ط١، الأسكندرية، مصر: المركز العربي للنشر و التوزيع، ١٩٩٦.

٤-بدايات التفلسف الأنساني: الفلسفة ظهرت في الشرق: د. مهدي فضل الله. دار الطليعة-بيروت، آذار (مارس) ١٩٩٤.

٥-البيروني: الفلسفة الهندية، مع مقارنة بفلسفة اليونان و التصوف الأسلامي، د. عبدالحليم محمود، عثمان عبدالمنعم يوسف. منشورات المكتبة العصرية، صيدا-لبنان.

٦-الحكمة الهندوسية، تأليف: ريما صعب. . . (آخرون)، ط١، بيروت، لبنان: مؤسسة نوفل، ١٩٩٨.

٧-الدين في الهند و الصين و أيران، أبكار السقاف، ط١، بيروت: مؤسسة الأنتشار العربي، ٢٠٠٤.

٨-سيد هارتا siddhartha: نثر من الهند، تأليف هرمان هيسة، ترجمة جيزلا فالور حجار. -ط١-دمشق، سوريا، دار المدى، ٢٠٠٠م.

٩-الفكر الشرقي القديم، ترجمة كامل يوسف حسين، مراجعة الدكتور أمام عبدالفتاح أمام، الكويت، سلسلة عالم المعرفة، صفر ١٤١٦هجري-تموز (يوليو)١٩٩٥.

١٠-فكر الهند: كبار مفكري الهند و مذاهبهمعلى مر العصور، تأليف البير شويتنرر، ترجمة: يوسف شلب الشام، ط١، دمشق، سوريا: دار طلاس، ١٩٩٤.

١١-الفلسفات الهندية: قاعاتها الهندوكية و الأسلامية و الأصلاحية، تأليف: دكتور علي زيعور، دار الأندلس للنشر و التوزيع، لبنان.

١٢-فلسفة اليوغا: ب. ن. نارايان. المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر و التوزيع-بيروت.

١٣-قصة الديانات: سليمان مظهر، دار الرقي للطباعة و النشر و التوزيع.

١٤-كتاب بهغفض غيطا (نشيد المولى) بدون تصرف. نعمته الربانية: أ. س. بهكتى فيدانت سوامي بربهوباض his divine grace a. s. bhaktivedanta swami praphupada. ترجمة عن الأنكليزية رافاناري ضاس (رابح يونس). دار الكتب بهكتي فيدانت. بيروت.

١٥-كريشنا: الأسطورة الهندية، المزمار السحري، تأليف: ك. م. موتشي، ترجمة رعد جواد، ط١، اللاذقية، سوريا، دار الحوار للنشر و التوزيع، ١٩٨٩.

١٦-كمال جنبلاط و اليوغا و الحكمة الهندية، تأليف: قيس غوش، ط١، طرابلس، لبنان: جروس برس، ١٩٩٥.

١٧-المعتقدات الدينية لدى الشعوب، تأليف: بارندر جفريأ ترجمة الدكتور أمام عبدالفتاح أمام، مراجعة الدكتور عبدالغفار مكاوي، الكويت، سلسلة عالم المعرفة، ذوالقعدة ١٤١٣هجري-أيار ١٩٩٣م.

١٨-معجم ديانات و أساطير العالم، تأليف أمام أمام، ط١، القاهرة، مصر، مكتبة مدبولي، (٣ مجلدات) ١٩٩٨م.

١٩-معرفة الذات للحكيم شانكار، تأليف: جورج حلو. . . (آخرون)، ط١، بيروت، لبنان: مؤسسة نوفل، ١٩٩٧م.
٢٠-مقارنة الأديان، أديان الهند الكبرى: د. أحمد شبلي، القاهرة، مكتبة النهضة المصرية، ط٨، ١٩٨٦م.
٢١-ملحمة راما يانا، تأليف: سوامي ستياناندا، ترجمة مؤيد عبدالستار، ط١، بيروت: لبنان، دار الكنوز الأدبية، ١٩٩٦م.
٢٢-منَو سمرتى، أو شرع منو، عربه و شرحه و علق عليه الدكتور أحسان حقي، بيروت، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٤٠٩هجري-١٩٨٨م.
٢٣-موجز تأريخ الأديان: فيلسيان شالي felicien shollay، ترجمة عن الفرنسية: حافظ جمالي، ط١، دمشق، دار طلاس للدراسات و الترجمة و النشر، ١٩٩١م.
٢٤-الموسوعة الفلسفية العربية: رئاسة تحرير: د. معن زيادة، نشر معهد ألأنماء العربي، ط١، ١٩٨٦م.
٢٥-الهندوسية: تحضيرها لأنعتاق الروح، تأليف: سوامي نيخيلاندا، ترجمة نبيل محسن، ط١، دمشق، سوريا، دار ورد، ٢٠٠٠م.

## پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی هیندۆسیەت

(١)وشەیەکی سنسکریتیە لێرەدا: ئارتها artha بە مانای شتێك، ماددەیەك دێت، زۆربەی جار وەردەگێردرێت بە واتای دارایی یان موڵکە ماددیەکان. وەرمگێڕاوە بۆ سەرکەوتنی دونیایی چونەکە دەقە هیندیەکان کاتێك گفتوگۆ دەکەن لەبارەی ئەم ئامانجەوە مامەڵەدەکات لەگەڵ ئەم واتایەدا بەشێوەیەکی فراوانتر لە دارایی، واتە مامەڵدەکات لەگەڵ واتایەکدا بەراوردکردنە لەنێوان پلەوپایەی بەرز و دارایی و ساماندا.

(٢)کتێبی the face of silence ڕوخساری بێدەنگی لە نوسینی دکتۆر: g. mukerji بە وەرگێراوی لە کتێبی the life of ramakrishna نوسینی: romain rolland، بڵاوکراوەتەوە لە ساڵی ١٩٥٤ز دا، ل ٨٠.

(٣)سەیری کتێبی yoga: the method of integration بکە (یۆگا: بەرنامەی تەواوبوون و یەکگرتن) نوسینی: alain danielon (new york، university book 1949) بۆ خوێندنەوەی کورتەی ئالۆژیکی ڕێگا و بانگەشەکانی ئەم خوێندنگایە.

(4)the philosophies of india، henrich zimmer (new york، pantheon books، 1951)pp 80-81.

(٥)دوبارەکردنەوەی پێویستە لە هەموو کتێبی ئۆپانیشاداتدا.

(٦)سرودێکی شاعیر توکرام tokram،وەریگێڕاوە لە کتێبەکەیدا john s. hoyland an indian peasant mystic (جوتیارە سۆفیە هیندیەکە) بڵاوکراوەی لەندەن allenson & co. ١٩٣٢.

(7)the art of mental prayer london: s. p. k. 1950 pp. 29-30.

(8)the way of pilgrim translated by r. m. french (new york: harper & brolthers 1955).

(9)prahavananda & isherwood: (new york: harper brothers1944)p60.

(10)hubert benoit، the supreme doctrine (new york: pantheon books)p22.

(١١)لێرەدا شتێکی هاوشێوەی هەتەری جێگیری کارتن لوسەر هەیە لەسەر لابردنی هەموو جیاکاریەك لەنێوان پیاوی ئایینی و پیاوی ئاساییدا ئەمە بۆ پیرۆزڕاگرتنی ژیانی ئاساییە. لێرەدا هەڵوێستی لوسەر دێت بە

**مێشکی مرۆڤدا کاتێك دەدوێت لەگەڵ دادوەر و جوتیار و سەرباز و هونەرمەند و خزمەتکار: ئەگەر هەریەکەیان بە ئیشی خۆیان هەستان بەوپەڕی وەفاداریەوە ئەوا هیچ کەسێك لە یەکێکی تر زیاتر نیە لەسەر زەویدا.**

(١٢)**بهاگافاد گیتا: بەشی ٥/ئایەتی ١٠.**

(١٣)**بهاگافاد گیتا: بەشی ٩/ ئایەتی ٢٧–١٨.**

(١٤)**بهاگافاد گیتا: بەشی ٣/ ئایەتی ١٩ و ٣٩.**

(15)srimad-bhagavad-gita، swami swarupananda (advaita asahrama، himlays، mayavati. 1933) p. 125.

(١٦)**بهاگافاد گیتا: بەشی ٦، وەرگێڕانی** prahavananda & isherwood.

(١٧)**سەیری ڕاسپاردەی هاوشێوەی ئەمە بکە لە ڕێنمایی مەسیحیدا لەو کتێبەی ئاماژەی پێکرا** bede frost **ل. ١٤٦.**

(١٨)**بهاگافاد گیتا: بەشی ١٢، سەیری بەشی ١٤ بکە.**

(١٩)the philosophies of india، henrich zimmer (new york: pantheon books 1951) pp 303-304.

( ٢٠ )**قەشە تۆماس تەسەوفی ناساندوە بەوەی ناسینی ئەزمونی یەزدانە.**

(٢١)**وەرگیراوە لە کتێبەکەی** henrichzimmer **کە پێشتلر ئاماژەی بۆ کراوە.**

(٢٢)**بهاگافاد گیتا: بەشی٦/ ئایەتی ١٩، تەواوی دەستەواژەکە: ((هەروەك ڕووناکی چرا، لە شوێنێکدا کە بای نیە نالەرزێت بەهەمان شێوە ئەو کەسەی بەرزدەبێتەوە بەسەر دەروونیدا بەجێگیری دەمێنێتەوەلە بیرکردنەوەی لە زاتی تاکوتەنها بۆ هەمیشە)).**

(٢٣)**بهاگافاد گیتا: بەشی ٦/ ئایەتی ٣٣–٣٤.**

(٢٤)**کاگاوا** kagawa **مەسیحی یابانی کاریگەرە بە تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتی لە هەمان کاتدا بەرگری دەکرد لەو ڕایەی دەڵێت باش نیە چاو دابخرێت لەکاتی نوێژکردندا.**

(٢٥)**بهاگافاد گیتا: بەشی ٥/ ئایەتی ٢٤.**

(٢٦)**کاتها ئۆپانیشاد: بەشی ٢/ بەندی ٣/ ئایەتی ١٠.**

(27)the philosophy of upanishads، paul deussen، new york; charles scribner's sons، 1908.

(٢٨)**باسکردنێکە زۆر دوبارە دەبێتەوە بی چەند دەستەواچەیەکی نزیك لەیەکتر لە هەموو ئۆپانیشاداتدا.**

(٢٩)**بۆ باسکردنی پیاوێك کە شەش مانگی بەسەربرد لەم حاڵەتەدا سەیری کتێبی** the life of ramakrishna، romain rolland، hollywood: vedanta press، 1952 pp77-78 **بکە.**

(٣٠)henrich zimmer **سەرچاوەی پێشوو ل. ٤٤**

(٣١)**سەندێك لە سەرچاوەکان ناوی دەبە نبە سواڵکەری گەڕۆك یان ئەو کەسەی گەیشتوە بە پلەوپایەی وازهێنان لە دونیا.**

(٣٢)**واتە هەموو نازناو و پلەوپایەیەکی مرۆڤ بریتیەلە دیاریکردنی بەوجۆرەی سەلماندنێك هەیە بۆ ئەم نازناوە.**

(٣٣)**هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل. ١٥٧–١٥٨، ئەمە باسکردنێکی تێروتەسەلە بۆ چوار ئاستەکەی ژیان زۆربەی وەرگیراوە لە کتێبی هنریك زیمەر کە پێشتر باسکرا.**

(٣٤)کاتێك تێبینی ئەم ڕاستیە کرالە توێژینەوە هاوچەرخەکاندا لەبارەی سیستمی چینایەتیەوە لە هیند، لەبەرئەوە پێویستە ئەم ڕاستیە ڕوونتر بکرێتەوە بە ناوهێنانی وەرگرتنی سێ نەریتی هیندی. یەکێك لە یاسادانەرە دێرینەکانی هیند دەڵێت: ((زانستی شکۆدار فێرببە خزمەتی هەموو کەسێك بکە تەنانەت منداڵی تازە لەدایکبوو بەڵکو فێری ڕێگای ڕزگاربوون ببە تەنانەت لە شاندالا–واتە چینی دەربەدەرکراوان–هەروەها خزمەتیان بکە)) ئەمە و چەندین وتەی تر باسکراوە لە کتێبی: هەموو کارەکانی سوامی فیفیکنندا (میاباتی، هیند، ئەدڤیتا ئەشراما، ساڵی ١٩٣٢) بەرگی سێیەم ل. ٣٨١ لە وەرگێڕانەکەی سوامی تیاگیساننداهاتوە لە پەندی حەفتاودوویەم لە پەندەکانی کتێبی بهاکتی سوترای نارادا (چاپی خوێندنگاکانی ماس سری ڕاماکریشنا، ساڵی ١٩٣٤): ((لەلای ئاشقانی یەزدان هیچ جیاکردنەوەیەك نیە لەسەر بنەمای چین یان شارستانیەت)). لە هەموو ئەمانە بەهێزتر دانپیانانێکی نهێنی کریشنایە لە بەشی سیانزەیەمی کتێبیمهابهاراتای پیرۆز: ((بەندە دڵسۆزەکان خۆیان بەختکردوە بۆ یەزدان، شودری واتە نزمترین چین نین، شودری ئەو کەسەیە باوەڕی بە یەزدان نیە لەهەر چینێك بێت. پێویستە لەسەر مرۆژی ژیر گاڵتە نەکات تەنانەت بە دەربەدەرکراوێك ئەگەر بەندەیەکی دڵسۆزی یەزدان بوو، هەرکەسێك بە سوکایەتی پێ بکات دەخرێتە نێو ئاگرەوە. )).

(٣٥)بۆ خوێندنەوەی یەکێك لەو بەرگریانە سەیری بەشی یەکەم بکە هیند چی پێشکەش کردوە بە چاکە بۆ مرۆڤایەتی لە کتێبی the dance of shiva واتە سەمای شیڤا نوسینی ananda coomaraswamy چاپی بومبی، چاپخانەی ئاسیا، ١٩٤٨)

(٣٦)وشویەکی سنسکریتیە بۆ ئەم چینە ئەویش کشتیریا kshatya یە کە بە مانای جەنگاوەران دێت، هەروەها بە واتای فەرمانڕەواکان دێت چونکە فەرمانڕەواکان ئەوانەن کە چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرێت کەسانی لاواز بپارێزن و زاڵمان لەناوبەرن.

(٣٧)من سوپاسی جێرالد هیلد دەکەم لەم چواندنەدا.

(٣٨)کتێبی سەمای شیڤا کە پێشتر ئاماژەی پێکرا.

(٣٩)بەراوردکراوە بە دەستەواژەی thomas a kempis کە دەڵێت: ماوەیەکی ناوازە هەیە لەنێوان ئەو شتانەی مرۆڤ بیریان لێدەکاتەوە بە ئەقڵی سروشتی و ئەو شتانەی کەسانی ڕوناکبیر بیری لێدەکەنەوە کاتێك بەبیرکردنەوە گەیشتون بە ڕاستی.

(٤٠)هاوشێوەی ئەم ڕێگایە هەن وەکو ڕێگای باسکردن لەڕێگەی نەرێکردنەوە لە نوسینەکانی زۆربەی سۆفیەکانی ڕۆژئاوا. چەند دەستەواژەیەکی قەشە بێرنارد هەیە کە دەڵێت: ((نەخێر. . . نەخێر. . . )) وتەی angela of foligno کاتێك هەوڵدەدات باس لە ئەزمونەکەی بکات لەگەڵ یەزداندا کە هەموو بوونی داگیرکردوە بەو دەستەواژانە: ((نەخێر ئەمە نیە. . . ئەمەش نیە، من ڕێزی لێدەگرم)) هەروەها وتەی قەشە جۆرج: ((کەواتە ڕاستی لەو شتەدایە کە دەیزانین لەبارەی یەزدانەوە لەکاتێکدا هەست بەوە دەکەین ناکرێت هیچ شتێکی لەبارەوە بزانین)) meister eckhart جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی یەزدانمان خۆشبوێت (نە خوداوەندە، نە ڕۆحە، نە کەسێکە، نە وێنەیەکە، بەڵکو پێویستە بەو شێوەیەی کە هەیە خۆشمان بوێت کە تاکو تەنهایە پێویستە تیایدا ڕۆبچین لە نەبوونەوە بەرەو نەبوون)).

(٤١)هاوشانێکی ڕۆژئاوایی هەیە بۆ ڕای هیند لەم خاڵەدا لە کێتببی waiting for god واتە چاوەڕوانکردنی یەزدان نوسینی weil simone کاتێك لە لاپەڕە ٣٢ دا دەڵێتحاڵەتەکە دوو شتی دژبەیەکی تیایە هەردوکیان

دروستە. یەزدان هەیە، یەزدان نیە. کێشەکە لەکوێدایە؟ من بەتەواوی دڵنیام یەزدان هەیە بەواتای هەستپێکردنم بۆئەوەی دڵنیام خۆشەویستیەکەم بۆی درۆینە نیە. دڵنیام یەزدان نیە بەو واتایەی هیچ شتێك نیە هاوشان و هاوتای ئەو بێت. هەروەها سەیری وتاری religious symbols and knowledge of god (واتە هێما ئایینیەکان و ناسینی یەزدان) نوسینی: paul tillich گۆڤاری the christian schalar بەرگی ٣٨، ژمارە ٣، ئەیلولی ١٩٥٥) ل. ١٩٣–١٩٤.

(٤٢)کورتەیەك لە ژیانی شانگارا لە کتێبی (براهما سوترام)، بەرگی ٢/بەشی ٣، بەندی ١٠ و (سیفیتاسفارا) بەرگی٥/ بەشی ٦، بەندی ١٤.

(٤٤)ئۆپانیشاد (بریها دارانیاکا)

(٤٥)بەشی درەختی ئارەزوەکان the whishing tree لە کتێبی: vedanta for the western word pp. 448-451.

(٤٦)ئۆپانیشا مونداکا بەرگی یەکەم/ بەشی ١/بەندی ٧ز

(٤٧)لە کتێبیwhat vedadanta means to me واتە ڤیدانتا چ مانایەکی هەیە لەلام لە نوسینی prema chaitania بەشی vedanta & the west pp. 33.

(٤٨)وەرگیراوە لە وتەکانی ڕاماکریشنا کە swami abhedmanda کۆیکردوەتەوە لە کتێبی the saying of ramakrishna واتە وتەکانی ڕاماکریشنا(the vedanta society، new york، 1903) بە کەمێك دەستکاریکردنەوە.

## ٣

# بوزیەت

## ئەی مرۆڤ هەستە

بوزیـەت بـە مـرۆڤ دەسـت پێـدەکات. لەکاتێکـدا پەیامەکـەی هینـدی هەژانـد، پادشـاکان لەبەردەمیـدا سـەریان دادەنەواند، خەڵکی دەهاتنەلای هەروەك دەهاتنە لای عیسای مەسیح، بۆئەوەی لێی بپرسن: تۆ چیت؟! (١). ئەم پرسیارە چەندە کەسایەتی خرۆشاند لـەدەوری خـۆی؟ ئەمـە ئـەو پرسـیارە نیـە بڵێین: تـۆ کێیـت؟ کـە دەگـەڕێت بەدوای نـاو و ڕەچەڵەکدا، بەڵکو تـۆ چیت؟: واتـە سـەربە چ پلـەو پایەیەکـە لـە بووندا؟ چ جـۆرە بونـەوەرێکیت؟ بەدڵنیاییەوە قەیسەر لەو کەسایەتیانە نەبووە بەهەمان شێوەی ناپلیۆن و سوکرات. بەڵکو تەنها دوو کەسـایەتی بـەم شێوەیە بوون: عیسـا و بـوزا. لەکاتێکدا خـەڵك ئـەم سەرسوڕمانەیان بۆ بوزا نیشـاندا، بـە چـەند وشـەیەك وەڵامی دەدانەوە کە دواتر بوویە کلیلی هەموو پەیامەکەی:

لێیان پرسی ئایا تۆ خوداوەندیت؟ لەوەڵامدا وتـی نـەخێر، ئایـا تـۆ فریشـتەیت؟ وتـی نـەخێر، کەواتـە قەشـەیت؟ وتی نەخێر، وتیان کەواتە تۆ چیت؟ بوزا لە وەڵمدا وتی من بەئاگاهێنەرەوەم.

ئەم وەڵامەی بوویەهۆی نازنازی بوزا، ئەمە واتای وشەی بوزایە. چاوگی سنسکریتی ئەم وشـەیەیە کـە بـەواتای بـەئاگابوون و زانـین دێـت. بـوزا واتـە بـەئاگا. لەکاتێکـدا زۆربـەی خـەڵکی سـەر زەوی داپۆشـرابوون بـە بـەزەیی خەوێکی قووڵ. خەونیان دەبینی کە ناسراوە بە خەونی ئاگایی ژیانی مرۆیـی، تاکـە مرۆڤێك لەناویانـدا تـوانی لەو خەوە بە ئاگابێتەوە. چونکە بوزیەت بە پیاوێك دەست پێدەکات خۆی دەربازکرد لـە سەرسـامبوون بـە ژیـان، ئەو بێئاگاییەی وەکو خەوێکی سوك وایە. ئەو بە مرۆڤ دەسپێدەکات و پێی دەڵێت هەستە.

بوزا ژیانی دەورەدرابوو بە ئەفسانەیەکی جوان. وتـراوە جیهـان ڕوناکبووەتـەوە لـە سـاتەوەختی لەدایکبوونیـدا، نابینایان تامەزرۆی بینینی هاتنی بوون بەڕادەیەك سەرلەنوێ توانیان شتەکان ببینن. کەڕو لاڵەکان کەوتنەقسـە بۆئەوەی بدوێن لەبارەی ئەو شتانەی لە داهاتودا ڕودەدەن. کەسانی گومڕا هاتنەسەر ڕێـی ڕاست. ئیفلیجـەکان چاکبووەنەوە و بـەپێی خۆیـان ڕۆیشـتن. زیندانیـەکان ئـازادکران لـە کـۆت و بەنـد، ئـاگری دۆزەخ کوژێنرایـەوە. تەنانەت دڕندەکان وازیان لە ئەنجامدانی تاوان هێنا، بۆئەوەی ئاشتی سەرتاسەری زەوی بگەڕێتەوە. تاکە کـەس کە دڵخۆش نەبوو بەم لەدایکبوونە مارا ئەهریمەن بوو.

ڕوداوە مێژووییەکانی ژیانی بوزا دەکرێت بەمشێوەیە کورتبکرێتەوە:

بوزا لەنزیکەی ٥٦٣ ساڵ پێش زایینەوە لەدایکبووە(٢)، لەو شوێنەی ئێستا ناوی دەوڵـەتی نیپاڵـە لـە دوری سـەد میـل لـە شـاری بنـارس نزیـك سـنوری بـاکوری هینـد لـەدایك بـووە. نـاوی تـەواوی بـوزا سـیدهارتا گوتامـا ساکسیاسـیە، سـیدهارتا نـاوی تایبـەت بـە خۆیـەتی، گوتامـا نـاوی خێزانەکەیـەتی، سـاکیا نـاوی هـۆزی خێزانەکەیـەتی، بـاوکی لەوکاتـەدا هینـد دابەشـکرابوو بـۆ چـەند هـەرێمێك پادشـا بـوو، واباشـترە بڵێین بـاوکی

سەرۆکی هەرێمێك لەو هەرێمانە بوو، ئەو ژینگەیەی بۆ کوڕەکەی دابین کردبوو، هیچ کەمتر نەبوو لە کۆشکێکی سکۆتلەندی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. پەروەردەکردنی بەپێی پێوەرەکانی ئەو سەردەمە خۆشگوزەرانیە بوو. . حەریری دەپۆشی، چەند خزمەتکارێکی هەبوو سێبەریان بە چەترێکی سپی بۆ دروستدەکرد. . . ئەو مەرهەمانەی بەکاری دەهێنان بە تایبەتی لە شاری بنارسەوە بۆیان دەهێنا. لەوانەیە بە جەستە و باڵا گەورە بووبێت، چونکە چەندین بەڵگەنامە هەیە کە دەدوێت لەبارەی تەواوی جەستەیی ئەوەوە. لە تەمەنی شانزەساڵیدا خاتونێکی دراوسێی هێنا ناوی یاسودهارا بوو منداڵێکیان بوو ناویاننا ڕاهولا.
بەکورتی بوزا پیاوێك بوو هەمووو خۆشیەکانی ژیانی بۆ تەرخانکرابوو، خێزانێکی بەخشندە (گوتاما خانەدان)ی هەبوو لە هەردوو سەری باوك و دایکیەوە، لەش و لارێکی ڕێك و جوانی هەبوو، (جەستەیەکی گەورە کە متمانەی دەدا بەبینەرانی، خاوەن جوانیەکی ناوازە بوو، ڕەنگی پێستی سەرنجڕاکێش بوو، دیمەنێکی شکۆداری هەبوو)، لەڕووی داراییەوە (فیلێکی مێیینەی هەبوو کەبە زیو ڕازێندرابوویەوە))، ژنێکی نمونەیی هەبوو ((بە هەیبەت هەروەك یەکێك بێت لە پەریەکانی ئاسمان، وەفادار بۆ هەمیشە، شاد بە شەو و ڕۆژ، لێوانلێو لە جوانی لە ڕوخسار و لەشولاریدا))، منداڵێکی جوانی بۆ خستەوە. وێڕای هەمووو ئەمانە میراتگری تەختی شاهانەی باوکی بوو، سەرۆکایەتی و پلەوپایە و دەسەڵات قەدەری ئەو بوو کە چاوەڕوانی دەکرد.
وێڕای هەمووو ئەمانە جۆرێك لە ناڕازیبوون باڵی بەسەردا کێشا لە بیستەکانی تەمەنیدا، لەکۆتاییدا وای لێکرد بەتەواوی واز بهێنێت لەو پلەوپایە دونیاییەی.
وێنەی پشتی ئەم دڵەڕاوکێیە بەرجەستەکرا لە ئەفسانەی چوار دیمەنەکەدا کە لەکاتی گەڕانیدا چاوی پێکەوت، کە یەکێکە لە بەناوبانگترین بانگەوازەکانی سەرکەشی لە ئەدەبی جیهانیدا.
چیرۆکەکە بەم شێوەیە. . کاتێك سیدهارتا لەدایك بوو باوکی پێشبینیکەرەکانی بانگ کرد بۆئەوەی پێی بڵێن داهاتوو چی حەشارداوە بۆ کوڕەکەی، هەمووو پێشبینیکەرەکان لەسەرئەوە هاوڕابوون ئەم کوڕە دەبێتە پیاوێکی نمونەیی لە داهاتوودا بەڵام شتێکی بنەڕەتی نادیار دێتەسەر ڕێی و ژیانی لێ تێکدەدات، ئەگەر مایەوە لە جیهاندا ئەوا هیند یەکدەخات، دەبێتە پادشایەکی جیهانی بەڵام ئەگەر وازی هێنا لە جیهان دەبێتە ڕزگارکەری جیهان. کاتێك ڕووبەڕووی ئەم دو هەڵبژاردنە بوویەوە بۆ چارەنوسی کوڕەکەی، بڕیاری دا کوڕەکەی ئاڕاستە بکات بەرەو چارەنوسی یەکەم. چوار کۆشك و چل هەزار سەماکەری خستە بەردەستی، فەرمانی توندی دەرکرد بۆئەوەی بە هیچ شێوەیەك ڕێگەنەدرێت دیمەنی دڵتەزێن یان قێزەون بێتە ناو کۆشکەوە، بەشێوەیەکی تایبەت جەختی کردەوە لەسەر پێویستی بەرنەکەوتنی شازادە بە دیمەنەکانی نەخۆشی و پیری و مەرگ. هەتا کاتێك شازادە دەچوە دەرەوە بۆ ڕاو پێویست بوو گروپێك لە سەربازەکانی پادشا پێشی بکەون بۆئەوەی دڵنیابن لە خاڵی بوونی ڕێگاکە لە هەریەکە لەو دیمەنانەی باسکران، دورخستنەوەی ئەگەر هەبوو. بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژەکان سەربازەکان بێ ئاگا بوون لە بوونی پیاوێکی پیر لەسەر ڕێگاکە، یان بەپێی چەند گێڕانەوەیەکی تر یەزدان هەستا بە دانانی ئەو پلانە بە ئامانجی بەدیهێنانی ئەزکی فێرکاری داواکراو لەو ساتەدا، بەبەرجەستەکردنی پیاوێکی پیر، پیری پشتی چەماندوەتەوە و ددانەکانی خستوە و سەری سپی کردوە، بە گۆچانێك خۆی ڕاگیرکردوە و هەڵدەلەرزێت. لەو ڕۆژەدا سیدهارتا لە واتای ڕاستەقینەی پیری تێگەیشت.
وێڕای ئەوەی پادشا هەستا بە زیادکردنی ژمارەی پاسەوانەکانی کوڕەکەی بەڵام شازادە سیدهارتا لە گەشتی دوەمیدا نەخۆشێکی بینی کەوتبوو لەسەر کەناری ڕێگاکە ئازار هەمووو جەستەی تێکشکاندبوو. لە گەشتی سێیەمیدا جەستەی مردوویەکی بینی. دواجار لە گەشتی چوارەمیدا چاوی کەوت بە قەشەیەکی سەر تاشراو

پۆشـاکێکی زەردی لەبـەردابوو دەفرێکـی بەدەسـتەوە بـوو بـۆ سـواکردن بەکاریـدەهێنا. لـەو ڕۆژەدا لـە ژیـان تێگەیشت بۆیە پاشەکشەی لە دونیا کرد. دروستە ئەم چیرۆکە ئەفسانەیە، بەڵام وەکو هـەمووو ئەفسـانەیەك لـە ناوەڕۆکەکەیـدا ڕاسـتیەکی گرنگـی لـەخۆگرتوە، چـونکە ڕێنماییـەکانی بـوزا بەشـێوەیەکی ئاشـکرا ئازارچەشـتنە حەتمیەکانی جەستە دەخاتەڕوو وەك نەخۆشی و پیری و مەرگ، کە بوونەهۆی نائومێدکردنی بوزا بەتـەواوی لـە ویژدانی تـەواوبوون و شـادومانی لـە جیهـانی جەسـتەدا. ((بێگومـان ژیـان بـەرەوڕووی پـیری و مـەرگ دەبێتـەوە. کام شوێنەی جیهان پیری و مەرگی تیانیە؟)).

تـەنها کاتێـك سـیدهارتا دەرکـی بـەوەکرد ناکرێـت خـۆی بپارێزێـت لـە ئـازاری جەسـتەیی و مـەرگ، نـەیتوانی بگەڕێتـەوە سـەر چێژوەرگرتنە جەسـتەییەکان. چیدی گـۆرانی سـەماکەرەکان و شیعرەکانیان و دەنگـی ئـامێرە مۆزیکیەکان و جەژن و بۆنەکان و پۆشاکە جوانـەکان و خواردەمەنیـە بەتامـەکان و ئاهەنگـەکان هـیچ گرنگیـەکیان نـەما بـۆ سـیدهارتا. بۆیـە بڕیاریـدا کۆشـکەکەی جێبهێڵێـت کەلـە بەرچـاوی وەك تەڵەیـەك وابـوو بـۆ فریـودانی و هێشتنەوەی لە حاڵەتێکی بێئاگاییدا، بگەڕێت بەدوای ڕاستیدا. شەوێك لە شەوەکانی بیسـتونۆ سـاڵی تەمەنیـدا گەشتی وازهێنان لە دونیـای دەسـتپێکرد دوور لـە کۆشـکەکانی و شـوێنی لـەدایکبوونی. لـەو چـەند کاتژمێرەی دوای نیوەشـەودا لەکاتێکـدا دەیویسـت بچێتە دەرەوەی کۆشـك سـیدهارتا بـۆ دواجـار سـەیری هاوسـەرەکەی و منداڵەکـەی کـرد کـە نوسـتبوون دواتـر فـەرمانی دا بـە دەرگاوانەکـەی ئەسـپە سـپیە گەورەکـەی بـۆ ئامادەبکـات و هـەردوکیان کەوتنـەڕێ بـە ئاڕاسـتەی دارسـتانەکە. لـە بەرەبەیانـدا گەیشـتنە سـنوری دارسـتانەکە، سـیدهارتا جلوبەرگەکـەی خـۆی گـۆڕی بـە جلوبـەرگی دەرگاوانەکـە، دواتـر دەرگاوانەکـە بـە سـواری ئەسـپەکە گەڕایـەوە بـۆ ئەوەی هەواڵەکە ڕابگەیەنێت، لەوکاتەدا سیدهارتا سـەری خـۆی تاشـی و بـەو جلوبەرگـە کۆنـەوە کەوتـەڕێ بـەناو دارستانەکەدا بۆ گەڕان بەدوای ڕۆشنبوونەوەدا.

شەش ساڵ بەوجۆرە بەردەوامبوو سیدهارتا تەواوی وزەی خۆی بەکارهێنا بۆ بەدیهێنانی ئـەو ئامانجـە. چـەندە ئەسـتەمە مرۆڤێـك بەتـەنها لـە دارسـتانێکدا بـژی. . . بەڕاسـتی بێـدەنگی دارسـتان زۆر قورسـە لەسـەر قەشـەیەك هێشـتا جێگیری ئـەقڵی بەدەسـت نـەهێناوە. ئـەم وشـانەی سـیدهارتا گوتامـا بەڵگەیـەکی ئاشـکران لەسـەرئەوەی گەڕان بەدوای ڕاستیدا هـەرگیز ئاسـان نـەبووە. بـەپێی کلتـور و نـەریتی ئـەو جێگایـە وادەردەکـەوێت سـیدهارتا لەکاتی گەڕانی بەدوای ڕاستیدا سێ ئاستی تێپەڕاندوە، بـەبێ ڕوونکردنـەوەی مـاوەی هەریەکـە لـە ئاسـتەکان بـۆ چۆنیەتی دابەشبوونی گەڕانەکەی بۆ سێ ئاست. یەکـەمین کـار ئەنجامیـدا چـووەلای دوو مامۆسـتای هیندۆسـی هاوچـەرخ بۆئـەوەی تـەواوی ئـەو زانیاریانـە بەدەسـت بهێنێـت کـە بـە میراتـی بۆیـان ماوەتـەوە لـەبارەی ئایینـە فراوانەکەیانـەوە. زۆر شـت فێربـوو لـەبارەی ڕاجـا یۆگـاوە. هـەروەها زۆر شـت فێربـوو لـەبارەی فەلسـەفەی هیندیـەوە بەڕادەیـەك هیندۆسـیەکانی ئـەمڕۆ دەڵـێن بـوزا لەوانـە، دەڵـێن ڕەخنـەگرتنی لـە هیندۆسـیەت لـەو سـەردەمەدا تـەنها بـە ئامـانجی چاکسـازی بـووە، ڕەخنـەکانی زۆر کـەمترن لـە لایەنگیریـەکانی بـۆ هیندۆسـیەت. بەهەرحاڵ بە تێپەڕبووی کات سیدهارتا هەمووو ئەو شتانە فێربوو کە ئەو یۆگیکارانە پێیان وتبوو.

هەنگاوی دووەمی پەیوەندی کردنی بوو بـە کۆمـەڵێك گۆشەنشـینەوە. زۆر کـەم نـانی دەخـوارد تـاوای لێهـات بـە درێژایی ڕۆژێك تەنها یەك دەنکە لۆبیـای دەخـوارد بەڕادەیـەك وەك خـۆی دەڵێـت ((کاتێـك گومـانی ئـەوەم بـرد کـە دەست دەدەم لە پێستی گەدەم لەڕاستیدا دەستم بـەر بڕبـڕەی پشـتم کـەوت!)). هەناسـەی خـۆی ڕادەگـرت تـا وا هەستی دەکرد: ((وەك ئـەوەی پیـاوێکی بـەهێز سـەری پـان بکاتـەوە بـە سـەری شمشـێرێك. . . یـان وەك ئـەوەی

گوریسێك توندكرابێت لە ملی، یان وەك ئەوەی دوو پیاوی بەهێز پیاوێكی لاوازیان گرتبێت و بیخەنەسەر خەڵوزی گەشاوە. . . )). خۆی نەدەشت بەڕادەیەك كە پیسی لەسەر لەشی ئەستور دەبوو.
داواجار لاواز و لاوازتر دەبوو تالەكۆتاییدا لەهۆش خۆی چوو، هاوەڵەكانی لەدەوری بوون بەخێرایی كەمێك برنجی گەان پێدا ئەگەرنا زۆر بەئاسانی گیانی لەدەستدەدا.
ئەم ئەزمونە فێریكرد جەنگان لەگەڵ جەستەدا بەبرسیكردنی هیچ سودێكی نیە. بەم وەرزشانە هەستا بە باشترین شێوە وێڕای ئەوە سەركەوتو نەبوو. ئەو وەرزشانە نەیگەیاند بە ڕوناكبوونەوە، بەڵام زۆرینەی كات ئەزمونە نێگەتیڤەكان سود بە مرۆڤ دەگەیەنن هێندەی سودی ئەزمونە پۆزەتیڤەكان، لەم حاڵەتەدا شكستهێنانی سیدھارتا لە وەرزشی جەنگان لەگەڵ جەستەدا سودەكەی بریتی بوو لەوەی یەكەمین بنەمای فەلسەفەكەی پێكهێنا ئەویش بنەمای: ((ڕێگای ناوەند لەنێوان دوو لایەنی بناغەییدا: جەنگان لەگەڵ جەستەدا لەلایەك، ڕۆچوون لە ئارەزوەكاندا لەلایەكەی ترەوە)). بنەمای ژیانی هاوسەنگ كەتیایدا هەمووو ئەو شتانە دەدرێتە جەستە كە پێویستی پێیەتی لە پشودان و خواردن كە یارمەتی دەری دەبن لە هەستان بە كارەكەی بە باشترین شێوە.
دوای ئەوەی وازی هێنا لە وەرزشی مراندنی جەستە، گوتاما دوا ئاستی گەڕانی بەدوای ڕاستیدا تەرخانكرد بۆ ڕێگایەك بیركردنەوەی ورد و تێڕامانی سۆفیگەریانە كۆدەكاتەوە لەسەر هێڵەكانی ڕاجا یۆگا. شەوێك لە شەوەكاندا لە نزیك شاری گایا لە باكوری ڕۆژھەڵاتی هیند (باشوری شاری بانتای ئێستا)، لەژێر دار هەنجیرێكدا دانیشت لەو كاتەوە ناونرا درەختی بو (كورتكراوەی بو واتە ڕوناكبوونەوە) ئەو شوێنە دواتر ناونرا پەڵەی جێگیر چونكە میراتی كلتوری دەگێڕێتەوە كاتێك بوزا هەستی بەوە كرد لەسەر لێواری ڕوناكبوونەوەیە دانیشت و خۆی جێگیركرد لەو شەوە چارەنوسسازەدا، پەیمانی دا لەو شوێنەدا هەڵنەسێت هەتا نەگات بە ڕووناكبوونەوە.
یەكەم ڕووداوی ئەو شەوە دیمەنی فریودانە كە هەوڵدانەكانی ئەهریمەنمان بیردەخاتەوە بۆ فریودانی عیسا (خوای لێ ڕازی بێت) لە شەوی دەست پێكردنی پەیامەكەیدا لەكاتێكدا ئەهریمەن هەستی بەوە كرد سەركەوتنی دوژمنەكەی گومانی تیانیە بەپەلە چووە لای سیدھارتا بۆئەوەی بیركردنەوەی بشێوێنێت. لە سەرەتادا هێرشی كردە سەر بە وێنەی كاما خوداوەندی ئارەزوی سێكسی بەوەی سێ ئافرەتی سەرنجڕاكێشی هێنایە بەرچاو، كاتێك سیدھارتا بەبێ جووڵە مایەوە بەبێ هیچ وروژاندێك، ئەهریمەن خۆی گۆڕی بۆئەوەی لەسەر شێوەی مارا خۆی نیشان بدات كە خوداوەندنی مردنە بۆئەوەی بیترسێنێت بەڵام دووبارە شكستی هێنا لەبەردەم خۆڕاگری سیدھارتادا، ئیتر بەخۆی و لەشكرەكەیەوە پاشەكشەی كرد.
لەدوای ئەوە لە كاتێكدا درەختی بو گوڵی دەباراند بەسەر سیدھارتادا، سیدھارتا بیركردنەوەی قووڵتر وقووڵتر دەبوویەوە هەتا ئەستێرەكانی بەربەیان درەوشانەوە. بەم كارە بەئاگاهێنانەوەیەكی گەورە ڕوودا، بوونی سیدھارتا گوتاما گۆڕا بۆ بوزا ئەم ڕوداوە گرنگیەكی دەردونی هەبوو. هەموو بوونەوەرەكانی سەر زەوی لەو بەیانیەدا دڵخۆش بوون و زەوی بە سەرسوڕمانەوە شەش جار لەریەوە. دە هەزار گالاكسی كەوتنە لەرزین لە ترسا هەمووو گوڵە لوتسەكان گوڵیان گرت و هەمووو گەردونیان گۆڕی بۆ چەپكە گوڵێك كە وەكو گێژاو دەسوڕێتەوە لە هەوادا(٤). ئەو ئەزمونە وای لە بوزا كرد لەو شوێنەدا جێگیر بێت بۆ ماوەی حەوت ڕۆژی تەواو، لە ڕۆژی هەشتەمدا ویستی هەستێتەوە بەڵام دوبارە نوقمبوویەوە لەناو شەپۆلێكی نوێی شادومانیدا، لە جۆرە حاڵەتێكی مەستیدا مایەوە بۆ ماوەی چل و نۆ ڕۆژ، دواتر سەر لەنوێ بەئاگاهاتەوە بەڕووی جیهاندا.

مارا واتە ئەهریمەن چاوەڕوانی بوو بۆئەوەی بە دوا هەوڵدانی خۆی هەستێت ئەم جارەیان کەوتە قسە لەگەڵ ئەقڵی گوتامادا بەڵام نەیتوانی تەنانەت بە ڕادەیەکی کەمیش بێت بەڵگەی بۆ بهێنێتەوە بۆئەوەی سەر لەنوێ بیگێڕێتەوە ناو بێمانایییەکانی ژیان، دواتر کەوتە تاقیکردنەوەی بۆئەوەی لەخشتەی بەرێت و پێی وت: ((کێ تێدەگات لەو ڕاستیەی کە پێی گەیشتویت؟ چۆن دەتوانیت وەحی بگۆڕیت بۆ سەر وشە؟ چۆن دەتوانیت ئەو خەونانەیان بۆ بگێڕیتەوە کەلە باسکردن نایەن؟ چۆن دەتوانیت مرۆڤ فێری ئەو شتانە بکەیت کە تەنها دەتوانێت هەستی پێبکات؟ بۆچی خۆت هیلاك دەکەیت بە ڕۆڵی کەسێکی بێ مێشك لەبەردەم جەماوەرێکی گوێگردا کەناتوانن لێت تێبگەن؟ بۆچی هەوڵ دەدەیت درەوشانەوەی ڕۆح پیشانی کەسانی سادە بدەیت کە هێشتا لەژێر کۆنترۆڵی ئارەزوەکاندان؟ بۆچی بەتەواوی دەست ناشۆیت لە جیهان هەمووو پەیوەندیەکت لەگەڵ جەستەتدا ناپچڕێنیت، بۆ هەمیشە بخەویت لە ئارامگای هەمیشەیی نیرڤانادا؟)).

گفتوگۆکەی ئەهریمەن برێکی زۆر لە ڕاستی تێدا بوو نزیکەی ڕۆژێکی خایاند، بەڵام لە کۆتاییدا بوزا وەڵامیدایەوە وتی: ((هەندێك کەس دەبن کە لێم تێبگەن)). بەمجۆرە مارا واتە ئەهریمەن لە ژیانی بوزا دەرکرا بۆ هەمیشە.

دوای نزیکەی نیو سەدە کاتێك بوزا ڕێگا خاکیەکانی هیندی دەبڕی هەتا سەری سپی بوو و هەنگاوەکانی خاوبوونەوە، ورەی بەرەو نەمان دەچوو و لاواز دەبوو بەهۆی زۆری تەمەنیەوە بەڵام وێڕای ئەوە هەر بەردەوام بوو لە گەیاندنی پەیامەکەی کە تێکشکێنەری خودپەرستی و ڕزگارکەری ژیانی مرۆڤەکانە. برایەتی قەشەکانی بونیادنا بۆ ڕکابەری کۆمەڵگای برهمەکان، هەمووو ئەو وشانەی قبوول کرد کە خەڵکی پێیان دەوت. کاری ڕۆژانەی بەتەواوی ڕێکخراو بوو، سەرەڕای پەروەردەکردنی قەشەکان و ڕاستکردنەوەی حاڵەتەکانی کەمی سیستمی ئاکار یان پێشێلکردنی یاسا، بەشێوەیەکی گشتی ئاڕاستەکردنی کاروباری برایەتی خشتەی کارکردنی دەپاراست و دانەدەبڕا لە ئامۆژگاریکردنی خەڵك بەگشتی، ڕاوێژکردنی تایبەت لەگەڵ ڕاوێژکارە نزیکەکانی ئامۆژگاری شڵەژاوانی دەکرد و هانی باوەڕدارانی دەدا و دڵی خەمبارەکانی دەدایەوە. ((خەڵکی دەهاتنەلای لە هەمووو لایەکی وڵاتەوە بۆ پرسیارکردن، ئەو بەخێرهاتنی هەمووانی دەکرد بەبێ هیچ بێزاربوونێك)).

ئەگەر وەڵامدانەوەی بوزامان وەرگرت بۆ ئەم فشارانە و توانای لە بەرەنگاربوونەوەیاندا ئەوا نمونەیەکی تیا دەبینین کە توینبی دایدەنێت بە نمونەیەکی بنەڕەتی بۆ ئاکار لە هەمووو مێژوودا، نمونەی (پاشەکشەکردن دواتر گەڕانەوە)). بوزا پاشەکشەی کرد بۆ ماوەی شەش ساڵ دواتر گەڕایەوە بۆ ماوەی چلوپێنج ساڵ. هەمووو ساڵێك دابەشکرابوو بەجۆرێك نۆ مانگی بەسەر دەبرد لەگەڵ جیهاندا و دواتر لە جیهان دادەبڕا لە وەرزی بارانبارینیدا بۆئەوەی لەگەڵ قەشەکاندا بەسەری بەرێت. سوڕی ڕۆژانەی بەهەمان شێوە دابەشکرابوو. ئەو کاتژمێرانەی لەگەڵ خەڵکیدا بەسەری دەبرد دوورودرێژ بوون بەڵام لە ڕۆژێکدا سێ جار پاشەکشەی دەکرد بۆئەوەی ئاگایی بەدەست بهێنێتەوە لەڕێگەی خەڵوەتەوە بۆ سەرچاوە پیرۆزەکەی.

لەدوای پەیامێکی قورس کە ماوەی ٤٥ ساڵی خایاند و لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا لە نزیکەی ساڵی ٤٨٣پ. ز. دا بوزا کۆچی دوایی کرد بەهۆی خواردنی هەندێك قارچکی ژەهراوی لە ماڵی کوندا سمیسی کە بەهەڵە لە دەفرەکەی ئەوا دانرابوون. تەنانەت کاتێك لەسەر جێگای مەرگ بوو ئەقڵی لەلای خەڵکی بوو. چونکە لە ناوەندی ئازارەکانیدا هەستی بەوە کرد، خۆی بە لێپرسراو لە مەرگی ئەو دەزانێت لەبەرئەوە دوا ڕاسپاردەی پێش مردنی بریتی بوو لەوەی بە هاوەڵەکانی بڵێت تەنها دوو ژەمە خواردن پڕ بوون لە خێرو بەرەکەت بۆی:

یەکەمیان کە یارمەتیدەرم بوو بۆ گەیشتنم بە ڕوناکبوونەوە و بەئاگابوون لەژێر درەختی بودا، دووەمیان ئەو دوا ژەمە بوو کە دەرگاکانی بۆ کردمەوە بەرەو نیرڤانا.

ئەمە یەکێك بوو لە دیمەنەکانی سەر جێگای مەرگ کە کتێبی مەرگی گەورە the great decease پاراستویەتی کە هەموووی بەسەریەکەوە وێنەی پیاوێکە چووەتە نێو حاڵەتێکەوە تیایدا ئاگایی و بیرکردنەوە لە بوون بەبێ هیچ بەرگریەك. دوو ڕستەی ماڵئاوایی وتی کە دەنگدانەوەکەی مایەوە بەدرێژایی سەدەکان: ((هەموو شتەکان شیدەبنەوە لەبەرئەوە کار بکە بۆ ڕزگاربوونت بەوپەڕی تواناتەوە)).

## دانا بێدەنگەکە

ئەگەر ویستمان لە بوزییەت تێبگەین بەشێوەیەکی باش ئەوا پێویستە دەرك بكەین بەو كاریگەریەی كە ژیانی بوزا هەیبوو لەسەر ئەو كەسانەی شوێنكەوتوی بوون.

ئەستەمە ڕوداوەكانی ژیانی بوزا بخوێنینەوە و دواتر هەست بەوە نەكەین كە ئەم پیاوە یەكێك نیە لە مەزنترین كەسایەتیەكان لە هەمووو سەردەمەكانی مێژودا. ئەو ڕێزگرتنەی كە هەمووو كەسێك هەستی پێدەكات ئەگەر بەڕادەیەكی كەم بیناسێت، بەجۆرێك خوێنەر خۆی دەبینێتەوە وابەستەبووە بە هەڵسوكەوتێكەوە كە دەستیگرتوە بەسەر هەستەكانیدا لەبەردەم كەسێكدا وەكو دانایيەكی بەرجەستەكراوە. لەوانەیە زۆرترین شت كە مرۆڤ سەرسام دەكات و كاریگەری هەیە لەسەری بەپێی دەربڕینی j. b. pratt كۆكراوەتەوە لەنێوان ئەقڵانیەت لەلایەك و سۆزداری لەلایەكی ترەوە، تێكەڵەیەكە بەتەواوی دوورە لە سۆزداریەوە لەلایەك و گرنگی نەدان بەوانی تر لەلایەكی ترەوە. بەبێ گومان یەكێك لە مەزنترین ئەقڵانیەكان لە هەمووو مێژودا لەم لایەنەوە هیچ كەمتر نیە لە سوكرات. هەمووو كێشەیەك كە دەیخاتەڕوو خۆڕسكانە ملكەچ دەبێت بۆ تێڕوانینێكی شیكاری لەسەرخۆ بۆ هێزە ئەقڵیەكەی. لەسەرەتادا شیدەكرێتەوە بۆ بەشە پێكهێنەرەكانی دواتر، ئەم بەشانە سەرلەنوێ كۆدەكرێنەوە لە ڕێكخستنێكی ئەندازەییدا كە كرۆكەكەی پیشان دەدات و پەردە لادەبات لەسەر واتا ڕاستەقینەكەی. ئەو شارەزا بوو لەبواری گفتوگۆ و ڕووبەڕووبوونەوەدا، هەروەها كەسێكی لەسەرخۆ بوو. ((لە گفتوگۆكردنمدا لەگەڵ هەر كەسێكدا هەرگیز بوارێك نەبوو بۆئەوەی بشڵەژێم)).

ئەو شتەی سەرنجڕاكێشە بریتیە لە چۆنیەتی هاوسەنگی ئەم ڕەگەزە ڕەخنەییە لە كەسایەتیەكەیدا، بە سۆز و بەزەیی بەڕادەیەك وای لە پەیامەكەی كرد ناوبنرێت بە ئایینی بەزەیی بێ پایان. لەبەر چیرۆكی خستنە مەترسی ژیانیەوە بێت یان لەبەر ئازادكردنی بزنێك كە خەریك بوو بكەوێتە خوارەوە لەسەر لێواری شاخێك، بەڵام ئەم سەركەشیانە ڕاستیەكن لەگەڵ هاتنە دونیاوە لەگەڵیدا بوون، لەبەرئەوەی ژیانی لێوان لێو بووە لە بەزەیی و بەخشینی بەردەوام بۆ كەمدەرامەتان. خەسڵەتی ((خۆنەویستی و قوربانیدان))لەلای بوزا كاریگەری هەبوو لەسەر وەرگێڕەكان و نوسەرانی ژیانی بەڕادەیەك هەندێكیان نەیانتوانیوە باسی بكەن و دەریببڕن تەنها بەوە نەبێت ئەم خەسڵەتە دەگەڕێتەوە بۆ ئاستێكی زۆر زوولە بوونی بوزا واتە كاتێك لە ئاستی لەبەرگرتنەوەی ئاژەڵیدا بووە پێش ئەوەی بگاتە ئاستی مرۆڤ، ، وەك لە گێڕانەوەی جاكاتا jakata tales دا هاتوە جارێك خۆی كردوەتە قوربانی كاتێك كەروێشكێكی كێوی بووە خۆی خستوەتە نێو ئاگرەوە هەتا ببێتە خۆراكی قەشەیەكی برهمەنی كە خەریكبوو لە برسا دەمرد. با ئەم گێڕانەوانە وەلا بنێین كە نوسراونەتەوە لەپاش ڕۆیشتنی خاوەنەكەی كە گومانی تیا نیە ژیانی بوزا كانگایەك بوو لە بەزەیی و خۆشەویستی. پێداگری دەكرد لەسەر لابردنی تیرەكانی دڵتەنگی لە دڵی هەم كەسێكی خەمباردا، بوزا بەبەزەیی بوو بەرامبەر بە هەمووو مرۆڤێك، ئەمە هێزێكی سەیری ڕۆحی بوو، بەم جۆرە كاری دەكردە سەر ئەو كەسانەی دەچوونە سەردانی.

لەڕووی كۆمەڵایەتیەوە، ڕەچەڵەكی پادشایانەی بوزا و پەروەردەكردنە شاهانەكەی تایبەتمەندیەكی كۆمەڵایەتی گەورەی پێ بەخشی بوو. لەنێو پادشاكاندا بەشێوەیەكی ئاسایی دەڕۆیشت، بۆچی نا خۆ لە ڕابردودا یەكێك بوو لەوان؟ بەڵام پلەو پایە كۆمەڵایەتیەكەی بەرزكرایەوە كە بە هیچ جۆرێك دوری نەدەخستەوە لە جوتیارە سادە و ساكارەكان. جیاوازی لە پلەوپایە كۆمەڵایەتیەكاندا لە چینەكانی خەڵكیدا هیچ گرنگ نەبوو لەلای. تەنانەت كەسە دەربەدەركراوەكان لەلای بوزا ڕێزی تەواویان لێدەگیرا، لەبەرئەم هۆیە كاتێك دەربەدەركراوان دەهاتنە لای بوزا بۆ یەكەمجار لە ژیانیاندا كەسێكیان دەناسی كە لێیان تێدەگات بەم جۆرە متمانەبوون بەخودی بۆ

دەگەڕاندنەوە، بەم کارە سەرلەنوێ پلەو پایە کۆمەڵایەتیەکەیان بەدەست دەهێنایەوە. (گوتاما پێشوازی لە هەمووو مرۆڤێك دەكرد، کەسێکی ئاشتیخواز و سادە بوو، هەروەها نزیك بوو لە خەڵکەوە، هەرکەسێك بیویستایە چاوی پێ بکەوێت ئەوا زۆر بە ئاسانی دەیتوانی ئەو کارە بکات)) (٥).

سادەییەکی سەرنجڕاکێشی هەبوو، لەو پیاوەدا کەوای لە پادشاکان دەکرد لەبەردەمیدا بچەمنەوە. تەنانەت کاتێك ناوبانگی گەیشتە لوتکە، دەبینرا کە دەفری سواڵەکەی بەدەستەوە بوو بە شەقام و کۆڵانەکاندا دەڕۆیشت بە خۆڕاگری مرۆڤێك کە تێگەیشتوە لە بێمانایی و فریودانی تەمەن. وەك دار مێو و درەختی زەیتون کە دوو درەختن لە کەمترین خاکدا گەشە دەکەن و سەوز دەبن، پێداویستیە جەستەییەکانی بوزا زۆر کەم بوون. جارێکیان بینرا لە شاری ئەلاوی دانیشتبوو لەسەر چەند گەڵایەکی درەخت لەسەر ڕێگایەك کە مەڕوماڵات تەختی کردبوو لە وەرزی سەرمای زستاندا. لەبارەی خۆیەوە وتی: (ڕەقە ئەو زەویەی سمی مەڕوماڵاتەکان چاڵیان کردوە، نەرمە ئەو فەرشەی کە پێکهاتوە لە گەڵاکانی درەخت، تەنکە ئەو پارچە قوماشە زەردەی لەخۆمم ئاڵاندوە، هەراسانکەرە ڕەشەبای زستان، بەڵام وێڕای هەمووو ئەمانە لەوپەڕی خۆشیدا دەژیم).

لەوانەیە دروست نەبێت باس لە بوزا بکەین وەکو پیاوێکی ئاسایی. جون هی john hay کە سکرتێری سەرۆکی ئەمەریکی لینکۆڵن بوو بە درێژایی ماوەی مانەوەی لە کۆشکی سپیدا دەڵێت: (ناکرێت پیاوێکی مەزن سادە بێت)). گومانی تێدا نیە بوزا هەستی بەوە دەکرد کە بەرزبووەتەوە بۆ ئاستێکی زانستی کە لە سەروو توانای زانستی هەموووانەوە بوو لەو سەردەمەدا. لەم ڕووەوە ڕازی بوو بە سادەیی سەرکەوتنەکەی لەگەڵ متمانەبوون بە خۆدا دەژیا کە لەو سەرکەوتنەوە بەدەستی هێنابوو. ئەمە شتێکی جیاوازە لە خۆبەزلزانین. لە دوا کۆبوونەوەی ساڵانەیدا لەگەڵ قەشەکان، پێشئەوەی سەرلەنوێ دەست بکەنەوە بە خولەکەیان، بوزا وتی: (بانگم کردون بۆ ئەم کۆبوونەوەیە بۆئەوەی لێتان بپرسم چ هەڵەیەکتان بینیوە لە هەڵسوکەوتەکانم و وتەکانمدا)، کاتێك یەکێك لە خوێنکارە نزیکەکانی هاواری کرد (گەورەم من باوەڕم وەهایە نەبووە و نابێت لەسەر زەویدا کەسێکی داناو پیرۆزی وەك تۆ). بوزا وەڵامی دایەوە و وتی (گومانی تێدا نیە ئەی ساریبوتا هەمووو بوزاکانی پێش منت ناسیوە)).

—ئەویش وتی: نەخێر گەورەم.

—باشە کەواتە پێویستە بوزاکانی داهاتوو بناسیت؟

—نەخێر گەورەم

—کەواتە بەلایەنی کەمەوە تۆ من دەناسیت بەشێوەیەکی تەواو

—تەنانەت ئەمە نا گەورەم

—کەواتە ئەی ساریبوتا بۆچی وشەکانت هێندە بوێرانە و گەورەن بەم ڕادەیە؟.

وێڕای بابەتیانەی بوزا بە ئاراستەی خۆی لەناو ژیانیدا فشارێکی بەردەوام هەبوو لە گۆڕینیدا بۆ یەزدان، بەشێوەیەکی ڕیشەیی هەمووو ئەو هەوڵدانانەی ڕەتکردەوە، جەختی دەکردەوە لەسەر ئەوەی ئەو تەنها مرۆڤێکە و هیچی تر. هەرگیز هەوڵی نەدەدا ئەو فریودانانە بشارێتەوە کە دەهاتنەڕێی، هەروەها خاڵە لاوازەکانی خۆی و قورسی گەیشتنی بە ڕوناکبوونەوەی نەدەشاردەوە بەڵکو ئەوەی دوپاتکردەوە بەئاسانی نەگەیشتوە بەو پلەوپایەیە، هەروەها دانی بەوەدا دەنا کە هێشتا کەسێك نیە دوور بێت لە هەڵەوە، هەروەها دانی نا بەوەدا ئەگەر پاڵنەرێکی تر هەبووایە بە هەمان پاڵنەری سێکسی ئەوا هەرگیز نەدەگەیشتم بەم پلەوپایەیە، هەروەها وتی مانگەکانی سەرەتای ژیانی گۆشەنشینی نزیکی کردمەوە لە لێواری مەرگ. ((کاتێك لە دارستان مامەوە

ئاسكێك بەلامدا تێپەڕی دواتر باڵندەیەك هات بووەهۆی كەوتنەخوارەوەی لقی دارێك ئینجا با لقوپۆپی دارەكانی لەراندەوە ئەوكاتە لەرزم لێهات و بەخۆمم وت ئێستا شتێكی ترسناك ڕوودەدات). هەروەك پۆل دەلكە paul dahlke ئاماژەی بەوەكردووە لە ڕاپۆرتەكانیدا لەبارەی بوزیەتەوە buddhist essays (ئەو كەسەی بەم ئاشكرایی و ڕاستگۆییە بدوێت پێویستی بەوە نیە خەڵكی فریوبدات بە هیوا و ئاواتە ئاسمانیەكان بۆ خۆشگوزەرانی و شادومانی. ئەو كەسەی بەم جۆرە لەبارەی خۆیەوە بدوێت خەڵكی كێش دەكات بەرەو خۆی بەهەمان هێزی كێشكردنی ڕاستی بۆ هەمووو ئەو كەسانەی دەچنە ناویەوە)).

ڕابەرایەتی بوزا بۆ برایەتی قەشەكان تەواو و بێوێنە بوو بەجۆرێك جارێك یەكێك لە پادشاكان سەردانی یەكێك لە كۆبوونەوەكانی ئەوانی كرد كە درێژبوویەوە هەتا نیوەی شەو ئیتر خۆڕاگری لەدەستدا و وتی (ئایا ئەم كارەتان فریودان و خۆنواندن نیە؟ چۆن دەبێت هیچ دەنگ و پژمین و كۆكەیەكی تێدا نەبێت لە هاوشێوەی ئەم دانیشتنە گەورەیەدا كە ١٢٥٠ كەس لە برایانی لەخۆگرتوە؟). دواتر وتی (ئایا دەكرێت بەم ڕادەیە بێدەنگ بێت؟).

هەروەك هەمووو بلیمەتە ڕۆحیەكان، بوزا ژیریەكی خۆڕسكی وەهای پێبەخشرابوو لە ناسینی سروشتی ئاكاری خەڵكدا دەیتوانی بە تاكە نیگایەك ڕاستی ناو ڕۆحی كەسانی دەوروبەری دەرك پێبكات و دەیزانی كامیان ڕاستگۆیە و كامەیان درۆ دەكات.

یەكێك لە جوانترین نمونە لەم بارەیەوە چاوكەوتنی بوو بە سونیتا كە كاری كۆكردنەوەی گوڵ بوو، مرۆڤێكی بەوجۆرە سادە تاكە كاری گەڕان بوو لەناو چەپكە گوڵە فڕێدراوەكاندا هەتا چەند دانە گوڵێك بدۆزێتەوە كە هێشتا سیس نەبوون بۆئەوەی چەپكە گوڵێكی نوێی لێدروست بكات و بیفرۆشێت، هەتا بیداتە بژێوی ئەو ڕۆژەی، لەو كاتەدا دڵی سونیتا لێوانلێو بوو لە ترس و خۆشی. كاتێك شوێنێكی نەدۆزیەوە هەتا خۆی تیادا حەشاربدات چونكە لە چینی دەربەدەركراوان بوو ئیدی چاری نەماو لە شوێنی خۆیدا وەستا، لەو كاتەدا بوزا هەستی بە چەند نیشانەیەكی پیرۆزی كرد لە دڵی سونیتادا كە دەدرەوشایەوە هەروەك چرا، لێی نزیك بوویەوە و پێی وت (چیت داوە لەم ژیانە پڕ لە ناسۆریە؟ ئایا بەرگەی وازهێنان لە جیهان دەگریت؟) سونیتا كاتێك هەستی بە مەستیەك كرد وەك كەسێك گوڵاوی یەزدانی بەسەردا ڕژێنرابێت لە وەڵامدا پێی وت: ((ئەگەر بمتوانیایە ببمە قەشەیەك لە قەشەكانی ڕێگاكەت و ڕێگەم بدەیت هەتا پێشبكەوم!)). بەم كارە بووبە ئەندامێكی دیاری برایان(٦).

ژیانی بوزا لێوانلێو بوو لەو بیروباوەڕەی كە پەیامێكی گەردونی هەیە، پێویستە لەسەری كاربكات بۆ جێبەجێكردنی، چونكە لەدوای گەیشتنی بە ڕوناكبوونەوە (چەند ڕۆحێكی بینی كە تۆز و خۆڵ بەرچاوی گرتبوون، چەند ڕۆحێكی تر تۆز و خۆڵ چاوی داپۆشیبوون و هیچیان نەدەبینی)(٧). جیهانی مرۆیی بەشێوەیەكی شڵەژاو و ونبوو دەهاتە پێشچاو، بەجۆرێك پێویستی بە یارمەتیدان و ڕێنمونی هەیە لەبەرئەوە هیچ چارەیەكی دیكەی نەبوو جگەلە هاوڕابوونی لەگەڵ شوێنكەوتوەكانیدا لەسەر ئەو ڕایەی كە (هاتوەتە دونیاوە بۆ خێر و چاكە و شادومانی و بەرژەوەندی زۆربەی خەڵك و دڵخۆشكردنی یەزدان و مرۆڤ، بەدەست پێكردن بە بەزەیی و میهرەبانیەكی بێسنور بۆ هەمووو جیهان)(٨). بە گەیاندنی ئەم پەیامە دڵ و ئەقڵی هیندی بەدەستهێنا. ((قەشە گوتاما ڕۆیشت بەرەو ژیانی ئایینی، وازی هێنا لە هۆز و كەسوكاری، وازی هێنا لە سامان و دارایی و گەنجینە پڕ لە ئاڵتونەكانی. ئەوماڵی خۆی جێهێشت لە لوتكەی گەنجێتیدا هێشتا تاڵە موویەكی سەری سپی نەبوو لەكاتێكدا لەوپەڕی هێز و توانا و جوانیدا بوو))(٩).

ژمارەیەکی لەڕادەبەدەر پەیڤ هەن لەبارەی ژیانی بوزاوە، گومانی تێدا نیە یەکێك لە هۆکارەکان بریتیە لەوەی هیچ یەکێك لەو باسانە خوێندکارەکانی بوزای ڕازی نەدەکرد. لەدوای ئەوەی وشەکان بە هەمووو توانای خۆیانەوە هەستان بەکارەکەیان، گەوهەری مامۆستاکەیان بە نهێنیەکی داخراو مایەوە.

ئەوەی تێگەیشتن لە کەسایەتیەکەی خۆشیان ویست، بەڵام بوزا زۆر لەوە زیاتر زانیاری لە گەوهەریدا هەبوو کە بتوانن سودی لێوەربگرن. لەکۆتاییدا نیوەی لە ڕوناکی و نیوەی لە تاریکیدا مایەوە لەبەرئەوە ناویان نا (ساکیامونی. . واتە دانا بێدەنگەکە لە هۆزی ساکیا)، وەك ئاماژەکردنێك بۆ شتێکی سەروو ئەوەی بتوانین لەبارەیەوە بدوێین یان بیری لێبکەینەوە. هەروەها ناویان نابوو تاساگاتا tathagata واتە ((ئەو کەسەی بەمجۆرە گەیشت))، ((بەدەستهێنەری ڕاستی))، ((ئەو کەسەی گەیشتوە بە ڕوناکبوونەوە بە تەواوترین شێوە))، چونکە ((ئەو تاکە کەسێکە شێوەی تەواوی ئەم گەردونە دەناسێت))، تاساگاتا قووڵە و دەرکی پێناکرێت، تێگەیشتنی قورسە بەڵکو وەکو زەریایە))(١٠).

## قەشە خرۆشاوەکە

ئەگەر لە بوزای مرۆڤەوە چووینەسەر بوزییەت وەك ئایینێك، پێویستە لەسەرمان سەیری بوزییەت بکەین لەژێر ڕوناکی باکگراوندی هیندۆسیەتدا گەشەی سەندوە. بە پێچەوانەی هیندۆسیەتەوە، پەرەیسەند لەڕێگەی فراوانبوونی ڕۆحی نائاشکرای هێماکانەوە، لەڕێگەی ڕابردویەکی پەردەپۆشکراو کە ناکرێت لەسەری بوەستین، ئایینی بوزا لەناکاو دەرکەوت. بوزییەت تا ڕادەیەکی دوور کاردانەوە بوو دژ بە گەندەڵی و لادانەکانی هیندۆسیەت، واتە بریتیەلە پڕۆتستانتی هیندی، بە واتای وشەی پڕۆتستانتی نیە، کە جەخت دەکاتەوە لەسەر بڕوانامە (testis) لەسەر شتێك (pro) بەڵکو هەروەها بەو مانایەی پڕۆتستانتیەت وەریگرت لە دواییدا کە جەخت دەکاتەوە لەسەر ناڕەزایی شتێکی تر. بوزییەت چالاکیە بنەڕەتیەکەی وەرگرت لە هیندۆسیەتەوە بەڵام پاشەکشەی کرد لەبەردەم گەندەڵیەکانیدا.

بەپێی ئەمە ئەگەر ویستمان بەشێوەیەکی باش تێبگەین لە ڕێنماییەکانی بوزا ئەوا پێویستمان بە وێنەیەك هەیە ئەگەرچی بچوککراوەش بێت لەبارەی هیندۆسیەتەوە کە لەو سەردەمەدا بووە هۆی دەرکەوتنی ئەو بنەمایانە. بۆ گەیشتن بەم وێنەیە پێویستمان بە چەند تێبینی و تێڕوانینێك هەیە لەسەر ئایین.

شەش دیاردە هەیە دەرکەوتنیان دوبارە دەبێتەوە لە هەمووو ئایینێکدا هەتا ئەو ڕادەیەی ئەو بیرکردنەوەیە چالاك دەکات کە تۆوەکانی ڕەگوڕیشەی داکوتیوە لە پێکهاتەی مرۆڤ و سروشتی دروستبوونیدا بەڕادەیەك ناتوانین پێشبینی ئەوە بکەین لە هەر ئایینێکدا لەگەڵ مرۆڤایەتیدا بدوێت هەتا خۆی لێ بپارێزێت و ڕیاکاری بکات.

یەکەم دیاردە: دەسەڵاتە Authority.

ئەگەر بابەتی دەسەڵاتی یەزدانیمان خستەلاوە و کورتمان کردەوە لە چارەسەرکردنی کێشەکە بە سنورە مرۆییەکەیەوە. ئەوا کێشەکە لە گەوهەریدا دادەبەزێت دەگاتە کێشەی تایبەتمەندبوون. کێشەکانی ژیانی ئایینی مرۆڤ و چارەسەرەکانی، لە ئاڵۆزیدا هیچ کەمتر نین لە کێشە تەندروستیەکان یان کێشە ڕامیاریەکان و کێشەکانی دەسەڵات. بەپێی ئەمە لۆژیکیە بڵێین ئەو بلیمەتیەی کە هەندێك کەس هەیانە جودایان دەکاتەوە لەوانی تر و بەرزیان دەکاتەوە بەسەر زۆرینەدا، لە توانایدایە لە تێگەیشتن لە ڕۆحی مرۆڤ و زانینی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا. بەمجۆرە ئەو کەسانە هەندێك متمانە و ڕێز بەدەست دەهێنن، بەشێوەیەکی گشتی گوێیان لێدەگیرێت و شوێنکەوتویان دەبێت دواتر دەبنە سەرچاوەی یاسایی.

ڕەگەزی دووەم لە ئاییندا بریتیە لە نەریت the ritual.

بەڕاستی نەریتەکان ئەو لانکەیەن کە زۆربەی ئایینەکان تیایدا پەروەردەبوون. بەپێچەوانەی ئەوەی زۆربەی خەڵك بیری لێدەکاتەوە، ئاکار و بیروباوەڕە ئایینیەکان یەکەمین شتن دواتر نەریتەکان دێن. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئایینەکان پەروەردە بوون بە دەستپێکردن لە بۆنەکانی غەم و نیگەرانی کە خەڵکی هەستی پێ دەکەن، بەو هۆیەوە ئارەزوی ئەوە دەکەن لە بۆنەیەکدا پێکەوە کۆببنەوە، لە کۆبوونەوەیەکی لێوانلێو لە شادومانیدا هەتا خواناسیان زیادبکات و بەهێز ببێت بە سرودە ئایینیەکان و سەماکردنی بەکۆمەڵ. ئەو هاندەرەی پاڵدەنێت بە مرۆڤەوە بەئاڕاستەی ویژدانی، قووڵترە لە ژیاندا لە ڕووکاری مرۆڤەوە، چونکە باڵندەکان بە چەند شێوەیەکی ئەندازەیی ڕێکخراو بەیەکەوە دەفڕن، هەروەها گیانلەبەرەکانی تریش بە هەمان شێوە بە کۆمەڵ دەژین.

ڕەگەزی سێیەم/ تێڕامان و بیرکردنەوەی ئەقڵیە speculation

وێڕای ئەوەی ئایین زۆربەی کات گەشەدەکات لەسەر شێوەی ڕێوڕەسم و مەڕاسیمەکانی، بەڵام ئەقڵ بەخێرایی بانگهێشت دەکرێت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی، وەك ئێمەی مرۆڤ لە کوێوە هاتوین؟ بۆچی ئێمە لەسەر ڕووی گۆی زەوین؟ بۆ کویٚ دەچین لەدوای گەشتی ژیان؟؟ هەمووو مرۆڤێك دەیەوێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە(١١).

ڕەگەزی چوارەم/ گواستراوەکان (واتە میرات و کەلەپووری ئایینی)tradition.

مرۆڤ بە بەراورد بە هەمووو بوونەوەران کەمتر ڕاپێچ دەکرێت بەڵام مرۆڤ دەخاتە دڵەڕاوکێو و مەترسیەوە، چونکە ئەو وانانەی باوباپیرانی فێری بوون لەمیانەی ژیانێکی قورس لە ئەزمون و هەڵە بە درێژایی کات، بەشێوەیەکی خۆڕسك بەردەست نیە بۆیان بەڵکو پێویستە بگوازرێتەوە بۆیان بەشێوەیەکی بەئاگا لەلایەن هەمووو نەوەیەکەوە لەڕێگەی زنجیرەی ڕۆشنبیری و کەلەپوور. لێگەڕیٚ با تاکە ئەڵقەیەك لەم زنجیرەیە کاری خۆی پشتگویٚ بخات واتە ڕێگەبدە بە تاکە نەوەیەك کەمتەرخەمی بکات لە هەستان بە کارەکەیدا لە گواستنەوەی دانایی و ژیری باوباپیرانی بۆ نەوەی دوای خۆی، ئەوکاتە دەبینینت سەرکەشی مرۆیی توشی هەرەس دەبێت و ملیۆنەها ساڵ دەگەڕێتەوە بۆ دواوە، بەجۆرێك پێویستە هەمووو ئەزمونێك لە سەرەتاوە دەست پێبکاتەوە. لەنێو هەمووو ڕێکخراوە ڕۆشنبیریەکاندا بۆ گواستنەوەی دانایی و ژیری ڕابردوو، هیچ ڕێکخراوێك نیە بیسەلمێنێت کە لە هەمووان بەهێزترە لەم بوارەی ئاییندا. ئەگەر ئایین لە هەندێك کاتدا پێشبینیکراو بێت ئەوا هەمیشە پارێزەرە. ئایا ئەم کارە باشە یان خراپە جیاواز دەبێت لە هەریەکە لەحاڵەتەکاندا بەپێی ئەو بەهایانەی کە دەیانپارێزێت.

ڕەگەزی پێنجەم/ لە بنەمای دەسەڵات و بەزەیی یەزدان.

سنورداری مرۆڤ و ئەو دوریەی کە ژیانی پشتی پێدەبەستێت لە هەمووو کارێکدا لەسەر ئەو هۆکارانەی ئەو دروستیان ناکات و دەسەڵاتی نیە بەسەریاندا، زۆربەی کات دەکەوێتە ناوجەرگەی پاڵنەری ئایینیەوە، پێناسەی شلییرماخر schleirmacher (فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەڵمانی) بۆ ئایین ئەوەیە کە ((هەستکردنە بە ملکەچی)).

ئەم دەرك پێکردنە لەلایەن مرۆڤەوە بەتەواوی پشتی بەستوە بە هۆکارەکانی دەرەوەی توانای خۆی، ئەمە دەردەکەوێت بەشێوەی چەمکی ئایینی بۆ دەسەڵاتی یەزدانی. ئەگەر چەمکی سوپاسگوزاریمان خستەپاڵ لەگەڵ سودی ئەم ژیانە کە یەزدان بەبەردەوامی دەیداتە بەندەکانی، ئەوا تۆوی چەمکی بەزەیی و بەخشینی یەزدانی بەدەست دێنین، بەڵیٚ بەخشینەکانی یەزدان بۆ مرۆڤ لە ژماردن نایەن، تەنها ژیانی دەستەبەر نەکردوە بەڵکو پاڵپشتی دەکات و توانای پیٚ دەبەخشێت لە هەمووو ساتێکدا بەدرێژایی ڕێگاکە.

دواجار ئایین لێوان لێوە لە نهێنی، زۆربەی کات تێکەڵ بە سیحر و جادوو کراوە، بەراوردکراوە بە نهێنیەکان و کارە سەیر و سەمەرەکان کە لەسەرووی توانای مرۆییەوەن، هەندێك جار تێکەڵکراوە بە کۆمەڵە شتێکی وەك ئامادەکردنی ڕۆحەکان، لەوانەیە ئەقڵانیەکان سکاڵابکەن لە هاوشێوەی ئەم شتانەدا، هەمووان دڵگران بن بۆ بێمانایی دین و زیادەڕەوی کردنی لە هەندێك ئاڕاستەدا. وێڕای ئەوە ئەم پەیوەندیە شایەنی تێگەیشتنە. دوا گرنگی پێدانی ئایین لە بیٚ پایانیدایە کە مرۆڤ بانگهێشت دەکات بەرەو لای خۆی واتە (ڕاکێشانی سۆفیگەری).

هەریەکە لەم شەش ڕەگەزە. دەسەڵات، نەریت، تێڕامان و سەرنجدانی ئەقڵی، گواستراوەکان و میرات و کەلەپوور، دەسەڵاتی یەزدانی لەگەڵ میهرو بەزەییەکەی، نهێنیەکان. ئەرکی خۆیان هەیە لە ئاییندا کە پێویستە لەسەری جێبەجێی بکات. لە هەمان کاتدا لەوانەیە هەریەکەیان تەنها بەشێوەیەکی ڕووکاری بوونی هەبێت

لەکاتێکـدا ڕاسـتیەکەی و ئەرکـە داواکراوەکـەی لەدەسـتدراوە! ئـەم شـەش ڕەگـەزە لـە هیندۆسـیەتدا تـەنها بەشێوەیەکی ڕووکاری بوونیان هەبوو کە بووەتەهۆی ئەوەی بوزا لەسەردەمی خۆیدا ڕووبەڕووی ببێتەوە.
چونکە دەسەڵات لە سەرەتادا پێویستە هەبێت، بەڵام لە هیندۆسیەتدا تەنها کەرەستەیەك بوو بەدەست چینی براهمەوە، ئەم چینە چەندین یاسای توندی دانا بۆئەوەی ڕاستی ئایینی وەك نهێنیەکی ئایینی تەنها لەلای ئەوان بمێنێتەوە.
بەهەمان شێوە نەریتەکان لەبری ئەوەی ببنە پۆشاکێکی پارێزەر بۆئەوەی تۆوی ڕۆح تیایدا گەشە بکات، بوون بە سەدەفەیەکی ڕەق هەمووو دەستکەوتە ئایینیەکانی لەناوخۆیدا بەنددەکرد، کە بووەهۆی ئەوەی پەرستنەکان بێ ڕۆح بن. چەندین گفتوگۆی بێمانایان دەکرد لەبارەی چۆنیەتی دروستبوونی جیهانەوە، ئەو شتە چیە جەستەی مرۆڤ جێدەهێڵێت لەدوای مردنی، دواتر دەچێتەناو گیانداڕێکی ترەوە واتا بەردەوامی دەدرێت بە مانەوەی ئەو ڕۆحە "تناسخ الأرواح"؟
ئامانج چیە لەدوای گەڕان بە هەمووو ئەم شتانەدا؟ ئەستەمە مرۆڤ هیچ سودێك ببینێت لەم توێژینەوە و تێڕامانە ئەقڵیانەدا، لەبارەی ئەوەی چەندە فریشتە دەتوانن سەمابکەن لەسەر نوکی دەرزیەك؟ یان ئایا یەزدان دەتوانێت بەردێك دروست بکات دواتر نەتوانێت لەجێی خۆی بەرزی بکاتەوە؟ ئەم کۆمەڵە مەتەڵە تەنانەت ئەگەر وەڵامەکەی زانرا هیچ پێشکەوتنێك ئەنجام نادات لە کاروانی ئایینی مرۆڤدا کە پێویستە بەبەردەوامی پێش بکەوێت.
بەهەمان شێوە میرات و کەلەپووری ئایینی لەبری ئەوەی بپارێزرێت و بگوازرێتەوە وەك دەستکەوتێکی ڕابردوو، بوو بە بەربەستێك لەبەردەم پێشکەوتندا، بەڕادەیەك زمانی سنسکریتی وێڕای ئەوەی خەڵك تێی ناگات وەکو زمانی ئایینی مایەوە.
بەم جۆرە چەمکی فەرمانڕەوایی یەزدانی و میهر و بەزەییەکەی بوو بە چەمکێکی ڕێگر، چونکە چەمکی بەزەیی یەزدانی پەرەیسەند بۆ بەدەستەوەدانی دەرئەنجامێکی هەڵە، بەوەی مرۆڤ پێویستی بەوە نیە کارێك بۆ ڕزگاربوونی بکات، بەهەمان شێوە چەمکی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی یەزدانی پەرەیسەند بۆ بەدەستەوەدانی دەرئەنجامێکی خراپتر، بەوەی ناتوانرێت هیچ شتێك ئەنجام بدرێت چونکە مرۆڤ بەتەواوی بەڕێوە دەبرێت بە خواست و ویستی یەزدانی، بەجۆرێك چەمکی کارما تێکەڵکراوە بە چەمکی هێز و تۆقاندن!
دواجار ئاستی نهێنیە ئایینیەکان دابەزیوە هەتا ئەو ڕادەیەی بازرگانی بە نهێنیە ئایینیەکانەوە بکرێت، ئارەزوکردنی لەڕادەبەدەر بۆ هەمووو شتێکی سەروو توانای مرۆیی بەشێوەیەکی تەواو دەستی بەسەرداگیراوە لەڕێگەی جادوو و جادووکەرانەوە. ئایین بەکاردەهێنن بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندی تایبەتی.
هەتا ئەم دیمەنە ئایینیە گەندەڵە کە هیچ پەیوەندیەکی نیە بە ڕاستی ئایینەوە و هیچ سودێك ناگەیەنێت بە هەوڵی ڕاستەقینەی ئایینی، نادیار و نائەقڵانیە و تەماویە بەهۆی پەڵە هەوری شتە پڕوپوچەکانەوە، بوزا هات پێداگری کرد لەسەر پاککردنەوەی دیمەنەکە و چاککردنی ئەو بارە بەڵکو ڕاستی ئەو کەسە بدۆزێتەوە کە داوای دەکات و سەرلەنوێ بدرەوشێتەوە لەوپەڕی هێز و چالاکیدا.
دەرئەنجامەکە زۆر سەرنجڕاکێش بوو چونکە ئەو شتەی بەرهەم هات لە کاری ئەم بلیمەتە گەورەیە ئایینێکی جیاکراوە بوو، تاڕادەیەکی زۆر لە هەمووو ئەو پێویستیانەی ئایین کەلەوانەیە مرۆڤ پێشبینی نەکرد بێت کە هیچ ئایینێك بتوانێت بەردەوام بێت، بەبێ ئەوانە ئەم کێشەیە سەرنجڕاکێشە بەڕادەیەك پێویستی بە سەلماندن هەیە:

١-بوزا بانگەوازی بۆ ئایینێك كرد كە خاڵیە لە دەسەڵات، لە دوو لایەنەوە هێرشی كردە سەر دەسەڵات، لەلایەكەوە ویستی قۆرخكاری براهمەكان تێكبشكێنێت لەسەر تێڕوانینە ئایینیەكان كە تا ئەو كاتە جێبەجێیان كردون، بەشێكی زۆری چاكسازیەكەی ئەوەبوو كە ئەو زانستەی كردە موڵكی خەڵك كە موڵكی تایبەتی هەندێك بوو، زانستێك بێت بۆ هەمووو خەڵك بەبێ هیچ جیاوازیەك. لەبارەی بەراوردكردنی لەنێوان ئاشكرایی ئەو و شاردنەوەی براهمەكان بۆ نهێنیەكان وتی (تاساگاتا[18] شتێكی نیە ناوی مستی داخراوی مامۆستا بێت). ئەم جیاوازیەی بە گرنگ دەزانی بەڕادەیەك گەڕایەوە سەری كاتێك لەسەر جێگای مەرگ بوو بۆئەوەی دوپاتی بكاتەوە بۆ شوێنكەوتوانی كاتێك وتی (هیچ شتێكم لێ نەشاردونەتەوە)(١٢).

هێرشی یەكەمی بۆسەر دەسەڵاتی ئایینی بوو، ڕێكخراوی چینی براهمە (پیاوانی ئایینی هیندۆسیەت)ی كردە ئامانج، هێرشی دووەمی ئاڕاستەی تاكەكانی كۆمەڵگە كرد. لەوكاتەدا جەماوەر بەشێوەیەكی نێگەتیڤانە پشتیان دەبەست بە براهمە بۆئەوەی هەواڵیان پێ بدەن بۆئەوەی چ كارێك باشە بیكەن، لێپرسراویەتی كاروانی گەڕانی ئایینی خستە ئەستۆی هەمووو تاكێك و لەم بارەیەوە وتی (ڕازی مەبن بەو شتەی دەیبیستن بە گێڕانەوە. میرات و كەلەپووری ڕابردوو بەبێ پرسیاركردن وەرمەگرن، ڕازی مەبن بە زانیاریەك تەنها بەوەی بوونی هەیە لە كتێبەكانمانـدا لەبەرئـەوەی دەگونجێت لەگەڵ بیروباوەڕمانـدا، هەروەها لە قسەكانی مامۆستاكەتاندا بوونی هەیە. . . . خۆتان ببنە چرای ڕۆشنكەرەوە بۆ خودی خۆتان. . . ئەوانەی ئێستا یان لەپاش مردنم تەنها پشت بە خۆیان دەبەستن و چاوەڕوانی یارمەتیدان نین لە هیچ كەسێكی ترەوە، ئەوانەن كە دەگەنە لوتكەی ڕاستی))(١٣).

٢-هەروەها بوزا بانگەوازی كرد بۆ ئایینێكی خاڵی لە مەڕاسیمە ئایینیەكان، زۆرجار گاڵتەی دەهات بە مەڕاسیمە ورد و تێروتەسەلە بێماناكانی ناو پەرستنی برەهمانیەت، هەروەها بە نزا دوبارەكراوەكان بۆ خوداوەندە بێتواناكان، لێرەدا مەبەست لەو پەیكەر و بتانەیە لە هیندۆسیەتدا دەپەرسترێن. بەبیركردنەوەی ئەو ئەمانە چەند شتێكی ئاڵۆزن بەهیچ جۆرێك پەیوەندیان نیە بە كاری لاوازكردنی منی باڵا و نەهێشتنی خودپەرستی. ((باوەڕهێنان بە سود و كاریگەری مەڕاسیمە ئایینیەكان)) یەكێكە لەو دە بەربەستەی بوزا باسی كردون كە ڕۆحی مرۆڤ كۆت و بەند دەكەن.

بوزا لێرەدا وەك هەمیشە بەتەواوی ڕاستگۆ بوو لەگەڵ خودی خۆیدا، چونكە لەگەڵ بەكەم نرخاندنی بەهای مەڕاسیمەكانی هیندۆسیەتدا بەرەنگاری هەمووو فریودانێك بوویەوە بۆ پێكهێنانی مەڕاسیمی نوێی تایبەت بە ڕێبازەكەی، ئەم ڕاستیە وای لە زۆربەی نوسەران كرد وابیربكەنەوە كە ڕێنماییەكانی تەنها ڕێبازێكی ئاكاری ئەقڵانین نەك ئایینین.

٣-بوزا بانگەوازی كرد بۆ ئایینێكی خاڵی لە تێڕامان و خەمڵاندنە ئەقڵیەكان، چەندین بەڵگەی تۆماركراو هەیە ئەوە دوپاتدەكەنەوە بوزا دەیتوانی ببێتە زانایەكی شارەزا لە بواری میتافیزیكیدا لە سەرتاسەری جیهاندا، ئەگەر هەمووو بیركردنەوەی خۆت تەرخان بكردایە لەم ئاڕاستەیەدا. بەڵام لەبری ئەوە بە ڕاشكاوانە گفتۆگۆكردن لەبارەی میتافیزیكاوە ڕەتبكەیتەوە. بێدەنگبوون لەبارەی ئەم بابەتەوە بەبێ تێبینی كردن تێنەپەڕی، یەكێك لە خوێنكارەكانی وتی: (ئایا جیهان هەمیشەییە یان كاتی؟ ئایا پایاندارە یان بێ پایان؟ ئایا ڕۆح خودی جەستەیە یان نا؟ ئایا بوزا لەپاش مردنی بوونی هەیە یان نا؟ هەمووو ئەم شتانە گەورەم بۆی شینەكردومەتەوە. ئەگەر ڕوونی نەكاتەوە بۆم گرنگ نیە بەلامەوە و دڵخۆشم ناكات و ناگونجێت لەگەڵمدا))(١٤).

---

[18] یەكێكە لە نازناوەكانی بوزا كە بەواتای بەدەستهێنەری ڕاستی دێت

بەڵێ زۆرن ئەو کەسانەی ئەم توێژینەوانە لەگەڵیاندا ناگونجێت. وێڕای نەقیزەدانی بەردەوام کە پاڵی پێوەدەنا بۆ چوونەناو ئەم توێژینەوانە، بوزا بەردەوام بوو لەسەر بێدەنگیەکەی، بیانوە سادە و ئاشکراکەی ئەوەبوو: ((سووربوون لەسەر زانینی ئەم کێشانە هیچ خزمەتێك بە ڕووناکبوونەوە ناکات))(١٥).

بەرنامەکەی پراکتیکی بوو ڕێگەی نەدەدا مەرەکانی لابدەن لە ڕێگای هەوڵ و تێکۆشان، بۆئەوەی لەبری لەوەڕگاکان کە دەرون تێر دەکەن ڕووبکەنە توێژینەوە و تێڕامانە ئەقڵیە بێسودەکان. نمونە بەناوبانگەکەی شیدەکاتەوە لەبارەی ئەو تیرەی کە ژەهراوی کراوە، ئەم خاڵە بەتەواوی، (وەکو ئەم کێشەیە وایە کە مرۆڤێك برینداركراوە لەڕێگەی تیرێکەوە کە ژەهراوی کراوە، لەوکاتەدا هاوەڵەکان و خزم و دۆستانی بەپەلە کەوتنە گەڕان بەدوای برین پێچێکدا تا چارەسەری بکات و لە مەرگ ڕزگاری بکات، لەوکاتەدا ئەو پێی وتن ڕێگەنادەم ئەم تیرە لە جەستەم بهێنرێتە دەرەوە پێش ئەوەی بزانم کێ تێی گرتم؟ ئایا ئەو لە چینی جەنگاوەرانە یان براهمە یان جوتیاران یان چینی دەربەدەرکراوەکانە؟ یان دەڵێت ناهێڵم ئەم تیرە لە جەستەم بهێنرێتەدەرەوە پێش ئەوەی بزانم ناوی خێزانی ئەو کەسە چیە کە تیرەکەی تێگرتم ئایا ئەو کەسە باڵای بەرزە یان کورت یان مامناوەندە؟ ئایا ئەو ڕەش پێستە یان ئەسمەرە یان زەردە؟ ئایا لەم دێیەوە هاتوە یان لە شارەوە؟ یان تەنانەت ئەبێت بزانم ئەو کەوانەی کە تیرەکەی پێهاویشتوە لە چەرم دروستکراوە یان لە ڕووەکی کوداندا؟، ئایا پەتەکەی لە ڕووەکی حەیزەران بووە یان درەختی گوێزی هیندی؟ یان تەنانەت دەبێت بزانم تیرەکە لە ڕووەکێکی کێویە یان ڕووەکێکی چێنراو؟ یان تەنانەت پەڕی بنکەی تیرەکە لە باڵی داڵ وەرگیراوە یان تاووس؟ یان تەنانەت دەبێت بزانم ئایا تیرەکە پێچراوەتەوە بە چەرمی گامێش یان. . . . یان مەیمون؟ یان تەنانەت دەبێ بزانم ئایا تیرەکە تیرێکی ئاسایی بووە یان لە ددانی گۆلك؟. ئەم پیاوە ئەگەر چاوەڕوان بوو هەتا هەمووو ئەو شتانە بزانێت ئەوا دەمرد پێش ئەوەی ڕزگاربکرێت. بەهەمان شێوە زانینی ئەوەی ئایا جیهان کۆتادارە یان ناکۆتایە، ئایا جەستە و ڕۆح دوو شتی جیان، ئایا بوزا دەمێنێتەوە لەدوای مردنی؟ واتە وەك پەیوەندی بە ژیانی ئایینیەوە. مرۆڤ هەست بکات بە سوودی ئەم ڕاستیانە یان پێچەوانەیان، ئەوا پێویستە لەسەری سەرلەنوێ لەدایك بێتەوە، تەمەنی پیری و مەرگ و خەموخەفەت و پەشیمانی. . . لەبەرئەوە نادوێم لەبارەی لەبارەی ئەو کێشانەوە چونکە هیچ یارمەتیدەرنیە بۆ گەیشتن بە ئارامی و دڵنیایی و بۆ ((نیرڤانا)).

ئەو شتە چیە شیمکردەوە؟ من ئازارم شیکردەوە لەگەڵ هۆکارەکەی، ئەو شتە چیە ئازار تێکدەشکێنێت، ئەو ڕێگایە چیە دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئازار بەشێوەیەکی ڕیشەیی، چونکە ئەمە شتێکی بەسوودە. کەواتە ئەی شوێنکەتوانم ئەو شتەی شیمنەکردوەتەوە بە شینەکراوەی دابنێن، ئەوەی شیمکردوەتەوە بەسە. ))(١٦).

٤-بوزا بانگەوازی کرد بۆ ئایینێکی خاڵی لە کلتورە گواستراوەکان tradition. هەر خۆی بە جێگیری وەستا لەسەر لوتکەکانی ڕابردوو، بەڵام ئەو باوەڕی وەهابوو زۆرینەی هاوسەردەمەکانی لەسەر ئەو لوتکە نەبوون بەڵکو لەبەشی خوارەوەی بوون، بەمجۆرە ڕێگەیان بە ڕابردوو دا تا بیان نێژێت. لەبەرئەوە ئەمە شوێنکەتووەکانی هاندا بار و قورساییەکانی ڕابردوو هەڵبگرن. ((دوای ئەو شتە مەکەون کە پێتان دراوە، نەبە سەرچاوەکەی و نەبە ڕێنماییە کلتوریەکانی. کاتێك هەست بە خۆتان دەکەن کە ئەم ڕێنماییانە باش نین، کاتێك بەشێوەیەکی پراکتیکی جێبەجێ کران بوونەهۆی گومڕایی لەبەرئەوە بەبێ هیچ دوودڵیەك ڕەتیان بکەنەوە))(١٧).

یەکێك لە گرنگترین دیمەنەکانی دژایەتیکردنی بۆ شێوازە کلتوریە دێرینەکان و پچڕاندنی هەمووو پەیوەندیەکان پێیانەوە بریتیە لە بڕیاردان بۆ وازهێنان لە بەکارهێنانی زمانی سنسکریتی و پێدانی هەمووو ڕێنماییەکانی بە زمانی زۆرینەی گەلەکەی، ئەمە بڕیارەکەی مارتن لوسەرمان بیردەخاتەوە بۆ وەرگێڕانی کتێبی پیرۆز لە

لاتینیـــــــــــەوە بـــــــــۆ زمـــــــــانی نەتەوەکـــــــــەی کـــــــــە ئەڵمانیـــــــــە.
٥-هەروەها بوزا بانگەوازی کرد بۆ ئایینێك کە پشتدەبەستێت بە هەوڵ و تێکۆشانی خود. لە سەردەمی بوزادا ئامانجمان کرد بۆ ڕۆحی خۆڕاگری و لاوازی شکست خواردن و نائومێدی کە بەربڵاوبوو لە هیندا. زۆربەی خەڵك ڕازی بوون بە سوڕی لەدایکبوون و دوبارە لەدایکبوونەوە کە سوڕێکی بێ پایانە، هەروەك خۆیان ڕاهێنا لەسەر ڕازیبوون بە بڕیاری سەرقاڵبوون بە کارە قورسە هەمیشەییەکانەوە، تەنانەت ئەو کەسانەی هیواخوازبوون بگەنە پلەوپایەی ئازادبوون، خۆیان ڕاهێنا لەسەر خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەو تێگەیشتنەی کە براهمە و دادوەر دەیانپاراست بەوەی ئەم پرۆسەیە هەزاران ژیان دەبات لەڕێگەی کارەماندوکەرەکەیانەوە، ڕێگای پلەبەپلە بۆ گەیشتن بە چینی براهمە یەکەمجار، دواتر ئازادبوون بەجۆرێك ناکرێت بگەیت بە ئازادبوون تەنها بە تێپەڕبوون نەبێت بە چینی براهمەدا! هیچ شتێك بوزای توشی خورپە نەدەکرد، کە وەك ڕێنماییەکی زیانبەخش بیبینێت، بەڵکو ماندووکەرترە لەم بیروباوەڕە. لەبارەی توانای مرۆڤەوە دەڵێت: ((ئەمە ڕێگای کۆتایی هاتنی ئازارە، کەواتە لەسەری بڕۆ))، بەڵکو لەمە زیاتر وای دەبینی پێویستە لەسەر هەمووو تاکێك بۆ خۆی لەسەر ڕێگاکە بڕوات لەڕێگەی وزەکەیەوە و دەست پێشخەریەکەیەوە. ((ئەوانەی تەنها پشت بە خۆیان دەبەستن، چاوەڕێی یارمەتیدان نین لە کەسانی ترەوە ئەوا دەگەنە بەرزترین لوتکە))(١٨).
هیچ خوداوەندێك نیە کە مرۆڤ بتوانێت پشتی پێ ببەستێت (ئەمە بەپێی بیروباوەڕی بوزییەت)، تەنانەت ناکرێت پشت ببەسترێت بە خودی بوزا. لەڕاستیدا بە قوتابیەکانی وت: ((کاتێك دەڕۆم خۆتان ماندوو مەکەن بە نزاکردن و سەڵەوات دان لەسەرم، چونکە کاتێك دەڕۆم بە ڕاستی ڕۆیشتوم. بوزا کاری کرد لەسەر ڕونکردنەوەی ڕێگاکە، کار بکە بۆ ڕزگاربوونت بە هەمووو تواناکەتەوە))(١٩).
هەروەك بوزا ڕازی نەبوو بەو بیرۆکەیەی تەنها براهمە لێهاتون بۆ گەیشتن بە پلەوپایەی ڕوناکبوونەوە. بەڵکو دوپاتیدەکردەوە بۆ شوێنکەوتوانی: ((لە هەر چینێك بیت دەتوانیت بگەیت بە ڕوناکبوونەوە لە هەمان ماوەی ئەم ژیانەتدا)) ((لێگەڕێ با پیاوێکی زیرەك، ڕاستگۆ، شەرەفمەند، دڵسۆز، ڕاسترەو بێتەلام فێری دەکەم. . . ئەگەر بەشێوەیەکی پراکتیکی بەتەواوی ئەوەی جێبەجێکرد کە فێری بووە ئەوا بۆ خۆی دەگات بە دەرکپێکردن بەم ئایینە شکۆدارە)).
٦-بوزا بانگەوازی کرد بۆ ئایینێکی خاڵی لە هێزەکانی سەروو توانای مرۆیی. هەمووو شێوازەکانی پێشبینیکردنی ڕەتکردەوە. ڕێگەی نەدەدا بە شوێنکەوتوانی تەنانەت بیربکەنەوە بە هەبوونی شێوەیەك لە شێوەکانی هێزی سەروو توانای مرۆیی. ((بەم جۆرە دەزانن هەر یەکێکتان هەوڵ بدات کارێکی نائاسایی یان بیەوێت موعجیزەیەك ئەنجام بدات ئەوا لە قوتابیانی من نیە)). چونکە ڕۆیشتن بەرەو ئەو هێزەی لەسەروو توانای مرۆڤەوەیە و پشتبەستن پێی وەك ڕێگای کورتکراوە هیچ سود ناگەیەنێت بە مرۆڤ بەڵکو لە ڕێگە لای دەدات و لە هەستان بە ئەرکەکەی دوای دەخات. ((چونکە من شتی مەترسیدارم دیوە لە ئەنجامدانی شتی سەرسوڕهێنەر و نائاسایی، لەبەرئەوە قێزەون دێتە پێشچاوم)).
ئایا ئایینی بوزا وەك زانیمان بەبێ دەسەڵاتی ڕۆحی و بێ مەڕاسیم و بێ بیروباوەڕی ئایینی و بێ میرات و کەلەپورە، بەبێ پشتبەستن بە بەخشینی یەزدانی و بەبێ موعجیزەیە کەواتە ئایینێکە بەبێ یەزدان؟ ئەمە پرسیارێکە گرنگیەگی گەوهەری هەیە پێویستە وەڵامەکەی هەڵبگرین بۆ دواتر.
هەتا بوزا زیندوو بوو بۆخۆی ئایینەکەی بەڕێوە دەبرد، پێداویستیەکانی ئایین لە ئایینەکەیدا نەبوون. بەڵام گەڕانەوە بۆ ناو ئایینەکەی لەدوای مردنی بەخێراییەکی پێشبینینەکراو بوو، زۆر بەتوندی لە ئەنجامدا بوزییەتە

ڕاستەقینەکە نمونەیەك و شایەتێکمان پێ دەدات کە بەنرخ ناخەملێنرێت، ئایینێکی ناوازەیە، لەبەرئەوەی هەموو شایەتێکی نوێ لەسەر ئەو شێوانەی کە دەکرێت ئایین وەریانبگرێت، تێگەیشتنمان قووڵتر دەکات بۆ ڕاستــــــــــــتی گەوهــــــــــــــەری و ماهیــــــــــــــــەتی ئــــــــــــایین.
دەکرێت بەرنامەی ئایینی بوزا کورتبکەینەوە لەم چەند خاڵەدا:
بەرنامەیەکی ئەزمونی بوو. هیچ ئایینێك تا ئەو کاتە بەوجۆرە ڕێکخراو و تەواو نەبوو، بانگەوازەکەی بۆ تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ڕاستەوخۆ بوو. ئەزمونێکی تایبەتی ڕاستەوخۆ بوو ئەویش دوا تاقیکردنەوە بوو بۆ ڕاست و دروستی هەر کێشەیەك ((پشت مەبەستن بە ڕاستی تەنها بەبیرکردنەوەی ئەقڵی و بە خەملاندن، تەنانەت بە بوونی بەڵگە))(٢٠). پێویستە لەسەر خوێندکاری ڕاستەقینە ((بۆخۆی تامی ڕاستی بکات و بیناسێتەوە)).
بەرنامەیەکی پراکتیکی بوو. چۆنیەتی تاقیکردنەوەکەی کردە دوا ئەزمون، ئاگایی خۆی ئاڕاستەکرد بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان هۆکار و دەرئەنجامدا کە کاردەکاتە سەر چۆنیەتی ئەو تاقیکردنەوەیە. ((ئەم فرمانە لە ئێستادایە، ئەم شتە ڕوودەدات. ئەم فرمانە لە ئێستادا نیە کەواتە ئەم شتە ڕوونادات)) کەواتە هیچ شوێنەوارێك بوونی نیە بەبێ کارتێکەر و دەرئەنجامێك بەبێ هۆکار(٢١).
بەرنامەیەکی پراگماتی کرداری بوو، ئەگەر ویستت جیای بکەیتەوە لەو کردارانەی گرنگی دەدەن بە کێشە مادیەکان وەکو گەڕان لە قووڵاییەکانی زەویدا یان بنیاتنانی پردەکان، بەڵام بەشێوەیەکی کرداری دەمێنێتێتەوە، چونکە بەرنامەی ئایینەکەی تەنها گرنگی دەدات بە چارەسەرکردنی کێشەکان، ئەوە ڕەتدەکاتەوە کەلە ڕێگە لابدات بەرەو تێڕامانە ئەقڵیەکان. بوزا هەمووو ئاگایی خۆی چڕکردەوە لەسەر ئەو کێشانەی توشی ئادەمیزاد دەبن کە پێویستیان بە چارەسەری خێرا هەیە. ڕێنماییەکانی هیچ بەهایەکیان نیە جگەلەوەی سودیان هەیە و هیچی تر، ڕێنماییەکانی وەك بەلەمێك وان بەسودن بۆ پەڕینەوە لە ڕووبارەکە، لەدوای گەیشتن بە ئەوبەری ڕووبارەکە هیچ بەهایەکی نامێنێت. بەرنامەیەکی چارەسەری بوو. دەکرێت ڕستە ناسراوەکەی باستور: ((لەبارەی ڕاکانت و ئایینەکەتەوە پرسیارت لێ ناکەم، بەڵام تەنها لێت دەپرسم چی ئازارت دەدات؟)) ببێتە ڕستەیەکی بوزا. کاتێك وتی: ((من تاکە شتێك دەزانم ئەویش ئازار و کۆتایی هێنانە بە ئازار، ئەوەی ڕوونیدەکەمەوە هیچ نیە جگەلە نەخۆشیەك و ڕێگای کۆتایی هێنان بەم نەخۆشیە))(٢٢).
بەرنامەیەکی دەروونناسی بوو، لێرەدا مەبەست لە زانستی دەروونناسی هێزی سەروو سروشتە (میتافیزیکی). لەبری دەست پێکردن بە گەردون و کۆتایی هێنان بە جێگای مرۆڤ تیایدا، بوزا بەشێوەیەکی جێگیر دەستپێدەکات نەك بە مرۆڤ و کێشەکانی و سروشتی و هێزە بزوێنەرەکانی پەرەسەندنی.
بەرنامەیەکی دیموکراتی بوو. لەو سەردەمەدا هێرشی کردە سەر سیستمی چینایەتی هیند بە ڕوانینێکی کراوەی کەم وێنەوە، بەتایبەتی کێشەی بانگەشەکردنی ئەو سیستمە بۆئەوەی تەنها ئەو شایەنی ئەوەیە بە میراتی بگوازرێتەوە. بوزا لەدایکبوو لە چینی کشتریا واتە جەنگاوەران و فەرمانڕەوایان بەڵام لەگەڵ ئەوەدا خۆی بینیەوە وەك براهمانیەك، بەم کارەی دیواری چینەکەی تێکشکاند، ڕێگاکەی کردەوە بۆ هەمووو تاکەکانی کۆمەڵگە بە چاوپۆشیکردن لەوەی سەر بە کام چینەن.
بەرنامەکەی ئاڕاستەکراوبوو بەرەو تاکەکان وەکو تاك. بوزا نەزان نەبوو بە سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ، بەتەنها برایەتی ڕاهیبەکانی دانەمەزراند بەڵکو جەختی کردەوە لەسەر گرنگی پەیوەندیکردن پێوەی وەك کەرەستەیەکی یارمەتیدەر بۆ پێشکەوتنی ڕۆحی. هەمووو ئەم شتانە قەدەغە ناکات کە بانگەوازەکەی لە کۆتاییدا ئاڕاستەی

**تاکەکان کرابوو.  هەمووو تاکێك پێویستە لەسەری بۆ خۆی ڕێگاکەی بدۆزێتەوە بەرەو ڕوناکبوونەوە، بە نهێنی و بێدەنگی، هەروەها خۆی ڕووبەڕووی کێشە تایبەتیەکانی ببێتەوە.**

**((لەبەرئەوە ئەی ئاناندا، ببە بە چرایەکی ڕوناك کەرەوە بۆ خۆت.  ببە بە تەناگەیەك بۆ خۆت.  پەنا مەبە بۆ هیچ پەناگەیەکی تر لەدەرەوەی خۆت، پشت بە ڕاستی ببەستە وەك پەناگەیەك.  بەوپەڕی تواناتەوە هەوڵبدە و تێبکۆشە بۆ ڕزگاربوونت)).**

## چوار ڕاستیە شکۆدارەکە

دواجار بوزا توانی ئەو مەستیە تێپەڕێنێت کە بەبێجووڵە هێشتبوویەوە لە پەڵە جێگیرەکەدا کە بۆ ماوەی چل و نۆ ڕۆژ لەدوای ڕوناکبوونەوەی، هەستا و دەستیکرد بە گەشتەکەی بە پێیەکانی بۆ دووری زیاتر لە سەد میل بە ئاڕاستەی شارە پیرۆزەکەی هیند بنارس. پێش ئەوەی بگات بەم شارە ڕاوەستا لە باخچەی ئاسکەکان لە سارنس sarneth بۆئەوەی یەکەمین ووتاری خۆی بڵێت. ژمارەی باوەڕدارەکان لەو شوێنەدا کەم بوون تەنها پێنج کەس بوون، لەو کەسانەی بەشداربوون لەگەڵیدا لە وەرزشە سۆفیگەریەکەیدا، بەڵام بەتوڕەییەوە وازیان لێهێنا لەگەڵ ئەوەدا کاتێك وازی هێنا لە شوێنکەوتوانی ئەو بەرنامەیە بۆ گەیشتن بە ڕووناکبوونەوە، بۆئەوەی ئێستا ببنە یەکەمین قوتابی بوزا. بابەتی یەکەمین وتاری کە چوار ڕاستیە شکۆدارەکە بوو، کە یەکەمین ووتاری فەرمی بوو لەدوای بەئاگاهاتنەوەیەوە، کاتێك گرنگترین دۆزینەوەکانی ڕاگەیاند کە پێی گەیشتبوو لە لوتکەی گەڕان بەدوای ڕاستیدا، کە شەش ساڵ بەردەوام بوو.

زۆربەی خەڵك ئەگەر داوایان لێکرا گرنگترین قایلبوونیان ئامادەبکەن لەبارەی ژیانەوە، خۆیان لە شڵەژانێکی گەورەدا دەبیننەوە بەچی وەڵام بدەنەوە؟ چوار ڕاستیە شکۆدارەکەی بوزا بەتەواوی هەوڵدانیەتی بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە. ئەم چوار ڕاستیە پێکەوە تەوەری سیستمەکەی پێکدەهێنن، بنەمای سەرەکی کە هەموو بنەماکانی تری لێوە پێکدێت. یەکەمین ڕاستی لە چوار ڕاستیەکە بریتیەلەوەی ژیان دوکهایە dukkah ئەمە وشەیەکی سنسکریتیە بەمانای ئازارچەشتن suffering دێت. وێڕای ئەوەی وشەی ئازار بەتەنها زۆر دوورە لە پێدانی واتای تەواو بە وشەی دوکها بەڵام بەشێکی گرنگی پێکدەهێنێت، شایەنی ئەوەیە کەمێك سەرنجی بدەین پێش ئەوەی بچینەسەر واتاکانی تری وشەی دوکها. بەپێچەوانەی ڕای زۆربەی توێژەرەوەکانەوە، فەلسەفەی بوزا لە بنەڕەتدا ڕەشبینانە نەبووە، دەکرێت ئەو باسەی پێشکەشی دەکات چاودێری حاڵەتی ئێستای مرۆڤ دەکات کە زاڵمانە بێت بەڵام بابەتی ڕەشبینی دەرناکەوێت تەنها کاتێك نەبێت دەست بە قسەکردن دەکات لەبارەی ئەوەی ئایا دەکرێت ئەم بار و هەلومەرجە چاك بکرێت یان نا. باوەڕی بوزا بە چاککردنی ئەم بارە، هەرئەمەیە والە فەلسەفەکەی دەکات پاڵپشتی لە تێبینیەکەی زیمەر zimmer بکات بەوەی ((هەمووو ئەوەی لە فیکری هیندیدا هەیە پاڵپشتی دەکات لە بینینی سەرەکی بۆئەوەی هەمووو شتێك باشە. هیوایەکی شکۆدار هەمووو شوێنێکی گرتوەتەوە)). بوزا هەمووو ژیانی سەرف کردبوو بۆئەوەی بۆ خەڵکی بسەلمێنێت چۆن دەکرێت بگەین بە شادومانی، بەڵگەیەکی تر لەسەر پاراستنی بە هیوا بوونی لەبەردەم زیاترین دانپیانانە ناڕۆمانسیەکانیدا بۆئەوەی کاروباری خەڵك لە خراپترین و ناتەواوترین باردایە، حاڵەتی دڵتەنگیەکی لەڕادەبەدەرە زۆر نزیکە لەوەی ببێتە تێکچوونێکی تەواو. بوزا گومانی لەوە نەبوو دەشێت مرۆڤ چەند کاتێکی خۆشی هەبێت لە ژیانیدا، هەبوونی کاتی خۆشی شتێکی چێژبەخشە. بەڵام لێرەدا دوو پرسیار هەیە. یەکەم لەڕاستیدا ژیان چەندی دڵخۆشکەرە؟ دووەم: ڕووکاری ئەم شادومانیە چیە کاتێك هەستی پێدەکەین؟ بە تێڕوانینی بوزا ئاستی ئەم هەست پێکردنە زۆر کەمە لەوانەیە بەس بێت بۆ گیانداران بەڵام بۆ مرۆڤ بۆشاییەکی گەورە جێدەهێڵێت و وای لێدەکات هەست بە نائومێدی بکات. بەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ ئەم کێشەیە تەنانەت چێژ هیچ نیە جگەلە ئازارێکی ڕوپۆشکراو بە پۆشاکێکی ئاڵتونی فریودەرەوە. هەروەك دراموند drummond نوسیویەتی: ((خۆشترین چێژبەخشەکانی ژیان هیچ نیە جگەلە ئازارێکی دەمامکدار))، لەکاتێکدا شیلی shelly دەدوێت لەبارەیەوە کە ((ئەو دڵەڕاوکێیەی خەڵك بە هەڵە ناوی دەبەن بە شادومانی لەڕادەبەدەر!)). لەژێر درەوشانەوەی گازی نیۆندا تاریکی خۆی حەشارداوە. لە کرۆکی ژیانی مرۆییدا نەك

کرۆکی ڕاستی دڵتەنگی خۆی حەشارداوە. ئەمە هۆکاری هەوڵدانمانە کە بە بەردەوامی خۆمان سەرقاڵ بکەین بەو هەوڵدانانەی زوو لادەچن، چونکە خۆ سەرقاڵکردن لەڕاستیدا بریتیە لەوەی مرۆڤ تاریکی لەبیربکات بۆ ماوەیەکی درێژ بەڵام هەر دەمێنێتەوە و گوشار دێنێت بۆ دڵخۆشیەکەیان. سەیرە! با چۆنە؟ ژیانی مرۆیی بەهەمان شێوە فانیە: هاوار، گریان، تووڕەیی، ماندوبوونە(٢٣). بڕیاردانمان لەسەر هەڵسەنگاندنی ژیانی مرۆیی بەشێوەیەکی ڕاستەقینەیە نەک نەخۆشانە، زۆربەی بیریارەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە کە سەر بە چەندین ڕێبازی فەلسەفی جیاوازن. وجودیەکان existentialists بەجۆرێک باس لە ژیان دەکەن هەوەس و ئارەزوویەکی بێسوودە هەروەها زیاد لە پێویست بێمانایە. فەیلەسوفی زانستی مرۆیی بێرتراند روسێل bertrand russel قورسیەک دەبینێت لە تێگەیشتن لەو هۆکارەی مرۆڤ توشی دڵتەنگی دەکات هەروەک ((تێناگات لەوەی بۆچی لەوکاتەی دەکرێت پرۆسەیەکی بێزراو بەکەم سەیر بکرێت کاتێک کە بۆ ناکۆتا دوبارە دەبێتەوە!)). شیعر وەک یەکێک لە پێوەرەکان دادەنرێت لە ڕۆح و هەستەکانی مرۆڤدا. بوزا هیچ شتێکی زیاتری نەوتوە لەوەی ڕۆبەرت پێن وارین robert penn warren ی شاعیر وتویەتی: ((ئەمە ڕاستیە، ئەمە تاکە شتە ڕاست بێت ئازارچەشتن، کەواتە لێگەڕێن با ڕاستی بخەینەڕوو وەک پیاو لەدایک دەبین بۆ شادومانی و خۆشی، بۆئەوەی چێژ ببێتە ئازار لەدایک دەبین بۆ هیوا، بۆئەوەی هیوا ببێتە ئازار لەدایک دەبین بۆ خۆشەویستی، بۆئەوەی خۆشەویستی ببێتە ئازار لەدایک دەبین بۆ ئازار، بۆئەوەی ئازار زیاتر بێت لەم هەڵقوڵانە لەڕادەبەدەرە کە بەرەو کەمبوون ناچێت دەتوانین وشەی ئازار بدەینە ئەوانی تر وەک یەکەمین پێناسەمان))(٢٤). تەنانەت ئەلبێرت شویترز albert schwietzer کە زۆرجار هیندی تاوانبارکرد بە ڕەشبینی، سەدای هەڵسەنگاندنی بوزای دوبارەکردەوە بۆ ژیان بەهەمان دەستەواژەکانی کاتێک ووتی: ((تەنها چەند ساتێکی دەگمەن هەیە هەست بە شادومانی دەکەم لەبەرئەوەی زیندووم. تەنها دەتوانم هەست بە دڵتەنگی بکەم بەهەمووو ئەو ئازارانەی کە دەیانبینم لە دەوری خۆم، تەنها ئازاری مرۆڤ نەبێت، بەڵکو ئازارەکانی هەمووو بوونەوەران)).

کەواتە دوکها dukkha بەواتای ئازارچەشتن دێت لە ئاستێکی دیاریکراودا لە بوونی بێ پایان.

ماناکان پۆزەتیڤانەتر دەردەکەون بۆ ئەم وشەیە کاتێک هەست بەوە دەکەین بەکاردەهێنرێت لە زمانی پالی pali دا بۆ قسەکردن لەبارەی ئەو ڕەوڕەوەیەی کە دەرچوە لە ناوەندەکەی، بەهەمان شێوە بۆ قسەکردن لەبارەی ئەو ئێسکەی دەرچووە لە شوێنەکەی. وێنەکە ڕوونە لە هەردوو حاڵەتەکەدا. بۆئەوەی تێبگەین لە مانای چوار ڕاستیە شکۆدارەکە پێویستە بەمشێوەیە بیخوێنینەوە: ژیان بەپێی ئەو شێوەیەی وەریگرتوە هەڵکەندراوە لە شوێنەکەی. شتێکی هەڵە ڕوویداوە. لە جومگەکەی دەرچووە. دواتر کاتێک تەوەری ڕەوڕەوەکەی وەک تەوەرێکی ڕاستەقینە نەماوە ئەوا حاڵەتەکەی لێکخشانی لەڕادەبەدەر (ململانێی ناوەکی) لەخۆدەگرێت لەگەڵ جوڵەی پەککەوتە و ئازارچەشتن. بوزا ڕازی نەبوو بە وازهێنان لە یەکەمین ڕاستی شکۆدار بەشێوە گشتیەکەی، بەڵکو بەردەوام بوو لە ئاشکراکردنی زانیاریەکان لەڕێگەی بیرهێنانەوەیان لەو حاڵەتانەی تیایدا لەشوێن دەرچوونی ژیان لە جێگا ڕاستەقینەکەی بەئازارە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا، چ خاوەنەکەی دەوڵەمەند بێت یان هەژار، ئاسایی بێت یان لێهاتوو و شارەزا، هەمووو ژیانێک دەبێتە ئامانج بۆ:

١-خورپەی لەدایکبوون: توێژەرە دەرونیەکان لەم سەردەمەدا هەستاون بە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ لەم کێشەیەدا. وێڕای ئەوەی فرۆید ئەوە ڕەتدەکاتەوە خورپەی لەدایکبوون کانگای هەمووو دڵەڕاوکێیەک بێت لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵام لەکۆتاییدا بە نمونەیەکی سەرەتایی بۆ دڵەڕاوکێ داینا. ((ئەزمونی لەدایکبوون زنجیرەیەک لە هەستی بەئازار لەخۆدەگرێت لە دەردان و خرۆشان، هەست پێکردنە جەستەییەکان، لەوکاتەوە بووە

**نمونەیەکی ڕاستەقینە بۆ هەمووو حاڵەتەکان کە دواتر تیایدا ژیان لەژێر هەڕەشەدایە، بەوەی هەمان ئەم هەست پێکردنە بەئازارانە دەردەکەونەوە لەوێنەی ترس و تۆقان و دڵەڕاوکێدا))(٢٥). لە باشترین حاڵەتەکاندا فڕێدانە دەرەوەی مناڵدان بە خورپە دادەنرێت، ئەگەر بەوجۆرە نەبێت بۆچی یەکەمین وەڵامدانەوەی منداڵی تازە لەدایکبوو گریانە؟ لە خراپترین حاڵەتەکاندا دەکرێت ئەزمونی لەدایکبوون هێندە دڵڕەقانە بێت کە ژیانی منداڵ فڕێدەداتە دەرەوەی هاوسەنگیەوە، بۆ هەمیشە بەجۆرێك لە ژیاندا دەڕوات وەکو کەشتیەکی ناهاوسەنگ بەهۆی بوونی کونێك لەیەکێك لە لاکانیەوە.**

**٢-نیشانەکانی نەخۆشی جەستەیی.**

**٣-نەخۆشیەکانی لاوازبوون بەهۆی پیری و بەساڵاچوونەوە. لە سەرەتای ڕۆژەکانی فڕینەوە، فڕینی فڕۆکە ئاسانترە لە نیشتنەوەی لەسەر زەوی، کاری سەرنجڕاکێش نیشتنەوەی سەلامەتە. ئەم کارە هیچ جیاواز نیە لەلای مرۆڤ. چالاکی جەستە بەسە بۆئەوەی ساڵەکانی سەرەتای ژیانی مرۆڤ جوان دەربکەون، بەڵام مەترسیەکان دەست دەکەن بە دەرکەوتن لە ساڵەکانی دواتردا. ترسان لەوەی مرۆڤ نەخوازراو بێت یان خۆشەویست نەبێت، ترسان لە پشتبەستن بە پارە و دارایی، ترسان لە نەخۆشی درێژخایەن، ترسان لەوەی مرۆڤ بێزراو بێت لەلایەنی جەستەییەوە، ترسان لەوەی مرۆڤ ببێتە شتێکی هەراسانکەر، یان ببێتە سەرچاوەی دڵەڕاوکێ، یان ببێتە بار بەسەر ئەوانی ترەوە. میانخولیا melancholia[19] پیری هیچ نیە جگەلە حاڵەتی کێشەیەکی گشتی کەلەم سەردەمەدا زانستێکی نوێ دانراوە بە ناوی زانستی پیریەوە gerontology.**

**٤-ترسان لە مەرگ (یان فۆبیا phobia واتە ترسان لە مردن). پزیشکی دەروونناس کارل ج. جانگ carl. G. jang بە پشت بەستن بە چەندین ساڵ لە کارکردن لە بواری پزیشکیدا، ئەو مەرگی بینیوە وەك قووڵترین ترس لەلای هەمووو نەخۆشەکان، ئەوانەی تەمەنیان لەسەروو چل ساڵەوەیە، ئەوانەی شیکاری دەرونیان بۆ کراوە. وجودیە هاوچەرخەکان هاوڕان لەسەرئەوەی ترسان لە مەرگ، ژیان توشی ئیفلیجی دەکات.**

**٥-بەوەی مرۆڤ خۆی ببینێتەوە کە وابەستەیە بەو شتەی ڕقی لێیەتی. هەندێك جار دەکرێت پەیوەندی خۆی بپچڕێنێت بەو شتەوە، هەندێکجار لەدەرەوەی توانای ئەودا دەبێت. وەکو نەخۆشیەك قابیلی چارەسەرکردن نیە و لەگەڵیدا دەمێنێتەوە، یان لاوازیەکی تایبەت بە کەسێکەوە کە لابردنی ئەستەمە. . . چەندین جۆری ئەشکەنجەدانی دەروونی و جەستەیی هەیە کۆت و بەندمان دەکات بەدرێژایی ژیان.**

**٦-مرۆڤ جودابکرێتەوە لەو کەسانەی کە خۆشی دەوێن، یان دابڕاندنی لەو شتانەی کە خۆشی دەوێن. کەمن ئەو کەسانەی نکوڵی دەکەن لەوەی ژیان بەرتەسك دەبێتەوە لەسەر مرۆڤ بەشێوەیەکی ئازاربەخش لەم شەش بابەتەدا.**

**یەکەمین ڕاستی شکۆدار ئەو شەش ئازارە کۆدەکاتەوە بۆئەوەی بگات بە دەرئەنجامێك لەسەرئەوەی سکاندات skandas ( پێنج توخم و پێکهێنەرە ئازاردەرەکانی ژیان). پێنج سکانداتەکە بریتین لە جەستە، هەستەکان، بیرکردنەوەکان، ئاگایی، نەستەکان، بەکورتی هەمووو ئەمانە ژیانی مرۆیی پێکدەهێنن.**

**وتارەکەی بوزا ئەوە دەخاتەڕوو ژیان بەگشتی لە ئازار و ئەشکەنجە پێکدێت. ژیان دوورە و لە ڕاستی جیابووەتەوە، لەنێوان ئەو و ڕاستیدا کەلێنێك هەیە کە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم بەدەستهێنانی شادومانی ڕاستەقینەدا، کە ناتوانرێت پێی بگەین تەنها بە پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە نەبێت.**

---

**[19] میلانخولیا melancholia نەخۆشیەکی دەرونیە کەسی نەخۆش زۆر ڕەشبینانە دەڕوانێتە ژیان و تەنانەت ڕقی لە خودی خۆیەتی، مرۆڤ توشی ئەم نەخۆشیە دەبێت لە سەرئەنجامی لەدەستدانی شتێکی بەنرخ لەلای لە ژیانیدا یان شکستهێنانی لە بەدیهێنانی ئارەزویەکیدا.**

بەڵام پێش ئەوەی ئەم لەیەکتر دورکەوتنەوەیە چارەسەر بکەین پێویستە هۆکارەکەی بزانین، ئەمە ئەو شتەیە کە دووەم ڕاستی شکۆدار لەبارەیەوە دەدوێت. بوزا دەڵێت: هۆکاری لاچونی ژیان لە شوێنە ڕاستەقینەکەی شتێکە کەناوی دەبات بە تنها tanha. زۆربەی کات وشەی تنها وەردەگێڕدرێت بە ئارەزوو desire. ئەم وەرگێڕانە بۆ ئەم وشەیە بە نزیك کراوەیی دادەنرێت، ئەم واتایە بەرەوڕووی دەبینەوە لە شانۆگەری (ماڵی هاڕڕاوەی دڵدا) کە تیایدا جۆرج برناردشو george bernard shaw واله کەسایەتی ئیللی ellie دەکات بڵێت: ((ئێستا هەست بەوە دەکەم شتێك نیە کە نەتوانم ئەنجامی بدەم، لەبەرئەوەی هیچ شتێکم ناوێت!)) بەم وتانەی والە کابتن شوتوفەر chtover دەکات و هاوار بکات و بڵێت: ((ئەمە تاکە هێزی ڕاستەقینەی ڕاستیە، ئەمە بلیمەتی و لێهاتوییە. ئەمە سەیرترە لە سەیر)). بەڵام ئەگەر هەوڵماندا واتای تنها ببێتە ئارەزوو بەتەواوی ئەوا دەکەوینە کێشەوە. یەکەم شت ئەگەر تنهامان وەرگێڕا بۆ ئارەزوو ئەوا دووەم ڕاستی شکۆداری بوزا شایەنی جێبەجێکردن نابێت، چونکە وازهێنان لە هەموو ئارەزویەك هەرچیەك بێت بەشێوەیەکی گشتی واتاکەی مەرگە، مەرگ نابێتە چارەسازی کێشەی ژیان. لەڕاستیدا وێڕای بێ توانایی بۆ جێبەجێکردنی ئەمە، وەرگێڕانەکە هەڵەیە چونکە هەندێك ئارەزو هەیە بوزا لایەنگیریان لێ دەکات بەشێوەیەکی ئاشکرا وەکو ئارەزووی ئازادبوون بۆ نمونە، یان ئارەزووی چاکەخواستن بۆ بوونەوەرەکانی تر. تەنها جۆرێکی تایبەتە لە ئارەزوو. ئارەزووی تێرکردنی مرۆڤە بۆ خودی تایبەت بە خۆی. ئارەزووی جودابوونەوەیە لە ژیان، گەڕان بەدوای تێربووندا لەنێو ئەو پارچەیەی بووندا کە گەمارۆدراوە لەناو ئەو شوشەیەی ناوی دەنێین خودی تاك. کاتێك خودپەرست نین ئازادین، بەڵام لێرەدا ئاستەنگێك هەیە ئەویش پاراستنی ئەم حاڵەتەیە لە (خۆنەویستی). تنها ئەو هێزەیە کە حاڵەتی (خۆنەویستی) تێکدەشکێنێت، دوورمان دەخاتەوە لە ئازادبوون لە هەموو ئارەزوویەك، بابگەڕێینەوە سەر ئەوەی کە کۆیلەی ئارەزوەکانمان بین، تنها بریتیە لە ئارەزووی تێرکردنێکی تایبەت ((منی باڵایە کە دەکولێتەوە وەك برینی گەدە)). تنها پێکدێت لە ((هەموو ئەو مەیلانەی کە هەوڵدەدەن بۆ بەردەوامی جودابوونەوە یان زیادکردنی، واتە تەرخانکردنی بوونی جودای خاوەنی ئەم ئارەزووە کەلە ڕاستیدا گەوهەرەکەی ئارەووە بۆ خود، ئەگەر چی لەسەر باری هەموو شێوازەکانی تری ژیانە، کاتێك ئەمە پێویست بێت. کاتێك تاکە یەکەیەکە ئەوا هەموو هەوڵدانێك بۆ جوداکردنەوەی تاکە دیمەنێکی ژیانە لەوانی تر، گومانی تیا نیە دەبێتە هۆی ئازار بۆ یەکەی هەوڵدەر بۆ جودابوونەوە کە کار دەکات دژ بە یاسا تەنانەت ئەگەر بێ ئاگا بێت. ئەرکی مرۆڤ بەرامبەر بە براکانی بریتیە لەوەی تێبگات کە ئەوان درێژکراوەی ئەون، دیمەنەکانی تری خودی ئەون، پێویستە لەسەری دەرك بەوە بکەن کە براکانی دیوەکانی تری دەرونی ڕاستەقینەیەتی)). (٢٦) ئەمە هەست پێکردنێکی تاڕادەیەك دوورە لەو ڕێگایەی کە خەڵك تێدەگەن لە براکانیان لە مرۆڤایەتیدا. تێڕوانینی مرۆڤی ئاسایی دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەو ڕێگایەی ئیبسین ibsen باسی کردوە وەك ئەو پەناگەیەی ((هەموو تاکێك تێیدا بەند دەکرێت لەناو بەرمیلی منی باڵادا، سەری دادەپۆشێت بە خود، بەرمیلەکە دەخاتە ناو ژێر زەمینی دەرون بۆ تکا و پاڕانەوە)). ئەگەر ویستمان وێنەیەکی بەکۆمەڵبین بۆ چەند تاکێك، ئەوا هەموو تاکێکیان گرنگی دەدات بە چۆنیەتی دەرکەوتنی لە وێنەکەدا لەپێش ئەوەی گرنگی بدات بە جوانی وێنەکە بە گشتی. لەوانەیە ئەم خاڵە کەم گرنگ بێت بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نیشانەیەکە لە نیشانەکانی ئەو شێرپەنجە لەناوبەرە کە لە ڕەگ و ڕیشەی دڵتەنگی و ئازارەکانماندا حەشاردراوە. کوا ئەو پیاوەی گرنگی بەوە دەدات کە هیچ مرۆڤێك برسی نەبێت بەو ڕادەیەی گرنگی دەدات بەوەی منداڵەکانی خۆی برسیان نەبێت؟ بەڕاستی دەگمەنن ئەو کەسانەی گرنگی دەدەن بە بەرزبوونەوەی ئاستی ژیان بەگشتی زیاتر لە گرنگیدانیان بە زۆربوونی

موچەکەیان یان داهاتی تایبەتیان. لێرەدا بوزا دەڵێت ئەمە بەتەواوی هۆکاری ئازارەکانمانە، چونکە لەبری ئەوەی متمانە و خۆشەویستی و چارەنوسمان ببەستینەوە بە ئەزەلەوە با پێداگری بکەین لەسەر بەستنەوەی بە گوێدرێژێکی بچووکی لاواز کە بریتیە لە دەرونی جودامان، کە بەبێ دوودڵی دەرك بەوەدەکەین کە تێکدەشکێت و بۆ هەمیشە چاوتروکانێکدا لەبەر چاومان نامێنێت. ئێمە بە بەرز ڕاگرتنی منی باڵا superego یەکەمین شت خۆمان بەند دەکەین لەناویدا و دواتر هەوڵدەدەین بۆ ڕازیکردن و تێرکردنی لەڕێگەی بەهێزکردنی منی باڵا و فراوانکردنیەوە. ((ئەمە بێ مێشکی و شێتیە کە وابهێنینە پێشچاومان کە بەندکردن بریتیە لە ئازادبوون! ئایا ناکرێت تێبینی ئەوە بکەین کە ئازارمان پێدەگات لە هەمان ئەو دەروونەوە؟)). زۆر دوورە لەوەی ببێتە دەرگایەك بۆ ژیانی لێوان لێو لە شادومانی. دەروون واتە منی باڵا پێکدێت لە کەلێنێکی تەسکەوە، هەرچەندە بئاوسێت بەرتەسکتر دەبێتەوە لەسەر سوڕانی خوێن کە تەندروستی مرۆڤ پشتی پێدەبەستێت واتە بەرتەسکبوونەوەی بەزەیی بەئاڕاستەی ژیان بەمجۆرە ئازارەکە زیاددەکات. سێیەمین ڕاستی شکۆدار بەشێوەیەکی لۆژیکی بەدوای ڕاستی دووەمدا دێت. ئەگەر هۆکاری لەشوێن دەرچوونی ژیان ((ئارەزوو و خۆویستی)) بێت ئەوا چارەسەری لە زاڵبووندایە بەسەر ئەو ئارەزوە خۆویستانەدا. ئەگەر توانیمان دەربازبین لە سنورە بەرتەسکەکانی پەرژەوەندیە تایبەتەکانمان بۆئەوەی بچینە ناو جیهانی ژیانی گەردونی فراوانەوە ئەوا ڕزگارمان دەبێت لە ئازارەکانمان. چوارەم ڕاستی شکۆدار ئاماژە دەکات بۆئەوەی چۆن ئەم چارەسەرە جێبەجێ دەکرێت. زاڵبوون بەسەر تنهادا واتە بەسەر ئارەزوو و خۆویستیدا واتە ئەو ڕێگایەی دەمانبات بەرەو چوونەدەرەوە لەو کۆیلایەتیەی تێیداین، ئەویش ئەو ڕێگایەیە کە هەشت لقی لێدەبێتەوە.

## ڕێگای خاوەن هەشت لق

ڕێگاکەی بوزا و شێوازی تێگەیشتنی لە کێشەی ژیان بە خستنەرووی چوار ڕاستیە شکۆدارەکە لە گەوهەر و بنەڕەتدا ڕێگای پزیشکی پسپۆڕە لە چارەسەرکردنی دەروونیدا. دەستی بە تێبینی وورد کرد بۆ نیشانەکانی دڵەڕاوکێ و خەم و خەفەت. ئەگەر هەموو شتێك بەشێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە بچێت، وامان لێدەکات هەست بە خودمان نەکەین تەنها بەڕادەیەکی زۆر لاواز نەبێت وەکو هەستکردنمان بۆ پرۆسەی هەرسکردنمان بۆ خۆراك لەکاتێکدا هەرسکردن تەندروستە و ئاساییە، کاتێك شتێك هەبێت پێویست بە دڵەڕاوکێ بکات پێویستمان بە گرنگیدانی زیاترە بۆ شێوازی ژیانمان. بەڵام کێشەکە بەمجۆرە نیە. چەند وزەیەکی بەدیهێنەر هەن بەڵام زۆر کەمترن لە بڕی پێویست، ململانێیەکی ناوەکی هەیە زیاتر لەوەی کە هەستی پێبکەین دروستە. بوزا هەموو ئەم نیشانانەی کورتکردوەتەوە لە یەکەمین ڕاستی شکۆداردا کاتێك ڕایگەیاند ژیان دکها (ئازار و ئەشکەنجە) یان (دەرچوونی جومگە)یە. هەنگاوی دووەم بریتیە لە ناسینەوە. لەپاش ئەوەی بیروباوەڕ و ئەفسانە و مەڕاسیمەکانی وەلانا ئەم پرسیارەی کرد بەشێوەیەکی پراکتیکی هۆکاری ئەم نیشانە نائاساییانە چیە؟ شوێنی هەوکردنەکە کامەیە؟ ئەو شتە چیە هەمیشە بوونی هەیە کاتێك ئازار بوونی هەیە، بوونی نیە کاتێك ئازار بوونی نیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دراوەتەوە لە دووەم ڕاستی شکۆداردا، هۆکاری لەشوێن دەرچونی ژیان لە جێگا دروستەکەی بریتیە لە تنها (واتە ئارەزووی تاك و خۆویستی) واتە بەکورتی پاڵنەری تێرکردنی خود. دواتر چی هەیە لەبارەی پێشبینیکردن لەبارەی ئەم نەخۆشیەوە؟ لێرەدا سێیەمین ڕاستی شکۆدار بوونی هیوایەك ڕادەگەیەنێت. نەخۆشیەکە چارەسەری هەیە، دەرمانەکەی زاڵبوونە بەسەر ئەم پاڵنەرە خۆویستانەدا؟ لێرەدا چوارەم ڕاستی شکۆدار وەڵامەمان دەداتەوە. . ڕێگای زاڵبوون بەسەر هەوەس و خۆویستیدا بریتیە لەو ڕێگایەی هەشت لقی لێ دەبێتەوە. کەواتە ڕێگای خاوەن هەشت لق بریتیە لە سوڕی چارەسەرکردن بەڵام چارەسەرێکی دەرەکی نیە هەتا نەخۆش وەری بگرێت بەبێ ئەوەی خۆی ڕۆڵی تیا ببینێت، چارەسەرەکە بە دەرزی و دەرمان یان مەڕاسیم و پشت بەستن نیە بە بەزەیی و بەخشینێکی نادیار بەڵکو چارەسەرەکە بە مەشق کردنە. خەڵك مەشق دەکەن بەشێوەیەکی ڕێکخراو لەبەر دیمەنێکی ناوەنجی ژیان، ڕاهێنان دەکەن بۆ مەبەستی لەشجوانی، هەروەها بۆ پیشە و حەز و ئارەزوەکانیان، بەڵام زۆربەی کات کەسانی وەك بینجامین فرانکلین benjamin franklin دەڵێن ئەستەمە مەشق بکرێت بۆ خودی ژیان، بەڵام بوزا هاوڕا نیە لەگەڵیاندا. بوزا دوو ڕێگای داناوە بۆ ژیان. یەکەم: ڕێگای کوێرانە کە خاوەنەکەی خۆی دەداتە دەست هەلومەرج بۆئەوەی کێشی بکات بەوجۆرەی دەیەوێت، وەك چیلکەیەك کەلەناو ئاودا ڕێدەکات، بوزا ئەم ڕێگایە ناودەنێت ونبوون و سەرلێشێوان. دووەم: ڕێگای ژیانی خوازراوە کە پلانی بۆ داڕێژراوە، ناوینناوە ڕێگا. ئەو شتەی بوزا لێرەدا پێشنیازی کردوە سیستمێکی توندە بۆ گۆڕانکاری لە نەریت و خووڕەوشتی مرۆڤدا بە ئامانجی دەربازکردنی لە نەزانین و ئازادکردنی لە حاڵەتەکانی سەرکوتکردن و کپکردن کە بەسەریاندا سەپێنراوە لەلایەن پاڵنەرە نەخوازراوەکانەوە (کە مرۆڤ کۆنترۆڵ دەکەن بەبێ ئەوەی بیەوێت یان دەرکیان پێ بکات) لەگەڵ ئازادکردنی لە تنهادا (ئارەزوە خۆویستیەکان و هەوەسبازیەکان). ئەمە سوڕێکی تەواوە وێنەی هەموو شتێکی بە وردی کێشاوە، بەدەستپێکردن لە هێڵی دەستپێکردنەوە هەتا ناوەندی گەیشتن بە ئامانجەکان و سەرکەوتن، بە بەرزایی و ڕێگا مەترسیدارەکاندا، هەروەها چەند ئیستگەیەك بۆ پشوودان و حەوانەوە تەرخانکراوە. ڕێگای خاوەن هەشت لق بەهۆی مەشقکردنەوە هەوڵ دەدات بۆ دووبارە بونیاتنانەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی، بۆئەوەی مرۆڤێکی جیاواز لەوەی ئێستای لێ دروست بکات، کەسێك بەتەواوی چاکبووەتەوە لە جۆرەکانی بێتوانایی کە ژیانی

توشی ئیفلیجی دەکات. بوزا دەڵێت: ((هەرکەسێك شادومانی بوێت دەتوانێت بەدەستی بهێنێت بەمەرجێك مەشق بکات)). واتە پەیڕەوی بنەماکان بکات. کەواتە ئەم مەشق کردنە چیە کە بوزا لەبارەیەوە دەدوێت؟ دابەشیکردوە بۆ هەشت هەنگاو. بەڵام ئاستێکی سەرەتایی هەیە کە بوزا باسی نەکردوە لە لیستەکەیدا، وێڕای ئەوەی زۆر باسی کردوە لە کاتەکانی تردا کە وامان لێدەکات دڵنیابین وای داناوە پێش ئەمە بەدی بهێنرێت. ئەم هەنگاوە سەرەتاییە هاوەڵیەکی تەندروستە. هیچ کەسێك هێندەی بوزا دەرکی بەوەنەکردوە کەئێمە وەك بوونەوەری کۆمەڵایەتی کارمان تێدەکرێت، بەو نمونەیەی کە هاوەڵی دەکەین لە هاوڕێکانماندا ئەوانەی لەگەڵمان دەدوێن بە هەڵوێست و بەهاکانیان زیاتر لە زمانیان. کاتێك بوزا پرسیاری لێکرا: ((مرۆڤ چۆن دەتوانێت بگات بە پلەوپایەی ڕوناکبوونەوە؟)) لەوەڵامدا وتی: ((بەئاگاهێنەرەوەیەکی باوەڕ دەردەکەوێت لە جیهاندا ئەوکاتە مرۆڤ هاوەڵی دەکات)). بەڵێ دوای چەند ڕێنماییەکی تر دەکەوێت بەڵام هاوەڵەکەی شتێکی سەرەکیە. کاتێك بتەوێت فیلێکی کێوی بکەیتە ماڵی، باشترین شت کە پێویستە سەرەتا ئەنجام بدرێت بریتیەلەوەی بخرێتە لای فیلێك پێشتر ماڵی کرابێت چونکە بە پەیوەندی کردنی بەم فیلەوە هەست بەوە دەکات ئەو حاڵەتەی داوادەکرێت بچێتە ناوی دژی ئەوە نیە کە ئەو فیلە پاڵنەرە سروشتیەکانی وەلابنێت بەڵکو ئەمە پەرەپێدانێکە دەکرێت ببێتە هۆی حاڵەتێك کە شایەنی جێبەجێکردن بێت، وێڕای ئەوەی جیاوازە لەم حاڵەتەی ئێستای. ئەم نمونە ڕاستەوخۆ بۆ هاوەڵەکەی باشترین ڕێگایە بۆ فێرکردنی. مەشقکردنی ژیانی ڕۆح هیچ جیاوازیەکی نیە لەو نمونەیەی باسمانکرد. ئەو گۆڕانەی بەرەوڕووی ڕاهێنەر دەبێتەوە لەم ڕێگایەدا هیچ کەمتر نیە لە گۆڕانی فیلەکە. لەبەرئەوە بەبێ بوونی بەڵگەیەکی بینراو لەسەرئەوەی سەرکەوتن لەم بوارەدا شتێکە دەکرێت ئەنجام بدرێت بەبێ پێدانی وزەی هاندەر کە بۆی دەگوازرێتەوە، لەو کەسانەی پێشتر گەیشتون بەو پلەوپایەیە، گومانی تێدا نیە لاوازبوونی بڕیاردان دەستپێدەکات ئەگەر پەتای دڵتەڕاوکێ بگوزرێتەوە لەکەسێکەوە بۆ یەکێکی تر هەروەك زانستی دەروونناسی سەلماندویەتی ناکرێت متمانە و بڕوابەخۆبوون بگوازرێتەوە لەنێوان تاکەکاندا. ڕۆبەرت ئینگیرسول robert ingersol وتی: (ئەگەر لەجێگای یەزدان بوومایە وام دەکرد، لەشساغی بەربڵاوبووایە نەك نەخۆشی. لەوەڵامیدا هیندیەکی هاوچەرخ دەڵێت: ((کەی دەرك بەوە دەکەین کە تەندروستی بەڕاستی بەربڵاوە هێندەی نەخۆشی؟ شادومانی بەربڵاوە هێندەی دڵتەنگی؟)). شانکارا دەڵێت: ((یەکێك لەو سێ شتەی پێویستە هەموو ڕۆژێك سوپاسگوزاریان لەسەر بکەین بریتین لە هاوەڵیکردنی کەسێکی پیرۆز، چونکە هەروەك چۆن هەنگ ناتوانێت هەنگوین دروست بکات تەنها بە کۆبوونەوەی نەبێت لەگەڵ کۆمەڵە هەنگێکی تر، بەهەمان شێوە مرۆڤ ناتوانێت پێشبکەوێت تەنها ئەگەر پاڵپشتی نەکرێت بە متمانە و گرنگی پێدان نەبێت، ئەو کەسانە دروستی دەکەن کە بە ڕاستی گەیشتون)). بوزا بەتەواوی هاوڕایە لەسەر ئەم وتانە. پێویستە هاوەڵیان بکەین و لەگەڵیان وتووێژ بکەین، خزمەتیان بکەین و شوێن ڕێگاکەیان بکەوین، ڕۆحی خۆشەویستی و بەزەییان لێوە وەربگرین. ئەگەر ئەم هەنگاوە نرا ئەوا بەشێوەیەکی پراکتیکی توانیومانە بەرەوپێش بچین بۆ هەشت هەنگاوەکەی ڕێگای خاوەن هەشت لق:

١-ڕوانینی دروست: وێڕای ئەوەی ڕێگای ژیان زیاترە لە کۆمەڵە بیروباوەڕێکی دیاریکراو بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت دەتوانێت پشتگوێی بخات یان بەتەواوی تێیپەڕێنێت چونکە مرۆڤ سەرباری ئەوەی گیانلەبەرێکی کۆمەڵایەتیە لەهەمان کاتدا گیانلەبەرێکی ئەقڵانیشە. بەڵێ مرۆڤ بەگشتی بەوجۆرە نیە، بوزا بەخێرایی و بێ وەستان دانبەوەدا دەنێت بەڵام ژیان پێویستی بە پلاندانانە بۆ جۆرێك لەبەرنامەی کارکردن کە پێویستە ئەقڵ متمانەی پێبکات و پشتی پێبەستێت ئەگەر ویستی بەپێی ئەوە بەرەوپێش بچێت. ئەگەر بۆ ڕوونکردنەوەی

زیاتر گەڕاینەوە سەر نمونەی فیلەکە دەڵێین هەرچەندە ئەو مەترسیەی فیلەکە خۆی تیادا دەبینێتەوە گەورەبێت، ئەوا هەڵناسێت بەهیچ جموجوڵێك بۆ ڕاکردن، بەڵام ئەگەر دڵنیابوو لەوەی ئەو ڕێگایەی گرتویەتەبەر بەرگەی کێشەکەی دەگرێت. ئەگەر باوەڕی بەوە نەهێنا ئەوا لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە و دەست دەکات بە هات و هاوار ئەوەی پێ باشترە لە مەترسی کەوتنەخوارەوە. گەمژەترین کەس لە هەمووان زیاتر هاوار دەکات ئەگەر بە کەم بایەخ سەیرکرا، پێویستە دانبەوەدابنێن کە ئەقڵ ڕۆڵێکی هاوشێوەی ئەوە دەبینێت لە ژیانی مرۆڤدا. چ ئەقڵی مرۆڤ هێزی هەبێت بۆ ڕاپێچکردنی ژیانی بەو ئاڕاستەیەی بیری لێدەکاتەوە و پلانی بۆ دادەنێت، یان توانای نەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە دەتوانێت ناڕازایی دەربڕێت. ئەگەر مرۆڤ باوەڕی بەشتێك نەبوو ئەوا ئەستەمە بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە لە هەموو دڵ و ڕۆحیەوە بەرەو ڕووی بڕوات. وەکو ئەقڵ بە خود بڵێت باوەڕم بەو شتە نیە تۆش باوەڕت پێی نەبێت. کەواتە چەند باوەڕێك هەیە پێویستە مرۆڤ بەدەستیان بهێنێت بۆ دەستپێکردن بۆ گرتنبەری ڕێگاکە. ئەو باوەڕانە چین؟ چوار ڕاستیە شکۆدراکەیە، واتە دەرککردن بەوەی ژیانی مرۆڤ لێوان لێوە لە ئازار، ئەم ئازارانە دروسبوون بەهۆی پاڵنەرەکانی بوونی جودا و تێرکردنی خودی تاك، دەکرێت ئەم ئازارانە بڕەونەوە، ڕێگای چاکبوونەوەیان بریتیە لە گرتنەبەری ڕێگای خاوەن هەشت لق.

٢-مەبەستی دروست: لەکاتێکدا هەنگاوی یەکەم بانگمان دەکات بۆئەوەی بە ئەقڵمان بڕیار بدەین لەسەر کێشەی سەرەکی ژیان، ئەم هەنگاوی دووەمە ئاماژە دەکات بۆئەوەی پێگری بکەین بە دڵمان لەسەر ئەو شتەی بەڕاستی دەمانەوێت. ئایا بەڕاستی ڕوناکبوونەوەمان دەوێت؟ یان مەیلی دڵمان هێشتا جێگیر نیە لەسەر ئەو شتەی دەمانەوێت، هێشتا بەلای ڕاست و چەپدا دەکەوێت وەك فڕۆکەیەکی لە کاغەز دروستکراو هەر تەوژمە و بەلای خۆیدا دەیبات. ئەگەر ویستمان بەرەوپێش بچین لە ڕێگایەکدا پێویستە بەردەوام بین لە جێبەجێکردنی مەبەستەکەماندا. پێویستە پێداگری بکەین بۆ بەرزبوونەوە لە جودابوونەوەمان و ناسینەوەی ناسنامەمان بەوەی بەشێوەیەکی یەکلاکراوە لەگەڵ بەرژەوەندی و چاکەخوازی هەمووانداین. هەموو تاکەکان بەنزیکەیی ئەوانەی کاری مەزنیان ئەنجامداوە گرنیان دەدا بە تاکە شتێك. بەڵێ ئەوان ڕۆژانە هەزاران کار و چالاکی جێبەجێ دەکەن بەڵام لەپشت هەموو ئەم کارانەوە ئەو ئامانجە حەشاردرابوو کە بەشکۆداری دادەنێن کە دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو ژیانیدا. تەنها کاتێك خەڵکی دەیانەوێت ئازادبن بەوپەڕی هێز و توانایانەوە، تەنها کاتێك گرنگی دەدەن بە وزەکانیان لەسەر زاڵبوون بەسەر لەشوێن دەرچوونی ژیان لە جێگا ڕاستەقینەکەیەوە، دەکرێت هەنگاوەکانیان لە سەرکەوتن بەسەر تەپۆلکە لمێکی لوسەوە بگۆڕێت بۆ بەرەوپێشچوونی خێرا بەهەنگاوی فراوان لەسەر زەویەکی جێگیر.

٣-ووتەی دروست: ئێستا دەست دەکەین بە پەلکێشان بەرەو قووڵی بۆئەوەی دەستمان بگات بە ئەوکلیکە کارەباییەی کە کۆنترۆڵی ژیانمان دەکەن. یەکەمینیان زمانە. زمان بە دوو ئەرك هەڵدەسێت. سەرەتا بەڵگەیەکمان دەداتێ لەسەر ئاکار و سروشتمان، دواتر یارمەتیمان دەدات بۆ گواستنەوە و گۆڕینیان. لەبەرئەوە کارێکی باشە ئەگەر بە زمان دەستمان پێکرد وەك بەڵگە و ئاماژەپێکەرێك. یەکەمین هەنگاو بریتیە لەوەی بەئاگابین بۆ نمونەی وتەکانمان و ئەوەی دەرونمان پێمان دەڵێن. لەبری بڕیاردان بەوەی کە هیچ نەڵێین جگەلە ڕاستی با تێبینی ئەوە بکەین ڕۆژانە چەند جار لە ڕاستی لادەدەین، دواتر دەستبکەین بە گەڕان بەدوای ئەو هۆکارەی بانگ هێشتمان دەکات بۆ ئەو لادانە. هەمان پڕۆسە سەبارەت بە لەدەستدانی خێر و چاکە لە وتەکانماندا، بڕیارنادەین کە بدوێین تەنها بە خێر و چاکە نەبێت، بەڵکو دەست دەکەین بەپێداگری کردن لەسەر چاودێریکردنی وتەکانمان بۆئەوەی بەئاگاتربین بۆ پاڵنەرەکان بۆ هاندەرەکان پشت لەدەستدانی چاکە و

نـەرمونيانی لـەوەی دەيڵـێين. دوای ئـەوەی دەسـتدەگيرێت بەسـەر ڕادەی دروسـت لەسـەر هـەنگاوی يەكـەم ئامادەدەبين بـۆ هەوڵـدان بـۆ ئەنجامـدانی هەنـدێك گۆڕانكـاری چـونكە زەمينـەی ئێسـتای بەباشـی ئامـادەكراوە، چونكە كاتێك بەباشی دەرك بەوەدەكەين چۆن دەدوێين، ئەوا پێويستی گۆڕين ئاشكراتردەبێت، بە چ ئاڕاستەيەك پێويستە گۆڕانكاری بكرێت؟ يەكەمجار بە ئاڕاستەی ڕاستی. بەهای ڕاستی لەلای بوزا بەهايـەكی ئاكاريـە. درۆ لـەلای ئـەو كـارێكی زۆر ناشـيرينە چـونكە بـوونی مـرۆڤ دەپوكێنێتـەوە. بۆچـی درۆدەكـەين و ئـەوانی تـر فريودەدەين؟ هاندەری ڕاستەقينە لەپشت هەموو ئەو بەڵگانەی دەيانهێنينەوە بريتيە لە ترسان لە دەركەوتن يـان ڕاستی ناو دەروونمان ئاشكرابكەين، تەنانەت بۆ خۆمان! لـە هـەموو كاتێكدا كـە خۆمـان بەدەستەوە دەدەيـن بۆ ئەم هاندەرە ئەوا ديواری منـی باڵامـان پاراستوە، بەمجۆرە زيـاتر خۆمـان دوور دەخەينـەوە لـە ژيـان و شـادمانی (گەڕانـەوە بـۆ دووەم ڕاسـتی شـكۆدار). لەوانەيـە وازهێنـانی كتـوپڕ لـە هـەموو ئامێرەكـانی پاراسـتنی منـی باڵـا كارێكی زۆر بنەڕەتی بێت بەڵام بە لايەنی كەمەوە پێويستە لەسەرمان بە ئاشكرا دەرك بكـەين بـە چۆنيەتی ئـەم ئامێرانە، بۆچی ژيانی ئـەو كەسانەی دەژيـن لەپشـت ئـەم ئامێرانـەوە پێويسـتە ژيـانێكی كـوێت و بەنـدكراو بێـت. بەڵام ئاڕاستەی دووەم كە پێويستە وتەكانمان بەرەو ڕووی بێت چاكە و چاكەخوازيە. پێويسـتە دووربكەوينـەوە لە شايەتی دانی درۆ، قسەی قۆڕ، چەنەبازی بێ سوود، جنێودان، شێواندنی ئابڕووی كەسانی تـر، سـووكايەتی پێكردن لە هەموو تاوانەكان خراپترە چونكە دژايەتيكردن و مەبەست تيايـاندا نائاشكرايە.

٤-ڕەوشـتی دروسـت: هـەروەها ئەمـە چـەند ئامۆژگاريـەك لـەخۆدەگرێت لـە بانگـەوازكردن بـۆ تێگەيشـتن لـە ڕەوشتی دەروون بەشێوەيەكی بابەتيانەتر لەپێش هەوڵدان بۆ چاككردنی. لەسەر مەشقكەر پێويستە بيربكاتەوە لـە كردەوەكـانی و تێبينـی ئـەو هاندەرانـە بكـات كـە پـاڵی پێـوەدەنێن. چـەندە لـە كردەوەكـانی خۆويسـتانەن و چەنديان بەخشندانە و خۆنەويستانەن؟ سەبارەت بەو ئاڕاسـتەيەی كـە پێويسـتە كردەوەكـان بـەرەو ڕووی بـڕۆن، ئامۆژگاری بـۆ جـاری دووەم، ئاڕاسـتەی چـوون بـەرەو خۆنەويسـتی، خۆشەويسـتی و چاكەخوازی بـۆ هـەمووان. ئەمانە چەند ڕێنماييەكی گشتين پێنج بنەماكە بـەووردی باسيكردوە كـە كـۆپی دووەمـی بوزييـەت دەنوێنێـت بـۆ نيوەی دووەم يان نيوەی ئاكاری لە دە ڕاسپاردەكە. مەكوژە، بوزيەكان پێداگری دەكەن لەسـەر ئـەم ڕاسـپاردەيە، لێرەدا مەبەستيان لە هەموو ئـەو گيانداراـنەی كـە كوشـتن و خواردنيـان قەدەغـە كـردوە لـە خۆيـان هـەر لەبـەر ئـەم هۆكارەيە كە ڕوەكين. دزی مەكە. درۆ مەكە. داوێنپـاك بـە. سـەبارەت بـە قەشـەكان و ئەوانـەی هاوسـەرگيريان نـەكردوە، پێويسـتە هاوسـەرگرتن لـەخۆيان قەدەغـە بكـەن. بـەڵام سـەبارەت بەوانـەی هاوسـەرگيريان ئەنجامـداوە پێويستە وازبهێنن لە خۆپەرستی بەدرێژايی ژيانيان. هۆشبەرەكان مەخۆرەوە. وتراوە كـە قەيسـەری ڕوسـی لـە دێرزەمانـەوە كاتێـك بـەرەو ڕووی ئـەو بڕيارەبوويـەوە كـە يـەكێك لـەم سـێ ئايينـە هەڵبـژێرێت بـۆ گەلەكـەی. . مەسيحيەت، يـان ئيسـلام، يـان بوزييـەت، ئـەم دوانـەی كۆتـايی ڕەتكـردەوە لەبـەر هـيچ هۆكارێـك نـا جگەلـەوەی هەردوكيان پێنجەمين قەدەغەكراويان لەخۆگرتوە!.

٥-كەرەستە دروستەكانی ژيان: وشەی كار بەتەواوی لەجێی خۆيدايـە چـونكە كاركردنمـان سـەرقاڵمان دەكـات لە حاڵەتی ئاگاييمان. بوزا پێشكەوتنی ڕۆحی بە كارێكی ئەستەم دەزانێت ئەگەر زۆربەی كارەكانی مـرۆڤ بـەرەو ئاڕاسـتەی پێچـەوانە كێشـی بكـەن: ((دەسـتی بۆيـاخچـی ڕەنگـی ئـەو بۆيەيـە دەگرێـت كـە كـاری پێـدەكات)). مەسيحيەت لەم بارەيەوە هەمان ڕای هەيە، مارتن لوسەر ڕازيبوو بەپيشەی جەلاد (ئەو كەسانە هەڵدەواسێت كە بڕيـاری لـە سـێدارەدان سـەپێنراوە بەسـەرياندا) وەك پيشـەيەك كـە پێويسـتە هـەموو تاكـەكانی كۆمـەڵگا كـاری تيابكـەن، لەكاتێكـدا پيشـەی لێكـدەرەوەی لـەخۆی قەدەغـەكرد. سـەبارەت بەوانـەی پێـداگری دەكـەن لەسـەر

ئازادبوون، هەتا ڕادەی ئامادەبوونیان بۆ تەرخانکردنی تەواوی ژیانیان لەسەر ئەم پرۆژەیە کە پێویستی بە یارمەتیدانی دروستە لەوانەوە بۆ چوونەناو پیشەی قەشایەتی. بەڵام سەبارەت بە کەسانی ئاسایی ئەم بنەمایە داوایان لێدەکات کاربکەن لەو پیشانەی ڕیکلام دەکەن بۆ ژیان، لەبری ئەوانەی تێکی دەشکێنێت. بۆ جاری دووەم بوزا تەنها بە وتەی گشتی ڕازی نەبوو بەڵکو ناوی پیشەکانی نا، ئەو پیشانەی لە سەردەمی ئەودا باوبوون بە شتێکی دژ بە هەتەری ڕۆحی دانان. هەندێك لەم پیشانە زەرەر و زیانەکانیان ڕوون و ئاشکرایە، ژەهرفرۆش، بازرگانی بەندە و کۆیلە، لەشفرۆشی. بەڵام چەند پیشەیەکی تری بە جۆرێك داناوە ئەگەر جیهان پێداگری بکات لەسەر وازهێنان لێیان ئەوا گۆڕانکارییەکی گەورە ڕوودەدات، پیشەی گۆشتفرۆش، مەی دروستکەر، چەك دروستکەر، باج و سەرانە کۆکەرەوە (چونکە چەوساندنەوە تیایدا لەو کاتەدا شتێکی ڕۆتینی بوو). هێشتا یەکێکە لەو پیشانەی سەرشێواندن دەنێنەوە، بۆچی بوزا پیشەی بازرگانی قافڵە و کاروانەکانی ئیدانە کرد؟ بەهەرحاڵ، ئەگەر ئاشکرا بێت ڕێنماییەکانی بوزا لەبارەی کار و پیشەکانەوە ئامانجیان یارمەتیدانی هاوسەردەمەکانی بێت لەسەر هەڵبژاردنی دروست لەنێو ئەو پیشانەی یارمەتیدەرن بۆ پێشکەوتنی ڕۆحی و ئەوەی ژیانی ڕۆحی کۆت و بەند دەکات و ڕێگرە لەبەردەم پێشکەوتنیدا، هەندێك بوزی هەن وابیردەکەنەوە ئەگەر بوزا زیندوو بووایە ئەوا کەمتر گرنگی دەدا بە باسکردنی وردەکارییەکانی ئەو پیشانە بەبەراورد بە گرنگیدانی بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ مەترسی، ئەوەی خەڵك لەبیریان بچێ بەدەستهێنانی بژێوی تەنها کەرەستەیەکە بۆ ژیان نەك ئامانج.

٦-هەوڵ و تێکۆشانی دروست: بوزا گرنگیەکی لەڕادەبەدەری دابوو بە خواست و و یست. بۆ گەیشتن بە ئامانج پێویستمان بە کارێکی گەورە هەیە، چەند چاکەکارییەك هەیە پێویستە پەرەیان پێبدرێت، هەروەها چەند هەستێك پێویستە جڵەویان بگیرێت، حاڵەتێکی تێکشکاندنی بیرکردنەوە پێویسە بەتەواوی لابرێت، ئەمە ئەگەر ویستمان هەلێکی تر بدەینە بەزەیی و جودابوونەوە لە منی باڵا واتە خۆویستی. هەستی ڕق و کینە کۆتایی نایەت لە دڵی ئەوانەی بیرۆکەی وەکو دزی لێکردم، لێیدام، سوکایەتی پێکردم دەستدەگرێت بەسەریاندا. بەڵام تاکە ڕێگە کە دەتوانرێت لەڕێگەیەوە ئەم جۆرە هەستانە لابرێت لەڕاستیدا تاکە ڕێگایە بۆ لادانی ئەو کۆت و بەندانەی ڕێگری لە مێشکی دەکەن لە هەموو جۆرە بیرکردنەوەیەك، ئەمە ئەو شتەیە ولیام جەیمس william james ناوی ناوە بەرزکردنەوەی هێواشی خواست و ویست. بوزا دەڵێت: ((ئەوانەی شوێن ڕێگایەك دەکەون دەتوانن وەکو ئەو گایە ڕێ بکەن بەناو قوڕێکی قوڵدا کاتێك بارێکی قورس لەسەر پشتیەتی و ماندووە بەڵام نیگاکانی جێگیرن هەمیشە سەیری پێشەوە دەکەن بە ورە و پێداگرییەوە لەسەر ئەوەی پشو نەدات هەتا لە قوڕەکە نەیەتەدەرەوە. ئەی قەشەکان بیرتان بێت ئارەزووە دەرونیەکان و گوناه و تاوان پیسترن لەو قوڕە، تەنها لەڕێگەی بیکردنەوە و تێڕامانەوە لە ڕێگاکە بەشێوەیەکی هەتەری دەتوانن لە خەم و ئازار ڕابکەن. )) (٢٧). بەڵام بە خواست و ویستی لاواز یان تەنها بە هیواخواستن و بێ هەوڵدان یان کارکردن بۆی ناتوانین بەدەستی بهێنین، هەروەها مرۆڤ ناتوانێت هیچ شتێك بکات! لە گفتوگۆکردن لەبارەی هەوڵ و تێکۆشانی دروستەوە بوزا چەند بیرۆکەیەکی تری زیادکردوە. زۆربەی کات شاخەوانەکان شارەزا نین، ئەوانەی هەوڵ دەدەن بۆ گەیشتن بە یەکەم لوتکەی شاخ و خۆڕاگرنین لەسەر ئەو ڕۆیشتنەی کە هێواش دێتە بەرچاویان، کە ڕێبەرە بەتەمەنەکەیان بۆیان دادەنێ بەڵام پێش ئەوەی ڕۆژەکە کۆتایی بێت دەرکب ەوەدەکەن کە بە خێراییەکی باش ڕۆیشتون، بوزا متمانەی هەبوو بە ڕۆیشتن و بەرەوپێشچوونی جێگیر زیاد لە خێرا. ئەگەر دەزوو زۆر کێشکرا ئەوا دەپچڕێت، ئەو فرۆکەیەی بەخێراییەکی زیادە لە پێویست بەرزدەبێتەوە تێکدەشکێت. لە چیندا نوسەری کتێبی تاو تی

چینگ tao te ching باس لەم خاڵە دەکات بە وێنەیەکی جیاواز: ((ئەو کەسەی هەنگاوی فراوان دەنێت هیچ ناکات جگەلەوەی دووریەکی زیاتر دەبڕێت)). لەبەرئەوەی ڕۆژئاوا ئەم دوو هەنگاوەی کۆتایی ڕێگای هەشت لقدار بە خاوەن گرنگیەکی تایبەت دەزانن بۆ تێگەیشتن لە ئەقڵی مرۆیی و ڕێگاکانی کارکردنی ئەوا لەبارەی ئەم خاڵەوە گفتوگۆی وردتر دەکەین لەدواییدا.

٧-ئاگایی دروست: مامۆستایەك نیە گرنگی دابێت بە ئەقڵ و جەختی نەکردبێتەوە لەسەر کاریگەریە گەورەکەی لەسەر ژیان زیاتر لەوەی بوزا ئەنجامی داوە. زۆرترین دەقە بیرۆزەکانی بوزییەت کە خۆشەویستن بریتین لە دەقی دهامابادا dhammapada کە بەم وشانە دەست پێدەکات: ((هەموو ئەوەی ئێمە لەسەرین دەرئەنجامی ئەوەیە بیرمان لێکردوەتەوە)). ئەوەی پەیوەندی هەیە بە داهاتوەوە بوزا بۆمان دوپاتدەکاتەوە و دڵنیامان دەکات کە ((هەموو شتەکان دەتوانرێت دەستیان بەسەردابگیرێت لەڕێگەی ئاگاییەوە))(٢٨). لەنێو فەیلەسوفە ڕۆژئاواییەکاندا سپینوزا spinoza لەگەڵ بوزادا هاوڕایە لە بابەتی وزەکانی ئەقڵ و توانا شاراوەکاندا. دەستەواژە بەناوباگەکەی دەڵێت: ((کاتێك لەشتێك تێدەگەیت خۆت لێی دەربازبکە)) خەریکە دەبێتە پوختەی هەموو فەلسەفە ئاکاریەکەی. بوزا بەتەواوی هاوڕایە لەگەڵ ئەم وتەیەدا. ئەگەر بەڕاستی توانیمان لە ژیان تێبگەین، ئەگەر بەتەواوی توانیمان لە دەرونمان تێبگەین ئەوا نەلە ژیانمان نە لە دەرونمان کێشەیەك نادۆزینەوە. زانستی دەرونناسی لەسەر هەمان گریمانە دەڕوات. کارل روجرز carl rogers دەڵێت کاتێك ((ئاگاییەکی تەواو هەیە بەو ئەزمونەی مرۆڤ پیایدا تێدەپەڕێت پێویستە متمانە بکەین بە هەڵسوکەوتی مرۆیی چونکە لەم ساتانەدا بوونەوەری مرۆیی دەرکدەکات بە سۆز و بەزەییەکەی بە ئاڕاستەی ئەوانی تر)).

لەبەرئەوە بوزا لەوە تێگەیشت نەزانین تاوان نیە. بەواتایەکی ڕوونتر، هەتا هەڵە و تاوان هی ئێمە بێت ئەوا ئەو شتەی پاڵمان پێوەدەنێت بەرەوڕووی شتێکی قووڵترە و بنەڕەتیە ئەویش نەزانینە، بەشێوەیەکی ڕوونتر نەزانین لە سروشتی ڕاستەقینەماندایە. بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم نەزانیەدا بەشێوەیەکی پلەبەپلە بوزا وا بەباش دەزانێت کە پشکنینی دەروون ئەنجام بدەین بە بەردەوامی هەتا ڕادەی تواندنەوەی دەروون و پوکاندنەوەی، بەڵام ئەم کارەی بە پێویست زانی چونکە وابیری کردەوە کە ئازادی بەدی دێت بە ناسینی خود و بەئاگابوون. بۆ ئەم ئامانجە بوزا پێداگری کرد لەسەر ئەوەی بەشێوەیەکی قووڵ هەوڵبدەین بۆ تێگەیشتن لە دەروونمان، بەوەی هەموو شتێك بەشێوەیەکی زۆر ڕوون ببینین (بەو شێوەیەی کە هەیە). ئەگەر ئاگاییمان پاراست بە بەردەوامی لەسەر بیرکردنەوە و هەستەکانمان ئەوا دەرکبەوەدەکەین کە مەلە دەکەین بۆ ناوەوە و دەرەوەی ئاگاییمان، لە هیچ حاڵەتێکدا نابێتە بەشێك لە دەروونمان. پێویستە هەموو شتەکان بەشێوەیەکی ناچالاك ببینین، واتە بەشێوەیەك کە هیچ ڕەنگدانەوەیەك نەبێت لەلایەن ئێمەوە بە ئاڕاستەی ئەو، بەتایبەتی لە هەست و سۆزەکانماندا، واتە ناکرێت چەند شتێك ئیدانە بکەین و بە چەند شتێکی ترەوە پەیوەست بین. هەروەك کۆمەڵە مەشقێك هەیە کە پێی باشە ئەنجام بدرێت، لەوانە: پێویستە لەسەر شوێنکەوتو ئەقڵی دەستبگرێت بەسەر هەست و پاڵنەرەکانیەوە لەبری لەوەی پەلکێشی بکەن، واتە ئەقڵ ببێتە شۆفێر نەك هەست و پاڵنەرەکان. پێویستە سەرنج بدەینە دیمەنە ترسناك و قێزەونەکان هەتا سەرنجدان بگاتە حاڵەتێك تیایدا ئەم شتانە ئاسایی بن بەلایەوە و هەست بە ڕق و کینە نەکات بەرامبەریان. پێویستە هەموو جیهان لەلای شوێنکەوتو ببێتە شوێنی بیرۆکەی لێوان لێو لە خۆشەویستی و بەزەیی. دور لە حاڵەتی نیوە ئاگایی کە ئاگایی مامناوەندی مرۆڤ دەگرێتەوە، ئەم هەنگاوی حەوتەمە داوا لەو کەسە دەکات کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت کە بەئاگا بێت لە هەموو ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدات. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر شوێنکەوتو کە بەئاگابێت لە کاتێکدا خەو دایدەگرێت،

بەئاگابێت لە هەناسەدانی. . ئایا هەناسە لەو ساتەدا وەرگرتنە یان هەناسەدانەوەیە. ئاشکرایە ئەمە پێویستی بە مەشقکردنە. وێڕای ئەوەی ئەنجامدانی ئەم مەشقە بەبەردەوامی تاڕادەیەك پێویستی بە تەرخانکردنی کاتە بۆ تێڕامان و ڕێکخستنی کاتەکانی پاشەکشەی تەواو لەم ئامانجە. ئەوەی ئێستا باس دەکرێت لەبارەی چاودێرێکی ڕۆژئاواییەوە بۆ قەشەکان لە تایلاند کە بەم هەنگاوە هەڵدەسان (یەکێکیان کاتژمێرەکانی هەموو ڕۆژێکی بەڕێ دەکرد بە ڕێگا ڕۆیشتن بەهێواشی بەدەوری باخچەکانی واتدا، لە تێڕامانێکی وردا لەبارەی کارێکەوە کە پەیوەندی هەیە بە هەموو هەنگاوێکەوە. ئەم پرۆسەیە جێبەجێدەکرا لەسەر هەموو کردارێکی سروشتی لە کردارەکانی ژیانی ڕۆژانەدا، هەتا ئەقڵی ئاگایی بەشێوەیەکی تیۆری بتوانێت بەدواداچون بکات بۆ هەموو هەنگاوێك کە دەڕوات بەرەو بەرهەمهێنانی هەستەکان و دەرکپێکردن و بیرکردنەوە. قەشەیەکی تر کەلە پەنجاکانی تەمەنیدا بوو سەرقاڵی سەرنجدان بوو لە گۆڕستانێکی بچوکی نزیك لەو باخچەیە بەو هۆیەوە هەرگیز هەستی بە بێزاری نەدەکرد. ئەو بە چیچکانەوە دادەنیشت بە تەنها بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك چاوەکانی بە کراوەیی دەهێشتەوە لەکاتێکدا باران بە لێزمە دەباری لە نیوەی شەودا یان لە گەرمای نیوەڕۆدا. ماوەی ئاسایی ئەم مەشقە دوو کاتژمێر یان زیاتر دەبوو)(٢٩). کەسی ئەنجامدەری ئەم سەرنجدانە لەڕێگەی ئەم کارەوە دەگات بە ژمارەیەك لە ژێری خۆڕسك:

(١)دەرك بەوە دەکات هەموو سۆزێك یان هەڵچونێك یان بیرۆکەیەك یان وێنەیەك جۆرە هەستێکی لەگەڵدایە لەلایەن جەستەوەیە، وە بە پێچەوانەوەشەوە.

(٢)مرۆڤ دەتوانێت نمونە بەرهەڵستکارەکان لە یەکتر جیابکاتەوە کە دەردەکەون لە ئەقڵی مرۆڤدا، چۆنیەتی دروستبوونی ئەم نمونانە (یان ئەم شێوازانە) کە سەرچاوەن بۆ بێزاریمان (دوکها dukkha). سەبارە تبە هەندێکیان ئەم خۆراکپێدانە برینە کۆنەکان دەکولێننەوە، سەبارەت بەوانی تر خۆیان دەبیننەوە کە سەرقاڵن بە تامەزرۆیی و بەزەیی هاتنەوە بە خودی خۆیانەوە. لەکاتێکدا ئەوانی تر هێشتا واهەست دەکەن کە لە دەریادان. لەگەڵ بەردەوامبوون لەسەر ئەم کارە بێزاری وەڕسبوون بەسەر کاڵبوونەوە دەچن بەرەبەرە دیارنامێنن.

(٣)دەرکبەوە دەکات هەموو حاڵەتێکی ئەقڵی و جەستەیی لە حاڵەتی ڕۆیشتندان، هەرچیەك بن حاڵەتێکی هەمیشەیی پێکناهێنن، تەنانەت ئازاری جەستەیی هیچ نیە جگەلە دەستەواژەیەك بۆ زنجیرە هەستێکی لەیەك جودا دەشێت زۆر بەخێرایی بگۆڕێن.

(٤)کەسی سەرنجدەر دەرك بەوەدەکات دەستگرتنی بەسەر ئەقڵی و هەستە جەستەییەکانیدا چەندە بچوکە، ئاگایی چەندە لاوازە لەکاتی کاردانەوەکانماندا.

(٥)لە هەموو ئەمانە گرنگتر مرۆڤ دەست بە دەرکپێکردن دەکات بەوەی خودێك یان دەرونێکی سەربەخۆی شاراوە بوونی نیە لەپشت ڕوداوە ئەقڵی و جەستەییەکانەوە، تا هەڵسێت بە ڕێکخستنی ڕوداوەکان و بەڕێوەبردنیان. کاتێك وزە ڕوپۆش دەکرێت بە ئاگایی و وردبینی، ئەوکاتە دەردەکەوێت خودی ئاگایی بەردەوام نیە هەروەك ڕوناکی گڵۆپێك کە بەخێرایی دادەگیرسێت و بەخێرایی دەکوژێتەوە بەڕادەیەك ئاگایی هەستی پێ ناکات بەڵکو وادەردەکەوێت ڕوناکیەکە بە بەردەوامی داگیرساوە. بەم ژێریە خۆڕسکەوە بیرکردنەوە لە بوونی خود هەمان لیست دەست دەکات بە شیبوونەوە و توانەوە.

٨-تێڕامانی دروست: ئەمە بەشێوەیەکی سەرەکی ئەو تەکنیکە لەخۆ دەگرێت کە بینیمان لە هیندۆسیەتدا لەژێر ناوی ڕاجا یۆگادا کە بەشێوەیەکی سەرەکی دەگات بە هەمان دەرئەنجام. لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا بوزا بە قوتابیەکانی گوت نیشانە سەرەتاییەکانی ئازادبوونی پێگەیشتوە پێش ئەوەی ماڵەکەی جێبهێڵێت کاتێك

هێشتا گەنج بوو ڕۆژێك دانیشتبوو لەژێر سێبەری ساردی دارسێوێکدا ڕۆچووبوو لەبیرکردنەوەیەکی قووڵدا بۆئەوەی خۆی ببینێتەوە لە ئاستی یەکەمی دوای ڕۆچووندا. ئەوە یەکەمین چەشتنی سەرەتایی بوو بۆ تام و چێژی ئازادبوون، بەخۆی گوت: ((ئەمە ڕێگای ڕووناکبوونەوەیە)). تامەزرۆیی بۆ گەڕانەوە سەر ئەم ئەزمونە و قووڵبوونەوە تیایدا، هێندەی بەئاگابوونی بۆ خەڵاتە بێماناکانی ژیانی دونیایی، ڕێنمونیان کرد بۆ پێداگریکردن لەسەر تەرخانکردنی تەواوی ژیانی بۆ سەرکەشی ڕۆحی. دەرئەنجامەکە وەك بینیمان زیارترە لە هێنانە کایەی فەلسەفەیەکی نوێ بۆ ژیان. ئەمە لەدایکبوونێکی ڕۆحی گشتگیر بوو، گۆڕانکاری بوو بەرەو شێوازێکی جیاواز لە دروستکردن وای لێکردوە هەست بە جیهان بکات بەشێوازێکی نوێ. ئەگەر ئەمە نەبینین و لێی تێنەگەین ئەوا ئامادەنین بۆ تێگەیشتن لە هێزی بوزییەت لە مێژوی مرۆڤایەتیدا. شتێك هات بەسەر بوزادا لەژێر درەختی بودا هەروەها شتێك هاتووە بەسەر هەموو بوزییەکی ڕەگەزپەرست هەتا کۆتایی لەسەر ڕێگای خاوەن هەشت لق. ئەقڵ وەك ئامێرێکی وێنەگرتنە لەوانەیە بەتەوای بینینی چڕنەکردبێتەوە بەڵام گەیشتوە بە دەستەواژە وردبینەکە. لەگەڵ لابردنی خەیاڵ و هەوەس و ڕق وکینە، سێ ژەهرەکە، ئەوکات دەبینین شتەکان لەڕاستیدا بەوجۆرە نین کە بیرمان لێدەکردنەوە. هەموو گریمانەکان لاچوون و گۆڕان بۆ دەرکپێکردنی ڕاستەوخۆ. ئێستا ئەقڵ لە شوێنە دروستەکەیدایە.

## بنەما سەرەکیەکانی بوزییەت

دووپاتکردنەوەی تێڕوانینی گشتی بوزا لەبارەی ژیانەوە کارێکی زۆر قورسە، قورسترە لە دووپاتکردنەوەی تێڕوانینی هەر کەسایەتیەکی تری دیار لە مێژودا لەبارەی ئەم بابەتەوە. بەشێك لەم کێشەیە لەبارەی ئەو ڕاستیەی دەڵێت بوزا هاوشێوەی زۆربەی مامۆستا دێرینەکان هیچ شتێکی نەنوسیوە. کەلێنێك هەیە لەنێوان وتەکانی و یەکەمین تۆماری نوسراو بە ماوەی سەدە و نیوێك وێڕای ئەوەی یادەوەری ئەو ڕۆژانە بەهێز و زۆر ڕاستگۆیانە دەردەکەون، بەڵام گومانی تیانیە ئەو کەلێنە بەو ماوە درێژە پێویستە چەند هێمایەك سەرسوڕمان و گومان دابنێت لەسەر تۆمارە نوسراوەکان. کێشەیەکی تر دێتە ئاراوە بەهۆی زۆری کەرەستەکان لە خودی دەقەکاندا. بوزا سەرقاڵی کاری فێرکاری بوو بەدرێژایی چل و پێنج ساڵ بەبەردەوامی، کۆمەڵێکی زۆر لەو ڕێنماییانەمان پێگەیشتوە بەجۆرێك لە جۆرەکان لەکاتێکدا دوا سەرئەنجام بەدڵنیاییەوە پۆزەتیڤانەیە، بەڵام بڕێکی زۆر لە کەرەستەکان مرۆڤ توشی سەرلێشێوان دەکەن چونکە وێڕای ئەوەی ڕێنماییەکانی بەجێگیری ماونەتەوە بەرێژایی ساڵەکانی تەمەن، کارێکی ئەستەمە بۆ هەر مرۆڤێك کۆمەڵە شتێك بڵێت بە چەندین ئەقڵی جۆراوجۆر بەبێ ئەوەی کێشە دروست بکات. ئەو شیکردنەوانە جیاوازن لەوکاتەی دەستی بەدەرکەوتن کرد لەو دەقانەی پێشتر لە خوێدنگاکاندا بەربڵاوبوون، هەندێکیان هەوڵدەدەن بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی دورکەوتنەوە یان جودابوونەوەی بوزا لە هیندۆسیەتی براهمانی، لەکاتێکدا خوێندنگاکانی تر هەوڵدەدەن بۆ بەهێزکردنی ئەو جودابوونەوەیە. ئەمە واله زاناکان دەکات توشی سەرلێشێوان بن لەکاتی خوێندنەوەی ئەو دەقانە لە زانینی ئەوەی چەندیان بوزای ڕاستەقینە خاوەنیانە و چەندیان دەستێوەردانی گروپ و ڕەوتەکانە. گومانی تێدانیە کۆسپی گەورەتر هەیە لەبەردەم سەرلەنوێ دۆزینەوەی فەلسەفەی بوزا کە چاکسازی تیاکراوە، بەهەرحاڵ بێدەنگیە تایبەتەکەی لەبارەی خاڵە یەکلاکەرەوەکانەوە. وەك بینیمان گرنگی پێدانی سەرەکی لەبارەی کێشە زانستیەکان و چارەسەرەکانیەوە بووە نەك لەبارەی کێشەکانی تێرامان و کێشە تیۆریەکانەوە. لەبری ئەوەی گفتوگۆ بکات لەبارەی کاروباری گەردونیەوە، بوزا ویستی خەڵکی بخاتەناو شێوازێکی جیاواز لە ژیانەوە. بەڵام هەڵەیە بڵێین کاروبارە تیۆریەکان بەهیچ جۆرێك گرنگ نەبوون بەلایەوە. وتارەکانی ئەوە نیشان دەدەن کە هەندێك کێشەی زۆر ووردی شیکردوەتەوە لەبەرئەوەی لەڕاستیدا ئەقڵێکی ناوازەی هەبووە لەوبارەیەی پەیوەندی هەیە بە کێشەکانی پشت سروشتەوە. بەرگریکردنی بۆ فەلسەفە بەرگریکردنێکی بنچینەیی بوو، وەك کەسێك هەست بکات بە گرنگی ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە لەبری خۆ سەرقاڵکردن بەو ئارەزوانەی تەنها بۆ کات بەسەربردنن. لەو بڕیارەیدا مافی ئەوەی هەیە وادابنێت خیانەت کردنە هاوشێوەی ئەم بەندە بخەینەناو هەندێك لە بنەما سەرەکیەکانەوە لەبارەی تێڕوانینی بوزاوە بۆ جیهان. بەڵام لەکۆتاییدا ناکرێت خۆمان بەدور بگرین لەم کارە لەبەر هۆکارێکی سادە ئەویش بریتیە لەوەی ناکرێت خۆمان بەدووربگرین لەو شتانەی پەیوەندیان بە میتافیزیکا(پشت سروشت)ەوە هەیە. هەموو مرۆڤێك چەند بیرێك بە مێشکیدا دێت لەبارەی دوا پرسیارەکانەوە، ئەم بیرکردنەوانە کاردەکەنە سەر شیکردنەوەی ئەو کێشانەی پەیوەندیان پێوەی هەیە. بوزا ئەوەی ڕەتدەکردەوە کە ڕۆبچێت لە گفتوگۆ فەلسەفیەکاندا بەدەگمەن ڕێگەی بەخۆی دەدا دەربچێت لەو چوارچێوەیە بۆ پشکنینی ژمارەیەك لەو کێشانە بەوریاییەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە تێڕوانینی تایبەتی هەبوو لەو بارەیەوە. هەرکەسێك مەبەستی تێگەیشتنی هەبێت لێیان ناکرێت خۆی بدزێتەوە لەو ئەرکە مەترسیدارەی کە هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی ئەو تێڕوانینانە. دەتوانین دەستپێبکەین بە چەمکی نیرڤانا، ئەو وشەیەی بوزا بەکاری دەهێنا بۆ خستنەڕوی ئامانجی ژیان لەڕوانگەی خۆیەوە. ئەم وشەیە بە واتای گومناوی‌یان لەناوچوون دێت،

هەروەك بڵێسەی ئاگرێك كەلە سوتان دەوەستێت و دەكوژێتەوە. كاتێك ئاگر ئەو سوتەمەنیە لەدەست دەدات كە خۆراكی پێدەدات ئـەوا دەكوژێتـەوە، ئەمـە نیرڤانایـە. لـەم وێناكردنـەوەوە وادانـراوە ئـەو كوژانـەوەی بوزییـەت ئاماژەی بۆ دەكاتبریتیەلە نەبوونی تەواو. ئەگەر كارەكە بەمجۆرە بوو ئـەوا بنەمایـەك دەبێـت بـۆ تۆمـەتباركردنی بوزییەت بەوەی كە ژیان ڕەتدەكاتەوە و ڕەشبینانەیە. ئەمە ئەو شتەیە زانایانی نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو لەبارەیـەوە دواون. نیرڤانا بریتیـە لـە چارەنوسـی ڕۆحـی مرۆیـی، واتـا تەواوەكـەی لەناوچوون و نـەمانی تـەواو، بەڵام پێویستە وردبین بین لەبارەی ئەو شتەی دەكوژێتەوە. ئەویش سنوری دەروونی كۆتادارە. ئەمە بەو مانایە نایـە تئـوە شـتەی دەمێنێتـەوە هـیچ نیـە. بەشـێوەیەكی نێگەتیڤانـە نیرڤانـا ئـەو حاڵەتەیـە كـە تیایـدا سـوتەمەی ئاگرەكـە ئارەزویـەكی تایبەتـە كـە بەتـەوای بـەكارهاتوە، هـەموو ئـەو شـتانەی ژیـان دیـاری دەكـەن مـردون. بەشێوەیەكی پۆزەیڤانە نیرڤنا خودی ژیانی بێسنورە. بوزا هەموو باسكردنێكی پۆزەتیڤانەی تێپەڕاندوە بۆ ئـەو حاڵەتـەی كـە هـیچ مـەرجێك یـان سـنورێكی نیـە، پێداگری دەكـات لەسـەرئەوەی كـە: ((شـایەنی باسـكرد نیـە، شایەنی بـاوەڕپێكردن نیـە، شـایەنی دەركپێكـردن نیـە، ناكرێـت لەبارەیـەوە بـدوێین))، سـەیرنیە كـەدوای ئـەوەی هەموو سیمایەكی ئاگایی لابرا كـە دەیناسـینەوە ئەوكاتـە چـۆن دەتـوانین بـدوێین لـەبارەی ئـەوەی ماوەتـەوە(٣٠)؟

یەكێك لە میراتگرەوەكانی بوزا ناجاسینا ئەم خاڵەی پاراست لەم وتووێژەدا:

-ئایا شتێك هەیە وەكو با بێت؟

-بەڵێ سەروەرم!

-گەورەم تكایە بام نیشان بدە بە ڕەنگ و تایبەتمەندیەكانیەوە، ئایا تەنكە یان ئەستور، درێژە یان كورت؟

-بەڵام گەورەم ناكرێت با ببینین چونكە با ناگیرێت بە دەست لەگەڵ ئەوەی بوونی هەیە.

-كەواتە گەورەم! ئەگەر نەكرێت با ببینین كەواتە بوونی نیە.

- ئەی گەورەم ناجاسینا دەزانم با بـوونی هەیـە، هـەروەها بـاوەڕم بـەوە هەیـە بـەڵام نـاتوانم والـە بـا بكـەم بـە چـاو ببینرێت. -لەگەڵ ئـەوەدا ئـەی گـەورەم! نیرڤانـا بـوونی هەیـە بـەڵام ئەسـتەمە وای لێبكـەین ببینرێـت(٣١). كەواتـە نەزانیە وابیربكەینەوە كە دوا چارەنوسمان شایەنی دەركپێكردنە. هەموو ئەوەی دەتوانین بیزانین بریتیە لـەوەی نیرڤانا حاڵەتێكە لەپشت سنوری ئەقڵ و بیركردنەوە و هەستەكان و خواست و ویسـتەوە، چونكە هـەموو ئەمانـە (وێڕای كارە جەستەییەكان) كەبە بەربەست دادەنرێت. بوزا تاكە باسكردنێكی پۆزەتیڤانەی كردوە كاتێك وتـی: ((پیرۆزیە ئەی هاوڕێیان بەڵێ نیرڤانا پیرۆزیە)). ئایا نیرڤانـا بریتیەلـە یـەزدان؟ كاتێـك بـە نـەرێ وەڵامدەدەینـەوە ئەوا ئەم پرسیارە دەبێتەهۆی دەرئەنجامێكی پێچەوانە. هەندێك گەیشتون بە دەرئـەنجامێك كـە بوزییـەت بـوونی یەزدان ناخاتەڕوو، لەبەرئەوە ناكرێت بە ئایین دابنرێت لەكاتێكدا چەند كەسێكی تـر بـەو دەرئەنجامـە گەیشـتون بەتـەواوی ئاشـكرایە كـە ئایینـە، چـونكە لـە پێویسـتیەكانی ئـایین بـاوەڕبوون نیـە بـە یـەزدان. ئـەم گفتوگۆیـە پێویسـتی بـە سـەیركردنێكی خێرایـە بـۆ واتـای وشـەی الله. واتـای ئـەم وشـەیە تاكـە شـتێك نیـە وێـڕای ئـەوەی سادەیە. پێویستە دوو ماناكەی وشەی الله لەیەك جودابكەینەوە بۆئەوەی شوێنەكەی بزانین لە بوزییەتدا. دوو ماناكەی وشەی الله گەردونی بونیادناوە بەدەستپێكردن لـە خواسـت و بڕیاردانـەوە. بوم واتایـە نیرڤانـا الله نیـە. بوزا بە كەسێكی دانەناوە چونكە كەسایەتی پێویستی بە پێناسـەكردن هەیـە ئەمـە شـتێكە جێگـای نابێتـەوە لـە نیرڤانادا. لەكاتێكدا بوزا نكوڵی نەكردوە لە دروشتبوون بەشێوەیەكی ڕاشكاو بەڵام ئەوەی بەدور زانیـوە نیرڤانـا بەرپرسیارە لێی بەشێوەیەكی ئاشكرا. ئەگەر باوەڕنەبوون بە یەزدانی بەدیهێنەر خوانەناسی بێت ئەوا بوزییـەت ئایینێكی خوانەناسانەیە. بەڵام مانایەكی تر هەیە بۆ یەزدان ناوی بـراوە بـە (مەبەسـتێك كـە جیـای دەكاتـەوە لـە

واتای یەکەمی) دەستەواژەیەکی یەزدانیە. بیرۆکەی کەسایەتی بەشێك نیە لەم تێگەیشتنە کە دەردەکەوێت لە ئەدەبیات و ئاسەواری سۆفیگەریدا لە هەموو شوێنەکانی جیهان. کاتێك بوزا ڕایگەیاند و وتی: ((لێرەدا ئەی ڕەبەنەکان! نە لەدایکبوویەك و نە بوونەوەرێك هەیە. . . ئەگەر بەوجۆرە نەبێت ئەوا نە ئازادبوون نە ڕزگاربوون لە پەیدابووندا نەدەبوو، نە دەربازبوون لە دروستکراو))(٣٢)، وادەرکەوت ئاماژەی دەکرد بۆ ئەو تێگەیشتنەیەزدانییە. لە دەرئەنجامی سەرسامبوونی بە لێکچواندنەکان لەنێوان نیرڤانا و یەزدانیەتدا، ئێدوارد کۆنز edward conze چەند دەقێکی بوزییەتی کۆکردوەتەوە لە زنجیرە تایبەتمەندیەکدا بەتەواوی چوونیەکە لەگەڵ هەریەکەلە نیرڤانا و چەمکی یەزدانیدا. وتراوە: ((نیرڤانا هەمیشەییە، جێگیرە، فەنابوونی نیە، ناجوڵێت، کاتی بۆ نیە (بێ سەرەتایە و بێ کۆتاییە)، نەمرە، لەدایك نەبووە، ناگۆڕێت. نیرڤانا هێزە، پیرۆزییە، شادومانیە، ئارامگا و پەناگەیە، ڕاستیەکی شکۆدارە، دوا ئامانجە، کاملبوونی ژیانمانە، ئاشتەوایی هەمیشەییە، شایەنی تێگەیشتن نیە))(٣٣). دەتوانین لەگەڵ کونز بەو دەرئەنجامە بگەین کە نیرڤانا یەزدان نیە کە ناسراوە وەکو بەدیهێنەر، بەڵام زۆر نزیك دەوەستێت لە چەمکی یەزدان بە مانا یەزدانیەکەی بەڕادەیەك وامان لێدەکات ئەو واتایەی بۆ تەرخان بکەین(٣٤). ئەو شتەی سەرنجڕاکێشترە ئەوەیە بوزا وتویەتی لەبارەی مرۆڤەوە، کە خاوەن خودی خۆی نیە. بیروباوەڕی ئاناتا وای لە بوزییەت کردوە وەك ئایینێکی زۆر نامۆ دەربکەوێت. بەڵام لێرەدا پێویستە ئەم وشەیە بەباشی بپشکنرێت. ئاتا بە زمانی بالی یان ئاتمان یان سنسکریتی واتە دەروون یان ئەو خودەی کە بوزا بوونی ڕەتدەکردەوە؟ لە سەردەمی بوزادا بەم واتایە دەهات (١)شتێك یان مادەیەکی ڕۆحی بەپێی بینینی هیندۆسیەت بۆ مرۆڤ، (٢)ناسنامەکەی خۆی دەپارێزێت بەشێوەیەکی سەربەخۆ بۆ هەمیشە. بوزا هەردوو تایبەتمەندیەکەی ڕەتکردەوە. بەدرۆخستنەوەی بوزا بۆ ئەو گەوهەرە ڕۆحیە، واتە ڕۆح وەك بوونەوەرێکی کورتەباڵا، وەك تارماییەك لەناو جەستەدا کە جەستە دەجوڵێنێت و ژیانی تیا پەخش دەکات، دەمێنێتەوە لەدوای فەنابوونی جەستە-ئەمە خاڵێکی سەرەکیە واتاکەی جیاکردوەتەوە لە کۆچی ڕۆحەکاندا transmigration لەبارەی شیکردنەوەکانی هیندۆسیەتەوە کە بەربڵاو بوو لەو سەردەمەدا بۆ بیروباوەڕی کۆچکردنی ڕۆحەکان. بوزا گومانی نەبوو لەوەی کە بەرجەستەکردنەوەی ڕۆحەکان incarnation بەجۆرێك لە جۆرەکان ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە بەڵام وێڕای ئەوە ڕەخنەی دەگرت لە شێوازی شیکردنەوەی براهمە هیندۆسیە هاوچەرخەکانی بۆئەم چەمکە. دەکرێت کرۆکی ڕەخنەگرتنەکەی کۆبکەینەوە لە ڕوونترین باسکردنەکان کە پێشکەشی کردوە لە تێڕوانینی تایبەتیەوە بۆ ئەم بابەتە. وێنەی ئاگرێکی بەکارهێناوە کە دەگوازرێتەوەلە مۆمێکەوە بۆ یەکێکی تر. ئاشکرایە ئەستەمە وابیربکەینەوە کە ئاگری سەر دوا مۆم هەمان ئاگری یەکەمین مۆمە، دواتر پەیوەندی نێوانیان پەیوەندیەکی هۆکاری تێناپەڕێنێت کە تیایدا کاریگەری دەگوازرێتەوە بەناو زنجیرەیەك لە کاردانەوە بەبێ بوونی گەوهەرێکی جێگیر. ئەگەر بۆ وێنەی ئاگرەکە ئەم ڕرازیبوونەی بوزا زیادبکەین بۆ کارما ئەوا دەگەین بە جۆرە پوختەیەك کە وتویەتی لەبارەی لەبەرگرتنەوەی ڕۆحەکان. دەکرێت بیرۆکەکەی کورتبکرێتەوە لەم خاڵانەدا:

١-زنجیرەیەکی هۆکاری هەیە لەنێوان هەموو ژیانێکی نوێ و ژیانی پێشویدا کە لێوەی دروستبووە دواتر لەنێوان ژیانی نوێ و ئەو ژیانەی بەدوایدا دێت. هەموو ژیانێك لە حاڵەتەکەی ئێستایدا ئەم شێوەیەی وەرگرتوە بەهۆی ئەو ڕێگایەی ژیانەکان پیایدا تێپەڕیوە.

٢-بەناو هەموو ئەم پلەبەندکردنە هۆکاریەدا ئیرادە و خواست بە سەربەخۆیی دەمێنێتەوە. یاسای هۆکاری وا لەم حاڵەتەی ئێستا دەکات ببێتە بەرهەمی کردارەکانی ڕابردوو، بەڵام لەناو ئەم حاڵەتەی ئێستادا ئیرادە لەژێر

کاریگەری کردارەکانی ڕابردوودایە بەڵام زاڵ نیە بەسەریدا واتە بە ئاسەواری ئەو کردارانە ڕێناکات. خەڵك بە سەربەخۆیی دەمێننەوە لە پێکهێنانی قەدەریاندا.

٣-دوو خاڵەکەی پێشو جەخت دەکەنەوە لەسەر پەیوەندی هۆکاری لە ژیاندا، بەڵام بەپێویستی نازانن کە گەوهەرێك هەبێت تا بیگوێزنەوە. بیرکردنەوەکان، هەڵسوکەوتەکان، هەستەکان، تەوژمەکانی ئاگایی، ساتەکانی ئێستا، ئەمە هەموو ئەو شتانەن کە دەیانبینین بەڵام کۆڵەکەیەکی ڕۆحی تیا نابینرێت. هیوم hume و جەیمس james لەسەر حەقن: ئەمر دەرونێکی هەمیشەیی هەبێت کە هەردەم بکەر بێت نەك کارپێکراو ئەوا هەرگیز خۆی دەرناخات. دەکرێت بەم وێنەیە تێڕوانینی بوزا ڕونبکرێتەوە لەبارەی کارماو بەرجەستەکردن لە لەبەرگرتنەوەی ڕۆحەکانەوە:

١-ئارەزوەکان و ڕق و کینەکان کاردەکەنە سەر پێکهاتە ئەقڵیەکان کە بە ڕێکەوت دەرنەکەوتون، پەیوەندیەکی سەرەکی هەیە بە پیشاندەرەکانی پێشو. سەرەڕای ئەو هەڵوێستەی کە پێشتر وەرمگرتوە لە کلتورەکەمەوە کە دابونەریتە ئەقڵیەکانی پێکهێناوە. ئەم دابونەریتانە ئارەزوە جۆراوجۆرەکان لەخۆدەگرێت لەگەڵ مەیلی بەراوردکردنی خود لەگەڵ ئەوانی تردا لە خۆبەزلزانین، ڕێکخستنەکان لەبارەی ڕازیبوون پێی یان لەبارەی پێچەوانەکەیەوە کە ڕقلێبوونیەتی.

٢-وێڕای ئەوەی کاردانەوە ناسراوەکان بەرەو جێگیربوون دەچن بەڵام نەبەستراومەتەوە بە مێژوی تایبەتیمەوە چونکە دەتوانم بیرۆکەی نوێ و گۆڕانکاری لە بیروڕادا بەدەستبهێنم.

٣-نە بەردەوامی نە سەربەخۆیی کە دوو خاڵی پێشوو جەخت دەکەنەوە لەسەری پێویستیان بەوەیە ببنە بیرۆکە و هەستی گەوهەری ئەقڵی کە بگوازرێنەوە لە ئەقڵێکەوە بۆ یەکێتی تر، یان لەساتێکەوە بۆ ساتێکی تر. بەدەستهێنانی گرنگیدان بە دادپەروەری لە باوك و دایکمەوە بەو واتایە نایەت کە مادەیەك هەیە لە سەری ئەوانەوە بازی داوەتە ناو سەرم. ئەم نکوڵی کردنە لە گەوهەری ڕۆحی هیچ نیە جگەلە دیمەنێك بۆ نکوڵیکردنی بوزا بۆ هەموو گەوهەرێك هەر چیەك بێت. گەوهەر دوو مانای هەیە گشتی و تایبەتی. بەشێوەیەکی گشتی وشەی گەوهەر یان مادە ئاماژە دەکات بۆ شتێکی هەمیشەیی کەخۆی حەشارداوە لەپشت گۆڕانکاریە ڕوکاریەکانی شتەکانەوە کە بەشێوەیەکی دیاریکراو وابیردەکرێتەوە ئەم شتە سەرەکیە مادەیە. زانای دەرونناسی لە بوزادا دژ بەم تێگەیشتنەیە چونکە سەبارەت بەو، ئەقڵ سەرەکیترە لە مادە. لەلایەکی ترەوە بوزا بەرەوڕووی جیهانی ئەزمونی بووەتەوە لە بوزادا دەرئەنجامەکانی بیرکردنەوە لەبارەی گەوهەرەوە. ئەستەمە زۆربەی ئەدەبی بوزی بخوێنرێتەوە بەبێ پابەندبوون بەم واتا گوازراوە (ئانیکا anicca) و نەمانی هەموو شتێکی کۆتایی هاتو، دەرکپێکردنی فەنابوونی هەموو بوونەوەرێکی سروشتی[20]. ئەمە ئەو شتەیە سیماکانی بوزییەت دەداتە جیهانی سروشتی لە توندیەکەیدا:

ژیان گەشتێکە

و مەرگ گەڕانەوەیە بۆ زەوی

گەردون وەك ئۆتێلێك وایە

و ساڵەکانی ڕابردوو وەك و تۆز و خۆڵ وایە.

---

[20] ئەمە وتەی پەروەردگارمان بیردەخاتەوە لە قورئانی پیرۆزدا: وَلا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ القصص: ٨٨ و كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ الرحمن: ٢٦ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ الرحمن: ٢٧.

بوزا تایبەتمەندیەکی کاتی داوەتە ئانیکا وەك یەکێك لە سێ تایبەتمەندیەکە لە تێڕوانینی تایبەت بەخۆیەوە–ئەو تایبەتمەندیانەی جێبەجێ دەکرێن بەسەر هەموو شتێکدا لە سیستمی سروشتدا–دوو تایبەتمەندیەکەی تر بریتین لە: ئازار چەشتن دوکها و بێ دەروونی ئاناتا، واتە نەبوونی ناسنامەیەکی جێگیر.
هیچ شتێك لە جیهانی سروشتیدا ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی پێش چەند ساتێك لەسەری بووە لەم تێڕوانینەوە بوزا نزیك بووەتەوە لە زانستی هاوچەرخدا کە ئەوەی دۆزیوەتەوە بوونەوەرەکان تاڕادەیەك جێگیرن لە جیهانی گەورەدا بەڵکو بوونی پێکدەهێنێت لە چەند وردیلەیەك خەریکە بوونی نیە.
بۆئەوەی جەختبکاتەوە لەسەر خێرایی نەمانی ژیان و تایبەتمەندیە کاتیەکەی بوزا پێکهاتەکانی خودی مرۆڤایەتی ناوناوە سکاندا–واتە تۆپەڵە دەزوویەك کەبە شلی پێکەوە بەستراون–جەستەی مرۆیی ناوناوە کۆمەڵە توخمێك کە هیچ پەیوەستیەك نیە لەنێوانیاندا زیاتر لە پەیوەستی نێوان دەنکۆڵە لمەکانی ناو تۆپەڵە لمێك. بەڵام بۆچی بوزا هێرش دەکاتە سەر شتێك کە ئاشکرا دەردەکەوێت؟ هۆکاری ئەمە بریتیەلەوەی وابیریکردوەتەوە ئێمە ڕزگارمان نابێت لە ئازاری پەیوەستبوون بە بەردەوامیبوونەوە تەنها ئەگەر باوەڕمان نەگات بە بنەمای گۆڕانی بەردەوامەوە بۆ مۆخی ئێسکمان (واتە ببێتە ڕازیبوونێکی تەواو). شوێنکەوتوانی بوزا بەتەواوی تێدەگەن لە ئامۆژگاریەکەی:
ئەم جیهانە بە تارمایی بزانە
وەك ئەستێرەیەك لە بەرەبەیاندا، وەك بڵقێکی ناو ئاو
وەك هەورەبریسکەیەکی هاوین
وەك ئاگری چرایەك وەك خەونێك(٣٥).
ئەگەر ئەم هەست پێکردنەمان وەرگرت وەك شتێکی کاتی بۆ هەموو شتە سنوردارەکان، تەنها پێشبینی ئەوە دەکەین کە وەڵامەکەی بوزا لەبارەی ئەم پرسیارەوە: ((ئایا مرۆڤ دەمێنێتەوە لەپاش مردنی جەستەیی؟)) ئەمە ڕەتکردنەوەیەکی ئاشکرایە بەڵام لەڕاستیدا وەڵامەکەی بەوجۆرە نەبوو بەڵکو یەکلاکەرەوە نەبوو. کاتێك کەسانی ئاسایی دەمرن لەدوای خۆیان چەند تەوژمێك لە ئارەزوی سنوردار جێدەهێڵن کە پێویستە بێتەدی لە بەرجەستەکردنە نوێکاندا، بەم واتایە بەلایەنی کەمەوە ئەو کەسانە بەردەوام دەبن لە ژیان(٣٦). بەڵام ئایا ئەو کەسانە چیان بەسەردێت کە گەیشتون بە پلەوپایەی ئارهات arhat واتە ئەو قەشانەی هەموو ئەو ئارەزوانە کوژانەتەوە لە بوونیاندا، ئایا ئەو جۆرە کەسانە بەۆردەوام دەبن لە بووندا؟ کاتێك سۆفیەکی گەڕۆك ئەم پرسیارەی کرد بوزا لە وەڵامدا پێی وت:
–وشەی دوبارە لەدایکبوونەوە بەسەریدا جێبەجێ ناکرێت.
–کەواتە ئایا دەکرێت بڵێین کە سەرلەنوێ لەدایکنابێتەوە؟
–دەستەواژەی سەرلەنوێ لەدایکنابێتەوە بەسەریدا جێبەجێ ناکرێت!
–ئەی گوتاما (ناوی ڕاستەقینەی بوزا) وەڵامی پرسیارەکانت دامەوە بە نەرێ. بەو هۆیەوە من شڵەژاوم و سەرم لێ شێواوە.
پێویستە بشڵەژێیت ئەی ڤاچچا vaccha چونکە ئەمە بیروباوەڕێکی زۆر قووڵە و تێگەیشتن لێی قورسە، شایەنی تێبینی کردن نیە، تەنها کەسە داناکان لێی تێدەگەن. لەبەرئەوە بالێت بپرسم: ئەگەر ئاگرێك لەبەردەمتدا هەڵبگیرسێت ئایا ئەو ئاگرە دەناسیتەوە؟
–بەڵێ ئەی گوتاما

–ئەگەر ئاگرەکە کوژایەوە، ئایا هەست بەوە دەکەیت کە دامرکاوەتەوە؟
–بەڵێ
–ئەگەر پرسیارت لێکرا ئاگرەکە بە چ ئاڕاستەیەکدا ڕۆیشت، ئایا بەرەو ڕۆژئاوا یان ڕۆژهەڵات یان باکور یان باشور، ئایا دەتوانیت وەڵام بدەیتەوە؟
–پرسیارەکە بەشێوەیەکی دروست ڕون نەکراوەتەوە ئەی گوتاما.
لەوکاتەدا بوزا کۆتایی هێنا بە گفتوگۆکەی بەم وتەیە: بە تەواوی بەهەمان ڕێگە سۆفیەکە پرسیارەکەی بەشێوەیەکی دروست نەکرد. ((هەستەکان، وێناکردنەکان، هێزەکان، ئاگایی هەموو شتێك کە دەکرێت ئاماژەی پێ بکرێت لە ئارهات arhat دا لەسەری لاچووە. ئارهات دەرکی پێناکرێت، ناپێورێت، قووڵە وەك زەریایەك، ناوترێت کە سەرلەنوێ لەدایکبووەتەوە بەڵکو هەریەکە لەو کۆمەڵە دەستەواژانەی بەسەردا دەچەسپێت))(٣٧).
ئەوەی یارمەتیدەرمانە بۆ تێگەیشتن لەم گفتوگۆیە بریتیەلەوەی هیندۆسیەکان لەوسەردەمەدا وابیریان دەکردەوە هەر ئاگرێك کاتێك دادەمرکێتەوە فەنا نابێت لەڕاستیدا بەڵکو دەچێتە حاڵەتێکی نەبینراوەوە کە هەموو ئاگرەکان تیایدا بەشدارن پێش ئەوەی ببینرێن. بەڵام هێزی ڕاستەقینەی ئەم گفتوگۆیە حەشاردراوە لە جێگایەکی تردا. لە پرسیارکردنی لەو جێگایەی ئاگرەکە بۆی چووە کە وادانراوە دامرکاتەوە بوزا سەرنجی ئاگایی ڕادەکێشێت بۆ ئەو ڕاستیەی کە هەندێك لە کێشەکان لەو زمانەوە هەڵدەقوڵێت کە بەکاریدێنین بەشێوەیەکی نەزانانە کە هەندێك جار پێویست بەوە دەکات چارەسەرێك بدۆزینەوە بۆ ئەو دەستەواژەیەی کە بەکاری دەهێنین. بابەتی بوونی ڕۆح کە گەیشتوە بە ڕووناکبوونەوە لەدوای مەرگ یەکێکە لەو نمونانەی کەلەسەر ئەم حاڵەتەن. ئەگەر بوزا وتی بەڵێ ئەوا بەردەوام دەبێت لە ژیان ئەوا گوێگرانی بەردەوام دەبن لەسەر ئەو شێوازەی ئێستا لە ئەزمون و هەستپێکردن، ئەمە کارێکە بوزا مەبەستی لێی نەبووە بەهیچ جۆرێك. لەلایەکی ترەوە ئەگەر بوزا پێی وتن ڕۆحی ڕوناکبووەوە لە بوون دا دەوەستێت ئەوا گوێگرانی وادادەنێن کە ڕۆح بەرەو نەمان دەبات، هەروەها ئەمە کارێکە بوزا نەیویستوە بیڵێت. لەسەر بنەمای ئەم ڕەتکردنەوەیە ناتوانین بەمتمانەوە زۆر بڵێین بەڵام دەتوانین شتێك بڵێین ئەوەش بریتیەلەوەی دوا چارەنوسی ڕۆحی مرۆیی حاڵەتێکە تیایدا هەموو ئەزمونێکی تایبەتی دەرونی سنوردار بەرەو نەمان دەچێت، لەکاتێکدا هەمان هەستکردن بەتەنها نامێنێتەوە بەڵکو بەرزدەبێتەوە بۆ حاڵەتی دەرەوەی دەرکپێکردن. هەروەك خەونە تێکەڵ و ناڕێکەکان بەشێوەیەکی تەواو بەرەو نەمان دەچن کاتێك مرۆڤ بەئاگادێتەوە، هەروەك ئەستێرەکان دیارنامێنن وەك ڕێزلێنانێك بۆ خۆری بەرەبەیان، ڕوناکی ئاگایی تاك بەتەواوی بەری لێدەگیرێت لەژێر ڕوناکی داگیرساوی ئاگایی تەواودا. هەندێك دەڵێن: ((دڵۆپی شەونم دەکەوێتە ناو دەریای بریقەدارەوە)) لەکاتێکدا ئەوانی تر وابەباش دەزانن بیربکەنەوە لە دڵۆپی شەونم کە دەکرێتەوە بۆئەوەی بگات بە هەمان دەریا. ئەگەر ویستمان وێنەیەکی وردتر نیشان بدەین لەبارەی حاڵەتی نیرڤاناوە ئەوا پێویستە لەسەرمان بەرەو پێش بچینبەبێ یارمەتیدانی بوزا لەبەرئەوە نا دەرکی بەم حاڵەتە کردوە کە توانای وشەکان تێدەپەڕێنێت لە شیکردنەوەدا تا ڕادەی نائومێدی نەك هەرئەوە بەڵکو چونکە ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە گوێگرانی ڕازی بکات بە تێڕوانینی سەرنجڕاکێش بەڵام نادروست. بەڵام وێڕای ئەوە دەکرێت چەمکێك پێکبهێنین لەبارەی ئامانجێکی لۆژیکیەوە کە هەوڵدەدات بۆئەوەی پێی بگات. وەك پێشتر بینیمان بوزا جیهانی وادااناوە کە ڕاگیرکراوە لەسەر سیستمێکی یاسایی کە ڕوداوەکان کۆنترۆڵی دەکەن بە یاسای هۆکاری (هۆکار و ئەنجام) کە دەچێتە نێو هەموو شتێکەوە. بەڵام ژیانی ئارهات حاڵەتێك پێکدێنێت لە سەربەخۆیی لەڕادەبەدەر لەبارەی سیستمی هۆکاری سروشتەوە. ئەم سیستمە پێشێل ناکات هەموو ئەوەی لە کێشەکەدایە

بريتيە لەوەی ڕۆح ئارهات نەشونما دەكات لە حاڵەتێكی سەربەخۆیی خودیدا لەگەڵ خاوبوونەوەی مستی جیهان لەسەری. بەم واتایە ئارهات زۆر سەربەخۆیە تەنها لە ئارەزووەكان و خەمو خەفەتی جیهان و هۆكارەكانی دڵتەنگینین بەڵكو لە ڕوداوەكانی جیهان بەشێوەیەكی گشتی. لەگەڵ هەموو نەشونمایەكی (ناسینی خود و ژیان لەو ڕاستیە ناوەكیەدا) inwadness ئاشتەوایی و سەربەخۆیی جێگای كۆیلایەتی دەگرێتەوە كە ئەو كەسانە بەهۆیەوە دەناڵێنن كە هێشتا ژیانیان قوربانی هەلومەرجە دیاریكراوەكانە. هەتا ڕۆح كۆیلەی جەستەبێت ئەوا ئازادبوونی تایبەتی كاتیە و كامڵ نابێت. بەڵام لەكاتی پچڕانی ئەم پەیوەندیە بە جەستەوە كە ڕوودەدات بە مردنی كۆتایی ئارهات ئەوكاتە سەربەخۆیی لە سنوردارەوە دەبێتە سەربەخۆییەكی تەواو. ئێمە ناتوانین بیربكەینەوە لەوەی ئەو حاڵەتە چۆن دەبێت بەڵام دەتوانین دەركبكەین بە چوون بەرەوڕووی. سەربەخۆیی ڕۆحی فراوانی دەهێنێتە ژیانەوە. قوتابیانی بوزا هەستیان بەوە كرد كە بڕێك لە ڕاستی بەرجەستەدەكرد زیاتر لە هەركەسێكی تر كە ناسیبێتیان، لە ئەزمونە تایبەتیەكەیانەوە ئەوەیان بینی كە بەرەوپێشچوون لە ڕێگای بوزادا ژیانیان فراوان دەكات. هەستیان بەوە دەكرد جیهانەكانیان فراوان دەبێت لەگەڵ هەموو هەنگاوێك لەو ڕێگایەدا هەستیان بەوەدەكرد كە ژیانیان چالاكتر بووە لە پێشتر. هەتا سنورداربوون لە جەستەكانیاندا ئەوا سنورێك هەیە كە ناتوانن بیبەزێنن. بەڵام ئەگەر ئەو بەربەستانە نەمان ئایا ناتوانن سەرلەنوێ سەربەخۆ بن بەشێوەیەكی تەواو؟ بۆ جاری دووەم ناتوانین بەشێوەیەكی دیاریكراو بیربكەینەوە لە هاوشێوەی ئەم حاڵەتە، بەڵام لۆژیكی بەرەوپێش چوون بە ئاڕاستەی ئەو ئاشكرا دەردەكەوێت. ئەگەر سەربەخۆیی زیاتر بوونی زیاتر بهێنێت ئەوا سەربەخۆیی تەواو خودی بوونە. هەزاران پرسیار دەمێننەوە، بەڵام بوزا بێدەنگە. ئەوانی تر پابەندن بە پرسیارەكانمانەوە، بەڵام تۆ ئازادیت. ئێمە دەپرسین و دەپرسین، تۆ پێدەكەنیت و لە ئارامیەكی تەواودایت(٣٨).

## دەستەواژەی گەورە و دەستەواژەی بچوك

هەتا ئێستا سەیری بوزییەتمان دەکرد بەوجۆرەی کە دەردەکەوێت لە کۆنترین دەقەکانیدا. ئێستا دەچینەسەر مێژووی بوزی و ئەو تۆمارەی پێشکەشمان دەکات لەبارەی ئەو ناکۆکیانەی دەکرێت بچێتەناو کلتور و نەریتە گوازراوەکان کە هەوڵدەدات بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی جەماوەر و خزمەتکردنی کەسایەتیە جۆراوجۆرەکان. کاتێك مێژووی بوزی نزیك دەکەینەوە بەم ئامانجە ئەوەی لەبەر چاومان دەردەکەوێت دوو کەرتبوونی ئەو مێژوەیە بۆ دوو کەرتی گەورە. هەموو ئایینەکان دابەشبوون تیایاندا ڕوودەدات، بۆ نمونە لە ڕۆژئاوا دوانزە هۆزە عیبرانیەکان دابەشبوون بۆ ئیسرائیل و یەهوزا، هەروەها مەسیحیەت بۆ کلێسای ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی، کلێسای ڕۆژئاوایی دابەشبوو بۆ کاسۆلیکی و پڕۆتستانتی، پڕۆتستانتی دابەشبوو بۆ چەندین گروپ و ڕێبازی جیاواز. هەمان شت ڕویدا لە بوزییەتدا، سەدەیەك تێپەڕنەبوو بەسەر مردنی بوزادا تۆوی دابەشبوون چێنرابوو. یەکێك لە نزیك کردنەوەکان بۆ پرسیاری بۆچی بوزییەت دابەشبوو پێویستە جێبەجێ بکرێت لەڕێگەی شیکاری ڕوداو و کەسایەتی و ئەو ژینگانەی کە ئەم ئایینە تیایدا پەیڕەوکراوە لە سەدەکانی سەرەتایدا. بەڵام دەتوانین ڕێگاکە کورتبکەینەوە و ئەو کێشانە تێبپەڕێنین، بەوپەڕی سادەییەوە دەڵێین بوزییەت لەبارەی ئەو کێشانەی خەڵك هەمیشە بەهۆیەوە دابەشدەبن بەهەمان شێوە دابەش دەبێت. ژمارەی ئەو کێشانە چەندە؟ واتە ژمارەی ئەو کێشانە چەندە خەڵك بەهۆیەوە دابەشدەبن بۆ چەند گروپ و کۆمەڵێك چ لە هیند بێت یان نیویۆرك یان مەدرید؟ یەکەم، ناکۆکی هەیە لەبارەی ئەوەی ئایا خەڵکی سەربەخۆن یان هەندێکیان پشت دەبەستن بەوانی تر. هەندێك کەس بەئاگان و زیاتر دەرك بە شتەکان دەکەن بە بەراورد بەوانی تر. سەبارەت بەوان سەربەخۆبوون و دەست پێشخەریان گرنگترە لە پەیوەندیەکانیان. بەڵگەنەویستیان ڕوونە لە تێڕوانینیاندا بەوەی خەڵك دەبینن ڕێگای تایبەت بەخۆیان دروستدەکەن لە ژیانیاندا، ئەوەی هەموو تاکێك بەدەستی دێنێت بەشێوەیەکی سەرەکی دەرئەنجامی کارە تایبەتەکەیەتی. ((لەدایکبووم لە کوچە و کۆڵانە هەژارەکاندا، باوکم ئالوودەبووی مەی بوو، هەموو خوشك وبراکانم سەگ خواردنی لەبەرئەوە پرسیارم لێمەکە لەبارەی بۆماوەیی و ئەو ژینگەیەی تیایدا گەورە بووم و گەیشتوم بەو پلەوپایەی ئێستا تێیدام بە هەوڵدانی تایبەتیم!)). ئەمە یەکێکە لە هەڵوێستەکان، لەلایەکی ترەوە ئەو کەسانە هەن کە ژیانیان لێوانلێوە لە پەیوەندی ئالوگۆڕکراو. سەبارەت بەوان جودابوونەوەی خەڵك لە یەکتر لاوازیان دەکات، ئەوان خۆیان بە پاڵپشتکراوی دەبیننەوە لەڕێگەی چەند ناوەندێکی کۆمەڵایەتیەوە کە لە هێزدا هیچ کەمتر نین لە ناوەندە موگناتیسیەکان لە فیزیادا. جەستە مرۆییەکان بەدڵنیاییەوە لەیەکدی جودان بەڵام لە ئاستێکی قوڵتردا ئێمە پەیوەستین بەیەکەوە وەك پەیوەستی پارچەکانی شاخە سەهۆڵینەکان لە سەرئاوکەوتنیاندا. ((مەپرسە زەنگەکە بۆ کێ لێدەدرێ، بۆ تۆ لێدەدرێت!)). پرسیاری دووەم پەیوەندی هەیە بەو پەیوەستیەی مرۆڤەکان لەسەری دەوەستن ئەمجارە لەگەڵ هاوەڵەکانیان نا بەڵکو لەگەڵ گەردون، ئایا گەردون هاوڕێیە، واتە یارمەتیدەرە بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەو بوونەوەرانەی کە تیایدا دەژین یان گرنگیان پێنادات؟ بیروڕاکان لەبارەی ئەم کێشەیەوە جیاوازن. لە ڕەفەی کتێبخانەکاندا چەندین کتێب دەبینین کە هەڵگری ناونیشانی هاوشێوەی: ((مرۆڤ بەتەنها دەوەستێت)) و لەلایەوە چەند کتێبێك دەبینین کە هەڵگری ناونیشانی وەکو: ((مرۆڤ بەتەنها ناوەستێت)) و ((مرۆڤ بەتەنها نیە)). هەندێك خەڵك تەواوی مێژوو وەك پرۆژەیەکی مرۆیی دەبینن کە خودی مرۆڤایەتی تیایدا هەڵدەسێت بە پشتبەستن بە هەوڵدانی تایبەتی، بەبێ ئەوە هیچ پێشکەوتنێك ڕوونادات. بەڵام سەبارەت بەوانی تر مێژووی مرۆیی پاڵپشتی دەکرێت و بەهێزدەکرێت لەلایەن ((هێزی شکۆدارەوە کە مێژوو بەرەو چاکە دەبات)). پرسیاری سێیەم کە خەڵکی لەسەری دابەشدەبن و هاوڕانین بریتیە لەوەی باشترین بەشی دەروونی مرۆیی کامەیە ئایا

سەرە یان دڵ؟ یاریەك ئەنجام دەدرێت لە هۆڵێكی میللیدا بەكاردەهێنرێت بۆئەوەی والە مرۆڤ بكات بەقووڵی بیربكاتەوە سەبارە بەم پرسیارە: ((ئەگەر پێویست بوو لەسەرت هەڵبژێریت لەنێوان ئەوەی ئایا كەسێكی خۆنەویست بیت یان بەرێز بیت ئایا كامیان هەڵدەبژێریت؟)). ئەمە هەمان خاڵە بەڵام شێوازێكی جیاوازە. كلاسیكیەكان بیركردنەوەكان پۆلێن دەكەن لە پلەوپایەی سەروو هەستەكانەوە. بەڵام ڕۆمانسیەكان بەپێچەوانەوە بیردەكەنەوە. كلاسیكیەكان بەدوای داناییدا دەگەڕێن. بەڵام ڕۆمانسیەكان ئەگەر پێویست بوو لەسەریان یەكێكیان هەڵبژێرن: ئەوان پێیان باشە سۆز و بەزەیی هەڵبژێرن. جیاكردنەوە پەیوەستە بە بەراوردكاری ولیەم جەیمس لەنێوان كەسانی خاوەن بیركردنەوەی ڕاستی و خاوەن خووڕەوشتی بەسۆز و بەبەزەیی. ئەمە ئەو سێ كێشەیە بوو كە خەڵكی دابەشكردوە، هەتا بوونەوەری مرۆیی بن ئەوا بەردەوامن لە دابەشبوون هەتا ئەمڕۆ. ئەم كێشانە بوزییە یەكەمینەكانی دابەشكرد، كۆمەڵێكیان دروشمی سەرەكیان دوا وتەی بوزا بوو كەلەسەر جێگای مەرگ وتی: ((ببنە چرا بۆ خۆتان، كاربكەن بۆ ڕزگاربونتان بەوپەڕی هەوڵ و تواناتانەوە)). هەموو پێشكەوتنێك كە ئەوانە بەدەستی دێنن كە سەر بەم كۆمەڵەیەن لە بوزییەكان دادەنرێت بە بەروبوومی دانایی واتە ژیری خۆڕسك بە هۆكاری ڕاستەقینە ئازار و ئەشكەنجەكە بەدەستهێنراوە لەڕێگەی تێڕامانەوە. بەڵام كۆمەڵەی دووەم بەزەیی و سۆز بە گرنگترین تایبەتمەندیەكانی ڕوناكبوونەوە دادەنێن، دەریانخستوە كە داواكردنی ڕوناكبوونەوە بۆ خودی ڕوناكبوونەوە ناچونیەكی لە وتەكاندا تێناپەڕێنێت. سەبارەت بەوان بوونەوەرە مرۆییەكان زیاتر كۆمەڵایەتین، خۆشەویستی گەورەترین بەخشینە لەم جیهانەدا. هەموو ناكۆكیەكانی تر كۆبوونەتەوە لەدەوری ئەم خاڵە سەرەكیانە. چونكە گروپی یەكەم پێداگری دەكەن لەسەرئەوەی بوزییەت ڕێگایەكە پێویستی بە كاتی تەواو هەیە بۆ مرۆڤ. ئەوانەی كردویانەتە ئامانجی سەرەكی لە ژیانیاندا بۆ گەیشتن بە نیرڤانا پێویستە لەسەریان واز لە جیهان بهێنن بەشێوەیەكی تەواو ببنە قەشە. بەڵام گروپی دووەم داواكاری كەمتر بوو لە گروپی یەكەم لەبەرئەوەی هەموو هیوایەكیان نەبەستوە بە هەوڵدانی تاكەكەسیەوە، هەروەها بینی كە تێڕوانینەكەیان دەكرێت بەدیبهێنرێت سەبارەت بە مرۆڤی ئاسایی بەتەواوی هەروەك لەتوانای قەشەیەكی شارەزادا هیە كە بەدەستی بهێنێت. ئەم ڕێگایە شایەنی جێبەجێكردنە لە جیهانی دونیاییدا هەروەك شایەنی جێبەجێكردنە لەناو دێری قەشەكاندا. ئەم جیاوازیە شوێنپەنجەی خۆی جێهێشت لەسەر دوو گروپە سەرەكیەكەی بوزییەت. هەردوكیان ڕێگاكەیان ناونا یانا yana كە بەم مانایە دێت: ((كەرەستەی گواستنەوە یان بەلەم)) لەكاتێكدا هەردوكیان وادادەنێن كە مرۆڤ دەپەڕێننەوە بەناو دەریای ژیاندا بەرەو كەناری ڕوناكبوونەوە. لەگەڵ ئەوەدا گروپی دووەكم بانگەواز دەكەن بۆئەوەی بوزییەت دەنوێنن بۆ هەموو خەڵك، دواتر دەستەواژەی گەورە پێكدێنێت. لێرەوە ئەم گروپە ناونرا ماهایانا mahayana كە بەم واتایە دێت دەستەواژەی گەورە كاتێك وشەی ماها maha بەمانای مەزن دێت (بەوهۆیەوە گاندی نازناوی ماهاتمای لێنرا واتە خاوەن ڕۆحی مەزن). كاتێك ئەم ناوە جێگیر بوو گروپەكەی تر ناونران نیهایانا nihayana واتە دەستەواژەی بچوك. بەڵام ئەم گروپی دووەمە بەتەواوی ڕازی نەبوون لەم نازناوە، پێیان باشبوو ناوببرێن بە تیراڤادا theravada: واتە ڕێگای پێشینان. بەمجۆرە دەستپێشخەری بەدەستهێنا بە بانگەشەی ئەوەی كە بوزییەتی ڕەسەن دەنوێنێت، ئەو بوزییەتەی كە خودی بوزا فێری كردون. ئەگەر كورتمان كردەوە لە ڕێنماییە ئاشكراكانی بوزادا هەروەك لە كۆنترین دەقەكاندا تۆماركراوە واتە یاسای پالی pali canon لەبەرئەوەی ئەو دەقانە بەشێوەیەكی گشتی پاڵپشتی دەكات لە ڕووانگەی بوزیەت تیراڤادا theravada. بەڵام ئەم كارە هیچ لە وەری شوێنكەوتوانی ڕێگای ماهایانای كەمنەكردوەتەوە دەستەواژەی

گەورە کە بەخێرایی بەرپەرچیان دانەوە و بەوەی جەختدەکەنەوە لەسەر ئەوەی ئەوان هێڵی ڕاستەقینەی بەردەوامیدان بە بوزییەتی ڕەسەن دەنوێنن. لە گفتوگۆکانیاندا وتیان بوزا بەشێوەیەکی قووڵتر کاری فێرکردنی ئەنجام داوە لە میانی ژیانیدا بەبەراورد بە فێرکردنی لەڕێگەی وشەکانەوەکە تۆمارکراون لە یاسای پالیدا. ڕاستی یەکلاکەرەوە لە ژیانیدا بریتیەلەوەی نەماوەتەوە لە حاڵەتی نیرڤانادا لەدوای ڕووناکبوونەوەی بەڵکو هەموو ژیانی تەرخانکرد بۆ ئەوانی تر. لەبەرئەوەی ئەم ڕاستیەی نەدرکاندوە بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە ئەوا شوێنکەوتوانی ڕێبازی تیراڤادا (کە بەشێوەیەکی توند پەیوەستن بە وشە یەکەمینەکانی بوزاوە هەروەك شوێنکەوتوانی ماهایانا دەڵێن) گرنگی خواناسیە مەزنەکەیان پشتگوێ خستوە ئەوەی وای لێکردون پەیامەکەی بخوێننەوە بەشێوەیەکی زۆر بەرتەسك(٣٩). دەکرێت ئەم دوو خوێندنگایە جێبهێڵین لە ململانێکانیاندا سەبارەت بە خەلافەتی پێغەمبەرایەتی، چونکە گرنگیپێدانمان لێرەدا لە بڕیارداندا نیە لەبەرژەوەندی یەکێك لە لایەنەکان بەڵام لە تێگەیشتن لە هەڵوێستەکان کە هەریەك لە خوێندنگاکان بەرجەستەی دەکەن. دەکرێت ناکۆکیەکان کورتبکەینەوە لەم چەند جیاوازیەدا لەگەڵ پێویستی گرنگیدان بەم جیاوازیانە بەشێوەیەکی هەتەری نا بەڵکو ئەمانە ناکۆکین لە جەختکردنەوە بەپلەی یەکەم یان ئەو گرنگیەی دەدرێت بەم خاڵی ناکۆکیە.

١-سەبارەت بە بوزییەتی تیراڤادا پێشکەوتنی ڕۆحی پشتدەبەستێت بە هەوڵدانی تاکەکەسی بەتەنها، پشتدەبەستێت بە تێگەیشتنی بە خواست و ویستی. سەبارەت بە شوێنکەوتوانی بوزییەتی ماهایانا ئەوا چارەنوسی تاك پەیوەستە بە هەموو ژیانەوە. ژیان لە دوا ڕاستیەکەیدا دابەشنەکراوە. ئەم دوو دێڕەی جۆن وییتیە john whittier لە کتێبەکەیدا بە ناوی چاوپێکەوتن the meeting ئەم دوا ڕووانگەیە دەخاتەڕوو: ئەو کەسەی دەیەوێت بگەڕێت بەدوای شتێکی تایبەت بەخۆی هیچ نادۆزێتەوە. ئەمە بۆ ئەو ڕۆحە ونبووەیە کە تەنها بۆ خۆی بەوەفایە.

٢-شوێنکەوتوانی بوزییەتی تیراڤادا وابیردەکەنەوە کە مرۆڤایەتی بە تەنها بوونی هەیە لەم گەردونەدا، خوداوەندێك بوونی نیە یارمەتی مرۆڤ بدات لەسەر تێپەڕاندنی تەنگوچەڵەمەکان لەبەرئەوە پەناگەیەکمان نیە جگەلە پشت بەستن بە خود بەتەنها لەبەرئەوە تاکە یارمەتیدەرمان بریتیە لە پشتبەستن بە خۆمان: ئێمە بۆ خۆمان کاری خراپە ئەنجام دەدەین، هەروەها بۆ خۆمان بەرگەی ئازار دەگرین، ئێمە بۆ خۆمان وازلە خراپە دەهێنین، ئێمە بۆ خۆمان پاکدەبینەوە. کەس ڕزگارمان ناکات جگەلە خۆمان، هیچ کەسێك ناتوانێت یارمەتیمان بدات. ئێمە بۆ خۆمان پێویستە لەسەرمان ڕێگاکە بگرینەبەر، بوزا تەنها ڕێگاکەی نیشان داین. بەڵام سەبارەت بە بوزییەتی ماهایانا، بەپێچەوانەوە وا دەبینن پیرۆزی شتێکی ڕاستەقینەیە. دەکرێت بگەین بە ئاشتەوایی چونکە هێزێك بوونی هەیە کە بێ سنورە بە واتایەکی تر پاڵ بە هەموو شتێکەوە دەنێت بەرەو ئامانجەکەی. بەپێی دەستەواژەی دەقە بەناوبانگەکەی ماهایانا: بوزا بوونی هەیە لە هەموو دەنکۆڵەیەك لە دەنکۆڵەکانی لمدا.

٣-لە بوزییەتی تیراڤادادا باسکردنی ڕوناکبوونەوەبریتیەلە دانایی بودهی bodhi کەبەواتای ژیری خۆڕسکی قوولْ دێت بە هۆکارەکانی دڵەڕاوکێ و ئازار و ئەشکەنجە، بەبێ بوونی گەوهەری دەرونی دابڕاو. لەم دەرکپێکردنانەوە بەشێوەیەکی خۆڕسك چوار ڕاستیە شکۆدارەکە هەڵدەقوڵێت لەگەڵ بەزەیی لێوانلێو لە خۆشەویستی و دڵخۆش بوون بە خۆشگوزەرانی ئەوانی تر. لە ڕووانگەی ماهایاناوە ناکرێت کارونا karuna واتە بەزەیی بە دەرئەنجامێکلی خۆڕسك دابنێین بەڵکو پێویستە هەرلەسەرەتاوە بەزەیی بدەینەپاڵ دانایی. چونکە تێڕامان دەبێتەهۆی پێکهێنانی وزەیەکی تایبەت کە دەشێت ڕووخێنەر بێت ئەگەر مرۆڤ بەشێوەیەکی خوازراو هەڵنەسێت بە پەروەردەکردنی بەزەیی هاتنەوە بەوانی دیکە وەك ئامانجێك و پاڵنەرێکی سەرەکی بۆ

هەڵسوکەوتی توند. ((دەمەویێتە ببمە پاسەوان و پارێزەر بۆ ئەو کەسانەی کە پارێزەریان نیە)) ئەمە نزایەکی شێوازی ماهایانیە ((هەروەها ببمە ڕێبەر بۆ گەشتیاران، ببمە کەشتیەك بیرێك کانیەك پردێکبۆ ئەوانەی دەیانەوێت بگەنە کەنارەکەی تر)). شاعیری قەشە شانتی دیڤا shantedeva کە نازناوی تۆماس ئەی کامپیس tomas a kempisی پێبەخشرا بەهۆی ئەم دەربڕینە جوانەوە: ((ئایا دەکرێتە ببمە مەرهەمێك بۆ نەخۆش، ببمە چارەسەر و خزمەتکاری هەتا نەخۆشی جارێکی تر ڕووی تێنەکات، ئایا دەکرێت بە باراندنی خواردن و خواردنەوە ئازاری برسێتی و تینویەتی بڕەوێنمەوە ئایا دەکرێت ببمە خواردن و خواردنەوەیان لە قات و قڕی کۆتایی تەمەنیاندا. ئایا دەکرێت ببمە خەزێنەی هەژاران و خزمەتیان بکەم. خودی بوونم و هەموو چێژەکانم لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتودا، بەبیٚ گوێدانە هیچ شتێك دەیانبەخشم، تەنانەت دەکرێت هەموو بوونەوەران بگەنە ئامانجەکانیان))(٤٠).

٤-سانگها sangha (واتە سیستمی قەشەیی بوزیی) دەکەوێتە ناوجەرگەی بوزییەتی تیراڤادا. دێری قەشەکان (بە پلەیەکی کەمتر دێری قەشە ژنەکان) بەدیهێنەری ڕۆحیە لەو ناوچانەی تیراڤادا بوونی هەیە، بیری هەموو تاکێك دەخاتەوە کە ڕاستیەکی شکۆدار هەیە لەپشت ڕاستی بینراوەوە کە ڕێز شکۆیەك دەداتە قەشە و قەشەژنەکان کە درێژدەبێتەوە بۆ ئەو کەسانەی نەزر دەکەن بۆ چەند ماوەیەکی دیاریکراو، ئەمە کارێکی بەربڵاوە بۆ مەشقکردن لەسەر تێڕامانی تەواو بەشێوەیەکی چڕوپڕ. لە دەوڵەتی میانمار (بۆرما لە ڕابردوودا) لەبەرکردنی پۆشاکی قەشەیی بۆ ماوەی سیٚ مانگ لە یەکێك لە دێرەکاندا بووەتە نیشانەیەك بۆ تێپەڕاندنی ئاستی تەمەنی کامڵبوون بۆ تاکە نێرینەکان. بەڵام بوزییەتی ماهایانا بەپێچەوانەوە ئایینێکە بەشێوەیەکی سەرەکی تایبەتە بە کەسانی ئاساییەوە بەڵکو تەنانەت قەشەکانیان ژن دەهێنن و پێشبینی ئەوەیان لێدەکرێت خزمەتی کۆمەڵگای دونیایی بکەنە ئامانجی سەرەکیان.

٥-ئەم ناکۆکیانە بەردەوامە تەنانەت لەبارەی نمونەی باڵاوە کە هەریەك لە خوێندنگاکان دەیخەنەڕوو. سەبارەت بە بوزییەتی تیراڤادا نمونەی باڵا بریتیەلە ئارهات واتە ئەو شوێنکەوتوەی کە گەیشتوە بە کامڵبوون کە بەتەنها ڕیٚ دەکات وەك کەرکەدەن، بەتەنها هەوڵ دەدات بۆ گەیشتن بە نیرڤانا بە تێڕامانێکی جێگیرەوە بەرەو ئامانجەکەی دەچێت. بەڵام نمونەی باڵا لەلای بوزییەتی ماهایانا بەپێچەوانەوە بریتیە لە: بودهی ساتڤا boodhisattva واتە ئەو کەسەی گەوهەرەکەی ساتڤایە و کامڵبووە لەڕێگەی دانایی بودهیەوە، ئەمە بوونێکە گەیشتوەتە سەر لێواری نیرڤانا بەڵام بەئاسایی وازی لەم خەڵاتە هێناوە و گەڕایەوە بۆ جیهانی دونیایی بۆئەوەی نیرڤانا ئامادە بێت بۆ ئەوانی تر. بودهی ساتڤا بڕیار بەسەر خۆیدا دەسەپێنێت بەجۆرێك باشترین بودهی ساڤا لەلای هەمووان بریتیە لە خوداوەندی بەزەیی کوان یین kwan yin لە چین بڕیاری داوە تەواوی ژیانی تەرخان بکات بۆ خزمەتکردن بۆئەوەی ئەوانی تر زووتر بتوانن بچنەناو نیرڤاناوە. ((لێرەوە ماهایانا جەخت ناکاتەوە لەسەر کاروانی خودی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە نیرڤانا بەڵکو ڕێگای چوون بەرەو نیرڤانا بە پیرۆز دەزانێت واتە بودهی ساتڤا boddhisattva ئەمە بوونەوەرێکی شایستەیە بۆ چوونەناو نیرڤانا بەهۆی تایبەتمەندیەکانیەوە لە بەزەیی و خۆشەویستی و خۆڕاگری و چالاکی و دانایی، بەهۆی کارەکانی پێشووی بەڵام ئەمە بەردەوام دەبێت لە جیهانی بوونی کاتیدا بۆ ڕزگارکردنی ئەوانی تر، ئەو بەبەزەییە لەگەڵیان و بە ئازارچەشتن ڕازیە بەمەرجێك ڕزگاریان بکات، خۆی دەکاتە قوربانی بۆ یارمەتیدانی بوونەوەرە بەئاگاکان لەسەر ڕوناکبوونەوە. چونکە ئامانجی ئەم یاسای ماهایانایە بەرژەوەندی تاکەکەسی نیە بەڵکو یارمەتیدانی ئەوانی ترە بەمەبەستی ڕزگارکردنیان هەروەها بونەوەرێکی نمونەیی (بودهی ساتڤا) کە دەتوانێت بەشێك لە

ڕاستیەکەی بگۆڕێت بۆ ئەو کەسانەی پێویستیان پێیەتی، چونکە خوازیاری قوربانیدانە و چوونەناو نیرڤانای خۆی دوادەخات بەهۆی خۆشەویستی بۆ ئەوانی تر)). چیرۆکی چوار پیاوەکە ناکۆکی نێوان دوو شێوازەکە دەخاتەڕوو، ئەو پیاوانە گەشتیان دەکرد بەناو بیابانە فراوانەکاندا هەتا گەیشتن بە ناوچەیەك کە دەورەدرابوو بە دیواری زۆر بڵند یەکێکیان بڕیاریدا بچێتە ئەو دیو دیوارەکان بۆئەوەی بزانێت چی هەیە بەوهۆیەوە سەرکەوت بەسەر دیوارەکەدا کاتێك گەیشتە لوتکە لە خۆسیدا هاواری کرد و خۆی هەڵدایە ناوەوە دووەم و سێیەم هەمان کاریان دوبارە کردەوە بەڵام کاتێك چوارەم کەس گەیشتە لوتکەی دیوارەکە و سەیری خوارەوەی کرد ئەو باخچە ئەفسوناویانەی بەدیکرد کە کانیاو و ئاوی سازگاریان پیادا دەڕوات و لێوانلێوە لە درەختی بەردار بە جۆرەها میوە وێڕای ئەوەی ئارەزوی ئەوەی دەکرد بچێتە ناوەوە بەڵام بەرەنگاری ئەم فریودانە بوویەوە کاتێك ئەو گەشتیارانەی بەبیرداهاتەوە کە بە بیابانەکاندا دەسوڕێنەوە بەوهۆیەوە بازی دایە خوارەوە و نەچوە ژوورەوە، دوبارە گەڕایەوە ناو بیابان بۆئەوەی هەموو ژیانی تەرخان بکات بۆئەوەی ڕێنمونیان بکات بەرەو ئەو بەهەشتە. سێ کەسەکەی یەکەم ئارهاتن بەڵام چوارەمیان بودهی ساتڤایە واتە ئەو کەسەی کە ئەرکێکی لەئەستۆ گرتوە بریتیەلەوەی ئەم جیهانە جێنەهێڵێت هەتا ئەو کاتەی کە هەموو گژوگیاکە خۆی ڕوناك نەکاتەوە.

٦-ئەم جیاوازیەی نێوان دوو خوێندنگاکە لەبارەی نمونەی باڵاوە بە دڵنیاییەوە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی سروشتی پێوانینی هەریەك لە دوو خوێندنگاکەی بوزا ڕەنگ بکاتەوە. سەبارەت بە یەکێك لە خوێندنگاکان بوزا قەشە بوو بەڵام سەبارەت بە خوێندنگاکەی تر بوزا ڕزگارکەر بوو. شوێنکەوتوانی بوزییەتی تیراڤادا ڕێز لە بوزا دەگرن وەکو دانایەك کە بەئاگاهاتوەتەوە لەڕێگەی هەوڵدانە تایبەتیەکانیەوە بۆ دۆزینەوەی ڕاستی، دواتر بووبە مامۆستایەکی بێ هاوتا ڕێگای دانا بۆ شوێنکەوتوانی. ئەو پیاوێك بوو لەنێو پێواندا مرۆڤبوونەکەی بناغەی بیروباوەڕی شوێنکەوتوانی تیراڤادایە بەوەی ئەوانیش دەتوانن بگەنە ڕووناکبوونەوە. بەڵام کاریگەری ڕاستەوخۆی بوزا وەستا لەگەڵ گەیشتنی بە بارا نیرڤانا واتە چوونە ناو نیرڤانا و مردنی. لەدوای ئەوە پەیوەندی بە جیهانەوە نەما چونکە چووەناو ئاشتەواییەکی تەواوەوە بەڵام ئەو پیرۆزڕاگرتنەی ماهانیەکان هەیانە بۆ بوزا بەس نەبوو بەم مرۆڤبوونەی کە بێ گومان مرۆڤبوونێکی نمونەیی بوو بەڵام وێڕای ئەوە هەر وەك مرۆڤێك دەمێنێتەوە بەڵکو بوزا بۆ ئەوان ڕزگارکەری جیهان بووکە بەردەوام بوو لە کێش کردنی بوونەوەرەکان بەرەو لای خۆی بە تیشکی دەستە گەوهەریەکانی. کۆیلایەتی و ئازار و ئەشکەنجە بوونی هەیە لەسەر هەریەکە لە ڕووەکانی بوون، گالاکسی لەدوای گالاکسی، جیهان لەدوای جیهان هەموویان کێش دەکرێن بەرەو ئازادبوون لەڕێگەی تێشکێك کەلەلایەن یەزدانەوە پێی دراوە. ئەم ناکۆکی و جیاوازیانە جیاوازی ناوەدین بەڵام چەند ناکۆکیەکی تر هەن کە دەشێت باسبکرێن بۆئەوەی وێنەکە تەواو ببێت. لەکاتێکدا بەپێی تیراڤادیەکان بنیاتنەری ڕێبازەکەیان دەڵێت تێڕامانە ئەقڵیەکان لەبارەی ڕاستی گەردونەوە لەڕێگە لادانێکی بێ سودە، ماهانیەکان ڕۆچووبوون لە تێڕامانی گەردونیدا بە چەندین چین لە بەهەشت و دۆزەخ. تاکە جۆری نوێژ کە شوێنکەوتوانی بوزییەتی تیراڤادا پێی ڕازی بوون بریتیبوو لە بیرکردنەوە بۆ قووڵکردنەوەی بیروباوەڕ و بەزەیی لێوانلێو لە خۆشەویستی، لەکاتێکدا ماهانیەکان چەند پاڕانەوەیەکیان بۆ زیادکرد بەناوی بوزا بۆ بەهێزکردنی ڕۆحی. دواجار لەکاتێکدا تیراڤادا تاڕادەیەك دابونەریتی سۆفیگەریانەی لەناوخۆیدا پاراست بە پابەندبوونی بە یاسای پالی بەڵام ماهانیەکان ئازادانە ڕەفتاریان دەکرد لە هەموو لایەنێکەوە. ماهایانا ڕازی بوو بە دەقەکانی بوزییەت بەوەی هەڵگری هەمان متمانەن بەبەراوردکردن بە یاسای پالی دێرین، کەمتر توندڕەو بوون لە شیکردنەوەی یاساکانی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردندا ڕایەکی بڵندیان هەبوو لەبارەی توانا ڕۆحیەکانی ئافرەت و

کەسە عەلمانیە ئاساییەکان بەشێوەیەکی گشتی. بەمجۆرە لە کۆتاییدا ڕەوڕەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتا بۆئەوەی بازنەکە تەواو بکات. ئەو ئایینەی دەستپێکرد وەك شۆڕشێك دژ بە مەڕاسیمەکان و خەملاندنە ئەقڵیەکان و پشتبەستن بە بەخشینی یەزدانی، دژبە هێزەکانی سەروو توانای مرۆیی، کۆتایی هات بە گەڕانەوە بۆ هەموو ئەو شتانە بۆ جاری دووەم بە هەو هێزێکەوە بەڵکو خودی بنیاتنەرەکەی بووە خوداوەند لەکاتێکدا باوەڕی نەبوو بە باوەڕهێنان بە خوداوەندێکی تایبەت! دەکرێت خشتەیەك دابنێین بۆ ئەو ناکۆکیانەی دابەشیان دەکات بۆ دوو بەشی سەرەکی لە بوزییەتدا، بەپێی ئەم خشتەیە لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی پێویستە ئەوەمان لەبیربێت ئەم ناکۆکیانە کە ڕێژەیین نەك ناکۆکی تەواو، واتە جیاوازین بەپلەی یەك و لەپلەی جەختکردنەوە لەسەر شوێنی ناکۆکیەکان.

| تیراڤادا | ماهایانا |
|---|---|
| مرۆڤ دەگاتە ئاستی ئازادبوون بەهۆی هەوڵدانی تاکەکەسیەوە، بەبێ هیچ یارمەتیدانێك لەلایەن هێزی سەروو توانای سروشتەوە. | هەوڵدانەکانی مرۆڤ پاڵپشتی دەکرێن لەلایەن هێزە یەزدانیەکانەوە کە پێیان دەبەخشرێت. |
| کلیکی چاکەکاری: داناییە. | کلیلی چاکەکاری: سۆز و بەزەیی(٤١). |
| گەیشتن بە سەربەخۆیی پێویستی بە پابەندبوونی بەردەوام و هەمیشەییە، بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ قەشە و قەشەژنەکانە. | مەشقی ئایینی پەیوەندی هەیە بە ژیانەوە لەم جیهانەدا، تایبەتە بە کەسە ئاساییەکانەوە. |
| نمونەی باڵا بریتیەلە ئارهات کە دەمێنێتەوە لە نیرڤانادا لەدوای مەرگ. | نمونەی باڵا بریتیەلە بودهی ساتڤا |
| بوزا: قەشەیە، مامۆستایەکی شکۆدارە، ئیلهام وەرگرە. | بوزا: ڕزگارکەرە. |
| هێزی سەروو توانای مرۆیی بەکەم دەزانێت. | گرنگی دەدات بە هێزی سەروو توانای مرۆیی. |
| مەڕاسیمەکان بەکەم سەیر دەکات. | جەخت دەکاتەوە لەسەر مەڕاسیمەکان. |
| مەشقکردنی ئایینی چڕدەکاتەوە لەسەر تێڕامان. | نزا و پاڕانەوەکانیش دەگرێتەخۆی. |

کام لە ڕێگاکان زیاتر سەرکەوتو بوو لەڕووی هەناویەوە؟ پێوەرێکی دیاریکراو نیە بەڵام لەڕووی داتاوە ئەوا لە وەڵامدا دەڵێین ماهایانا سەرکەوتو بووە. لەوانەیە بەشێك لە هۆکاری ئەمە حەشاردرابێت لە ڕابەری یەکێك لە مەزنترین پادشاکان کە جیهان ناسیونی. لە مێژووی پادشا دێرینەکاندا کەسایەتی ئاسوکا (٢٧٢-٢٣٢ پ. ز. ) شکۆدارە وەکو لوتکەی شاخی هیمالایا لەبەردەم ئاسمانی ڕوناککراوە بە ڕوناکی خۆر. ئەگەر هەموومان بوزی ماهایانی نەبین لەمڕۆدا ئەوا کەمتەرخەمی ئاسوکا نیە. ئاسوکا باوەڕی هێنا بە ماهایانا نەك هەر ئەوەندە بەڵکو داوای لە هەموو شوێنکەوتوانی کرد کە باوەڕی پێ بهێنن، ئەو لە هەوڵدان بەردەوام بوو بۆئەوەی ئەم ڕێبازە بگەیەنێتە سێ کیشوەر، بەمجۆرە بەردەوام بوو هەتا بوزییەتی کرد بە ئایینێکی جیهانی.

بەڵام لەوانەیە بۆ دوور ڕۆیشتبین ئەگەر وابیربکەینەوە تەنها کەسایەتیەك وای لە بوزییەت کرد ببێتە ئایینێکی جیهانی. لەڕاستیدا ڕێگا جیاوازەکانی گواستنەوەی پەیامەکەی بوزا لە کیشوەری ئاسیادا وای کرد کە جیاکاری بکرێت لەنێوان تیراڤادا و ماهایانادا.

هەموو ئەو جیاوازیانەی تائێستا باسمان لێوە کردون بیروباوەڕی بوون جگەلەوە چەند جیاوازیەکی کۆمەڵایەتی–ڕامیاری گرنگ هەن لەنێوان دوو گروپەکەدا(٤٢).
تیراڤادا ویستی یەکێك لە سیمای ڕێنماییەکانی بوزا بەرجەستەبکات کە تائێستا باسنەکراوە ئەویش: تێڕوانینیەتی بۆ کۆمەڵگایەکی شارستانی گە بونیاددەنرێت لەسەر سێ کۆڵەکە: خاوەنداریەتی، کۆمەڵگای قەشەکان، کۆمەڵگا بەگشتی، هەریەکەیان ئەرکی تایبەت بەخۆی هەیە بەرامبەر بەوانی تر کە پێویستە بەدەستی بهێنێت لێوەیان. وڵاتەکانی باشوری ئاسیا تائێستا بوزییەتی تیراڤادا پەیڕەوی دەکەن: سیریلانکا، میانمار (بۆرما)، تایلاند، لاوس، کەمبۆدیا لایەنی ڕامیاری پەیامەکەی بوزایان بەشێوەیەکی هەتەری وەرگرتوە. هێشتا شوێنەواری ئەم شێوازە ماوەتەوە لەو وڵاتانەدا بەشێوەیەکی بەرچاو. بەڵام گرنگیدانی چین بە بوزییەت کە گواستویەتیەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە بوزیەتی ماهایانای تیادا پەیڕەوی دەکرێت: کۆریا، ژاپۆن، تیبت کە ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەکانیان تێپەڕاندوە، هەریەکە لە ڕەهەندی پەروەردەیی و کاروباری ڕامیاری دەگرێتەوە.
بوزییەت لە زەمینەکانی باکور وەك جۆرێك لە ڕەخت دەردەکەوێت. نێردراوە موژدەبەرە بوزییەکان هەوڵیاندا چینیەکان بەوە ڕازی بکەن کە (بوزیین) هەڵگری چەمکی زانستی دەروونناسی و میتافیزیکی زۆر قووڵن کە دانا چینیەکان پەیان پێنەبردوە. بەڵام کونفوشیوس زۆر بیریکردەوە سەبارەت بە سیستمی کۆمەڵایەتی، چینیەکان ئامادەنەبوون بۆ وەرگرتنی ڕێنماییەکان لەبارەی ئەم بابەتەوە لەلایەن بێگانەکانەوە. بەمهۆیەوە چین لە گرنگی پێشنیازە ڕامیاریەکانی بوزای کەمکردەوەتەوە، لە گەوهەرە ڕۆحیە دەرونیەکەیەوە سودمەندبووە لەگەڵ ڕەنگە گەردونیەکانیدا.
هێشتا جیهان چاوەڕوانی دانای مێژوویەکە بۆ بوزییەت کە باسی چیرۆکی دابەشبوونی هەردو ڕێبازی تیراڤادا و ماهایانا بکات بەجۆرێك ئەو ڕێگایە ڕونبکاتەوە کەبەهۆیەوە تیراڤادا بە وەفاداری مایەوە بۆ تێڕوانینی بنیاتنەری شارستانیەتی بوزییەت، لەکاتێکدا ماهایانای بوزی تەنها گرنگی بە گەوهەرە ئایینیەکەی داوە: ئەمە شێوازێکە دەکرێت شارستانیەتە خاوەن ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان بەهێزبکات بەشێوەیەکی جێگیر.
جیاوازیە بیروباوەڕیەکان لەنێوان تیراڤادا و ماهایانادا وادەردەکەوێت کە بەرەو کاڵبوونەوە چوبێت بەتێپەڕبوونی کات. دوو گەنجی ئەڵمانی دوای جەنگی جیهانی دووەم بێزاربوون لە ئەوروپا بەوهۆیەوە بەروە سیریلانکا کەوتنڕێ بۆئەوەی تەواوی ژیانیان تەرخان بکەن بۆ ڕێبازی تەندروستی بوزا. بوونە دوو ڕاهیبی بوزی تیراڤادی. یەکێکیان ناوی خۆی گۆڕی بۆ نیانابونیکا nyanaponika بەردەوام بوو لەسەر ئەو ڕێبازە بەڵام دوەمیان اتێك لە گەشتێکدا بوو لە باکوری هیندچاوی کەوت بە چەند تیبتیەك بەوهۆیەوە چووە سەر ڕێبازی ماهایانی، لە ڕۆژئاوا ناسرا بەناوی لاما گۆڤیندا lama govinda. لەدوا ڕۆژەکانی تەمەنی نیانابونیکا یەکێك لە دیدەنیارەکانی پرسیاری لێکرد لەبارەی جیاوازی نێوان هەردوو ڕێبازەکەی بوزییەت کە هەریەکە لەو دوانە پەیڕەویان دەکرد؟ ڕاهیبە بوزیە تیراڤادیەکە لە وەڵامدا پێی وت: ((هاوڕێکەم برپاریدا ببێتە بودهی ساتڤا، بەڵام من ناتوانم هێزی ئەم سەرئەنجامە ببینم، چونکە ئەگەر مرۆڤێك هەبێت بەتەواوی بتوانێت سەرکەوتوو بێت لە زاڵبوون بەسەر خۆیدا هەروەك ئارهات دەیەوێت ئەوا چی دەمێنێتەوە لەدوای ئەوە جگە لە سۆز و بەزەیی؟))

## نهێنی گوڵەکە(٤٣)

لەدوای ئەوەی بوزییەت دابەشبوو بۆ تیراڤادا و ماهایانا تیراڤادا بەردەوام بوو وەك نەریتێکی زۆر یەکگرتوو لەکاتێکدا ماهایانا دابەشبوو بۆ چەندین دەستە و خوێندنگا. بەناوبانگترینیان: ڕێبازی زەوی پاك pure land sect کە هاوشێوەی ڕەوتی پۆلسیە لە مەسیحیەتدا لە پشتبەستنیدا بە بیروباوەڕ بەتەنهالێرەدا پشتبەستن بە هێزەکانی تری یەکێك لە بوزاکان کە هەڵدەسێت بە هەڵگرتنی خۆشەویستان بۆ زەوی بەهەشتی ڕۆژئاوایی. لە خوێندنەوە میللیەکەیدا ئەم بەهەشتە چەندین شێوەی بەهەشت هەڵدەگرێت لە ئاییني مەسیحییەتدا، وێڕای ئەوەی هەردوکیان داندەنێت بە چەند شیکردنەوەیەکی ناسکتر و قووڵتر لە بەهەشت لە حاڵەتی ئاگاییدا لەبری شوێنی جوگرافی، ئەمە لەکاتێکدا خوێندنگاکە ئەرکێکی تری گرنگی پێشکەشکردوە لە خوێندنگاکانی ماهایانا (بەچینی پێی دەوترێت: تیان تایti'en tai، بە ژاپۆنی: تندای tendai) بۆ بوزییەت، خۆشویستنی کونفوشیەت لەبارەی فێربوون و گونجانی کۆمەڵایەتی. ویستی جێگایەك بدۆزێتەوە بۆ هەموو خوێندنگا بوزییەکان لە باسێکدا ناونرا لوتس سوترا lotus sutra. ناچینەناو ئەم ڕێبازە بچوکانەی بوزییەتی ماهایانا بەڵکو سەرەتا بوار دەکەینەوە بۆ ئەو بوزییەتەی کاریگەری هەبوو لەسەر تاوییەت taoism بەشێوەیەکی گەورە مەبەستمان لە بوزییەتی چانە ch'an بە چینی یان زن zen بە ژاپۆنی، دووەم بۆ ئەو بوزییەتەی پەرەیسەند لە تیبت. هۆکاری ئەم هەڵبژاردنە لەبەشێکیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە ئەم لقانەی بوزییەت بریتین لەو لقانەی کە بەبەراورد بەوانی تر زیاتر سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا لە ڕۆژئاوا، بەڵام سودێکی تر هەیە لەم هەڵبژاردنەدا ئەوش بریتیەلەوەی دەمانباتە سەر دوو زەمی جیاواز کە بوزییەت تیایاندا پەرەیسەند بەشێوەیەکی بەرچاو.

لەبەرئەوەی دەسەڵاتی کۆمونیزم بووە بەربەست لەبەردەم ژیانی ئایینیدا، بەوهۆیەوە دەکەوینەشوێن بوزییەتی ڕێبازی زین zen لە سیما ژاپۆنیەکەیدا. ئەم گروپە دوپاتی دەکەنەوە وەکو هەر ڕێبازێکی تری ماهایانی شوێنکەوتوی بیروباوەڕی خودی گوتامان، دەڵێن ڕێنماییەکانی کە ڕێگای خۆی دۆزیەوە بۆ یاسای پالی pali canon بۆ خەڵکی ئاسایی بوو بە گشتی. بەڵام شوێنکەوتوانی زیاتر دەرکپێکەرن لە پەیامەکەیدا ڕێنمایی قووڵتر و نەرمونیانتریان بیستوە. یەکێك لە نمونە باوەکان لەبارەی ئەم بابەتەوە باسکراوە لە وتاری گوڵی بوزادا. بوزا لەسەر شاخێك وەستا لەگەڵ قوتابیەکانیدا کە دەوریاندابوو، بوزا بە بێدەنگی مایەوە و تاکە وشەیەکی نەدرکاند بەڵکو زۆر بە سادەیی دەستی دایە پەڕەی گوڵێکی لوتسی ئاڵتونی. کەس تێنەگەیشت لە مانای ئەم کارە جگەلە ماهاکاسیاپا mahakasyapa کە زەردەخەنەیەکی کرد بەمهۆیەوە بوزا کردیە میراتگری خۆی. ئەو زیریەی کە پاڵپێوەنا بۆ ئەو زەردەخەنەیە، گواسترایەوە بۆ هیند لەڕێگەی بیستوهەشت باوکی ڕۆحیەوە دواتر بودهی دهارما bodhidharma گواستیەوە بۆ چین لەساڵی ٥٢٠ ز. لەوێوە بڵاوبوویەوە بۆ ژاپۆن لە سەدەی دوانزەی زایینیدا، نهێنی زن zenی لەخۆگرت.

چوونەناو زن zenەوە وەکو چوونەناو شووشەی ئەلیسە بۆ وڵاتی سەیروسەمەرەکان کە مرۆڤ خۆی دەبینێتەوە لە وڵاتی شتە سەیروسەمەرەکان کە نایەن بەبیری هیچ کەسێکدا بەجۆرێك هەموو شتێك لەوێدا شێتانە دێتەپێشچاو. ئەمە جیهانی وتووێژە نادیارەکانە، دژێتیە سەرنجڕاکێشەکان، جیاوازیە زەقەکان، دەرئەنجامە هەڵە و پێشبینی نەکراوەکان، هەموو ئەمانە هەڵگیراون لە شێوازە شارستانیەکاندا کە دەکرێت ئەندێشە بکرێن. لێرەدا چەند نمونەیەك دەخەینەڕوو:

پیاوێـك هـەبوو بـەناوی گوتیـەوە gutei هـەرکات پرسـیاریان لێـدەکرد لـەبارەی واتـای زن zen ەوە پەنجـەی دۆشاومژەی بەرزدەکردەوە.  ئەمە هەموو ئەو شتەبوو کە ئەنجامی دەدا، یەکێکی تـر کـە ئـەم پرسـیارەی لێـدەکرا شەقی لە تۆپێك هەڵدەدا و ئەوی تر زللەیەکی دەدا لە کەسە پرسیارکەرەکە!.
کەسێك کە تازە دەستی پێکردبوو ڕەخنـەی گـرت لـە بـوزا بـەڵام داوای لێکـرا دەمـی دابخـات و هـەرگیز ئـەو وشـە پیسە دوبارە نەکاتەوە!.
کەسێك وا خۆی نیشاندا کەلە بوزییەت تێگەیشتوە بەو هۆیەوە ئەم پارچە هۆنراوەیەی نوسی:

جەستە درەختی بودهیە bodhi
مێشك وەك ئاوێنەیەکی درەوشاوەیە.
گوێبگرە بۆئەوەی هەمیشە بە خاوێنی بیهێڵیتەوە،
مەهێڵە تۆزی لێ بنیشێت.

خێرا ئەم هۆنراوەیە ڕاستکرایەوە بە چوارینەیەکی پێچەوانە وا قوبووڵکرا کە ئەمە هەڵوێستی بوزییەتی زنە:

بودهی bodhi دانایی ڕاستەقینە درەخت نیە،
مێشك ئاوێنەیەکی درەوشاوە نیە.
لەبەرئەوەی هیچ شتێك نیە لە سەرەتاوە،
ئیتر بۆچی لەبارەی سڕینەوەی تۆز و خۆڵ دەدوێین؟

ڕاهیبێك لە مامۆستاکەی نزیك بوویەوە و پێی وت:  گەورەم ئێستا گەیشتمە ئەم دێرە، ئایا دەکرێت بمبەخشیت و چەند ڕێنماییەکم بدەیتێ؟ مامۆستاکە لێی پرسی:  ئایا نانی بەیانیت خواردوە؟ پرسیارکەرەکە لە وەڵامدا وتی:  بەڵێ، مامۆستاکە پێی وت:  کەواتە بڕۆ دەفرە پیسبووەکانت بشۆ.  پرسیارکەرەکە تێگەیشت لـەو شـتەی دەیەوێت لەڕێگەی ئەم وتووێژەوە!
کۆمـەڵێك لـە مامۆسـتایانی زن zen masters کۆبوونـەوە بـۆ گفتوگۆکردن، کـاتێکی خۆشـیان بەسـەربرد کاتێـك ڕایانگەیانـد شـتێك نیـە بـە نـاوی بوزییەتـەوە، یـان ڕووناکبوونـەوە، یـان شـتێك هاوشـێوەی ئـەو بێـت گـەر لـە دوورەوەش بێت نیرڤانا.  تەڵەیان بۆ یەکتر دادەنا بۆ ئەوەی یـەکێکیان ڕاوبکـەن بـۆ جەختکردنـەوە لەسـەر شـتێك دژەکەی پابەندە پێوەی! لەوکاتەدا هەموو بەشداربووەکان دەستیان دەکردە پێکەنین.
ئەوەی ڕوودەدا لێرەدا چیە؟ ئایا دەکرێت سـودمەند بین لـە هـەر واتایـەك لەمـە کـە بـۆ یەکـەمجار وەك گاڵتـەجاڕی دەردەکەوێت، ئەگەر هەراسانکردنێکی ڕاستەوخۆ نەبێت؟ ئایا دەشـێت بـە ڕاسـتیان بێـت لـەم جـۆرە قسـە ڕۆحیـە دوانەییـەدا، یـان بەوپـەڕی سـادەییەوە دەیانـەوێت هەراسـانمان بکـەن و گاڵتـەمان پێبکـەن بـە هێنانەکایـەی ئـەو پرسیارانەی وەڵامیان نیە؟
لە وەڵامدا دەڵێین ئەوان بەتـەواوی هەتـەرین، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی زۆر بەکـەمی هەتەریانـە ڕەفتـار دەکـەن.  لەگـەڵ ئەوەی ناتوانین هیواخوازبین بتوانین تێڕوانینی ئەوان بە تەواوی بگوێزینەوە، چونکە گەوهەری زن zen بریتیەلە

بێتوانایی لە گەماڕۆدانی وشەکاندا، بەڵام دەتوانین چەند ئاماژەیەك بکەین بۆ سەر ئەو شتەی کە ئەوان دەیانەوێت پێمان بڵێن.
بالەسەرەتاوە دانبەوەدابنێین تەنانەت ئەمە ئەستەم دەبێت، لەبەرئەوە ناچاردەبین بۆ بەکارهێنانی وشەکان بۆ دوان لەبارەی هەڵوێستێکەوە بەوپەڕی وردیەوە دەرکدەکرێت بە سنورداری وشەکان. وشەکان جێگایەکی نادیار داگیردەکەن لە ژیاندا. لەلایەکەوە ناتوانین دەستبەرداری وشەکان ببین لە ژیانماندا، لەبەرئەوەی بەبێ وشەکان زبر دەبین. بەڵام هەروەها فریومان دەدات یان بەلایەنی کەمەوە گومڕامان دەکات، بە بەرهەمهێنانی ڕاستیەکی ڕووکاری ڕاستی کرداری پەردەپۆش دەکات. باوك دەتوانێت بەبیرکردنەوەی خۆی فریوبدات بەوەی منداڵەکەی خۆشدەوێت لەبەرئەوەی لەگەڵمنداڵەکەی دەدوێت بە گوفتاری شیرین و نەرمونیان. هەروەك نەتەوەیەك دەتوانێت وادابنێت دەستەواژەی بە ویستی یەزدان لە سوێندی یاساییدا کە هاوڵاتیەکانی دەیدەن بەو مانایە دێت کە هەموو هاوڵاتیەکانی باوەڕییان بە بوونی یەزدان هەیە.
لەگەڵ دانپیانانمان بە سودی وشەکان، چونکە وشەکان سنوردارکراون بە سێ سنوریان هەیە. لە خراپترین حاڵەتەکاندا جیهانێکی دەستکرد بونیاتدەنێن لەکاتێکدا هەستە ڕاستیەکانمان شاردراوەن، کاتێك خەڵك دادەبەزنە ئاستی بیرکردنەوە بێماناکان. سنورداری دووەمی وشەکان بریتیەلەوەی تەنانەت کاتێك باسکردنیان تاڕادەیەك وردبینانەیە بەڵام ئەو باسکردنانەی دەیانخاتەڕوو هەمان ئەو شتانە نین کە باسدەکرێن، چونکە ناوی ژەمەکان بۆ نمونە هەمان ژەمەکانی خواردن نیە. دواجار هەروەك سۆفیەکان دوپاتی دەکەنەوەئەزمونە ڕۆحیەکانیان زۆرجار لە وزەی وشەکان تێدەپەڕێن و باسکردنیان ئەستەم دەبێت.
هەموو ئایینێك پەرەپێدراوە ئەگەرچی کەم بێت بە ((زانستی هێماکان و پەرەسەندنیان))، تاڕادەیەك دادندەنێت بەو ڕێگایەی وشەکان و مێشك تیایدا شکست دێنن لە باسکردنیان، ئەمە کاتێك بەرگری ناکەن لە (مێشك و وشەکان) بە لادانی ڕاستی و شێواندنی.
هەتا ئەقڵانیەکان ڕەخنەی زیاتر بگرن لەم ڕاستیە ئەوا دژێتی لەو شتانەی دەکەونە پشت ئەقڵ یان دەرەوەی توانای ئەقڵ خوێنبەری ژیانی هەموو ئایینێك دەنوێنێت بەڵکو هەموو هونەرێك. سۆفیەکان لە هەموو ئایینێکدا دەدوێن بۆمان لەبارەی پەیوەندیان بە جیهانێکەوە کە دەیانگۆڕێت لە ناخەوە بە تاریکیە بێوێنەکەی. بوزییەتی زن zen ڕاستەوخۆ دەوەستێت لەم سەربازگەیەدا تاکە ناوازەبوونەکەی بریتیەلەوەی گرنگیدانی چڕکردەوەتەوە لەسەر شکاندنی بەربەستی زمان.
تەنها ئەگەر ئەم ڕاستیەمان خستە پێشچاومان ئەوا هەلێکمان دەبێت بۆ تێگەیشتن لەم ڕووانگەیە کە لە هەندێك ڕێگادا نامۆترین دەربڕینە لەبارەی ئایینێکی کامڵەوە. خودی بوزا بەپێی نەریتی زن یەکەمین کەس کە ئەم دەستورەی جێبەجێکردوە کاتێك بۆیەکەمجار ڕەتی کردەوە هەر دەربڕینێکی گوفتاری بدات (لە وتاری گوڵە ئاڵتونیەکەدا). بودهی دهارما بەردەوام بوو لەسەر ئەم نەریتە بەوەی باسیدەکات وەك گەنجینەیەك کاتێك هێنای بۆ چین وەك پەیامێکی تایبەت لە دەرەوەی کتێبە پیرۆزەکان. ئەمە وادەردەکەوێت کە زۆر دوورە لە ئایینەوە هەروەك خەڵکی زۆربەی کات لێی تنێدەگەن تا ئەو ڕادەیەی بەشێوەیەکی گومڕاکەر دەردەکەوێت.
بیرلە هیندۆسیەت بکەرەوە و کتێبیڤیدای تایبەت پێی، کونفوشیەت و دەقە باوەکانی، یەهودیەت و تەوراتەکەی، مەسیحیەت و ئینجیلەکەی، ئیسلام و قورئانەکەی. بەهەمان شێوە بوزییەتی زن دەقی تایبەت بەخۆی هەیە کە دەخوێنرێتەوە لە بەیانیان و ئێوارانـدا لە دێرەکانیدا لەگەڵ دەقەکانی سوترا sutras کە تیایدا بەشداردەبێت لەگەڵ لقەکانی تری بوزییەت، دەقە تایبەتەکان بە بوزییەتی زن بریتیەلە کتێبی هیکیجان ڕۆکو hekigan roku

و دەقی مومونکان mumonkan وێڕای دەقەکانی تر. بەڵام تاکە نیگایەك بۆسەر ئەم دەقە تایبەتانە بەسە بۆئەوەی ئاشکرای بکەن چەندە جیاوازن لە کتێبە پیرۆزەکانی تر! تەوەری هەموو ئەو دەقانە لەبارەی خستنەڕووی ئەو ڕاستیەی بوزییەتی زن zen ناکرێت وەسفبکرێت بەشێوەیەکی زارەکی. باس لەو قوتابیانە دەکات کە لە ماموستاکانیان دەپرسن لەبارەی زن zen، بۆئەوەی بگەن بە هاواری هو ho کە بەڕوویاندا دەدرێت! هۆکارەکەی بریتیەلەوەی ماموستاکە وابیردەکاتەوە قوتابیەکانی هەوڵدەدەن لەم ڕێگایەوە کەموکورتی لە ژیانیاندا بە وشەکان لەبری دەرکپێکردن. لەڕاستیدا قوتابیەکان بەختەوەر دەبن ئەگەر ماموستاکانیان وازبهێنن بە ڕەتکردنەوەی زارەکی لە وەڵامی پرسیارەکانیان. زۆربەی کات وەڵامدانەوە خێراکە لەلایەن ماموستاکەیەوە بە ژمارەیەك لە وشە و چەند لێدانێك دەبێت، بەوەی گوێناداتە ئاسودەیی قوتابیەکان بەڵکو پەنادەباتەبەر ڕێگای توندوتیژتر بەوەی وابیردەکاتەوە دەتوانێت قوتابیەکە دەربهێنێت لەو حاڵەتە لەدەرەوەی ڕێڕەوی ئەقڵی کە تێیدایە لە ئێستادا.
وەك ئەوەی پێشبینی دەکەین ئەم هەڵوێستە ناوازەیە لە دەقە پیرۆزەکاندا بۆخۆی لە هەڵوێستی بوزییەتی زندا بە ئاڕاستەی بیروباوەڕەکانە. بەپێچەوانەی زۆربەی ئایینەکان کە چڕدەبنەوە لەدەوری جۆرە بیروباوەڕێکەوە، بوزییەتی زن سنورداركردنی خۆی لە بەرگێکی زارەکی دیاریکراودا ئەمە بونیادنەنراوە لەسەر وشەی نوسراوە بەڵکو ئەو لە دەرەوەی ڕێنماییەکانە هەروەك بودهی دهارما دەڵێت لەبارەی خستنەڕووی ئەم خاڵەدا ژیان زۆر دەوڵەمەندە و فرەڕەنگە دەکرێت پۆلێنبکرێت لە پلەبەندکردنێکی دیاریکراودا، بەبێ ئەوەی یەکسان بێت بەم پۆلێنکردن و باسکردنە. هیچ دوپاتکردنەوەیەك نیە، سودەکەی زیاترە لە سودی ئەو پەنجەیەی ئاماژە دەکات بۆ مانگ. لەترسی ئەوەی ئاڕاستەی خودی پەنجەکە بگۆڕێت بوزییەتی زن یەکسەر دەیکێشێتەوە دواوە. هەموو ئایینەکانی تر هەموو سوکایەتی پێکردنێك بە وشەکانی یەزدان بە تاوانێکی گەورە دادەنێت، بەڵام ماموشستایانی بوزییەتی زن لەوانەیە فرمان بدەنە قوتابیەکانیان بە دڕاندنی کتێبە پیرۆزەکانیان بۆ چەندین پارچە، خۆپاراستن لە وشەکانی وەکو بوزا یان نیرڤانا وەك خۆپاراستنە لە پیسی و بۆگەنی، گومانی تێدانیە ئەوان نیەتی هیچ بەکەم زانینێکی ڕاسەقینەیان نیە بۆی(٤٤) بەڵکو ئەوەی مەبەستیانە لە ڕاستیدا بریتیەلەوەی ئەوان لە هەوڵ و تێکۆشاندان بە هەموو شێوازەکان بۆئەوەی بیربکەنەوە چۆن قوتابیە تازە دەستپێکردوەکان تەنها دووربخرێنەوە بۆ دەرەوەی شیکارە زارەکیەکان. ((هەموو ئەوانەی پێم دەڵێن: ئەی خودایە ئەی خودایە ناچنە مەلەکوتی ئاسمانەکانەوە. بەڵکو ئەوەی هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی خواستی باوکم کە لە ئاسمانەکانە. )) (ئینجیلی مەتا ٢١\٧).
بوزییەتی زن گرنگی نادات بە تێڕوانینەکان لەبارەی ڕوناکبوونەوەوە، بەڵکو ئەو خودی ڕوناکبوونەوەی ڕاستەقینەی دەوێت. لەبەرئەوەیە هاواردەکات و خۆی دەپارێزێت لە چوونەناو بچوکترین شت لە بیردۆزەکان تەنانەت ئەگەر نیەتێکی خراپی نەبێت. هەموو ئەوەی دەیەوێت بریتیەلەوەی قوتابی ناچاربکات بۆ شکاندنی بەربەستی وشەکان. پێویستە لەسەر ئەقڵەکان بازبدات بەسەر پەیوەندکارە زارەکیەکاندا بۆ شێوازێکی نوێ لە تێگەیشتن و دەرکپێکردن.
کاتێك دەشێت زیادەڕەوی بکرێت لە تێگەیشتن لە هەموو خاڵێکدا ئەوا پێویستە بگەینە ئەو سەرئەنجامەی کە بوزییەتی زن وازدێنێت لە ئەقڵ و وشەکان بەتەواوی(٤٥).
تاکە شتێك کە دوپاتکراوەتەوە بریتیەلەوەی زن گرنگینادات بە هەوڵدانەکانی ئەقڵ بۆ پێچەوانەی دوا ڕاستی زیاترلە گرنگیدانی کیر کیگارد kierkegaard بۆ میتافیزیقیای هیگڵ hegel هەرچەندە هەوڵبدات بۆ

سافکردنی خشت ئەوا نابێتە ئاوێنەیەك بۆ ڕەنگدانەوەی خۆر! بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت کە ئەقڵ بێ کەڵکە. ئاشکرایە ئەقڵ یارمەتیمان دەدات بۆ بڕینی ڕێگاکەمان لە ژیانی ڕۆژانەماندا بەهەمان شێوە شوێنکەوتوانی زنی ڕێنمونی کرد بۆئەوەی بەرگری بکەن لە فێربوون بەڵکو لەوە زیاتر ئەقڵ ئەگەر کاری کرد بەشێوەیەکی دروست ئەوا دەکرێت یارمەتیدەر بێت بۆ بەئاگابوون بە ئاڕاستەی ئامانجەکە ئەگەر ڕێگاکە بەکارهێنراو بێت بۆ ئەنجامدانی ئەمە وەکو بەکارهێنانی دڕکە بۆ لادانی دڕکێکی ترلەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان بڵێین ئەقڵ ڕۆڵێکی شیکاری دەبینێت، کاردەکات وەکو پردێکی بۆ گەیاندنی جیهانی تازە دۆزراوە بە جیهانی هەستی گشتی، چونکە لە زندا هیچ کێشەیەك بوونی نیە کاتێك وەڵامەکەی دەدۆزرێتەوە ئەمە واتایەکی باش نابەخشێت لەنێو چوارچێوەی سەرچاوە تایبەتەکەیدا، هەروەك ئەزمونێك نیە ئەوە ڕەتبکاتەوە کە مامۆستاکان نەیانەوێت هەوڵبدەن بۆ شیکردنەوەی ئەگەر هەلی دروست و یارمەتیدەریان پێدرا. بابەتی پەیوەندی زن بە ئەقڵەوە زۆر بە سادەیی خاڵێکی دوو لایەنە. یەکەم لۆژیکی زن و ڕونکردنەوەی تێیان دەگەین لە ڕوانگەی ئەزمونی جیاوازەوە بەشێوەیەکی ڕیشەیی بەبەراورد بە ڕوانگە ئاساییەکان. دووەم مامۆستایانی زن پێداگری دەکەن لەسەرئەوەی قوتابیەکانیان بۆ خۆیان ئەم ئەزمونە تێپەڕێنن، ڕێگەنەدەن بە قسەکردن جێگای ئەزمونی کرداری بگرێتەوە.

ئەم پێداگریە نابینین لە بوزییەتی زندا سەبارەت بەم دوا خاڵە بەشێوەیەکی ڕونتر لەو ڕێگایەی هەڵبژاردوە بۆ درێژەدان بە ڕێگا تایبەتیەکەی بۆ خۆی. کاتێك ئایینەکانی تر سەبارەت بە جێنشینی ڕوویانکردە بیروباوەڕە فۆلکلوریەکان بوزییەتی زن داهاتوی خۆی مسۆگەرکرد لە حاڵەتێکی دیاریکراو لە ئاگایی پێویستە ڕاستەوخۆ بگوزارێتەوە لە ئەقڵێکەوە بۆ یەکێکی تر وەکو گڕی مۆمێك کە دەگوازرێتەوە لە مۆمێکەوە بۆ یەکێکی تر، یان ئەو ئاوەی لە دەفرێکەوە دەکرێتە دانەیەکی تر. گواستنەوە لە ئەقڵ–بوزا بۆ ئەقڵ–بوزا ئەو گواستنەوە تایبەتە پێکدەهێنێت کە بودهی دهارمکا bodhidharmka باسی دەکات وەکو گەوهەری گواستنەوەی زن. بۆ ژمارەیەك لە سەدە هێمای ئەم گواستنەوە هەناویە ڕۆحیە بە دەستەوەدانی عەبا و دەفری بوزا لە باوکێکی ڕۆحیەوە بۆ یەکێکی تر بێڵام لە سەدەی هەژدەیەمدا باوکی ڕۆحی شەشەم لە چین گەیشت بەو دەرئەنجامەی کە تەنانەت ئەم دەستنیشانکردنە بە هەنگاوێك دادەنرێت بۆ تێکەڵکردنی شێوە لەگەڵ گەوهەردا، دواتر فەرماندان بۆ وەستاندنی. کەواتە ئێمە لێرەدا لەبەردەم نەریتێکداین چڕدەبێتەوە لەدەوری جێنشینی هەموو مامۆستایەك بۆ پێشخۆی، هەریەکە لەوان میراتیان وەرگرتوە لەڕووی بنەماوە لە مامۆستاکەیەوە لە حاڵەتێکی ئەقڵی هاوشێوەی ئەو حاڵەتەی کە گوتاما بەئاگای هێنایەوە لە قوتابی و جێنشینەکەیدا ماهاکاسیاپا mahakasyapa.

ئەنجامدانی کرداری شکست دێنێت لە گەیشتن بەم بنەمایە، بەڵام ئەم داتایانە پێشنیازی چەند هەنگاوێك دەکات کە گیراونەتەبەر بۆ پاراستنی ئەم نەریتە بە زیندویی. نوسەری ئەم کتێبە چەند ڕێنماییەکی تایبەتی داوە بە نزیکەی نۆسەد تاقیگە. بەڵام تەنها سیانزەیان توانیویانە مەشقکردنیان لەسەر زن تەواو بکەن، چواریان ئینکا inka یان پێدراوە واتە جێگیرکراون وەك ڕوشیەکان roshis (مامۆستایانی زن) و ڕێگەیانپێدرا وانەبڵێنەوە بە قوتابیانی تر.

ئەو مەشقکردنە چیە کە دەسەپێنرێت بەسەر شوێنکەوتواندا بۆئەوەی ڕاکێشرێن بەرەو ئەقڵ–بوزا کە پارێزراوە بەم شێوازە؟ دەکرێت بیخەملێنین بە بەکارهێنانی سێ دەستەواژەی سەرەکی: زازن zazen، کوان koan، سانزن sanzen.

Zazen واتـە تێڕامـان لـە حاڵـەتی دانیشـتندا. زۆربـەی مەشـقی زن ڕودەدات لـە هـۆڵێکی تێڕامـانی گـەورەدا. دیدەنیارەکانی ئەو هۆڵانە توشی شڵەژان دەبن بەهۆی بڕی ئەو کاتژمێرە دورودرێژانەی کە بەشێوەیەکی ناکۆتا دێنەپێشچـاو، کـە تیایـدا ڕاهیبـەکان کاتـەکانی خۆیـان تـەرخان دەکـەن بـۆ دانیشـتن بەشـێوەیەکی بێـدەنگ بـۆ ماوەیـەکی زۆر درێـژ ڕوخسـاریان ئاڕاسـتەی دیوارەکانـە بـەپێی هـەر ڕێبازێـك لـە ڕێبازەکـانی زن کـە سـەربەو پەرستگایەیە(٤٦). شێوازی دانیشتنەکەیان شێوازی دانیشتنی لوتسە کە لە هیند وەرگیراوە. چاوەکانیان نیوە داخراوە لەکاتێکدا چاوەکانیان بە ئاڕاستەی ئەو پارچە حەسیرە پوشینەیە کەلەسەری دانیشتون.

بـەمجۆرە کاتـژمێر دوای کاتـژمێر، ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ، سـاڵ لـەدوای سـاڵ دادەنیشـن(٤٧)، دەگـەڕێن بـەدوای بەئاگاهێنانـەوەی ئـەقڵ–بوزادا هـەتا پردێکی پەیوەنـدی دروسـت بکـەن لـەنێوان ئـەو و ژیـانی ڕۆژانەیانـدا. ئـەو تایبەتمەندیـەی کـە سەرنجڕاکێشـترە لـەم پرۆسـەیەدا بریتیەلـەو بەکارهێنانـەی کـە پێـی هەڵدەسـتن بـۆ یـەکێك لـە نامۆترین کەرەستەی مەشقی ڕۆحی کە مرۆڤ ناسیویەتی لـە هەرجێگایـەکی جیهانـدا بێـت، ئـەویش کەرەسـتەی کوان koan.

بەشێوەیەکی گشتی کـوان بـەمانای مەتـەڵ دێـت بـەڵام مەتەڵـەمانی زن خـەیاڵی و سەیروسـەمەرەن! بـۆ یەکـەمجار تەنها وەکو بەیەکگەیشتنی نێوان مەتەڵ و چیرۆکی سەگە هارەکەیە!

مامۆسـتا وو تسـو wu tsu دەڵێـت: بـا ڕونکردنەوەیـەك وەربگـرم لـە چیرۆکێکی ئەفسـانەییەوە. مانگایـەك بـە پەنجەرەیەکدا تێدەپەڕێت. بەهەردوو شاخی و چوارپەلیەوە. ئیتر بۆچی کلکی تێناپەڕێت؟

یان هەروەها: شێوەی ڕوخسارت چۆن بوو پێشئەوەی باوباپیرانت لەدایك ببن؟

یـان مەتـەڵێکی تـر ئێمـە هـەموومان دەنگـی دەسـتەکان دەناسـینەوە کاتێـك چـەپڵە لێـدەدەن. کەواتـە دەنگـی تاکەدەسـتێك چـۆنە کاتێـك چـەپڵە لێـدەدات. ئەگـەر هـاتو وتـت تاکـە دەسـتێك ناتوانێـت چـەپڵە لێبـدات ئـەوا دەنێردرێیت بۆ کۆتایی ڕیزەکە.

مەتەڵێکی تر: ((لی کو)) کە بەرپرسێکی باڵادەستە پرسی لـە مامۆسـتایەکی بـەناوبانگی بوزییـەتی زن وتـی: لەدێرزەمانەوە کەسێك بێچوە مراویەکی دانا لەناو شوشەیەکدا. پاش ماوەیەك بێچوە مراویەکە گەورەبوو هـەتا گەیشتە ڕادەیەك نەیدەتوانی لەنێو شوشـەکە بێتـەدەرەوە. کەسەکەنەیدەویسـت شوشـەکە بشـکێنێت، هـەروەها نەیدەویسـت مراویەکـە ئازاربـدات. کەواتـە چـۆن دەکرێـت مراویەکـە لـەو شوشـەیە دەربهێنێـت؟ مامۆسـتاکە بـە بێدەنگی مایەوە بۆ چەند ساتێك دواتر هاواری کرد: ئەی بەرپرس! وتی: بـەڵێ! وتـی: ئـەو ئێسـتا لـەدەرەوەی شوشەکەیە!.

پاڵنەرەکانمان ئەم مەتەڵە بێمانایانـەمان بەسـەردا دەسـەپێنن، بەڵام ئەو کەسـەی پـەیڕەوی بوزییـەتی زن دەکـات ڕێگەی پێنادرێت بەو کارە هەستێت. چ پیاو بێت یان ژن فـەرمانی پێـدەکرێت کـە هـەموو وزەکـەی ئاڕاسـتەبکات بەرەو ئەو مەتەڵانە. هەندێکجار لۆژیکیان پێکەوە دەبەسترێنەوە، هەنـدێك کـات هەڵـدەدرێت بـەرەو قوڵـایی ئـەقڵ هەتا بگەن بە وەڵامێکی دروست. ئەمە پرۆژەیەکە لەوانەیە بەشێوەی ڕێژە وەربگیرێت، تاکە مەتەڵێك، ماوەیەکی درێژ کەمتر نەبێت لە ماوەی ئامادەکاری بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا!.

لـەم سـاتەدا ئـەقڵ لـە حاڵـەتی کـارکردنێکی چڕدادەبێت، بـەڵام بـە ڕێگایـەکی زۆر تایبـەتی کاردەکـات. ئێمـە لـە ڕۆژئاوا پشت بە ئەقڵ دەبەستین تاڕادەیـەکی زۆر وامـان لێـدەکات پێویسـتمان بـەوەبێت بیر لـەخۆمان بکەینـەوە بەجۆرێك لـە حاڵـەتی بوزییـەتی زنـدا مامەڵـەدەکـەین لەگـەڵ دیمـەنێك دەکـەین بـەوەی ئـەقڵ سنوردارە، پێویسـتە

بگۆڕدرێت بە بەرنامەیەکی تر بۆ زانین. سەبارەت بە بوزییەتی زن ئەگەر ئەقڵ تۆپی باسکە نەبێت ئەوا جێگیرکردنی لەسەر زەوی دەیکاتە پەیژەیەکی زۆر کورت بەس نیە بۆ گەیشتن بە بەرزاییەکانی ڕاستی تەواو.
کەواتە پێویستە لەسەرمان بەسەر ئەقڵدا زاڵببین. ئەم سەرکەوتنە بۆ خۆی ئامانجی کوانە (مەتەڵ و کێشە بێچارەکان) بۆ گەیشتن پێیان. ئەگەر ئەو کێشانە ووادەرکەوتن کە زۆر دورن و ئابڕوبەرن سەبارەت بە ئەقڵ، ئەوا پێویستە لەسەرمان ئەوەمان لەبیربێت کە بوزییەتی زن هەوڵنادات بۆ ڕازیکردنی ئەقڵی دونیایی بەڵکو مەرامەکەی بەپێچەوانەوە هەراسانکردنی ئەقڵە، تێکدانی هاوسەنگیەکەی، لە کۆتاییدا خرۆشاندنی شۆڕش دژبە یاساکانە کە کۆت و بەندی دەکات. بەڵام ئەمە کێشەکە بەشێوەیەکی هاوسەنگ دادەنێت. ئەوەش ناچارکردنی ئەقڵە بۆ ململانێکردن لەگەڵ ئەو شتەی بە بێمانا دادەنرێت، ناچارکردنی ئەقڵە بۆ کۆکردنەوە لەنێوان ئەو شتانەی کە زۆربەی کات ئەستەمە پێیان بگەین، زن خەهوڵ دەدات ئەقڵ ڕاپێچ بکات بەرەو حاڵەتێك لە خرۆشان کە تیایدا بازدەداتە دەرەوەی قەفەسی لۆژیك لەگەڵ هەموو ئەو نائومێدیەی کە پاڵ بە جرجێکەوە دەنێت بازبدات لەکاتێکدا گەمارۆدراوە لە سوچێکدا. بوزییەتی زن دەخرۆشێنرێت لەڕێگەی شتە ناچونیەك و دەرئەنجامە هەڵەکانەوە، لەکۆتاییدا ئەقڵ دەوروژێنێت تائەو ڕادەیەی وابیردەکاتەوە بیرکردنەوە هیچ زیاتر نیە لە بیرکردنەوە لە خودی بیرکردنەوە، هەستکردن بە شتێك هیچ زیاتر نیە لە هەستکردن بۆ شتێك. دواتر کاتێك زن ئەقڵی لۆژیکی دەگەیەنێت بەم خاڵە، واتە دەیگێڕێتەوە بۆسەر ڕێگا داخراوەکە ئەوکات پشت دەبەستێت بە ژیریەکی خۆڕسك کە ژیانی بەکارهێنراو و ژیانی یەکە پێکەوە دەبەستێتەوە.
ڕوناکی دەچێتەنێو جێگا نهێنیەکان
لەوێدا یاسا لۆژیکیەکان دەمرن
نهێنیەکان لەڕێگەی چاوەوە نشونمادەکەن (٤٨)
پێشئەوەی ئەم ڕێگایە ڕەتبکەینەوە وەك ڕێگایەکی سەیروسەمەرە باشتر وایە لەبیرمان بێت کیر کیگارد kierkegard تێڕامانی لە بیرۆکەی بەرجەستەکردن incarnationی داناوە بە شتێکی نالۆژیکی بۆ بوونەوەری ناکۆتا کە دەبێتە کۆتادار کاتێك دەبێتە ڕوداوێك، واتە بۆ ئەو خوداوەندەی دەبێتە مرۆۋ وەك یەکێك لە مەشقە ڕۆحیە مەسیحیەکان. مەتەڵەکانی کوان نالۆژیکانە دەردەکەون بەوەی ئەقڵ پێشتر جموجوڵی دەکرد لەنێو چوارچێوەیەکی ڕێکخراودا. بەڵام لەدەرەوەی ئەو چوارچێوەیە کوان ناچونیەك نیە لەبەرئەوەی لۆژیکی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەوەش لۆژیکی ڕیمیانیان riemannianە. کاتێك بەربەستە ئەقڵیەکان تێکدەشکێن ئەم لۆژیکە بەشێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوێت. وەك کاتژمێری بەئاگاهێنەرەوە کە دادەنرێت بۆ بەئاگاهێنانەوەی ئەقڵ لە خەونی ئەقڵانیەت. لەوێدا ڕوونیەکی زیاتر لەبەردەستدایە.
ڕاهیبی زن بەتەنها نیە لە ململانێکەیدا لەگەڵ ئەم کێشانەدا. کتێبی مەتەڵەکان کە کاری لەسەر دەکرێت سودی پێناگەیەنێت، هەروەها گفتۆگۆی لەبارەوە ناکرێت لەلایەن ڕاهیبە هاوەڵەکانیەوە، سەبارەت بەم کێشانە تەنها دەکرێت وەڵامی گوازراوەی بدرێتەوە کە پێشتر ئاڵوگۆڕکراوە. بەڵام وێڕای ئەوە، بەڕێژەی دووجار لە ڕۆژێکدا ڕاهیب چاوی بە مامۆستاکەی دەکەوێت بەمەبەستی ڕاوێژکردن سەبارەت بە تێڕامان کە ناودەبرێت بە سانزن sanzen لە گروپی ڕینزای rinzai یان دۆکوسان dokusan لە گروپی سۆتۆ soto لە بوزییەتی زن). ئەم کۆبوونەوەیە لەگەڵ مامۆستاکەیدا زۆر کورت دەبێت. مەشقپێکراوەکە بڕیار دەدات لە بارەی مەتەڵەکەوە بەو وەڵامەی پێی گەیشتوە تا ئێستا. لێرەدا ڕۆڵی مامۆستاکە سێ لقی لێدەبێتەوە. یەکەم لەو حاڵەتە شادومانەی کە وەڵامی مەشقپێکراوەکە دروستە ئەوکاتە مامۆستاکە وەڵامەکەی پشتڕاستدەکاتەوە، بەڵام ئەمە کەمتر دەبێت

لـە ڕۆڵـی مامۆسـتاکە، چـونکە وەڵـامی دروسـت زۆربـەی کـات هێـزی باوەڕپێکردنەکـەی بـەهێزدەبێت. بـەڵام خزمەتێکی زیاتر پێشکەشدەکرێت لەکاتی ڕەتکردنەوەی وەڵامە نەگونجاوەکاندا، چونکە هیچ شتێك لـەوە زیـاتر یارمەتی قوتابی نادات بۆ وەلانانای ئەو کێشانە بۆ هەمیشـە، کاتێك مامۆسـتاکەی بەتـەواوی ڕەتیـان دەکاتـەوە. ئـەم دیمەنـە باسـکراوە بـۆ سـانزن sanzen بەشـێوەیەکی گونجـاو لـە یاسـاکانی هیـاکوجو hyakujo دا کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەدەی نۆیـەمی زایینی، وەك هـەڵێك کـە دەدرێتـە مامۆسـتاکە بۆئـەوەی بـەوردی هەسـتێت بـە پشکنینی قوتابیەکـەی، تێگەیشتنە هەڵـەکانی بـۆ ڕاستبکاتەوە و دەربـازی بکـات لـە یاساکانی پێشـوو هـەروەك چۆن بە تواندنەوە ئاڵتون جیادەکرێتەوە لە قورقوشم و مس، یان وەك ئەو زەڕنگەرەی هەڵدەسێت بـە سـافکردنی بەردێکی بەنرخ بۆئەوەی هەموو کەموکورتیەکی لەسەر لابدات(٤٩).

خزمەتکردنەکەی تری مامۆستاکە بریتیەلـەوەی قوتابیەکـەی بـە چالاکی بهێڵێتـەوە و پێداویستیەکانی بـۆ دابین بکـات. کۆتـایی ئـەم مەشـقکردنانە لـە تێڕامـانی حاڵـەتی دانیشـتنی zazen و کێشـە بێچـارەکان koan و ڕاوێژکاریەکای پەروەردەکـەری sanzen چیە؟ یەکەمین بڕینـی گـرنگ بریتیـە لـە ئەزمونی ژیرانـە ناودەبرێت بـە کینشو kensho یان ساتوری satori. وێڕای خۆئامادەکردن بۆی کەلەوانەیـە پێویسـتی بـە چـەند ساڵێك بێت بـەڵام خـودی ئەزمونەکـە وەك بروسـکەیەك دێت و وەك موشـەکێکی بێدەنگ دەتەقێتـەوە لـەناخی تاکـدا، هـەموو شـتێك فـڕێ دەداتـەناو ڕووناگەیـەکی نوێـوە. لەترسـی ئـەوەی مـرۆڤ فریوبـدرێت بـە وشـەکان شـوێنکەوتوانی بوزییەتی زن کاتی زۆر بەفیڕۆنادەن لە باسکردنی ئەم حاڵەتەدا واتە حاڵەتی سـاتوری، بـەڵام چـەند گێڕانەوەیـەك هەن کە هەندێکجار لەبارەیەوە دەردەکەون:

واهاتمەناوەوە. واهاتمەناو سنوری جەسـتەیی فیزیاییـەوە، بـەڵێ مـن خـاوەنی جەسـتەی خـۆمم بـەڵام واهەسـتم دەکرد من لەناوەندی گەردوندا ڕاوەستاوم. خەڵکانێك دەبینـم بـەرو لای مـن دێـن بـەڵام هـەموویان هـەمان کەسـن. هـەموویان هـەر خـودی خـۆم بـوون. هـەرگیز پێشتر ئـەم جیهانـەم نـەدیبوو. مـن لـەڕابردودا وابیرمـدەکردەوە مـن بەدیهێنراوم بەڵام ئێستا پێویستە ڕای خۆم بگۆڕم، من هەرگیز بەدینـەهێنراوم مـن خـودی گـەردونم کاتێك هـیچ تاکێك بوونی نەبووە. (٥٠)

دەکرێت لەڕێگەی ئەم باسکردنەوە لە شتێك تێبگەین حاڵەتی ساتوری لەبـەرگیراوەی بوزییـەتی زنـە بـۆ ئـەزمونی سۆفیگەری کە لە هەر جێگایەك دەرکەوتوە شادومانی و ئاشتەوایی لەگەڵ خۆیدا هێناوە لەگـەڵ هەسـتکردن بـەو ڕاستیەی ڕکابەری زمانی ئاسایی دەکات. بەڵام ئەگەر ویستمان هاوشێوەی ئەم ئەزمونانە ببەستینەوە بە جۆش و خرۆشی گەڕانی ئایینیەوە ئەوا بوزییەتی زن لەنزیك خاڵی دەستپێکردنەوە دایدەنێت، واتە مەشقکردنی زنـی ڕاستەقینە دەستپێدەکات لە حاڵەتی ساتورییەوە. چونکە سـەرەتا پێویسـتە حاڵـەتی سـاتوری تـر هـەبێت، ئەمـە کاتێـك مامۆسـتا قوتابیەکـەی فێردەکـات زیـاتر بجوڵێـت لـەم کێڵگەیـەدا(٥١). بـەڵام ئـەو خاڵـەی گرنگـە لێـرەدا بریيەلەوەی بوزییەتی زن نیوەی ئامانجەکانی بەدەستهێناوە لـە ئاڕاسـتە زانستیەکە و گرنگیـدان بـەم جیهـان لـە چینەوە، بـە هاوسـەنگکردنی بـەو ئاڕاسـتە سـۆفیگەریە ناوەکیـەی کـە هەیـەتی بەئاڕاسـتەی جیهانەکـەی تـر کـە وەریگرتوە لە هیند، من دەڵێم ئەم بوزییەتی نزە ڕێگەی نەداوە بە ڕۆحی مرۆیی کە پاشەکشـەبکات لـەو حاڵەتـە سۆفیگەرانەیە بەشێوەیەکی تەواوز بەڵکو کاتێك دەگات بە حاڵەتی ساتوری پێویستە لەسەرمان:

بێینـەدەرەوە لـەو زەلکـاوەی کەتێیـدا تـەپاوتلمان دەکـرد، بۆئـەوەی سـەرلەنوێ ئازادانـە ڕێبکـەین بـەناو کێڵگـە کراوەکانـدا. لەناەیـە هەنـدێك کـەس بڵێن: ((ئەگـەر گەیشـتم بـە حاڵـەتی سـاتوری ئـەوا ئەوەنـدەم بەسـە. بۆچـی

پێویستە بۆ دوورتر لەوە بڕۆم؟)).  مامۆستا دێرینەکان هێرشیان کردوەتە سەر ئەو جۆرە کەسانە و پێین دەڵێن ((کرمەکانی زەوی لەناو قوڕ و لیتەی ڕوناکبوونەوەدا دەژین))(٥٢).

بلیمەتی زن لەو ڕاستیەدا حەشاردراوە کە جیهان لە حاڵەتێکی نمونەییدا ناهێڵێتەوە لە هەمان کاتدا پاشەکشە ناکات لە جیهان.  ئامانجی زن فراوانکردنی دەرچەکانی دەرکپێکردنە بەجۆرێك ئەفسونی ئەزمونی ساتوری نیشان بدات.

یەکێك لە قوتابیەکان لە مامۆستاکەی دەپرسێت:  ((ئایا واتای بودهی دهارمات bodhidharmas لە ڕۆژئاواوە دێت؟)) مامۆستاکە لە وەڵامدا پێی وت:  ((بەڵێ درەختی سەروو لە باخچەکەدا ڕاوەستاوە!)).  پێویستە دەرکبکرێت بە گەردونی سەرنجڕاکێش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، حاڵەتی ساتوری یەکەمین ژیریە لەم دەرکپێکردنەدا.  بەڵام ئەگەر ئەفسونی ئەم جیهانە بڵاونەبێتەوە بۆ ناو شتە بەربڵاوەکانی وەکو درەختی ناو باخچەکەمان، لەڕێگەیەوە هەموو ئەرکەکانی ڕۆژانە جێبەجێدەکرێت لەگەڵ تێگەیشتن لەوەی هەریەکەیان دیمەنێکی ناکۆتایە، چونکە کاری بوزییەتی زن هێشتا تەواو نەبووە.

جگەلە خودی بوزییەت هیچ مرۆڤێك نەیتوانیوە بەم ئەرکە هەستێت بەشێوەیەکی تەواو.  وێڕای ئەوە لەڕێگەی ئاماژەپێکردنەکانی کۆمەڵێك لە نوسراوەکانی بوزییەتی زن بیرۆکەیەك پێکدەهێنێت لەبارەی حاڵەتی ئەو مرۆڤەی گەیشتوە بەیەکێکی دیکە و شتێك نەماوە تا ئەنجامی بدات.  یەکەم:  ئەمە حاڵەتێکە تیایدا ژیان وادەردەکەوێت کە لێوانلێوە لە خێر و خۆشی.  کاتێك پرسیارکرا لە قوتابیەکی ڕۆژئاوایی کە حەوت ساڵی بەسەربردبوو لە مەشقکردنی زندا لە کیوتو kioto وتی:  ((هیچ شارەزاییەکی ناسروشتی نیە کە بیدۆزیتەوە، بەڵام لە بەرەبەیاندا کاتێك هەڵدەسیت جیهان بەشێوەیەکی جوان بەڕادەیەك ناتوانی بەرگەی جوانیەکەی بگریت گەر بە زۆر نەبێت)).

دووەم:  لەگەڵ ئەم هەستپێکردنەدا بە جوانی ژیان، تێڕوانینێکی بابەتی دەست بەسەر مرۆڤدا دەگرێت لەبارەی پەیوەندی مرۆڤ بەوانی ترەوە.  خێر و چاکەی ئەوانی تر گرنگ و کاریگەرە لەسەری بەهەمان ڕادەی خێرو چاکەی خۆی.  کاتێك مرۆڤێك چاودەبڕێتە سەد دۆلاریەك دەشێت لە نیگاکانیدا هەستپێکردنێکی خاوەندارێانە هەبێت بەڵام لەکاتی سەیرکردنی ئاوابوونی خۆردا ناکرێت نیگاکانی مرۆڤ خۆویستانە بێت(واتە ناکرێت مرۆڤ ئاواتەخوازی ئەوەبێت تەنها خۆری ئەو ئاوابێت و هی ئەوانی تر نا، بەڵکو ئەو هەست بەوە دەکات کە خۆر موڵکی هەموو بوونەوەرەکانە).  بوزییەتی زن دەیەوێت مرۆڤ بگەیەنێتە ئەم تێڕوانینی ئاوابوونی خۆرە بۆ هەموو شتێکی تر.

ئەم حاڵەتە پێویستی بە بەئاگابوونە هەتا ڕادەی کامڵبوون، کێشەکانی وەکو ((بەئاگابوونی کێ؟)) یان ((بەئاگابوون سەبارەت بە چ شتێك))، هیچ جێگایەکی نیە لێرەدا چوونە دوانەیی بوون بەتەواوی لێرەدا نەماوە. کاتێك ئەم نیگایە دێت و دەستدەگرێت بەسەر ئاگایی مرۆڤدا ئەوا هەست دەکات بە سوپاسگوزاری بۆ ڕابردوو و لێپرسراویەتی لەبارەی شتەکانی ئێستا و داهاتوو.

سێیەم:  ژیانی زن وەك پێشتر جەختمان کردەوە لەسەری مرۆڤ پەلکێش ناکات بۆئەوەی لە جیهان دووری بخاتەوە بەڵك دەیهێنێتەوە بۆناو جیهان.  ئێمە بانگەشە بۆئەوە ناکەین کە جیهان و شتە دونیاییەکان بەتەواوی پشتگوێبخرێن ئەگەر ئامانجی ژیان دەرهێنانی ڕۆح بێت لە جەستە.  بانگەوازەکە بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕەزامەندی و تێربوونەیە کە ئاگایی تەواو دەیبەخشێت تەنانەت لەم بارە جەستەییەدا.  ((گەورەترین دەرئاسا کامەیە؟)) ((بریتیەلەوەی بەوپەڕی ئارامیەوە بەتەنها و لەگەڵ خودی خۆمدا دابنیشم))، ((بەسادەیی بینینی شتەکان

بەوجۆرەیە کە هەیە، واتە بەشێوە ڕاستەقینەکەی بەبێ هیچ زیادە و کەمێك)). دروستە زن بایەخێکی زۆر دەدات بە تەنهایی، بەڵام تەنهاییەکی خاڵیە چونکە ئەو هێڵانە دەسڕێتەوە کە دابەشی دەکەن، تەنهاییەکی کامڵە چونکە ئەو هێڵانە ئاڵوگۆڕ پێدەکات بەو هێڵانەی دەمانگەیەنن بەیەکتر. ئەمە ئەو شتەیە کە پەیڕەو کراوە لە سیستمی بوزییەتی زندا کە دەڵێت: ((هەمووان یەك شتن یەکیش هەموو شتێکە، هیچیش هەموو شتێکە)). بوزییەتی زن حاڵەتێکی ئاسایی پیرۆزە: ((نانت خواردوە؟ کەواتە هەستە دەفرەکانت بشۆ. )). ئەگەر نەتوانیت مانای ژیان بدۆزیتەوە زۆر بە سادەیی لە شتنی دەفرەکاندا ئەوا نایدۆزیتەوە لە هیچ جێگایەکی تردا.

چالاکیەکانی ڕۆژانەم هیچ جیاواز نین،

تەنها من خۆمم لەگەڵیاندا گونجاندوە بەشێوەیەکی سروشتی.

هیچ شتێك وەرناگرم، هەروەها واز لە هیچ شتێك ناهێنم،

لە هەموو بارێکدا نە ڕێگر هەیە نە ململانێ کردن. . .

ئاو دەردەهێنم دار هەڵدەگرم،

ئەمە هێزێکی ناسروشتیە، ئەمە چالاکیەکی بێوێنەیە(٥٣)

بەم دەرکپێکردنە هەمیشەییە لەکۆتاییدا حاڵەتێکی هاوسەنگبوون و گونجان دێت. دوێنێ باش بوو، ئەمڕۆ باران دەبارێت، شوێنکەوتوەکە گەیشتوەتە پشت کۆت و بەندەکان. هەتا پاڵنەرە دژیەکەکان پێویست بن بۆ پاراستنی جیهان ئەوا هەریەکەیان بەشێوەیەکی تایبەتی پێشوازی لێکراوە.

هۆنراوەیەکی شاعیر سینگ تسان seng ts'an هەیە لەبارەی متمانەبوون بە دڵ کە بێگەردترین دەربڕینە لەبارەی ئەم نمونە باڵایەوە لە ڕەزامەندی تەواو.

ڕێگای نمونەیی ئاستەنگ و ڕێگر ناناسێت

جگەلەوەی ئەوە ڕەتدەکاتەوەکە هەستێت بە باشترزانین،

تەنها کاتێك نەبێت کە دەربازدەبێت لە ڕقوکینە و خۆشەویستی

خۆی ئاشکرا دەکات بەشێوەیەکی تەواو و بەبێ نکوڵی کردن،

دەیەکی ناکۆکیەکان ئینجێکە،

ئاسمان و زەوی وەلادەنرێن.

ئەگەر ئاواتەخوازبوویت ببینیت لەپێش چاوەکانتدا

ئەوا هیچ بیرۆکەیەکت نابێت نە بۆ ئەو نە دژ بە ئەو.

بەوەی ئەو شتەی خۆشت دەوێت بیخەیتە بەرامبەر ئەوەی ڕقت لێیەتی، ئەمە نەخۆشی ئەقڵە.

ڕێگای کامڵ وەکو بۆشایی ئاسمانی فراوانە،

لەگەڵ بێتوانایت بەبەرامبەر هەر شتێك، ئەوا شتێکی زیا لە پێویست دەبێت.

ئەمە بەهۆی هەستانتەوەیە بە چەند تاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو

ئەوکات ژیری ڕاستەقینە لەدەست دەدەیت بۆ دۆزینەوەی ڕێگاکە

تاکێك هیچ نیە جگەلە هەمووان، هەمووان هیچ نین جگەلە تاکێك.

بڕیاری خۆت بدە لەمباریەوە، ئەوانی تر ڕازیبونی تایبەتی خۆیان نیشان دەدەن،

قسەم کرد بەڵام بێ سوود کەڵك بوو چونکە وشەکان

ناتوانن هەواڵ بدەن لەبارەی ئەو شتانەی کە نە دوێنێیان هەیە نە سبەی نە ئەمڕۆ؟ (٥٤)

تەنانەت ڕاست و درۆ جیاواز دێنەپێشچاو. ((بەدوای ڕاستیدا مەگەڕێ. تەنها بوەستە لە هەڵگرتنی هەر ڕاو بۆچونێکی دیاریکراو. )).

پێنجەم: دوای ئەوەی دابەشبوونەکان تێدەپەڕێنین: دەرون و ئەوی تر، کۆتادار و بێ کۆتا، ڕازیبوون و ڕەتکردنەوە، دەکرێت بەسەریاندا بەرزببینەوە، چونکە تەنانەت دابەشبوون لەنێوان ژیان و مەرگدا جیاوازە.

کاتێك بەم ئاستە دەگەین لە بەدەستهێنانی شتەکان بەشێوەیەکی تەواو، کەسی گەیشتو بەم ئاستە هەرگیز ناتوانێت هەست بەوە بکات مردنی تاك کۆتایی ژیانە. تاك ژیاوە لە ڕابردویەکەوە کە سەرەتایەکی نیە و دەژی هەتا داهاتویەك کە کۆتایی نیە. لەم ساتەدا تاك دەچیتەناو ژیانی هەمیشەییەوە کە لێوانلێوە لە شادومانی(٥٥)

ئێمە بوزییەتی زن جێدەهێڵین بۆ داهاتوەکەی، پێویستە ئاماژە بکەین بە کاریگەریەکەی لەسەر ژیانی ڕۆشنبیری ژاپۆن. وێڕای ئەوەی کاریگەریەکەی مەزنترە لەسەر هەڵوێستە بەربڵاوەکانی ژیان، چونکە چوار پێکهاتەی ڕۆشنبیری ژاپۆنی هەڵگری شوێنپەنجەی بوزییەتی زنن بە جۆرێك سڕینەوەیان مەحاڵە. لە سومی sumie یان دیمەنی سروشتی مەرەکەبی ڕەشدا ڕاهیبەکانی زن ژیانی سادەیان بەسەر دەبەن. ڕکابەری یەکتر دەکەن لە شارەزایی و قووڵایی هەستکردنیان بە گەورە چینیەکانیان. پەرستگاکانی زن بێوێنەن لە شێوازی باخچەکانیاندا بەڵکو ئەم هونەرەیان بەرزکردوەتەوە بۆ ئاستێکی بێوێنە. پلەبەندکردنی گوڵەکان دەستپێکردوە لەو کاتەی پێشکەش کراون بە بوزا، بەڵام پەرەیسەندوە و بووەتە هونەرێکی تایبەت تائێستا بەشێکە لە مەشقکردنی هەموو کیژێکی ژاپۆنی. دواجار ڕێوڕەسمی چای بەناوبنگ دێت کە تیایدا دەڕازێنرێتەوە لە چەند دەفرێکی بەنرخی گڵکاری دێرین لەگەڵڕێوڕەسمە خۆشەویستەکان، ڕۆحی بێدەنگی بۆ گەیشتن بە گونجاندن و ڕێزگرتن کە زنی پێ دەناسرێتەوە.

## هەورەتریشقە ئەڵماسیەکە

تائێستا دواین لەبارەی دوان لە یانا yanas یان ڕێگاکانی بوزییەت بەڵام ئێستا پێویستەی ڕێگای سێیەم زیادبکەین. ئەگەر بوزییەتی هینایانا hinayana بە واتای ڕێگای بچوك بێت ئەوا ڤاجرایانا vajrayana بە واتای ڕێگای ئەڵماسی دێت.

ڤاجرا لەبنەڕەتدا خوداوەندی هەورەتریشقەی هیندە ئیندرا indra ناوبراوە لە زۆربەی دەقەکانی بوزییەتدا کە نوسراونەتەوە بە زمانی بالی، بەڵام کاتێك ماهایانا بوزای گۆڕی بۆ کەسایەتیەکی گەردونی ئەوکاتە خوداوەندی هەورەتریشقە گئیندرا بووە گۆچانی ئەڵماسی بوزا. لێرەدا نمونەیەکی ئاشکرا دەبینین لەبارەی توانای بوزییەت لەسەر خۆگونجاندنی لەگەڵ بیروباوەڕە خۆجێییەکان لەکاتێکدا هەڵدەسێت بە دوبارە هەڵسەنگاندنی بە گۆڕینی ناوەندی ڕۆحی ڕاکێشان بەوەی ئەڵماس گۆڕاوە بۆ هەورەتریشقە، هێمای هێزی سروشت بۆ ئەوەی بچێتەناو دروشمی فەرمانڕەوایی ڕۆحیەوە، لەکاتێکدا مانای ئەو هێزە پارێزرا کە هەورەتریشقە خاوەنیەتی. چونکە ئەڵماس ڕەقترین بەردە و لەهەمانکاتدا یەکێکە لە ڕوونترین بەردەکان. ئەمە والە ڤاجرایانا دەکات ببێتە ڕێگای هێز و ڕوونی واتە هێزی دەرککردنی بوزا بە بەزەیی درەوشاوە(٥٦).

کەمێك پێشتر تێبینی ئەوەمان کرد دەتوانین بەدواداچون بکەین بۆ ڕەگوڕیشەی ڤاجرایانا لە هینددا، بەردەوامی بەخۆی داوە لە ژاپۆن وەك بوزییەتی شینبون، بەڵام تیبتیەکان tibetans ئەم ڕێگەی سێیەمەی بوزییەتیان تەواو کرد. لەبەرئەوەی بوزییەتی تیبتی تەنها بوزییەت نیە کە خوداوەندی بونی تیبتی تێدایە، هەروەها ئەوەندە بەس نیە کە واباسی لێوەبکەین کە بوزییەتی هیندیە لە سەدەی هەشتەم و نۆیەمدا بەرەو باکور ڕۆیشت بۆئەوەی لەوێدا بپارێزرێت لەبەرئەوەی لە هیند بەرەو داڕمان چووە. بەڵکو پێویستە وەك ڕێگای سێیەمی بوزییەت ببینرێت، لەکاتێکدا گەوهەری ڤاجرایانای بۆ زیاددەکەین ئەویش تانترا tantra یە.

بوزییەتی تیبتی ئەو بوزییەتەی ئێستا لەبارەیەوە دەدوێین، لەڕاستیدا بوزییەتی تانتریکە tantric buddhism ئەمە نابێتە قۆرخکردنی تانترا لەلایەن بوزییەکانەوە کە بۆ یەکەمجار خۆی نیشاندا لە هیندۆسیەتی چەرخەکانی ناوەڕاستدا لەکاتێکدا ئەم وشەیە دوو چاوگی سنسکریتی هەبوو یەکێکیان درێژکردنەوەیە. بەم واتایە دەقەکانی تانترا ئاماژەی بۆ دەکەن لەبەرئەوەی زیادکراوە بۆ کۆمەڵە دەقێکی هیندۆسی بۆ فراوانکردنی بوارەکەی. ئەمە واتای شێوەی وشەکەمان دەداتێ بەتەنها. بەڵام سەبارەت بە پێکهاتەکانی ئەو دەقانە پێویستە لەسەرمان سەیری دووەم واتای زمانەوانی تانترا بکەین کە پێکدێت لە پیشەی چنین ئاماژەدەکات بە تێکئاڵان. کاتێك هەڵدەسیت بە کرداری چنین دەزووەکان چەندینجار تێکدەئاڵێن. چونکە دەقەکانی تانترا چڕدەبنەوە لەسەر پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان شتەکان. هیندۆسیەت هاوشێوەی ئەم دەقانەی داهێناوە بەڵام بوزییەت، بەتایبەت بوزییەتی تیبتی گرنگی داوەتە ئەم دەقانە. تیبتیەکان دەڵێن ئایینەکەمان بەهیچ جۆرێك تایبەتی نیە لە ئامانجەکەیدا. کە مەشقەکانیان جیادەکاتەوە بەوەی یارمەتی مرۆڤ دەدات بگات بە نیرڤانا لە یەك ماوەی ژیاندا بەتەنها(٥٧). ئەمە واپیشاندانێکی گەورەیە! ئیتر چۆن تیبتیەکان بەرگری لێدەکەن؟

ئەوان دەڵێن ئەم زیادکردنە لە خێرایی گەیشتندا بەدەستدەهێنرێت لەڕێگەی بەکارهێنانی هەموو وزە ڕوناککەرەوەکان لە پێکهاەی مرۆییدا، لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر هەموو وزەکانی جەستە، لەگەڵ دوپاتکردنەوەی وشەی هەموو بۆئەوەی بەکاربهێنرێت بۆ هەوڵ و کۆششەی ڕۆحی.

ئەو وزەیەی گرنگی پێدەدرێت لە ڕۆژئاوا بریتیە لە سێکس، لەبەرئەوە شتێکی سەیرنیە ئەگەر ببینی ناوبانگی تانترا لە دەرەوە هەڵقوڵاوە لە بەکارهێنانە پیرۆزەکەی بۆ ئەم پاڵنەرە. هـ. ج. ویلز h. g. wells جارێك وتی

یەزدان و سێکس ئەو دوو شتەن کە سەرسامیان کردوم. ئەگەر بتوانین هەردوکیان بەدەست بهێنین، ناچار نەکرێن لەسەر هەڵبژاردنی یەکێکیان هەروەك لە هەریەکە لە حاڵەتی قەشەیەتی و ڕەبەنی‌ن ئەمە وای لە ئەقڵی میللی ڕۆژئاوایی کردوە کە هاوسەنگیەك دروستبکات لەنێوان تانترا و سێکسدا، بەڕاستی ئەمە شتێکی غەمگینکەرە، لەبەرئەوە نیە کە نادیاری جیهانی تانترا زیاددەکات کە فراوانترە لەو وێناکردنە بەڵکو لەبەرئەوەی ڕێنماییە سێکسیەکانی دەشێوێنێت بەوەی لە جیهان لایدەبات. لەنێو ڕێنماییە جیهانیەکانی تانترادا لەبارەی سێکسەوە، هیچ شتێکی نامۆی تێدانیە، ئەمانە کۆمەڵە ڕێنماییەکی گشتگیر و جیهانین. سێکس شتێکی زۆر گرنگە–دواجار ئەو شتەیە کە بەردەوامی ژیان دەپارێزێت–بەڕادەیەك پێویستە بەتەواوی ببەسترێتەوە بە یەزدانەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ.
ئێروس هیسیود eros hesiod ی پیرۆز کە ئاهەنگ بەهۆیەوە دەگێڕدرێت لە فیدروس ئەفڵاتوندا لە هەندێك لە ڕێگاکان لەلایەن هەریەك لە نەتەوەکان، تەنانەت ئەمە زۆر هاوسەنگە. سێکس بە پیرۆزی ڕاگیراوە لە زۆربەی دەرکەوتەکاندا. بەڵام وێڕای ئەم مەرجە بەوجۆرە نابێت تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە بەراورد دەکرێت بە خۆشەویستی. کاتێك دوو کەس یەکتریان خۆشدەوێت بەشێوەیەکی شێتانە–شێتی پیرۆزی ئەفڵاتونی– لەکاتێکدا لەوپەڕی پێویستیدایە بۆئەوەی بەوی تر بگات، بەڵام ئەوی تر ئارەزوی گەیشتن ناکات پێی، لە لوتکەی ئەم ئاڵوگۆڕکردنەدا ئەستەمە بڵێین ئەزمونی جەستەیی زیاترە بەبەراورد بە ئەزمونی ڕۆحی، یان ئەگەر هەستنیان بەوەکرد یەك کەسن یان دوانن. ئەو ساتی مەستیە ecstatic ناونراوە بە مەستی extasisچونکە حاڵەتێکە تیایدا لە دەرەوەن بەجۆرێك ex=دەرەوە، stasis=حاڵەت، بەجۆرێك خۆیان دەخەنە نێو تەنهاییەوە. هیچ شتێك تائێستا هێندەی تانتریا نمونەیی نەبووە. لەبەرئەوەی بەدەستپێکردن بە سرودە عیبرانیەکان(لەیەکێك لە گەشتەکانی پەیمانی دێریندا) هەتا هێمایی سێکسی ئاشکرا لە شایی ژنهێنانی هەناوی سۆفیگەریدا لەگەڵ پێغەمبەر عیسا (خوالێی ڕازی بێت)، چونکە ئەو بنەمایانەی باسکران دەیانبینین لەهەموو ئەو گێڕانەوانەدا. بەڵام ئەو شتەی تانترا جیادەکاتەوە بریتیەلەوەی بەوپەڕی وەفاداریەوە هەڵدەسێت بە پێکەوەبەستنی لەگەڵ سێکسدا وەك هاوپەیمانێکی ڕۆحی کە لەگەڵیدا کاردەکات بەشێوەیەکی ئاشکرا.
دوور لە ئابڕوو و شەرمی لەڕادەبەدەر و ختوکەدان مەشقکەرانی تانترا هەوڵدەدەن ڕەگەزی صەیوەندی نێوان سێکس و خۆشەویسی بپارێزن، واتە ڕەگەزە جەستەیی و ڕەگەزە ڕۆحیەکەی لە پەیوەندیەکی توندوتۆڵدا، ئەمە لەڕێگەی هونەرەکەیانەوە کە ژن و مێردەکان نیشان دەدات لە حاڵەتی لەباوەشگرتنی سێکسیدا، لەڕێگەی خەیاڵکردنەکانیانەوە لێرەدا پێویستە تواناکان پەروەردەبکرێن لەسەر وێناکردن بەشێوەیەکی چالاك، لە پەیوەندیەکی سێکسی ئاشکرادا، لەبەرئەوەی هەموو دەزگا کەهەنوتیە تیبتیەکان ڕەبەنی بەباش نازانن، جگەلە دانەیەکیان. ئاسان نیە بۆ لەوە دورتر بچین لەم گشتاندنەدا، لەبەرئەوە ئەم کێشەیە وەلادەنێین لەگەڵ نیشاندانی تێبینیەك لەبارەی ئەم بابەتەوە: بەدواداچونی کرداری سێکسی تانتری جێبەجێ ناکرێت وەك جۆرێك لە بەزم گێڕان بە پێشێلکردنی یاسا دابنرێت بەڵکو لەژێر چاودێری گورو دا guru، لەنێو چوارچێوەیەکدا کە نیگایەکی خۆنەویستانە دەستی بەسەرداگرتوە، وەك ئاهەنگێك بۆ تاج لەسەرنان بۆ زنجیرەیەکی دوورودرێژ لە مەشقکردنی ڕۆحی کە ئەنجام دەدرێت لەمیانەی چەند ژیانێکدا. سۆزی ڕۆحی کە هەوڵ دەدرێت بۆ گەیشتن پێی بریتیەلە خۆنەویستی و مەستی ئەمە پیرۆزیەکە ڕوودەدات لەکاتی ڕاستاندنی ناسنامە شکۆدارەکەی. بەڵام دوا ئامانجی ئەم کردارە بریتیەلە سەرکەوتن بەسەر ئەزمونی خۆنەویستانەدا و گەڕانەوە بۆ مەشقکردن لەسەر فرەیی لە جیهاندا بەبێ هەستکردن بە نامۆیی لەبارەی ئەم جیهانەوە.

دوای ئەوەی لایەنی سێکسی تانترامان تاوتوێ کرد دەتوانین بچینەسەر ڕوخسارەکانی تری تانترا. وەك پێشتر بینیمان ئەم کردارانە جیادەکرێنەوە بەوەی بەڕادەیەکی فراوان پشت دەبەستێت بە جموجوڵەکانی جەستە، وزە جەستەییەکان کە بەکاریدەهێنێت بەشێوەیەکی ڕێکخراو کە قسکردن و سەیرکردن و هێماکان لەخۆدەگرێت.
بۆ پێزانین بە جیاوازی لەنێوان ئەو مەشقە ئایینیەی کە کاردەکات بەم توانا جەستەییانە و بەکاریان دەهێنێت بەشێوەیەکی کارا، باشتروایە بگەڕێینەوە بۆسەر ڕاجا یۆگا و زن لە بوزییەتدا، بەرنامەی تێڕامان تیایاندا کاردەکات لەسەر سستکردنی جوڵەی جەستە و جێگیرکردنی بەتەواوی وەك کەرەستەیەکی کرداری بۆ کاراکردنی ئەقڵ و شکۆدارکردنی، تاکە فۆتۆیەك بەسە لەڕێگەی کامێرایەکەوە بگیرێت بۆ وێنەی جەستە لەکاتی ئەنجامدانی ئەو مەشقانەدا(چونکە لەسەر ئەو حاڵەتە دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت بەدرێژایی مەشقکردنەکە) لەکاتێکدا لە حاڵەتی تیبتیەکاندا tibetans پێویستمان بە کامێرایەکی ڤیدیۆیی هەیە بۆ وێنەگرتنی حاڵەتی جەستە لەمیانەی ئەو مەشقانەدا، هەروەها پێویستە ئامادەکراوبێت بۆ تۆمارکردنی دەنگ.
لەبەرئەوەی کاتێك جەستەی تیبتیەکان سەرقاڵە بە جێبەجێکردنی ڕێوڕەسمەکان لە حاڵەتی جموجوڵێکی بەردەوامدا دەبێت. پیاوانی لاما کڕنوش دەبەن (لاما: ناوی ڕاهیبی بوزییەتی تیبتیە) لەسەر زەوی بەشێوەیەکی تەواو، دەستەکانیان دەجوڵێنن و چەند بڕگەیەکی پیرۆز دەخوێننەوە، کۆمەڵە سرودێك دەڵێن کە لەناو قوڵایی قورگیان دێتە دەرەوە، کەواتە هەمیشە لەمیانەی ڕێوڕەسمەکاندا شتێکی دەنگی و بینراو هەیە کە جێبەجێ دەکرێت بەشێوەیەکی بەردەوام. بەڵگەی گەوهەری کە باسی لێوەدەکەن وەك بیانوهێنانەوەیەك بۆ سەرقاڵکردنی جەستەیان لەمیانەی کۆششە ڕۆحیەکەیاندا، ئەمە بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ و ئاشکرایە. ئەوان ڕازین بەوەی دەنگەکان و دیمەنەکان و جموجوڵەکان دەکرێت ئاگایی بەرێت، بەڵام دەڵێن پێویست هەمیشە بەو سەرئەنجامە بگات. بلیمەتی پێشەنگە مەزنەکانی تانترا دەردەکەوێت لە دۆزینەوەیان بۆ کەرەستە شارەزاکان ئوپایا upayas کە یارمەتیان دەدات لە ئاڕاستەکردنی وزە جەستەییەکانیان لەڕێگەی کەناڵەکانەوە، بۆئەوەی بیکەنە چەند تەوژمێك تا پاڵ بە ڕۆحەوە بنێت بۆ پێشەوە لەبری ڕێگری کردن لە جوڵەکەی. ڕەگەزی دیار لەم تەوژمانەدا دەبەسترێتەوە بە دەنگەوە، دیمەن، جووڵە کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ناوی هەموویان بە پیتی م دەستپێدەکات. مانتراس mantras واتە گۆڕینی ژاوەژاو بۆ دەنگ و گۆڕینی چەنەبازی بۆ چەند دەقێکی پیرۆز. مودراس mudras سەمای دەستەکان دەگۆڕێت بۆ سەمایەکی پیرۆز. ماندالاس mandalas چارەسەری چاوەکان دەکات و ئاڕاستەیان دەکات بەرەو جوانیە پیرۆزەکەی.
ئەگەر ویستمان لەبارەی ئەم ڕێوڕەسمە بدوێین بە ڕێگای تایبەت بە خۆمان ئەوا ئەو دیمەنەی دەردەکەوێت بەمشێوەیە دەبێت: ڕاهیبەکان دادەنیشن لە چەند ڕیزێکی دورودرێژدا، کڵاوی شامانی کێویان لەسەردایە، عەبای کلێسایان لەبەردایە. ڕاهیبەکان دەستدەکەن بە سرود وتن بەدەنگێکی گڕ بەتێپەڕینی کات دەبنە مۆزیکێکی هاوڕێك، وێڕای ئەوەی ڕاهیبەکان لەڕاستیدا گۆرانی ناڵێن بەڵام بە هاوڕێکبوونی ئاوازەکان لەلایان ناسراو نەبوو. لەڕێگەی ئامرازێکی دەنگیەوە کە هاوشێوەی نیە لە هیچ جێگایەکی تری جیهاندا(٥٨). لەم ساتەدا دەستەکانیان دەجوڵێنن کەبەشێوەیەکی پلەبەندکراو حاڵەتێکی ئاگایی پێکدێنن کە دەچنەناوی. بەڵام دوا سیمای ئەم مەشقە بەردەست نابێت بۆ چاودێرەکان چونکە سیمای ناوەکین، چونکە بەدرێژایی ئەو مەشقانە ڕاهیبەکان خوداوەن دێننە پێشچاویان کە ناوی دەهێنن، بەوەی وێنای دەکەن بەڕادەیەکی گەورە لە تێڕامان (ئەمە پێویستی بە چەندین ساڵ مەشقکردن هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەو تەکنیکە)، لەسەرەتادا بە داخستنی چاوەکان، بەڵام لەکۆتاییدا لەڕێگەی چاوەکانەوە کە بەتەواوی کراوەبن، بەو جۆرە دەتوانن خوداوەند ببینن

هەروەك بەبەرجەستەكراوی لەپێشچاویان بێت. ئەمە پێویستی بە ڕێگایەكی دوورودرێژە بۆئەوەی بیكاتە ڕاستی، بەڵام لە لوتكەی تێڕامانەكەدا ڕاهیبەكان بۆ لەوە دورتر دەچن. ئەوان دەیانەوێت بەشێوەیەكی ئەزمونی یەكبگرن لەگەڵ ئەو خوداوەندەی كە ناوی دەهێنن، باشتروایە هێزەكانیان لەم مەبەستەدا بەكاربهێنن. لێرەدا چەند شێوازێكی هونەری ڕێكدەخرێت، بەڵام لەبەر خودی هونەر نیە بەڵكو بە مەبەستی لە قاڵبدانی ڕۆحی مرۆیی بە درێژترین شەپۆل بۆ خوداوەندی پاسەوان و پارێزەر كە لێی دەپاڕێنەوە. بۆ كاملكردنی ئەم لایەنە لە جیاكردنەوەی بوزییەتی تیبتی پێویستە لەسەرمان ڕێكخراوێكی ناوازە زیادبكەین كە ڕێكخراوی دالای لامایە. كاتێك خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی لەساڵی ١٩٨٩ز. بەخشرا بە قەشە دالای لاما dalai lama ئەو ڕێكخراوە لە هەموو جیهاندا ناسرا. دالای لاما وەك پاپا نیە چونكە مافی دیاریكردنی بیروباوەڕی ئایینی نیە لەبەرئەوە گومڕاكردنە گەر ناوی بنێین پادشای-یەزدانی، چونكە ئەگەر تیایدا دەسەڵاتە ئایینی و ڕۆحیەكان كۆكرانەوە ئەوا یەكێك لەم دەسەڵاتانە ئەركە گەوهەریەكەی دیاری دەكات ئەوەش بریتیەلە بەرجەستەكردنی لەسەر زەوی بە بنەما ئاسمانیەكانی كە بەزەیی و میهرەبانی لە گرنگترین سیماكانیەتی. دالای لاما بریتیەلە بودهی ساتڤا كەلە هیند ناسرابوو وەك ئەڤالۆكیتیشڤارا avalokiteshvara، لە چین وەك خوداوەندی بەزەیی كوان یین، لە ژاپۆن وەك كانون kannon. ئەمە وەك چینریزیگ chenrezig (ناوە تیبتیەكەی)، بۆ چەندین سەدە هەستاوە بە بەرجەستەكردنی خۆی بۆ بەهێزكردنی نەریتە تیبتیەكە. لەڕێگەی خودی خۆیەوە تائێستا هەستاوە بە چواردە بەرجەستەكردنی لەدوای یەك، تەوژمی نەبڕاوە لەكاریگەری ڕۆحی كە دەناسرێتەوەبە بەزەیی و میهرەبانی لە تامو چێژەكەیدا. بەمجۆرە سەبارەت بە جیهان بەشێوەیەكی گشتی بۆ تیبت بەشێوەیەكی تایبەت، چونكە ڕێكخراوی دالای لاما فێركاری نیە، بەڵام پێكهاتوە لە چالاكیەكەی ئامادەكراو بەشێوەیەكی سەربەخۆ كاردەكات جیا لە هەموو شتێكی تر وەك تاكێك ئەم شتە یان ئەو شتە ئەنجام دەدات. دالای لاما ناوەندی ئاشتەوایی دەنوێنێت كەبەشێوەیەكی بەردەوام دەڕژێتەناوی بە بنەمای بەزەیی و میهرەبانی بوزی بەهەموو توانا گەردونیەكەیەوە، بۆئەوەی لەوێوە بدرەوشێتەوە بەرەو گەلی تیبتی بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ، لەوێوە بگات بە هەموو بوونەوەرە خاوەن هەستەكان. ئایا دالای لاما هەڵدەسێت بە دوبارە بەرجەستەكردنی خۆی بۆ جاری دووەم (واتە دوای مردنی؟) هیچ كەسێك وەڵامی ئەم پرسیارە نازانێت لەبەرئەوەی لە ئێستادا هێرشبەرە چینیەكان لەسەر ئەوەی هیچ كەسێكی تایبەت ناتوانێت خزمەتیان بكات چونكە شتێكی زۆر گرنگ هەیە ڕادەكێشرێت لە مێژوو چونكە هێندەی گرنگی باران بۆ زەوی ڕۆحی مرۆیی گرنگە بۆ گەلی تیبت لەكاتی تەنگانەكەیدا.

## وێنەی پەڕینەوەکە

تائێستا سەیری سێ ڕێگای پەڕینەوەمان کرد لە بوزییەتدا: دەستەواژەی بچوک و دەستەواژەی گەورە، لەگەڵ گرنگیدانی تایبەتی بە بوزییەتی زن، ئەوەی سێیەمیان تاڕادەیەك شاز دەردەکەوێت لە چوارچێوەی دەربڕینەکاندا: دەستەواژە ئەڵماسیەکە. ئەم دەستەواژانە زۆر جیاوازن بەڕادەیەك واله مرۆڤ دەکەن لە کۆتاییدا بپرسێت لەسەر چ بنەمایەك جگەلە پەیووەندیە مێژوییەکەی ئەم خوێندنگا جیاوازانە شایستەی ئەوەن بە دیمەنەکانی تاکە ئایینێك دابنرێن. دوو بۆچوون هەیە بانگەواز دەکەن بۆ سەیرکردنیان وەکئەوەی ڕێبازەکانی تاکە ئایینێکن. یەکەم: هەموویان تاکە بنیاتنەرێك بە پیرۆز دەزانن ئەویش بوزایە. دووەم: دەشێت هەموویان پۆلێنبکرێن لەژێر یەك ناودا: ئەویش وێنەی پەڕینەوەیە، واتە ئەزمونی ڕۆژانە بۆ پەڕینەوە لە ڕوبارێك لەسەر بەلەمێك. بۆئەوەی بایەخی ئەم وێنەیە بزانین پێویستە لەسەرمان ئەو ڕۆڵەمان لەبیربێت کە بەلەمی ناو ڕوبارەکان دەیگێڕن لە ژیانی ئاسیایی کلاسیکیدا. لەو زەویانەی ڕوبارەکان پێکەوەیان دەبەستنەوە، هەموو گەشتێکی گرنگ پێویستی بە بەلەمێکە، ئەم ڕاستیە ڕۆتینیە کاریگەربوو لەسەر هەریەکەلە خوێندنگاکانی بوزییەت، هەروەك بەکارهێنانی وشەی بەلەم یان یانا شایەتی دەدات کە بەکاردەهێنرێت لە زۆر جێگادا. ئەمە شتێك ئاساییە، چونکە بوزییەت گەشتێکە بەناو ڕوباری ژیاندا، چونکە ئەمە گواستنەوەیە لە کەناری نەزانین ومەرگەوە بەرەو کەناری دانایی و بەئاگابوون و ڕوناکبوونەوە، ئەگەر بەراوردکاری کرا لەنێوان ئەو سێ ڕێگایەدا هیچ نیە جگەلە جیاوازی نێوان ئەو بەلەمانەی کە مرۆڤ بەکاری دەهێنێت بۆ پەڕینەوە، یان لەنێوان ئەو ئاستانەی پێی گەیشتوە لەم گەشتەیدا.

ئەم ئاستانە چین؟

کاتێك لەسەر کەناری یەکەمین ئەمە لەڕاستیدا ژیان دەنوێنێت سەبارەت بە ئێمە. زەوی لەژێر پێیەکانمادا پتەوە، خەڵاتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئاشکرایە و گرنگە. بەڵام کەنارەکەی تر هیچ کاریگەریەکی نیە لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردنمان.

بەڵام ئەگەر شتێکی ڕویدا پاڵمان پێوەبنێت بۆ زانینی چۆنیەتی شتەکان لە کەنارەکەی تر، لەوکاتەدا دەتوانین بڕیاربدەین لەبارەی هەوڵدان بۆ پەڕینەوەمان بۆ کەنارەکەی تر، ئەگەر کەسانی سەربەخۆ بووین ئەوا بڕیاردەدەین بە ئەنجامدانی ئەو گەشتە هەستین بەتەنها پشتبەستن بە خۆمان. لەم حاڵەتەدا لە شوێنکەوتوانی بوزییەتی تیراڤادا دەبین، نەخشەکەی بوزا جێبەجێ دەکەین بەڵام بۆ خۆمان خۆمان دروستدەکەین. بەڵام زۆربەمان نە کاتی هەیە نە شارەزایی بۆ بەجێهێنانی هاوشێوەی ئەم پرۆژەیە، کەواتە ئێمەی ماهایانی لەسەر کەناری یەکەم دەڕۆین تا ئەو جێگایەی کە پێشبینی دەکەین بەلەمێکی لێیە بۆئەوەی بەکاری بهێنین لە پەڕینەوەماندا بۆ کەنارەکەی دیکە. لەکاتێکدا پێشڕەوەکان لەسەر ڕووی ئەم بەلەمە لە کەشو هەوایەکی لێوانلێو لە ئاگاییدان کە نیگاکانیان چڕکردوەتەوە لەسەر کەنارەکەی تر کە هێشتا ئەستەمە بناسرێتەوە بەهۆی دوریەکەیەوە، بەڵام گەشتیار هێشتا هاوشێوەی هاوڵاتیەکانی سەر کەناری یەکەمن. بەمجۆرە بەلەمەکە دەکەوێتەڕێ بەناو ئاوەکەدا وردەوردە دوور دەکەوێتەوە لە کەناری یەکەم و دوکان و شەقامەکان بچوك دەبنەوە لەپێش چاو بەرلادەیەك هێندەی مێرولەیەکیان لێدێت. لەم کاتەدا ئەو کەنارەی بەرەوڕووی دەڕۆین هێشتا دوور دێتە پێش چاو. ناوبڕێکی کاتی هەیە لەمیانەی پرۆسەی پەڕینەوەکەدا، کە تیایدا هیچ ڕاستیەکی بەرجەستەکراو بوونی نیە جگەلە ئاو و ئەو بەلەمەی گەشتیارەکانی لەسەرە. ئەمە ساتەوەختی دەرکەوتنی هەرسێ بوزییەتەکەیە: پەنایان برد بۆ بوزا، هێندە بەسە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان پێشڕەوێك هەستاوە بە گەشتێك و

بۆی سەلماندووین کە دەشێت سەرکەوتو بین تیایدا. پەنای برد بۆ دهارما، بەلەمەکە کە ژیانی خۆمان پێسپاردوە. پەنای برد بۆ سانگها، سیستم یان شێوازەکە، کەسانی سەر بەلەمەکە کە هەڵدەستن بە بەڕێوەبردنی. کەناری جیهانمان لەپشت خۆمان جێهێشتوە، هەتا ئەو کاتەی پێ دەخەینە سەر کەنارەکەی تر هەموو ئەو شتەی بەدەستمانەوە ماوە و پشتی پێدەبەستین ئەو سێ شتەیە.

کەنارەکەی دووەم وردەوردە نزیک دەبێتەوە دواتر دەبێتە ڕاستی. بەلەمەکە لەنگەردەگرێت لەسەر لمەکە. لەسەر ئەو زەویەی کە نهێنی و پەنهان بوو هەروەك خەونێك، ئێستا بووەتە ڕاستی، ئەو کەنارەی لەپشت خۆمان جێمان هێشت کە ئاشکراو ڕاستەقینەبوو ئێستا تەنها پەڵەیەکی بینراوە بەبێ ئەوەی هیچ مادەیەکی هەبێت. بەڵام ئێمە تامەزرۆی ناسینی ئەو ژینگەیەین کە دەوری داوین، بەسوپاسگوزاریەوە بەلەمەکە و ستاڤ بەڕێوەبەری بەلەمەکەمان لەبیرە. بەڵام ناکرێت پێداگری بکەین لەسەر هەڵگرتنی بەلەمەکە بۆئەوەی لەگەڵ خۆمان بیبەین کاتێك بە ئاڕاستەی دارستانەکە دەڕۆین. بوزا پرسی: ئایا مرۆڤ لێزان دەبێت ئەگەر بەهۆی پێزانی بە چاکەوە هەستێت بە هەڵگرتنی بەلەمەکە و بەدوای خۆیدا ڕایبکێشێت؟ یان لێزان ئەو کەسەیە بەلەمەکە جێبهێڵێت کە پێویستی پێی نەماوە، دواتر بەرەو پێشەوە بڕوات بەبێ ئەوەی سەیری دوای خۆی بکات؟ ئایا ئەم بەلەمە هۆکارێك نەبوو بۆ پەڕینەوە و پێویست بەوە ناکات بەجێبهێڵرێت و لەبیربکرێت کاتێك بەوکارە هەستا کە بۆی دروستکراوە؟ بەهەمان شێوە پێویستە کەرەستەی بیروباوەڕ فڕێ بدرێت کاتێك لەبیردەکرێت و مرۆڤ دەگات بە کەناری ڕووناکبوونەوە(٥٩).

لێرەدا دەگەین بە پراج ناپارامیتا prajnparamita یان کامڵبوونی دانایی، دەقەکانی سوترا sutras کە بەشێوەیەکی بەرفراوان دانراون بە لوتکەی دەقەکانی بوزییەت. پێنج بنەماکە، ئەو ڕێگایەی هەشت لقی لێ دەبێتەوە دەستەواژە تەکنیکیەکانی دوکها و نیرڤانا و کارما، سیستمی ڕێگا و خودی بوزا، هەموو ئەمانە گرنگی خۆیان هەیە لەمیانەی کرداری پەڕینەوەکەدا، بەڵام هیچ بایەخێکیان نامێنێت لای ئەو کەسانەی گەیشتونەتە کەنارەکەی تر. لەڕاستیدا سەبارەی بە گەشتیارەی نەگەیشتوە بە کەنارەکەی تر بەڵکو کاتێك دێت تەنها بەلەمەکە بێ بایەخ نابێت لەلای بەڵکو خودی ڕووبارەکەش. کاتێك ئەم کەسە ئاوڕدەداتەوە بۆئەوەی سەیری ئەو زەویە بکات کە جێی هێشتوە، چی بۆ دەردەکەوێت؟ ئەبێ چی دەرکەوێت لەو زەویەوە بۆ ئەو کەسەی گەیشتوە بەلوتکە، بینینی خودی ئەو ڕووبارەی لەلا گرنگ نیە کە کەناری یەکەم و ئەم کەنارەی ئێستای پێکەوە دەبەستێتەوە؟ ئەو سەیردەکات نە کەنار دەبینێت نە ڕووبار نە بەلەم نە ستاڤ بەڕێوەبەری بەلەمەکە، هەموو ئەو شتانە بوونیان نەماوە لە جیهانە نوێکەدا.

پێش پەڕینەوە بە ڕووبارەکەدا، پێویستە هەریەکە لە کەناری مرۆیی و یەزدانی جودا لەیەکتر دەربکەون، جیاواز بن هەروەك جیاوازی نێوان مەرگ و ژیان، شەو و ڕۆژ. بەڵام تەنها بە پەڕینەوە هیچ دوانەییەك بوونی نامێنێت. کێڵگەی یەزدان یان جیهانەکەی شوێنێکی تایبەت نیە. هەر جێگایەك گەشتیارەکە تیایدا دەوەستێت ئەگەر وەستانێك ڕوویدا لەم جیهانەدا ئەوا خودی جیهان دەگۆڕێت. بەم مانایە پێویستە دانپیانانەکانی ئەم وتە بەنرخە بخوێنینەوە: ژیانی دونیاییمان بریتیەلە لە چالاکی خودی نیرڤانا، هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوانیاندا(٦٠). تێڕامانی دەرون ڕێبەری کردن بۆ حاڵەتی باسکردنی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ لەسەرئەوەی نیرڤانایە، بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە لەسەر ئەوەی بۆشاییەکی تەواوە، لەبەرئەوەی بەرزدەبێتەوە بەسەر هەموو شێوەکاندا. ئەوەی سەرکەوت جۆگەی ئاودا لەناو جیهانی خۆیدا ئەم بۆشاییە دەبینێتەوە کە دۆزیویەتیەوە لەناویدا: ((شێوە بریتیەلە بۆشایی، بۆشایی شێوەیە، بۆشایی جیاوازنیە لە شێوە، شێوە جیاواز نیە لە بۆشایی)).

کاتێك ئەو جودابوونەوەیە بێدەنگ دەکرێت لەنێوان قوبوولْ کردن و ڕەتکردنەوەدا، ئەوا جەختدەکرێتەوە لەسەر هەموو ساتێك لەبەرئەو شتەی لەڕاستیدا دەینوێنێت. ئەمە تۆڕی ئیندرای گەردونیە کە پێکەوە بەستراوە لەڕێگەی گەوهەرەکانەوە لە هەموو خاڵێکی پەیوەندیکردندا. هەر گەوهەرێك ڕەنگدانەوەی گەوهەرەکانی ترە، بەجۆرێك ئەم ڕەنگدانەوەیە زیاددەکرێت بۆ ڕەنگدانەوەی هەموو گەوهەرەکانی تر. لە هاوشێوەی ئەم تێڕوانینانەدا پۆلێنکاریەکانی نێوان چاکە و خراپە نامێنن. دەخوێنینەوە: ((ئەوەی تاوانە دانایییە لە هەمان کاتدا))، بۆ جاری دوەم دەخوێنینەوە: ((جیهانی گۆڕانکاریەکان نیرڤانایە)).

ئەم زەویەی لەسەری وەستاوین

زەوی لوتسی بەڵێنپێدراوە،

خودی ئەم جەستەیە

جەستەی بوزایە(٦١).

ئەو کەنارەی بەم دواییانە دۆزراوەتەوە ڕوناکی خۆی دەخاتەسەر بودهی ساتڤا بۆئەوەی نەچێتەناو نیرڤاناوە هەتا خودی گژوگیا ڕوناك نەبێتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی گژوگیا بەردەوامە لە گەشەکردن بەبەردەوامی، ئایا ئەمە واتای ئەوەیە بودهی ساتڤا هەرگیز ناچێتەناو ڕوناکبوونەوە؟ نەخێر بەپێچەوانەوە بەو واتایە دێت بودهی ساتڤا بۆ ئەو خاڵەی تیایدا جیاکردنەوەی کات و ڕۆژگار لە هەمیشەیی بوون هێزی خۆی لەدەست دەدات. ئەو جیاوازیەی ئەقڵی لۆژیکی کێشاویەتی بەرەو نەمان دەچێت لەژێر هەورەبروسکەی ژیریدا کە هەموو جیاکەرەوەکانی لەناوبردوە. کات و هەمیشەیی بوونبوونەتە دوو دیمەنی تاکە دەرونێك، هەموو ئەوانەی تاقیدەکەنەوە و هەستی پێدەکەن وەك دوو ڕووی گۆشەیەکن. ((گەوهەری هەمیشەیی بوون حەشاردراوە لە لوتسی لەدایکبوون و مردندا)).

لە ڕووانەی ئاگایی ئاسایی و دونیاییەوە پێویستە هەمیشە دژێتی و ناچونیەکیەك بمێنێتەوە لەنێوان ئەم ژیریە و ئاگایی دونیاییدا. بەڵام پێویست ناکات بەمە سەرسام بین، چونکە زۆر ناچونیەك دەبێت سەبارەت بەوانەی ڕوباری نەزانینیان تێپەڕاندوە. چونکە تەنها ئەوان ەتوانن جیاکاریەکانی جیهان بتوێننەوە-یان لەوانەیە پێویست بێت بڵێین کە بەردەوام دەبن لە هەوڵ و تێکۆشانیان بۆئەوەی جیاوازیەکان بمێنن بەڵام بەبێ ئەوەی ئەو جیاوازیانە گرنگ بێت بەلایانەوە-بەجۆرێك دەشێت ڕوبار بینراو بێت بۆ داڵ، بەڵام ئەو دەیەوێت بینینێت وەك شتێك دەگات بە هەردو کەنارەکە لەبری ئەوەی دابەشکرابێت بەسەریاندا!.

## بەیەکگەیشتنی بوزییەت و هیندۆسیەت لە هیند

لەنێوان جیاوازیە ڕوکاریەکانی بوزییەت–ئەم ئایینەی کە دەستیپێکرد بە ڕەتکردنەوەی ڕێوڕەسمەکان، ڕەتکردنەوەی خەملاندنەکان، ڕەتکردنەوەی پشتبەستن بە پیرۆزی، ڕەتکردنەوەی نهێنیە ئایینیەکان، ڕەتکردنەوەی یەزدان وەك کەسێك، بۆئەوەی هەموویان بگەڕێنێتەوە بۆناو وێنەکە! بوزییەکان ڕۆژانە لەزیادبووندان لە هەموو وڵاتێکی ئاسیاییدا جگەلە هیند (ئەو وڵاتەی کە بەڕاستی تیایدا پەروەردە بووە)!، تەنها لەم دواییانەدا لەدوای دیارنەمانی بۆماوەی هەزار ساڵ سەرلەنوێ ژمارەیەکی کەم لە بوزییەکان دەرکەوتن لە هیند. بوزییەت سەرکەوتوو بوو لە جیهاندا بەشێوەیەکی بەرفراوان بەڵام ئەو زەویەی دۆڕاند کە تیایدا لەدایك بوو. بەڵام لەڕاستیدا ئەمە ئەو شتەیە کەلەسەر ڕووکاری دەرەوە دەردەکەوێت بەڵام زۆر وردبینانە نیە بەڵکو دیمەنێکی فریودەرە. ڕاستی قووڵتر بریتیەلەوەلای بوزییەت شکستی نەهێناوە لەلای هیندۆسیەت هێندەی ئەوەی تیایدا جێگیر بووە. هەتا ساڵەکانی نزیکەی ١٠٠٠ز، بوزییەت لە هیند= بەردەوام بوو وەك ئایینێکی تایبەت. **ئەو وتەیەی دەڵێت کە هێرشبەرەر موسوڵمانەکان لە هیند لایانبردوە دوورە لە ڕاستیەوە بەو بەڵگەیەی هیندۆسیەت تیایدا مایەوە. ڕاستیەکە بریتیە لەوەی لەمیانەی ١٥٠٠ ساڵ مانەوەی لە هیندا جیاوازیەکانی نێوان بوزییەت و هیندۆسیەت بەرەو کاڵبوونەوە چوو.** هیندۆس دانیناوە بە یاسابوونی زۆربەی ئەو چاکسازیانەی بوزا بانگەشەی بۆ کردون، هەروەها پێی ڕازی بوون، وەك لاسایی کردنەوەیەك بۆ سیستمی قەشەیەتی سانگهای بوزی هیندۆس سیستمی قەشەیی سادهوسی sadhus بنیاتنا واتە سۆفیە گەڕۆکەکان. لەلایەکی ترەوە ڕێنماییەکانی بوزییەت وادەردەکەوتن کە هاوشێوەی هیندۆسیەتن، بەتایبەت کاتێك بوزییەت بواری ڕەخساند بۆ ماهایانا هەتا لە کۆتاییدا بوزییەت هات بۆئەوەی ڕۆبچێت لەو چاوگەی کە لێوەی هەڵقوڵاوە.

بنەماکانی بوزییەت هیچ شوێنەوارێکی جێنەهێشت لەسەر هیندۆسیەت بۆئەوەی لەدواییدا ئەم تێکەڵبوونە بە شکستهێنانی بوزییەت دابنێین. بەڵام لەڕاستیدا بەوجۆرە نیە چونکە هەموو ڕێبازەکانی بوزییەت بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانەی شوێنی خۆی دۆزیەوە لەناو هیندۆسیەتدا. هیندۆس دانی بەوەدا نا تەنها بەشێوەیەکی تیۆری نا بەڵکو بەشێوەیەکی پراکتیکی لە زۆرینەی کاتەکاندا، بە دوبارە جەختکردنەوەی لەسەر بەزەیی و میهرەبانی بەرامبەر بە هەموو بوونەوەرە زیندوەکان، لەسەر نەکوشتنی گیاندارەکان، لەسەر لابردنی بەربەستە چینایەتیەکان لە کاروبارە ئایینیەکاندا و کەمکردنەوەیان لە کاروبارە کۆمەڵایەتیەکاندا، جەختکردنەوەی لەسەر ئاکار بەشێوەیەکی گشتی. وادەرکەوت نمونەی باڵای بودهی ساتڤا جێ پەنجەی بەئاشکرا جێهێشت لەسەر نزا و پاڕانەوەکان، وەکو ئەم نزایە لەلایەن سانتی دیڤا santi deva لە نوێژەکانی پەرستشەکانی هیندۆسیەتدا کە ناودەبرێن بە بهاگافاتام bhagavatam:

**لە یەزدان ناپاڕێمەوە کە مەزنیم پێ ببەخشێت کە بەدەستدێت لەکاتی دەستەبەرکردنی هێزە هەشت لقەکەدا، هەروەها داوای لێناکەم کە ڕزگارم بکات لە لەدایکبوونەوە بۆ جاری دووەم، تاکە داواکاریم لێی بریتیەلەوەی ئەو توانایەم پێ ببەخشێت کە هەست بکەم بە ئازاری ئەوانی تر بەڕادەیەك هەروەك لە جەستەیاندا بم، بەوەی توانام هەبێت لەسەرئەوەی ئازارەکانیان بڕەوێنمەوە و دڵخۆشیان بکەم.**

بەکورتی بوزا بە کوڕە یاخیبووەکەی هیندۆسیەت دانراوە بەڵکو بەرزکراوەتەوە بۆ پلەوپایەی بەرجەستەکردنی یەزدانی. داننراوە بە ڕۆڵی بوزییەتی تیراڤادا لەسەرئەوەی گەوهەرەکەی هیندۆسیەتە نەك دوانەیی بوون،

تەنانەت وێڕای ئەوەی پراجن پارامیتا prajnparamita وادادەنێت کە نەمری هیچ نیە جگەلە خودی کاتی ئێستا، هاوشانی خۆی دۆزیەوە لە هیندۆسیەتدا کە دەڵێت:

خودی ئەم جیهانە خانویەکی مەزنە بۆ گەمە و شادومانی،

لێرەدا دەتوانم کە نان بخۆم، بخۆمەوە، هەروەها کامەران بم.

ڕاما کریشنا ramakrishna

لە خوێندنگا تانتریەکانی هیندۆسیەتدا بەشێوەیەکی تایبەت ئەم شوێنکەوتوانە گەیەنراونەتە ئەو خاڵەی تیایدا هەریەکە لەمانە دەبینن گۆشت، مەی، سێکس–ئەو شتانەی لە سەرەتادا وەك بەهێزترین بەربەست دەردەکەوتن لەبەردەم گەیشتن بەی یەزدان–ئەمانە هیچ نین جگەلە چەند دیمەنێکی تری جیاوازی خودی یەزدان!.

((دایك لە هەموو ماڵێکدا هەیە. ئایا پێویستە لەسەرم کە هەواڵ بپچڕم ئەگەر یەکێکیان دەفرێکی قوڕینی شکاند لەسەر زەوی؟))(٦٢).

## کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر:

١–وێڕای ئەوەی نوسراوەتەوە لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا بەڵام کتێبی:

j. b. pratt's: the pilgrimage of buddhism nduddist ilgrimage (new york: ams press، 1928)

واتە: دیدەنی بوزییەت، دیدەنی کەسی بوزی نوسینی: ج. ب. پرات، گێڕانەوەیەکی گشتگیرە شایستەی تێگەیشتنە بۆ ئەم ئایینە بوزییەت.

٢–بەڵام تازەترین کتێب کەلەبەردەستدا بێت: ئایینی بوزی نوسینی ڕیچارد ڕۆبنسۆن و ویلارد جونسونە.

٣–کتێبی: دەقە پیرۆزەکانی بوزییەت لە نوسینی ئێدوارد کۆنز دەناسرێتەوە بەوەی بەشێوەیەکی ژیرانە دەدوێت لەبارەی دەقە ڕەسەنەکانی بوزییەتەوە.

٤–کتێبی ئەزمونی ژیری لە نوسینی جۆزێف گۆڵدشتاین چۆنیەتی ئەنجامدانی تێڕامان ڕوون دەکاتەوە لە بوزییەتی تیراڤادادا بەشێوەیەکی جوان بۆ خوێنەرە ڕۆژئاواییەکان.

٥ و ٦–ئەم دوو کتێبە بەدوو کتێبی جیاواز دادەنرێن لەبارەی زنەوە یەکێکیان تەواوکەری ئەوی دیکەیانە:

Philip kapleau's the three pillars of zen (new york: anchor books، 1989) and shunryu suzuki's zen mind، beginner's mind (new york: john weatherhill، 1970).

٧–کتێبی بنەماکانی سوپاسگوزاری هەناوەی تیبتی لە نوسینی: لاما ئانجاریکا گوڤیند بیردۆزی بوزیییەتی تیبتی دەخاتەڕوو.

٨–کتێبی لوتکەکان و چاوپیسی لە نوسینی مارکۆ پاللی یەکێکە لە جوانترین وانە ڤیدیۆییەکان لەبارەی گەشتی tavelogues کە نوسراوەتەوە.

٩–دوو کاسێتی ڤیدیۆیی لەبارەی بوزییەتی تیبتیەوە کە ماوەی هەریەکەیان نیو کاتژمێرە لەژێر ناونیشانی: خوێندنەوەی سرودێکی ئایینی بۆ ئاسودەکردنی ڕۆحی مردوەکان بۆ بیروباوەڕ requiem for faith، ڕەهەندە بیستراو و بینراوەکانی ڤاجرایانا دەخاتەڕوو هەروەك چۆن باسکراوە لەم بەشەدا لەژێر ناونیشانی هەورەبروسکەی ئەڵماسیدا.

## چەند سەرچاوەیەكی بەسود لەبارەی بوزییەتەوە بە زمانی عەرەبی:

١-الأديان القديمة في الشرق، دكتور عبدالرؤف شبلي، دار الشروق، بيروت، قاهرة، ط٢، ١٤٠٣ه-١٩٨٣م.

٢-أشهر الديانات القديمة، تأليف: لطفي وحيد، ط١، الأسكندرية، مصر، المركز العربيللنشر و التوزيع، ١٩٩٦.

٣-آلهة في الأسواق، دراسة في النحل والأهواء القديمة في الشرق، د. عبد الرؤف شبلي، الكويت: دار القلم. (كتاب ضعيف جدا في محتواه)

٤-انجيل بوزا، ترجمة سامي سليمان، شيا، ط١، بيروت، لبنان، دار الحداثة، ١٩٩١م.

٥-بوزا، اعتمادا على أقدم النصوص، ألفه بالفرنسية: زالبولا راهولا، و قدم لة بول ديمييفيل أستاذ في كوليج دي فرانس و مدير الدراسات البوزية في مدرسة الدراسات العليا. ترجمة: يوسف شلب الشام، ط١، ورد للطباعة ة النشر، دمشق، ٢٠٠١م. (١٤٣ ص من القطع المتوسط، ممتاز جدا في توضيحه وشرحه.

٦-بوزا، تأليف: جيم هوب. . . وآخرون، ترجمة حسن الرفاس، دار الحصاد، دمشق، ٢٠٠٠م.

٧-البوزية، فؤاد محمد شبل، مصر: القاهرة، دار المارف، ١٩٧٣. (٢٥٦ صحفة من القطع الصغير، وهو كتاب ممتاز للغاية في موضوعه، بل من أفضل ما كتب عن البوزية بالعربية، نظرا لأن مؤلفه أقام مدة جيدة في بلدان البوزية في الشرق كاليابان والهند وتايلاند و سريلانكا. . ).

٨-بوذية، ألفه بالفرنسية هنري لآرفون سلسلة ماذا أعرف؟ ترجمة هنرز نجيب، نشر النمشورات العربية، ط٢، بيروت، ١٩٨٥. (١٥٥ ص من القطع الصغير و ممتاز جدا في بابه).

٩-التصوف البوذي و التحليل. . . ، تأليف: ت. سوزوكي، ترجمة: ثائر ديب، ط١، اللاذقية، سوريا، دار الحوار للنشر والتوزيع، ١٩٩٩٦م.

١٠-الحكمة البوذية، تأليف: ريماصعب و آخرون، ط١، بيروت: لبنان، مؤسسة نوفل، ١٩٩٦م.

١١-الدين في الهند و الصين و ايران، أبكار السقاف، ظ١، بيروت، لبنان، مؤسسة الأنتشار العربي، ٢٠٠٤م.

١٢-رحلة الأنسان مع الأديان، تأليف: عبدالرحمن نورالدين القاهرة، ط١، مصر: دار الهلال، ١٩٩٢م.

١٣-قصة الأديان، سليمان مظهر، دار الرقي للطباعة و النشر والتوزيع، ١٩٨٤

١٤-المدينة الفاضلة عند جوتاما بوذا-أفلاطون. . . ، تأليف: اسحاق عبيد، ط١، القاهرة، مصر: دارالفكر العربي، ٢٠٠٠م.

١٥-معجم ديانات و اساطير العالم، تأليف: امام امام، ط١، القاهرة، مصر، مكتبة مدبولي، (٣ مجلدات) ١٩٩٨م.

١٦-مقارنة الأديان، أديان الهند الكبرى: دكتور أحمد شبلي، القاهرة، مكتبة النهضة المصرية، ط٨، ١٩٨٦.

١٧-من قاموس الأديان: الهندوسية-البوذية-السيخية، تأليف: الدكتور أسعد السحمراني، ط١، بيروت، لبنان، دارالنفائس، ١٩١٤ه-١٩٩٨.

١٨-موجز تأريخ الأديان: فيليسيان شالي ترجمة عن الفرنسية: حافظ جمالي، ط١، دمشق، دار طلاس للدراسات و الترجمة و النشر، ١٩٩١.

١٩-الموسوعة الفلسفية العربية: رئاسة حرير: د. معن زيادة، نشر معهد الأنماء العربي، ط١، ١٩٨٦.

## پەراوێزەكانی نوسەر بۆ بەشی بوزییەت

١-پرسیاركردن لە عیسا جیاواز بوو بەڵام ناوەڕۆك و مانای پرسیارەكە یەك شت بوو.

٢–مێژونوسەکان هەرگیز کۆك نەبوون لەسەر بەرواری لەدایکبوونی.  لە ساڵی ١٩٥٦ لە هەموو وڵاتە بوزییەکان ئاهانگیان گێڕا لەسەر  یادی تێپەڕینی ٢٥٠٠ ساڵ بەسەر کۆچی دوایی بوزا.  بەوەی لەدایکبوونەکەی  دەخاتە ساڵی ٦٢٤پ. ز.  بەڵام من ئەو مێژوەم باسکردوە کە مێژونوسە  ڕۆژئاواییەکان باسی دەکەن.

1952.  ،buddhism:  a religion of infinite compassion ،3-cf.  clarence h.  hamilton .14-15 ،1954) ،reprint (new york:  the libreal arts press

٤–هەمان سەرچاوەی پێشو لاپەڕە ٣–٤.

the pilgrimage of buddhism and a  ،5-quoted from dighha nikaya in j.  b.  pratt .10 ،128) ،buddhist pilgrimage (new york:  ams press

٦–هەمان سەرچاوەی پێشو ل ١٢.

٧–هەمان سەرچاوەی پێشو ل٨.

٨–هەمان سەرچاوەی پێشو ل٩.

٩–هەمان سەرچاوەی پێشو ل١٠.

١٣10-majjhima lxxii.  Quoted in p

١١–تومیەت ڕێبازی قەشە توماوادادەنێت  بەڵگەیەکی پراتیکی هێناوەتەوە لەبارەی بوونی یەزدان و بوونی ڕۆح، بەڵام دانبەوەدا دەنێت کە سروشتی یەزدان  و ڕۆح دەچێتەدەرەوەی توانای بیرکردنەوەی ئەقڵی.  وشەی speculation واتە خەملاندنی ئەقڵی بەکارمان هێنا بە مانای لاستیکی کە هەموو کێشەکان دەگرێتەخۆی کە دەگەڕێت بەدوایدا لە ئاییندا کەلە دەرەوەی بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵیە بەبێ گوێدانە وەحی بۆئەم کێشانە یان نا.

١٢–وەرگیراوە لە کتێبی mahayana buddhism بوزییەتی ماهایانایی لە نوسینی b.  l.  suzuki چاپی لەندەن ل٢.

١٣–لە کتێبی ڕێنماییەکانی بوزای میهرەبان لە نوسینی e. aburtt چاپی نیویۆرك ل٤٩–٥٠.

١٤–هەمان سەرچاوەی پێشو ل ١٨.

١٥–هەمان سەرچاوەی پێشو ٣٢.

١٦–وەرگیراوە بە دەستکاریەوە لە کتێبی majjhima nikaya ژمارە ٦٣ وەرگێڕانی e. j. thomas لە کتێبی نوسینە یەکەمینەکانی بوزییەت ل ٦٤–٦٧.

١٧–کتێبی هەندێك لە وتەکانی بوزا نوسینی f. l. woodward ل٢٨٣.

١٨–وەرگیراوە لە کتێبی teaching of the compassionate buddha لە نوسینی burtt ل٥٠.

١٩–وەرگیراوە لە کتێبی بوزییەت لە نوسینی christmas humpherys ل ١٢٠.

٢٠–وەرگیراوە لە کتێبی woodward:  some sayings ل٢٨٣.

.hinduism and buddhism p 62 ،21-quoted in a coomaraswamy

٢٢–وەرگیراوە لە کتێبی  woodward:  soe sayings ل٢٩٤.

23-sir edwin arnold the light of asia

24-robert penn warren brother to dragons

٢٥–سیگموند فرۆید:  دەروازەی گشتی بۆناو شیکاری دەروونی ل ٣٤٤.

٢٦– کتێبی بوزییەت نوسینی humphreys ل٩١.

٢٧–هەمان سەرچاوەی پێشو ل٩١.

28-anguttara nikaya 8: 83

.29-lew ayres aftras of the east p 90-91

**٣٠-بێتوانـایی لەباسـکردنی نیرڤانـادا ئەمـە ئـەو شـتەیە بوزییـەکانی والیـێکـرد بـدوێن لـەبارەی نیرڤانـاوە وەك بۆشاییەك، بەڵام نەك بە واتای وشەیی بۆشایی، بەکورتی نیرڤانا داماڵراوە لە هەموو تایبەتمەندیە سنوردارەکان. هاوشـێوەی شـەپۆلەکانی سـەروو بیسـتن کـە نابیسـترێن لەبرئـەوەنا کـە دەنـگ نـین بـەڵکو لەبەرئـەوەی گوێمـان ناتوانێت بیانبیستێت.**

**٣١-وەرگیراوە لە کتێبی** teaching of... **لە نوسینی** burtt **ل١١٥.**

،teaching ،and burtt ،88-89 ،the pilgrimage ،3. cf. pratt ،43; dana viii ،32-iti-vuttaka .113

1951. reprint (new york: ،budhhizm: its essence and davelopment ،33-edward conze . harper & row)

its relation to paul tillich's god above god in the courage to ،for example ،34-compare .be p 186-190

. p 32 ،35-vairacchedika

**٣٦-بـەم بۆنەیـەوە یـەکێك لـە ڕێگاکـان کـە تیایـدا تێگەیشـتنی بـوزا لـەبارەی لەبەرگرتنـەوەی ڕۆحـەکان نـاکۆکی لەسـەر بـوو لـەبارەی تێگەیشـتنی زۆربـەی هیندیـە هاوچـەرخەکان چـونکە بیروبـاوەڕی هیندۆسـیەت پێوانەییـە گەڕانەوەی لەدایکبوونەوە بۆ کارما دەبەستێتەوە بە دەرئەنجامی ئەو کارانەی پێی هەستاوە لـە ژیانـەکانی تـردا. بـەڵام بـوزا بەشـێوەیەکی تایبـەت لەمبارەیـەوە دواوە، وتـی دوبـارە لەدایکبوونـەوە ناگەڕێتـەوە بـۆ کارمـا بـەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ تنها واتە ئارەزوی تێرکردنی منی باڵا. چونکە هەتا ئارەزوی تێرکردنی خود بەردەوام بێت ئەوا کاری بۆ دەکرێت. ئەمە بەو مانایە دێت هەتا ئارەزو کلیل بێت ئەوا دەکرێت بۆهەمیشە بچینە دەرەوە لـە سوڕی لەدایکبوون و دوبارە لەدایکبوونەوە، کاتێك مرۆڤ ئارەزوی ئەوە دەکات.**

.the pilgrimage p 86 ،37-quoted in pratt

.the pilgrimage p 91 ،38-quoted in pratt

**٣٩-تیبتی ماهایانا وادادەنێت کە بودها ئامۆژگاری زۆربەی بیروباوەڕەکانی ماهایانای کردوە بەڵام بە جەستەی سامبوگایاکا کە ناکرێت دەرکیپێبکرێت تەنها لەلایەن قوتابیە پێشکەوتوەکانەوە نەبێت لە هەڵسوکەوتدا.**

.40-from the bodhichayavatara of shantideva

**٤١-ئەمـە ویـڕای ئـەوەی ماهایانادانـایی بـە پـیرۆز دادەنێـت لەبەرئـەوەی بـەزەیی و میهرەبـانی لەگـەڵ خۆیـدا دەهێنێت.**

**٤٢-ئەگـەر ئەمـە وەکـو تێکـەڵکردنی ڕامیـاری بـە ئـایین دەرکـەوت ئـەوا پێویسـتە دەرك بـەوە بکـەین ئـەم کتێبـە بەشێوەیەکی سەرەکی گرنگی دەدات بە میتافیزیقیا، دەروونناسی، ئاکار، ناشێتەناو کێشەی ئایینە مەزنەکانەوە وەك گێڕانەیەکی مێژویی بەڵکو وەك ئایین بە واتا شارستانیەکەی. هەریەکەیان بەرنامەی ژیـانی تـەواوی داناوە بۆ شوێنکەوتوانی.**

**٤٣-ئـەم بەنـدە وەرگـیراوە لـەژێر کاریگـەری نوسـینەکانی د. ت. سـوزوکی کـە شـێوەی کۆتـایی وەرگرتـوە لـە مەشقکردنی زن ڤ کیوتو لە هاوینی ساڵی١٩٥٧دا.**

٤٤–پرۆفیسۆرێکی ڕۆژئاوایی ئارەزوی ئەوەی کرد دەرکبکات بە پێداگریکردنی زن لەسەر بەرزبوونەوە بەسەر شێوەکانی تردا، سەرسام بوو کاتێك سەرۆکی یەکێك لە پەرستگاکانی بینی لەکاتی سەردان کردنیدا بینی بەوپەڕی ڕێزەوە دەچەمیەوە لەبەردەم وێنەی بوزادا هەرکات بەبەردەمیدا دەڕۆیشت. پرۆفیسۆرەکە وتی: ((من وابیرم دەکردەوە کە ئەم ئاستەتان تێپەڕاندوە!))، دواتر وتی:: ((بەڵام من تف لەم وێنەیە دەکەم)) لەوەڵامدا سەرۆکی پەرستگاکە بە ئینگلیزیەکی شێواو وتی: ((زۆرباشە، تۆ تفی لێ دەکەیت و منیش بۆی دەچەممەوە)).

٤٥–بەهۆی ئەو ڕادەیەی ئەقڵ دەچێتەناو کارکردنی نوسەری ئەم چەند دێڕەی زن، خودی مامۆستای گوتو ڕوشی دەڵێت من دوور نیم لە نەخۆشی فەیلەسوف، بەڵام دواتر پەشیمان بوویەوە ووتی: هیچ کێشەیەك نیە لە خودی فەلسەفەدا، کاتێك بڕوانامەی ماجستێری هێنا لە بواری فەلسەفەدا لە یەکێك لە باشترین زانکۆکانی ژاپۆن. ئنجا وتی: ((بەڵام ئەقڵ ناتوانێت کاربکات تەنها لە سنورێکی دیاریکراودا نەبێت)).

٤٦–دوو خوێندنگان سوتو دابەشکراوە لە دوجین کە خوێندنگای تساو تونگی تایبەت بە چان ch'an لە چینی هێنا، خوێندنگای ڕینزای کە ڕەنگی ژاپۆنی قوتابخانەی لینچی دەنوێنێت کە ئیزای هێنای لە ژاپۆنەوە. یەکەمین قوتابخانەیە کە ڕوناکبوونەوە بە پڕۆسەیەکی پلەبەندکراو دادەنێت لەکاتێکدا قوتابخانەی دووەم بە شتێکی کتوپڕی دەزانێت کە بەیەکجار دێت.

٤٧–کورتترین ماوە تۆمارکراوە بۆ شیکاری کوان یەك شەو بوو، درێژترینیان دوانزە ساڵ بوو!

٤٨–دیلان توماس: ((ڕوناکی دەبڕێت کاتێك خۆر هەڵنایەت)).

٤٩–وەرگیراوە لە کتێبی cat's yawn ل٣٢.

٥٠–وەرگیراوە لە کتێبی zen notes بەرگی یەکەم ژمارە ٥ ل١.

٥١–یەکێك لە مامۆستا گەورەکانی زن دای ئوشو وتی: ((ساتوری گەورەم تاقیکردەوە هەژدەجار بەڵام ساتوری بچوك زۆرجار تاقیمکردوەتەوە کە ناتوانم بیانژمێرم)).

52-sasaki، zen dust.

53-from the saying of the lay disciple ho. Not published in english.

54-abridged from ix t. suzuki's translation in edward conze p 75-171.

55-from zen- a relegion.

56-the word the tebtans used to translate the sanskrit words.

٥٧–بۆ گفتوگۆی زیاتر لەبارەی ئەم خاڵەوە سەیری کتێبی the tantric distinction بکە لە نوسینی جێفری هۆپکینز. ل ١٤٨–١٤٩.

٥٨–من لێرەدا هەڵدەسم بە باسکرنی ڕێوڕەسمی گیومیو گگیوتو دوو پەیمانگای بڵند لە پەیمانگاکانی تانتریك لە تیبتز سیەری کتێبی هیوستن سمیس the boston globe.

59-majjhima-nikaya

60-cf. edward conze buddhism. P 136.

٦١—ئەم دێڕانە وەرگیراون لە کتێبی سرودێك لە پیاهەڵدان بە زازندا

62-ramprasad، quoted in h. zimmer، the philosophies of india p 602.

٤

# كونفوشيەت

## یەكەمین مامۆستا

ئەگەر تاكە مرۆڤێك هەبێت كە ناوی بەسترابێتەوە بە شارستانیەتی چینیەوە، ئەوە كونفوشیوسە confucius یان كونغ فوتسو kung fu tzu، بەواتای مامۆستا كونگ دێت.

چینیەكان بە ڕێزەوە ناوی دەبەن. . بەناوی مامۆستای یەكەم، لەبەرئەوە نیە كە پێشتر مامۆستا نەبووە بەڵكو لەبەرئەوەی لە پلەی یەكەمدایە. هیچ كەسێك بانگەشەی ئەوە ناكات كونفوشیوس شارستانیەتی چینی بە تەنها دروستكردوە بەڵكو لە داهێنان و ڕەسەنایەتی خۆی كەمدەكردەوە بەوەی دەیوت هیچ نیە جگەلە ((خۆشەویستی دێرینەكان))(١)، بەڵام ئەو پلەوپایەیەی قوبوڵی كرد بۆ خۆی زۆر لەوە كەمتری پێدەدات كە شایستەیەتی، ئەمە نمونەیەكی پراكتیكی ئاشكرایە لەسەر دەستكورتی و هەژاری، ئەمە لەو تایبەتمەندیانە بوو كە بانگەشەی بۆ دەكرد. چونكە ئەگەر كونفوشیوس بەتەنها شارستانیەتی چینی نەنوسیبێتەوە ئەوا بێ گومان سەرۆكی ئەم شارستانیەتەیە. وای لە شارستانیەتی وڵاتەكەی كرد ببێتە جێی گرنگیپێدان بەدرێژایی بیست وپێنج سەدە.

ئەو خوێنەرەی وادادەنێت هاوشێوەی ئەم دەستكەوتە ناكرێت بەدی بێت تەنها لە ژیانێكی لێوان لێو لە ڕوداو نەبێت، بەڵام تێدەگات لەوەی بە هەڵەداچووە كاتێك ژیانی كونفوشیوس دەخوێنێتەوە.

كونفوشیوس لەدایكبووە لە نزیكەی ساڵی ٥٥١ پ. ز. لە هەرێمی لو كەلەمڕۆدا بەناوی هەرێمی شانتونگ. شتێكی دڵنیاكەر نازانین لەبارەی باوباپیرانیەوە بەڵام ئاشكرایە كە ژیانی خێزانی سادەبووە. ((كاتێك منداڵ بووم بێ پلەو پایەی كۆمەڵایەتی بووم)). باوكی مرد پێش ئەوەی كونفوشیوس ببێتە سێ ساڵان، پەروەردەكردنی جێهێشت بۆ دایكە هەژارەكەی. لەبەرئەوە ناچاربوو بۆخۆی هەوڵبدات بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ڕۆژانەی، لەسەرەتادا لەڕێگەی هەستانی بە كاری ناخۆشەوە. بەڵام نەداری و ئەو كێشانەی بەدەستیەوە دەیناڵاند لەو ئاستەی ژیانیدا پەیوەندیەكی توندوتۆڵی پێكهێنا لەنێوان ئەو و خەڵكدا بەگشتی، ئەو شتەی دواتر ڕەنگیدایەوە لە ڕەهەندە دیموكراتیەكەدا كە بە ئاشكرا دەیبینین لە هەموو فەلسەفەكەیدا.

وێڕای ئەوەی ماوەتەوە لە شوێنەواری گەنجێتیەكەی ئەوەمان پێڕادەگەیەنێت كە عاشقی ڕاوی گیانداران و ڕاوەماسی و تیرهاویشتن بووە، ئەو شتەی بۆمان دوپاتدەكاتەوە لەو كەسانە نەبووە كە ئالوودەی خوێندنەوەبن، بەڵام دەستی بە خوێندنەوە كرد لە تەمەنێكی زوودا و تیایدا سەركەوتو بوو. (((كاتێك تەمەنم گەیشتە پانزە ساڵان، مێشكم ڕاهێنا لەسەر خوێندنەوە و فێربوون)). لە سەرەتای بیستەكانی تەمەنیدا لەدوای ئەوەی چەندین كاری فەرمانبەری تێپەڕاند، لەدوای ژنهێنان زۆر سەركەوتو نەبوو، جێگیر بوو لەسەر پیشەی مامۆستا. ئاشكرابوو كاری فێركردن ئەو بەهرەیە بوو كە دەگونجا لەگەڵ سروشتیدا، هەر خێرا ناوبانگی پەیداكرد كە بووە هۆی ئەوەی كۆمەڵێك قوتابی پڕ جۆش و خرۆش پەیوەندی پێوە بكەن.

وێڕای باوەڕی قوتابیەکانی ((هەرلە سەرەتای ڕەگەزی مرۆییەوە کەسێك نەبووە لەسەر ڕووی زەوی کە هاوشانی مامۆستاکەمان بێت)) بەڵام کونفوشیوس خۆی بە کەسێکی شکستخواردو دادەنا لە پیشەکەیدا. ئامانجی ئەوە بووکە پیشەیەکی گشتی بەدەست بهێنێت، لەبەرئەوەی وابیری دەکردەوە کە بیرکردنەوەکانی و بیردۆزەکانی جێگیر نابن لەلای خەڵك ئەگەر سەرکەوتنی بیرۆکەکانیان نیشان نەدات بە شێوەیەکی پراکتیکی. متمانەیەکی تەواوی هەبوو بەوەی لەتوانایدایە سەرلەنوێ کۆمەڵگە ڕێکبخاتەوە.

کاتێك هەواڵی پێدرا لەبارەی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان لە هەرێمی وی wei، پرسیاری لێکرا پێویستە چی بکرێت لەمبارەیەوە؟ لەوەڵامدا وتی: دەوڵەمەندیان بکەن. دواتر پرسیاری لێکرا: دواتر چی؟ لەوەڵامدا وتی: فێریان بکەن، کەمێك ڕاوەستا و وتی ئەگەر شازادەیەك هەبووایە منی بەکاربهێنایە ئەوا دەکرا شتێك بکرێت لەماوەی ساڵێکدا، دەکرا کارەکە بە سەرکەوتویی ئەنجام بدرێت لەماوەی سێ ساڵدا!.

لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا هەندێك لە زانایانی ئەو سەردەمە هەستان بە لێکۆڵینەوە لە هیواو ئاواتەکانی لە ژیاندا بە گوزارشت بۆ پیشەیەکی کارگێڕی گرنگ. زۆر بەخێرایی بەرزکرایەوە لە وەزیری کاروباری گشتیەوە بۆ وەزیری داد و دواتر بۆ سەرۆك وەزیران، هەرێمی لو لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەودا دەوڵەتێکی نمونەیی بوو((خیانەتکردن و گەندەڵی تیایدا نەما)). ئەم ڕۆمانە ڕۆمانسیە بەردەوام دەبێت: ((ئەگەر شتێك کەوتە سەر ڕێگا و کەس هەڵی نەگرتەوە)). ئەوکاتە پاراستنی ئەمانەت دەبێتە سیستمی ژیانی ڕۆژانەی خەڵك. لەڕاستیدا دادوەرە هاوچەرخەکانی کونفوشیوس دەترسان لە ڕاستگۆییەکەی بەڕادەیەك نەیاندەویست دایبمەزرێنن لە هەر پلەوپایەیەکدا کە دەسەڵاتێکی گەورەی تیادا بەکاربێت.

کاتێك کونفوشیوس ناوبانگی دەرکرد و پلەوپایەی بەرزبوویەوە کە بوویە فەرمانڕەوای هەرێمەکەی، (کە پلەوپایەکەی بەدەست هێنابوو بە زۆری هێز)، هەستی بەوەکرد ناچارە داوای ئامۆژگاری بکات لە کونفوشیس لەبارەی باشترین ڕێگا بۆ فەرمانڕەوایی؟ کونفوشیوس بە گاڵتەپێکردنەوە وەڵامی دایەوە، وتی باشتر وایە فێرببێت چۆن خۆت بەڕێوەببەیت پێش هەوڵدانت بۆ بەڕێوەبرنی ئەوانی تر. ئەگەر ئەم وەڵامە لە کەسێکی ترەوە جگەلە کونفوشیوس بهاتبایە ئەوا فەرمانڕەوا فەرمانی مل پەڕاندنی دەدا، بەڵام نەیوێرا ئەو شتە بکات بەرامبەر بە کونفوشیوس بەهۆی ناوبانگەکەیەوە لەناو خەڵکدا. هەموو ئەوەی فەرمانڕەواکە ئەنجامی دا ڕازی نەبوو بیکاتە سەرۆك وەزیران، لەبری ئەوە پلەوپایەیەکی بەرزی پێدا بەڵام بەبێ بوونی دەسەڵاتی بڕیاردان، بەو هیوایەی بتوانێت بەمجۆرە بێدەنگی بکات، بەڵام کاتێك کونفوشیوس هەستی بەم پیلانگێڕانە کرد لە دژی بە بێزاریەوە دەستبەرداری ئەو پلەوپایە بوو.

هەروەك داوای لێکرابێت لەبارەی خۆیەوە وتی: لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا هەستم بە پەیامێکی پیرۆز کرد کە پێم سپێردراوە کونفوشیوس سیانزە ساڵی تری تەمەنی بەسەربرد لەگەڵ ئاوڕدانەوەیەکی زۆر بۆ دواوە و هەنگاوەکانی بەرگری، لە گەشتێکی درێژدا لە هەرێمێکەوە دەچو بۆ هەرێمێکی تر، ئامۆژگاری فەرمانڕەواکانی دەکرد لەبارەی چاککردنی شێوازی فەرمانڕەوایی کردنیان، هەوڵی دەدا هەلێکی ڕاستەقینە بەدەست بهێنێت بۆ جێبەجێکردنی بیروڕاکانی هەتا بیانخاتە بواری جێبەجێکردنەوە.

بەڵام هەرگیز بواری لەو جۆرەی بۆ نەڕەخسا هەتا وای لێهات پێشبینی یەکێکیان کە دەیوت: ((ئاسمان ئەم مامۆستایە بەکاردەهێنێت وەك زەنگێك بۆ بەئاگاهێنانەوەی خەڵك)) ببێتە جێی گاڵتەپێکردن، کاتێك چەند ساڵێك تێپەڕی بەبێ ئەوەی هیچ بەدی بێت.

جارێکیان پێشنیاری بۆ کرا بۆ گرتنەدەستی پلەوپایەیەکی بەرز، بەڵام کاتێك بۆی دەرکەوت ئەو بەرپرسەی ئەم پلەوپایەی بۆ پێشنیار کردوە یاخی بووە لە سەرۆکەکەی ئەم پێشنیارەی بە تەڵە دانا بەوهۆیەوە ڕەتی کردەوە. بەهۆی شکۆداریەکەیەوە ناوبانگێکی لەڕادەبەدەری بەدەستهێنا، کاتێك یەکێکیان لۆمەی کرد وتی: ((ئایا بەڕاستی کونفوشیوس کەسێکی مەزنە، لەبارەی هەموو شتێکەوە زانیاری هەیە، بەڵام بەهیچ شتێك ناوبانگی پەیدا نەکردوە)) کونفوشیوس لەوەڵامدا بە دڵتەنگیەوە بە قوتابیەکانی وت: ((ئێستا پێویستە لە چیدا لێهاتو بم، تیر هاویشتن یان ئەسپسواری؟)).

کاتێك هەرێم لەدوای هەرێم ئامۆژگاریەکانی کونفوشیوسیان پشتگوێ دەخست لەبارەی ئاشتەوایی و گرنگیدان بە هاوڵاتیان، سۆفیەکان هەوڵەکانی ئەویان بەکەمزانی بۆ چاکسازی کردن لە کۆمەڵگەدا، ئامۆژگاریان کرد کە لەگەڵیان بێت بۆ گەڕان بەدوای کۆنترۆڵکردنی دەرون کە بەسە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو نەخۆشیانەی کۆمەڵگەدا کە چاکبوونەوە لێیان مەحاڵە، تەنانەت جوتیاران ڕەخنەیان لێگرت بەوهۆیەی ئەو پیاوێکە ناتوانێت سەرکەوتو بێت، وێڕای ئەوە بەردەوامە لە هەوڵدانی یەك لەدوای یەك، لەگەڵیدا نەوەستا تەنها ژمارەیەکی کەم نەبێت لە قوتابیە وەفادارەکان، لەمیانەی ئەو ڕەتکردنەوە و نائومێدیەدا کە نزیکی کردەوە لە لەبرسامردن. لە یەکێك لە چیرۆکەکاندا باسکراوە کە لە دەوری کونفوشیوس کۆبوونەتەوە ئەویش سەیری کردن بە دڵێکی لێوانلێو لە شادومانی، بە هێمنی وتی: ((مینگ تسو زۆر ئارامە و بەهێزە، تسو لو لێوانلێوە لە وزە و چالاکی/، جان چیوو تسو کونگ بوێرن. )).

لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، گۆڕانکاری ڕوویدا لە هەرێمە تایبەتەکەیدا وای لێکرد بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، کاتێك تێبینی ئەوەیان کرد لەوە بەتەمەنترە پۆستێکی فەرمی پێبدرێت، لەبەرئەوە وازی هێنا لە پلەوپایەی حکومی دوا ٥ ساڵی تەمەنی لە بواری فێرکردندا بەسەربرد لە نوسینەوەی تۆمارە دێرینەکانی چیندا. لە ساڵی ٤٧٩ پ. ز دا کۆچی دوایی کرد لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدا.

ئەگەر کونفوشیوس وەك کەسێکی ڕامیاری شکستی هێنابێت ئەوا بەبێ گومان یەکێکە لە مەزنترین مامۆستایانی جیهان. ئامادەبوو بۆ پەروەردەکردن لە بواری مێژوو و شیعر و مۆزیك و ئاییندا. کاری فێرکردنەکەی سوکراتمان وەبیردەهێنێتەوە کە زانکۆیەکی پێکهاتو بوو لە تاکە کەسێك! هەروەها بەرنامەی فێرکردنەکەی وەك بەرنامەی سوقرات وابوو. بەشێوەیەکی دوور لە شتە فەرمیەکان کاری فێرکاری ئەنجام دەدا، وا دەردەکەوت گفتوگۆ دەکات لەگەڵ قوابیەکانی لەبارەی کێشەکانەوە، زیاتر لەوەی وادەربکەوێت کە وانەیان پێدەڵێتەوە. لێهاتو بوو بە تایبەت لە شێوازی پرسیارکردن و وتنەوەی وانەکاندا، واتە: ((چەندە شێوازی پرسیارکردنی جیاواز بوو لە شێوزای ئەوانی تر!)). هەروەها ئەو کراوەییەی دەردەکەوت بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان ئەو و قوتابیەکانیدا سەرنجراکێش بوو. هیچ کاتێك خۆی بە دانا نەدەزانی. دنایی لەلای ئەو بە مانای کۆکردنەوەی بڕێکی زۆر لە زانیاری نەدەهات بەڵکو بریتیبوو لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن. لەبەرئەوە شێوازی هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ قوتابیەکانیدا مامەڵەیەکی هاوڕێیانە بوو، پابەند بوو بە بە گەیاندنی پەیامەکەی پێویسە مرۆڤ کامڵ بێت بەڵام سادەبێت هەرکات پەیامەکەی گەیاند.

((چوار شت هەن لە ڕێگای ئەو کەسەی بیرکردنەوەی قووڵە. من تەنها توانیومە یەك دانەیان جێبەجێ بکەم. ئەویش بریتیەلەوەی خزمەتی باوکم بکەم بەتەواوی هەروەك پێشبینی ئەوە دەکەم کە کوڕەکەم لەگەڵمدا ئەنجامی بدات. خزمەتی فەرمانڕەواکەم بکەم هەروەك پێشبینی ئەوە دەکەم کە وەزیرەکانم خزمەتم بکەن. خزمەتی برا گەورەکەم بکەم بەهەواوی هەروەك پێشبینی ئەوە دەکەم برا بچوکەکانم خزمەتم دەکەن. یەکەمین بم

لە جۆری مامەڵەکردنم لەگەڵ هاوڕێکانمدا هەروەك پێشبینی دەکەم بەهەمان شێوە مامەڵەم لەگەڵدا بکەن. ئەمەیان نەمتوانی ئەنجامی بدەم))(٢).

کونفوشیوس دەرکی دەکرد بە گرنگی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی گرتبوو بەوەی پێشبینی زۆر لەوە زیاتری دەکرد لە قوتابیەکانی. . بەبیرکردنەوەی ئەو مەبەست لە پابەندبوونیان دوبارە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگەیە بەشێوەیەکی کامڵ و گشتگیر. ئەم بیروباوەڕە وای لێکرد بەپەرۆش بێت لەگەڵ پاراستنی ڕووخۆشیەکەی نەوەك ببێتە مرۆڤێکی تووڕە ڕەگەز. کاتێك تسای ووی گوماناوی بە گاڵتەپێکردنەوە پێی وت: ((ئەگەر یەکێکیان وتی کەسێك هەیە لەناو ئەو بیرەدا، وا هەست دەکەم مرۆڤێکی خۆنەویست هەوڵ دەدات بۆ گەیشتن پێی))، لەوکاتەدا کونفوشیوس وتی: ((تەنانەت مرۆڤی خۆنەویست سەرەتا بیرەکە دەپشکنێت بۆئەوەی دڵنیا بێت لەوەی بەڕاستی کەسێك هەیە لەناو بیرەکەدا پێش ئەوەی بچێتەناوی)). کاتێك کەسێك پێی وت: ((پێویستە مرۆڤ سێ جار بیربکاتەوە پێش ئەوەی بە هەر کارێك هەستێت))، کونفوشیوس بوە وشکیەوە وەڵامی دایەوە وتی: دوجار بەسە. بەڵام وێڕای متمانە بەخۆبوونی هەمیشە لە ئامادەباشیدا بوو بۆ ئەوەی لەوانەیە لەسەر هەڵە بێت، ئەگەر بەڕاستی بەوجۆرە بوو ئەوا دانی بە هەڵەکەیدادەنا زۆر بە سانایی.

شتێکی نائاسایی لە کەسایەتیەکەیدا نەبوو، بەڵکو مرۆڤێکی ئاسایی بوو، حەزی بە تێکەڵبوون هەبوو لەگەڵ خەڵکدا. . لە دەرەوەی ماڵەوە نان بخوات. . بەشداری بکات لە گۆرانی وتن لەگەڵ گروپێکی گۆرانی وتندا. . مەی دەخواردەوە بەڵام بەبێ زیادەڕەوی. قوتابیەکانی بەمجۆرە باسیان دەکرد: ((لەکاتی پشوانیدا شێوازی فێرکردنی دڵخۆشەر بوو، بەڵام وێڕای بەبەزەیی بوونی بەڕێز و ویقار بوو. . توند بوو ئەگەر پێویستی بکردایە. .))

هەمیشە ئاماژەکراوە بۆ ڕازیبوونی بە دیموکراتیەت. تەنها بەرگری نەدەکرد لە کێشەکانی خەڵك دژ بە خانەدانەکان بەڵکو پەیوەندیە تایبەتیەکانی تێدەپەڕاند بەشێوەیەکی ئاشکرا، هەموو چینەکان بەڕێزبوون لەلای لەژیانیدا قوتابیە هەژارەکانی بەکەم نەدەزانی تەنانەت ئەوانەی نەیاندەتوانی کرێی فێرکردنی پێبدەن. وێڕای میهرەبانیەکەی بەتەوانا بوو بەسەر گاڵتەپێکردندا کاتێك هەستی بەوەدەکرد کەسێك هەیە شایستەیەتی. دەگێڕنەوە ڕەخنەی گرتوە لە هاوەڵەکانی و وتویەتی: ((ئاشکرایە کونگ تسو ئێستا کامڵبووە بۆیە کاتی تەرخان کردوە بۆ ئەم جۆرە شتانە، بەڵام من کاتم نیە بۆ ئەو جۆرە شتانە)). کونفوشیوس ڕاستگۆ بوو لەوەی دەیگوت چونکە تا دوا ساتی تەمەنی گرنگی دەدا بە چاککردنی خۆی زیاد لە گرنگیدانی بە چاککردنی ئەوانی تر. ((چۆن دەوێرم ڕێگە بە خۆم بدەم کە بە دانا دابنرێم؟ باشوایە پێم بوترێتمن هەوڵدەدەم بۆ بەدەستهێنانی ئەوە بەبێ ئەوەی ئەوە بەدیبهێنم بەشێوەیەکی تەواو))(٣). بێگومان بە وەفاداری مایەوە لەم بوارەدا.

ئەو دەیتوانی دەسەڵات و پارە بەدەست بهێنێت تەنها بە داواکردنیان ئەگەر ڕازی ببوایە بە سەوداکردن لەگەڵ دەسەڵاتداراندا، بەڵام دادوەری بە باشتر زانی، هەرگیز پەشیمان نەبوو لەو هەڵبژاردنەی.

((نانی وشك و ئاو دەخۆمەوە، دەستم دەخەمە ژێر سەرم لەبری سەرین، هێشتا شادومانم لەنێو هەموو ئەم شتانەدا. سامان و دارایی و پلەوپایە هیچ گرنگ نین بەلامەوە کە دەتوانم بەدەستیان بهێنم بە دورکەوتنەوە لە دادوەری و زوڵمکردنەوە. )).

شکۆدار کرا لەلایەن قوتابیەکانیەوە لەدوای مردنیەوە. تسو کونگ وتی: (( ئەو خۆرە. مانگە کە ئەستەمە بەرزبیتەوە و پێی بگەیت. ئەستەمە هاوشانی ئەو بدۆزینەوە هەروەك ئەستەمە بە پەیژە بەرزبیتەوە بۆ ئاسمان. )). ئەوانی تر ئەمەیان پشتڕاستکردەوە. بەدرێژایی چەند نەوەیەك لە هەموو چین سەیری کراوە وەك نمونەی

باڵـا بـۆ دە هـەزار نـەوە. بـەڵام ئـەو ڕاسـتیەی زیـاتر ڕازی دەکـرد بریتیەلـەوەی خـەڵك زیـاتر گرنگـی بـدەن بـە بیرکردنەوەکانی نەك بە خودی خۆی. پێش دوو هەوزار ساڵ و تا ئەم سەدەیە، هەموو قوتابیەك دەستەکانی بە پێکەوە ئاڵاو بەرزدەکاتـەوە بـە ئاڕاسـتەی مێـزی نـاو پۆلـەکە کـە هـەڵگری ڕەفەیـەکی کتێبـە نـاوی کونفوشیوسـی لەسەرە. لەڕاستیدا هەموو قوتابیەکی چینی چەند کاتژمێرێك بەسەردەبات لە تێڕامان لە وتەکانی.

لـە دەرئـەنجامی ئەمـەدا وتـەکانی بوویـە بەشـێك لـە ئـەقڵی چینـی دواتـر گواسترایەوە بـۆ چینـی نەخوێنـەوارەکان لەڕێگەی وتە میللیەکانەوە، هەروەها حکومەتی چینی بەشێوەیەکی قووڵ لەژێر کاریگەری کونفوشیوسدایە زیاد لە هەموو کەسایەتیەکی تر، چونکە لەکاتی دەسـتپێکردنی سـەردەمی مەسـیحیەوە ژمارەیـەکی زۆر لەکاربەدەسـتە حکومیەکان داوایان لە هاوڵاتیان کرد کتێبە کلتوریەکان بخوێننەوە کەلەبارەی کونفوشـیەتەوەن. چـەند هـەوڵێك درا بۆ بەرزکردنەوەی کونفوشیوس بۆ پلەوپایەی بوون بە یەزدان.

چی هەموو ئەم کاریگەریە گەورەیەی بەرهەمهێنا؟ بەڕادەیەك هەتا سەردەمی دەستبەسەراگرتنی فەرمانڕەوایی لە چین لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە، چاودێران هێشتا کونفوشیەتیان بە مەزنترین هێزی ڕۆشـنبیری و فیکـری بێوێنـە دادەنا، لەنێوان دانیشتوانی چیندا کە ژمارەیان چواریەکی دانیشتوانی هەموو سەرزەویە!.

ئەسـتەمە ئەمـە بگەڕێتـەوە بـۆ سـەر کاریـەری کەسـایەتیەکەی بەتـەنها. ئەگـەر هەوڵمانـدا هەسـت بـەوە بکـەین لـە ڕێنماییەکانیدا ئـەوا سەرسامیەکەمان زیـاتر دەکـات. گومـانی تێدانیـە وەك چیرۆکە داڕێـژراوەکان بەشـێوەیەکی ناسك، وتە ئاکاریەکان بەهەمان شـێوە شایسـتەی پیاهەڵـدانن بەشـێوەیەکی قـووڵ. بـەڵام چـۆن کۆمـەڵێك لـە وتـە سادەکان دەتوانن لە قاڵب بدرێنـەوە بەشـێوەیەکی شارسـتانیانە؟ ئەمـە بـۆ یەکـەمجار وەك مەتـەڵ دێتـە پێشـچاو. ئەمە چەند نمونەیەکە لەبارەی وتەکانی:

((ئەو کەسەی هەست بە دڵتەنگی ناکات بەهۆی نەناسینی لەلایەن خەڵکـەوە و گرنگـی نـەدان بـە بیرکردنـەوەکانی فەیلەسوفی ڕاستەقینە نیە.

ئەو شتەی ناتەوێت خەڵك لەگەڵتدا ئەنجامی بدەن ئەوا تۆش لەگەڵ خەڵکدا ئەنجامی مەدە.

من دڵتەنگ نابم گەر خەڵکی نەمناسن. بەڵام دڵتەنگ دەبمز ئەگەر خەڵکی نەناسم.

هەوڵمەدە بۆ دەرئەنجامە خێراکان، هەروەها مەگەڕێ بەدوای سودە کەمەکاندا. ئەگەر تێکۆشایت بۆ دەرئەنجامە خێراکـان ئـەوا ناگـەیت بـە دوا ئامـانج. ئەگـەر سـودە کەمـەکان فریویـان دایـت ئـەوا هـەرگیز کـاری مـەزن ئـەنجام نادەیت.

خانەدانترین کەسەکان ئەوانەن پێش ئامۆژگاری کردنی کەسانی تر لەسەر خۆیان جێبەجێی دەکەن.

ئەگەر سەیری دڵت کرد ئەوا هیچ هەڵەیـەکی تیـا نابینیـت، یـان شـتێکت نەدۆزیـەوە کـە شـایەنی دڵـەڕاوکێ بێـت، کەواتە لەچی ئەترسیت؟

کاتێك شتێك دەزانیت و دەرك بەوە دەکەیت کە دەیزانیـت ئەمـە زانینـە، بەهـەمان شـێوە کاتێـك شـتێك نازانیـت و دەزانیـت کـە نایزانیـت، بـەڵام چـوون بـەرەو دورتـر لـەوە شـتێکی خراپـە بەهـەمان شـێوەی کەمتەرخـەمیکردن لـە شتێکدا.

کاتێك کەسێکی بـەڕێز دەبیـنین بیربکـەرەوە دەتوانیـت بەنمونـەی باڵـای خـۆتی بزانیـت. کاتێـك کەسـێکی ناڕێـك دەبینی لەپێش ئەوەی هەر شتێك بڵێیت ئاکاری تایبەت بە خۆت بپشکنە.

خەڵکی هەموویان ئارەزوی بەدەستهێنانی دارایی و پلەوپایە دەکەن بەڵام مرۆڤێك نـەیتوانی بەدەسـتیان بهێنێـت لەڕێگایەکی تەسکدا ئەوا هەرگیز بەدەستیان ناهێنێت.

بەسۆز بە بەرامبەر بە هەموو مرۆڤێك. بەڵام هاوڕێیەکی دڵسۆز مەبە تەنها لەگەڵ کەسە دادوەرەکاندا نەبێت(٤))).
بەدڵنیاییەوە شتێکی نمونەیی نیە لەو ئامۆژگاریانەدا. کەواتە ئەو هەموو هێزەی لە کۆی بوو؟

## ئەو کێشەیەی بەرەورووی کونفوشیوس بوویەوە

کلیلی گەیشتن بە نهێنی هێزی کاریگەری کونفوشیوس، شاردراوەتەوە لە سەیرکردنی ژیانی و ڕێنماییەکانیدا لەسەر باکگراوندی ئەو کێشەیەی بەرەورووی بوویەوە. کێشەکە تێکدانی کۆمەڵایەتی بوو.

چین لە سەردەمەکانی پێشودا شڵەژاوتر نەبووو لە وڵاتەکانی تر، هیچی لەوان کەمتر نەبوو. بەڵام لە سەدەی هەشتەمی پ. ز. هەتا سەدەی سێیەمی پ. ز. داڕمانی خێزانی فەرمانڕەوا شوی بەخۆوە بینی. خانەدانە ڕکابەرەکان جێهێڵران بە خۆیان و ئامێرە تایبەتیەکانیانەوە، کە بووە هۆی دروستکردنی حاڵەتێکی هاوشێوەی حاڵەتی فەڵەستین لە سەردەمی فەرمانڕەوایی نەوەکانی ئیسرائیلدا[21]. ((لەو ڕۆژانەدا پادشایەك نەبوو بەسەر ئیسرائیلەوە و هەموو مرۆڤێك ئەوەی ئەنجام دەدا کە بەلایەوە دروست بوو!)).

جەنگ دەستیپێکرد و بەردەوام بوو بەدرێژایی ئەو سەدەیە، بەشێوازی سوارچاکی. چەکەکانیان عەربانە بوو، هێماکەیان ڕەوشتبەرزی بوو، کاری چاکە و خێرخوازی ڕێزی لێ دەگیرا کاتێك یەکێك لە خانەدانەکان بەرەورووی پەلاماردان دەبوویەوە، کاروانێك لە خۆراك دەنێردرا بۆ سوپای هێرشبەر، وەك مەردایەتی نیشاندان یان چەند جەنگاوەرێك دەنێردران کە هەڵدەسان بە بڕینی گەرووی خۆیان لەبەردەم سوپای هێرشبەردا بۆئەوەی بۆیان بسەلمێنن پیاوەکانیان لە مەرگ ناترسن!. هەروەك لە سەردەمی هۆمیرۆسدا جەنگاوەرانی هەردو سوپاکە خۆیان بەیەکتری دەناساند و سڵاویان لەیەکتر دەکرد بەسەر عەرەبانەکانیانەوە بە شێوەیەکی لووتبەرزانە، پێکەوە مەییان دەخواردەوە، بەڵکو تەنانەت بازرگانی چەکیان دەکرد لەگەڵ یەکتردا لە مەیدانی جەنگدا!

بەڵام لە سەردەمی کونفوشیوسدا، جەنگ لەنێوان هەرێمەکاندا لە حاڵەتی سوارچاکیەوە گۆڕا بۆ حاڵەتی درندەیی. بەڕادەیەك لەدوای مردنی کونفوشیوس شێوازی جەنگ کردن گۆڕا بۆ هێرشی کتوپڕ. لەبری زیندانیکردنی دیلەکان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە و گۆڕینەوەیان لەپرۆسەی ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکاندا جەنگاوەرەکان دیلەکانیان بەکۆمەڵ دەکوشت، تەنانەت هەموو دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کە هێرشیان دەکرایە سەر، ئەوانەی بەخت یاوەریان نەدەبوو دەستگیردەکران و بەبێ بەزەییانە سەریان دەپەڕاندن بەبێ چاوپۆشیکردن لەوەی منداڵ یان ئافرەت یان بەتەمەنن. لەوانە تیایاندا بوو بەجارێك ٦٠٠٠٠ و ٨٠٠٠٠ و ٤٠٠٠٠٠ مرۆڤ بەجارێك دەکوژران. دەگێڕنەوە لەدوای یەکێك لە سەرکەوتنەکان دیلەکان فڕێ دەدرانە ناو ئاو کوڵاوەوە و دواتر کەسە نزیکەکانیان ناچاردەکران لەو شۆربایە بخۆنەوە کە بە گۆشتی بەدیلگیراوەکانی خزمیان دروستکرابوو!!

لە هاوشێوەی ئەم سەرەمە تاریکەدا ئەو پرسیارەی خەڵکی سەرقاڵ کردبوو ئەمەبوو: چۆن بتوانین دەست هەڵبگرین لە تێکشکاندنی خودی خۆمان؟ وەڵامەکان جیاواز بوون، بەڵام ئەم پرسیارە بۆ هەمیشە وەك خۆی مایەوە. لەگەڵ داهێنان و زۆربوونی جۆرەکانی چەك بەتایبەت چەکی ئەتۆم لە سەدەی بیستەمدا، ئەم پرسیارە لە ئەمڕۆدا دەکرێت لەبەردەم هەموو جیهاندا.

کاتێك کلیلی ناسینی هێزی کونفوشیەت لە وەڵام ی ئەم پرسیارەدا شاردراوەتەوە کە پەیوەیستە بە توندوتۆڵی کۆمەڵایەتیەوە بەوهۆیەوە پێویستمان بە بینینی ئەم کێشەیە هەیە لە ڕوانگە مێژووییەکەیەوە.

کونفوشیوس لە سەردەمێکدا ژیا تیایدا ڕکابەری کۆمەڵایەتی دابەزیبوو بۆ نزمترین ئاستی. هیچ پەیوەندیەك نەمابوو کە نەوتەوەکان پێکەوە ببەستێتەوە. ئەو شتە چیبوو دەیتوانی تاکەکانی کۆمەڵ بەیەکەوە کۆبکاتەوە؟

[21] ماوەیەك لە مێژوی نەوەی ئیسرائیل لە زەوی کەنعان–بەپێی ئەوەی باسکراوە لە تەوراتی یەهودییەتدا_نەوەکانی ئیسرائیل چەند هۆزێکی پەرش و بڵاو بوون بەشێوەی خێڵەکیانە ژیانیان دەبردەسەر دەوڵەتێکیان نەبوو بەڵکو لە هەموو هۆزێکدا چەند پیاوێك هەبوو کە ناودەبران بە دادوەر.

پێش ئەوەی ژیان بگات بە ئاستە مرۆییەکەی، وەڵامەکە ڕوون و ئاشکرا بوو. ئەو بەستەرەی تاکەکانی کۆمەڵ بەیەکەوە دەبەستێتەوە بریتیەلە تایبەتمەندیەکی سروشتی خۆڕسك کەلە ناخی هەموویاندا بوونی هەیە. ئەو هاوکاریەی ئەو تایبەتمەندیە خۆڕسکە بەرهەمی دەهێنێت لەنێوان تاکەکانی مێروولە و هەنگدا هاوکاریەکی.
بەهێز و سەرسامکەرە، بەڵام لە گیانداراني تردا دەشێت پشت بەم تایبەتمەندیە خۆڕسکە ببەسترێت بۆ مسۆگەرکردنی هاوکاری لەنێوانیاندا. توندوتیژیەکی زۆر هەیە لەجیهاندا، بەڵام بەگشتی ئەم توندوتیژیە لەنێوان تاکە جیاوازەکانی جۆرێکی دیاریکراودا بوو. بەڵام لەنێو تاکە جۆرێکدا تایبەتمەندیەکی خۆڕسکە بۆ پێکەوەژیان و پاراستنی ژیان لە حاڵەتێکی جێگیردا. بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی نەتەوەکاندا ئەو سەرچاوەیە دیارنەما کە پێویست بوو بۆ پەیوەستی کۆمەڵایەتی. کاتێك مرۆڤ گیانداریکی بێ غەریزە بوو ئەوا میکانیزمێك نیە لەناخیدا هەتا پشتی پێببەسترێت بۆ هێشتنەوەی ژیان بەشێوەیەکی تەندروست. کەواتە ئەو شتە چیە ئێستا دەتوانێت حاڵەتە شڵۆقەی نێوان تاکەکانی جۆری مرۆیی ڕێکبخات. لە ئاستی منداڵی جۆرەکانی مرۆییدا، وەڵامەکە بریتیە لە نەریتێکی خۆڕسك، یان هەروەك زانایانی مرۆیی هەندێکجار دەڵێن ئەمە کۆمەڵە نەریت و خووڕەوشتێکە بەڵام بەدرێژایی چەند نەوەیەك سەلمێندرا چەند بەرنامەیەك هەیە یارمەتیدەرن لە خۆشگوزەرانی تاکەکانی خێڵەکەدا. هەموو کاتێك ئەندامانی هۆزەکە کۆنابنەوە بۆئەوەی بڕیاربدەن لەبارەی نەریتەکانەوە کە بەدیهێنانی ئارەزوەکان مسۆگەر دەکەن؟؟، بەڵکو زۆر بە ئاسانی کاڵدەبنەوە بەدرێژایی کات، کە نەوەکان لە ڕێگەیەوە ڕێگا دەگرنەبەر بەرەو نەریتە سودمەندەکان و دوردەکەونەوە لە نەریتە تێکشکێنەرەکان. کاتێك نمونەی ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە پێکدەهێنرێن و جێگیر دەبن، ئەو کۆمەڵگایانەی شکست دێنن لە دۆزینەوەی هاوشێوەی ئەم پەرەسەندنە خۆی لە دەرەوەی بازنەی بووندا دەبینێتەوە، یان کۆمەڵگایەکی نامێنێت هەتا زانایانی مرۆڤناسی لە ئەمڕۆدا توێژینەوەی لەسەر ئەنجام بدەن!. ئەم نمونەیە دەگوازرایەوە نەوە لەدوای نەوە بەبێ هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەك، هەروەك ڕۆمانیەکان دەڵێن cum lacte (بە لاتینی) واتە: دەگوازرێتەوە بۆ نەوە نوێکان لەڕێگەی شیری دایکیانەوە. ژیانی نوێ تاڕادەیەکی زۆر دورکەوتوەتەوە لە ژیانی کۆمەڵگا خێڵەکیەکان کە ژیان دەخاتەژێر کاریگەری نەریت و ڕەوشتە باوەکان، ئەو شتەی وایکردوە بە ئەستەم بتوانین دەرکبکەین بە چۆنیەتی دەستبەسەراگرتنی ئەم خوووڕەوشتانە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، لەئەمڕۆدا بواری زۆر نەماوەتەوە بۆ دەستێوەردانی نەریتە باوەکان. لەوانەیە پۆشاك و جلەبەرگ یەکێك بێ لە پاشماوەکانی ئەو نەریتانە کە هێشتا کاریگەری هەیە لەسەرمان. بەڵام تەنانەت لەم بابەتەدا ئاڕاستەکردنەکان لاواز دەبن. بەڵێ، گومانی تیانیە هەندێك لە نەریتەکان هێشتا کاریگەرن لە هەندێك حاڵەتدا، بۆ نمونە ئەگەر بەڕێوبەری کارگەیەك بیری چوو بەیانیەك بۆینباخ ببەستێت، ئەوا ئەمە دەیخاتە کێشەوە و سەرکەوتنی لە کارەکەی ئەوڕۆژەیداتێکدەدا! بەڵام پۆشاکی تەنك و تەسك و کورت کێشەیەکی گەورە نیە لەم کاتەدا، تەنها ئەگەر لەو شوێنەدا پۆشاکی یەك جۆر بەسەریاندا نەسەپێنرابێت. بەکورتی ئەو کەسە سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێت بەرەو لای خۆی، وا لەوانی تر دەکات وەك کەسێکی بێگانە سەیری بکەن، بەڵام هەندێك هەن دەڵێن باشتروایە مرۆڤ ئەو پۆشاکە لەبەربکات کەلەگەڵیدا دەگونجێت و لەڕووی دەرونیەوە ئاسودەی دەکات بەجۆرێك تەنانەت ئایین ناتوانێت پێی ببەخشێت. ئەگەر هێزی ئەم نەریت و خووڕەوشتانەمان بەگشتگیری ناساند لەسەر هەموو بوارەکانی تری ژیان کە زۆر بەکەمی هەستی پێ دەکەین لە دەرەوەی ئەو کاروبارانەی پەیوەندیان هەیە بە جلوبەرگەوە، ئەوا وێنەیەکمان لەلا دروست دەبێت لەبارەی کۆمەڵگە خێڵەکیە ئاڕاستەکراوەکان بە نەریت و عادەتەکان. دوو شت هەیە لەبارەی ئەم ژیانە ئاڕاستەکراوەوە کە گرنگیەکی تایبەتیان هەیە. یەکەم: توانای

لەڕادەبەدەری ئەو شێوازە لە ژیان کە بەتەواوی ئاڕاستەکراوە بە نەریتەکان لەسەر چاودێریکردن و ڕێکخستنی هەڵسوکەوتەکانی دەرەوەی کۆمەڵگە یان گۆشەگیری. چەند هۆزێك هەن لە ئەسکیمۆ و لەنێوان دانیشتوانی ڕەسەنی ئوستورالیا، لە فەرهەنگەکەیدا وشەیەك نیە بە واتای یاخیبوون. دووەم شتی کاریگەر لە هاوشێ، ەی ئەو کۆمەڵگانەدا بریتیەلە ڕێگایەکی خۆڕسك، کە جێبەجێ دەکرێت بەبێ بیرکردنەوە لە پرۆسەی ڕێکخەرە کۆمەڵایەتیەکان کە جێبەجێ دەکرێت لە ڕێگەی نەریتە باوەکانەوە. دارشتنێك نیە بۆ یاساکان دابنرێن دواتر کۆمەڵە سزایەکی بۆ دابنرێت، پلانێك نیە دابنرێت بۆ پرۆسەی پەروەردەکردنی منداڵان. پێشبینیەکانی کۆمەڵێکی بەهێز بەڕادەیەك منداڵەکان وەریدەگرن بەبێ بیرکردنەوە. دانیشتوانی گرینلاند هیچ بەرنەمەیەکیان نیە بۆ پەروەردە و فێرکردن، بەڵام وێڕای ئەوە زانایانی مرۆڤنناسی دەڵێن منداڵەکانیان گوێڕایەڵ بوون بەشێوەیەکی جوان و هەمیشە ئامادەی یارمەتیدان بوون. هێشتا هەندێك لە هیندیە سورە ئەمریکیەکان ئەو کاتانەیان لەبیرە لە ناوچەکانی خۆیان دەژیان لەنێو کۆنترۆڵکردنێکی بەکۆمەڵی ناوەکیدا ((هیچ یاسایەك لە ئارادا نەبوو وێڕای ئەوە هەموو مرۆڤێك بەشێوەیەکی خۆڕسکانە ئەو کارەی ئەنجام دەدا کە دروستە. ))(٥).

بەمجۆرە نەریتە باوەکان لە چین پەیوەستیەکی کۆمەڵایەتی پێویستی دابین دەکرد بۆ پاراستنی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی تەندروست. چەند بەڵگەیەکمان بەدەست گەیشت لەسەر هێزی ئەو نەریتانە. بۆ نمونە چیرۆکێکمان لەلایە کە یەکێك لە مێژونوسە چینیەکان تۆماریان کردوە لەبارەی حاڵەتی خامنێکی خانەدان سوتا هەتا مرد لە کۆشکەکەیدا لەبەرئەوەی ڕازی نەبوو ئەو نەریتە بشکێنێت کە چوونەدەرەوەی خانمان لە ماڵ قەدەغە دەکات بەبێ کەنیزە. ئەو مێژونوسە چینیە کە یەکێکە لە هاوچەرخەکانی کونفوشیوس لە گێڕانەوەیدا بۆ ئەم ڕوداوە نوسیویەتی ئەو نەریتە شتێك لە هێزەکەی لەدەستداوە بەڵام هێشتا هەر ماوە و بەردەوامە. پێشنیازی ئەوەی کرد ئەگەر ئەو خانمە شووی نەکردبێت ئەوا ئەو هەڵسوکەتەی دروستە بەڵام ئەگەر شووی کردبێت نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئافرەتێکی بەتەمەن بێت لەوانەیە نەگونجاو بێت لە هاوشێوەی ئەو هەلومەرجەدا ئەو کۆشکە گرگرتوە جێبهێڵێت بەتەنها بەبێ ئەوەی کەسێك هاوەڵی بکات بۆئەوەی لە ئاگرەکە ڕزگاری بێت!.
(٦)هەستیارەی ئەم مێژونوسە سەبارەت بە ڕابردو بەهێزترە لە هەستیاری زۆرینەی خەڵك، گومانی تێدا نیە هەموو کەسێك لە سەردەمی کونفوشیوسدا بەوجۆرە گرنگی نەدەدا بە نەریتەکان هەروەك ئەو خانمە ئەنجامی دا کە مێژونوسەکە باسی کرد. دواتر چین گەیشت بە خاڵێکی نوێ لە پەرەسەندنە کۆمەڵایەتیەکەیدا کە ناسرابوو بە دەرکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە تاکەکانیان کە بە ئاگابوون بە دەرونی خودی خۆیان زیاتر لە ئاگاییان بۆ کۆمەڵ، منی باڵا تیایاندا زاڵ بوو بەسەر ڕاناوی ئێمەدا، ئیدی ئەقڵ هێز و دەسەڵاتێکی گەورەتری هەبوو لە دەسەڵاتی نەریتە کۆمەڵایەتیەکان، بەرژەوەندیە تاکەکەسیەکان زاڵبوو بەسەر بەرژەوەندی گشتیدا، چیتر هەڵسوکەوتی باوباپیران هێزی ڕازیکردنی تاکەکانی لەدەستدا. هاوشێوەی ئەو کەسانە دەستیان کرد بە پرسیارکردن: چی هەیە لەو نەریتەدا یان ئەو عادەتە چ سودێکی هەیە؟! گەڕان بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا بوویە شتێکی پێویست. ئەو قوڕە دێرینەی کە تاکەکانی کۆمەڵی بەیەکەوە دەبەست درزی تێکەوت، تاکەکان دەستیان کرد بە بڕینی ڕێگاکەیان بۆ دەرەوەی کێکی نەریت و عادەتەکان بە شکاندنی ئەو کێکە بەشێوەیەك کە چاککردنەوەی مەحاڵبێت. ئەم پچڕان و جیابوونەوەیە بەشێوەیەکی کتوپڕ ڕووی نەدا. هیچ شتێك لە مێژودا بەشێوەیەکی کتوپڕ ڕونادات بەڵکو ڕوداوەکان لەکاتی گونجاودا ڕودەدەن بەشێوەیەکی پلەبەندراو لەژێر کاریگەری گۆڕانکاریە ڕۆشنبیریەکاندا. لەوانەیە خودپەرستەکان و گۆشەگیرەکان چەند پرسیارێکی سەیریان وروژاندبێت، بەرگریان کردوە لە ناسنامەی کۆمەڵایەتی بە دەستپێکردن لە بزواندنێکەوە نیە بەڵام بەهۆی

بێتواناییان بەسادەیی کە هەست بەخۆیان بکەن کە یەکێکن لە ئەندامەکانی باندێك. بەڵام تاکبوون و بەئاگابوون بە دەرون تەنها بە دەرکەوتنی درم بڵاو دەبێتەوە لە کۆمەڵگەدا وەك بەربوونی ئاگر لە پوش. بەمجۆرە یەکگرتنی خۆڕسکبوویە شتێك لە ڕابردوو.

## وەڵامە دژبەیەکەکان

کاتێك نەریتـەکان ناگەڕێنـەوە بـۆ سـەر پاراسـتنی کۆمەڵگـە بەشـێوەیەکی تونـدوتۆڵ، ئـەوا ژیـانی مرۆڤایـەتی بەرەوڕوی مەترسیدارترین تـەنگ و چـەڵەمەدەبێتەوە ئـەویش پێویستە لەسـەر جیهـانی نـوێ تێگەیشتن لێـی بـە کـارێکی ئەسـتەم نـەزانێت چـونکە لـەم سـاڵانەی دواییـدا بووەتـە تارماییـەك بەشێوەیەکی توندوتیـژ مرۆڤایـەتی ڕاوەدودەنێت. ویلایەتە یەکگرتوەکان ڕونترین نمونـەمان پێـدەدات لـەم بارەیـەوە چونکە دەوڵەتێکە ناسراوە بە بلیمەتیـەکی نمونـەیی لەبەرئـەوەی چـەندین نەتـەوەی جیـاوازی لـەخۆگرتوە. بـەڵام لـەدوای لاوازکردنـی ئـەو نەریتانەی کە نەتەوەکان هەڵگریان بوون بەبێ ئەوەی نەریتی جێگرەوەیـان پێبـدات بەو هۆیـەوە ویلایەتـە بووبە یەکێك لەو نەتەوانەی کە بێ نەریت و عادەت بێت بە درێژایی مێژوو وەك جێگرەوەیـەك بـۆ نەریتـەکان ویلایەتـە یەکگرتوەکان پێشنیازی ئەقڵی کرد. ((هاوڵاتیانی ڕۆشنبیر کرد، دواتر متمانـەی پێبەخشین کە بەشێوەیەکی ئەقڵانی ڕەفتار بکەن)): ئەمـە بیرکردنـەوەی جیفرسـۆن سـەر بـە بزوتنـەوەی ڕوناکبوونـەوە و ڕۆشـنبیری بـوو کـە ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی لەسـەر بنیـات نـرا. بـەڵام ئـەم بنەمایـە سـەرکەوتو نـەبوو. هـەتا سـەردەمانێکی نزیـك سـەرکردەی جیهـان بـوو لـە بـواری پەروەردەکردنـدا، بەهـەمان شـێوە سـەرکردەی جیهانـە لـە تـرس و تۆقانـدن و تاواندا!.

ئەگـەر وەڵـامی بزوتنـەوەی ڕوناکبوونـەوە و ڕۆشـنبیری[22] لەسـەر کێشـەی تونـدوتۆڵی کۆمەڵایـەتی کـە هێشـتا پێویسـتی بـە بەرگریکردنـە لـە خـود، لەبەرئـەوە باشـتروایە گرنگـی بـدرێت بـەو ڕێگایانـەی تـر کـە چینـی کـۆن پێشنیازی کردون. یەکێك لەو پێشنیازانە ڕاستەقینەخوازەکان پێشکەشیان کرد[23](٧). چی بکەین کاتێك خەڵکی بەشێوەیەکی دروست ڕەفتار ناکەن؟ لێیان بدەین. ئەمە وەڵامێکی کلاسیکیە بۆ پرسیارێکی کلاسیکی، چونکە زمانی هێز ئەو زمانەیە زۆربەی خەڵك لێی تێدەگەن. کاتێك هەندێك لە تاکەکان هەولچدەدەن بیچنە دەرەوە لە قۆزاخەی نەریتەکان بۆئەوەی بە ئەقڵ ژیانیان بەڕێوە ببەن، چونکە چێژی هەست و بەرژەوەندی تاکەکەسی زۆر بـەهێز دەبێـت هـیچ شـتێك نایانوەسـتێنێت جگەلـە هەڕەشـەی تۆڵەسـەندنەوە چـونکە ئـەوە تـەنها زامنکـەری هێشتنەوەی یاخیبوانە لە هێڵێکی دروستدا. هەرچۆنێك دەتەوێت بدوێ لەبارەی ئەقڵ و بنەما ئەخلاقیەکانەوە، بەڵام لە دوا شیکاردا بۆت دەردەکەوێت کە هێـزی توندوتیـژ سـەرکەوتو دەبێت. تاکە ڕێگا بـۆ دورکەوتنـەوە لـە توندوتیـژی لـە کۆمەڵگـەدا دۆزینـەوەی هێزێکـی بـەرگری نیشـتیمانی چالاکە کـە ئامـادە بێـت بـۆ لێـدانی گـوزی پۆڵایین، گەڕاندنەوەی خەڵك بۆسەر هێڵـی ڕاست کاتێك لادەدەن لێـی. کەواتـە پێویستە چـەند یاسـایەك هـەبێت بەشـێوەیەکی ئاشـکرا سـنوردابنێت بۆئـەوەی ڕێگەپێـدراوە و دانـانی سـزا بـۆ سەرپێچـیکاران. ئـەو سـزایانە بـەجۆرێك دەبێـت کـەس ناتوانێـت بەرگـەیان بگرێـت. بـەکورتی وەڵـامی دروسـت لەسـەر کێشـەی سیسـتمی کۆمەڵایەتی: ((یاسا، دواتر یاسا، لەگەڵ بوونی چەند سزایەك خەڵك ناچاربکات پابەند بن بە یاساوە)).

ئەمە وەڵامی هۆبیس hobbes بوو کە پێشنیازی کرد بۆ ڕۆژئاوا. ئەگەر تاکە خودپەرستەکان بەبێ چاودێری هێڵرانەوە بەبێ بوونی دەستێکی بەتوانا بەسەر دانانی سنورێك لەنێوان ئەوان و بەرژەوەندیەکانیاندا، ئەوا ژیان زۆر ناخۆش و بەد دەبێت لە هەمووی گرنگتر زوو کۆتایی دێت!. فەلسـەفەی ڕاسـتەقینەخوزای جێبـەجێ کـراوە

---

[22] بزوتنەوەی ڕوناکبوونەوەی ڕۆشنبیری بزوتنەوەیەکی فەلسەفیە لە سەدەی هەژدەیەمدا دەرکەوت لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا وای بەباش دەزانی خەڵکی ڕۆشنبیر بکرێن لەڕووی بیرکردنەوە و لەڕووی ڕۆحیەوە وەك چارەسەرێك.

[23] )شوێنکەتوانی ڕێبازی ڕاستەقینەخوازی ئاکارێکی بنیاتنراوە لەسەر بەرەوڕووبوونەوەی ڕاستیەکان و پشتگوێ خستنی نەریتەکان و هەست.

سەبارەت بە سیستمی کۆمەڵایەتی لەڕێگەی میکانیزمی پاداشت و سزاوە. ئەوانەی گوێڕایەڵی حکومەت بوون پاداشت دەکرێن ئەوانەش کە سەرپێچی دەکەن سزادەدرێن. ئەگەر ئەم نزیککردنەوەیەمان لەبەرچاو گرت ئەوا لیستی یاساکان پێویستە دوورودرێژ بێت. ((هان فی تسو han fei tzu وتەبێژی شوێنکەتوانی ڕێبازی ڕاستەقینەخوازی دەڵێت: ئەگەر یاسا کورتکراوە بێت ئەوا زۆربەی خەڵك گفتوگۆ دەکەن لەبارەی مەبەستەکەیەوە. کاتێك دادوەرێکی ڕۆشنبیر هەڵدەسێت بە دانانی یاساکانی ئەوا هەموو شتێکی کتوپڕ لەبەرچاو دەگرێت و بەوردی لەبارەیەوە دەدوێت(٨). کەواتە پێویستە پێداویستیەکانی یاسا بخاتەڕوو بەشێوەیەکی ئاشکرا، نەك هەرئەوەندە بەڵکو پێویستە هەموو سزاکان بە وردی ڕوونبکاتەوە کە پەیوەندیان هەیە بەو یاسایانەوە. پێویستە سزاکان توند بن. هان فی تسو لە قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: نمونەکان هەمیشە پێمان دەڵێن پێویستە سزا سووك بێت. بەڵام ئەم کارە شێواندن و شڵەژان و وێرانکاری لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. ئامانجی پاداشتەکان هاندانە و سزاکان قەدەغەکردنە. ئەگەر پاداشتەکان بەرز بوون ئەوا ئەوەی دادوەر دەیەوێت بەشێوەیەکی خێرا جێبەجێ دەکرێت، کاتێك سزاکان توند دەبن ئەوا ئەوەی دادوەر نایەوێت ئەنجامی بدات زۆر بەخێرایی قەدەغەدەکرێت. )). ئاشکرایە ئەو هەڵسەنگاندنەی ئەم فەلسەفە سیاسیە دەیداتە سروشتی مرۆیی هەڵسەنگاندنێکی زۆر نزمە لە دوو لایەنەوە: یەکەم: ئەم فەلسەفەیە وادادەنێت ئەم پاڵنەرە بەدانە زیاترە لە پاڵنەرە باشەکان لە مرۆڤدا، وادادەنێت مرۆڤەکان بە سروشتیان هەوەسباز و چاوچنۆکن. ئەگەر خوازرا چاکەکانیان دەربکەوێت ئەوا پێویستە هەروەك پارچە تەختەیەك کەلەناو ئامێردا و لەژێر پەستاندا ڕێکدەکرێتەوە بەهەمان شێوە مرۆڤەکان ڕێکبخرێنەوە!. ((کەسانی ئاسایی تەمەڵن ئاساییە خۆیان بپارێزن لە کاری قورس و بەبێکاری دڵخۆش بن))(٩). زۆربەیان هەڵوێستی ئاکاری دروست دەکەن کاتێك وابیردەکەنەوە پێشیان دەخات، لەڕاستیدا دەشێت لە وڵاتێکدا بنەمای ئاکاری درۆینە دەربکەوێت، بەڵام لەکاتی پێویستدا بەرژەوەندیە تایبەتیەکان دەردەکەون. لەلایەکی تر بە نیگایەکی ڕاستەقینە سەیری سروشتی مرۆڤ دەکرێت، وادەبینرێت خەڵك دووربین نین، وادادەنێت دادوەرەکان پێویستە بۆ ماوەیەکی درێژ بیر لە چاکسازی بکەنەوە، بەڵام شوێنکەوتوان ناتوانن ئەم کارە بکەن، لە سەرئەنجامی ئەم کارە ڕازی نابن بە قوربانیدان لە ئێستادا بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتەکان لە داهاتودا. ((وادابنێ منداڵێکی شیرەخۆرە پێستی سەری توشی نەخۆشیەك بوو بەجۆرێك ئەگەر سەری نەتاشرێت ئەوا دوبارە توشی نەخۆشیەکە دەبێتەوە. ئەگەر دەرمانێك بە کوڵاوی نەکرێت بەسەری منداڵەکەدا ئەوا نەخۆشیەکە پەرەدەسەنێت. بەڵام کاتێك ئەم کارە ئەنجام دەدرێت منداڵەکە توشی ئازار دەبێت، وێڕای ئەوەی کەسێك بە وردی چاودێری دەکات بەڵام دایکی منداڵەکە دەتوانێت بەو کارە هەستێت بەپەڕی سۆز و خۆشەویستیەوە، منداڵەکە هاواردەکات لە ئازاردا بەڵام دایکەکەی گوێ بەمە نادات چونکە دەزانێت دەرئەنجامی ئەم کارە باش دەبێت))(١٠). بەهەمان ڕێگا، ((جەماوەر ئاسایش و دڵنیاییان دەوێت، بەڵام ڕقیان لە کەرەستەکانی دەستەبەرکردنی ئاسایشن)). ئەگەر ڕێگەدرا بە هەوەسبازەکان ئازادبن لە ڕەفتارکردنیاندا ئەوا هەر خێرا دەبنە نێچیری ئەو ئازارانەی کە دەترسان توشیان بێت، لەکاتێکدا ئەگەر ڕازی بن بە هەندێك لەو شتانەی ڕقیان لێیەتی لە ئێستادا ئەوا لە کۆتاییدا دەگەیەنرێت بەو شادومانی و خۆشگوزەرانیەی کە دەیانەوێت پێی بگەن. بەڵام ئەوان زۆر بە سادەیی بە گومان بوون لە توانای ئەو پاڵنەرانە بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و سیستمی کۆمەڵگە. ناوبەناو چەند کەسێکی لێهاتو دەردەکەون دەتوانن وێنەی چەند بازنەیەکی ڕاستەقینە بکێشن بەبێ بەکارهێنانی پەرگاڵ، بەڵام ئایا ئەو کەسانەی ڕەوڕەوە دروستدەکەن چاوەڕوانی ئەو کەسە نمونەییانە بن؟ لەوانەیە لە هەزار کەس تاکە کەسێك دەستپاك بێت، کەواتە بوونی ئەو

تاکە کەسە چ سودێکی دەبێت لەنێو ملیۆنەها کەسی تردا؟ لەوانەیە یەك کەس لە هەزار ببێتە فەرمانڕەوا، بتوانێت تاکەکانی گەلەکەی هان بدات بۆ هاوکاریکردنی یەکتر بەشێوەیەکی خۆڕسکانە و بەبێ سزادان، بەڵام هەواڵدان بە گەلی چین کە ڕۆچووبوو لەنێو شەڕی نێوان هەرێمەکاندا پێویستی بە هاتنی فەرمانڕەوایەکی نمونەیی بوو لەجۆری پاڵەوانە ئەفسانەییەکانی ڕابردوو، هەروەك هەواڵدان بە پیاوێك خەریکە نوقم دەبێت لە ڕوباری ناوەڕاستی چیندا چاوەڕوانی مەلەوانێکی شارەزایە لە هەریمەکانی نزیك سنورەوە بۆئەوەی ڕزگاری بکات لە نوقومبوون!. ژیان قورسە ئاواتەخوازین بەوجۆرە نەبێت بەڵام ئەم هیواخواستنە هیچ شتێك لە ڕاستیەکان ناگۆڕێت. هیچ دەریاچەیەك بەتەواوی مەنگ نیە، هەموو دەریاچەیەك پێویستە شەپۆلی هەبێت، هیچ بازنەیەك بەتەواوی نەکێشراوە، هەموو بازنەیەك بەشێك لە شێواوی تێدایە. هیواخواز بووم کە شتەکان بگۆڕم لەبەرتۆ گەر بمتوانیبایە، بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانم ئەو کارەت بۆ ئەنجام پێویستە ڕازی بیت بە شتەکان بەودجۆرەی کە هەیە. ڕاستیەکانی بوون تاڵن بانگەشە دەکەن بۆ ڕاستی بێ پێچ و پەنا بە توندی، چونکە جۆرەکانی شیکارکردن بەشێوەیەکی پراکتیکی پۆچەڵدەکرێتەوە چونکە هەوڵدەدات بۆ ڕۆیشتن بە دوو ڕێگادا و لە یەك کاتدا. ((ناکرێت بەفر و پشکۆ لە دەفرێکدا کۆبکرێنەوە. )). لەڕاستیدا لە چین فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی دۆزرایەوە کە جیاوازە لە فەلسەفەی ڕاستەقینە هەروەك جیاوازی ئاگر و بەفر، لەگەڵیدا ژیاوە لە سەردەمی کونفوشیوس. ئەمە فەلسەفەیەکی ناسراوە بەناوی موهیەت mohism بەهۆی وتەبێژی سەرەکی بەناویەوە مو تسو mo tzu یان مو تی mo ti کە پێشنیازکراوە وەك شیکارێك بۆ کێشەی کۆمەڵایەتی چین، بەکارنەهێنانی هێز بەڵکو بە بەکارهێنانی خۆشەویستی گشتگیر چین ئای(١١)، ئەمە فەلسەفەیەکە دەڵێت: ((پێویستە لەسەر مرۆڤ کە بەبەزەیی بێت بەرامبەر بە هەموو خەڵك هەروەك بەبەزەییە بەرامبەر بە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی، پێویستە سەیری نەتەوەکانی تر بکات هەروەك چۆن سەیری نەتەوەکەی دەکات. هێرشە ئاڵوگۆڕکراوەکان لەنێوان هەرێمەکاندا، تاڵانکاری و وێرانکردنی ماڵی یەکتر، شەڕ و کوشتاری نێوان تاکەکان، ئەمە یەکێکە لە گرنگترین کارەساتەکانی جیهان. بەڵام بۆچی ئەم کارەساتانە دەردەکەون؟ ئەوانە دەردەکەون بەهۆی لەدەستدانی خۆشەویستی لەم سەردەمەدا، فەرمانڕەواکان فێربوون تەنها وڵاتی خۆیان خۆشبوێت نەك وڵاتەکانی تر. لەبەرئەوە بەبێ هیچ دوودڵیەك هێرشدەکەنە سەر وڵاتەکانی تر. سەرۆکی خێزانەکان فێربوون تەنها تاکەکانی خێزانەکەی خۆیان خۆشبوێت نەك تاکەکانی خێزانەکانی تر لەبەرئەوە ناسڵەمنەوە لە پەلاماردانی خانوەکانی دراوسێیان و تاڵانکردنی کەلوپەلەکانیان. لێرەوە هەموو کارەسات و ململانێ و سکاڵا و ڕقەبەرایەتی لە جیهاندا دروست بوون بەهۆی نەمانی خۆشەویستی ئاڵوگۆڕکراوەوە. . . چۆن ئەم بارە ڕێکبخەینەوە؟ ناچارین لەڕێگەی خۆشەویستی و هاوکاری ئاڵوگۆڕکراوەوە چاکسازی ئەنجام بدەین. بەڵام ئایا ڕێگەی خۆشەویستی گشتگیر و هاوکاری ئاڵوگۆڕکراو کامەیە؟ بریتیە لەوەی هەریەك لە ئێمە وڵاتانی دراوسێمان خۆشبوێت هەروەك چۆن وڵاتی خۆمان خۆشدەوێت، ماڵی دراوسێکانمان وەك ماڵی خۆمان بپارێزین، خەڵکمان خۆشبوێت بەو ڕادەیەی خۆمان خۆشدەوێت. کاتێك هەموو خەڵك یەکتریان خۆشدەوێت ئەوکاتە کەسی بەهێز زوڵم لە لاوازەکان ناکات، دەوڵەمەندەکان گاڵتە بە هەژارەکان ناکەن، کەسی زیرەك کەسە سادە و خۆشباوەڕەکان فریو نادات. بەهۆی خۆشەویستی ئاڵوگۆڕکراوەوە ڕێگری دەکرێت لە ڕودانی کارەسات، ململانێ، سکاڵا، ڕقوکینە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵدا))(١٢). مو تسو هاوڕا نەبوو لەگەڵ ئەو کەسانەی بیرۆکەکەی ئەمیان بە بیرۆکەیەکی سۆزداری و ناپراکتیکی دەزانی. ((ئەگەر ئەم بیرۆکەیەم سودبەخش نەبێت، ئەوا من یەکەم کەسم کە ڕەتی دەکەمەوە، بەڵام چۆن دەبێت شتێك باش بێت بەڵام سودبەخش نەبێت؟)) ئەو

**یەزدانەی: ((خەڵکی زۆر خۆشدەویت، هەتاو و مانگ و ئەستێرەکانی دروستکردوە بۆ خزمەتی مرۆڤەکان، بەفری باراندوە، هەورەبروسکە، بارانی باراندوە، شەونمی دروستکردوە، شاخەکان و ڕوبار و دۆڵەکانی دروستکردوە، ئاسمان جیهانی خۆشدەویت. هەموو شتێك ئامادەکراوە بۆ خزمەتکردنی مرۆڤەکان))(١٣). ((هەتا خۆشەویستی شتێکی باش بێت، یەزدان چاکەی جیهانی بوێت، ناکرێت وابیربکەینەوە لە جیهانێکدا دەژین خۆشەویستی تیایدا بێسودە، چونکە ئەو کەسەی خەڵکلی خۆشدەویت لای ئەوان خۆشەویستە، ئەو کەسەی سود دەگەیەنێت بەوانی تر سودمەند دەبێت لێیان، هەرکەسێك خەڵك ئازاربدات ئەوا ئازاردەدرێت))(١٤).**

## وەڵامی کونفوشیوس

هیچ یەکێك لەو دوو وەڵامە دژبەیەکە چارەسەرێکی گونجاویان دانەنا بۆ کێشەی توندوتۆڵی کۆمەڵایەتی لەلای کونفوشیوس(١٥). وەڵامی ڕاستەقینەخوازی ڕەتکردەوە کە بەکارهێنانی هێز بەباش دەزانێت، لەبەرئەوەی چارەسەرێکی توندوتیژانەیە. دەشێت ئەو هێزەی یاسا دایدەنێت سنور دابنێت بۆ مامەڵەکردنی خەڵك، بەڵام ناشیرین دەبێت دەستێوەردان بکات لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی ڕۆژانەیان. بۆ نمونە ئەوەی پەیوەندی بە خێزانەوە هەیە، هێز دەتوانێت مەرجەکانی ژنهێنان و تەڵاقدان دابنێت، بەڵام ناتوانێت خۆشەویستی دروستبکات لەنێوان ژن و مێردەکاندا. ئەمە دەچەسپێنرێت بەسەر هەموو شتێکدا. چونکە حکومەتەکان پێویستیان بە کۆمەڵە شتێکە ناتوانێت بۆخۆیان دابینی بکەن: وەکو ئامانج و هاندەر. بەڵام سەبارەت بە پشتبەستن بە موهییەکان mohists بە خۆشەویستی بەتەنها، ئەوا کونفوشیوس هاوڕایە لەگەڵ ڕاستەقینەخوازەکان لە بیرۆکەی ئایدیالیزم. A. S. Graham هاوڕابوو لەگەڵ کونفوشیوس لەم خاڵەدا کاتێك تێبینی ئەوەی کرد بیرکردنەوەی لەوەی ڕووی داوە لە ڕابردودا ئەوا دەبینین موهیەت mohism سەیر نەبوو لە بیرکردنەوەی کونفوشیوسدا بەڵکو لەسەر هەموو شارستانیەتی چینی، هیچ کەسێکی تر بەباشی نەزانی مرۆۋ گرنگی بدات بە ئەندامەکانی خێزانی کەسێکی تر، خۆشیبوێن هەروەك چۆن ئەندامەکانی خێزانەکەی خۆی خۆش دەوێت(١٦). دەبینین کونفوشیوس جەختدەکاتەوە لەسەرئەوەی خۆشەویستی جێگایەکی زۆر گرنگی هەیە لە ژیاندا، بەڵام پێویستە پاڵپشتی بکرێت لەلایەن ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکانەوە، ژەنین لەسەر ئامێری چەنگی خۆشەویستی بەتەنها بەبێ داواکردنی بەو کەرەستانەی بەدەستیان دەهێنێت. ئەگەر ئەوەی باسکرا لەبەرچاوگیرا یارمەتیمان دەدات لەسەر باسکردنی کونفوشیوس بۆ هەریەکە لە ڕاستەقینەخوازەکان و موهیەکان بەوەی هەردوکیان بێ جیاوازی هەڵەن، بەڵام بە دوو ئاڕاستەی جیاواز. ڕاستەقینەخوازەکان وابیریان دەکردەوە حکومەتەکان دەتوانن ئاشتەوایی و پێکەوەژیان بنیاتبنێن لەڕێگەی یاساکان و بەکارهێنانی هێزەوە، لەکاتێکدا موهییەکان چونە لایەنی بەرامبەرەوە، وایاندانا پابەندبوونی تاکەکەسی دەتوانێت ئەم کارە جێبەجێ بکات. هردو گروپەکە ئەوەیان لەبیرکرد کە هەلومەرج و پەیوەندیە جیاوازەکان چەند کاردانەوەیەکی جیاواز دروست دەکەن. کاتێك پرسیارکرا لە کونفوشیوس: ئایا پێویستە لەسەر مرۆۋ دوژمنەکەی خۆشبوێت کە ئازاری دەدات و خراپەی بەرامبەر دەکات؟ لەوەڵامدا وتی: ((بێ گومان نەخێر. بەرەنگاری ڕقوکینەببنەوە بە دادپەروەری، خۆشەویستی و چاکە. ئەگەر وانەکەیت ئەوا چاکەکەت بەفیڕۆ دەدەیت. )). یەکەم قوتابی کونفوشیوس مینشیوس mencius ئەم لۆژیکەی بەکارهێناوە لە ڕەتکردنەوەی بانگەوازەکەی مو تسو mo tzu دا لەبارەی ((خۆشویستنی هەمووان بەبێ جیاوازی)). لە گرنگینەدانی بەو خۆشویستنەی دروستدەبێت لەنێوان تاکەکانی خێزاندا، مو تسو واپیشانیدوە ئەوە ڕاستەقینە نیە. وادەردەکەوێت تێڕوانینی ئێستای ڕۆژئاوا بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان لەڕێگای پەروەردەکردنی ئەقڵەوە نەهاتوە بەبیری کونفوشیوسدا. ئەگەر بەبیریدا هاتبێ ئەوا ڕەتیدەکردنەوە لەبەرئەوەی بیرۆکەیەکە بەباشی تاوتوێ نەکراوە. ئەوانەی هەڵگری تێڕوانینێکی پەرەسەندون لەبارەی زیرەکیەوە، وادادەنێن زیاددەکات بەتێپەڕبوونی کات لەوانەیە گفتۆگۆبکەن لەبارەی ئەم هەڵوێستەی کونفوشیوسەوە بەهۆی ئەوەی مامەڵەی دەکرد لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی ناکامڵدا هەروەك گەنجێکی هەرزەکار، چونکە ئەو لەوە بەتەمەنترە کە زلەی لێبدرێت هەروەها لەوە تەمەنی کەمترە لەگەڵیدا بدوێیت. زۆرترین ئەگەر بریتیەلەوەی ئەگەر ئاگایی کونفوشیوسی داگیربکردایە ئەوا دەکرا ئەقڵ کاربکات لەمیانەی هەڵوێستەکان و ئەو هەستانەی دەگونجێن و

کاریـان تێـدەکرێت لەڕێگــەی پەیوەندیــەکانی تــاك لەگــەڵ کۆمەڵــدا، ئەگــەر ئەزمونــەکانی تــاك لــەم بــوارەدا ئاڕاستەنەکرێن بەرەو هاوکاری، ئەوا بەرزکردنەوەی ئەقڵ هیچ سودێکی نابێت، لە زۆربەی ئەگەرەکاندا، تەنها لە یارمەتیـدانی ئـەو کەسـانەدا نـەبێت کـە ئـەقڵیان پەرەیســەندوە بـۆ بـەدیهێنانی بەرژەوەندیـە تایبەتیـەکانیان بەباشترین شێوە!. کونفوشیوس کوڕی فەلسەفەی ڕوناککردنەوە نەبوو بەڵکو نزیکتر بوو لە فەیلەسوف و زانا دەروونناسـەکان کـە دانـدەنێن بـەوەی خرۆشـاندن بەرهـەم ناهێنرێـت لەڕێگـەی ڕۆشـنبیرکردنەوە. ئەگـەر ئـەوەی باسکرا زانرا ئەوا دەڵێین کۆنفوشیوس تاڕادەیەك گرنگی دەدا بە نەریت و عادەتەکانەوە، چونکە بەبیرکردنـەوەی ئەو پێکهێنەری سەرەکی هەڵوێستەکان بوو. ئەو نەریتەکانی خۆشدەویست چونکە کەناڵێکی شاردراوەی تیادا بینی کە دەتوانێت پەرەبدات بە هەڵسوکەوتی ئێستا بەو نمونانـەی جێبەجێ کراون لـەماوەی چـەرخی زێڕینـی ڕابـردوی چـیندا، سـەردەمی پێکـەوەژیان بـەوەی نەریتـەکان هـەمووانی ناچـارکردبوو بەوهۆیـەوە هـەمووان پابەندبوون پێوەی بەهۆی ئەوەی ئەو نەریتانە بەشێوەیەکی جوان پاککرانەوە کەواتە ئاشتەوایی و شادومانی دەهێنن لەگـەڵ خۆیانـدا. لەوانەیـە کونفوشـیوس وێنـاکردنێکی نمونـەیی ئەنجامـدابێت و وێنەیـەکی ڕۆمانسـی دابێتـەپاڵ ئـەو ماوەیـە لـە مێـژوی چین کـە لەڕێگەیـەوە هـەزارەی دووەمـی پـێش زایینـی دوخاتـەڕوو، لەکاتێکـدا فەرمانڕەوایی خێزانی چۆو chou لە لوتکەدا بوو. وەك گومانی تێدانیە ئەو بەخیلی دەبرد بە چین لەو ماوەیەدا بەهەموو توانایەکیەوە. نەریت و خووڕەوشتە باوەکان بۆ ئەو چەند کەرەستەیەکی گونجاو بوو بۆ گواستنەوەی دەستوور لـەو ڕابردوە پرشـنگدارە بـۆ خزمـەتکردنی ئـەو سـەردەمە شـێواوەی کـە تیایـدا دەژیـا. بیردۆزدانـەرە کۆمەڵایەتیـە هاوچـەرخەکان هـەمان بیرکردنـەوەیان پێباشـە. ئـەوان ئـەمڕۆ پێمـان دەڵـێن پێویسـتە پـەروەردەی کۆمەڵایەتی لە گەورەکانـەوە بگوازرێتـەوە بۆ بچوکەکان، پێویسـتە نـەریت و عادەتـەکان بپـارێزرێن وەك تـۆڕێکی بـەردەوام لـە بـیرەوەری لـەنێو هـەڵگرانی نەریتەکانـدا، نـەوە لـەدوای نـەوە. . . کاتێـك پچـڕانێك ڕوودەدات لـە بەردەوامبوونی خووڕەوشتە کۆمەڵایەتی و شارستانیەکان ئەوا ئەو کۆمەڵـە دەکەوێتـە مەترسیەوە. ئەگـەر ئەو پچڕانە بەخێرایی چارەسەر نەکرێت ئەوا کۆمەڵگە شیدەبێتەوە و دەبێتـە نێچیری جـەنگی نێوان دەسـتە و تاقمـە جۆراوجۆرەکـان، چـونکە کاتێـك ئـەو بەردەوامبوونـە دەپچـڕێت گواسـتنەوەی کلتـوری ڕۆشـنبیرییبۆ نـەوە نوێکـان دەوەستێت، دواتر پێویستە لەسەر نەوە نوێکـە لـە سـفرەوە دەسـتپێبکات و لـە سـەرەتاوە دەسـتبکات بـە زانینـی دۆزینەوەی زۆربەی ئەو شتانەی پێویستە بیانزانێت لەڕێگەی ئەزمونە تاڵەکان و هەڵەکانیەوە. . . هیچ نەوەیەك نیە لە توانایدا بێت بەو کارە هەستێت(١٧). کونفوشیوس بـە زمـانێکی جیـاواز دەدوا بـەڵام لەسـەر هـەمان بابـەت کاری دەکرد. ڕێگرتنی لە ڕابردوو نـەیکرد بـە پیـاوێکی دێرینخـواز. ئـەو دەیزانـی گۆڕانکاریـەکی زۆر ڕویـداوە، گۆڕانکاریەك بەبێ ئەوەی بتوانین بگەڕێینەوە بۆ ڕابردوو. ساڵی ٥٠٠ پ. ز. بەتـەواوی جودابووتـەوە لـە سـاڵی ١٠٠٠ (ئەگەر چەند ژمارەیەکمان بەکارهێنا) لەڕێگەی چینیەکانەوە بوونە چەند تاکێکی سەربەخۆ. ئەمڕۆ ئەوان بـەئاگان بـۆ نـاخی خۆیـان و ئـارەزوی تێڕامـان و بیرکردنـەوە دەکـەن. ئەگـەر بـەمجۆرە بێـت، ئـەوا ناکرێـت پشـت ببەستین بـە نەریتـە خۆڕسـکەکان لـەبری ئـەوە پێویسـتە ئـەو نەریتـەی پشـتی پێدەبەسترێت بەئاگایانـە مامەڵـەی لەگەڵدا بکەین. کاتێك نەریتەکان بەشێوەیەکی خۆڕسك ناگەڕێنەوە ئەوا پێویستە پاڵپشتی بکرێن و بەهێزبکرێن لەڕێگـەی ئاگاییـەوە. ئـەو چارەسـەرەی لەسـەرەتادا سـادە دێتـە پێشچـاو بـەڵام قووڵـە لـەڕووی گەوهـەر و ناوەڕۆکەوە، قووڵیەك دەگونجێت لەگەڵ بلیمەتی کۆمەڵایەتیدا، لـە کاتـەکانی گواستنەوەدا پێویسـتە لەسـەر هـەر پێشنیازێکی چالاك دوو مەرجی تێدابێت: مەرجی یەکەم پێویستە پەیوەست بێت بە ڕابـردوەوە و بـەردەوامی پێبدات، چونکە خوازراو نابێت لەلایەن هەمووانەوە ئەگەر هاوشێوەی ئەوە نـەبێت کـە خـەڵك لەگەڵیـدا ڕاهـاتون–

((وابیرنەکەنەوە من هاتوم تا ڕەخنە بگرم لە پێغەمبەران بەڵکو هاتوم ئەو کارە تەواو بکەم ئەوان دەستیان پێکردبوو. )) (ئینجیلی مەتا ۱۷\۵)-لەهەمان کاتدا پێویستە لە وەڵامەکەدا ئەو پەرەسەندانە لەبەرچاوبگیرێن کە شایستەی جێبەجێ کردن نین بەشێوەیەکی زانستی. پێشنیازەکانی کۆنفوشیوس هەردو مەرجەکەی لەخۆگرتبوو بەشێوازێکی ناوازە. بەردەوامیدان بە ئاستی نەریت پارێزراو بوو. بەجۆرێك وادەردەکەوت دەڵێت: بابزانین ئەم بابەتە چۆن کاری تێدا دەکرا لە سالی ڕابردوودا. ئێمە گوێمان لە بانگەوازەکەی بوو کە زۆر بەسادەیی ئەو شتە دێرینەکانی خۆشدەوێت. بە لێزانی ئەو کەسە ڕامیاریەی بۆ پشتڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکەی پشت بە دەستو دەبەستێت، کونفوشیوس نوسەرە کلاسیکیەکانی ئەو سەردەمەی بانگکرد بۆئەوەی چەند ئاڕاستەکردنێکی بنەڕەتی بنیات بنێن بۆ پێشنیازەکانی، بەدەستپێکردنلە کلتوری چینی دێرینەوە. وێڕای ئەوەی بەبەردەوامی و هەمیشە شیکردنەوەی بۆ دەکردینلێرەو لەوێ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی دەکرد بۆ ئەو نەریتانە. دەتوانین هەستبکەین بەوە بکەین ئەگەر شتێك نەزانراو بووایە لەلای گەلەکەی ئەو هەڵدەستا بە دوبارەکردنەوەی پرۆسەی ئاڕاستەکردنەوەی، بە گۆڕینی لە ئەقڵی ناوەکیەوە بۆ ڕێکحراوێکی بەئاگا. بەڵێ ئەمە پێشتر نەزانراو بوو لەلای گەلەکەی، بەڵکو پێویستە بڵێین ئەو پرۆسەی دوبارە ئاڕاستەکردنەوەیە لە بەشێکی زۆریدا نەزانراوبوو تەنانەت لەلای خۆی، چونکە دروست نیە وادابنێین کونفوشیوس بەتەواوی دەرکیدەکرد بەو کارەی کە ئەنجامی دەدا. بەڵام بلیمەتی پشتنابەستێت بە تێگەیشتن و ئاگایی خودی بەتەواوی لە داهێنانەکانیدا. لەوانەیە زانینی شاعیر بەهۆی هەڵبژاردنی بۆ ئەو وشانە لە هۆنراوەکەیدا زۆر کەمتر بێت لە زانینی ڕەخنەگر، بەڵام ئەم نەزانینە نابێتە ڕێگر لەم ڕاستودروستی ئەو وشانە و شوێنی بەکارهێنانیان. زۆربەی جار هەموو داهێنانە نمونەییەکان ئەنجامدراون بە دەستپێکردن لە هەستپێکردنێکی ژیرانەوە زیاترلەوەی لە زیرەکیەکی ئاشکراوەبێت. ئاشکرایە ئەمە ئەو حاڵەتە بوو کونفوشیوسی تێدابوو. ئەو بڵگەی نەدەهێنایەوە بۆ ئەو دەستەواژانەی بەکارمان هێنان لە هەریەکەلە وەڵامەکانیدا، لەڕاستیدا نای نەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. وەڵامی دادەنا بەپلەی یەك ئەوی تری جێدەهێشت بۆ نەوەکانی داهاتو لە هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەوەی ئەنجامیداوە: بۆچی سەلمێندراوە ئەو شتەی پێشنیازی کردوە کاریگەرە. گواستنەوە لە نەریتی خۆڕسکەوە بۆ نەریتی ئەندازەکراو پێویستی بە دەمەزەردکرنی هێزەکانی ئەقڵی ڕەخنەگرانە بۆ پاراستنی هێزی نەریت و کاریگەریەکەی لەلایەك، لەهەمان کاتدا بۆئەوەی یارمەتیمان بدات بۆ خستنەڕوی ئامانجەکان و مەبەستەکانی نەریت کە لە ئێستاوە خزمەتمان دەکات. پێویستە لەسەر هەموو نەتەوەیەك سەرەتا بڕیاربدات لەبارەی بەها گرنگەکانی خێر و چاکە و خۆشگوزەرانی هەمووان، لێرەوە تێدەگەین بۆچی ((تاوتوێکردنی هەڵوێستە دروستەکان لەنێو کونفوشییەکاندا بابەتێکی گرنگ بوو))(۱۸). دواتر پێویستە هەموو ئەم کەرەستەی فێرکردنانە-فرمی بن یان نافەرمی، لە منداڵدانی دایکەوە هەتا ناو گۆڕ- ئاڕاستەبکرێن بۆ بینینی قوبووڵکردنی گشتگیری ئەو بەهایانە. هەروەك یەكێك لە چینیەکان باسی لەم پرۆسەیە کردوە وتی: ((بەها ئاکاریەکان پێشکەش دەکرا بە خەڵك لە هەموو ڕێگەیەکەوە-لەڕێگەی پەرستگاکانەوە، شانۆکان، ماڵەکان، یاریەکان، وتە میللیەکان، خوێندنگاکان، مێژو، چیرۆکەکان-هەتا ئەو بەهایانە بوونە خووڕەوشتی جێگیر لە ژیانی ڕۆژانەدا. . . . تەنانەت ڤیستیڤاڵەکان بەم واتایە کاری ئایینی بوون))(۱۹). بە هاوشێوەی ئەم کەرەستانە تەنانەت کۆمەڵگەیەك کەلە چەند تاکێك پێکهاتبێت((ئەگەر تەواوی هەوڵیدا بۆ ئەم کارە))ئەوا دەتوانێت نەریتێکی گشتگیر دابڕێژێت، هێزی پێشنیازەکان دەتوانێت پاڵ بە ئەندامەکانیەوە بنێت بۆئەوەی بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی دروست هەڵسوکەتبکەن، تەنانەت کاتێك یاسایەك بوونی نیە. ئەم تەکنیکە

لەبارەی ئەو شتەوەیە کە زانایانی کۆمەڵناسی ناوی دەنێن ((شێوازەکانی ناوبانگ و وازنین)). هەموو کۆمەڵێك شێوازی هەڵسوکەوتی دیاریکراو و تایبەت بەخۆی هەیە کە بە شوو ناوبانگی دادەنێت. بۆ نمونە لەوانەیە ئەو شێوازانە لەلای باندە مێردمنداڵەکان لەسەر تێکشکاندنی نەریتەکان بێت، لەکاتێکدا لە پەرستگاکاندابۆ ڕێزگرتنە لە پیرۆزی و خۆنەویستی. ناوەڕۆکی ئەو شێوزای هەڵسوکەتانە هەرچیەك بێت ئەوا هەمیشە ئەو بەهایانە بەرجەستەدەکات کە سەرۆکی هەموو کۆمەڵێك ڕێزیان لێدەگرێت. ئەو شوێنکەتوانەی ڕێنمایی وەردەگرن لە سەرۆکەکانیانەوە ڕێز لەو بەهایانە دەگرن و خۆیان ڕادەهێنن لەسەر کارکردن پێیان، لەبەرئەوەی سەرسامن بەو نەریتانە، لەلایەکی ترەوە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی هاوشانەکانیان لە کۆمەڵەکەدا. ئەمە ڕۆتینێکی بەهێزە بەڵکو تاکە ڕۆرتینێکە کەتیایدا بەها مرۆییەکان دەچنە نێو کۆمەڵە مرۆییە گەورەکانەوە. بۆ ماوەی نزیکەی دوو هەزار ساڵ، ڕستەی یەکەم کە فێری هەموو منداڵێکی چینی دەکرا کە بیخوێنێتەوە هەتا بڕی لەژێر ڕوناکی ڕاستەوخۆی کونفوشیوسدا، ئەمەیە سەیربکە، سیەربکە، سەیربکە و ببینە بەڵکو لەبری ئەوە: ((مرۆڤ بە سروشتی خۆیان چاکەخوازن)). لەوانەیە گاڵتەبکەین بەم ئامۆژگاریە ئاشکرایە بەڵام هەموو نەتەوەیەك پێویستی پێیەتی. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا چیرۆکی تایبەت بەخۆی هەیە لەگەڵ جۆرج واشینتۆن و درەختی گێلاس و یاسا ئاکاریەکانی کۆمەڵە کتێبێکی ماك گوفی ڕێدەرز macguffey readers. ڕۆمانیە کە ناسراون بە پابەندبوون و گوێڕایەڵی سودیان وەرگرتوە لە ئەفسانەکەیانەوە لەبارەی ئەو باوکەی بڕیاری مەرگی دا بەسەر کوڕەکیدا لەبەر ئەو سەرکەوتنەی بەدەستی هێنا دژ بە ئەو فەرمانانەی پێیدرابوو. ئایا نیلسۆن بەڕاستی وتی ((ئینگلتەرا پێشبینی ئەوە دەکات لە هەموو پیاوێك کە هەستێك بەو ئەرکەی پێی سپێردراوە))؟ ئایا فڕانسیسی یەکەم ڕایگەیاند: ((دەکرێت هەموو شتێك لەدەست بدەیت جگەلە شەرەف و ڕاستگۆیی؟)) گرنگ نیە ئەوە بزانیت. ئەم چیرۆکانە چەند وتەیەکی میللی دەردەخەن، خەڵك پێکدەهێنێت بەهاوشێوەی خۆی، چیرۆکەکانی کونفوشیوس کە کۆتاییان نیە، داناییەکەیان هەڵبژێردراوە لەو پارچە ئەدەبیانەی نوسراون بۆ دروستکردنی نمونەیەك کە چینیەکان هیواخوازبوون هەموویان پابەندبون پێوەی.

((مامۆستاکە گوتی: مرۆڤی بەڕێزی ڕاستەقینە خۆشەویستە بەڵام ناسراو نیە، هەروەها ئەو مرۆڤەی بێ پلەو ئاستە ناسراوە بەڵام خۆشەویست نیە. پادشا تسو لێی پرسی: ئەی چی دەڵێیت لەبارەی ئەو کەسەی هەموو دانیشتوانی شارەکەی خۆشیان دەوێت؟ کونفوشیوس لە وەڵامدا پێی وت: ئەوەندە بەس نیە، بەڵکو پێویستە چاکەخوازەکان خۆشیان بوێت لە خەڵکی شارەکەی و خراپەکاران ڕقیان لێی بێت. مامۆستاکە وتی: کەسانی ڕەوشتبەرز مەزنن بەڵام لەخۆبایی نین. بەدڕەوشتەکان لەخۆباییین بەڵام مەزن نین. کاتێك فان چیە fan ch'ih لەگەڵ مامۆستاکەدا دەڕۆیشت لەژێر درەختەکاندا لەکاتێکدا باران دەباری، وتی: ئایا دەتوانم لێت بپرسم مرۆڤ چۆن دەتوانێت ئاکاری چاك بکات، هەڵەکانی ڕاستبکاتەوە، شتە نائەقڵانی و ئەقڵانیەکان لەیەك جیابکاتەوە؟ مامۆستاکە لە وەڵامدا پێی وت: ئەمە پرسیارێکی باشە. ئەگەر مرۆڤ ئەرکی لەسەرەتادا دانا و سەرکەوتنی لەدواتر دانا، ئایا ئاکاری چاك نابێت؟ ئەگەر مرۆڤ ڕەخنەی لە هەڵە و کەموکورتیەکانی خۆی گرت لەبری ئەوەی هێرش بکاتە سەر ئەوانی تر، ئایا ئەمە نابێتەهۆی چارەسەرکردنی کەموکوڕیە تایبەتیەکانی؟ بەوەی مرۆڤ سەلامەتی خۆی و کەسوکاری لەبیربکات لە ساتی توڕەبوونیدا ئایا ئەمە بە نائەقڵانی دانانرێت؟)). کونفوشیوس لە هاونیشتمانیەکانیدا سروشتی دووەمی دروست دەکرد بۆ تەواوکردنی وتاری لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی کە باسکرا لەپێشتردا، خەڵکی بەدەستی دێنن کاتێك ڕۆشنبیر دەبن. ئەم سروشتی دووەمە دروست دەکرێت لەسەر وێنەی ئەو شتەی خەڵك بۆی دەژین و ئەوەی پێویستە لەسەری بن. . . . دڵسۆزی تەواو بۆ

کۆمەڵ ناکرێت بێتەدی تەنها لەڕێگەی سروشتی دووەمی مرۆڤەوە نەبێت، لەدوای کۆنترۆڵکردنی سروشتی سەرەتایی یەکەم، مامەڵەکردن لەگەڵیدا بەوەی کە ڕاستی کۆتایی نانوێنێت. لەوکاتەدا یاساکانی پابەندبوون نابنە پێویستی ژیان، یان بەسەریدا ناسەپێنرێت، بەڵکو دەبێتە هەڵقوڵاوی خودی خۆی.

## ناوەڕۆکی نەریتی تاوتوێکراو

نەریتی تاوتوێکراو جیاوازە لە نەریتی خۆڕسك لەوەدا کە پێویستی بە چاودێری و گرنگیپێدانە. سەرەتا پێویستی بە چاودێری و گرنگیپێدانە هەتا دەتوانرێت هێزەکەی بپارێزرێت بەرەو ڕووی تاکبوونی لەڕادەبەدەر کە هەڕەشەی ئەوەی لێدەکات لاوازی بکات ئەم کارەی داناوە بە لێپرسراویەتی پەروەردەکردنی بنەڕەتی، پەروەردەکردن بە واتایەکی فراوانتر. بەڵام دووبارە پێویستی بە چاودێری و گرنگیپێدانە بۆ ناوەڕۆکی ئەو پەروەردەکردنە. ئەو تایبەتمەندیەی ژیانی کۆمەڵایەتی کامەیە کە پێویستە لەسەر ئەم نەریتە خۆی لێی بپارێزێت؟ دەکرێت هێڵە فراوانەکان کورتبکرێنەوە بۆ وەڵامدانەوەی کونفوشیوس لەبارەی ئەم پرسیارەوە لە پێنج دەستەواژەی سەرەکیدا.

١-ج ین jen واتای وشەی ج ین -پێکهاتوە لە هەردو وشەی مرۆڤ و دووان. . ئەو پەیوەندیە نمونەییەی پێویستە هەبێت لەنێوان خەڵکدا. وەرگێڕدراوە بەچەندین شێوەی جیاواز: باشی، مرۆیی، چاکەکردن، خۆشەویستی، لەوانەیە باشترین وەرگێڕان و گونجاوترینیان ((بەزەیی هاتنەوە و هەستکردنی مرۆیی بەوانی تر بێت)). جین دایکی چاکەکان بوو لە ڕووانگەی کونفوشیوسەوە بۆ ژیان. ئەو کامڵبوونێکی شکۆدارە کونفوشیوس دانی بەوەدانا هەرگیز نەیبینیوە بەشێوەیەکی تەواو بەرجەستەکرابێت. لەبەرئەوەی جین بەکارهێنانی وزە مرۆییەکان دەگرێتەوە لە لوتکەکەیدا، کەواتە چاکەیەکی شکۆدارە بەڕادەیەك مرۆڤ تەنها دەتوانێت بەئاگابێت کاتێك دەیەوێت بەئاگابێت لەکاتێکدا لەبارەیەوە دەدوێت(٢٠). سەبارەت بە خانەدانەکان، ئەو چاکەیەکی بەنرخترە لە خودی ژیان. ((جیهانی پێداگرکار و پیاوی جین ژیانیان دەکەنە قوربانی بۆ پاراستنی تایبەتمەندی جین تیایاندا بەشێوەیەکی کامڵ)). تایبەتمەندی جین بیەشێوەیەکی خۆڕسك هەستی مرۆیی دەگرێتەوە بەرامبەر ئەوانی تر و ڕێزگرتن لە خود، ئەمە هەستێکە کاتێك دەردەکەوێت لەگەڵیدا هەستکردن بە ڕێزی ژیانی مرۆیی دەردەکەوێت. ئەمە تایبەتمەندیەکە چەندین هەڵوێست بەدوای خۆیدا دێنێت: جوامێری، وەفاداری و دڵسۆزی و چاکەخوازی. زۆربەی کات کامڵبوونی هەموو شتێك والە مرۆڤ دەکات لەڕووی مرۆییەوە شکۆدار بێت. لە ژیانی گشتیدا ئەم تایبەتمەندیەی مرۆڤ پاڵمان پێوەدەنێت بەرەو هەوڵدان لە کارکردندا. لە ژیاندا بەتایبەتی بەشێوەیەکی نەرم، بەسۆز، بەتوانابوون لەسەر ((پێوانی هەستی ئەوانی تر بە حود)). ئەگەر ویستمان ئەم دەربڕینە نێگەتیڤە شیبکەینەوە، ئەوا دەڵێین ئەم تایبەتمەندیە دەبێتەهۆی پێکهێنانی بنکەیەکی ئاڵتونی کە دەڵێت: ((ئەو شتە مەکە بەرامبەر بە خەڵك کە ناتەوێت بەرامبەرت ئەنجامی بدەن))(٢١). بەڵام هۆکارێك نیە بۆ وەستان لەلای ئەم دەربڕینە نێگەتیڤانەیە. ((لە ئارەزوکردنی جەختکردنەوە لەسەر خود، کەسی خاوەن جین هەوڵدەدات هەتا جێگیربێت و بڕیاربدات)). هاوشێوەی ئەم دڵە گەورەیە نە سنور دەزانێت نە نەتەوایەتی نە نیشتیمانی، چونکە ئەوانەی بەهرەی جین یان هەیەدەزانن ((لەنێو چوار دەریاکەدا، هەموو خەڵك خوشك و بران)).

٢-چون تسو chun tzu واتای دووەمی چون تسو. ئەگەر جین بەواتای پەیوەندی نمونەیی نێوان مرۆڤەکان بێت، ئەوا چون تسو ئاماژەدەکات بۆ دەربڕینی نمونەیی لە هاوشێوەی ئەم پەیوەندیەدا. وەرگێڕدراوە بۆ کەسی مەزن یان پایەبەرز مرۆڤایەتی سەرکەوتو لە باشترین حاڵەتەکانیدا. لەوانەیە دەستەواژەی کەسی پێگەیشتوی شکۆدار باشترین وەرگێڕانە و نزیکترینیانە لە واتاکەیەوە. چون تسو (کەسی تێگەیشتوی شکۆدار) بەرامبەرە بە کەسی گەوج و گەلحۆ، کەسی سوك و ڕیسوا، کەسی بیرتەسك. کاتێك چون تسو بەتەواوی گونجاوە، هاوسەنگ و ورەبەرزە، ئەوا مامەڵەدەکات لەگەڵ ژیاندا یان بەشێوەیەکی گشتی سەیری ژیان دەکات، بەجۆرێك کە

خانەخوێیەکی نمونەییە، لەنێو ئەوانەی دەوریانداوە وا هەست دەکات لە ماڵی خۆیدایە، بەوهۆیەوە پشوو دەدات بەشێوەیەکی تەواو، ئەگەر بەوجۆرە بێت ئەوا هەموو چاودێریەکی ئاڕاستەدەکات بۆئەوەی ئەوانی تر بحەسێنێتەوە. یان ئەگەر ڕەگەزەکەمان گۆڕی دێینە سەر ئەو خاڵەی تیایدا چون تسو هەست دەکات بەوەی گەردون بەشێوەیەکی گشتی ماڵی ئەوە، چون تسو تایبەتمەندیەکانی خانەخوێی نمونەیی هەڵدەگرێت، کە هەستی پڕدەکاتەوە لەنێو هەموو ژیاندا بەشێوەیەکی گشتی. کاتێك پڕچەك کرابوو بە ڕێزگرتنی لە خۆی کە دەبێتەهۆی ڕێزگرتنی لەوانی تر، مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات لەسەر ئەو بنەمایە نا ئەتوانم چیان لێ وەربگرم بەڵکو لەسەر بنەمای ئەتوانم چی بکەم بۆئەوەی بیانحەسێنمەوە و دڵخۆشیان بکەم؟ کاتێك خانەخوێکە ڕازییە بەوەی پێی دراوە ئەوا دەکەوێتە نێو کەشوهەوایەکەوە هەست بە خۆشی و میهرەبانی دەکات. کاتێك خانەخوێکە کەسێکی لێهاتو بێت ئەوا دەبێتە تاکێکی نمونەیی. جموجوڵەکانی خاڵیە لە توندوتیژی، دەربڕینەکانی کراوەن و وتارەکانی خاڵین لە وشەی زبر. یان با دوبارە ڕەگەزەکە بگۆڕین و دەڵێین پیاوی بەڕێز زۆر قسە ناکات. خۆبەزلزان نیە، هەوڵ نادات خۆی بنوێنێت، ((لەوانەیە تەنها لە یاریە وەرزشیەکاندا هەوڵی خۆدەرخستن بدات)). ئەو هەمیشە پابەندە بە پێوەرە تایبەتیەکانیەوە، هەرچەندە ئەوانی تر پێوەرەکانی خۆیان لەبیربکەن، ئەو هەرگیز ناشڵەژێت لەبارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنیەوە، چونکە هەمیشە دەتوانێت دەستپێشخەری بکات لەکاتێکدا ئەوانی تر پەنادەبەنەبەر ڕێکەوتننامەکان. ئوە فێری بەرەنگاربوونەوەی هەموو ڕوداوێکی کتوپڕ بێتەوە بەبێ هیچ توڕەبوون و ترسێك، لەخۆی بایی نابێت ئەگەر سەرکەتنی بەدەستهێنا، ناڕەحەت نابێت ئەگەر توشی شکست هات)). کونفوشیوس وایدانا ئەو کەسەی دەبێتە چون تسوی ڕاستەقینە بەشێوەیەکی تەواو تەنها ئەو دەتوانێت بنەما مەزنەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بونیادبنێت، ((تەنها کاتێك ئەوانەی کۆمەڵگە دروست دەکەن دەگۆڕێن بۆ سەر شێوازی چون تسو ئەو کاتە جیهان دەکرێت بجوڵسێت بەرەو ئاشتەوایی)). ئەگەر دادپەروەری هەبێت لە دڵدا، ئەوا جوانی بوونی دەبێت لەناو ئاکاردا. ئەگەر جوانی هەبوو لە ئاکاردا، ئەوا پێکەوەگونجان دەبێت لە ماڵدا. ئەگەر پێکەوەگونجان هەبێت لە ماڵدا، ئەوا سیستمێك بوونی دەبێت لە نەتەوەدا. ئەگەر سیستمێك هەبێت لەناو نەتەوەدا، ئەوا ئاشتەوایی بوونی دەبێت لە جیهاندا.

٣-li. واتای سێیەمە، دوو واتای هەیە. یەکەم ئەدەب و هونەر، ئەو ڕێگا دروستەی مرۆڤ کاری پێدەکات. کونفوشیوس بڕوای وابوو کارێکی نادروستە وابیربکەینەوە خودی خەڵك دەتوانن ژیرانە شێوازی هەڵسوکەوتی دروست دیاری بکەن. ئەوان پێویستیان بە چەند نمونەیەکی زیندو هەیە تا دوبارەی بکەنەوە، کونفوشیوس ویستی ئاگاییان ئاڕاستە بکات بەرەو شکۆدارترین نمونە کە مێژووی کۆمەڵناسی، بۆئەوەی هەمووان بتوانن سەرنجی بدەن و دوبارەی بکەنەوە. لەلای فەرەنسیەکان-کە شارستانیەتەکەیان نزیکترین هاوشانی چینە لە ڕۆژئاوا، تەنها لەڕووی چێشلێنانەوە نا بەڵکو لەڕووی گرنگیدانیان بە هونەری ژیان-چەند دەستەواژەیەك ئەم خاڵە ڕوون دەکەنەوە بەشێوەیەکی زۆرباش وای لێدەکات ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە بۆ دەستەواژە ڕۆژئاواییەکان: *Savoir faire*: واتە دەرکپێکردن، واتە زانینی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن بە خۆڕاگرانە لە هەموو هەلومەرجێکدا، *Comme il faut*: واتە بەوجۆرەی کە پێویستە، ئەو ڕێگا دروستەی پێویستە کاری پێ بکرێت، *Apropos*: گونجاو. *Esprit*: ڕۆح، هەستکردنی دروست بە شتەکان. کونفوشیوس ویستی تاکی چینی پەروەردەبکات بەو ئاڕاستانە. لەڕێگەی داناییەوە (لاسایی کراوەتەوە بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە کونفوشیوس وتی. . . )، چیرۆکەکانی (گوڵبژێرە ئەدەبیەکان لێوالێوە پێی)، نمونەی زانستی بۆ هەڵسوکەوتەکەی (کونفوشیوس لە گوندەکەیەوە دەستیپێکرد، زۆربە سادەیی و وەفادارانە، کاتێك لە دادگا بوو زۆر بە وریاییەوە

دەدوا)، کونفوشیوس ویستی ڕێگایەکی تەواو بۆ ژیان ڕێکبخات، بەجۆرێك هەر یەکێك پەروەردە دەکرێت هەرگیز ناشڵەژێت سەبارەت بەو ڕێگای دروستەی پێویستە بیگرێتەبەر. یەکێك لە قەشەکانی سەدەکانی ناوەڕاست وتی: ((هەڵسوکەتی خاوێنکراو (ئەتەکیەت) مرۆڤ دروست دەکات)). کونفوشیوس پێش چەندین سەدە دەرکیکردبوو بەم ڕاستیە. جوان هەڵسوکەوتکردن بوارێکی فراوانی گرتەوە، بەڵام ئێمە دەتوانین گەوهەری ئەو شتە بەدەست بهێنین کونفوشیوس گرنگی پێدەدا سەبارەت بە ((ڕاستکردنەوەی ناوەکان))، ڕێبازی ناوەند، پێنج پەیوەندیە جێگیرەکە، خێزان و تەمەن. کونفوشیوس دەڵێت: ((ئەگەر دەستەواژەکلان دروست نەبن، ئەوا زمان ناگونجێت لەگەڵ ڕاستی شتەکاندا. ئەکەر زمخان نەگونجێت لەگەڵ ڕاستی شتەکاندا، ئەوا ناکرێت ئەرکەکان جێبەجێ بکرێن بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە. لەبەرئەوە مرۆڤی پایەبەرز بە پێویستی دەزانێت ئەو ناوانەی وتەکە بەکاریان دەهێنێت بەشێوەیەکی دروست و گونجاو، ئەوەی پێی دەدوێت دەکرێت جێبەجێ بکرێت بەشێوەیەکی دروست و هەڵوێستی ئەو وشانەی قسەیان پێدەکات. مرۆڤی پایەبەر هەوڵدەدات وشەکانی بێ هەڵە بن)). لەوانەیە ئەم وتانە ناسراو بن لەلای خەڵك بەگشتی. بەڵام کونفوشیوس لێرەدا بە کێشەیەکەوە سەرقاڵ بوو ئەویش زانستی مانای دەستەواژەکان semantics: واتە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان وشەکان و بیرکردنەوە و ڕاستیە حاشاهەڵنەگرەکان. هەموو بیرکردنەوەی مرۆیی تێدەپەڕێت بەناو ئەم وشانەدا، لەبەرئەوە ئەگەر وشەکان شێواو بوون، ئەوا بیرکردنەوە ناتوانێت پێشبکەوێت بەشێوەیەکی ڕاست و دروست. کاتێك کونفوشیوس دەڵێت هیچ شتێك گرنگتر نیە لەوەی باوك باوك بێت، فەرمانڕەوا فەرمانڕەوا بێت، ئەو دەیەوێت پێمان بڵێت پێویستە بەتەواوی بزانین مەبەستمان لە چیە کاتێك ئەو وشانە بەکاردەهێنین. بەهەمان ڕادەی گرنگیپێدان، پێویستە ئەو وشانە بەڕاستی هەڵگری واتا ڕاستەقینەکەیان بن. بانگەوازکردن بۆ ڕێکخستنەوە و ڕاستکردنەوەی ناوەکان بانگەوازکردنە بۆ زانستی پێوانەیی بۆ واتای دەستەواژەکان، واتە دۆزینەوەی زمانێك تیایدا وشەکان بنەڕەتی بن ئەو واتایانەی هەڵیدەگرن ڕێکخراو بن. بەڵام بیروباوەڕی ناوەند گرنگ بوو لەلای کونفوشیوس بەڕادەیەك یەکێك لە کتێبە یاساییەکانی کونفوشیوس هەڵگری هەمان ناونیشان بوو کتێبی ناوەند. ئەو دوو وشە چینیەی کە بە واتای ناوەند دێن چون و یۆنگ chun&yung واتای تەواوی ئەم دوو وشەیە: ناوەندی جێگیر (یان بەردەوام)، لەبەرئەوە ناوەند بریتیەلە بەرنامە یان ئەو ڕێگایەی بەشێوەیەکی جێگیر لە نیوەدایە، لە خاڵی ناوەندی نێوان ئەو دوو لایەنەی گونجاو نیە کاریان پێ بکەین، بەو بنەمایەی دەڵێت: زیادەڕەوی دروست نیە لە هەر شتێکدا بێت، بنەمای ناوەندی ئاڵتونی ئەرستۆ نزیکترین هاوشانی ڕۆژئاوایی بۆ بنەمای ناوەندی کونفوشی. ناوەند خووڕەوشتە هەستیارەکان هاوسەنگ دەکات بۆئەوەی بیپارێزێت لە ژەمە زیادەکان و ڕۆچوونی تەواو. بەم شێوەیە گەندەڵی لەباردەبات پێش لەدایکبوونی. لە کتێبی لی li دا نوسراوە: پێویستە لغاوی مەردایەوتی بەرنەدرێت، پێویستە خواست و ویست تەواوی ئارەزوەکانی پێنەدرێت، پێویستە چێژ بە شێوەیەکی زیاد لە پێویست پەیڕەو نەکرێت. ڕێزگرتن لە ناوەند هاوسەنگی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. ئەو هاندەرە بۆ لەیەکگەیشتن و مرۆڤەکان وریادەکاتەوە. . ڕێزگرتنی چین لە ناوەند ڕزگاری کرد بە شێوازیانە نەك بە گشتگیرانە، لە زیادەڕەویکردن لە هەمان بەها پاکەکاندا، ((کە تیایدا بەپەرۆشبوونی لەڕادەبەدەر و گرنگیپێنەدانی زیادلەپێویست لابراوە))، بەمجۆرە چین پارێزرا لە دەمارگیری. ئێستا دەچینەسەر پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکە کە بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێت لە پیلانەکەی کونفوشیوسدا، ئەمە ئەو پەیوەندیانەیە کە لەنێوان باوك و منداڵەکانیدایە، ژن و مێرد، برا گەورە و برابچوکەکانی، بەرپرس و هاوڵاتیاندا هەیە(٢٢). لەبەر هێشتنەوەی کۆمەڵگە بەتەندروستی پێویستە ئەو

پەیوەندیە سەرەکیانە پێکبهێنرێت بەشێوەیەکی دروست. هیچ یەکێك لەو پەیوەندیانە داگیرکەر نین بەڵکو چەند وەڵاندانەوەیەکی جیاواز هەن دەگونجێن لەگەڵ هەریەکەلە لایەنەکان بۆ نمونە پێویستە لەسەر دایك و باوك منداڵەکانیان خۆشبوێت هەروەك پێویستە لەسەر منداڵەکان بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن. پێویستە لە برا و خوشکە گەورەکان بەبەزەیی بن بەرامبەر بە خوشکوبرا بچوکەکانیان، لەکاتێکدا‌ویستە لەسەر خوشکوبرابچوکەکان ڕێزبگرن لە خوشك وبرا گەورەکانیان، پێویستە لەسەر پیاوان چاك بن لەگەڵ ژنەکانیان، پێویستە لەسەر ژنەکان گوێڕایەڵ بن. پێویستە لەسەر هاوڕێ گەورەکان هەستی هاوڕێ بچوکەکان لەتەمەندا ڕابگرن، لەکاتێکدا پێویستە لەسەر هاوڕێ بچوکەکان لە تەمەندا ڕێزبگرن لە هاوڕێکانیان کە بەتەمەنترن لەوان. دواجار پێویستە لەسەر فەرمانڕەواکان چاکەکار بن، پێویستە لەسەر هاوڵاتیان گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانیان بن. کونفوشیوس دەڵێت: تۆ لەڕاستیدا هەرگیز بەتەنها نیت کاتێك کاردەکەیت. هەر کارێك ئەنجامی دەدەیت بەدڵنیاییەوە کاردەکاتە سەر کەسەکەی تر. لێرەدا و لەم پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەدا چوارچێوەیەك دەبینین تیایدا دەتوانی خۆیەتی تەواو بەدەست بهێنیت بەبێئەوەی زیان بگەیەنیت بە تۆڕی ژیان کە ژیانت پشتی پێدەبەستێت. لەڕاستیدا سیان لەو پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر خێزان بە ئاماژەپێکردنێکی ئاشکرا بۆسەر ڕادەی ئەو گرنگیەی کونفوشیوس دەیسپێرێت بە ڕێکخراوی خێزان. ئەو لەم کارەیدا داهێنەر نەبوو بەڵکو بەردەوامی بەو ئەگەرەی چین بەوەی خێزان یەکەیەکی بنەڕەتیە بۆ کۆمەڵگە. ئەم بەئەگەردانانە بەرجەستەکراوە لەو ئەفسانە چینیەی کە پیاهەڵدانە بۆ ئەو پاڵەوانەی خێزانی داهێنا بۆ بەرزکردنەوەی چینیەکان لە ئاستی ئاژەڵیەوە بۆ ئاستی مرۆیی. لە خێزاندا ڕێزگرتنی ڕۆڵەکان بۆ باوك و دایکیان دادەنرێت بە کلیلی بنەڕەتی. لێرەدا واتای ترسان لە یەزدان دێت. لەم دواییانەدا یەکێکیان وتی: ((کاتێك هیچ مانایەك نامێنێت بۆ باوك و دایك لەپێشچاوی ڕۆڵەکانیان، ئەوا شارستانیەت دەکەوێتە ژێر مەترسیەوە)). ئەمە بەتەواوی ئەو شتە بوو کە کونفوشیوس ویستی بیڵێت. ((ئەرکی ڕۆڵەکان بەرامبەر باوك و دایکیان ئەو کانگایەیە کە هەموو سیفەتە باشەکانی لێونە هەڵدەقوڵێت)). ئەدەبی کونفوشی لێوالێوە لە چیرۆکی ڕۆڵە وەفادار و گوێڕایەڵەکان بۆ باوك و دایکیان، زۆربەیان چیرۆکی سەیروسەمەرەن، وەکو چیرۆکی ئەو ئافرەتەی خەسوی حەزی بە ماسی بوو لە ناوەڕاستی زستاندا، بەوهۆیەوە ئافرەتەکە لەسەر ڕووی گۆمێکی بەستوو ڕاکشا سنگی ڕووت کرد بۆئەوەی سەهۆڵەکە بتوێنێتەوە بە گەرماییەکەی، بەڵکو لەو کونەی دروستبووە لەچینی سەهۆڵەکەدا بتوانێت دەستی درێژبکات و ماسی ڕاوبکات بۆ خەسوی. ئەم ڕێزگرتنە لە بەتەمەنەکان لە کونفوشیەتدا لە سنوری خێزاندا نەوەستا بەڵکو هەموو بەتەمەنەکانی گرتەوە بە گشتی، وەك ڕێزگرتنێك لە تەمەن لەلای کونفوشیوس بەشێوەیەکی گشتی. دوو خاڵ هەن کە پەیوەستن بەیەکەوە: لە لۆژیکی سودوەرگرتنەوە، شتێکی باشە کە خاوەنی کۆمەڵگەیەك بین (لەدوای تەمەنێك) تیایدا منداڵەکان و گەنجان چاودێری بەتەمەنەکان بکەن و خزمەتیان بکەن، چونکە زۆر زوو خودی گەنجەکان پیر دەبن و پێویستیان بە هاوشێوەی ئەو چاودێریك هەیە لە ڕۆڵەکانیانەوە. بەڵام لەڕاستیدا لە کونفوشیەتدا شتێکی زیاتر هەیە لەم بەڵگەی سودوەرگرتنە. کونفوشیزۆر بە ڕوونی دەیزانی پێویستە لەسەر بچوکەکان ڕێز لە گەورەکانیان بگرن و خزمەتیان بکەن تەنها لەبەر وەفاداریان نا بەڵکو لەبەرئەوەی تەمەن پێویستی بە ڕێزگرتن هەیە لە بەها گەوهەریەکەی، بەوەی هەموو ڵێك لە تەمەن ئەزمونی زیاتر دەداتە مرۆڤ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو دانایی مرۆڤ کامڵتر دەبێت و ڕۆحی ناسکتر. لەبەرئەوە زۆربەی کەسە بەتەمەنەکان شارەزاترن لە کەسانی تر لەبارەی ئەو شتانەی گرنگن لە ژیاندا. ئەم تێڕوانینە بەتەواوی پێچەوانەی تێڕوانینی ڕۆژئاوایە کە گەنجان بە گرنگتر دەزانن

له كەسە بەتەمەنەكان، بە ڕادەیەك ئەستەمە دەرك بەوە بكەین ئاخۆ ژیان چۆن دەبێت ئەگەر هەریەك لە ئێمە پێویستی بە خزمەتكردن و چاودێری و ڕێزگرتنی زیاتر هەیە لەگەڵ تێپەڕینی هەر ساڵێك لە تەمەن. لەدوای ئاستی منداڵی، گونجاندن لەگەڵ ساڵەكانی داهاتوودا، چەند كەسێكی زیاتر بازدەدەنەر مێزەكە بۆئەوەی قۆری چایەكەت بۆ پڕ بكەن لەبری ئەوەی شبینی ئەوەت لێبكەن كە تۆ بۆخۆت بەو كارە هەستیت. گوێت لێدەگیرێت لەدوای تێپەڕینی هەموو ساڵێك لە تەمەنت. كەواتە سیان لە پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕكراوەكە چڕدەكرێتەوە لەسەر ڕێزگرتنی مرۆڤ لە كەسە بەتەمەنەكان خزم بن یان هاوڕێ پێویستە خزمەتبكرێن. لەكاتی خستنەڕووی یاسای ڕاستكردنەوەی ناوەكاندا، ڕێبازی ناوەند، بیروباوەڕی پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕكراوە مەزنەكە، ڕێزگرتن لە تەمەن، ڕێزگرتن لە خێزان، بەمجۆرە تایبەتمەندیە گرنگەكانی دەستەواژەی لیمان ڕوونكردەوە بە واتا یەكەمینەكەی كە ((شێوازی هەڵسوكەوتكردن))؟ بەڵام واتای دووەمی ئەم دەستەواژەیە واتە ئایین Rite، چونكە كاتێك هەڵسوكەتەكان جێبەجێ دەكرێن بەشێوەیەكی دورودرێژ لە كونفوشیەتدا، ئەوا ژیان بەتەواوی دەكەوێتەێو سەمایەكی پیرۆزەوە. هەموو ژیانی كۆمەڵایەتی وێنەی بۆ دەكێشرێت و ئەركەكانی دیاری دەكرێت، هەنگاوە سەرەكیەكانی دیاریكراون بەجۆرێك بوارێكی زۆر كەم ماوەتەوە بۆ پینەكردن. ئەمە نمونەیەكی دیاریكراوە بۆ هەموو كردارێك بەدەستپێكردن لەو ڕێگایەی ئیمبراتۆر ڕاپۆرتێك پێشكەش دەكات لەبارەی هاوڵەكانیەوە بۆ ئاسمان، گەیشتن بەو ڕێگایەی پێویستە لەسەر كونفوشیوس خزمەت بە وانەكەی دەكات و چۆن چایی بۆ دەهێنێت. روت ژنی ئەلفرێد نۆرس وایت هێد alfred north whitehead قەشە كامبردج كۆتایی بە وتارەكەی هێنا بەم وتەیە: ((لە كۆتاییدا ئەی برایان سەبارەت بەو كەسانەی بەشێوەیەكی دروست هەڵسوكەوت دەكەن، لە ژیاندا توشی كێشە نابن)). لی ئەو نەخشەیەی ژیانە كە دەكرێت پەیڕەوی بكەین بەشێوەیەكی دروست.

٤- تی te. چوارەم چەمك كە كونفوشیوس دایهێنا بۆ هاوڵاتیەكانی مانای تی te ە. بەم وشەیە بە مانای هێز دێت، بەتایبەت ئەو هێزەی فەرمانڕەوایی خەڵك دەكات (واتە دەسەڵات power) بەڵام ئەمە تەنها سەرەتای پێناسەكردنیەتی. ئەم هێزە چیە؟ تێبینی ڕەتكردنەوەی كونفوشیوسمان كرد بۆ بانگەسەی ڕاستەقینەخوازەكان كە دەیاوت تاكە یاسای كاریگەر بریتیەلە هێزی فیزیایی(جەستەیی). كونفوشیوس لەسەر حەق بوو لەم ڕەتكردنەوەیەدا، بەوەی مێژووی چین ئەمەی سەلماندوە لەمیانەی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی دەسەڵاتدار چ ین ch'in كە ڕامیاری بونیادنا لەسەر بنەمای ڕاستەقینەخوازی بەتەنها، وێڕای ئەوەی لەسەرەتادا سەركەوتو بوو بەشێوەیەكی سەرنجڕاكێش، بۆ یەكەمین جار چینی یەكخست، چین ناوەكەی بەمیراتی وەرگرت: چ ین=چین. بەڵام ڕووخا لەمیانەی كەمتر لە نەوەیەك، وتەكەی تالیراند tallyrandی پشتڕاستكردەوە: ((دەتوانیت هەموو شتێك ئەنجام بدەیت لەڕێگەی ڕمەكانەوە بەڵام ناتوانیت لەسەری دابنیشیت)). یەكێك لە جوانترین چیرۆكە كونفوشیەكان ئەو چیرۆكەیە كە دەگێڕێتەوە كونفوشیوس گوێی لە ناڵە وگریانی ژنێكی تەنها بوو لەسەر یەكێك لە لاكانای شاخی تای tai، كاتێك لێی پرسی هۆكاری گریانەكەت چیە، لە وەڵامدا وتی: ((باوكی مێردەكەم لێرەدا كوژرا لەلایەن پڵنگێكی نێرەوە، دواتر مێردەكەم كوژرا بەهەمان ڕێگا، ئێستا كوڕەكەم دوچاری هەمان چارەنوس بوویەوە))، لەوكاتەدا كونفوشیوس بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: ((كەواتە بۆچی هەر لەو شوێنە مەترسیدارەدا ژیان بەسەردەبەیت؟)) لەوەڵامدا وتی ((چونكە لێرەدا هیچ فەرمانڕەوایەكی ستەمكار بوونی نیە)). دواتر كونفوشیوس بە قوتابیەكانی وت: ((هەرگیز ئەوەتان لەبیرنەچێت كە فەرمانڕەوای ستەمكار دڕندەترە لە پڵنگی نێر)). كونفوشیوس بڕوای وابوو هیچ دەوڵەتێك لە جیهاندا بوونی نیە

فەرمانڕەوایی تەواوی هاوڵاتیەکانی بکات بەزۆرەملێ، تەنانەت بەشێکی گەورەیان بۆ ماوەیەکی درێژ. پێویستە لە کۆتاییدا حکومەت پشتببەستێت بە ڕەزامەندی هاوڵاتیەکانی، متمانەیان پێی هەبێت و پێزانینیان هەبێت بۆ ئەو کارانەی ئەنجامی دەدات. کاتێك کونفوشیوس ئاماژەی کرد بەسێ شتی بنەڕەتی کە پێویستە لە هەموو حکومەتێکدا هەبێت ((توانستی ئابوری، توانستی سەربازی، هەبوونی متمانە لەلایەن گەلەوە))، دواتر وتی متمانەی گەل گرنگترینیانە لەبەرئەوەی ((ئەگەر گەل متمانەی بە حکومەتەکەی نەبێت ئەوا بەردەوام نابێت و هەرزوو دەڕوخێت)). ئەم متمانەپێبوونەی هاوڵاتیان دەرناکەوێت هەتا هەستبەوەنەکەن کە سەرکردەکانیان خاوەن توانا و شارەزان، ئەو کات تەواوی کاتەکانیان تەرخان دەکەن بەوپەڕی وەفاداریەوە بۆ بەرژەوەندی گشتی، ئەوان خاوەن ئاکارێکی جوان دەبن کە ئەوانی تر ناچاردەکەن ڕێزیان لێبگرن. لە دوا شیکاردا دەردەکەوێت چاکە لە کۆمەڵگادا بەرجەستەناکرێت نەلە ڕێگەی هێزەوە نەلە ڕێگەی یاساوە بەڵکو لەڕێگەی ئەو کەسانەی سەرسامین پێیان و ڕێزیان لێدەگرین. کەواتە هەموو شتێك وەستاوە لەسەر سەرۆکی دەوڵەت و پشتی پێدەبەستێت، ئەگەر ئەو سەرکردەیە (پیاو بێت یان ژن) فریودەر و ستەمکار و ناڕەسەن بوو، ئەوا هیچ هیوایەك نیە بۆ چاکەخوازی لە کۆمەڵگەدا، بەڵام ئەگەر سەرکردەکە پادشایەکی ڕاستەقینەبوو بەگشتی، یاساکانی هەڵقوڵاوی چاکیەکی خودی بن ئەوا لە دەوری ئەم پادشایە کۆمەڵە وەزیرێك کۆدەبنەوە ناکرێت بکڕدرێن، دڵسۆزیەکەیان کاریگەر دەبێت لەسەر ویژدانی بەرپرسە خۆجێییەکان، لەوانەوە ئەم کاریگەریە دەگوێزرێتەوە بۆ هاوڵاتیان بەشێوەیەکی گشتی. بەڵام بۆئەوەی ئەم پرۆسەیە سەرکەوتوو بێت پێویستە فەرمانڕەواکان ئارەزوی تایبەتیان نەبێت واتە بۆ بەرژەوەندی خودی خۆیان کارنەکەن بەڵکو هەرکارێك ئەنجامی دەدەن بۆ بەرژەوەندی گشتی بێت، ئەمە وتەیەکی کونفوشیوس شیدەکاتەوە: ((ئەوانەی شایستەی فەرمانڕەوایی کردنن تەنها ئەو کەسانەن پێیان باشە لە فەرمانڕەوایی دووربن و پێی هەڵناسن)). ئەمە کورتەی بیرۆکەی کونفوشیوسە لەبارەی تی te: (ئەو کەسەی فەرمانڕەوایی دەکات لەڕێگەی تی (دەسەڵات)ەوە دەتوانین بەراوردی بکەین بە ئەستێرەی جەمسەری باکور کە لە جێگاکەی خۆیدا جێگیرە و هەموو ئەستێرەکان بەرەو لای دەچن. کاتێك بارۆنی هەرێمی لو پرسی لە کونفوشیوس: مرۆڤ چۆن فەرمانڕەوایی ئەنجامدەدات؟ لەوەڵامدا وتی: ئەگەر بتەوێت فەرمانڕەوایی بکەیت پێویستە دادپەروەرانە بمێنیتەوە، گەورەم ئەگەر هەستایت بە فەرمانڕەوایی خەڵك لەسەر ڕێگای ڕاست ئەوا کام لە هاوڵاتیان دەوێرێت لەو هێڵە لابدات؟ لە بۆنەیەکی تردا هەمان فەرمانڕەوا لە کونفوشیوسی پرسی لەبارەی ئەوەی ئایا پێویستە بڕیاری لەسێدارەدان جێبەجێ بکرێت بەسەر ئەو کەسانەی یاسا پێشێل دەکەن و ڕێزی لێناگرن، کونفوشیوس لەوەڵامدا وتی: سزای لە سێدارەدان چ پێویستیەکی تێدایە بۆ فەرمانڕەوایی؟ ئەگەر تۆ ئارەزووی چاکسازی بکەیت ئەوا گەلەکەت چاك دەبن. دادپەروەری پادشا وەکو با وەهایە، دادپەروەری گەل وەکو گژوگیایە، سروشتی گژوگیا وایە دەچەمێتەوە کاتێك با هەڵی کرد). دادوەر هولمز دەیوت پێی خۆشە باج و سەرانە بدات چونکە وا هەستی دەکرد بەم کارەی شارستانیەت دەکڕێت. کاتێك هاوشێوەی ئەم هەڵوێستە پۆزەتیڤە بوونی هەیە ئەوا کاروبارەکان باشتر بەڕێوەدەچن. بەڵام ئەم هەڵوێستە پۆزەتیڤە چۆن بەرهەم دێت؟ لەنێو هاوڵاتیە ڕۆژئاواییەکاندا کونفوشیوس ئەفلاتونی بە باشترین کەس دەزانی کە لەبارەی بیرۆکەکەیەوە دەدوێت کاتێك وتی: ((کەواتە پێم بڵێ ئەوی کریستیاس cristias! مرۆڤ چۆن ئەو فەرمانڕەوایە هەڵبژێرێت کە فەرمانڕەوایی دەکات؟ ئایا ئەو کەسە هەڵنابژێرێت کە سەرکەوتو بووە لە بونیادنانی سیستمدا لە ژیانی تایبەت بەخۆیدا، بزانێت چ بڕارێك هەڵدەقوڵێت لە توڕەییەوە، دەکرێت هەزاران جار زیادبکات لە کاریگەریەکانی لەسەر هاوڵاتیان. ؟)) هەروەك

کونفوشیوس پشتگیری دەکرد لە وتەکەی تۆماس جیفرسۆن: هونەری فەرمانڕەوایی بەگشتی، کورتدەکرێتەوە لەوەدا کە مرۆڤ دەستپاك honest بێت

٥- وین wen. دوا چەمك لە بیرکردنەوەی کونفوشیسدا وینە، وتەیەکە ئاماژەدەکات بۆ هونەرەکانی ئاشتی لەبەرامبەر هونەری جەنگ، مۆزیك، هونەر، شیعر، کۆکراوەی ڕۆشنبیری لە شێوازە ڕۆحیەکەیدا. کونفوشیوس هونەری بەرزنرخاند و گرنگیەکی زۆری پێدا. جارێکیان لەدوای بیستنی هۆنراوەیەك بەجۆرێك کاریگەر بوو لەسەری بۆ ماوەی سێ مانگ گوێی نەدەدا بەوەی دەیخوارد. بەبڕوای کونفوشیوس ئەو مرۆڤەی گرنگی نادات بە هونەر ئەوا نیوە مرۆڤە. بەڵام ئەو هونەرەی خزمەت بە هونەر دەکات کاریگەر نەبوو لەسەر کونفوشیوس بەڵکو توانای هونەر بۆ گۆڕینی سروشتی مرۆڤ بەرەو چاکە، بە کارکردنەسەر دڵی خەڵك، ڕێزگرتنی ئەوانی تر ئاسان بکات لەسەریان کە بەبێ هونەر کارێکی قورسە. ((بە هۆنراوە ئەقڵ دەخرۆشێت، لە مۆزیکەوە کامڵبوونی کۆمەڵایەتی پێشوازی لێدەکرێت. هونەری هەستپێکردنمان فێردەکات، یارمەتیدەرە بۆ بەرگەگرتنی غەم و ناڕەحەتی. ئەرکی ڕێزگرتن و خزمەتکردنی باوك و دایك ڕووندەکاتەوە))(٢٣). ڕەهەندێکی ڕامیاری زیاددەکرێت بۆ دەستەواژەی وین wen. چیە ئەو شتەی سەرکەتو دەبێت لە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا؟ لێرەدا ڕاستەقینەخوازەکان وەڵامدەدەنەوە بەدەستەواژەی هێزی فیزیایی(جەستەیی). ئەمە هەمان وەڵامە کە ستالین دەنگدانەوەکەی دوبارەکردەوە لەم سەردەمەدا کاتێك یەکێکیان لێی پرسی ئایا چ تێفکرینێکت هەیە بۆ پاپا (ڤاتیکان) لەو جوڵەیەی خۆتی بۆ ئامادەدەکەیت دژبە پۆڵەندا؟ بە خۆڕسکانە وەڵامی دایەوە: ((چەند فەوجی سەربازی هەیە؟)). بەڵام هەڵوێستی کونفوشیوس بەتاواوی جیاواز بوو. بەبڕوای ئەو سەرکەوتن لە کۆتاییدا بۆ ئەو دەوڵەتەیە کە لەدەرونیدا وین دروستدەکات، واتە ڕۆشنبیری شکۆدار، واتە ئەو دەوڵەتەی شکۆدارترین هونەر و فەلسەفە و شیعری تێدایە، کە بەڵگەدەهێنێتەوە بۆ دەرکپێکردنی بە ((تایبەتمەندی ئاکاری بۆ چاك ڕەفتارکردن لەگەڵ دراوسێدا کە لێهتویی پێکدەهێنێت چونکە لە کۆتاییدا ئەمە ئەو شتانەیە کە سەرسامبوونی خۆڕسکی پیاوان و ژنان بەرەو لای خۆی دەبات لە هەموو جێگا و شوێنێکدا)). فەڕەنسیە ڕەسەنەکان جەنگاوەری بەهێز بوون، شارستانیەتەکەیان توندە بەڕادەیەك بە بەربەری ناسرابوون. بەڵام کاتێك بەرەوڕووی شارستانیەتی ڕۆمانی بوونەوە، هەستیان بەوەکرد کە شکۆداریەکەی ڕوون و ئاشکرایە بەڕادەیەك لەدوای هێرش و پەلاماردانی قەیسەر هیچ ڕاپەڕینێکی گشتگیر ڕووی نەداوە لە وڵاتەکەیاندا دژ بە فەرمانڕەوایی ڕۆمانی. ئەم کارە کونفوشیوسی سەرسام نەدەکرد.

## پڕۆژەی کونفوشی

باوادابنێین ئەو نەریتە تاوتوێکراوەی کونفوشویس ویستی پێکی بهێنێت بەڕاستی جێبەجێ کرا، ئایا ژیانی ئەو چینیانە چۆن دەبوو کە پێکهێنرابوو لەسەر ئەو بنەمایە؟ ئەو پڕۆژەیەکی لەخۆ دەگرت کۆتایی نایەت لە پەروەردەکردنی خودیەوە بەو ئامانجەی مرۆڤ ببێتە مرۆڤ بەشێوەیەکی تەواو. پیاو و ژن لە سیستمی کونفوشیوسدا چاکەخوازن، هەمیشە لە هەوڵداندان بۆئەوەی باشتر بن. هەوڵدان لەم پڕۆژەیەدا لە بۆشاییدا نەبوو. ئەمانە کۆمەڵە یۆگیکارێك نین کە گۆشەگیربوون لە ئەشکەوتی ناو شاخەکاندا بۆئەوەی یەزدان بدۆزنەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو کونفوشیوسەی پێداگری دەکرد لەسەر ئەو نەریتە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ خۆی خستەناو چەقی ڕەوتە دژبەیەکەکانەوە کەهەرگیز کۆتایی نایەن کەلە حاڵەتی گۆڕانێکی بەردەوامدان بۆ پەیوەندیە مرۆییە ئاڵوگۆڕکراوەکان، کونفوشیوس ئارەزوی نەدەکرد کاروبارەکان بەوشێوەیە ناکۆك و ناڕێك بن. پیرۆزی لە گۆشەگیریدا هیچ مانایەکی نەبوو لەلای کونفوشیوس. بانگەوازەکەی کونفوشیوس بۆ بەدیهێنانی پەیوەندیە ڕاستەوخۆ مرۆییەکان نیە بەڵکو بۆ قووڵتر لەوە دەچێت. ئەو وابیردەکاتەوە دەرونێك نیە لە دەرەوەی پەیوەندیە مرۆییە ئاڵوگۆڕکراوەکانەوە بێت. دەرون بنکەی پەیوەندیە مرۆییە ئاڵوگۆڕکراوەکانە. ئەو بونیادنراوە لەڕێگەی پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکانەوە لەگەڵ ئەوانی تردا، دەناسێنرێت لەڕێگەی کۆی ئەو ڕۆڵە کۆمەڵایەتیەکانی کە دەیگێڕێت، کەواتە واتای خود self لای کونوفوشیوس زۆر جیاوازە لە واتای خود لە ڕۆژئاوا بە ڕادەیەك پێویست دەکات بەشێکی تەواو تەرخان بکەین بۆ ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە. کونفوشیوس سەیری خود دەکات وەك تۆڕێك نەك وەك خودێکی سەربەخۆ، ئەمە خاڵێکە تیایدا ژیانەکان یەکدەگرنەوە. هەروەك ئەو تەوژمە هەوایيانەی داڵ بەرەوڕووی دەبێتەوە کاتێك دەفڕێت، ئەم تەوژمانە هێرشدەکەنە سەر داڵەکە بەڵام ئەو بەکاریان دەهێنێت بۆ ڕێکخستنی بەرزبوونەوەکەی لەڕێگەی باڵەکانیەوە. ژیانی مرۆیی ئێمە لە جوڵەیەکی هەمیشەییدایە هەروەك داڵ لە فڕینیدا، بەڵام لە حاڵەتی ژیاندا پەیوەندیە مرۆییە ئاڵوگۆڕکراوەکان ئەو کەشوهەوایەیە کەلەڕێگەیەوە ژیان ڕێگاکەی دەگرێتەبەر. پڕۆژەی کونفوشی بریتیەلە کۆنترۆڵکردنی باڵەکان بۆ بەرزبوونەوە بەرەو ئامانجێکی قورس ئەوەش کامڵبوونی مرۆییە. یان هەروەك کونفوشیوس دەیویست بڵێت: بەرزبوونەوە بەرەو ئامانج بریتیەلەوەی مرۆڤ کامڵتربێت لە مرۆڤایەتیەکەیدا. پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکانی کونفوشیوس بەرجەستەدەکرێت لەو لێکچواندنەدا بە تەوژمە جێگیرەکان لە هەلومەرجێکدا دەکرێت لەلایەکی ترەوە بە توندی هەڵگەڕێتەوە. بینیمان لە پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکەدا ئەو هەڵسوکەتەی گونجاوە لەگەڵ تاکدا لە یەکێك لەلاکانی پەیوەندیەکەدا ناگونجێت لەگەڵ هەڵسوکەوتی تاك لەلایەکی ترەوە. باشتروایە ئەم ڕۆڵانە بەرجەستەنەکرێت. پرسیاری یەکلاکەرەوە لێرەدا: ئایا هەڵسوکەوتە تایبەتیەکان کە کونفوشیوس دەیانخاتەڕوو لە پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکەدا لایەنگری یەکێك لە لایەنەکان دەکات؟ واتە هەریەك لە دوو تاك بەرزدەکاتەوە بەسەر ئەوی تردا؟ لە یەکێك لە واتاکاندا بەدڵنیاییەوە بەو کارە هەڵدەسێت. لەلای کونفوشیوس ئاسایی بوو کە منداڵەکان سەرسام بن بە باوك و دایکیان، ژن ڕێز لە مێردەکەی بگرێت، هاوڵاتیان لە فەرمانڕەواکەیان، خوشکوبرا بچوکەکان ڕێز لە گەورەکانیان بگرن، لەبەرئەوەی لایەنەکەی تر کە بەشێوەیەکی گشتی بەتەمەنترە ئەو لایەنەیە کە بەئەزمونترە. بەڵام ئێرە ئەو شوێنەیە پێویستە هاوسەنگی باڵەکان بەباشی ڕابگرین لەبەرئەوەی پێچەوانەی ئەمە ئەگەر هێندەی تاڵە موویەك بێت دەکرێت پڕۆژەی کونفوشی بشێوێنێت[٢٤].

[٢٤] لەسەر ئەو بنەمایەی هەموو شتێك ئەگەر زیادی کرد لە ڕادەکەی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە لێی و دژایەتی دەکات.

مەترسیە گەورەتر شاردراوەتەوە لەلای بەشداربوی گەرە لە هەر دوانەیەك، کە پێدەچێت ئەو بەئەگەردانانە بێت کە جێگاکەی هەڵگری زیادەیە لەبری ئەو زیادانەی پێویستە لەسەری بەدەستی بهێنێت بە لێهاتوویی و شایستەبوونەوە. گومانی تێدانیە کاتێك سروشتی مرۆیی بێت ئەوا چینیەکان خۆیانداوە بەدەست ئەم فریوخواردنەوە—ئەستەمە بزانین تا چ ڕادەیەکە؟—تا ئەو ئاستەی بەس بوو بۆ دۆزینەوەی ئەم لایەنە ناشیرین و گەندەڵەی سیستمی کونفوشی. بەڵام خودی کونفوشیوس هەوڵیداوە بۆ پوچەڵکردنەوەی خراپ بەکارهێنان بەپێداگریکردنی لەسەرئەوەی دەسەڵات میکانیزمێك نیە بەڵکو پلەوپایەیەکە پێویستە بەدەست بهێنرێت. ئەو گوێڕایەڵیەی کە پیاو شایستەیەتی بەدەستی بهێنێت لە ژنەکەیەوە ئەوەستێتەوە لەسەر جۆرێك لە پیاو کە هاوشێوەی ئەم گوێڕایەڵیە مسۆگەردەکات، هەمان شت جێبەجێ دەکرێت بەسەر چوار پەیوەندیەکەی تردا، وێڕای بوونی جیاوازی لە جۆری ئەو گوێڕایەڵیانەی کە دەگۆڕێت بەپێی هەریەك لە حاڵەتەکان. بۆ نمەنە لە پەیوەندی هاوڵاتیان بە فەرمانڕەواوە، فەرمانڕەوا گوێڕایەڵبوونی هاوڵاتیان دەپارێزێت تەنها لە حاڵەتێکدا تاکە خەمی باشکردنی گوزەرانیان بێت لەبەرئەوەی لەتوانایدایە ئەو کارە بکات. پێش دوو هەزار ساڵ بەسەر دەرچوونی بڕوانامەی مەزن[25]، جاڕنامەی مافی مرۆڤ، پێش دوو هەزار ساڵ لە هەستانی ڕۆژئاوا بە لابردنی مافی یەزدانی پیرۆز لەسەر موڵکداری، چینیەکان لەڕێگەی کونفوشیوس و قوتابیەکانیەوە مافی شۆڕشگێڕانیان خستەناو فەلسەفە ڕامیاریەکەیانەوە بەشێوەیەکی توندوتۆڵ: ئاسمان ئەو شتە دەبینێت کە گەل دەیبینن، هەروەها ئاسمان ئەو شتە دەبینێت کە گەل دەیەوێت. ئەوی ڕوویدا لەڕووی مێژوییەوە لە پیلانگێڕان دژبە فەرمانڕەوا ناشایستەکان بەهیچ جۆرێك لەسەر داوای کونفوشیوس نەبوو بەڵکو دژبە ڕێنماییەکانی کونفوشیوس بوو، ئەمە لەڕاستیدا دیمەنی لاوازی مرۆیی پیشان دەدات لەنێو پڕۆژەی کونفوشیدا. لەو لێکچواندنەی پێشتر باسمان کرد بۆ پڕۆژەی کونفوشی باسمان لە وێنەی ئەو داڵە کرد کە هەوڵدەدات باڵەکانی بە هاوسەنگی ڕابگرێت لە ئاسماندا بۆئەوەی یارمەتی بدات لە بەرزبوونەوەدا. ئەگەر ویستمان ئەم لێکچواندنە نزیکبکەینەوە بە پرسیارکردنمان لەبارەی بەرزبوونەوە لێرەدا؟ ئەو کاتە دەبینین وەڵامەکە دەستپێکردوە لە پەرەگرافی پێشوودا. ئەمە کۆتایی مرۆڤە چون تسو chun tzu واتە بەدیهێنانی مرۆڤایەتیەکەیەتی بەشێوەیەکی کامڵ لەڕێگەی بەبەزەیی بوونی لەگەڵ هەموو خەڵکدا بەبێ سنور. تایبەتمەندی چینی بۆ ئەم بەزەیی و سۆزە بریتیەلە سین hsin بەشێوەیەکی وێنەیی سین پێکهاتوە لە وێنەیەکی شێوازی دڵی مرۆیی، بەڵام واتاکەی دڵ و ئەقڵ دەگرێتەوە، چونکە دڵڕێنماییەکانی کونفوشیەتدا شانبەشانی ئەقڵ دەڕوات، چونکە ئەگەر لەیەك جوداکرانەوە ئەوا بیرکردنەوە کاڵ و کرج و ناکامڵ دەبێت و هەستەکان بێ هێز دەبن بەمهۆیەوە پڕۆژەی کونفوشی شکست دێنێت. بەڵام سەبارەت بەم دڵ/ئەقڵ ئەوا فراوان دەبێت لەسەر شێوەی بازنەی هاوچەق دەستپێدەکات لە خودی مرۆڤەوە، بڵاودەبێتەوە و فراواندەبێت لەوێوە بۆئەوەی بەشێوەی یەکلەدوای یەك خێزانی مرۆڤ و دواتر ئەو کۆمەڵگەیە بگرێتەوە کە مرۆڤ بەرەوڕووی دەبێتەوە دوابەدوای ئەوە نەتەوەی مرۆڤ، لە کۆتاییدا مرۆڤایەتی بەگشتی. لەکاتی گواستنەوەی ناوەندی بەزەیی و سۆز لە خودی مرۆڤەوە بۆ خێزانەکەی، مرۆڤ بەرزدەبێتەوەسەر خودپەرستیەکەیدا، کاتێك لە خێزانەکەیەوە بەرەو کۆمەڵگە دەڕوات ئات بەرزدەبێتەوە بەسەر ویستنی کەسە نزیکەکانیدا، کاتێك لە کۆگەوە دەجوڵێت بەرەو گەل ئەوا بەرزدەبێتەوە بەسەر بیرتەسکیدا، دواجار کاتێك دەجوڵێت بەرەو بەزەییهاتنەوە لەگەڵ مرۆڤایەتیدا ئەوا

---

[25] بڕوانامەی مەزن بریتیە لە بڕوانامەی مافە بنەڕەتیەکان magna carta کە خانەدانەکانی ئینگلیز پادشا جۆنیان ناچارکرد هەتا بیخاتەڕوو لەساڵی ١٢١٥ز، مافی تاکەکانی گەلی زامنکرد.

بەرزدەبێتـەوە بەسـەر ڕەگەزپەرستیدا. ئـەم فراوانبوونـەوە ئاسـۆییە بەردەوامـە لەگـەڵ فراوانبـوون بەئاڕاسـتەی قوڵیدا، چونکە کاتێك پێشنیازمان کرد لـە پێشـەوەدا کونفوشیوس هـەمان دەسـتەواژەی دەبینـی لـەبارەی ڕۆڵـە کۆمەڵایەتیەکانەوە کە مرۆڤ دەیانگێڕێت، مەبەسلە بازدان نەبوو بۆ ئەو دەرئەنجامـەی کونفوشیوس ڕەتیکردەوە ون بوونی هەبێت لەناو مرۆڤدا. بانگەوازی کونفوشیوس بۆ پشکنینی دەروون بەشێوەیەکی گشتی ئەوە ڕوون دەکاتـەوە بـاوەڕی نـەبوو بـە بـوونی لایـەنی نـاوەکی دەروون بـەڵکو ئـەو بوونـە ناوەکیـە ڕاسـتەقینەیەی بـە گـرنگ دادەنا. ڕێنماییـە کونفوشـیەکان چڕدەبنەوە لـەدەوری خـود و بـۆ خـود هـەتا دڵنیـاتربین، کاتێك فـراوان دەبێـت جودابوونـەوەی لـەوانی تـر لاواز و ناسـکتر دەبێـت. ژیـانی نـاوەکی گەشـەدەکات بەشـێوەیەکی چڕوپڕ کاتێـك بەزەیی و هاوخەمی زیاددەکات چونکە پانی و قوڵی سین hsin لـەلای ئـەو کەسـەی چوارچێوەی ڕێبـازی خـود پێکدەهێنێت و خۆراکی فیکری پێدەدات. کەواتە ناوەوە و دەرەوە پێکەوە کاردەکـەن لـە سیسـتمی کونفوشـیدا، بـەجۆرێك جیهـانی نـاوەکی قـووڵ دەبێتـەوە و ڕوونـتر دەبێـت هەرچـەندە جـین jen (خۆشەویسـتی و بـەزەیی) فـراوانتر بێـت، لەوێـدا دەرکـدەکرێت بـە تواناکـانی لـی li (هونـەری بـاش هەڵسـوکەوتکردن) بـە پێشـکەوتنی پلەبەپەلە. مرۆڤ هەوڵ نادات بۆ بەدەستهێنانی ئەمـە بـە تـەنها بـەڵکو تیایـدا پێشـدەکەوێت لـە دەریـای مرۆییـدا شانبەشانی ئەوانی تر هەوڵدەدەن بۆئەوەی ببنە مرۆڤی کامڵ لـەڕووی مرۆڤایەتیـەوە. کێڵگـەی ئەنجامـدانی ئـەم کارانە میشە پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکەیە.

لـە میانـەی مەشـقکردنەوە مـرۆڤ ئـەوەی بـۆ دەردەکـەوێت هەسـتان بـە ڕۆڵ لـە یـەکێك لـەو پێـنج پەیوەندیـەدا بەشـێوەیەکی تـەواو تیشـك دەخاتەسـەر ڕۆڵـەکانی تـر، لەوێـدا مـرۆڤ وەك بـاوك بـەرەو باشـتر دەچـێت، ئەمـە تیشکدەخاتەسـەر ئـەوەی چ مانایـەکی هەیـە کـە منداڵ باش بێت لەگەڵ دایك و باوکی، ئەمە جێبەجێدەکرێت بەسـەر ڕۆڵـەکانی تـردا لەگـەڵ جیاوازیـەکی کـەم، بـەوەی هەسـتان بـە هەریەکـە لـە ڕۆڵـەکان بـە تـەواوی تیشـك دەخاتەسەر ڕۆڵەکانی تر.

## ڕەوشتە یان ئایین؟

ئایا کونفوشیەت ئایینە یان ڕەوشتە بەتەنها؟ وەڵامی ئەم پرسیارە پشت دەبەستێت بە پێناسەکردنمان بۆ ئایین. کونفوشیەت بە گرنگیدانی بە ڕەوشتی تاك، سیستمی ئەخلاقی، نزیکبوونەوەی ژیان لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە کە تیایدا ئایینەکان مامەڵەدەکەن لەگەڵ ژیاندا، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت پێویستە سیمای ئایین لەبەرگی کونفوشیەتدا لابەرین. چونکە ئەگەر ئایین وەگرین بە مانا فراوانەکەی، وەك بەرنامەی ژیان پێکدەهێنرێت لەبارەی دوا گرنگیپێدانەکانی گەلێك ئەوا کونفوشیەت بەشێوەیەکی ڕوون شایستەی ناوی ئایینە. تەنانەت ئەگەر بە واتا بەرتەسکەکەیەوە وەربگیرێت، واتە گرنگیدان بە باری مرۆڤایەتی لەسەر زەمینەی خودا لەسەر بوونی مادی، ئەوا کونفوشیەت دەشێت دانرێت بە ئایین، بەڵام ئایینێکی بێدەنگە. ئەگەر تائێستا وتەکانمان کورتکردەوە لەسەر قکردن لەبارەی گرنگیپێدانە کۆمەڵایەتیەکانی کونفوشیوس، ئەوا پێویستە بڵێین ئەو گرنگیپێدانانە ئەگەر بن ئەوا هەموو تێڕوانینەکەی ناگرێتەوە، ئەگەر ویستمان سەیری دووری بڵند بکەین لەسەر بوونی مادی کونفوشیەت، ئەوا پێویستە لەسەرمان کونفوشیەت بخەینە نێو باکگراوندی ئایینی چینی دێرینەوە کە کونفوشیوس تیایدا دەژیا، چونکە هەتا هەزارەی یەکەمی پێش زایین، تێڕوانینی گەردونی چینیەکان پێکهاتبوو لە سێ توخمی پێکەوەبەستراو: یەکەم–ئاسمان و زەوی بە یەکەیەکی پێکەوەبەستراو دانراون. لێرەدا تەنها مەبەستمان لەم جێگایە نیە بەڵکو ئەوانەی تێیدا دەژین، هەروەك ئێمە کاتێك دەڵێین ئەنجومەنی نیشتیمانی ئاماژە ناکەین بە بیناکە بەتەنها بەڵکو بۆ نوێنەرەکانی کەلەو ئەنجومەنەدا دادەنیشن. ئەو کەسانەی لە ئاسمان دەژین باوباپیرانی تی ti کەسێکی شکۆدار فەرمانڕەواییان دەکات ئەویش شانگ تی shang tiیە. ئەوان باوباپیرانیانن کە پێش ئێمە تێپەڕین بەمزوانە دانیشتوانی زەوی ئێستا دەچنە لایان، هەموو پرۆسەیەکی بەردەوام مردن تیایدا هیچ نیە جگەلە بەرزبوونەوە بۆ حاڵەتێکی ڕێزدارتر، چونکە ئەم دوو مەیدانە تێکەڵ بەیەکدی بوون بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو و هەروەها لە پەیوەندیەکی بەردەوامدان. ئاسمان خۆشگوزەرانی زەوی کونترۆڵدەکات بۆ نمونە کەشوهەوا خووی ئاسمانە لەکاتێکدا پشتدەبەستێت بە دانیشتوانی زەوی بۆ دابینکردنی هەندێك لە پێداویستیەکانی لەڕێگەی قوربانی کردنەوە. بەدڵنیاییەوە ئاسمان جیهانێکی گرنگترە لە جیهانی زەوی چونکە دانیشتوانی ئاسمان ڕێزدارترن و دەسەڵاتیان گەورەتر و قووڵترە، لە دەرئەنجامی ئەم کارەدا ئەوان دەستدەگرن بەسەر ڕێز و ویقاری دانیشتوانی زەوی و دەستدەگرن بەسەر بیرکردنەوەکانیاندا. کاتێك ئاسمان و زەوی هەریەکەیان پشت بەوی دیکەیان دەبەستن پێویستە پێکەوە پەیوەندیان هەبێت، بەهۆی پێویستی هەریەکیان بەوی تر ئەگەر بەهۆی خۆشەویستیەوە نەبێت. ڕوونترین ڕێگا کە زەوی بەهۆیەوە دوا لەگەڵ ئاسماندا بریتیەلە قوربانی کردن. دانیشتوانی زەوی بەباشیان زانی بەشداربن لەو خێر و بەخشینانەی کە پێیان دراوە لەگەڵ ئەوانەی پێش خۆیان، گەوهەری چاکەکانیان هەڵدەگیرا بۆ ئاسمان لەڕێگەی ئەو دووکەڵەی بەرزدەبوویەوە لەو سوتانگەیەی کە تەرخانکرابوو بۆ قوربانی کردن. کەلە ناوەندی هەموو گوندێکی چینی دێریندا بوو، کاتێك گەلی چین دەرکەوت ئەو فەرمانڕەوایەی خۆی ناونا کوڕی ئاسمان بەوهۆیەی کە چاودێری ئەو قورانیانەی دەکرد کە گەل پێشکەشیان دەکرد بۆ ئەوانەی پێش خۆیان. تەنانەت لە سەردەمێکی کۆندا وەکو سەردەمی کونفوشیوس، هەر بەڕێوبەرایەتیەکی باڵادەست لە هەریەك لە هەرێمەکان پێشینیانی خۆیان بپەرستبایە ئەوا مافی دەسەڵاتداری لەدەستدەدا. ئەگەر قوربانیەکان ڕێگەیەکی سەرەکی بێت بۆ بەردەوامیدان بە پەیوەندی نێوان ئاسمان و زەوی، ئەوا پێشبینی کردن ئەو کەناڵەیە لەڕێگەیەوە ئاسمان وەڵامی دانیشتوانی زەوی دەداتەوە. کاتێك پێشینیان هەموو ڕابردووی گەلەکانیان دەزانن

توانای ئەوەیان هەبوو گرنگی بدەن بە داهاتوی ئەو گەلانە، لێرەوە پێشبینیکردن کەرەستەیەك بووە نەوەکانی ئێستا دەتوانن لەڕێگەیەوە داهاتوویان بزانن. کاتێك باوباپیران ئامادەبوون کە خۆیان فیدابکەن لەپێناو نەوەکانیاندا ئەگەر بەشێوەیەکی سروشتی دەیانەوێت بەشداربن لەگەڵ نەوەکانیاندا لەو زانستەی هەیانە سەبارەت بە داهاتوو. کاتێك دەنگەژێیان نیە هەتا پێی بدوێن ئەوا پەنایان بردەبەر نیشانەکان بۆ تێگەیاندنی دانیشتوانی زەوی. لە دەرئەنجامی ئەمەدا هەموو شتێك رووی دەدا لەسەر زەوی دابەشدەبوو لە تێڕوانینی چینیەکانەوە بۆ دوو جۆر: یەکەم ئەو شتانەی خەڵك ئەنجامیان دەدا بە مەبەستەوە، چونکە ئەمە دادەنرێت بە کۆمەڵە شتانێکی ئاسایی، جۆری دووەم ئەو شتانەی کە ڕوویان دەدا بەبێ مەبەست (واتە بەسەریاندا دێت بەبێ ئەوەی هیچ ڕۆڵێکی تیادا بگێڕن)، ئەمە پێویستە تێبینی بکرێت بە چاودێریەکی وردەوە چونکە لەوانەیە ئاماژەبن بۆ ڕوودانی کارەساتی نەخوازراو، بەوەی مرۆڤ بەتەواوی نازانێت کەی هەوڵدانی پێشینیان دەتوانن ببنە هۆکاری ئاگادارکردنەوەی خەڵك بەشێوەیەکی بەپەلە لەڕودانی کارەساتێکی دڵتەزێن!. هەندێك لە ئاماژەکان دەردەکەون لەسەر ڕووی جەستە یان لە ناوەوەیدا: خوران، پژمین، کزانەوە، سەرسمدان، زرنگانەوە لە گوێدا، گرژبوون و خاوبوونەوەی پێڵوەکان. لەکاتێکدا هەندێك لە ئاماژەکان بۆ ڕوودانی کارەسات دەرەکین: هەورەگرمە، هەورە چەخماخە، جودابوونەوەی ئەستێرەکان، ئیش و کاری مێروو و بڵندە و گیانداران. دەکرا هەندێك کەس دەستپێشخەری بکەن و بۆ خۆیان بگەڕێن لەبارەی زانستی شتە بزرەکانی ئاسمان بەشێوەیەکی دیار، دەتوانن ئاسنی گەرم بخەنە سەر سەدەفی کیسەڵ داوتر ئەو درز و قڵیشانە بپشکنن کە دەردەکەون. بە هەر بۆنەیەکەوە بێت: گەشت، جەنگ، لەدایکبوون، ژنهێنان، ژیرانە دەبوو بگەڕێن بەدوای ئامۆژگاریە ئاسمانیەکاندا لەمبارەیەوە. چیرۆکێکی دێرین هەیە لەبارەی میوانێك خانەخوێکەی داوای لێکرد مانەوەکەی درێژبکاتەوە هەتا شەو ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: ((پێشبینی ئەوەم کرد لەبارەی ڕۆژەکەوە بەڵام لەبارەی شەوەوە نا، بەوهۆیەوە ناوێرم بەو کارە هەستم!)). لە هەموو ئەو تایبەتمەندیە سەرەکیانەی ئایینی چینی دێرینـدا لەـهەستکردنیاندا بە بەردەوامیدان لەگەڵ پێشینانیان، قوربانی کردن، پێشبینیکردن–جەختکردنەوەیەکی هاوبش هەبوو. ئەوەش جەختکردنەوەیە لەسەر ئاسمان نەك زەوی. لەبەرئەوە ئەگەر ویستمان لە ڕەهەندی گشتی کونفوشیەت وەکو ئایین تێبگەین ئەوا پێویستە تێبینی گواستنەوەی ئاگایی کونفوشیەت بکەین لە گەڵی زەویەوە بۆ ئاسمان بەبێ خستنەخوارەوەی ئاسمان لە وێنەکە بەگشتی. دەکرێت ئەم تایبەتمەندیە دوانەییانە بۆ هەموو کونفوشیەت پشتڕاستبکرێتەوە زۆر بەئاسانی، بۆ نمونە لەبارەی ئەو گفتوگۆیەی لەبارەیەوە ئەنجامدرا لە سەردەمی خۆیدا، ئەوەش: کێ لەپێشترە پێداویستیەکانی دانیشتوانی دونیای زیندوان، یان پێداویستی ئەوانەی پەیوەندیان هەیە بە جیهانی ڕۆحەوە لەڕێگەی قوربانی کردنەوە؟ کونفوشیوس لە وەڵامداوتی: ((ئەگەرچی پێویستە ڕۆحەکان پشتگوێ نەخرێن بەڵام خەڵکی سەر زەوی لەپێشترن و بەپلەی یەکەم دێن)). ئاڕاستەی گرنگیدان بە دونیا بەرەو گرنگیدانە پراکتیکیەکان–دواتر چینیەکان بەهۆیەوە ناسران–بەچەند هەنگاوێکی پێشکەوتو بەرەو پێش دەچێت. کونفوشیوس ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەم ئاڕاستەیەدا بەرەو دونیا. جۆن دیوی john dewey دەڵێت: ((من ناڵێم کۆمەڵگە بەو جۆرەی دەیناسین هەموو شتێکە، بەڵام پێشنیازی ئەوە دەکەم فراوانتر و دەوڵەمەندترە لە هەموو ئەو شتانەی لەبەر چاوماندایە و دەتوانین تێبینی بکەین)). کونفوشیوس هاوڕایە لەگەڵ ئەم بیرۆکەیەدا چونکە فەلسەفەکەی تێکەڵەیەك بوو لە ژیری خۆڕسك و دانایی پراکتیکی. فەلسەفەکەی بەهیچ جۆرێك میتافیزیقی ئەوەی پشت سروشت نەبوو، هەروەها دوور لە خەمڵاندنەکان و بانگکردنی ڕۆح بەرەو دینداری گەردونی. بەگشتی لەبارەی

ڕۆحەکانەوە نەدواوە، هەروەها دەیگوت: ((ئەوەی دەیزانیت بڵێ دەیزانم، ئەوەی نایزانی دانبەوەدابنێ کە نایزانیت!))(٢٤). ؟((زۆربەی کات گوێبگرەواز لەو شتانە بهێنە واتاکەیان ئاشکرا نیە، بە وریاییەوە مامەڵە بکە لەوەی پەیوەندی هەیە بەوانی ترەوە)). بەپێی ئەمە کونفوشیوس هەرکات پرسیاری لێبکرایە لەبارەی ئەو کێشانەی پەیوەندیان هەیە بەو جیهانەوە، گرنگی دەدا بە بوونەوەرە مرۆییەکان، چونکە کاتێك پرسیاری لێکرا لەبارەی خزمەتی ڕۆحی مردوەکان لەوەڵامدا وتی: ئێوە تەنانەت لە تواناتاندا نیە خزمەت بە زیندوەکان بکەن ئیتر چۆن دەتوانن خزمەت بە ڕۆحەکانیان بکەن لەپاش مردنیان!))، کاتێك پرسیاری لێکرا لەبارەی مردنی خۆیەوە لەوەڵامدا وتی: ((ئێوە تەنانەت لە ژیان تێناگەن ئیتر چۆن لە مەرگ دەگەن؟)). بەکورتی ئەو دەیگوت لە یەکجاردا لە تاکە جیهانێك تێبگەن. دەتوانین سەیری یەکێك لە وێنە ناوازەکانی ئەو ڕێگایە بکەین کە کونفوشیوس خاڵی گرنگیپێدانی هاوڵاتیانی لە ئاسمانەوە دەگۆڕی بۆ زەوی ئەگەر تێبینی بکەین ئەو جەختی دەکردەوە لەسەر گۆڕینی پەرستنی پێشینیان بۆ پەرستنی بونیادنەر. لە چینی دێرین مردوەکان دەپەرستران. بەدەستپێکردن لە توخمی پارێزەر لە سروشتەکەیدا، کونفوشیوس هیچ شتێکی نەکرد بۆ وەستاندنی پەرستنی پێشینیان، بەڵام بوونی ڕۆحی مردوەکانی ڕەتنەدەکردەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە مامەڵەکردن لەگەڵیان بەکارێکی باشی دەزانی ((هەروەك بەڕاستی بوونیان هەبێت)). لە هەمان کاتدا بەتایبەتی جەختی دەکردەوە لەسەرئەوەی گرنگی بدرێت بە خێزانی زیندوو، هەروەها دوپاتی کردەوە پیرۆزترین پەیوەندی ئەوەیە کەلەنێوان خزم و کەسە نزیکەکاندایە. سەبارەت بەئەو ئەرکی ئەندامانی ئێستای خێزان بەرامبەر بەیەکتر گرنگترە لە ئەرکەکانیان بەرامبەر بەو ئەندامانەی لە ژیاندا نەماون. ئەو دووریەی کونفوشیوس گرنگیپێدانی بۆ گواستەوە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی پێویست ناکات بیرکردنەوەمان ببات بۆئەوەی بەتەواوی ئاسمان لە زەوی جودابکەینەوە لەڕووی پەیوەنیەوە. ئەو هێڵە فراوانە سەرەکیەکانی بینینی گەردونی ڕەتنکەردەوە لە سەردەمی خۆیدا کە پێکهاتوە لە ئاسمان و زەوی، واتە پێکهاتوە لە بەدیهێنەری پیرۆز کە نیوەی جەستەی سروشتیە و نیوەکەی تری لەسەروو سروشتەوەیە ئەوەی فەرمانڕەوایی هەمووی دەکات: شانگ تهی shang ti شکۆدارە. لەکاتێکدا کونفوشیوس پاراستنی تایبەت بەخۆی هەبوو سەبارەت بە کاروباری پشت سروشت بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بەتەواوی ڕەتی نەدەکردنەوە بەتێڕوانینی ئەو لە شوێنێکی ئەم گەردونەدا وزەیەك یان توانایەك هەیە لەلایەنی حەق و ڕاستیدایە، بڵاوکردنەوەی دادپەروەری و چاکەکاری بۆ ئەو مەبەستە داواکاریەکی گەردونیە بەوهۆیەوەویستی ئاسمان یەکەمین شتە پێویستە لەسەر مرۆڤی چون تسو chun tzu (مرۆڤی کامڵ و تێگەیشتو) ڕێزی لێبگرێت. کونفوشیوس بڕوای وابوو هێزێك هەیە ناردویەتی وەکو نوێنەرێك بۆ بڵاوکردنەوەی ئامۆژگاریەکانی. لەمیانەی گەشتە دوور و درێژەکەیدا کاتێك لەیەکێك لە سەردانەکانیدا دانیشتوانی شاری کوانگ kwang هێرشیان کردەسەر شوێنکەوتوەکانی دڵنیاکردەوە وتی: ((ئاسمان منی دەستنیشانکردوە بۆ گەیاندنی ئەم بیروباوەڕە، هەتا بەو کارە هەستم ئیتر دانیشتوانی کوانگ دەتوانن چی بەرامبەرم بکەن؟))(٢٦). کاتێك هەستی بەوەکرد گەلەکەی پشتگوێیان خستوە و گرنگی نادەن بە بیرکردنەوەکانی دڵخۆشی خۆی دایەوە وتی: ((ئاسمانێك هەیە دەمناسێت)). یەکێك لە وتە ئاینیەکان لە هەموو سەردەمێکدا وەرگیراوە لە پێنوسەکەیەوە کە نوسیویەتی: ((ئەو کەسەی سوکایەتی بە خوداوەند دەکات هیچ کەسێکی نیە نوێژی بۆ بکات و لێی بپاڕێتەوە))(٢٧). ئەم باوەڕهێنانە بە یەزدان کە تاڕادەیەك لاوازە یارمەتیمان دەدات لەوە تێبگەین بۆچی زانا کونفوشیە هاوچەرخەکان نوسیویانە ((نمونەی باڵا لە کونفوشیەتدا بریتیە لە یەگکرتوویی مرۆڤ و ئاسمان، لە بیروباوەڕی ناوەنددا ئەم نمونە باڵایە باسکراوە وەك مرۆڤێك لەگەڵ ئاسمان و زەویدا سێگۆشەیەکی پیرۆز پێکدەهێنێت))(٢٨). ئەگەر ئەم

سێگۆشەیەمان کردە دوا ئامانجی پڕۆژەی کونفوشی ئەوا یارمەتیمان دەدات بۆئەوەی پێشبکەوین و بگەین بە هەنگاوە یەکلەدوای یەکەکان کە وەستاون پێشئەوەی بگەن بە دوا ئامانج. وتمان پڕۆژەکە بریتیەلەوەی مرۆڤ لەڕووی مرۆڤایەتیەوە کامڵ ببێت بە بەرزبوونەوە و شکۆداربوونی بەشێوەیەکی یەکلەدوای یەك: بەسەر خودپەرستیدا دواتر بەسەر خۆشویستنی کەسە نزیکەکاندا دواتر بەسەر بیرتەسکیدا دوابەدوای ئەوە بەسەر دەمارگیری و ڕەگەزپەرستیدا، دواتر بەسەر شۆڤێنیدا. ئێستا پێویستە دوا بڵندبوونەوە زیادبکەین ئەویش بڵندبوونەوەیە بەسەر مرۆڤایەتی گۆشەگیریدا کە دابڕاوە لە ئاسمان. لێرەدا دەتوانین بەردەوام بین لە وتەکانی یەکێك لە دانا کونفوشیەکان: ئەگەر بمانەوێت والە خۆمان بکەین کە شایستەی ئەوە بین ببینە هاوڕێی ئاسمان، ئەوا پێویستە لە پەیوەندیەکی بەردەوامدا بین بەو ڕوناکیە بێدەنگەی حەق و ڕاستی دەکات لە دڵ و ئەقڵماندا هەڵبێت و پرشنگ بدات. ئەگەر نەتوانین ئەو بەربەستانە تێبپەڕێنین ئەوا تاکە شتێك دەتوانین هیواخوازی بین مرۆڤایەتیەکی تایبەتیە کە بانگی مرۆڤ دەکات بۆئەوەی ببێتە پێوەر بۆ هەموو شتەکان. بەڵام لە بەرامبەردا: مرۆڤایەتی کونفوشیەت گشتگیرە، پشت دەبەستێت بە تێڕوانینی مرۆیی گەردونی وادەبینێت مرۆڤایەتی لە کامڵبووندایە و جەستەیەکی یەکگرتوو پێکدەهێنێت لەگەڵ ئاسمان و زەوی و ئەو شتانەی کەلە ژماردن نایەن وامان لێدەکات بتوانین گەردون بەرجەستە بکەین لە هەستەکانماندا(٢٩).

## کاریگەری کونفوشیەت لەسەر چین

چارلز گالتۆن داروین charles galton darwin لە کتێبەکەیدا بەناوی ملیۆن ساڵی داهاتوو the next million years ئاماژەدەکات بەوەی هەر کەسێك بیەوێت کاریگەریەکی بەرجەستەکراو دروستبکات لەسەر مێژووی مرۆیی یەکێك لەم سێ هەڵبژاردنەی لەبەردەمدایە کەلەڕێیانەوە دەتوانێت کاربکات: یەکەم هەستان بە کارێکی ڕامیاری ڕاستەوخۆ، بواری دووەم بەشداربێت لە دروستکردنی بیروباوەڕێکی نوێ، سێیەم هەوڵبدات گۆڕانکاریەك ئەنجامبدات لە کرۆمۆسۆمی جۆرەکانی مرۆڤایەتیدا کەهەڵگری سیفەتە بۆماوەییەکانن. یەکەم هەڵبژاردن لاوازترینیانە چونکە شوێنەواری کاری ڕامیاری بەدەگمەن بەردەوام دەبێت بۆ ماوەیەکی درێژتر لە ژیانی خاوەنەکەی. هەڵبژاردنی سێیەم پراکتیکی نیە چونکە ئەگەر زانیاریمان هەبێت بۆ ڕودانی ئەو جۆرە گۆڕانکاریانە لە کرۆمۆسۆمەکانی مرۆڤدا ئەوا جێبەجێکردنی کارێکی قورسە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورت بێت. لەبەرئەوە داروین گەیشت بەو دەرئەنجامەی ((بیروباوەڕ هیوایەکی باشتر دەدات کە مرۆڤ لە ڕێیەوە دەتوانێت چارەنوسی داهاتووی کۆنترۆڵ بکات))(٣٠). لە مێژوودا نمونەیەکی ڕوون و ئاشکرا نیە کە پاڵپشتی ئەم وتەیە بکات لە کاری کونفوشیوسدا. چونکە بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ ئامۆژگاریەکانی کونفوشیوس بەشێوەیەکی گشتی کاریگەر بوون لەسەر چواریەکی دانیشتوانی سەر ڕووی زەوی کە دانیشتوانی چین پێکدەهێنن. ڕێنماییەکانی باس لە چیرۆکی سەرکەوتنێکی بێوێنە دەکەن بۆ یادداشتی پراکتیکی کزنفوشیوس کە کاریگەریەکی فراوانی هەیە لەسەر چینی دانایان کە فەرمانڕەوا بوون لە چین، بووەهۆی دەرکەوتنی کونفوشیوس وەك گرنگترین کەسایەتی لە مێژووی چیندا. دەقەکانی کونفوشیەت کرا بە سیستمی بنەڕەتی بۆ مەشقپێکردنی فەرمانبەرانی حکومەت، ئەم نمونەیە بەردەوام بوو–جگەلە ساڵەکانی ٢٠٠ بۆ ٦٠٠ زایینی کە بەهۆی دابەشبوونی ڕامیاریەوە پچڕا–هەتا داڕمانی ئیمبراتۆریەت لەساڵی ١٩٠٥ز. لەهەمان ماوەی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی دەسەڵاتداری هان han کونفوشیەت بووە ئایینی فەرمی لە چین لە ساڵس ٥٩ز فەرمانڕەواکان فەرمانیان دا بە قوربانی کردن بۆ کونفوشیوس لە هەموو خوێندنگا شارستانیەکان، پەرستگاکان بونیادنران لە سەدەکانی حەوتەم و هەشتەمی زاییندا لە هەموو هەرێم و پارێزگایەکی ئیمبراتۆریەتی چینی بۆئەوەی ببنە مەزارگەی کونفوشیوس و قوتابیە بەناوبانگەکانی. ڕێنماییەکانی کونفوشیەت دڵ و کرۆکی تاقیکردنەوەکانی خزمەتی شارستانی پێکدەهێنن لە چین کە دیموکراتیەتی بنیاتنا لە ئەرکە گشتیەکاندا لەپێش چەند سەدەیەك کاتێك ناوچەکانی تری جیهان خەونیان پێوە دەبینی. بنەماڵەی فەرمانڕەوای سانگ sung لە سەدەی دەیەمدا هەتا سەدەی سیانزەیەم هەستا بە کاملکردنی ئەو سیستمی تاقیکردنەوانە کەبەردەوام بوو هەتا ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم. چارلز داروین بەردەوام بوو لە بیرۆکە گشتیەکەی لەبارەی هێز و کاریگەری بیروباوەڕ بە وتەکەی: ((پێویستە شارستانیەتی چینی قوبوول بکرێت وەك نمونەیەکی شێوازی بە ڕادەیەکی گەورەتر لە هەموو شارستانیەتێکی تر لە جیهاندا))(٣١). ئێمە بۆ ئەو دووریە نەچوین هەتا پێوەرێك نەبێت لەڕێگەیەوە پلە دابنێین بۆ شارستانیەتەکان بەپێی چۆنیەتیەکەیان، تەنها بەو برە ڕازین کە ژمارەی وێنە بابەتیەکانمان دەداتێ. بەپێچەوانەی ئەوروپا یان تەنانەت هیند چین توانی یەکگرتویی گەلەکەی بپارێزێت لە یەکبوونێکی ڕامیاریدا کەلە لوتکەی چۆنیەتیەکەیدا ژمارەیەك لە دانیشتوانی لەخۆگرت نزیکەی سێیەکی دانیشتوانی سەر زەویە. ئیمبراتۆریەتی چینی بەردەوام بوو لەژێر فەرمانڕەوایی چەندین خێزانی پادشایی بۆ زیاتر لە دوو هەزار ساڵ، ئەمە ماوەیەکە ئەگەر بەراوردمان کرد بە ماوەی ئیمبراتۆریەتی ئەسکەندەری مەقدۆنی و یولیۆسیس قەیسەر و ناپلیۆن بۆناپرت ئەوا هەست بەوە دەکەین ئەم چەند ئیمبراتۆریەتە بۆ ماوەیەکی زۆر

کورت بەردەوام بوون. ئەگەر ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی ئیمبراتۆریەتی چینیمان لێکدا لە ژمارەی ئەو دانیشتوانەی کەلە خۆی گرتوە لە مامناوەندی ساڵێکدا ئەو ئەو ئیمبراتۆریەتە دەردەکەوێت وەك گەورەترین ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی کاریگەر کە ڕەگەزی مرۆیی توانیویەتی دروستیبکات. ئاسان نیە بڵێین کونفوشیەت بەتەنها بەشداربووە لە دروستکردنی ئەم ڕێکخراوە، چونکە لەگەڵ تێپەڕینی کات بەهاکانی کونفوشیەت تێکەڵ بوو بە بەها گشتیەکانی گەلی چینی بەڕادەیەك جوداکردنەوەیان لەیەکدی بووە کارێکی قورس. کەواتە ئەو کارەی پێی هەڵدەستین بەوپێیە بریتیەلەوەی تێبینی هەندێك لە تایبەتمەندیەکانی کەسایەتی چینی بکەین کە کونفوشیس و قوتابیەکانی بەهێزیان کردوون وێڕای ئەوەی لە سفرەوە دەستیان پێنەکردوە. ئەم تایبەتمەنیانەی کە باسیان دەکەین بەشێوەیەکی ڕوون لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە ژاپۆنەوە بۆ کۆریا و زۆربەی باشوری ڕۆژهەڵات واتە هەموو ئەو ناوچانەی ئاکاری کونفوشیەتیان پێگەیشتوە. دەتوانین دەستپێبکەین بە جەختکردنەوە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی کە تێبینی دەکەین لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە کونفوشیوس یارمەتیدەربوو لە جێگیرکردنیدا. لەڕاستیدا هەموو پسپۆڕێك لە توێژینەوە چینیەکاندا ئەم جەختکردنەوەی تێبینی کردوە، لێرەدا تەنها ئەوەندە بەسە باس لەم دوو دانپیانانە بکەین: ئیتین بالاز Etienne balaz تێبینی ئەوەی کرد ((فەلسەفەی چینی بەگشتی فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتیە)). وینگ تسیت چان wing-tsit chan گەیشت بەو دەرئەنجامەی: ((فەلسەفەی چینی بەشێوەیەکی سەرەکی گرنگیداوە بە کێشە ئاکاری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاریەکان)). بۆئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ چۆنیەتی ئەو ڕەنگدانەوەیە ببینین بەشێوەیەکی پراکتیکی دەتوانین ئاماژەبکەین بەوەی چین لە کیشوەرێك دەچێت وەك ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا. لەڕووکاری دەرەوە چینیەکان هەست بەوەدەکەن پێویستە گونجاوبن لەگەڵ یەکتردا لە هەستکردنیاندا بۆ کات. گومانی تێدانیە ئەمە خاڵێکی بچوکە بەڵام دەتوانێت ڕەنگدانەوەی هەبێت بۆ هەڵوێستە قووڵەکان کەلە پشتیەوە شاردراونەتەوە، بەهەرحاڵ چەند بەڵگەیەکی ترمان لەبەردەستدایە: دوپاتکردنەوەی کۆمەڵایەتی بۆ کونفوشیوس چالاکیەکی کۆمەڵایەتی ئاشکرای بەرهەمهێنا لەنێوان چینیەکاندا، یارمەتیدان بۆ بەدەستهێنانی پێداویستیەکانیان بەشێوەیەکی بەرفراوانتر. مێژوونوسەکان ئەم جەختکردنەوە کۆمەڵایەتیەیان بەرزنرخاند، لەوانەیە دەستپێکردبێت بەدەستپێکردن لە پێویستی چین بۆ پرۆژەکانی ئاودێری لەلایەك و هەڵکەندنی کەندەکی قووڵ بۆ ڕووبارەکانیان لەلایەکی ترەوە. لەم پلەوپایەدا پێویستە ئەو ڕاستیە نەشارینەوە کە چالاکی کۆمەڵایەتی دەشێت جێبەجێ بکرێت بەشێوەیەکی نادروست!. چونکە چەندین حکومەتی داپڵۆسێنەر هەبوو لە چین، بەڵام ئەو چالاکیە کۆمەڵایەتیە چاك بێت یان خراپ بەهەرحاڵ ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە. کاتێك چین بەرەوڕووی تەقینەوە گەورەکەی دانیشتوانی بوویەوە لە چارەکی سێیەمی سەدەی ڕابردودا توانی ڕێژەی لەدایکبوون دیاری بکات لەماوەی سەدەیەکدا. لە سی ساڵدا لەنێوان ساڵی ١٩٤٩ بۆ ١٩٧٩ توانی قاتی و گرانی و لافاو و نەخۆشیە درم و بەربڵاوەکان کۆنترۆڵبکات بەهۆیەوە توانی چواریەکی دانیشتوانی زەوی ڕزگار بکات! هەروەك باسکراوە لە گۆڤاری ئەمەمریکی زانستیدا Scientific american لە ژمارەی ئەیلولی ١٩٨٠ دا: ((ئەمە ڕووداوێکی مەزن بوو لە مێژوودا))(٣٢). لەوەدا پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە بابەتی ئەم کتێبەوە ڕێگایەکی ناوازە لەنێو هەموو شارستانیەتەکانی جیهاندا چین توانی لەڕێگەیەوە بیروباوەڕ و بنەما دژبەیەکەکانی ناو ئایینەکان یەکبخات. لە هیند هەروەك ڕۆژئاوا ئایینەکان سنورداربوون لەبەرئەوە هیچ واتایەك نیە بۆئەوەی کەسێك مەسیحی بێت لە هەمان کاتدا موسوڵمان و جولەکە بێت! هەروەك ناکرێت هیندۆسی و بوزی بێت لەیەك کاتدا، بەڵام چین مامەڵەی لەگەڵ ئەم کارەدا کردوە بەشێوازێکی جیاواز،

چونکە بەپێی نەریت و کلتور هەموو چینیەك کونفوشی بوو لەڕووی ئاکار و ژیانی گشتیەوە، تاوی بوو لە ژیانی تایبەتی و تەندروستیدا، بوزی بوو لە سەرەمەرگدا، لەگەڵ بەشێك لە ئایینی گەلی شامانی لەسەر درێژایی ڕێگاکە. هەروەك یەکێکیان ئەم خاڵەی وت: ((هەموو چینیەك کڵاوێکی کونفوشی لەسەر دەکات، پۆشاکێکی تاویی دەپۆشێت، پێڵاوی بوزیی لەپێ دەکات)). لە ژاپۆن شنتوویەت زیادکراوە بۆ ئەم تێکەڵەیە. بەڵام گرنگی خێزان لە چین کە سیان لە پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکەی کونفوشیەت لەخۆدەگرێت ئەوا ئاشکرایە و پێویستی بە شیکردنەوە نیە. هەندێك لە پسپۆڕانی توێژینەوە چینیەکان دەڵێن، ئەگەر پەرستنی پێشینیان و ملکەچی منداڵ بۆ باوك و دایکمان لەبەرچاوگرت ئەوا خێزان دەردەکەوێت وەك ئایینێکی ڕاستەقینە بۆ گەلی چینی. ناوی مرۆڤ دەستپێدەکات بە ناوی خێزانەکەی، دواتر ناوی تایبەتی دێت، بەوجۆرە خێزانی چینی بەردەوام بوو لە ژیانی بەشێوەیەکی باش هەتا سەدەی بیستەم، هەروەك ئەم ڕاپۆرتە شایەتی دەدات لەسەر ئەوە: ((خێزانی گەورە هەشت نەوە لەخۆ دەگرێت، لەوانە برا و مام و خاڵ، باوکی مام و باوکی خاڵ (واتە باپیران لەلایەنی باوك و لەلایەنی دایکەوە)و منداڵ و نەوە و منداڵی نەوەکان. لەوانەیە نزیکەی سی باوك هەریەکەیان لقەکانی خۆی بەدەستپێکردن لە باپیرانەوە بۆ نەوەکان، لە ماڵێکی خێزانی گەورەدا وەکو تاکە خێزانێکی گەورە))(٣٣). دەستەواژە چینیەکانی پەیوەندیە خێزانیەکان بەهەمان شێوە ئاڵۆزە، چونکە برا بەیەك دەستەواژە دەردەبڕدرێت کە بە نەگونجاو دادەنرێت بەڵکو پێویستە دوو وشە بێت بۆ دیاریکردنی ئەوەی ئایا برا بچوکە یان گەورە سەبارەت بە قسەکەر، هەمان شت سەبارەت بە خوشك و پور و خاڵ و مام و باپیرە و داپیرە، چونکە چەند وشەیەکی جیاواز هەیە پێویستە زیادبکرێن بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی ئەم پەیوەندیانە ئایا لە لایەنی باوکەوەن یان لە لایەنی دایك، لە دەرئەنجامدا چەند نازناوێکی تایبەت هەیە بۆ سەد و پانزەپەیوەندی نزیکی جیاواز لە خێزانێکی چینی فراوانی گەورەدا. دەشێت پەیوەندیە خێزانیەکان زۆر بەهێزبن هەتا شوێنەوارێکی خنکێنەر جێبهێڵن لەسەر تاکەکانی خێزان، بەڵام سەبارەت بە ئاسیاییە ڕۆژهەڵاتیەکان ئەو پەیوەندیە خێزانیە بەهێزانە چەندین سوودی دابین کردوە بۆ تاکەکانی خێزان کە هێشتا بەردەوامە هەتاوەکوئەمڕۆ. ئەوکاتە دابەزینی ڕێژەی ئەنجامدانی تاوان ولەناو نیشتیمان کەمدەکات چونکە سەبارەت بە ڕێژەی تاوانی دزیکردن لە ژاپۆن بۆ نمونە لە سەدایەکی ڕێژەکەیەتی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، هەروەك تۆمارێکی ناوازە هەیە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە کۆچەریەکان لە نیشتمانەکەیانەوە کۆچدەکەن بۆ وڵاتانی تر، بەوەی ڕێژەی تاوان تیایاندا کەمدەکات لەکاتێکدا بەشداریکردنیان و جموجوڵیان لەبەرزبوونەوەدایە. هێشتا کەسە نزیکەکان بەشدارن لە یارمەتیدانی ناسراوەکانیان لە بواری فێرکردنیاندا، هەرچەندە لەیەك دووربن. مەیلی لەڕادەبەدەر بەرەو کەسی گەرەتر لە تەمەندا لە پێنج پەیوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەکەی کونفوشیوسدا لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی ڕێزگرتن لە تەمەن لەلای ئاسیاییە ڕۆژهەڵاتیەکان بۆ هەڵوێستێك دەگات بە ئاستی بەپیرۆز زانینن و ڕێزگرتن لێی. لە ڕۆژئاوا کاتێك کەسێك دان بەوەدا دەنێت تەمەنی گەیشتوەتە پەنجا ساڵان ئەوا ئەو وەڵامەی دەیدرێتەوە زۆربەی کات: ((تەمەن وا دەرناکەوێت کە چل ساڵت تێپەڕکردبێت ئەگەر بەتەنها ساڵێك بێت)). بەڵام ئەدەبی چینی کلتوری لەم حاڵەتەدا بریتیەلەوەی ئەو کەسە گوێ لەو قسەکەرە بگرێت و بڵێت: ((بەڵکو بەتەواوی وەکو کەسێکیت گەیشتوەتە شەست ساڵان)). لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی ڕابردودا، کەسێکی بەتەمەن سەردانی ژاپۆنی کرد کاتێك کەسێکی ژاپۆنی لێی پرسی: چۆن بوویتە کەسێکی دانا؟ پرسیارەکە شڵەژانێکی دروستکرد لەلای میوانە بەتەمەنەکە ئەمە وای لە ژاپۆنیەکە کرد هەست بە هەڵەی زمانەوانیەکەی بکات لەشێوازی پرسیارکردنەکەیدا لە داوای لێبوردنکردندا لەبارەی هەڵە زمانەوانیەکەی،

ژاپۆنیەکە ئەم هەڵەی ڕوونکردەوە بۆ میوانەکە و تێیگەیاند مەبەستی ئەوە بووە بپرسێت لێی تەمەنی چەندە! ئەگەر ئەم هەڵوێستەمان بەراورد کرد بە هەڵوێستی سەبارەت بە تەمەن ئەوا هەست بە جیاوازیەکی گەورە دەکەین. لەبەرەنگاربوونەوەی بۆ دابەزینی دارمانی جەستە لەگەڵ زۆربوونی تەمەندا، چین چەند پەیکەرێکی کۆمەڵایەتی دانا کە یارمەتیدەرە لە شادومانکردنی ڕۆح و چالاککردنیدا. لەگەڵ تێپەڕینی هەموو ساڵێك لەتەمەنی کەسی بەتەمەن گرنگی زیاتری پێدەدرێت لەلایەن خێزانەکەی و کەسەنزیکەکانیەوە، هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، چاودێری زیاتر بەدەست دێنێت لەگەڵ گوێگرتن لێی و ڕێزگرتنی. هێشتا بیروباوەڕی ناوەندی کونفوشیەت بەردەوامە هەتا ئەمڕۆ دەیبینین لە پەسەندکردنی چینی بۆ قسەلێکردن و میانڕەوی لەبەرامبەر پەنابردن بۆ هەڵوێستە توندوکانز هەتا ئەم سەردەمە سەیری کاری یاسایی دەکرا وەك شتێکی قێزەون و بێزراو و وەك دانپیانانێك بۆ شکستی مرۆڤ لە توانایدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بەیەکسانی بۆ ناکۆکیەکانی نێوان تاکەکانی خێزانێك. ئامارمان لەلانیە سەبارەت بە چین بەڵام لەناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا ئامارەکان ڕێژەی پارێزەرەکان دەخەنەڕوو لە ژاپۆن کەبە ڕێژەی یەك پارێزەرە بەرامبەر بە هەموو بیستوچوار پارێزەرێك لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا. کێشەی مەیلی قسەلێکردن لەگەڵ دیاردەی ڕۆژهەڵاتی تایبەت کە دەناسرێت بە ناوی ئابڕوو، بەوەی لە چوارچێوەی قازانج/زیاندا پەیوەستە بە دوا بڕیاری دادگا، بڕیاردان بەرامبەر بە لایەنی دۆڕاو بە بڕیار دادەنرێت لەسەر ئابڕووی، ئەمە شتێکی زۆر خراپە چونکە ئەگەر بتەوێت بژیت لەنێو هەلومەرجێکی خۆشەویستانەدا لەگەڵ خزم و کەسە نزیکەکانت ئەوا پێویستە بیانپارێزێت لە برینداربوون و بەدڕەفتارکردن لەگەڵیان لەڕووی دەروونیەوە. لێرەدا وین wen هەیە واتە بڕوای کونفوشیوس بەوەی فێربوون هیچ نیە جگەلە پاککردنەوەی ڕووکاری دەرەوە بەڵام وزەکان کۆمەڵگاکان و دڵی مرۆڤەکان دەگۆڕێت. چین گەیشتوە بەم بڕوایە بەوهۆیەوە چینی زانایان لەسەر لوتکەی هەرەمی کۆمەڵایەتی و سەربازەکانی خستوەتە بنکەکەیەوە. لەوانەیە مرۆڤ بپرسێت ئایا لە جێگایەکی تری جیهان جگەلە تیبت لەماوەی ساڵەکانی سەرەتای مێژووی ئیسلام هاوشێوەی ئەو هەوڵدانە هەیە بۆ جێبەجێکردنی نمونەی ئەفلاتون لەبارەی پادشای فەیلەسوفەوە. ئەمە تەنها هەوڵدانێك بوو بەڵام لێرەو لەوێ و لەنێوان سەردەمێك و سەردەمێکی دیکەدا ئەم هەوڵدانە کاریگەری خۆی هەبوو. چەندین سەردەمی ئاڵتونی هەبوون لە چین کە تیایدا هونەرەکان پەرەیانسەند بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، بەدەستهێنانی فێرکاریەکی قووڵ بۆ هونەری نوسین، هونەری وێنەکێشان هەروەك ئەوەی بەخەیاڵدا دێت بەخێرایی: هونەری سەماکردنی چالاککەری ژیان تای چی چوان tai chi chuan. چینیەکان کاغەزیان داهێنا، چاپکردنی جوڵاو دۆزرایەوە لە چین پێش چەندین سەدە لە گۆتنبرگ. لێرەدا ئینسایکلۆپیدیایەك چینی هەیە تەمەنی پانزە سەدەیە، بە لوتکەی توێژینەوەکان دادەنرێت بەدرێژایی دوو هەزار ساڵ، ژمارەی بەرگەکانی گەیشتە ١١٠٩٥ بەرگ. هەروەها لە چین جوانترین هۆنراوەکان نوسراونەتەوە لەگەڵ وێنەکان کەلەسەر سیرامیك کێشراون، ((کە دەکرێت دابنرێت بە جوانترین و باشترین دەفری لە هەموو جیهان بەهۆی ناسك و جوانی شێوازەکانی و لێهاتویی و ووردی لە کێشانی وێنەکانی سەر دەفرەکان))(٣٤). ئەو ڕەگەزە هونەریانە وین wen یان بەرهەمهێنا لەگەڵ تێکەڵکردنی بە هونەری خودی ژیان لە کونفوشیەتدا ڕۆشنبیریەکی خاوەن تام و چێژێکی تایبەت ئەمە تێکەڵەیەکە لە میهرەبانی و لێزانی. چینیەکان بەردەوام بوون لە بەتوانایی لەسەر دەرکپێکردن و پەیڕەوی کەلە لوتکەدا بوو بەبێ ڕکابەر. چین بەهۆی بوونی گەورەترین سنوری کراوەوە بەبەراورد بە هەموو شارستانیەتە گەورەکان بەرەوڕووی چەندین شەپۆلی یەکلەدوای یەکی هێرشی بەربەریەکان بووەوە کە هەمیشە ئامادەبوون بۆ هێرشکردنەسەر جوتیارەکان کە

پەیوەست بوون بە زەویەکانیانەوە، تەتارەکان لەدەرگاکانی چینیاندا بۆ چەندین جار، هەر تەتار بوون کەلە یەکێك لە پەلاماردانەکانیاندا ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانیان ڕوخاند بۆ هەمیشە، بەڵام لە چین وێڕای ئەوەی چینیەکان نەیاتوانی بەرەنگاریان ببنەوە بەڵام توانیان هەڵیان بمژن بۆ ناو شارستانیەتەکەی خۆیان. هەر شەپۆلێکی هێرشبەرەکان بۆ سەر چین کۆتایی دەهات بە توانەوەی لایەنی شارستانیەتی هێرشبەر لەناو شارستانیەتی چیندا ئەوان سەرسام بوون بەوەی بینیان لە چین جار لەدوای جار کەسی هێرشبەر یان داگیرکەری نەخوێندەوار کە تاکە ئامانجی تاڵانکاری و وێرانکردنەلە کۆتاییدا چۆك دادەدا بۆ شارستانیەتی ئەو وڵاتەی چووەتە ناوی لەماوەی چەند ساڵێکدا یەکەم هیوای نوسینی هۆنراوەیەکە کە فێری بووە لە مامۆستاکەیەوە بەجۆرێك ڕەفتاری دەکرد کە خەڵکی ناوچەکە گومانی ئەوەیان دەبرد ئەویش چینیەکی ڕاستەقینەبێت نەك داگیرکەر!. ڕوووترین نمونە لەسەر ئەوە قوبلای خانە Kublai Khan کە چینی داگیرکرد بەڵام داگیرکرا لەلایەن شارستانیەتی چینیەوە، لەبەرئەوەی سەرکەوتنەکەی یارمەتیدەری بوو لە بەدیهێنانی مەرامەکانی لەوەی ببێتە کوڕی ڕاستەقینەی ئاسمان. بەڵام ئەم جادووە بەردەوام نەبوو، چونکە لە سەدەی پانزەیەمدا شارستانیەتی چینی هێشتا شارستانیەتێکی ناوازە بوو لە هەموو ناوچەکانی جیهان، بەڵام بەرەوی پوکانەوە و نەمان دەچوو پێویستە دوو سەدەی کۆتایی لەو ماوەیە لابرێت چونکە ڕۆژئاوا بەهۆی تەکنیکی سەربازیەوە چارەنوسی چینی دەرهێنا لەنێو دەستەکانیدا. گفتوگۆکردنی کونفوشی هیچ مەبەستێکی نیە لەنێو چوارچێوەی ئەو جەنگەی ڕۆژئاوا کردیە سەر چین تیایدا ئافیون و تریاك سەپێنرا بەسەر چینیەکاندا کە دواتر بووەهۆی دابەشبوونی چین بۆ چەن ناوچەیەك لەژێر کاریگەری ئەورووپیدا. هەتا هێنانی مارکسیەت لە سەدەی بیستەمدا، پێویستە سەیری بکرێت وەك هەوڵدانێکی شکستخواردوو لە چینەوە بۆ دوبارە بەدەستهێنانەوەی سەربەخۆییەکەی کە لەدەستیداوە. سەبارەت بە کاریگەری کونفوشیەت پێویستە سەیری سیاسەتەکانی چین نەکەین لە سەدەی بیستەمدا، بەڵکو پێویستە سەیری ئەو ڕووداوە ئابوریە بکەین کە ڕوویدا لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیای مەزن لەم چل ساڵەی دواییدا. ئەگەر ژاپۆن و کۆریا و تایوان و سەنگافورەمان وەرگرت پێکەوە کە هەموویان ئاکاری کونفوشی بونیادی ناون ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەم دەوڵەتانە دادەنرێن بە ناوەندی داینامیکی بۆ نەشونمای ئابوری لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا (پڵنگەکانی ئاسیا)—ئەمە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە لەسەر ئەوەی ڕوودەدات کاتێك تەکنەلۆژیای زانستی پەیوەندی هەیە بەوەی دەکرێت ناوی ببەین بە تەکنەلۆژیای کۆمەڵایەتی بۆ ئاسیاییە ڕۆژهەڵاتیەکان. تاکە ئامارێك لە ڕاپۆرتی پەیامنێرێکدا سەبارەت بە ڕوداوێکی ڕۆتینی کلیلی تێگەیشتنی چۆنیەتی کاریگەری ئەو تەکنەلۆژیا کۆمەڵایەتیەمان پێدەدات. لە ساڵی ١٩٨٠ز دا کرێکارە ژاپۆنیەکان ڕێژەی ٥، ١ یان وەرگرت بەتەنها لە ڕۆژانی پشوودا بەشێوەیەکی ساڵانە کە دەگاتە ١٢ ڕۆژ لەبەرئەوەی بەپێی گێڕانەوەیان: ((پشووە زۆرەکان قورسایی زۆری دەخستە سەر شانی هاوەڵەکانیان!. ))(٣٥). بەڵام سەبارەت بەو ڕاپۆرتەی کە بەدوای ئەودا دێت: کاتژمێر شەشی بەیانی ڕۆژێك لەی ڕۆژەکانی بەهار. لەبەردەم ئێستگەی سەرەکی لە شاری کیوتو kioto شەش پیاو دەوەست لەنێو بازنەیەکدا و گۆرانی دەڵێن. هەموویان کراسی سپیان لەبەرکردوە و بۆینباخی ڕەشیان بەستوە، پانتۆڵی ڕەشیان لەپێدایە لەگەڵ پێڵاوی ڕەشی بریقەدار. یەکێکیان بەڵێننامەیەك دەخوێنێتەوە جەختدەکاتەوە لەسەر نیەتپاکیان لە خزمەتکردنی کڕیارەکانیان و خزمەتکردنی کۆمپانیاکەیان، خزمەتکردنی شارەکەیان کیوتو، خزمەتکردنی ژاپۆن و خزمەتکردنی هەموو جیهان. ئەوان شۆفێری تاکسین کە بەپێی پێویست بە کارەکانیان هەڵدەستن(٣٦). لەمەی دواییدا ڕاپۆرتێکی ترە لە کیوتووە کە پەیوەندی نیە بە کێشەی بەرهەمهێنانەوە، بەڵام ئاماژە دەکات بۆ

ئەو ڕەوشتەی ڕۆژهەڵاتیەکان ناوبانگیان بەهۆیەوە وەرگرتوە: ((لە ژاوەژاو و قەرەباڵغی هاتوچۆی کیوتۆدا، ڕوودوایێکی پێکدادان لەنێوان دوو ئۆتۆمۆبێلدا ڕۆدەدات کە دەبێتەهۆی زیان گەیاندن بە هەردوکیان هەردو شۆفێرەکە لە ئۆتۆمبێلەکانیان هاتنەدەرەوە بۆئەوەی هەریەکەیان بۆئەوی دیکە بچەمێتەوە بۆئەوەی داوای لێبوردن بکات لەو پشتگوێخستنەی بووە هۆی ئەم ڕووداوە. )) ئەمە لە پاشماوەکانی ڕۆحی کونفوشیەتە کە هێشتا ماوەتەوە هەتا ئەمڕۆ، بەڵام مرۆڤ دەپرسێت ئایا بەتێپەڕینی کات کاڵ ببێتەوە و نەمێنێت کەواتە داهاتووی ئەم ئایینە چیە لە جیهانێکدا کە بەردەوامە بەڕۆژئاوایی کردن بەشێوەیەکی ڕێکخراو؟ کەس وەڵامی ئەم پرسیارە نازانێت. لەوانەیە لەبەردەم ئایینێکدا بین کەلە سەرەمەرگدایە. ئەگەر بەمشێوەیە بێت ئەوا واباشە ئەم بەشە کۆتایی پێ بهێنین بە وشەکانی کونفوشیوس کەلەسەر خۆی جێبەجێی کردبوون کاتێك چاوەکانی داخست بۆ دواهەمین جار کە دوا نیگای کردە سەر گومەزی مەزنی تای شان tai shan چیای پیرۆزی چین: چیا پیرۆزەکە دەڕۆخێت تیشکەکە دەشکێتەوە پیاوە داناکە سیس دەبێت. بەڵام لە لایەکی ترەوە پێغەمبەران شێوازی تایبەتیان هەیە بۆ ژیان کە زۆر درێژترە تەمەنیان لە ژیانی کەسە سیاسیە مەزنەکان، چونکە گاندی زیاتر مایەوە لە نەهرو، وادیارە کونفوشیوس زیاتر دەمێنێتەوە لە ماو تسی تونگ.

## کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر:

١-کتێبی ئایینی چینی لە نوسینی لۆرانس ج. تومبسۆن نیگایەکی گشتیمان دەداتیٚ لەسەر ڕەهەندی ئایینی لە چین بەشێوەیەکی گشتی.

٢-سەبارەت بە وەرگێڕانی دەقە کونفوشیەکان، باشتروایە کتێبی هەڵبژێردراوە ئەدەبیەکانی کونفوشیوس بخوێنیتەوە لە نوسینی ئارسەر ویلیز و کتێبی مینیسیوس لە نوسینی دی سی لاو.

٣-سەبارەت بە نوسینە فەلسەفیەکان کتێبی گفتوگۆکانی تاو لە نوسینی ئی سی گراهام بە باشترین شێوە مێژووی گشتی فیکری چینی دەخاتەڕوو لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا.

٤-لە بەشی پڕۆژەی کونفوشیدا بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر پشتم بەست بە نوسینەکانی زانای هاوچەرخی کونفوشی تو وی مینگ tu wei ming بە تایبەتی هەردو کتێبی فیکری کونفوشی و مرۆڤایەتی و بەرەوشتکردنی دەروون.

٥-کونفوشیەتی نوێم چارەسەرنەکردوە وەك بابەتێکی داهاتوو لەم بەشەدا، ئەمە بزوتنەوەیەکی گرنگە دەستیپێکردوە لە سەدەی هەشتەمی زایینیدا، پەرەیسەند لە هەردو سەدەی یانزەهەم و دوانزەهەمدا، سەرلەنویٚ کونفوشیەتی دارِشتەوە لەژێر کاریگەری تاوییەت و بوزییەتدا، چەندین لێکۆڵەرەوەی بەرهەمهێنا کەتا ئەمڕۆ بەردەوامن. زانایانی نوێی کونفوشی کاریانکردوە بەشێوەیەکی تایبەت لەسەر پەرەسەندنی تێڕوانینی گەردونی کە هاوشانی تێڕوانینی گەردونیە لە بوزییەتدا، وەك سیستمێك لە فەلسەفەی ئاکاری کە ئاکاری کونفوشیەت دەخاتەڕوو بە چەند دەستەواژەیەکی میتافیزیقی. ئەم چیرۆکەیان بەشێوەیەکی گشتی خراوەتەڕوو لە کتێبی پەرەسەندنی فیکری کونفوشینویٚ لە نوسینی کارسونگ چانگ.

٦-کتێبی کونفوشیوس ((عەلمانیەت وەك شتێکی پیرۆز)) لە نوسینی هیربرت فینگاریت دادەنرێت بە کتێبێکی نمونەیی چونکە نوسەرەکەی یەکێکە لە دیارترین فەیلەسوفە هاوچەرخەکان کە گفتوگۆیان کردوە لەسەر بیرکردنەوەکانی کونفوشیوس لەبەر گرنگیە مێژوویەکەیان نیە بەڵکو (بەپێی وتەکانی فینگاریت) بەهۆی ئەوەی: ((بیرمەندێك بووە خاوەن بینینێکی لێکدەرەوە بووە بۆ مرۆڤ هاوشانی نیە لە مەزنیدا لەلای هیچ بیرمەندێکی تر)).

## پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی کونفوشیەت

1. the analects of Confucius، VII: 1. هەڵبژێردراوە ئەدەبیەکانی کونفوشیوس

2. the doctrine of the mean، chapter 13. a statement comparable in spirit is found in the analects، XIV: 28.

3. the analects، VII: 33.

4. the analects، passim.

٥. هەروەك رۆس بینیدیکیت ruth benedict دەیگێڕێتەوە.

6. arthur waley، the way and its power، (London: allen&unwin، 1934. reprint. 1958)، 32.

**٧. هەڵوێستی ڕاستەقینەخوازەکانم وەرگرتوە لێرەدا دەیخەمە ڕوو لەڕێگەی تێڕوانینی مێژوونوسە  کونفوشیە ڕەسەنەکانەوە.  لەوانەیە هەندێك لە زانایان  ئەم وێناکردنە  بۆ بیرکردنەوەی ڕاستەقینەخوازەکان بە شتێکی گاڵتەئامێز دادەنێن تاڕادەیەك بەڵام هەڵچونیان بەگشتی بەرەو ئەو ئاڕاستەیەی باسکراوە  شتێکی دوپاتکراوەیە و کومانی تێدانیە.**

1939.  reprint.  ،three ways of thought in antient china ،8. quoted in Arthur waley .199 ،1963) ،(London:  allen & unwin

.74 ،the way ،as quoated in waley ،9. han fei tzu

.162 ،the way ،10. waley

**١١. وێڕای ئەوەی خۆشەویستی واتای وشەی ئای کەواتە ئێس.  گراهام دەستەواژەی گرنگیپێدانی ئاڵوگۆڕکراو بەکاردەهێنێت یان گرنگیدان بە هەموو تاکێك لە وەرگێڕانیدا بۆ وشەی ئای، بەجۆرێك وادەبینێت ئەمە وەرگێڕانێکی گونجاوتر و ڕاستگۆترە لە (ئارەزوی گەیاندنی سود)بە خوێندنگای موهیەت.**

ct:  ،1929.  reprint (west-port ،the neglected rival of confucious ،motes ،12. yi-pao mei 80f ،1973) ، hyperion press

145 ،89 ،motes ،13. ye-pao mei

83 ،motes ،14-ye-pao mei

**١٥–هەڵدەستم بە چارەسەرکردنی ئەم وەڵامانە بەشێوەیەکی ڕێکخراو بەمەبەستی ئاسانکردنی شێوازی خستنەڕووی بیرۆکەکە، نەك بەپێی ڕێکخستنێکی کاتی ڕاستەقینە، لەکاتێکدا لەدوای مردنی کونفوشیوس ئەو پرسیارانە دانران کە ڕەتیکردنەوە بەم ڕێکخستنە.  ئەوەی ماوەتەوە لەسەر قوتابیەکانی ئەوانەی دوای هێڵە گشتیەکان کەوتن کە مامۆستاکەیان بۆی کێشابوون بۆئەوەی بیری ئەو بەڵگە ئاشکرایانەیان هەبێت دژ بەو وەڵامانە.**

.p. 43 ،1989) ،il:  open court ،disputers of the tao (la sale ،16. A. C. Graham

.1955) ،brown & co.  ،the public philosophy (boston:  little ،17. walter lippinann

.161 ،the way ،18. waley

،9 ،1947) ،ct:  yale university press ،tides from the west (new haven ،19. chiang molin .19

1938.  reprint  ،the analect  of cofucious ،as quoted ky Arthur waley ،20. confucious .28 ،1956) ،(London:  allen&unwin

.21. the analects.  XII: 2; XV: 24

**٢٢. دەستەواژەکانی کوزنفوشیوس لەبارەی باوك/کوڕ و برای گەورە/برای بچوك زۆرن بۆئەوەی وایان لێبکات جێبەجێ بکرێن زیاتر لە هەستیاریە هاوچەرخە نوێکان.  بەڵام من وابیرناکەمەوە بەمجۆرە سوکایەتی دەکەم بە مەبەستی ڕاستەقینەی کونفوشیوس.**

.XVII: 9 ،23. The analects

.II: 17 ،24. the analects

.XI: 11 ،25. The analects

26. The analects، IX: 5.

27. The analects، III: 13.

28. Tu Wei-ming، 484 :(august 1989) the world and I.

30. charles galton darwin، the next milion year (garden city، ny: double day، 1953).

31. ding chen the economic development of china، sientific american (september 1970): 152.

32. F. C. S Northrop، the tamingof the nations (new york: macmillan، 1953)، 117.

33. maxine hong kingston، the woman warrior (new york: random house 1989)، 12.

34. the option of a kowledgeable collecter as qoutedin rene grousset، the rise and splendour of the chinese empire، 1953. reprint (berkeley: university of california press، 1965)207.

35. newspaper columnist georgie anne geyer، from tokyo، augest 13، 1983.

36. east west journal (december 1979).

٥

# تاوییەت

**هیچ شارستانیەتێك تاك ڕەنگ نیە. لە چیندا ئاڕاستە و شێوازە کلتوریەکانی کونفوشیەت تەنها بە تارماییە ڕۆحیەکانی بوزییەت هاوسەنگ نەکراون بەڵکو هەروەها بە ڕەنگە ڕۆمانسیەکانی تاوییەت.**

## مامۆستا دێرینەکە

بەپێی گێڕانەوە گوازراوەکان تاوییەت کەبە (داویە) دەخوێنرێتەوە بونیادنراوە لەلایەن پیاوێکەوە کە ناوی لاو تسوە lao tzu، وەك دەگێڕنەوە لەدایکبووە لە نزیکەی ساڵی ٦٠٤ پ. ز. . ئەمە کەسایەتیەکی نادیارە هیچ شتێکی دوپاتکراوەی لەبارەوە نازانین، بەڵکو زانایان دەپرسن ئایا لەڕاستیدا بوونی هەبووە!. ئێمە تەنانەت ناوە ڕاستەقینەکەی نازانین، چونکە ئاشکرایە دەستەواژەی لاو تسو کە دەکرێت وەربگێڕدرێت بۆ واتای پیاوی بەتەمەن یان هاوەڵی بەتەمەن تەنها نازناوێکە بۆ ڕێزلێنان و ناوێکی تایبەتی نیە. هەموو ئەوەی لەبەردەستمانە قسەی بێمانا و ئەفسانەیە، هەندێکی خەیاڵیە: وەکو ئەوەی دەوترێت نەیزەکێك هێناویەتی، هەر لەوێدا واتە لەناو نەیزەکەکەدا ماوەتەوە بۆ ماوەی بیستو دوو ساڵ، دواتر لەدایکبووە بەپیری سەرسپی و دانا بووە هەر لە سەرەتاوە. بەشەکانی تری چیرۆکەکە دور نین لە باوەڕهێنان پێیان: وەك بەرپرسێك کاری کرد لە پاراستنی تۆمارەکان لە هەرێمە ڕۆژئاواییەکەیدا، لەڕێگەی ئەم کارەیەوە ژیانێکی سادەی بردەسەر. هەموو سەرئەنجامەکان پەیوەستن بە تاکە کتێبێکی قەبارە بچوکەوە دەوترێت ئەو خاوەنیەتی.

بەشێك لەم کتێبە ئەو دەرئەنجامەمان بۆ دەخاتەڕوو کە ئەم کەسە سۆفیەکی گۆشەنشین بووە سەرقاڵی تێڕامان و بیرکردنەوە بووە.

تاکە وێنەیەك کە تێی دەگەین و باوکی مێژوونوسە چینیەکان سوما شین ssu-ma ch'ienگواستویەتیەوە لەو هەڵسوکەتە نادیارەی لەدوای خۆی جێیهێشتوە بەوەی بیرکردنەوەی قووڵ بووە. بەپێی ئەم گێڕانەوەیە جارێك کونفوشیوس سەردانی کردوە. بەپێی ئەو گێڕانەوەیە وتراوە ئەمە پیاوێکی نادیارە بەڵام شایستەی ڕێزلێگرتنە. وتی: ((دەزانم باڵندە دەتوانێت بفڕێت، ماسی دەتوانێت مەلە بکات، دەزانم گیاندارەکان دەتوانن ڕابکەن. ئەو بوونەوەرانەی دەتوانن ڕابکەن دەکرێت بە تۆڕ ڕاوبکرێن، ئەوانەی مەلە دەکەن بە داو نانەوە بۆیان ڕاودەکرێن، ئەوانەی دەفڕن بە ڕم ڕاودەکرێن، تەنها ئەژدیها نەبێت ئەوە لە سنوری زانیاریەکانمدا نیە، ئەو بە ئاسماندا بەرزدەبێتەوە، ئەمڕۆ لاو تسوم بینی کە وەکو ئەژدیهایە. )).

وێنە کلتوریەکە تەواو دەکرێت بەو ڕاپۆرتەی نوسراوە تیایدا لاو تسو lao tzu دڵتەنگ بوو بەو ڕق و کینە و دوبەرەکیەی لە گەلەکەیدا هەیە لەبەرئەوە گۆشەگیری هەڵبژارد لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا، چووە سەر پشتی کەرکەندەنێك و بەرەو ڕۆژئاوا کەوتەڕێ کە ئێستا بە تیبت tibet ناسراوە، بەڵام لە دەروازەی هانکاو hankao pass دەرگاوانەکە هەوڵیدا ڕازیبکات تا بگەڕێتەوە بۆ نیشتیمانەکەی بەڵام کاتێك نەیتوانی ڕازیبکات داوای لێکرد بەلایەنی کەمەوە تۆمارێکی بۆ جێبهێڵێت لەبارەی بیروباوەڕیەوە لەو شارستانیەتەی لەگەڵ خۆیدا دەیبات، لاوتسو ڕازی بوو ئەم کارە بکات بەوهۆیەوە بۆماوەی سێ ڕۆژ گۆشەگیربوو دواتر بە کتێبێکی

بچوکەوە گەڕایەوە کە لە پێنج هەزار وشە پێکهاتبوو لەژێر ناونیشانی تاو تی چینگ tao te ching یان ڕێگا و هێزەکەی، ئەمە شایەتیەکە بۆ حاڵەتی بوونی مرۆیی لە نیشتیمانەکەیدا. دەکرێت ئەم کتێبە بخوێنرێتەوە لە ماوەی نیو کاتژمێردا، هەروەها دەکرێت بخوێنرێتەوە بەدرێـژایی تەمەن، ئەم کتێبە وەکو دەقێکی سەرەکی بۆ بیری تاوییەت ماوەتەوە هەتا ئەمڕۆ.

چەندە وێنەیەکی نامۆیە لەبارەی بونیادنەری ئایینێك لە ئایینەکانی جیهان. پیاوی بەتەمەن نە موژدەدەر بوو نە ڕێکخەر، بەڵکو ئەو کارەی پێی هەستا بریتی بوو لەوەی چەند لاپەڕەیەکی نوسی لەسەر داوای دەرگاوانەکە و دواتر چوە سەر پشتی گامێشەکە و ڕۆیشت، ئەمە هەموو شتێك بوو سەبارەت بەوەی پەیوەندی هەیە بەو کەسایەتیەوە. چەندە جیاوازە بەبەراورد بە بوزا کە ڕێگا تۆزن و خۆڵاویەکانی هیندی بڕی بەدرێـژایی چل ساڵ تەنها لەپێناوی ئەوەی بیروباوەڕەکەی ڕوونبکاتەوە و بڵاویبکاتەوە، چەندە جیاوازە لە کونفوشیوس کە فەرمانڕەواکانی هەراسانکردبوو لەکاتێکدا هەوڵی دەدا بۆ بیرۆکەکانی هەلێك بڕەخسێنێت هەتا گوێی لێبگیرێت. بەڵام لێرەدا پیاوێك هەیە هیچ گرنگیەك نادات بە سەرکەوتنی بیرۆکەکەی، جگە لە گرنگیدان بە ناوبانگ و سامان و دارایی، تەنانەت بۆ تەنها جارێك نەوەستا بۆئەوەی وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە، وێڕای ئەوە ئەگەر ئەو چیرۆکەی ژیانی ڕاستەقینە بێت یان خەیاڵی ئەوا زۆر بەڕاستی دەمێنێتەوە سەبارەت بە هەڵوێستی تاوییەت کە کردیە بەشێك لە تاوییەت بۆ هەمیشە، هەموو ئیمبراتۆرێك ئەم کەسایەتیە بە نادیار دەزانێت لە باوباپیرانیەوە، تەنانەت زاناکان وێڕای ئەوەی دەزانن تاکە دەستێك کتێبی تاو تی چینگی نەنوسیوەتەوە tao te ching هەروەها باوەڕیان بەوە نیە ئەو شێوەیەی ئێستای وەرگرتوە پێش نیوەی دووەمی سەدەی سێهەمی پ. ز. بەڵام هاوڕان لەسەرئەوەی بیرۆکەکانی بەیەکدەگەن لە خاڵێکدا پێویستی بە بوونی کەسێك هەبێت لەوێدا، کتێبەکە شێوەیەکی وەرگرت لەژێر کاریگەری ئەودا، لاریمان نیە کە ناوبرێت بە لاو تسو.

## سێ واتاکەی تاو Tao

**کاتێك کتێبی پیرۆزی تاوییەت دەکەینەوە: تا تی چینگ یەکسەر هەست بەوە دەکەین هەموو شتێك تیایدا لەبارەی واتای خودی تاوە. ئەم وشەیە لەڕووی زمانەوانیەوە بە مانای ڕێگا یان شێواز دێت. بەڵام سێ واتا هەیە کە دەشێت ئەم وشەیە هەڵگریان بێت.**

**یەکەم، تاو بەمانای ڕێگای ڕاستی ڕەها دێت. ئەم تاوە دەرکی پێناکرێت بەشێوەیەکی ڕوون چونکە زۆر فراوانترە لەوەی ئەقڵی مرۆیی تێیبگات. کتێبی تاو تی چینگ لە یەکەمین دێڕیدا ئاشکرای دەکات ئەو وشانەی لەبارەیەوە دەدوێت یەکسان نیە پێی:**

**((ئەو تاوەی دەکرێت لەبارەیەوە بدوێین تاوی ڕاستەقینە نیە)) وێڕای ئەوە ئەم تاوەی کە لەسەروو باسکردن و وەسفکردنەوەیە بنەڕەتی هەموو ئەو شتانەیە کە دواتر باسدەکرێن. ئەو لەسەروو هەموو شتێکەوەیە، لەپشت هەموو شتێکەوەیە، لەژێر هەموو شتێکەوەیە، ئەو بەزەییەی لێوەی هەڵقوڵاوە و هەموو ژیانێك دەگەڕێتەوە بۆی. نوسەری کتێبی تاو تی چینگ ترسی لێ نیشت بەهۆی مەزنی و شکۆداری ئەم تاوە کە لێوانلێوە لە نهێنی بەوهۆیەوە کەوتە پیاهەڵدانی، گومانی تێدانیە بیرۆکەی تاوی سەرەتایی نهێنی بنەڕەتی ژیانی خستەڕوو: ((چەندە ئاشکرایە! چەندە هێمن و لەسەرخۆیە! ئەو هەمیشە بوونی هەیە هەر لە جاویدارەوە))، ((گونای تێدا نیە تاو گەورەترە لە هەموو شتە گەورەکان)). لەگەڵ ئەوەدا ناکرێت نکوڵی بکەین لەوەی کە لەسەروو هەموو وەسفکردنێکەوەیە، لەبەرئەوە جارلەدوای جار سەرزەنشتی ئەو کۆتاییە دوبارەبووەی بیروباوەڕی تاوییەت دەکەین کە دەڵێت: ((ئەوانەی دەزانن هیچ ناڵێن، ئەوانەی دەدوێن هیچ نازانن))(١).**

**دووەم، وێڕای ئەوەی تاو بیرۆکەیەکی باڵایە بەشێوەیەکی بێسنور بەڵام لەهەمان کاتدا ناوەکیە و خودیە. بەم واتایە تاو بەرنامەی گەردونە، سیستمە، میلۆدیە، هێزی بزوێنەرە لە هەموو سروشتدا، بنەمای ژیانە. لەپشت ژیانەوەیە، بەڵام لە ناوەندی هەموو ژیاندایە، چونکە کاتێك تاو دێتە ناو ئەم شێوەیەوە بەرجەستەدەکرێت هەموو شتەکان فێردەکات. ((گەوهەرە چالاکەکەی دەگونجێنێت، وتەکانی ڕووندەکاتەوە، شێوەی خاك و خۆڵ وەردەگرێت)). لەبەرئەوەی لەبنەڕەتدا ڕۆحێکی پوختە و مادە نیە تەواو نابێت، هەرچەندە لێی ڕابکێشرێت زیاتر هەڵدەقوڵێت، چونکە ((ئەو کانگایەیە کە وشك ناکات))، هەروەك ئەفلوتین وتیلەبارەی کەسێکی هاوشانی تاو. چەند نیشانەیەك هەن بۆ هەتەری بوونی، چونکە کاتێك زستان دێت ((هیچ گەڵایەك بە درەختەوە نامێنێت و گوڵەکان بۆنە خۆشەکەیان لەدەست دەدەن)). جگەلەوەی لە کۆتاییدا میهرەبان و بەبەزەییە. ئەمە نمونەیی نیە بەڵکو بەبەزەییە، دوودڵ نیە بەڵکو بەبێ وەستان لە هەڵقوڵاندایە، ئەو بێسنور بەخشندەیە. چونکە هەموو شتێك دەبەخشێتە ژیان، دەکرێت ناوی بنێین دایکی جیهان. لەم شێوەی دووەمەدا، تاو وەکو نوێنەری سروشتە، هێزی هەڵقوڵاوی ژیان ian vitale تایبەتە بە برجسون bergson وەکو ڕێکخەری سروشتە، کۆمەڵە یاسایەکی لێکس ئایتیرنا lex aeterna کلاسیکی ڕۆژئاوایە، (واتە یاسای جاویداری کە بونیادنانی جیهان ڕێکدەخات). دەکرێت جۆرج ڕۆمانس هاوەڵی چارلز داروین لەبارەیەوە دوابێت کاتێك درایەپاڵ ((بنەمای کامڵکەری هەمووان، ڕۆحی گەردون، خودی شاردراوە بەبێ هیچ کەرەستەیەك، کە هەڵدەقوڵێت بەشێوەیەکی مەبەستدار)).**

**بەڵام لە واتای سێیەمیدا، ئەوا وشەی تاو دەنێردرێت بۆ ((بەرمانەی ژیانی مرۆیی کاتێك جێبەجێ دەکرێت لەگەڵ تاوی گەردون، بەوجۆرەی باسکراوە لە ئێستادا)). زۆربەی ئەوەی لەم بەشەدا باسکراوە بە وردی**

لەبارەی ئەوەی تاوییەکان پێشنیازی دەکەن لەبارەی ئەو شێوەیەی پێویستە ڕێگای ژیانی مرۆیی لەسەری بێت، سەرەتا پێویستە ئاماژەبکەین بەوەی لە چین سیٚ جۆری تاوییەت هەیە.

## سیٚ نزیککردنەوە بۆ هێز و ئەوەی بەدوایدا دێت لە ڕێبازەکانی تاوییەت

دەستەواژەی تاو تی چینگ tao te ching وەرگێڕدراوە بۆ ڕێگا و هێزەکەی. وەك بینیمان وشەی یەکەمی ئەو ناوە شیدەکرێتەوە بۆ سیٚ مانا، واتە وشەی تاو هەڵگری سیٚ مانایە. پێویستە بڵێین ئەمە جێبەجیٚ دەکرێت بەسەر وشەی دووەمی ئەو ناونیشانەدا، واتە هێز تی te. بەپێی سیٚ ڕێگای نزیککردنەوە بۆ هێزی تی te، لە چین سیٚ شێوازی زۆر جیاواز لە تاوییەت دەرکەوت بەڕادەیەك بۆ یەکەمجار وا دەرکەوت هیچ پەیوەنیەك نیە کە پێکەوەیان ببەستێتەوە جگەلە بەشداربوون لەن ناوەکەیاندا، هەروەك باری ئەو دەستەواژانەی هاوبەشن وەك دەستەواژەی چاو بۆ نمونە کە بەواتای کانگای ئاو دێت، چاوی بینەر، جۆرە مادەیەك!. بەڵام وەك دەبینین کێشەکە بەوجۆرە نیە، بەڵام بەهەرحاڵ پێویستە لەسەرەتادا ئەم سیٚ شێوازە لەیەکدی جیابکەینەوە. دوانیان هەڵگری مانای ئاشکران: تاوییەتی فەلسەفی و تاوییەتی ئایینی، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك گرنگیان داوە بە تاوییەتی ئایینی، ناوبراوە بە تاوییەتی میللی. بەڵام سێیەمیان، کەلەڕووی پلەبەندکردنەوە بە دووەم دانە دادەنرێت هەڵگری چەندین گۆڕانکاریە ڕێگەنادات تاکە ناونیشانێکی بۆ دابنرێت. بەڵام شوێنکەوتوانی کۆمەڵەیەکی تایبەت پێکدەهێنن بەهۆی بەشداربوونیان لە یەك ئامانجدا، چونکە هەموویان سەرقاڵن بە بەرنامەیەکی بوژاندنەوە ئامانجی ئاسانکردنی هێزی تاوە ئەوەش هەڵدەقوڵێت لەڕێگەی بونەوەرە مرۆییەکانەوە، لێرەوە ئاماژەدەکەین بۆ ئەم کۆمەڵانە بە تاوییە بوژێنەرەوەکان.

## هێزی کاریگەر:  تاوییەتی فەلسەفی

بەپێچەوانەی تاوییەتی ئایینی کە بووە بە کلێسایەکی تەواو، تاوییەتی فەلسەفی و تاوییەتی بوژێنەرەوە تارادەیەك ناڕێکە.  تاوییەتی فەلسەفی و بەرنامەی بوژاندنەوە گرنگیەکەی زیاتر نیە لە گرنگی ڕێکخراوە فەرمیە هاوچەرخەکان بۆ بەرنامەی بزوتنەوەی شکۆدار transcendentialist movement لە نیوئینگلاند new england[26]، بەرنامەی لەشجوانی هاوچەرخ! هەردوکیان بەشدارن بە وێکچونی دووەمیان هەردوکیان بەرنامەیەکی پشتبەستنە بە خود.  چەند مامۆستایەك هەن بەڵام تەنها بە مەشقپێکراو دادەنرێن کە قوتابیەکانیان ڕادەهێنن و ڕێنمونیان بکەن بۆئەوەی پێویستە تێبگەن (لە حاڵەتی تاوییەتی فەلسەفیدا)، یان بۆ ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەن (لە حاڵەتی سیستمی پارێزکردنی خۆراکیدا).  لە دژبەیەکبوونی بنەڕەتی لەگەڵ تاوییە دینداراەکان، تاوییەکان لە دوو سەربازگەدا کاردەکەن بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر خودی خۆیان.

ناکۆکیەکانی نێوان تاوییەتی فەلسەفی و تاوییەتی بوژێنەرەوە پەیوەندی هەیە بە هەڵوێستە تایبەتیەکانیانەوە بەئاڕاستەی هێزی تاو کە ژیان لەڕێگەیەوە خۆراك وەردەگرێت.  لەبەر ڕوونکردنەوەی ناکۆکیەکانی نێوانیان، تاوییە فەلسەفیەکان هەوڵدەدەن هێزەکەیان تێ بپارێزن لەڕێگەی بەکارهێنانیەوە بەشێوەیەکی کاریگەر، لەکاتێکدا تاوییە بوژێنەرەوەکان کاردەکەن لەسەر زیادکردنی ئەو بڕە کەلەبەردەستدایە.

لەبەرئەوەی تاوییەتی فەلسەفی لە گەوهەریدا هەڵوێستێکە بە ئاڕاستەی ژیان بەوهۆیەوە یەکێکە لەو سێ تاوییەتەی کە شایستەی ناردنەدەرەوە، واتە ئەمە ئەو تاوییەتەیە زۆر شتی هەیە کە دەیڵێت بە جیهانی فراوان، دواتر چارەسەرێکی درێژتر بەدەست دەهێنێت لەلایەن ئێمەوە، بەڵام ناگاتە نیوەی دووەمی ئەم بەشە.  ئەوەی ئێستا پێی هەڵدەستین بریتیەلە ناساندنی بەتەنها لەبەرئەوەی بخرێتە جێگا لۆژیکیەکەی  لەپێش ئەوەی بچینەسەر باسکردنی دوو تاوییەتەکەی تر.

تاوییەتی فەلسەفی کەلە چین بە تاوییەتی خوێندنگایی بەستراوە بە ناوەکانی لاو تسو lao tzu و چوانگ تسو chuang tzu و تاو تی چینگ.  tao te ching دەکرێت ئەو ناوانە بەیەکە ببەستینەوە ئەگەر بیرمانکەوتەوە فەلسەفە پێویستی بە زانین هەیە، هەروەك بیکۆن bakon بە جیهانی وت بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا:  ((زانین هێزە:  بریتیەلەوەی بزانین چۆن ئەو سوارڕەوە چاکبکەینەوە بەو هێزەی هەمانە بەسەریدا. )).  بەدڵنیاییەوە نیگای تاوییەکان بەئاڕاستەی سوارڕەوەکان نەبوو بەڵکو ڕووەو ئەو ژیانەی ویستیان چاکی بکەن.  ئەو زانینەی ژیان بەهێزدەکات ناوی دەنێین:  دانایی لەبەرئەوەی بە دانایی بژین، هەروەك فەیلەسوفە تاوییەکان دەڵێن پێویستە بەشێوازێك بژین بیپارێزین لەسەر چالاکی ژیان، لەسەر بەکارنەهێنانیان لە ڕێگا بێکەڵکەکاندا لە سەرەتاکەیدا ململانێ و ناکۆکیە. ئێستا دەگەڕێین بەدوای تایبەتمەندیەکانی هەریەك لە لاو تسو و چوانگ تسو بۆئەوەی دوربکەوینەوە لە هاوشێوەی ئەم بەفیڕۆدانە لە نیوەی دووەمی ئەم بەشەدا، بەڵام دەتوانین لەئێستاوە تاکە خاڵێك تۆماربکەین، ئامۆژگاریەکانیان لەبارەی واتای وو وی‌یە ئەمە ڕستەیەکە واتاکەی بریتیەلە دامرکانەوە (کارنەکردن) بەڵام لە تاوییەتابەمانای چالاکیەکی پوخت دێت.  واتە پەیوەندیە تایبەتیە

---

[26] بزوتنەوەی شکۆدار transcendentialist movement بزوتنەوەیەکی ئەدەبی و فەلسەفیە سەریهەڵدا لە ویلایەتە یەکگرتوەکان لە ویلایەتی نیوئینگلاند لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا.  کاردانەوە بوو لەسەر هەندێك لە ڕێبازە ئەقڵانیەکانی سەدەی هەژدەیەم، ناسرابوو بە ڕەتکردنەوەی هەڵوێستە ئایینیە پیوریتانیەکان پاکژکەرەوەی توند کە بەربڵاوبوو لە نیوئینگلاند، بەجۆرێك ئەم بزوتنەوەیە سەریهەڵدا.  جگەلەوە بەرەنگاری بزوتنەوەی مەڕاسیمە توندەکان و زانستی ئایینی دوگماتی بۆ هەموو ڕێکخراوە ئایینیەکان.  ئەم بزوتنەوەیە واتە بزوتنەوەی شکۆدار باوەڕی هەبوو بە گرنگی تێڕامان و جوانی سروشت و مرۆڤی بەپیرۆز دادەنا، شوێنکەوتوانی هەستی ئایینی پیرۆزیان دەردەبڕی بە ئاڕاستەی سروشت و باوەڕیان وابوو پەیوەندیەکی بەردەوام هەیە لەنێوان گەردون و ڕۆحی مرۆڤدا، ئایین دەچێتەناو هەموو شتەکانەوە و شکۆدارترین ئامانجی ژیانی مرۆیی یارمەتیدەرە بۆ یەکگرتنی ڕۆحە لەڕێگەی تێڕامان و وەرزشە ڕۆحیەکانەوە.

ئاڵوگۆڕکراوەکـان، ململانێکـانی نـاو دەروون، پەیوەنـدی لەگـەڵ سروشـتدا–هـەتا نـزمترین ئاسـتی. ئێسـتا دەچینەسەر کۆمەڵە چالاکەکان زاتە کۆمەڵەی دووەمی تاوییەت.

## هێزی تەندروستی تاوییەت و یۆگا

پسپۆڕە تاوییەکان خوازیار نەبوون کاربکەن لەسەر بەدیهێنانی ئامانجی فەیلەسوفەکان کە دێتەدی بە بەڕێوەبردنی بەشەکانی تاو بەشێوەیەکی چالاك، بەڵکو ویستیان بەشەکەیان بپارێزن لە تاو بۆ زیادکردنی ئەم بەشە کە پێویستە لەگەڵیدا کاربکەن، بەو زمانەی دەڵێت:  ئەگەر فەیلەسوفە تاوییەکان کاریانکردبێت لەسەر زیادکردنی قازانج لەڕێگەی کەمکردنەوەی بڕی تێچوون، پسپۆڕە تاوییەکان ویستیان کاربکەن بۆ زیادکردنی کۆی داهات.  وشەی چی ch'I بە دەروازەیەکی گونجاو دادەنرێت بۆئەم خوێندنگایە، چونکە وێڕای ئەوەی بەواتای هەناسەدان دێت لەڕاستیدا ماناکەی وزەی ژیانە، بەجۆرێك تاوییەکان بەکاریانهێناوە بۆ ئاماژەکردن بە هێزی تاو کە لەناو دەرونیاندا هەستیان پێکردبوو بەمجۆرە ئامانجی سەرەکیان بووبە پاڵپشتیکردنی.  وشەی چی ئەو تاوییانەی شەیدای خۆی کردبوون.  پێشتر بلەیك blake باسی هەستی ئەوانی کردبوو کاتێك وتی ((هێز بریتیەلە شادومانی))، چونکە هێز بریتیەلە هێزی ژیان و تاوییەکان ژیانیان خۆشویستوە.  تەنها ئەگەر زیندوو بیت ئەو شتێکی زۆرباشە، ئەگەر چالاکتر بیت ئەوە باشترە، کە هەمیشە لە ژیاندا بیت ئەمە زۆرباشترە، لێرەوە ڕێوڕەسمی نەمری دەروونی تاوییەت دەستپێدەکات.  بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەیان بە گەورەکردنی چی ch'I (وزەی ژیان) ئەو تاوییانە مامەڵەیانکرد لەگەڵ سێشتدا:  مادده و جووڵە و ئەقڵیان.  لەوەی پەیوەندی هەیە بە ماددەوە هەوڵیاندا هەموو شتێك بخۆن، بۆئەوەی بزانن ئایا چی ch'I بە خواردەمەنی زیاددەکات. لەڕێگەی ئەم تاقیکردنەوەیەوە لیستێکی دەرمانیان دانا کە تیایدا دەگەڕان بەشوێن گیا و ڕووەکە پزیشکیەکاندا[٢]، تەنها بەدوای چارەسەردا نەدەگەڕان بەڵکو بۆ زیادکردنی وزەی ژیان هەوڵیاندەدا، دوا زامنکەری شەرابی تەمەندرێژکردن کە نەمری جەستەیی مسسۆگەر دەکات[٣].  هەروەها هەستان بە تاقیکردنەوەی سێکسی، بەجۆرێك وادانرا لە یەکێك لە تاقیکردنەوەکاندا ئەگەر پیاوان شلەی تۆویان پاراست لەکاتی کاری سێکسیدا ئەمەش بە فشارخستنەسەر بنکەی ئەدامی نێرینەیان لەکاتی هاتنەدەرەوەی شلەی تۆوەکەدا بۆئەوەی نەهێڵن بێتەدەرەوەی لەش و بیگەڕێننەوە بۆ ناو لەشیان[٤]، ئەوا جەستەیان یین yin هاوبەشە مێیینەکانیان هەڵدەمژێت بەبێئەوەی هێزی یانگ yang ی تایبەت بەخۆیان بەکاربهێنن.  بەهەمان شێوە مەشقکردنەکانی هەناسەدان پەرەیانپێدرا.  وابیریاندەکردەوە کارکردن لەگەڵ هەوادایارمەتیدەریان دەبێت لە ڕاکێشانی چی ch'I لە دا  بەرگی کەشوهەوادا.  ئەم هەوڵدانانە بۆ هێنادەرەوەی چی لە مادده بە هەرسێ شێوەکەیەوە ڕەق و شل و گازی تەواکرا بە بەرنامەی مەشقکردن و جووڵە جەستەییەکانتای چی چوان (مەشقە دێرینەکانی چین لە تێڕامان و گوێڕایەڵی)، کە یاری سەما و تێڕامان پێکەوە کۆدەکاتەوە، فەلسەفەی یین\یانگ yin\yang، هونەری سەربازی لە پێکهێنان ئامانجی ڕاکێشانی چیە لە گەردون و لابردنی لەمپەرەکان لەبەردەمیدا، ئەمەی دوایی بابەتی دەرزیە چینیەکان دەگرێتەوە. دواجار نۆرەی ئاڕاستەی ئەقڵی مرۆییە.  ئەو کەسانەی بە تێڕامانەوە سەرقاڵبوون ئەم کارەیان پەرەپێدا تادواتر ناسرا بە تێڕامانی تاویی.  ئەنجامدانی تێڕامان هەموو ئەو شتانەی قەدەغەدەکرد کە بیرو هۆش دەبات و ئەقڵ سەرقاڵ دەکات، خاڵیکردنەوەی مێشك تائەو ڕادەیەی دەکرێت هێزی تاو پیایدا تێپەڕێت بەناو پاڵیوەرەکانی جەستەوە بۆئەوەی ڕاستەوخۆ بچێتەناو دەروونەوە. ئەم سێیەمین ڕێگایە بۆ زیادکردنی چی (وزەی ژیان)بەتەوای بۆئەم کارە تەرخانکرابوو، لەبەرئەوە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاترە.  سەبارەت بەو خوێنەرەی سەیری بەشی هیندۆسیەتی کردوە لە م کتێبەدا، ئەوا خێراترین دەروازە بۆ تاوییەتی تێڕامان بریتیەلەوەی بیرلەوە بکاتەوە کەلەوێدا باسکراوە سەبارەت بە ڕاجا یۆگا raja  yoga، واتە ڕێگای چوون بەرەو یەزدانلەڕێگەی وەرزشە جەستەیی و دەرونیەکانەوە.  ئەگەر

چینیەکان ئەم مەشقەیان لە هیندیەکانەوە وەرگرتبێت یان نا ئەوا شێوازەکانی دانیشتن و تەکنیکەکانی بیرکردنەوە لە تێرامانی تاوییدا بیری ڕاجا یۆگامان بیردەخاتەوە، بەڕادەیەك هەندێك لە پسپۆڕان لەبواری توێژینەوە چینیەکاندا ئەم ناوە سنسکریتیەیان وەرگرتوە و ناویاننناوە یۆگای تاویی. بەڵام وێڕای ئەوە چینیەکان یۆگا تایبەتەکەیان تایبەتمەنیەکی جیاوازیان پێدابوو، بووەهۆی گرنگیپێدانی کۆمەڵایەتیان بۆ بوون بۆ جەختکردنەوە لەسەر توانای گواستنەوەی چی کە یۆگیکارەکان ڕایانکێشاوە لەڕێگای تێرامانی جەستەییەوە بۆ جەماوەر، لەبەر جوانکردنی چالاکیەکەی و دۆزینەوەی گونجان لەنێوان کێشەکانیدا. شانبەشانی کونفوشیەکان کاریاندەکرد بۆ ناساندنی چی وەك نمونەیەکی ئاکاری و نمونەیەك بۆ چۆنیەتی هەڵسەکەوتکردن، یۆگیکارەکان هەوڵیاندا بۆبەکارهێنانی تاو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەوەی لەسەرەتادا ڕاپیکێشن بۆ ناو دڵ و ئەقڵیان دواتر بیدەنە ئەوانی تر. وادەردەکەوێت بەشێکی زۆری یۆگیکارەکان کە بەم کارە هەستان پێیان نازانرێت، بەڵام پڕۆژەکەیان کە ژیانبەخشە زۆر سودبەخش بوو بۆ خەڵك زیاتر لە کاری چاکەکارەکانی تر. لێرەدا نزیك دەبێتەوە لە تاوییەتی فەلسەفی چونکە جوڵاندن و چالاککردنی ئەم تاوییەتە یۆگییە شانازیکردنە بە دەروونی هەناویەوە لەبەرامبەر دەروونی ڕووکاری لە چین. منداڵان ئەم دوو ڕەهەندە لەیەکدی جودا ناکەنەوە لە کەسایەتیاندا هەروەها کەسە دێرینەکان بەم کارە هەڵنەستاون. تاوییەتی یۆگی دەرکەوت وەك پێشخستنی ئاگایی خودی تاکی چینی، پەرەیپێدا هەتا گەیشتە ئاستی بینینی تەواو، جیهانی دەروونی هەناوی جیهانێکی تازە بوو سەبارەت بە چینیەکان و زۆر سەرنجڕاکێش بوو بۆئەو کەسانەی تازە دەیاندۆزیەوە، تاڕادەیەك وایانلێهات بەجۆرێك سەیری ماددەیان دەکات تەنها توێژاڵێکە. چونکە جیهانی ناوەکی کێشەیەکی گرتەخۆی چونکە دڵتەنگی و سەرقاڵی ڕۆحی پڕکردوە، ئەوەی هەستا بەلابردنی ئەم دڵتەنگی و سەرقاڵیە هەتا ((ئەو ڕووکاری دەروەی ئەو دەروونە دەربکەوێت پێویست بوو پاك و بێگەر بێت))، ئەوکاتە مرۆڤ تەنها شتە دەرکپێکراوەکان نابینێت بەڵکو ئەو ((خودە دەبینێت کە دەرك بە شتەکان کراوە لە ڕێگەیەوە)). بۆ گەیشتن بەم حاڵەتە پێویست بوو هەموو جۆرەکانی ئارەزوو ڕەتدەکرێنەوە و هاندان بۆ پاککردنەوەی جەستە و دەروون. ناکرێت ڕۆحی بێگەرد بناسرێت تەنها لە ژیانێکی پاکو بێگەرددا نەبێت، خۆی ئاشکراناکات تەنها لەوکاتەدا نەبێت کە هەموو شتێك پاکە، لەبەرئەوە ((دەروون وەلا بنێ)). هەروەك پێویستە هەموو ئەو هەست و سۆزەی سەرقاڵمان دەکات دابمرکێنرێتەوە، چونکە کاتێك شەپۆڵ دەدات لەسەر ڕووی هزر ڕێگەنادات بە تێرامان بگەین بە کانگاکانی ئاگایی کەلەژێریەوەیە. (لێرەدا نزیککردنەوە و وێکچوون لەگەڵ تاوییەتی فەلسەفی بەهێزە). پێویستە هەموو ئەم ئارەزوو و ڕق و کینەیە دابمرکێنرێتەوە لەگەڵ دڵتەنگی و شادومانی، ئەمە ئەگەر ئەقڵ خوازیاربێت بگەڕێتەوە سەر پاکوبێگەردیە ڕەسەنەکەی، چونکە دواجار هیچ شتێك بۆ ئەو باش نیە جگەلە ئاشتەوایی و ئارامی. لێگەڕێ با چەرمەسەری و پەژارە بڕەوێتەوە ئەوکاتە هەست بەوەدەکەیت پێکەوەگونجانی ئەقڵ و سەرچاوە گەردونیەکەی ڕوودەدات بەشێوەیەکی خۆڕسکانە. ئەو نزیکە لێمانەوە، ئەو بەڕاستی لەلاماندا ڕاوەستاوە وێڕای ئەوە دەرکیپێناکرێت، ئەو شتێکە کاتێك پێی دەگەین ناتوانین بەدەستی بهێنین. وا دەردەکەوێت بەشێوەیەکی بێسنور دوورە لێمانەوە. وێڕای ئەوەی ئەو دوور نیە، ئێمە ڕۆژانە هێزەکەی بەکاردەهێنین. چونکە ڕێگای ڕۆحی ژیان هەموو پەیکەرەکان لێوانلێودەکات، وێڕای ئەوە مرۆڤ ناتوانێت هەمیشە بەدوایدا بڕوات. ئەو دەڕوات و وێڕای ئەوە بەجێمان ناهێڵێت. ئەو دێتەلامان وێڕای ئەوە لێرە نیە. ئەو بێدەنگە بەجۆرێك هەستی پێناکرێت وێڕای ئەوە لەپڕ هەست بەوە دەکەین ئەو لێرەیە لە مێشکماندایە. ئەو تاریکە و زەردهەڵگەڕاوە، هیچ دیمەنێکی دەرەکیمان نیشان نادات، وێڕای ئەوەی لە

ناخمانەوە هەڵدەقوڵێت وەك ڕووبارێكی مەزن هەر لە سەرەتای لەدایكبوونمانەوە(٥). مەرجە سەرەكیەكان بۆ گەیشتن بە ناسینی خود بریتیە لە خۆنەویستی، پاكی دەروون، بێدەنگی و ئارامی سۆزداری، بەڵام ئەم مەرجانە ناگەنە لوتكەیان تەنها لەڕێگەی تێرامانەوە نەبێت. ((لە بێدەنگیدا دابنیشە، ئەوكاتە هەست بەوەدەكەیت درەوشانەوەی ڕۆح دێتە لات و جێگیر دەبێت)). بۆئەوەی ئەمە ڕووبدات پێویستە هەموو هەڵسوكەوتە دەرەكیەكان دابمركێنەوە و تەواوی هەستەكانمان چڕبكەینەوە لە خاڵێكی دیاریكراودا. چەند جۆر دانیشتنێك پێویستە بۆ گەیشتن بەم ئاستە هاوشێوەی شێوازە جۆراوجۆرەكانی دانیشتن لە یۆگای هیندیدا، هەروەها پێویستە شێوازی هەناسەدان كۆنترۆڵ بكرێت بەشێوەیەكی نمونەیی، پێویستە هەناسەدان ناسك بێت هەروەك هەناسەدانی منداڵێك، بەڵكو تەنانەت وەكو كۆرپەلەیەك لە منداڵدانی دایكیدا. دەرئەنجامەكە جۆرێك لە حاڵەتی ئاگاییە ناسراوە بە دانیشتن بە هزرێكی خاڵیەوە. لەدوای ئەم دەركپێكردنە چی دێت؟ لەگەڵیداڕاستی و شادومانی و هێز دێت، ژیری خۆڕسكی تاوییەتی تێرامان دەگاتە لوتكە لەژێر كاریگەری ڕاستی ڕەهادا، كاتێك دواجار هەموو شتێك جێگای ڕاستەقیسنەی خۆی دەگرێت. دەركپێكردنی ڕاستەوخۆ بۆ سەرچاوەی ئاگایی یۆگیكار ((بێدەنگی، پاكی و بێگەردی، جێگیری و بێ جوولە هەروەك پادشایە لەسەر تەختی پادشایەتی)) شادومانیەكی لەڕادەبەدەر دێنێت بۆ ئەم یۆگیكارە كە پێشتر هەستی پێنەكردوە. بەڵام سودی كۆمەڵایەتی ئەم حاڵەتە شاردراوەتەوە لە توانایەكی نمونەییدا كە دەیبەخشێت بە خەڵك و شتەكان، هێزێكە لەڕاستیدا لە توانایدایە ئاسمان و زەوی بجوڵێنێت. تەواوی گەردون دەستەوسان دەبێت لەبەردەم ئەقڵی بێدەنگی ئارامگرتوودا. لەبارەی هیندەوە دواین كە پەیوەندی هەیە بەم هێزە دەروونیەوە، بەڵام قەشە یۆحەنا پەیمانێكی هاوشێوەی ئەمە دەدات: ((دەتوانیت خەڵك ملكەچ بكەین بەبێ هیچ هەوڵ و تێكۆشانێك، هەروەها هەموو شتەكانی گەردون ملكەچ دەبن بۆت)). كەسی فەرمانڕەدا دەتوانێت بگات بەم حاڵەتی ئارامیە و فەرمان بكات بەسەر گەلەكەیدا بەبێئەوەی تەنها پەنجەیەكی بەرزبكاتەوە، ئەمە بە هێزی ئاكاری سۆفیگەرانەی. ئەو فەرمانڕەوایەی دەستبەرداری تەواوی ئارەزووەكانی ببێت و بگات بەم وزە دەروونیە بەشێوەیەكی خۆڕسك دەتوانێت كارێك بكات هاوڵاتیەكانی دەستبەرداری ئارەزوەكانیان ببن. ئەو فەرمانڕەوایی دەكات بەبێئەوەی ناسراو بێت، واتە بەبێئەوەی خەڵكی بزانن كە ئەو فەرماڕەوایی دەكات. كەسی دانا پشتدەبەستێت بە چالاكیەكی بێ كردار، خۆی دەخاتە دواوە، بەڵام هەمیشە لە پێشەوەیە. لەدەرەوە دەمێنێتەوە، بەڵام هەمیشە لەوێ بوونی هەیە. ئایا ئەمە لەبەرئەوەنیە كە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەوڵنادات، چونكە هەموو ئامانجە تایبەتیەكانی بەدی دێن؟(٦). یۆگیە تاوییەكان ناتوانن هیواخوازی تێگەیشتنی لەوە زیاتر بن لە كەسە ئاساییەكانی ناو كۆمەڵگا، لەبەرئەوە هەوڵیان نەداوە بۆ بە گشتی كردنی هەڵوێستەكەیان. كاتێك وتەكانیان نوسیوەتەوە ویستویانە نهێنی بێت، كراوە بن بۆ شیكردنەوەی تاكەكەسی لەلایەن ئەو كەسانەی دەیخەنەڕوو بۆ جەماوەر. بەشێك لەو هۆكارەی وای لێكردن بەم شێوازە بنوسن بێگومان بەرەدەسێنێت لە هەستیاربوونیان بەئاڕاستەی ڕەخنە ڕووخێنەرەكانیان كە بەرامبەر بە سۆفیگەری دەكرێت لەلایەن ئەو كەسانەی هاوڕانین لەگەڵیان، تاڕادەیەك دەبینین چوانگ تسو گاڵتەدەكات بە مەشقەكانیان كە بۆ كۆنترۆڵكردنی هەناسەدانیان پەیڕەوی دەكەن، دەڵێت: ((ئەو كەسانە هەوای بەكارهاتو فڕێدەدەنە دەرەوەی لەشیان بەهێزێكی زیادلەپێویست و هەوای پاك و خاوێن هەڵدەمژن. هەروەك ورچەكان كە سەردەكەون بەسەر درەختەكاندا بۆئەوەی ئاسانتر هەناسە بدەن)). مینشیوس mencious هاوڕایە لەگەڵیدا لەم گاڵتەپێكردنەدا، كاتێك ئەو كەسانەی بانگەشە بۆ ڕێگا دەرونیە كورتكراوەكان دەكەن بۆ گەیشتن بە گونجانی كۆمەڵایەتی دەچوێنێت بەو جوتیارانەی خۆڕاگرنین

و بەسەبرنین هەتا دانەوێڵە و چێنراوەکانیان بە ئارامی نەشونما بکەن بەڵکو پەلەدەکەن لە گەشەسەندنیاندا، وێڕای ئەم ڕەخنە ڕوخێنەرانە یۆگای تاویی ژمارەیەکی زۆر هەواداری هەیە، تەنانەت هەندێك لە پسپۆڕان لە زانستە چینیەکاندا دایاننناوە بە دەرکپێکردنی بنەڕەتی کەلەسەر ئەو بنەمایە کتێبی تاو تی چینگ نوسراوەتەوە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەو زمانە پەردەپۆشکراوەی کە کتێبەکەی پێ نوسراوەتەوە، چونکە زۆربەی کات دەخوێنرێتەوەبەشێوەیەکی فەلسەفی. بەڵام پێشئەوەی بچینەسەر ئەو ڕێگا فەلسەفیە پێویستە بەشی سێیەمی تاوییەت باسبکەین، واتە تاوییەتی ئایینی.

## هێزی جێگرەوە تاوییەتی ئایینی

تاوییەتی فەلسەڤ هەوڵیداوە بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی سروشتی تاو بەشێوەیەکی کاریگەر، تاوییەتی بوژێنەرەوە هەوڵیداوە بۆ بەهێزکردنی بنکە تایبەتیەکەی، بەڵام لەشتێکی کەم بوو. بیرکردنەوە و بەرنامە تەندروستیەکان پێویستیان بە کات هەیە، زۆربەی چینیەکان لەو شتومەکەیان کەمە!. وێڕای ئەوە پێویستیان بە یارمەتی هەیە، چونکە چەند نەخۆشیەك هەیە پێویستیان بە کۆنتڕۆڵکردن هەیە، ئەو تارماییانەی خەریکی دزیکردن و وێرانکارین پێویستە چارەیان بکرێت، بۆ بارانبارین پێویستە کار بکرێت یان کاربکرێت بە وەستاندنی بارینی، تاوییەکان کاریان کرد بۆ چارەسەری ئەم کێشانە، هاوشێوەی ئەو ڕێنماییانەی دایان نابوو بۆ زۆربەی کارەکانی پێشبینیکەر و دەروونناسەکان شامانیەکان[٢٧] ئەوانەی چارەسەری نەخۆشیەکان دەکەن بە جادوو. تاوییەتی ئایینی چەندین ڕێکخراوی دانا بۆ هاوشێوەی ئەم چالاکیانە. بەمجۆرە کڵێسای تاوییەت پەرەیسەند (بە زمانی چینی ناسراوە بە: تاو چیاو tao chiao واتە تاویەتی کڵێسا یان بنەماکانی تاوییەت)، لەژێر کاریگەری بوزییەت لە سەدەی دووەمی زاییندا. لەو پەرستگایەدا چەند خوداوەندێك جێگیرکرا یەکێك لەو سێ (i) خوداوەندە خودی ((لاوتسو))یە. لەو خوداوەندەوە چەند دەقێکی پیرۆز دروستبوو، قوبووڵکرا وەکو ڕاستیەك بەبێ هیچ زیادەڕەویەك. هێڵی بابوی بەردەوام بوو لە کڵێسای تاوییەتەوە تائێستا لە تایوان. تاوییەتی ئایینی کێشەیەکی تەمومژاویە. وادەردەکەوێت زۆربەی ئەفسانەیە، بەڵام پێویستە بیرمان بێت بیرۆکەیەکی بچوکمان نیە سەبارەت بە واتای هێز، ئیدی چۆن پێشدەکەوێت ئێمە دەزانین چارەسەری نەخۆشیەکان بە بیروباوەڕ و نزا و پاڕانەوە دەکرێت چەندین وزە دەرباز بکات هەروەك چۆن خودی بیروباوەڕ ئەو کارە دەکات، یەکێك لەوانە باوەڕبوونی مرۆڤە بە خودی خۆی متمانەبەخۆبون. کاتێك بۆ چارەسەرکردن بە نزا و پاڕانەوە ئەو وزانە زیاددەکەین کە کەسایەتیە جادووگەرەکان زیادی دەکەن مەبەست لێی خرۆشاندنی خەڵکە، ئەمە وێڕای هێزە نهێنیە نادیارەکان کە بەکاردێن لە خەواندنی موگناتیسیدا، ئەمانە دەتوانن لوتبەرزیمان کەمبکەنەوە، ڕێگەمان پێبدەن گوێ لە تاوییەتی ئایینی بگرین بەشێوەیەکی دادپەروەرانە. بەهەرحاڵ مەبەستی ئێمە لێرەدا ئاشکرایە: ((ڕێکخراوی تاوییەتی کەهەنوتی وای لە هێزی ژیانی گەردونی کردوە دەستەبەربێت کەسە ئاساییەکان لە ناو لادێکاندا))(٧). دەقەکانی ئەم خوێندنگایە چەندین ڕێوڕەسمی لەخۆگرتوە، ئەگەر بە وردی جێبەجێکرا کاریگەری جادووی دەبێت، هەموو وشەیەکی جادووی کلیلی تایبەت بەخۆی هەیە لە تاوییەتی ئایینیدا، پێویستە ئەم وشەیە سەربەست بکرێت، بەهەرحاڵ واتایەك هەیە لە پشت هەریەکەیانەوە، چونکە جادوو بە واتا نوێکەی کارێکی فریودەرانەیە، جادووگەران بەجۆرێك باسدەکرێن بینەران فریودەدەن بەوەی هێزی سەروو توانای مرۆییان هەیە. بەڵام بەپێچەوانەی ئەمەوە جادوو بەپێی کلتوری ئایینی بە چاوی ڕێزەوە سەیردەکرا. یەعقوب بوهیمی jacob boheme بۆ لەوە دوورتر ڕۆیشتوە تاڕادەیەك جەختی کردوە لەسەرئەوەی ((جادوو باشترین لاهوت ئایینزانیە چونکە بیروباوەڕی ڕاستەقینە بنەمای خۆی تیادا دەدۆزێتەوە. ئەوی بۆنی جادوو دەکات گەمژەیە، فێڵبازترە لەوەی لە لاهوت بگات)). لە کلتوری ئایینیدا جادوو وەك کەرەستیەکی سەیردەکرا بۆ بەکارهێنانی هێزەکانی سەروو توانای مرۆیی لەڕێگەیەوە. بەپێی ئەو وتەیەی دەڵێت هێزەکانی سەروو توانایی مرۆیی لەڕاستیدا بوونیان هەیە چونکە جادوو وا لەم هێزانە دەکات کە بەردەست بێت. کاتێك ئەو

---

[٢٧] شامانیەت shamanism ئایینێکی سەرەتاییە لە ئایینەکانی باکوری ئاسیا (سیبیریا) و ئەوروپا و باکوری ئەمەریکا بەوە دەناسرێتەوە باوەڕیان وایە جیهانێکی شاردراوە هەیە ئەویش جیهانی خوداوەن و ئەهریمەنەکان و ڕۆحی باوباپیرانە، لەبەرئەوەی ئەم جیهانە وەڵامناداتەوە تەنها بۆ شامان نەبێت: shaman ئەو قەشەیە جادوو بەکاردەهێنێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان و ئاشکراکردنی شتە شاردراوەکان و دەستگرتن بەسەر ڕووداوەکاندا.

**کەسەی بەکاری خەواندنی موگناتیسی هەڵدەسێت دەستدەدات لە شانی جەستەی ڕەقدەبێت بەڕاستی ئەمە ڕوودەدات، لەوکاتەدا یارمەتیدەرەکانی دەتوانن هەڵیبگرن سەری لەسەر کورسیەك و قاچی لەسەر کورسیەکی دی دابنێن بەبێئەوەی جەستەی بکەوێتە خوارەوە بەمجۆرە نزیك دەبینەوە لە جادوو بە مانا کلتوریە ئاینیەکەی. وێڕای ئەوە خەواندنی موگناتیسی بە جادوو دانانرێت چونکە کەسی خەوێندراو لە حاڵەتێکی نمونەیی دایە لە ئاگایی. ئەگەر ویستمان مونە بهێنینەوە بۆ جادوو بە مانا کلتوریە ئاینیەکەی، ئەوا پێویستە لەسەرمان بچینە سەر ئەو پرۆسەیەی وەکو پرۆسەی چارەسەرکردنە بە کاغەزی ئینیاس کە باسکراوە لە گەشتی کردەوەی پێغەمبەران ٩\٣٢-٣٤: ((لەکاتێکدا بوتروس لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر دەڕۆیشت، سەردانی دانیشتوانی شاری لودەی کرد، لەوێدا کەسێکی ئیفلیجی بینی بەناوی ئینیاس، ماوەی هەشت ساڵی بوو کەلە جێگادا کەوتبوو. پێی وت: ئەی ئینیاس، یەسوعی مەسیح شیفای تۆی داوە. هەستە بۆ خۆت جێگاکەت کۆبکەرەوە!، لەو کاتەدا هەستایە سەرپێ. )) تێبینی ئەوە بکە ئەمە دەرئاسا موعجیزە نەبوو، موعجیزە دەبوو ئەگەر مەسیح ئینیاسی ئیفلیجی چارەسەربکردایە بەبێ یارمەتیدانی بوتروس، بەمجۆرە نمونەیەك بدات بەدەستەوە کە پزیشکەکان ناوی دەبەن بە چارەسەری بەپەلە. بەڵام لەم کارەدا بوتروس ڕۆڵی هەبوو لەم چارەسەرکردنەدا، دەتوانین بڵێین ڕۆڵێکی پێویستی بینی، لێرەدا بەرەوڕووی جادوو دەبینەوە، جادووی پیرۆز، ئەگەر دروست بێت بوترێت، لەبەرئەوەی ئەگەر عەفریتێك داواکرا بۆ مەبەستی خراپ لەوکاتەدا فڕوفێڵ و فریودان چالاك دەبێت. لەژێر ناونیشانی جادوودا بە مانا کلتوریەکەی، کڵێسای تاوییەت چەند ڕێگایەکی داناوە بۆ بەکارهێنانی هێزەکانی سەروو توانای مرۆیی بۆ مەبەستی مرۆیی.**

## تێکەڵکردنی هێزەکان

هەرسێ لقەکەی تاوییەت: (١)تاوییەتی فەلسەفی، (٢)بەرنامەکانی زیندووڕاگرتن و چالاککردنی زیادکردنی هێزی چی (وزەی ژیان) لەلای هەموو تاکێك، (٣)کڵێسای تاوییەت: -کە بۆ یەکەمجار وادەرکەوت هیچ شتێکی هاوبەش نیە لەنێوانیاندا تەنها بەڕادەیەکی کەم نەبێت-لەئێستادا وێکچوونێکی ئاشکرامان نیشان دەدات. هەموویان هەمان گرنگیپێدانیان هەیە-چۆن دەتوانین هێزی تاوی بوژێنەرەوە تی زیادبکەین-گرنگیپێدانی تایبەتی دەچێتەنێو زنجیرەیەکی پێکەوەبەستراوەوە. زنجیرەکە دەستپێدەکات بە چۆنیەتی دابەشکردنی بڕی ئاسایی هێزی بوژێنەرەوەی چی تایبەت بە ژیان بە باشترین شێوە بەرەو (تاوییەتی فەلسەفی). لێرەوە دەجوڵێت بەرەو پرسیارکردن لەبارەی ئەوەی ئایا دەکرێت بڕی سروشتی (بەرنامەی زیندووکردنەوەی تاوییەت). دواجار، پرسیاردەکات لەبارەی ئەوەی ئایا دەکرێت وزەی گەردونی کۆبکەینەوە، هەروەك چۆن هاوێنەیەکی ئەم کارە دەکات، بۆ بڵاوکردنەوەی بەمەبەستی باشکردنی گوزەرانی ئەو کەسانەی پێویستیان بە یارمەتیدان هەیە (تاوییەتی میللی یان ئایینی). مەترسی ئەم ڕێکخستنە لەوەدا شاردراوەتەوە کە بۆ ڕوونکردنەوەی سنوری جیاکەرەوەی نێوان ئەو سێ بەشەیە بەشێوەیەکی زۆر ورد، ئەمە لەکاتێکدا لەڕاستیدا دیواری جوداکەرەوە نیە لەنێوانیاندا بەڵکو دەتوانرێت سەیر بکرێن وەك چەند تەوژمێك لەنێو ڕووبارێکی هاوبەشدا. بەدرێژایی مێژوو هەریەك لەو سێ جۆرەی تاوییەت تێکەڵ بووە بە جۆرەکانی تر، ئەمە بەردەوامە هەتا تاوییەتی ئەمڕۆ کە دەیبینین لە هۆنگ کۆنگ و تایوان. جۆن بلو فیڵد john blofeld کەلە چین ژیا بەدرێژایی ئەو بیست ساڵەی پێش شۆڕشی کۆمۆنیزم هیچ تاوییەکی نەدیبوو کە هەر سێ جۆرەکەی تاوییەتی پەیڕەو نەکردبێت. دەکرێت ئەوەی پێشتر وتراوە کورتبکرێتەوە بەمشێوەیە: بۆئەوەی ببیتە شتێك، بۆئەوەی شتێك بزانیت، بۆئەوەی شتێك ئەنجام بدەیت، پێویستە بەرزببیتەوە و شکۆداربیت بەسەر شتە ڕووکاریەکاندا. ژیان خاوەنی گەوهەرێکە دەگات بە ڕادەی تێکەڵکردنی قووڵاییەکانی سۆفیگەری (یۆگای تاوییەت) لەگەڵ دانایی ڕاستەوخۆ (تاوییەتی فەلسەفی)، لەگەڵ توانای بەرهەمهێنانی جادوو (تاوییەتی ئایینی). کاتێك ئەم شتانە لەپاڵ یکتردا دادەنێین خوێندنگایەك پێکدەهێنرێت، لەچین ئەو خوێندنگایەی لەم بەشەدا باسکراوە بریتیەلە تاوییەت. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە بگەڕێینەوە بۆسەر تاوییەتی فەلسەفی و مافی گوێگرتن لێی پێبدەین.

## ئاسوودەیی دروستکەر

ئامانجی تاوییەتی فەلسەفی نزیکبوونەوەیە لە ژیانی ڕۆژانەی تاك لەسەر هێڵی تاو tao، بۆئەوەی درێژبێتەوە بەشێوەیەکی بێسنور. ڕێگای سەرەکی بۆ بەدەستهێنانی ئەم شتە هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆکرد بریتیەلەوەی ژیانی بەرەو باشتر ببات و کاملی بکات وەکو وو وی wu wei. وەکو پێشتر تێبینیمان کرد پێویستە دەستەواژەی وو وی وەرنەگێڕین بە مانای نەکردنی هیچ کارێك یان ناچالاکی لەبەرئەوەی ئەو وشانە بەرەو هەڵوێستێکی ترمان دەبەن ئەوەش کارنەکردن و سستیە، لەبەرئەوە باشترین وەرگێڕان بۆ ئەم وشەیە بریتیەلە چالاکی پوخت و بێدەنگی دروستکەر یان ئاسوودەیی دروستکەر. دڵنیایی دروستکەر کۆدەبێتەوە لەناو هەموو تاکێکدالەنێو دوو جاڵەتی دژبەیەکدا: چالاکی بێسنوور و ئارامی بێسنوور. دەکرێت ئەم دوو حاڵەتە پێکەوە بژین لەبەرئەوەی بوونەوەرە مرۆییەکان داخراو نین بەڵکو دەریایەکی بێسنور لە تاو پێکدەهێنن بەناو چینێك لەژێر ئاگاییەوە. یەکێك لە ڕێگاکانی دروستکردن جێبەجێدەکرێت لەڕێگەی پەیڕەوکردنی ڕێنماییەکانی ئەقڵی بە ئاگا، وێڕای ئەوەی ئاشکرایە دەرئەنجامەکانی ئەم شێوازە لە کارکردن بە دەگمەن کاریگەر دەبێت لەبەرئەوەی گرنگی بە پۆلێنکردن دەدات زیاتر لە ئەفراندن. داهێنانی ڕاستەقینە هەروەك هەموو هونەرمەندێك دەیزانێت کاتێك دەردەکەوێت دەگات بە بڕێکی زیاتر لە سەرچاوەکانی ئاگایی. بۆئەوەی ئەمە ڕووبدات پێویستمان بە جۆرێك لە جوودابوونەوە هەیە لە دەروونی ڕووکاری، پێویستە لەسەر ئەقڵی ئاگایی ئارامبگرێت، چیدی چەقبەستوو نەبێت بەڵکو بکەوێتە جموجوڵ. تەنها بەمشێوەیە دەتوانرێت یاسای کۆششی پێچەوانە بڕدرێت کە هەرچەندە هەوڵبدەین بەرپەرچدەدرێینەوە. wu wei کرداری شکۆدارە، نەرمیەکی ناوازەیە، سادەیی و سەربەخۆییە، کاتێك خۆمان بەدەستەوە دەدەین بۆ هەوڵەکانمان بۆ هێزێك کە خاوەنی نین، ئەمە نزیکبوونەوەیە لە تەوژمی پێچەوانە بۆ نزیکبوونەوە لە کونفوشیوس. کونفوشیوس هەوڵیدا بۆ بونیادنانی چەند وەڵامێکی نمونەیی کە دەکرێت لاسایی بکرێتەوە بە ئاگایی. بەڵام نزیککردنەوەی تاوییەت بەتەواوی پێچەوانەیە بەوەی گەیشتنە بە ناخی دەروون و گونجان لەگەڵ هێزی تاو و وازهێنان لە هەڵسوکەوتکردن بە شێوەیەکی خۆڕسکانە. چونکە کردار بەدوای بوونی خوددا دێت، کرداری نوێ بوونی نوێ بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بوونێکی ژیرتر و بەهێزتر. کتێبی تاو تی چینگ ئەم خاڵە باس دەکات بەبێ هیچ دوودڵیەك، دەڵێت: ڕێگای بەرەو ئەنجامدانی کردارێك بریتیەلەوەی بوونت هەبێت لەسەرەتادا. چۆن دەتوانین ئەم ژیانە باسبکەین کە هۆکارە سەرەکیەکی تاوە؟ ژیانێك هێزێك تا بەرزترین ئاست وزەی پێدەبەخشێت ئاڵۆزە بەشێوەیەکی بێوێنە. ئەمانە ئاکاری تەوانلەدایکبوون لە چالاکی کە هیچ پێویستی بە توندوتیژی نیە. هەموو ئەو کارەی دەیکات بریتیەلەوەی لێگەڕێت هێزی تاو بەناویدا بڕوات دواتر بێتەدەرەوە بۆئەوەی ژیان ببێتە سەمایەکی دوور لە دوودڵی و هەڵچوون و لاسەنگی. وو وی بریتیەلە ژیانی سەروو دوودڵی و دڵەڕاوکێ: بەردەوام بە لە ڕاکێشانی کەوانەکە پەشیمان دەبیتەوە لە ڕاکێشان مشارە تیژکراوەکە تەنك و لاواز دەبێت (بەشی ٩)(٨) وێڕای ئەوە ژیانێکی دوورە لە ئارامیەوە، ئەمە بەرجەستەکردنی نەرمی و سادەیی و سەربەخۆییە، ئەمە جۆرێکە لە چالاکی پوخت هیچ جووڵەیەك بەفیڕۆ نادرێت لە پێکدادان و بەرپەرچدانەوەدا. **دەشێت مرۆڤ بە لێزانی جموجوڵ بکات بەجۆرێك شوێن پێ لەدوای خۆی جێنەهێڵێت بە باشترین شێوە بدوێت بەبێ هیچ دوودڵیەك، بەجۆرێك ژمێریاری دەکات پێویستی بە ژمێرەر نیە (بەشی ٢٧).** گومانی تێدانیە ئەم جۆرە چالاکیە پێویستی بە شارەزاییەکی بێوێنە هەیە، ئەم خاڵە ئاماژەی بۆکراوە لەو چیرۆکەی تاوییەتدا کە دەدوێت لەبارەی ئەو ڕاوکەرەی سەرقاڵی ماسی گرتنە و توانی ماسیەکی زۆر گەورە بهێنێتە سەر وشکانی بە تاڵە دەزوویەك چونکە بەشێوەیەکی باش چنرابوو

بـه ئاسـانی نەدەپچـڕا. بـەڵم لێهـاتوویی تاوییـەت بەدەگمـەن تێبینـی دەکرێـت، چـونکە وو وی هـیچ کەسـێك ناچارناکات و هـەرگیز ناشـڵەژێت بـەجۆرێك دەردەکـەوێت هـیچ جـۆرە هەوڵـدانێکی تێـدا نیـە. نهێنیەکـە لێرەدا شاردراوەتەوە لـەو شـێوازەی بەکاردێت بـۆ گـەڕان بـەدوای بۆشـاییەکانی نـاو ژیـان و سروشـت، جموجـوڵکردن بەناویـدا. چـوانگ تسـو ئـەم خاڵـەی ڕوونکردوەتـەوە لـە چیرۆکی چێشـتلێنەری شـازادە ویـن هویـدا wen hui چقۆکەی دەستی زۆر تیژ دەردەکـەوت کاتێك سـەرقاڵی سـەربڕینی گایـەك بـوو و دواتـر لـەت لـەتی دەکرد کاتێك لێیـان پرسـی نهێنـی ئـەم لەتکردنـە خێرایـەی گۆشـتی گاکـە چیە لـە وەڵامـدا وتـی: ((چـەند بۆشـاییەك لـەنێو جومگەکاندا، نوکی چەقۆکە زۆر تیژە کاتێك ئەم بۆشاییە دەدۆزێتەوە هەموو ئەو بوارە دەدۆزێتەوە هەروەك شنە با دێت و دەچێت هەر لەبەرئەوەیە ماوەی ١٩ ساڵە ئـەم چەقۆیەم هەیـە و هێشـتا وەکـو جاران تیـژە. ))(٩) **ئارام دەگریـت و کـەمێك چـاوەڕوان بیـت؟ هـەتا قوڕەکـە بنیشـێت و ئاوەکـە ڕوونبێتـەوە؟ ئایـا دەتوانیـت بـێ جووڵـە بمێنیتـەوە؟ هـەتا کـرداری دروسـت بـۆ خـۆی هەسـتێتەوە؟** (بەشـی ١٥). کەواتـە ئـاو یەکێکـە لـەو ڕەگەزانـەی هاوشێوەی تاوە لە جیهانی سروشتیدا. بەڵام شێوازی سەرەتایی وو وییە. تێبینی ئەو ڕێگایەیان کرد کە ئاو خۆی ئەگونجێنێت لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا، هەروەها چۆن بـەرەو شـوێنە نزمـەکان دەڕوات بـەخێرایی. بـە هـەمان شێوە: **چاکەی شکۆدار وەکو ئاو وایە، خۆراك دەداتە هەموو شتێك بـەبێ هیچ ماندووبوونێك. ئـەو تـەنها بـە شوێنە نزمەکان ڕازیە کە خەڵکی خۆیان دەپارێزن لەو جۆرە شوێنانە. لەبەرئەوە ئەو وەکو تاو وایە (بەشی ٨)** وێڕای ئەوە ئاو هەڵگری هێزێکی نادیـارە سـەبارەت بـە شـتە ڕەق و تورتـەکان چونکە ئـەو بەردەوامـە لـە ڕۆیشتن بەناو بەردە تیژەکاندا بۆئەوەی وردیان بکات، گونجاو بـن لەگـەڵ ڕێگـای ڕۆیشـتنەکەیدا. ئـەو ڕێگاکـەی دەبڕێـت بەناو سنور و بەژێر دیوارە جوداکەرەوەکاندا. ئەو لەکاتی ڕێکردنیدا بـەردەکان دەتوێنێتـەوە و شـاخە مەزنـەکان دەڕمێنێت کە ئێمە بە نەمر دامان دەنان. هیچ شتێك لە جیهاندا نەرم و ناسك نیە وەکو ئاو وێڕای ئەوە بۆئەوەی شتە ڕەقەکان پارچە پارچە بکات هیچ شتێك ناتوانێت بەسەریدا سەربکەوێت شتی نـەرم بەسـەر ڕەقـدا زاڵـدەبێت ناسك شتی ڕەق تێکدەشـکێنێت هـەموو تاکێك ئـەم ڕاستیە دەزانێت بـەڵام زۆر کـەمن ئـەو کەسـانەی ئـەم زانینـە جێبەجێ دەکەن. (بەشی ٧٨). ئەو بەشێوەیەکی ناکۆتا نـەرم و نیانـە وێڕای ئـەوە هێنـدە بـەهێزە هـیچ کەسـێك نابێتـە هاوشـانی لـە هێـزدا، ئـەم ڕاستیانە دەربـارەی ئـاو بەتـەواوی ڕاسـتی وو وی‌یـە. ئـەو کەسـەی ئـەم حاڵەتـە بەرجەستە دەکات، هەروەك کتێبی تاو تی چینگ دەڵێت کاردەکـات بـەبێکارکردن. هاوشـێوەی ئـەم کەسـە بـەبێ هیچ جۆرە شڵەژانێك مامەڵەدەکات، باوەڕت پێدەهێنێت بـەبێ هێنانـەوەی بیـانو، زامـن ڕەوانـە بـەبێ خۆبـەزلزانین دەرئـەنجام بەدەسـت دێنێـت بـەبێ توندوتیـژی و زۆرەملـێ. وێـڕای ئـەوەی ئـەم هۆکـارەزۆر بەدەگمـەن تێبینـی دەکرێت، کاریگەریەکەی بەتەواوی یەکلاکەرەوەیە. باشترین سـەرکردە ئـەو کەسـەیە گەلەکـەی هەسـت بـە بـوونی ناکەن. سەرکردەی باش، ئـەو کەسـەیە کـە زۆر بەکـەمی دەدوێـت، کاتێـك بـە کارەکـەی هەڵدەسـێت، ئامانجەکـەی بەدەست دێنێت، ئەوانیی تر دەڵێن: ئێمە بۆ خۆمان بـەو کـارە هەسـتاین(بەشـی ١٧). دوا تایبەتمەنـدی ئـاو کـە دەیکاتە هاوشانی گونجاو بۆ وو وی بریتیەلەو ڕوونیەی بەدەست دێت لەڕێگەی ئارامگرتنیەوە. کتێبی تـاو تـی چـینگ دەڵێـت: لێگـەڕێ بـا ئـاوی لێـڵ بنیشـێت و ڕوونببێتـەوە. ئەگـەر ویسـتت توێژینـەوە بکـەیت لەسـەر ئەستێرەکان لـەدوای ئـەوەی دەچیتە نـاو ژوورێکـی ڕونـاککراوە، پێویسـتە بیسـت خولـەك چاوەڕوان بیت هـەتا گلێنـەی چـاومانفراوان ببێـت و ئامـادەبن بـۆ ئـەم کـردارە. پێویسـت چـەند ماوەیـەك هـەبێت هاوشـێوەی ئـەو چاوەڕوانیە، ئەگەر درێژی مێشك بەتوانا بێت لەسەر خوێندنەوەی دروست و پاشەکشەبکات لە بریسکەی جیهان بەرەو قووڵاییە ناوەکیەکانی دەروون (ڕۆح): دەشێت پێنج ڕەنگەکە مرۆڤ توشی کـوێری بکـات. پێنج ئاوازەکە

توشی کەڕی بکەن پێنج چێژەکە توشی سستی دەبن دەشێت پێشبرکێ و ڕاوکردن پیاوان بەرەو شێتی ببات دەستکەوتەکانیان ناهێڵن بەشاشتی بژین بەوهۆیەوە پیاوی خاوەن هەست چاوی ناوەکی بەباشتلر دادەنێت لە چاوی دەرەکی(بەشی ١٢) وێڕای ئەوە ناکرێت ڕوونی بەدەست بێت لەڕێگەی چاوی ناوەکیەوەتەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە ژیان بگات بە بێدەنگی و ئارامی و یەکسان بێت لەگەڵ ئارامی قوڵاییەکانی حەوزێکی مەنگ.

## بەهاكانی تری تاوییەت

هێشتا بەردەوامین لە وێکچواندن لەگەڵ ئاو، چونکە تاوییەکان هنکوڵی دەکەن لە هەموو شێوەکانی جەختکردنەوە لەسەرخود و ململانێ چونکە جیهان لێوانلێوە لەو کەسانەی جەختدەکەونەوە لەسەر خۆدەرخستن یان ئاژاوەنانەوەن ئەوان دەیانەوێت هەمیشە لە پێشینەدا بن. تاوییەت وادەبینێت سودێکی زۆر کەم هەیەلە هاوشێوەی ئەم خواستانەدا: ((تەور لە سەرەتادا لە درێژترین دار دەدرێت)). ئەو کەسەی لەسەر پەنجەکانی پێی دەوەستێت جێگیر نابێت ئەو کەسەی بەخێرایی بەرەوپێش دەچێت زۆر دوور ناڕوات ئەو کەسەی هەوڵ دەدات دەربدەوێت و بدرەوشێتەوە ڕوناکی تایبەت بەخۆی دەکوژێنێتەوە(بەشی ٢٤). هەڵوێستی تاوییەکان بۆ خاکی بوون ڕێنمونی کردن بۆ ڕێزگرتن لە شەل و کوێرەکان و بەرزڕاگرتنیان بەهۆی کە خۆنەویستن. ئەوان تامەزرۆی ئاماژەکردن بوون بۆ بەهای پەرداخ و دەروازە و دەرگاکان خۆنەویستن هەروەك بەفری تواوە. ڕەتکردنەوەی تاوییەکان هەڵقوڵاوە لە بەرزبوونەوە بۆ پلەوپایەی گوێنەدان بەو خەڵاتانەی ئەم جیهانە دەیبەخشێت. ئەم خاڵە دەردەکەوێت لە چیرۆکی سەردانی چوانگ تسو بۆ وەزیری دەوڵەتی دراوسێ، یەکێکیان هەواڵی بە وەزیر دا چوانگ تسو بۆئەوە دێت جێگاکەی تۆ بگرێتەوە بەو هۆیەوە وەزیر لە ترسا بەڵام کاتێك چوانگ تسو ئەم پڕوپاگەندەی بیست وەزیری دڵنیاکردەوە وتی: ((لە باشور باڵندەیەك هەیە پێی دەڵێن یوان چو ئایا ناویت بیستوە؟ ئەو باڵندەیەکە لە زەریای باشورەوە دەست بە گەشتەکەی دەکات هەتا دەگات بە زەریای باکور، لە میانەی گەشتە دورو درێژەکەیدا لەسەر هیچ درەختێك نەدەنیشتەوە جگەلە درەختی وو تانگی پیرۆز، هیچ میوەیەك ناخوات جگەلە گوڵی لیلکی فارسی، هیچ ئاوێك ناخواتەوە جگەلە ئاوی بیری ئەفسوناوی. چاوی بە کوندەپەپویەك کەوت جەستەی جرجێکی هەڵگرتبوو کە هەڵئاوسابوو و بۆگەنی کردبوو، ئەو باڵندەیەی بینی لە نزیك ئەوە دەفڕێت، بەوهۆیەوە کوندەپەپوەکە ترسا باڵندەکەی تر یوان چو بوەستێت و ئەو پاروە بەتام و چێژەی لێ بسێنێت! بۆیە هاواری کرد چو! چو!. ئێستا خەڵکی بە من دەڵێن تۆ هەوڵدەدەیت هاوار بەسەرمدا بکەیت و بڵێیت چو! بۆئەوەی دوورم بخەیتەوە لە وەزارەتە بەنرخەکەت!. ))(١٠) ئەمە هەڵوێستیانە بەرامبەر بە مەزنترین خەڵاتەکانی جیهان. ئەوە خاوەنی بەهایەکی ڕاستەقینە نیە کە خەڵکی گومانی لێدەکات. هیچ نیە جگەلە ڕاستی ململانێ و جەختکردنەوە لەسەر خود؟ وادەردەکەوێت تاو بەبێ ئەوە بەردەوام دەبێت بەشێوەیەکی ناوازە. پێویست ناکات سروشت پێداگری بکات، دەشێت هەڵبکات بۆ نیوە بەیانیەك، نیوەی ڕۆژەکە ببارێت (بەشی ٢٣). پێویستە خەڵك خۆیان بپارێزن لە ڕق وکینەو توندوتیژی، تەنها بەئاڕاستەی ئەوانی تر نا لە ڕەگەزەکەیان بەڵکو بەرەوڕووی خودی سروشت. هەڵوێستی ڕۆژئاوا بەگشتی بەرامبەر بە سروشت وەك دوژمنە، وەك شتێك پێویستە لە دژی بجەنگێین و دەستی بەسەردابگرین و بەسەریدا سەربکەوین. بەڵام هەڵوێستی تاوییەت بەتەواوی پێچەوانەی ئەمەیە. سروشتێکی قووڵ هەیە لە فیکری تاوییدا، بەڵام وەکو سروشتی روسو یان وردز ورس یان زوریو نیە هەروەها وەك سروشتی گالیلۆ یان بیکون نیە. ئەوانەی دەیانەوێت دەستبگرن بەسەر زەویدا وە پێکهێنانی بەپێی خواست و ئارەزوویان هەرگیز سەرکەوتو نابن هەروەك تێبینیت کرد. زەوی وەکو دەفرێکی زۆر پیرۆز وایە، تەنها نزیکبوونەوەی دونیایی لێی تێکی دەدات و دەیشێوێنێت کاتێك دەستیان پێی دەگات ون دەبێت و نامێنێت. (بەشی ٢٩). پێویستە ببینە هاوڕێی سروشت. کاتێك بەریتانیەکان توانیان سەربکەون بەسەر بەرزترین چیای سەر زەویدا ئەم کارە بەرز نرخێندرا بەجۆرێك سەرکەوتن بەسەر لوتکەی ئیڤێریستدا بە دەستکەوتێکی مەزن دانرا. بەڵام د. ت. سوزوکی تێڕوانینی تری هەبوو لەسەر ئەم بابەتە وتی: ((بەڵام ئێمەی ڕۆژهەڵاتی ئەگەر بەو کارە هەستاین ئەوا دەماوت

هاوڕێیەتی بەستن لەگەڵ ئیڤیریستدا نەك داگیرکردنی)). بەڵام ئەو گروپە ژاپۆنیەی سەرکەوت بەسەر لوتکەی ئەنابورنەدا کە دووەم بەرزترین لوتکەیە لە جیهاندا کە شاخەوانێکی ڕۆژئاواییان لەگەڵدا بوو سەرسام بوو کاتێك وتیان ئەمە سەرکەوتنێکی مەزنە!. تاوییەت هەوڵدەدات تەریب بێت لەگەڵ سروشتدا نەك دەست بگرێت بەسەریدا. ئەمە بەراوردکردنێکی ژینگەییە، ئەمە ئەو کارە بوو جۆزیفنیدهام joseph needham ئاماژەی بۆ کرد وێڕای ئەوەی چینیەکان دواکەوتبوون لە زانستە تیۆریەکاندا بەڵام هەر لەدێر زەمانەوە ((فەلسەفەی ئەندامیان پەرەپێدانی لەبارەی سروشتەوە کاتێك زانستی نوێی ناچارکرد بیگرێتەخۆی لەپاش سێ سەدە لە مادیبوونی میکانیکی)). بەراوردکردنی ژینگەیی تاوییەت چەندین ئەندازیاری ڕۆژئاوایی سەرسام کرد بەتایبەت فرانك لیود رایت frank lloyd wright. پەرستگاکانی تاوییەت دەرناکەون بەشێوەیەکی دوور لە ژینگەی دەوروبەریان. لەگەڵ کێوەکاندا دەجەنگێت لەژێر درەختەکاندا تێکەڵ بووە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا بە باشترین شێوە چونکە بوونەوەرە مرۆییەکان هەمان کار دەکات چونکە بەنرخترین داهێنانی خۆ گونجاندنە لەگەڵ تاوییەتدا، جێهێشتنی هێزە ئەفسوناوییەکەی کەلەناخیاندا کاردەکات. نزیکبوونەوەی تاوییەت لە سروشت کاریکردەسەر هونەری چینی بەشێوەیەکی قووڵ، چونکە ڕێکەوت نیە خۆی بگونجێنێت لەگەڵ مەزنترین ماوەکانی هونەری چینی لەگەڵ زۆربوونی کاریگەری تاوییەت. پێش ئەوەی هونەرمەند قەڵەم و کاغەز بەدەستەوە بگرێت دەچووە ناو سروشت و تیایدا دەتوایەوە، وەك دەوتریت دەبووە ئەو دار حەیزەرانەی کە وێنەی دەکێشا. هونەرمەندان نیوەی ڕۆژ دادەنیشتن پێش ئەوەی قەڵەم بخەنە سەر کاغەزی وێنەکێشانیان. وشەی چینی کەلە بارەی پانۆرامای سروشتەوەدیمەنی سروشت دەدوێت پێکهاتوە لە چاوگی شاخ و ئاو، دووەم ئاماژە دەکات بۆ خۆگونجاندن و بەردەوامی و جموجوڵی بەردەوام. بەشە مرۆییەکەی کەمە لەبەرئەوە پێویستە بەوردی سەیری بوونەوەرە مرۆییەکان بکەین لە وێنەکاندا، ئەمە ئەگەر لە بنەڕەتدا بوونی هەبێت. بوونەوەرە مرۆییەکان وێنەیان دەکێشرێت لە حاڵەتی هەڵگرتنی کۆڵەپشتێك یان بەسەر پشتی گامێشێکەوە یان کاتێك پاڵ دەنێت بە بەلەمێکەوە بە ئاماژەکردن بۆ ڕۆح لە گەشتەکەیدا، بۆ ئەو بارەی لەکۆڵی ناوە، ئەو شاخەی بەسەریدا سەرکەوتوە، دەورەدراوە بە جوانی لە هەموو لایەکەوە. چونکە مرۆڤەکان جوان نین وەك شاخەکان و تەمەندرێژ نین وەك دار سنەوبەرەکان، وێڕای ئەوان سەربە سیستمی شتەکانن لەبەرئەوە سیستمی سروشتی بەتەواوی هەمووان سەر بەئەون هەروەك باڵندەکان و هەورەکان. تاوی ئەزەلی هەڵدەقوڵێت لەناو خەڵکەوە هەروەك شتەکانی تر لەم جیهانەدا. سروشتی تاوییەت کۆبووەتەوە لەگەڵ مەیلی سادەیی سروشت لەبەرئەوە خۆبەزلزانین و شانازی بەخۆوەکردن لە شتە بێ بەها و بێ ماناکانە. کاتێك شوێنکەوتوانی چوانگ تسو داوایان لێکرد ڕێگەیان پێبدات بۆئەوەی ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی بۆ بکەن لەدوای مردنی لەوەڵامدا پێی وتن: ((ئاسمان و زەوی کەفەنی دەرەکی و ناوەکی منن. خۆر و مانگ و ئەستێرەکان پۆشاکمن، جیهان بەگشتی ڕێوڕەسمی جەنازەکەمن. ئیدی چیم بۆی لەوە زیاتر؟)).

تاوییەکان گاڵتەیان بە شارستانیەت کرد و سەرەتایی بوون و سادەبوونیان بە باشتر دەزانی. لاوتسو وتی: ((با وڵاتێکی بچوکمان هەبێت و ژمارەیەکی کەم لە دانیشتوان تیایدا بژین، لێگەڕێ با خەڵك بگەڕێنەوە سەر بەکارهێنانی گوریسی گرێکان بۆ پاراستنی تۆمارەکانیان. لێیان گەڕێ با خواردنی بەتام بخۆن، ماڵەکانیان ئاسودەیە، با سادەبێت کارەکانیان)). تاوییەت هانی گەشتکردن نادات لەبەرئەوەی کارێکی بێ ئامانجە، پەلکێشمان دەکات بەرەو شتی بێمانا و بێهودە. ((لەوانەیە دەوڵەتی دراوسێمان زۆر نزیك بێت بەجۆرێك

دەتوانین گوێمان لە خوێندنی دەنگی کەڵەشێر و وەڕینی سەگەکانی بێت وێڕای ئەوە کەسەکان گەورە دەبن و دواتر دەمرن بەبێ ئەوەی سەردانی بکەن تەنانەت بۆ تەنها جارێك بێت))(١١).

ئەم سادەییە تاوییەتی دوورخستەوە لە کونفوشیەت. ئامانجە سەرەکیەکانی هەردوو خوێندنگاکە ناگۆڕێت، بەڵام تاوییەکان نایانەوێت هەڵسوکەت بکەن لەگەڵ کونفوشیەکاندا، لەبەرئەوەی کونفوشیەکان گرنگی دەدەن بە ڕوکاری دەرەوەی شتەکان، ڕێوڕەسم تاوییەکان ساردبوونەوە لە مامەڵەکردن لەگەڵیان. نزیکبوونەوەیان لە یەکتر بەگشتی ڕووکاریە و توندوتۆڵ نیە. کونفوشیەت تەنها نمونەیەکی مرۆیی بوو بۆ نزیکبوونەوە لە ژیان بەشێوازێکی ڕێکخراو. هەموو سیستەمە تاوتوێکراوەکان، هەموو هەوڵدانەکانیان بۆ ڕێکخستنی ژیان بەپێی سیستمێکی ڕێکخراو بێمانایە و خاڵیە لە هەموو سودێك.

| | | |
|---|---|---|
| ئەمە وەکو ڕێگا جیاوازەکانی بڕینەوەی هەمان ڕاستیە. ماوە قورسەکان لە هەرێمی سانج sung پاسەوانی مەیمونەکانی ناچارکرد بڕی ژەمە خۆراکی مەیمونەکان کەمبکەنەوە، رایگەیان: ((لەئێستاوە سێ مۆز بەیانیان و چوار بۆ ئێواران)) کاتێك بەرەوڕووی شۆڕش بوویەوە پاسەوانەکە ڕازی بوو دانوستان بکات لەگەڵیان دواجار ڕازی بوو بە داواکاری مەیمونەکان بەوەی چوار مۆز بۆ بەیانیان و سیان بۆ ئێواران. بەمجۆرە مەیمونەکان شادومان بوون بە سەرکەوتنەکەیان!. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی تری تاوییەت تێگەیشتنەیتی بۆ بەهاکان، گونجان و نەگونجانیان لەگەڵ یەکتردا لەبەرئەوەی بەیەکەوە پەیوەستن. لێرەدا تاوییەت بە قووڵی پەیوەستە بە هێمای کلتوری چینی یین-یانگ yin/yangەوە کەبەمشێوەیە وێنادەکرێت: Yin واتە ڕەنگی ڕەش ئاماژەدەکات بۆ تاو لە بیری چینیدا بۆ بازنەیەکی بەتاڵ کە بریتیەلە یەکەم بنەما پێش | | هەموو ئەو شتانەی لە گەردوندایە تێکەڵەیەکە لە وزەی موجەب و وزەی سالیب. بەشە تاریکەکە وێناکراوە لە بەشە سپیەکەدا و بەشە ڕووناکەکە لە بەشە ڕەشەکەدا چونکە تاو شکۆدار نابێت لە حاڵەتە پوختەکەیدا.<br>(وەرگێڕی عەرەبی) |

| دەرکەوتنی شتەکانی بوون، دواتر بازنەکە بازنەکەی ناویان ڕەنگەکەی دەگۆڕێت لە سپییەوە بۆ ڕەش Yang بریتیەلە بنەمای دوای دەرکەوتنی شتەکانی بوون کە دروستبوون بەهۆی سوڕانەوەی هەردوو هێزەکە هێزی موجەب و هێزی سالیب. | | |
| --- | --- | --- |

ئەم دوانەییە هەموو دژبەیەکبوونەکانی سەرەکیەکانی ژیان کورتدەکاتەوە: چاکە\خراپە، بکەر\کارتێکراو، پۆزەتیڤ\نێگەتیڤ، ڕووناکی\تاریکی، هاوین\زستان، نێر\مێ. بەڵام وێڕای ئەوەی ئەم دادپەروەریە لە حاڵەتێکی شڵەژاندایە بەڵام بەتەواوی دژبەیەك نیە، جێنشینە لە قووڵاییەکانی بواری هاوشانەکەیدا.
دواجار دوان خۆیان دەبیننەوە کە شی بوونەتەوە لەڕێگەی ئەو بازنەیەی دەوری داون، ئەوەش تاوە لە کاملبوونی سەرەتاییدا. لەمیانەی ئەم کاملبوونەدا دژبەیەك دەرناکەون زیاتر لە ئاستەکانی سوڕانەوەی ناکۆتادا، چونکە هەریەکەیان بەبەردەوامی دەگۆڕێت بۆ پێچەوانەکەی کاتێك ئاڵوگۆڕ بە جێگاکانیان دەکەن. ژیان بەرەوپێش ناچێت یان بەرەو سەرەوە بە ئاراستەی لوتکە یان بە ئاراستەی جەمسەرێکی دیاریکراوی جێگیر. بەڵکو دەچەمێتەوە بۆ ناو خۆی بەمجۆرە بازنەیەکی تەواو دروست دەکات هەتا بگات بەو دەرکپێکردنەی کە هەمووان یەك تاکن و هەمووان باشن.
تاوییەکان دەڵێن ئەو کەسانەی بە تێڕامانەوە سەیری ئەم هێما قووڵە دەکەن ئەوەیان بۆ دەردەکەوێت کە دەیانگەیەنێت بە باشترین نهێنیەکانی جیهان لە هەر وشەیەك یان مشتومڕی دوورودرێژ. بە خۆگونجاندن لەگەڵگرنگی ئەم هێمایە، تاوییەت خۆی بەدووردەگرێت لە دابەشبوون. چونکە هیچ تێڕوانینێك نیە لەم جیهانەدا کە ڕێژەیی بێت و بەشێوەیەکی ڕەها دابنرێت. کێ دەزانێت کەی ڕێگا بازنەییەکە دوورودرێژ دەبێت لەڕاستیدا کورتترین ڕێگایە بۆماڵەوە؟ یان تێڕامانی ڕێژەیی خەون و بەئاگایی: چوانگ تسو خەونی بەوەوە بینی کەبووەتە پەپولە، بیری لەوە دەکردەوە لەکاتی خەونەکەیدا دەکرێت هەموو شتێك بێت جگەلە پەپولە، بەڵام کاتێك لەخەوهەستا سەرسام بوو بەوەی خۆی بینیەوە چوانگ تسو، بیری لەوە کردەوە: ئایا بەڕاست چوانگ تسو خەونی بەوەوە بینی کە پەپولە، یان پەپولەیە خەون دەبینێت کە بووەتە چوانگ تسو!؟
کەواتە هەموو بەها و چەمکەکان دواجار ڕێژەیین سەبارەت بە مێشکی ئەو کەسەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.
کاتێك وترا بەو باڵندانەی ناتوانن بفڕن وترا چەند جۆرە باڵندەیەك هەن دەتوانن ماوەیەکی دوور بفڕن بەبێ وەستان ئەوان ئەم کارەیان بە شتێکی نەشیاو زانی، سەریان ڕاوەشاند و وتیان: ((ئێمە دەزانین دوورترین ماوە کە باڵندەیەك بتوانێت بفڕێت لە درەختێکەوە بۆ یەکێکی ترە، تەنانەت ئەمە ناکرێت بۆ یەکێك دڵنیا بێت لەوەی هەموو جارێك دەتوانێت پێی بگات. ژونکە زۆربەی کات هەست بەوە دەکەین کاتێك دەمانەوێت بەرەو پێش بچین هێزێك بەرەو دواوە کێشمان دەکات. هەموو ئەم چیرۆکانە لەبارەی فڕینەوە بەیەکجار بۆ ماوەیەکی دوور تەنها شتێکی بێمانایە!)).

تێڕوانینی تاوی تەنانەت چاکە و خراپە دژبەیەك نین بەتەواوی. ئەگەر ڕۆژئاوا مەیلی دابەشکردنی ئەم دوانەی هەبێت بەشێوەیەکی توند ئەوا تاوییەکان کەمتر مەیل دەکەن بۆ ئەم دابەشکردنە. ئەوان پشتدەبەستن بە چیرۆکی خاوەن کێڵگەکە کە ئەسپەکەی هەڵهاتبوو و ڕۆیشتبوو، دراوسێکەی هاتەلای بۆ دڵدانەوەی بەڵام خاوەن کێڵگەکە لەوەڵامدا پێی وت: ((کێ پێی گوتی هەڵهاتنی ئەسپەکەم شتێکی خراپە؟ کێ دەزانێت لەڕاستیدا چی خراپە و چ شتێك چاکە؟؟)). خاوەن کێڵگەکە لەسەر حەق بوو لەم بابەتەدا چونکە لە ڕۆژی دواتردا ئەسپەکە گەڕایەوە و کۆمەڵە ئەسپێکی کێوی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کە لەکاتی ڕاکردنیدا چووبووە لایان. بۆ جاری دووەم دراوسێکەی هاتەوەلای بەڵام ئەم جارە پیرۆزبایی لێکرد بەهۆی خۆشبەختیەکەیەوە بەڵام گوێی لە خاوەن کێڵگەکە بوو هەمان وەڵامی دایەوە: ((کێ دەزانێت چی باشە و چ شتێك خراپ؟؟)). دووبارە لەسەر حەق بوو چونکە لە ڕۆژی دواتردا کوڕی خاوەن کێڵگەکە هەوڵی دا یەکێك لە ئەسپە کێویەکان ڕام بکات بەڵام کەوت و قاچی شکا. بۆ جاری سێیەم دراوسێکەی هاتە لای بۆ دڵدانەوەی بەڵام هەمان وەڵامی گوێ لێ بوو: ((کێ دەزانێت چی باشە و چ شتێك خراپە؟)). بۆجاری چوارەم ڕاستگۆیی جوتیارەکە دەردەکەوێت، بەوەی لە ڕۆژی دواتردا کۆمەڵە سەربازێك هاتنە ئەو ناوچەیە بە ئامانجی ڕاکێشانی زۆرەملێی خەڵك بۆ سەربازی بەڵام کوڕی جوتیارەکەیان نەبرد بەهۆی برینداریەکەیەوە. کەواتە ئەم چیرۆکە هاوشێوەی چیرۆکی زن zen دەردەکەوێت چونکە بوزییەت کاتێك چارەسەرکرا لەڕێگەی تاوییەتەوە ڕێبازی زن لێی جودابوویەوە.

تاوییەت بەردەوامە لە بەرنامەکەی سەبارەت بە ڕێژەیی بوون هەتا کۆتاییەکەی کاتێك ژیان و مەرگ دەخاتە نێو ئەو سوڕانەی کە یەکێکیان ئەوی دی تەواو دەکات لە ڕیتمی تاو دا. کاتێك ژنەکەی چوانگ تسو مرد هاوڕێکەی هوی تسو سەردانی کرد بۆ دڵدانەوەی، بینی ((لەسەر زەوی دانیشتوە، هەردوو قاچی درێژکردوە و گۆرانی دەڵێت و دەفرێکی تەختەیینی بەدەستەوەیە و پیایدا دەکێشێت. بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی: ((بەڵام دواجار ئەو بەوپەڕی وەفاداریەوە ئەو هەموو ساڵە لەگەڵت ژیانی بەسەر برد، شەونخونی کرد بەدیار کوڕەکەتەوە کە منداڵ بوو هەتا بووە پیاوێکی کامڵ، لەگەڵ تۆدا ژیا و پیر بوو، ئەگەر تاکە فرمێسێك نازڕێژیت بەهۆی مردنیەوە ئیدی چۆن دادەنیشیت و ئاوەها گۆرانی دەڵێیت و دەکێشیت بەو دەفرە تەختەیینەدا؟! بەڕاستی ئەم کارەت زۆر خراپە!)).

لەوەڵامدا چوانگ تسو پێی وت: ((تۆ بە هەڵە لەمن تێگەیشتوویت. چونکە کاتێك گیانی لەدەستدا دڵگراتن بووم هەروەك هەموو پیاوێك کە ژنەکەی لەدەست دەدات. بەڵام دواتر دەرکم بەوە کرد ئەو پێش ئەوەی لەدایك بێت جەستەی نەبوو، بۆم ڕوون بوویەوە هەمان کرداری گۆڕان هێناویەتە ئەم ژیانە، هەر هەمان کردارە بەرەو مەرگی بردووە. ئەگەر مرۆڤ ماندوو بوو ڕۆیشت هەتا پشوو بدات پێویست ناکت دوای بکەوین بە شیوەن و گریان. لەبەرئەوە ژنەکەم کە لەدەستمداوە چووە هەتا بخەوێت لە ژوورێکدا لەنێوان زەوی و ئاسماندا. گریان بەدوای ژنەکەمدا دژایەتی کردنی یاسای سروشتە. بەوهۆیەوە هەڵنەسام بەو کارە)).

چوانگ تسو لەجێگایەکی تردا باوەڕبوونی بە مەرگ دووپاتدەکاتەوە:

ئەمە گۆی زەویە

بنەمای بوونی مادی

قورسی کردوم بە ئەرك و کارەکان

پشوودانم پێدەبەخشێت لە کۆتایی تەمەنمدا

ئاشتەواییم پێ دەبەخشێت لە مردندا

چونکە ئەو کەسەی ئەو شتانەی پێبەخشیوم کە پێویستمن لە ژیاندا
بە هەمان شێوە ئەو شتانەم دەداتێ کە پێویستم پێیانە لە مردندا(١٢).
کەواتە شتێکی سەیر نیە تێڕوانینی دژبە توندوتیژی ببینین لە تاوییەتدا. چەند بڕگەیەك لە کتێبی تاو تی چینگ هاوشێوەی ئامۆژگاری شاخەکەیە:
ئەو کەسەی دەیەوێت ڕێنمونی سەرۆکێك بکات لەبارەی سودەکانی ژیانەوە
ئەوا ئاگاداری دەکاتەوە لە بەکارهێنانی چەك بۆ مەبەستی هێرش بردن
تەنانەت باشترین جۆرەکانی چەك، هیچ نین جگەلە کۆمەڵە کەرەستەیەکی ئەهریمەن (خراپە):
بەروبومی سوپای زەوی لەناوچونە(بەشی ٣٠)
چەکەکان کەرەستەی توندوتیژین
هەموو پیاوە بەڕێزەکان قێزی لێدەکەنەوە.
چەکوتەقەمەنی کەرەستەی ترس و تۆقاندنن
پیاوی بەڕێز بەکاریان ناهێنێت
تەنها لەکاتی پێویستدا نەبێت.
ئەگەر ناچارکرا بەکاری بهێنێت
ئەوا بە وریاییەوە بەکاری دەهێنێت.
ئاشتەوایی شکۆدارترین بەهای هەیە. . .
بەڕێزەوە دەچێتە مەیدانی جەنگەوە
لێوانلێو لە دڵتەنگی و بەزەیی
هەروەك بۆ ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن بچێت. (بەشی ٣١)
ئەگەر بەهای کارکردنی زانایانی چین بۆ لوتکەی پلەوپایە کۆمەڵایەتیەکان بگەڕێتەوە بۆ کونفوشیوس، ئەوا تاوییەت بەتەواوی بەرپرسە لە باری سەرباز لەناو کۆمەڵگەدا. ((ئەو ڕێگایەی پێویستە بیگرێتەبەر ئەو کەسەی دەیەوێت مرۆڤێکی چالاك بێت ڕێگای سەرباز نیە)). تەنها ئەوە ((هەموو خەڵك بە ئەندامی جەستەی دەزانێت، بەتەواوی ئامادەیە بۆ پارێزگاری کردنیان. ئاسمان ئەو کەسانەی کە حەز ناکات بە شکستخواردویی بیانبینێت پڕچەکیان دەکات بە سۆز و بەزەیی)).
جەنگ شتێکی خەمناك و تاریکە، تاوییەت دواوە لەبارەی کێشەکانی ژیانەوە. لەکاتێکدا ئەو ڕوناکیە دەپارێزێت کە دەگاتە ئاستی شادومانی. ئێمە لەکاتی بینینیدا تێبینی ئەفسونەکەی دەکەین. کتێبی تاو تی چینگ دەڵێت: ((ئەو کەسەی هەست دەکات کونی تێکراوە یان بڕدراوە ئەوە بێگومان تەنها بڵقێك بووە و هیچی تر)). کەم دووان و ڕاستگۆیی کەلەم جۆرە وتانەدا دەبینرێت تێڕوانینی گشتی ئەم کتێبە دەخاتەڕوو. ئازادی دەکات لەو شتانەی دەیبەستێتەوە بە ژیانەوە، تاوییەت هاوشێوەی تێڕوانینەکانی تری چینە، بەڵام وەك بینیمان جیاوازە لە کونفوشیەت لەودا کە گرنگی نادات بەو ڕووکاری دەرەوەی شتەکان. ئەدەبیاتی تاویی پڕە لەو لێدوانانەی کە لەگەڵ کونفوشیەتدا ئەنجامدراون هەمیشە بیرتەسك و لەخۆباین. نمونەیەك لەسەر ئەمە یرۆکی چوانگ تسوی تاویی و هوی تسوی کونفوشیە کە لەکاتێکدا بەسەر پردی هاو دەپەڕیەوە. ژوانگ تسو (تاویی) پێی وت: ((سەیربکە ماسی ژۆن بازدەدات بە سەربەستی، ئەمە ئەو شادومانییە کە ماسی هەستی پێ دەکات)).

**هوی تسو لەوەڵامدا پێی وت: ((تۆ ماسی نیت، چۆن دەزانیت ماسی بەو کارە دڵخۆش دەبێت؟)).**

**چوانگ تسو لەوەڵمدا وتی: ((تۆ وەکو من نیت، ئیتر چۆن دەزانین من زانیاریم نیە لەبارەی ئەو شتەی ماسی دڵخۆش دەکات؟)).**

## کۆتایی

کونفوشیەت و تاوییەت کە دەوری یەکتریان داوە وەکو یین/یانگ (ڕوناکی و تاریکی). کونفوشیوس لایەنی کلاسیکی و کلتوری دەنوێنێت لەکاتێکدا لاو تسو لایەنی ڕۆمانسی دەنوێنێت. کونفوشیوس گرگنی دەدات بە مرۆڤ، لەکاتێکدا لاو تسو گرنگی دەدات بەوەی لەپشت مرۆڤەوەیە و مرۆڤ شکۆدار دەکات. هەروەك چینیەکان دەڵێن: کونفوشیوس دەچێتە ناو کۆمەڵگەوە بەڵام لاوتسو لەناو ناخیدا هاتوچوون دەکات. شتێك لە ژیانە درێژدەبێتەوەلە هەریەکە لە دوو ئاڕاستەکەدا بێگومان شارستانیەتی چینی هەژار دەبێت ئەگەر هەریەك لەم دووانە لەدەست بدات.

هەندێك تێب هەن کە بە خوێندنەوەیان بۆ یەکەمجار کاریگەریەکی ئەفسوناویمان لەسەر جێدەهێڵێت کەناتوارێت دواتر لابرێت، هۆکارەکەی بریتیەلەوەی قوڵترین قەڵاییەکانی منی باڵای خوێنەر دەدوێنێتز سەبارە تبە هەموو ئەو کەسانەی ئەو بیرکردنەوەیان هەیە کە لە هەموو کات و شوێنێکدا هێزی تاو بەناویاندا هاتوچۆ دەکات، کتێبی تاو تی چینگ یەکێکە لەو کتێبە ئەفسوناییانە. بەهەمان شێوە کاریگەر بوو لەسەر زۆربەی چینیەکان، بەڵام شاعیرێکی ئەمریکی دایدەنێت بەی ((یەکیچك لەو کتێبانەی زۆرترین ڕوونکردنەوەی تێدایە لەبارەی بەردەوامی ژیان، هەروەها باشترین ئامۆژگاری لەخۆ دەگرێت لەبارەی چێژوەرگرتن لە ژیان))(١٣). وێڕای ئەوەی هیچ کەسێك تا ئەمڕۆ بەتەواوی پەیڕەوی ڕێنماییەکانی ناو ئەم کتێبەی نەکردوە بەڵام وانەکانی لەبارەی سادەیی و کراوەیی و داناییەوە هەتا ئەمڕۆ بەڵگەیەکی دڵخۆشکەرن بۆ ملیۆنەها چینی.

بوونەوەرێك هەیە، کامڵ و کەموێنەیە،

دۆزراوەتەوە پێش ئاسمان و زەمین

چەندە هێمن و لەسەرخۆیە؟

چەندە ڕۆحپاکە؟

بە تەنهایی دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت.

لە نزیك و دوور بوونی هەیە، وێڕای ئەوە بێزار نیە بەوەی بە خۆشەویستیەکەی هەموو شتێك دادەپۆشێت وەکو پۆشاکێك،

وێڕای ئەوە داوای ئەوە ناکت ببێتە سەرکردە و پێشەوا

من ناوی ئەو نازانم، بەوهۆیەوە ناوی دەنێم تاو tao: ڕێگا،

شادومانم بەو هێزەی خاوەنیەتی. (١٤)

<u>کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر:</u>

١-وەرگێڕانێکی ئینگلیزی ورد نیە بۆ دەقی بنەڕەتی تاویی، بەڵام وەرگێڕانی ستیڤن میچیل بۆ کتێبی تاو تی چینگ بە نزیکترین وەرگێران دادەنرێت بۆ دەقە بنەڕەتیەکە. وەرگێڕانی د. سی. لو چەند تێبینیەکی بەسوودی لەخۆ گرتوە.

٢-هەروەها کتێبی جیا-فوفونگ/وجان دەقە ئینگلیزیەکەی چەند دەقێکی ڕوون و متمانەپێکراوی تێدایە.

٣-کتێبی ڕێگای چوانگ تسو لە نوسینی تۆماس میترون تێڕوانینێکی ڕوون دەدات لەبارەی ئەو بیرمەندە مەزنەوە.

٤-تەواوی کارەکانی چوانگ تسو وەرگێڕدراوە لەلایەن بورتون واتسون لەژێر ناونیشانی the complete works of chuang tzu.

٥-کتێبی لاوتسو و تاوییەت لە نوسینی ماکس کالتنمارك تێڕانینێکی گشتگیر بەدەستەوەدات لەبارەی کلتوری تاویی بەشێوەیەکی گشتی.

٦-یەکێك لە گرنترین لێکدانەوەکان لەبارەی فەلسەفەی تاوییەت لە بەشی دووەمی کتێبیتوشیکیهو ئیزوتسو، سۆفیگەری و تاوییەت.

<u>کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر بە زمانی عەرەبی:</u>

١-سر الزهرة الذهبية، القوى الروحية و علم النفس التحليلي. تأليف ريتشارد ويلهلم وك. غ. يونغ. ترجمة نهاد خياطة. ط١، دار الحوار: اللاذقية، ١٩٨٨م.

٢-كتاب تاو تي تشينغ انجيل الحكمة التناوية في الصين، لاوتسو، صياغة عربية للنص، تقديم و شرح و تعليق فراس السواح، ط٢، منشورات دار علاء الدين، دمشق، ٢٠٠٠م.

<u>پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی تاوییەت</u>

١. تاو تی چینگ بەشی ٥٦.

٢. واتە لیستی ئەو دەرمانانەی بەکارهێنراوە لەلایەن پزیشکە چینیە دێرینەکانەوە، زۆربەیان بەڵگەی مێژوویین لەبارەی چالاکی و کاریگەریانەوە، دەرگایەکی فراوان دەکاتەوە بۆ گرنگیپێدانی هەموو جیهانی ڕۆژئاوایی بە بواری پزیشکی لە نوسینی ریچارد سولزر لە کتێبەکەیدا بەناوی وانە کوشندەکان چەند تێبینیەك لەبارەی هونەری نەشتەرگەریەوە

٣. وشەی نەمری دوو واتای هەیە لە تاوییەتدامیکل ساسو بە پێناسەکردنی پیاوێك کە بەدوای نەمریدا دەگەڕێت بەڵام بەردەوامە لە قسەکانی بەوەی نەمری سەبارەت بە زۆربەی خەڵك بە واتای تەمەن درێژی نایەت بەڵکو حاڵەتێکە تایدا مرۆۆ لەدوای مەرگ دەبرێت بەرەو سزادان لە دۆزەخدا. کتێبی: تاوییەت و ڕێبازی نوێبوونەوەی گەردونی ل٣.

٤. لەڕاستیدا تۆو لەو کاتەدا دەگەڕێتەوە ناو میزڵدان دواتر لەگەڵ میزدا دێتەدەرەوە، بەڵام چینیەکان لەو کاتەدا ئەمەیان نەدەزانی.

٥. ئارسەر والی وەریگرتوە لە ڕێگا و هێزەکەی ل. ٤٨-٤٩.

٦. تاو تی چینگ بەشی ٢ و ٧ وەرگێڕانی ئارسەر والی.

٧. کتێبی دانییل ئۆفرمایر: ئایینەکانی چین ل. ٣٩.

٨. ئەگەر پێچەوانەی ئەوە دیاری نەکەین ئەوا ئەم وەرگرتنانە لە تاو تی چینگ لە بەشەکانی ٨، ١٥، ٢٤، ٣١، ٧٨ لە وەرگێڕانی ستیڤن میشیل بۆ کتێبی تاو تی چینگکە لە بەشەکانی ٩، ١٢، ١٧، ٢٣، ٢٧، ٢٩، ٣٠ کتێبی بەرنامەی ژیان هاوشێوەی لاوتسویە.

٩. وەرگیراوە لە کتێبیڕێگای چوانگ تسو لە نوسینی توماس میترون ل. ٤٥-٤٧.

١٠. بورتون واتسون وەرگێڕان لەژێر ناونیشانیچوانگ تسو کارە سەرەکیەکانی ل. ١٠٩-١١٠.

١١. وەرگێڕانی فونگ یو-لان لە کتێبی تاو تی چینگ بەشی ٨٠ لە کتێبی مێژوی کورتکراوەی فەلسەفەی چینی، ل. ٢٠.

١٢.	**وەرگیراوە لە وەرگێڕانی کزل. ریچیل لەبەشی بیستوپێنج لە کتێبی تاو تی چینگ لە ناو کتێبی: تێڕامان و لەخواترسان لە ڕۆژهەڵات ل. ١٠٢.**

١٣.	**کتێبی بەرنامەی ژیان هاوشێوەی لاوتسو ل. ١٢-١٣.**

١٤.	**وەرگیراوە لە وەرگێڕانی ك. ل. ریچیل لە بەشی بیستو پێنجەی کتێبی تاو تی چینگ لەناو کتێبیتێڕامان و لەخواترسان لە ڕۆژهەڵات ل. ١٠٤.**

# ٦

# یەهودییەت

سیّ بەشی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی هەڵگری مۆرکی باوباپیرانی جولەکەیە.  هەریەك لە ئێمە دەتوانێت تێبینی هێزی کاریگەری ئەو ناوانە بکات کە منداڵەکانمانی پیّ ناو دەنێین:  ئادەم سمیس، نوح ویبستر، ئیبراهام لینکولن، ئیسحاق نیوتن، ریبیکا ویست، سارە تیسدال، جراندما موزس(موسا).
ئەم کاریگەریە بەشێوەیەکی ئاشکرا دەبینین لەلای مایکل ئەنجلۆ کاتێك پەیکەرێکی تاشی بە ناوی داوود، کاتێك وێنەی بنمیچی سیستینی کێشا، ئەمە ئەو کاریگەریەیە کە شاعیر دانتی هەڵگری بوو کاتێك کۆمیدیای یەزدانی نوسی، میلتون کاتێك بەهەشتی ونبووی نوسی.  چونکە ویلایەتە یەکگرتوەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەڵگری جیّ پەنجەی  میراتی یەهودیە کە لاچونی نیە:  ڕستەی بە پەروەرێنیان لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆییدا، وشەکانی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە هەموو ناوچەکانی جیهان هەڵکۆڵراوە لەسەر زەنگی ئازادی. . .  بەڵام کاریگەری ڕاستەقینەی جوولەکە لەسەر شارستانیەتی ڕۆژئاوایی حەشاردراوە لەو کاریگەریەی فیکری یەهودی هەیەتی لەسەر ئەو تێڕوانینەی کە جیهانی ڕۆژئاوا دەیگرێتەخۆی بە ئاڕاستەی قوڵترین ئەو کێشانەی ژیان دەیانخاتەڕوو.
کاتێك بیردەکەینەوە لە کاریگەری تێڕوانینی یەهودییەت لەسەر شارستانیەتی ڕۆژئاوا، هەوڵدەدەین بگەڕێینەوە دواوە بۆ سەر ئەو زەوی و نەتەوە و مێژووەی کە ئەم کاریگەریەی دروستکردوە، ئەوکاتە توشی شۆك دەبین چونکە بێگومان پێشبینی ئەوە دەکەین ڕەگوڕیشەی ئەو زەوی و نەتەوە و مێژووە بێوێنەیە بەشێوەیەك هاوشانی کاریگەریەکەی بێت بەڵام دواجار دەزانین کە بەو شێوەیە نیە.  چونکە لەسەر ئاستی کات عیبرانیەکان دواکەوتون لە دەرکەوتنیان لەسەر شانۆی مێژوودا.  چونکە لە نزیکەی ٣٠٠٠ ساڵ پێش زایین، میسر خاوەنی هەڕەمەکانی بوو، سۆمەر و ئەکاد دوو ئیمپراتۆریەتی جیهانی بوون، هەروەك فینیقیا دەستیپێکرد لە نزیکەی ١٤٠٠پ. ز.  دەستیکرد بە داگیرکردنی زەویەکان، ئایا جوولەکە لە کویّ بوون لەنێو ئەم گێژاوە مەزنەدا؟ ئەوان هیچ نەبوون جگەلە کۆمەڵێکی وەلانراو و لەبیرکراو زۆر کەم بوون کە بەناو بیاباندا دەهاتن و دەڕۆن، زۆر لەوە کەمتر بوون کە تێبینی بکرێن لەلایەن هێزە مەزنەکانی ئەو سەردەمەوە.
کاتێك بۆ دواجار جێگیر بوون ئەو زەویەی هەڵیان بژارد زەویەکی زۆر سادە بوودرێژیەکەی نزیکەی ١٥٠ میل بوولە دان بۆ بئر سبع، پانیەکی نزیکەی ٥٠ میل بوو کاتێك بە ئۆرشەلیمدا (قودس)تێپەڕ دەبوویت، زۆر لەوە کەمتر بوو لە ناوچەکانی تردا.  کەنعان ناوی ئەو وڵاتە بچکۆلەیە بوو کە ڕووبەرەکەی نزیکەی هەشتیەك ویلایەتی ئیلینویزە لە ئەمریکا.  هەروەها ناوچەیەکی تایبەت نەبوو بەڵکو زەویەکی زۆر سادە بوو.  ئیدمۆن ویلسۆن دەپرسێت لەکاتی سەدانیدا بۆ زەوی پیرۆز:  ((ئایا ڕوناکی هیدایەتی پێغەمبەران تیشکی داوەتەوە لەو تەپۆڵکە بێدەنگانەوە کە هەموو شتێك کراوەیە بە ئاڕاستەی ئاسمان؟؟)).  ((ئایا بەڕاستی جەنگی خوێناوی و دڕندانە ڕوویداوە لێرەدا کە تەورات لەبارەیانەوە دواوە؟)).  چەندە دوور دەردەکەوێت کە کتێبی

پیرۆز تەورات دەرکەوتوە لە مێژووی ئەو تەپۆڵکە بچکۆلە بێدەنگانەوە کە خاڵخاڵە بە بەردو ئەو کۆمەڵە مەڕومالاتەی تیایدا دەلەوەڕێن لەژێر ئاسمانێکی زەرهەڵگەڕاودا!(۱).

تەنانەت مێژووی یەهودی کاتێك سەیری دەکەین لە ڕووکاری دەرەوەی گرنگ دەرناکەوێت بەشێوەیەك کە شایەنی باسکردن بێت. گومانی تێدانیە کە مێژوویەکی بێڕەنگ نەبووە، بەڵام بە پێوەرە دەرەکیەکان هیچ جیاواز نەبوو لە مێژووی ئەو نەتەوە بچوکانەی کە لە ژماردن نایەن وەك نەتەوەی بەلقان یان تەنانەت نەتەوەی هۆزە ڕەسەنەکانی ئەمریکای باکور. هەمیشە نەتەوە بچوکەکان لە جێگای خۆیان دەردەکرێن و لێرەو لەویّ جێگۆڕکێیان پێدەکرێت، کاتێك دەردەکرێن هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەر زەوی یەکەمین جاریان.

ئەگەر مێژووی یەهودیمان بەراورد کرد بە مێژوی ئیمبراتۆریەتی ئاشوری و مێژوی ئیمبراتۆریەتی بابلی ئەوا وەکو مێژویەکی لاوەکی دەیبینین. ئەگەر کلیلی ئەو سەرکەوتنەی جوولەکە بەدەستی هێناوە لە دێرین بوونیان و مێژوو و قەبارەی زەوی ژێر دەسەلاتیان نەبێت کەواتە لە کوێدا حەشاردراوە؟؟. ئەمە یەکێکە لە مەزنترین مەتەڵەکانی مێژوو، چەند وەلامێك بۆ ئەم پرسیارە پێشنیازکراوە بەڵام ئێمە لێرەدا ئەم وەلامە دەخەینەڕوو: ئەو شتەی جوولەکەی گواستەوە لە سستی و لاوازیەوە بۆ مەزنی ئایینی هەمیشەیی بریتیبوو لە گرنگیدانیان بە واتای شتەکان.

## واتای ألله

((له سەرەتادا، ألله. . . . )). له سەرەتایەوە هەتا کۆتاییەکەی، هەوڵدانی جوولەکە بۆ دۆزینەوەی واتا و دانایی لە شتەکاندا ڕەگوڕیشەی داکوتیبوو لە تێگەیشتنیان بۆ ألله.

ئەو فەلسەفەیەی نەتەوەیەکی دیاریکراو باوەڕی پێیەتی هەرچیەك بێت، ئەوا پێویستە گرنگی بدات بەوی تر. لە بەر ئەم دوو هۆکارە یەکەم: هیچ کەسێك بە ڕاشکاوانە بانگەشە بۆ ئەوە ناکات کە خۆی خودی خۆی دروستکردوە، کاتێك بەم جۆرە نەبوو کەواتە ئەوانی تریش ناتوانن خۆیان خودی خۆیان بهێننە بوون. دەرئەنجامی خۆڕسك کەواتە مرۆڤایەتی لە شتێکی ترەوە دروستبووە نەك هەرخۆی دروست بووە.

هۆکاری دووەم: هەموو مرۆڤێك لە ساتەوەختێکدا هەست بەوە دەکات کە تواناکانی سنوردارە. لەوانەیە بەردێك قورس تر بێت لەوەی کە بتوانێت هەڵیبگرێت و بەرزی بکاتەوە لەسەر ئاستی زەوی، یان شەپۆلێك کە دەتەوێت گوندێك خاپور بکات بە تەواوی، لەبەر ئەم هۆکارە پێویستە بیر بکەینەوە لە کەسێکی تر کە مرۆڤی هێناوەتە بوون، کەسێك خاوەن توانایەکی گشتگیر و بێسنور کە جەخت بکاتەوە لەسەر سنورداری مرۆڤ.

ئەگەر ئەم دوانەمان لەیەکدا لە یەك کەسدا ئەوا خەڵکی دەپرسن ئایا ئەو کەسە واتایەکی هەیە. چوار تایبەتمەندی هەن کەوا لەو کەسەی تر دەکات واتایەکی هەبێت: کە بێزارکەر بێت، یان بێ ئاکار ئەخلاق بێت، یان توندڕەو بێت. سەرکەوتنی فیکری جوولەکە حەشاردراوە لە ڕەتکردنەوەیان بۆ پێدانی هەریەك لە و تایبەتمەندیانە بەو کەسەی تر کە دروستکەری مرۆڤە. جوولەکە تایبەتمەندی بێزارکەر ڕەتدەکەنەوە بە وێناکردنی وەك کەسایەتیەکی خاوەن توانا و ویست، لەم ڕووەوە هاوڕا بوون لەگەڵ هاوچەرخەکانیان. واتای بوونەوەری نەجوڵاو بیرۆکەیەکی دواکەوتوە بەڵام سەبارەت بە نەتەوە دێرینەکان خۆر دەتوانێت پیرۆزی ببەخشێت و بسوتێنێت، ئەو زەویەی بەروبووم دەدات، باران، گەردەلول، نهێنی لەدایکبوونی مرۆڤ، ڕاستی مردن ئەمانە هەموویان ناتوانرێت شیبکرێنەوە وەك چەند کلۆتبوونێکی دیاریکراو بۆ ماددە، چەند یاسایەکی میکانیکی کوێرانە ڕێکیان دەخات، بەڵکو هەموو ئەمانە بەشێکە لە جیهانێك لێوانلێوە لە هەست و ئامانج و مەبەست لە هەموو لاکانیەوە.

ئاسانە گاڵتە بکەین بە عیبرانیە یەکەمینەکان کە وا بیریان دەکردەوە ڕاستی ڕەها کەسێکە ڕێدەکات لەناو بەهەشتدا لە ئارامی کەشوهەوای بەیانیدا. بەڵام کاتێك ئەو بەرجەستەکردنە تێدەپەڕێنین ڕۆدەچین لەناو قوڵاییەکانی ئەو بیرۆکەیەی لەپشتیەوە حەشاردراوە، واتە ئەو بیرۆکەیەی وادەبینێت ڕاستی ڕەها زیاتر لە کەسێك دەچێت نەك مادەیەك هەروەها زیاتر لە ئەقڵێك دەچێت نەك ئامێرێك، ئەوا پێویستە لەسەرمان دوو پرسیار لە خۆمان بکەین:

یەکەم: ئەو بەڵگەیە چیە کە دژ بەم بیردۆزەیە؟ وا دەردەکەوێت هیچ بەڵگەیەك نیە دژ بەم بیردۆزە بێت، بەڕادەیەك وای لە زانا و فەیلەسوفێکی وەك ئەلفرێد نۆرس وایتهێد کرد باوەڕبهێنێت بەم بیردۆزە.

دووەم: ئایا ئەم بنەمایە کەمترە لە گەوهەرەکەیدا لە جێگرەوەکەی؟ جوولەکەکان زیاتر دەڕۆن بۆ ئەوەی وێنای دەکەن ئەوی تر مەزنیەك بەرجەستە دەکات کە بێسنورە بەجۆرێك مرۆڤ ناتوانێت بەتەواوی تێبگات لێی بە شێوەیەکی تەواو. جوولەکە لە مرۆڤدا قوڵی و نهێنیەکیان بینی مەزنتر لە سەیروسەمەرەکانی تر کە

دەیانبینین لەم بوونەدا، ئیتر چۆن دەتوانن بەوەفا بن بۆ باوەڕی جێگیریان بۆ شایستەیی و مەزنی ئەوەی تر بەبێ ئەوەی شێوازی بوونی تایبەتی فراوانبکەن و قووڵی بکەنەوە بۆئەوەی وایلێبکەن ئەوەی تر بگرێتەوە؟ جیاوازی جوولەکە لەگەڵد دراوسێکانیان تەنها لە بیرکردنەوەیان لەوی تر نەبوو وەك کەسێك بەڵام لە گرنگیدان بە کەسایەتیەکەی بە باسکردنی وەك تاکێکی بێوێنە لەسەرو سروشت و بوونی مادیەوە. سەبارەت بە میسری، بابلی، سورییەکان بەشێوەیەکی کەمتر لەلای نەتەوەی نێوان دوو ڕووبارەکە لەو سەردەمەدا، هەریەکە لە هێزەکانی سروشت خوداوەندێکی تایبەتی دەنوێنێت. بۆ نمونە گەردەلول خوداوەندی گەردەلول بوو، خۆر خوداوەندی خۆر، باران خوداوەندی باران بوو. بەڵام کاتێك دەچینەسەر تەوراتی عیبری ئەوکات خۆمان لە کەشوهەوایەکی تەواو جیاوازدا دەبینین، بەجۆرێك سروشت دەبینین کە تەنها دەربڕینی تاك یەزدانیە بۆ هەموو گەردون. هێنری فرانکفورت دەڵێت:

کاتێك دەقی نۆزدیەم لە سفر المزامیر دەخوێنینەو: ((ئاسمانەکان مەزنی یەزدان نیشان دەدەن، گەردون هەواڵی کاری دەستەکانی ئەومان پێدەدات. )) ئەوکات گوێمان لەدەنگێك دەبێت گاڵتەدەکات بە بیروباوەڕی میسری و بابلیەکان. ئەو ئاسمانانەی کە سەبارەت بە خوێنەری سفر المزامیر بەڵگەیەکە لەسەر مەزنی ألله، سەبارەت بە دانیشتوانی نێوان دوو ڕوبارەکە خودی یەزدانی بوونە. ئەو فەرمانڕەوای شکۆدار بوو ئانو. سەبارەت بە میسریەکان ئاسمانەکان نهێنی دایك یەزدان دەنوێنێت کەلە ڕێگایەوە مرۆڤ لەدایکبووە. لە میر و وڵاتی نێوان دوو ڕوبارەکە یەزدانیبوون وەك حاڵەتێکی سروشت دەبینرا: خوداوەند یەکێکە لە پێکهاتەکانی سروشت، میسریەکان خۆریان وەك دروستکەر دەبینی، دانیشتوانی وڵاتی نێونا دوو ڕوبارەکە خۆریان ناودەبرد بە خوداوەندی شماش زامنکەری دادپەروەری. بەڵام سەبارەت بە یەهودییەت خۆر کۆیلەیەکی بەوەفای أللهیە. یەزدان بەشێك نەبوو لە سروشت بەڵکو لە سەروو سروشتەوە بوون. . . وا دیارە عیبرانیەکان کەمتر نەبوون لە یۆنانیەکان لە بەرەنگاربوونەوەیان لەگەڵ شێوازی خەملاندندا کەلەو سەردەمەدا باو بوو(٢).

وێڕای ئەوەی تەوراتی عیبری ئاماژەدەکات بە بوونی چەند یەزدانێکی تر جگەلە یەهوە کە لە زۆربەی وەرگێڕانەکاندا بە هەڵە نوسراوەتەوە کە بەم شێوەیە نوسراوە یاهفاه ئەوا ناگەیەنێت ئامانجی سەرەکی بۆ یەهودییەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بیروباوەڕی یەکتاپەرستی نەبووە، چونکە ئەگەر بەوردی دەقی نوسراوەە بخوێنینەوە تێدەگەین ئەو خوداوەندە جیاوازە لە یەهوە لە دوو ڕووەوە: یەکەم: لە بنەڕەتدا لەلایەن یەهوە هاتۆتە بوون: ((من وتم ئێوە خوداوەندن و هەمووتان نەوەی شکۆدارن)). دووەم: بەپێچەوانەی یەهوە هەموویان دەمرن ((بەڵام وەکو خەڵك دەمرن و وەك یەکێك لە سەرۆکەکان دەڕوخێن))(سفر المزامیر: ٨٢/٦-٧). ئاشکرایە ئەم ناکۆکیانە گرنگن بۆ دانانی أللهی ئیسرائیلی لە پۆلێنێکدا بەتەواوی جیاوازە لە خوداوەندەکانی تر، تەنها لەڕووی پلەوپایەوە نا بەڵکو لەڕووی جۆرەوە. ئەمانە ڕکابەری یەهوە نین بەڵکو شوێنکەوتی یەزدانن و ملکەچن بۆی. لەڕاستیدا جوولەکە لە دێرزەمانەوە لەوانەیە لە هەمان کاتی دەستکردن بە نوسینی تەورات یەکاپەرست بوون بەتەواوی.

گرنگی و مانای ئەم دەستکەوتە شاردراوەتەوە لە فیکری ئاینیدا، دواجار پێشکەش دەکرێت بە ژیان. ئەگەر ألله ئەو کەسە بێت کە مرۆڤ ژیانی خۆی فیدادەکات ئەوا فرە یەزدانی بەو مانایە دێت مرۆڤ بە دابەشکراوی بژی لەنێو ئەو چەند یەزدانەدا. ئەگەر پێویست بێت لەسە ژیان کامڵ بێت، پێویستە لەسەر مرۆڤ ڕۆژەکانی ژیانی بەفیڕۆنەدات لە لای بەڕێوبەرێکی گەردونەوە بۆلای یەکێکی تر بەڕێ بکەوێت بۆئەوەی

بزانێت کێ بەرپرسیارە لە کاروباری گەردون لەو ڕۆژەدا!، بەکورتی ئەگەر ڕێگایەکی جێگیر هەبێت بۆئەوەی ژیانی پێ بەرینەسەر، هەروەها پێویست بوو بەرەوپێش بچین، ئەگەر ڕێگایەك هەبێت بەرەو کاملبوون دەکرێت بەدوایدا بگەڕێینبۆ گەیشتن بەو مەبەستە پێویستە ئەوی تر تاك بێت هەتا پالپشتی لەم ڕێگایە بکات. لێرەوە بنەمای بیروباوەڕی ئیسرائیلی ئەم ڕستەیە: ((گوێبگرە ئی ئیسرائیل: ألله خودامانە و تاکوتەنهایە. ))(سفر التثنية: ٦/٤).

پرسیارێك ماوە. ئایا ئەو کەسەی تر-کە سەیر دەکرێت وەك تاکێکی ڕەها و بێ هاوتا-نائاکاریە، یان توندڕەوە؟ ئەگەر بەوجۆرە بێت ئەوا ماناکە تێکدەدات. ئاشکرایە ژیان هەلدەقولێت لەنێو تاکەکانی کۆمەلدا کاتێك خەلك ڕەفتاردەکەن بەشێوەیەکی ئاکاری، بەلام ئەگەر پالپشتی نەکرا لە دوا ڕاستی ڕەها لە هاوشێوەی ئەم هەلسوکەوتە ئاکاریە، ئەگەر لە جیهاندا هیچ بەهایەکی ئاکاری ئەخلاقی نەمێنێت تیایدا ئەوا خەلکی بەرە ڕووی کێشەیەکی گەورە دەبنەوە و دوچاری ڕێگایەکی داخراو دەبن سەبارەت بە ڕێگای دروست لە ژیاندا؟. بەلام لەوەی کە پەیوەندی هەیە بە مەیلی ئەوی تر بە ئاڕاستەی خەلك: ئایا خۆشەویستانەیە یان دوژمنانە ئەگەر هێزی ئەوی ترمان لەبەرچاو گرت کە بەشێوەیەکە کە وێناناکرێت و لەسەروو هێز و توانای مرۆڤەوەیە دەتوانین بڕیاربدەین کە مەرامەکانی دژبە چاکە و بەرژەوەندی مرۆڤن ئەوکاتە ژیانی مرۆیی زۆر دوور دەبێت لەوەی مانی هەبێت بەلکو تەنانەت هیچ زیاتر نابێت لە یاری مشك و پشیلە. ئەم تێڕوانینە وای لە کەسێکی ڕۆمانی کرد ئەگەر خوداوەند نائاکاری بێت هەروەك بیرکردنەوەی ڕۆمانیەکان ئەوا بوونی مانادار پێویستی بەوەیە دژایەتی خوداوەند بکەیت بەلکو وا پێویست دەکات ڕەتی بکەیتەوە.

یەزدانی جوولەکە هەلگری هیچ یەکێك لەو تایبەتمەندیە نێگەتیڤانە نەبوو کە ناسرابوو بەڕادەیەکی زیاتر یان کەمتر لە خوداوەندی دراوسێکانی. لێرەدا دێینەسەر دەستکەوتی مەزنی فیکری جوولەکە کە کورتنەکراوەتەوە لەسەر یەکتاپەرستی ڕەها بۆ ألله بەتەنها بەلکو شکۆداربوون لەو تایبەتمەندیانەی کە باوەڕی پێهێنا لەم یەزدانە تاکەدا. یۆنانیەکان و ڕۆمان و سوریی و زۆربەی نەتەوەکانی نێوان دوو ڕوبارەکە باوەڕیان بە دوو شتە لە تایبەتمەندی خوداوەندەکەیاندا یەکەم خوداوەندێکە مەیلی نائاکاری دەکات دووەم خوداوەندێکە هیچ گرنگی نادات بە مرۆڤایەتی بەپێی پێویست. بەلام جوولەکە ئەم بیرکردنەوانەیان پێچەوانە کردەوە لەکاتێکدا خوداوەندی ئولیمبوسی یۆنانی بەدوای ژنە جوانەکانەوەیە بەبێ هیچ ماندوبوونێك، خوداوەندی سیناء چاودێری هەتیوەکان دەکات و بەزەیی دێتوەە بە بێوەژنەکاندا و گرنگی دەدات بە هەژار و نەداران. لەکاتێکدا خوداوەندی ئانو لە وڵاتی نێوان دوو ڕوبارەکە، خوداوەندی کەنعان ئیل بەردەوامن لە پشتگوێخستنی کاروباری مرۆڤەکان، هیچ گرنگیەك نادەن بە کێشەکانی خەلك، یەهوە دەدوێت و ناوی ئیبراهیم دەبات و گەلەکەی ڕزگار دەکات لە کۆیلایەتی هەروەك باسکراوە لە رؤیا حزلیقدا گرنگی دەدا بەو جوولەکانەی ڕاگوێزرابوون بۆ بابل کە بەدەست غوربەت و تەنهایی و دوورە وڵاتیەوە دەیاننالاند. ((ألله یەزدانێکی چاك و بەبەزەییە هەر لە ئەزەلەوە بۆ هەمیشە، سۆز و بەزەییەکەی ڕەنگی داوەتەوە لە تەواوی کارەکانیدا)).

بەمجۆرە بوو، کەواتە تێگەیشتنی عیرانیەکان بۆ ئەوی تر کە مرۆڤ بەرەوڕووی دەبێتەوە. ئەو بونێکی سادە و بێڕەنگ نیە چونکە لە ناوەندەکەیدا بە شکۆداری دەوەستێت وەك بوونێکی بێوێنە. ئەو ناڕێك نیە چونکە یەکگرتوە لە یەکەیەکی پیرۆزدا. ئەو بە پێچەوانەی بوونەوەری نائاکاری و پشتگوێخەرە. ئەو مادەکەی

**چاکە و خۆشەویستی و بەزەییە. ئایا دەکرێت توشی شۆك دەبین ئەگەر جوولەکەکان ببینین بە دڵخۆشیەوە هـاوار بکـەن: ((کـێ وەکـو تۆیـە لـەنێو خوداوەندەکانـدا ئـەی یـەهوە؟!)) یـان: ((چ نەتەوەیـەکی مـەزن خوداوەندێکی وەکو ألّلهی هەیە؟)).**

## واتای ئاکار

نوسەری ڕوسی دوستوفسکی لە کتێبەکەیدا برایانی کارامازۆڤ لەسەر زمانی کەسایەتی ئیڤان دەڵێت: ((من ڕازی نیم بەم جیهانەی ألله، وێڕای ئەوەی من دەزانم ألله بوونی هەیە، بەڵام من ڕازی نیم بە جیهانەکەی بە هیچ جۆرێك، مەبەستم لەوە نیە کە بە ألله ڕازی نیم، پێویستە زۆر بە باشی لێم تێبگەن ئەو جیهانەی ألله دروستی کردوە من پێی ڕازی نیم، ناتوانم پێی ڕازی ببم)).

لەوانەیە ئیڤان تەنها کەس نەبێت کە ألله بە چاك دەزانێت، بەڵام جیهانی بە چاك نەزانی. فەلسەفەیەکی تەواو هەیە کە بەتەواوی ئەم هەڵوێستەی وەرگرتوە: فلسفە الکلبیە cynicism[28] و جینیە لە هیند. بەڵام یەهودییەت بە پێچەوانەی ئەمەوە جەخت دەکاتەوە لەسەر چاکی جیهان، گەیشتوە بەم دەرئەنجامە لەڕێگەی ئەو بیروباوەڕەی کە هەیانە بەوەی ألله دروستی کردوە–((لەسەرەتادا ألله ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد))(سفر التکوین: ١/١)–دواتر ڕایگەیاند کە جیهان چاکە و دورە لە خراپەکاریەوە.

مانای چیە جیهان بەگشتی وەك دەیناسین دروستکراوە لەلایەن ألله؟ لەوانەیە فەیلەسوفەکان سەیری ئەم دانپیانانە بکەن وەك شیکردنەوەیەك بۆ ئەو کەرەستەی کە گەردون هێناویەتە جیهانی بوونەوە. بەڵام ئەمە بابەتێکی کوزمولوجی پوختە، هیچ کارناکاتە سەر بابەتی: چۆن ژیان بەسەردەبەین؟ پرسیاری ئایا جیهان هۆکارێکی یەکەمی هەیە یان نا؟ لەوانەیە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە هەرچۆنێك بێت پەیوەندی هەیە بەو ڕێگایەی تیایدا هەست دەکەین بە ژیان.

بەڵام لایەنێکی تر هەیە بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی گەردون بەگشتی دروستکراوە لەلایەن ألله. کاتێك نزیکدەبینەوە لەم جەختکردنەویە لەم گۆشەنیگایەوە نایبینین بدوێت لەبارەی ئەو ڕێگایەی زەوی لێوەی دروستبووە بەڵکو لەبارەی تایبەتمەندی بەدیهێنەرەکەی. هەریەك لە ئێمە لە هەندێك کاتداخۆی دەبینێتەوە دەپرسێت لەبارەی ئەوەی ئایا ژیان هیچ مانایەکی هەی، یان ئایا ژیانێکی سودبەخش و ماناداره؟ ئەمە پرسیارێکە دەگات بە ڕاستی ئەو پرسیارەی دەڵێت: کاتێك کاروبارەکان بەرەو خراپبوون دەچن و دژوار دەبن، ئایا مانایەك هەیە شایستەی ئەوە بێت مرۆڤ لە پێناویدا لە ژیان بەردەوام بێت؟؟. ئەو کەسانەی دەگەن بەو دەرئەنجامەی کە ژیان هیچ مانایەکی نیە دەستبەرداری دەبن، ئەگەر بۆ تەنها جارێکیش بێت لەڕێگەی خۆکوشتنەوە، بەشێوەیەکی پلەبەندکراو لەڕێگەی خۆبەدەستەوەدانی ڕۆژانە بۆ نائومێدی و خەمۆکی تێکشکێنەر کە دەستدەگرێت بەسەر مرۆڤدا بەرێژایی ساڵەکانی ژیانی. هەر مانایەکی تر هەبێت بۆ وشەی ألله لە بنەڕەتدا واتا ئەو کەسەی تیایدا توانا و بەهای ئەخلاقی کۆبوەتەوە، ئەو کەسەی کە ئیرادەو ویستی هەرگیز توشی تێکشکان نابێت، ئەو کەسەی خواست و ویستی تەنها بۆ چاکە و خێرە. بەم واتایە جەختکردنەوە لەسەرئەوەی جیهان لەلایەن ألله دروستکراوە جەختکردنەوەیەکە لەڕاستیدا بۆ سەر بەهای ئەم گەردونە متمانەپێکراوە بەشێوەیەك ڕازی نابێت بە دووبارەبوونەوە. بەشێك لە چیرۆکی نوسەر: ت. س. ئیلیوت ئاهەنگی کۆکتێل دەدوێت لەبارەی ئەم خاڵەوە.

---

[28] فەلسەفەیەکە باوەڕی وایە هەڵسوکەوتی مرۆیی لەم جیهانەدا بەرژەوەندیە تایبەتیەکان دەستی بەسەردا دەگرێت زۆرجارباس لەم هەڵوێستەی دەکات بە گاڵتەجاڕیەوە، وابیردەکاتەوە کە چاکە گەوهەرەکەی دەستبەسەراگرتنی دەرونە ئەمە فەلسەفەیەکی ڕەشبینانەیە و گاڵتەجاڕی دەکات بە جیهان.

سیلیا ئەو کەسەی تەنها توشی نائومێدی نەبوو بەڵکو توشی ڕەشبینی بوو بەهۆی چیرۆکێکی خۆشەویستی شکستخواردوو، چووەلای پزیشکێکی دەروونی داوی لێکرد یارمەتی بدات، یەکەمین دانیشتنی بەمجۆرە دەستی پێکرد:

پێویستە پێت ڕابگەیەنم

لەڕاستیدا پێویستە بیربکەمەوە لەوەی شتێکی هەڵە هەیە لە دەرونمدا

لەبەرئەوەی ئەگەر بەوجۆرە نەبێت ئەوا هەڵەیەك هەیە لەخودی جیهاندا،

ئەمە ترسێنەرترە و تۆقێنەرە بەشێوەیەکی زۆر زیاتر!

وە زیاتر مەترسیدار دەبێت،

لەبەرئەوە من پێم باشە وابیربکەمەو کە هەڵەکە لەمندایە، دەکرێت ئەم هەڵەیە ڕاستبکرێتەوە.

ئەو چەند دێڕە دەدوێت لەبارەی گرنگترین بڕیاری بنەڕەتی کە ژیان داوای دەکات لە مرۆڤ. زۆرجار لەژیاندا کاروبارەکان بەجۆرێك بەڕێوەدەچن کە ڕازیمان ناکەن. پێویستە لەسەرمان چی بکەین کاتێك ئەمە ڕوودەدات؟ دواجار دەکرێت هەموو هەڵبژاردنەکان کورتبکرێنەوە لەم دوو هەڵبژاردنەدا: دەشێت هەڵەیەك حەشاردرابێت لە ئەستێرەکاندا ئەی خۆشەویستم بوتوس! (واتە لە خودی گەردندا). زۆرن ئەوانەی گەیشتون بەم سەرئەنجامە و باوەڕیان پێهێناوە. یان توماس هاردی ئەو کەسەی گەیشت بەو دەرئەنجامەی کە هێز ئەم گەردونەی بەرهەمهێناوە بەم ڕادە خەماویە، دەبێت جۆرێك بێت لە سەوزی بێدەنگ!. نوسەر سومرست موغام لە چیرۆکەکەیدا لەبارەی بەندایەتی مرۆڤەوە of human bondage بۆ کەسایەتی سەرەکی فیلیب فەرشێکی فارسی هەبوو کە بازرگانێکی بوهیمی بەدباری پێیدابوو دڵنیای کردوە ئەگەر لە مانای وێنەی سەر ئەو فەرشە تێگەیشت ئەوا تێدەگات لە مانای ژیان. کەسە بوهیمیەکە مرد لەکاتێکدا هێشتا فیلیب لە دودڵیدا مابوویەوە. چۆن دەکرێت فورشێکی عەجەمی چارەسەری کێشەی ژیان بکات و نهێنیەکەی ئاشکرا بکات؟ کاتێك بە ئاگا هاتەوە بە دەرئەنجامێك گەیشت کە وەڵامێکی ڕوون و ئاشکرا بوو: ژیان لە بنەمادا هیچ مانایەکی نیە ((چونکە هیچ وەڵامێك نیە بۆ ئەم پرسیارانە: بۆچی؟ چۆن؟ هۆکار چیە؟)).

ئەمە ئەگەرێکە. بەڵام ئەگەرێکی تر هەیە کاتێك کاروبارەکان بەشێوەیەکی هەڵە بەڕێوەدەچن، چونکە هەڵەکە حەشارنەدراوە لە ئەستێەکان و گەردوندا، بەڵکو لە خودی ئێمەدا حەشاردراوە. ئەگەر هەریەك لە ئەگەرەکان دروست بێت بەشێوەیەکی بابەتی ئەوا هیچ گومانێك نیە لەبارەی ئەو وەڵامەی بواری زیاتر دەدات بە بیرکردنەوە. چونکە لە حاڵەتی یەکەمدا مرۆڤەکان دەستەوسانن چونکە کێشەکانیان بەهۆی تایبەتمەندی خراپی گەردونەوەیە کە ناتوانن چاکی بکەنەوە. بەڵام هەڵبژاردنی دووەم ڕکابەری مرۆڤ دەکات و بانگهێشتیان دەکات هەتا سەیربکەن بەشێوەیەکی وردتر و قوڵتر بۆ ناو ناخی خۆیان، بگەڕێن بەدوای هۆکاری کێشەکانیاندا لە کۆمەڵە شوێنێکدا دەتوانن گۆڕانکاری تیادا ئەنجام بدەن. کاتێك جوولەکە سەیر شتەکانی کرد لەژێر ڕۆشنایی ئەم بیرکردنەوەیەدا ئەوا جەختکردنەوەیان لەسەرئەوەی جیهان دروستکراوە لەلایەن یەزدانەوە و بیروباوەڕێکی جێگیری پێبەخشیون. هەرچەندە حاڵیان خراپ بێت هەرچەندە دۆڵی سێبەری مەرگ کە خۆیانی تیادا دەبیننەوە قووڵ بێت ئەوان نائومێد نابن لە خودی ژیان. هێشتا مانایەك هەیە هەتا لە کۆتاییدا سەربکەون.

هەلی وەڵامدانەوە بەشێوەیەکی دروستکەر هەرگیز ون نەبووە چونکە جیهان دروستکراوە لەلایەن أللە کە تەنها ئاسمانەکانی دروستنەکردوە بەڵکو ئەو خێرو چاکەیەی بۆ هەمیشە هەردەمێنێت.
تائێستا دواوین لەبارەی هەڵسەنگاندنی جوولەکە بۆ جیهانی دروستکراو بەگشتی، بەڵام ڕەگەزێك هەیە چیرۆکی تەوراتیدا کە شایستەی ئەوەی گرنگی پێبدەین بەشێوەیەکی تایبەت: هەڵسەنگاندنی بۆ خودی سروشت واتە بۆ لایەنی مادی بوون.
زۆرینەی فیکری ئیغریقی بۆ مادە تەماوی و نادیارە. هەمان شت سەبارەت بە فەلسەفەی هیندی کە مادە تیایدا بە شتێکی خراپ دادەنرێت بەڵکو لەوە زیاتر بەشتێکی بۆگەن دادەنرێت کاتێك بەر هەرشتێك بکەوێت ئەویش بۆگەن دەکات وەك خۆی. دەربازبوون لەم چوارچێوەیە پێویستە ئازادکردنی ڕۆح بگرێتەوە لەناو مادەدا.
بەشی یەکەمی سفر التکوین چەندە جیاوازە وەك بینیمان دەشتپێدەکات بەم وشانە: ((لەسەرەتادا أللە ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد. ٩٩، کاتێك ئێستا ئەم چەند وشەی بۆ زیاددەکەین: ((أللە سەیری هەموو ئەو دروستکراوانەی کرد و پیاداچونەوەی بۆ کردن هەتا هەموویان زۆرچاك بن))(سفر التکوین: ٣١/١).
کاتێك بەوردی سەیری وشەی زۆر دەکەین دەبینین تایبەتمەندیەك دەدات بە تێڕوانینی یەهودی بۆ جیهانی سروشت ئەو تێڕوانینەی کە دواتر بەتەواوی گواسترایەوە بۆ ڕۆژئاوا. بەدەستپێکردن بە پێداگریکردنیان لەسەر پێدانی مانایەك بە هەموو ئاڕاستەکان، ڕەتکردنەوەی جوولەکە لە وازهێنان لە دیاردە مادیەکانی سروشتی جیهانی بوون. ئەوان وابیریان دەکردەوە هێشتا سروشت تازەو ونوێیە هەروەك سەرەتای دروستکردنی، پێویستە چێژی لێوەربگرن. زۆری خۆراك ئەو شتە بوو کەو ای لە زەوی پەیمانپێدراو بکات کە ببێتە زەویەکی چاك: ((چونکە یەزدان تۆی هێناوەتە سەر زەویەکی چاك زەویەك تیایدا ڕوبار و کانیاوەکان لەناو شاخەکاندا هەڵەقوڵێن. زەوی گەنم و جۆ و ترێ و هەنجیر و هەنار. زەوی زەیتی زەیتون و هەنگوین))(سفر التپنیە٨/٧-٩). هەروەها سێکس بە تێڕوانینی جوولەکە شتێکی باشە ئەواەی پێچەوانەی ئەمە بیردەکەنەوە زۆر کەمن، وێڕای ئەوە جوولەکەزۆربەیان سەیری ژنهێنان دەکەن بەوپەڕی ڕێزەوە. باکگراوندی فیکری لەپشت ئیدانەکردنی پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل کاتێك ڕوبەڕوی دەبوونەوە لە کۆمەڵگەکانیاندا لە نادادپەروەری و نایەکسانی لە دابەشکردنی سامان و دارایی، ئەمە زۆر دوور بوو لەوەی خاوەنداریێتی مادە بەشتێکی خراپ لەقەڵەمبدەن بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو ئیدانەکردنەیانبەڵگە بوو لەسەرئەوەی ئەوان هەبوونی سامان و دارایی شتێکی زۆر باشە بەڕادەیەك کە هەمووان بەشدار بن لە خاوەنداریێتی ئەم سامان و داراییەدا نەك قەتیسماو بێت بە دەستی چەند کەسێکی دیاریکراوەوە و ئەوانی تر لێی بێبەش بن.
هاوشێوەی ئەم هەڵویستە بە ئاڕاستەی سروشت وادەردەکەوێت یەهودییەت دەخاتە جێگایەکی زۆر د=ور لە تێڕوانینی بنەڕەتی هیندۆسیەت بۆ سروشت، بەڵام وێڕای ئەوە یەهودییەت جیاناکرێتەوە لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە تیایدا ڕێز لە سروشت دەگیرێت. ئەوەی تێڕوانینی عیبری لە تێڕوانینی چینی جوادەکاتەوە دەرناکەوێت هەتا دوای ئەوەی کە تێبینی بەڵگەیەکی تر دەکەین لە یەکەم بەشی سفر التکوین کاتێك أللە دەڵێت-لە ئایەتی ٢٦-دالەبارەی نەتەوەیەك کە دەیەوێت بەدیانبهێنێت: ((مرۆڤ دروست دەکەین لەسەر وێنەو شێوەی خۆمان کە دەستدەگرن بەسەر ماسی نێو دەریاکان و باڵندەکانی ئاسمان و مەڕوماڵات و

**هـەموو زەوی بەگشـتی)). ئەمـە چـەندە جیـاوازە لـە هەڵوێسـتی چـینی سـەبارەت بـە سروشـت کـە دەکرێـت تێبینی بکەین بە هەستپێکردنێکی پێچەوانە کە دەیبینین لە کتێبی تاو تی چینگدا:**

**ئەوانەی دەیانەوێت دەستبگرن بەسەر زەویدا**

**دەستکاری بکەن بەپێی ویستی خۆیان**

**تێبینی ئەوەم کردوە هەرگیز سەرکەوتو نابن.**

**ئەگەر سـێ جەختکردنـەوە سـەرەکیەکەمان دانـا کەلـەبارەی سروشـتەوەیە لـە بەشـی یەکـەمی سـفر التمـوین بەرامبەر بەیەکتر بەم شێوەیە:**

**ألله زەوی دروستکرد،**

**ڕێگەی دا بە مرۆڤ دەستبگرێت بەسەریدا بە هەموو ئەو شتانەی کە تێیدایە،**

**ألله هەموو ئەو شتانەی کردویەتی بە زۆر چاکی زانی. . .**

**ئەوا تێبینی دەکەین هەڵسەنگاندن و ڕێزلێنانێك هەیە بۆ سروشت، تێکەڵکراو لەگەڵ متمانەی مرۆڤ و هێـز و توانای لە کارکردندا بۆ مەبەستی خێر و چاکە، ئەمە بەشـتێکی نمونـەیی دادەنرێـت لـەو سـەردەمەدا. ئەمـە هەڵسەنگاندنێکە وا بڕیاردراوە کە بەروبومێکی چاکی هەبێت وەك دەردەکەوێت لە زانستی نوێدا لـە جیهـانی ڕۆژئاوادا.**

**سەرۆکی ئەسقەفەکان ولیەم تیمپڵ دەیوت: ((یەهودییەت و مەسیحییەت زیاترین دوو ئایینن کـە گرنگـی بـە مـادە دەدەن. کاتێـك ئیسـلام زیاددەکرێـت بـۆ ئـەم لیسـتە ئـەوا ئایینـە شـکۆدارەکان بەشـێوەیەکی ئاشـکرا دەردەکەون لە جەختکردنەویان لەسەر ئـەوەی مرۆڤـەکان بـەبڕێکی چونیەك لەجەسـتە و ڕۆح پێکهـاتون، ئـەم یەکگرتنـەی نێـوان جەسـتە و ڕۆح بەرپرسـیاریەتێکی ڕێگـر نیـە. بـەم شـێوەیە بەسـێ دەرئـەنجام دەگـەین:**

**١)سـیما و نیشـانەکانی مـادە بـۆ ژیـان گـرنگن(لێـرەوە جەختکردنەویـەکی بـەهێز هەیـە لـە ڕۆژئـاوا لەسـەر مرۆڤایەتی و خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکان)،**

**٢)دەشـێت مـادە یارمەتیـدەر بێـت لـە مەرجـەکانی ڕزگـاربوونی خـود (ئەمـە دوپاتکراوەتـەوە لـە بیروبـاوەڕی زیندوکردنەوەی جەستەکان)**

**٣)سروشـت دەتوانێـت میوانـداری ألله بکـات. (مەلـەکوتی ألله دێتەسـەر زەوی، مەسـیحیەکان بیروبـاوەڕی بەرجەستەکردن بۆ ئەم کارە زیاددەکەن).**

## واتای بوونی مرۆڤ

ڕەگەزی یەکلاکەرەوە لە بیرکردنەوەی مرۆییدا بریتیە لەوەی بیریلێدەکاتەوە سەبارەت بە خود. مانای چیە کە مرۆڤ بین؟ دانایی چیە لەوەدا کە بژین لەم ژیانە مرۆییەدا؟

لێرەدا جوولەکە گەڕاون بەشوێن مانادا. ئەوان زۆر گرنگیان داوە بە ڕاستی سروشتی مرۆڤ، لەبەر لایەنە ئاژەڵیەکانی مرۆڤ یان تایبەتمەندیە هەوەسبازیەکانی نیە بەڵکو ویستویانە ڕاستیەك بدۆزنەوە سودبەخش بێت بەدرێژایی ژیان. ویستویانە تێبگەن لە حاڵەتی مرۆیی بەشێوەیەك بتوانن سود بە خۆیان بگەیەنن بە باشترین شێوە  کە ژیان دەتوانێت پێی بگات.

جوولەکە لەڕاستیدا دەرکیبەوە کردوە کە تواناکانی مرۆڤ سنوردارن. چونکە ئەگەر بەراوردی بکەین بە مەزنی ئاسمانەکان مرۆڤ تەنها مستێك خۆڵە بیرمان دەخاتەوە ئێمە لە بنەڕەتدا خاکوخۆڵین (سفر المزامیر: مزمور ١٠٣/ئایەتی ١٤). کاتێك مرۆڤ بەرەوڕووی هێزەکانی سورشت دەبێتەوە ئەوا هەروەك مۆرانە پاندەکرێتەوە؟(سفر أیوب: ١٩/٤)، ژیانی لەسەر زەوی زوو کۆتایی دێت ((وەك ئەو گژوگیایەی گەشە دەکات. گوڵدەگرێت لە بەرەبەیاندا و لە ئێوارەدا دەڕنرێت و سیس دەبێت. ))(سفر المزامیر: ٦/٩٠)، تەنانەت ئەم ماوە کورتە لێوانلێوە لە ئازار کە وا لە ساڵەکانی ژیانمان دەکات ون ببێت وەك هەناسەدانەوەیەك))(سفر المزامیر: ٩٠: ٩). جوولەکە ناچاربوو چەندین جار ئە پرسیارە لەخۆی بکات: ((لەخۆم دەپرسم: مرۆڤ چیە هەتا گرنگی پێبدەیت؟ نەوەی ئادەم چیە هەتا بیری بکەیت؟یان ساتەوەختێك لە کاتی خۆتی پێببەخشیت))(سفر المزامیر: ٤/٨).

ئەگەر سەربەخۆیی ئیسرائیلمان وەك نمونە وەرگرت لە بیرکردنەویاندا، ڕەتکردنەوەیان بۆ کۆتکردنی گومانەکانیان کاتێك هەستی پێ دەکەن، ئەوا سەرسام نابین کە ببینی چەند ساتەوەختێکی گومان هەبوون کە ئیسرائیلیەکام وابیربکەنەوە: ((نەوەکانی مرۆڤ هیچ باشتر نین لە ئاژەڵ و مەڕوماڵات، چونکە ئەوەی بەسەر مرۆڤدا دێت بەسەر ئاژەڵیشدا دێت. هەروەك چۆن مرۆڤەکان دەمرن بە هەمان شێوە ئاژەڵەکانیش دەمرن. مرۆڤ هیچ زیاتر نیە لە ئاژەڵ هەردوکیان بۆیەك جێگا دەچن هەریەکەیان لە خاك دروستکراون هەر بۆ ناو خاکیش دەگەڕێنەوە. . ))(سفر الجامعە: ١٨/٣-١٩). لێرەدا ڕاڤەیەکی بایۆلۆجی دەبینین بۆ جۆری مرۆیی کە سەودا ومامەڵەی تێدانیە، هیچ جیاواز نیە لەو ڕاڤەیەی پێشنیازکراوە لە سەدەی نۆزدەیەمی زایینیدا!. بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدا بریتیەلەوەی ئەم بیرکردنەوەیە داخراو نیە. ئەو تایبەتمەنیەی ئاشکرایە و گرنگە لە تێڕوانینی یەهودییەتدا بۆ سروشتی مرۆڤ، ئەمە بریتیەلەوەی بەبێ ڕەتکردنەوەی لاوازیەکەی بۆ دورترین ئاست دەڕوات لە جەختکردنەوەی لەسەر مەزنی مرۆڤ بەشێوەیەکی کەموێنە، لەکاتێکدا دەڵێت: ((ئێمە تێکەڵەیەکین لە خاك و ئایینزانی)).

لە دەقی وەرگێڕانی الملك جیمسدا بۆ تەورات بیروباوەڕی بنەڕەتی یەهودییەت لەبارەی حاڵەتی مرۆڤ و سروشتیەوە بەمشێوەیە: ((مرۆڤم دروستکردوە بەشێوەیەکی کەمتر لە فریشتە. . ))(المزامیر: ٥/٨). لێرەدا خراپ وەرگێڕانێك هەیە بۆ ئەم وشەی دوایی لە ڕستەکەدا، لە تەوراتی عیبریدا بەم شێوەیە نوسراوە:

((واملێکردوه تۆزێك کەمتر بێت لە خوداوەند))(یان لە أللە)(چونکە وشەیئیلوهیم لە زمانی عیبریدا ژمارەکەی دیاریکراو نیە واتە چەند تاکێك دەگرێتەوە). بۆچی وەرگێڕەکان وشەی خوداوەند دەگۆڕن بۆ فریشتە؟ وەڵامەکە ئاشکرایە بەهۆی نەزانینەوە نەبووە بەڵکو نەیانتوانیوە بوێرانە وەك عیبرانیەکان وشەکان دەربڕن، ئەو تۆمەتەی تائێستا ئاڕاستەی تەورات نەکراوە بریتیەلەوەی نەوتراوە کەسایەتیەکانی درۆینەن، کەسەکان مێژوویی نین. تەنانەت پاڵەوانە مەزنەکانی وەك داوود باسکراوە زۆر بەسادەیی، چونکە باس لە داوود کراوە لە سفر صموئیلدا بەهەموو کەموکوڕیەکانیەوە، بەڕادەیەك سفر صموئیل دادەنرێت بەیەکێك لەو نوسراوە مێژوویانەی کە بە ئەمانەتەوە گواستراوەتەوە. وێڕای ئەوەهیچ برێك لە ڕاستی بوونی نیە کە بتوانێت ڕۆحی لەلای یەهودی بمرێنێت، ئەو مرۆڤەی شایستەی ئەوەیە ناوببرێت بە ((مرۆڤی کامڵ و نەوەی ئادەم))(سفر أیوب: ٦/٢٥)، هەرئەوە أللە شەرەفی سەرکەوتنی پێبەخشیوە هەروەك باسکراوە لە سفر المزامیردا: ((تۆزێك کەمترە لە فریشتە بە سەرکەوتن پاداشتی دەکات. ))(سفر المزامیر: ٥/٨)، یەکێك لە حاخامەکان دەڵێن: ((هەرکاتێك ژن و پیاوێك بەسەر ڕێگایەکدا دەڕۆن، فریشتەکان هاوار دەکەن: ڕێگاکە بکەنەوە! ڕێگاکە بکەنەوە! ڕێگا بکەنەوە بۆ وێنەی أللە!)).

کاتێك دوایـن لـەبارەی ڕاستەقینەخوازی لـە تێـڕوانینی یەهودییەتـدا بـۆ سروشـتی مرۆیـی دانپیانـای دوپاتدەکەینـەوە بـۆ نـوری جەسـتەیی مـرۆڤ: لاوازی، زوو کـارتێکردن، ئازارچەشـتن، کـورتی تەمـەن، بـەڵام نـاتوانین سنوری ڕاسەقینەخوازی ببینین هەتا بەپێی تێڕوانینی یەهودی سنوری ئاکاری مرۆیی زیاتر جەستەییە واتە مرۆڤ سنورداره لەڕووی ئاکارئەخلاقەوە زیاتر لەوەی لەڕووی جەستەییەوە سنوردارکراوە. مرۆڤەکان تەنها لەڕووی جەستەییەوە لاواز نین بەڵکو ئەوان یاخیبوو و تاوانبارن: ((ئەوەتا من بە تاوان وێناکراوم، بەگوناه دایکم سکپڕبوو بەمنەوە. ))(المزامیر: ٥/٥١). بەڵام هەڵەیە بەتەواوی پشت ببەستین بەم ئایەتە بۆ سەلماندنی بیروباوەڕی گەندەڵی و خراپی مرۆڤەکان، یان بۆ سەلماندنی ئەوەی کە سێکسکردن کارێکی خراپە لە بنەڕەتدا. هەردو چەمکەکە وەرگێراون و هیچ پەیوەندیەکیان بە یەهودییەتەوە نیە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم ئایەتە یارمەتیدەرە لە شتێکی گرنگدا لە زانستی مرۆڤی یەهودیدا. ئەم نەتەوەیە وێڕای ڕەسەنایەتیەکەی بەردەوام بوو لە تاوان. هیواخوازبووە کە چاکەخواز بێت بەڵام هەمیشە لەوە کەمتر بووە، ویستویەتی بەخشندە بێت بەڵام هەمیشە دەستی دەنوقاند و پارەکانی کۆدەکردەوە و خێری لێنەدەکرد. لە ئاژەڵ باشتر دروستکراوە بەڵام زۆربەی کات وا ڕەفتاردەکات کە لە ئاژەڵ خراپت بێتەپێشچاو!.

وێڕای ئەوە هیچ یەکێك لەو کەموکوڕیانە بەسەریاندانەسەپێنرابوو. لەڕاستیدا جوولەکە هەرگیز گومانی نەبووە لە بابەتی ئازادی ویست و ئیرادە. یەکەمین کار کەلەسەر مرۆڤ تۆمارکرا هەڵبژاردنێکی سەربەخۆ بوو. دروستە کاتێك ئادەم و حەواو لە بەروبومی درەختە قەدەغەکراوەکەیان خوارد لە بەهەشتدا مار فریویدان، بەڵام وێڕای ئەوە دەیانتوانی گوێی پێنەدەن. تاکە شتێك مارەکەهێمایشەیتان ئەنجامی دا فریودانیان بوو بەتەنها، دەسەڵاتی نەبوو هەتا ئەو فەرمانەیان بەسەردا بسەپێنێت، ئەمە چیرۆکی بێئاگایی مرۆڤایەتیە. شتە بێگیانەکان ناتوانن هیچ شتێکی تر بن جگەلەوەی دروستکراون بۆی. چونکە ئەوان بەپێی سروشت کاردەکەن لەو حاڵەتەی تیایدا دروستکراون بۆی. بەڵام بوونەوەرە مرۆییەکان کاتێك دروستکران ئازادی هەڵبژاردنیان پێدراوە: دەرونیان پاکبکەنەوە هەتا بەهۆیەوە سەرکەوتو بن، یان دەرونیان تێکبشکێنن بۆئەوەی سەرشۆڕ و گومڕابن، چونکە مرۆڤ بەدەستی خۆی قەدەری خۆی

دروستدەكات لەڕێگەی بڕیارەكانیەوە كە لە ژیاندا ئەنجامیان دەدات، ((وازبهێنن لە خراپەكاری. فێری چاكەكاری ببن. ))(سفر اشعیا: ١٦/١-١٧). هاوشێوەی ئەم ڕاسپاردەیە تەنها ئاڕاستەی مرۆڤەكان دەكرێت: ((مردن و ژیانم لەپێشچاوت داناوە لەگەڵ پیرۆزی و نەفرەت. باشتروایە ژیان هەڵبژێریت بۆئەوەی خۆت و نەوەكانت بژین))(سفر التثنیة: ١٩/٣٠).

دواجارلە تێڕوانینی یەهودیەوە بەو دەرئەنجامە دەگەین ألله مرۆڤەكانی خۆشدەوێت. كەواتە خەڵك خۆشەویستی خودان، هەروەك لە تەوراتدا بەمشێوەیە خۆشەویستی ألله بۆ بەندەكانی وێناكراوە:

١ كاتێك ئیسرائیل لاو بوو خۆشمویست و لە میسرەوە بانگمكرد.

٢ هەموو ئەوانەی بانگمكردن قوربانیان دەكرد بۆ بتەكانیان كە بەدەستی خۆیان دروستیان كردبوون.

٣ من دەستم گرتن بەڵام نەیانزانی من شیفام پێبەخشین.

٤بە خۆشەویستی بەیەكەمە دەمبەستنەوە هەروەك ئەو كەسەی كێرد لەسەر ملیان لابەرێت و خۆراكیان پێبدات. . .

٨ چۆن دەستبەرداریان دەبم؟ چۆن دەتاندەمە دەست دوژمن ئەی ئیسرائیل؟. . . دڵم لە ئازاردا تەپاوتل دەدات لە ناخمدا. (سفر هوشع: ٣/١١-٤، ٨)

تەنانەت لەم جیهانە فراوانەدا بە هەموو هێزە مەزنەكانەوە پیاوان و ژنان دەتوانن بە متمانەوە بژین ماڵی وا هەست دەكەن لە ماڵی خۆیان و باوكیاندا دەژین كە خۆشی دەوێن و بەتەواوی قوبوڵیان دەكات.

پێكهاتەكان و مادەكانی ڕاستی سروشتی مرۆڤ و بوونی مرۆیی امەیە كە ئەقڵ دەتوانێت دەركی پێبكات؟ ئەگەر نكوڵیمان كرد لە لاوازی مرۆیی ئەوا هەڵسەنگاندنمان بۆ مرۆڤ ڕۆمانسیانە دەبێت(ناڕاستەقینە). ئەگەر باوەڕهێنا بە مەزنی مرۆڤ لاببەین لە وێنەكە ئەوا بیركردنەوكانمان بۆ بەرەوپێشچون سنورداردەبێت. ئەگەر دانپیانانی هەڵەمان لابرد ئەوا دەبینین كە سۆز و هەست هەرەشە لەڕاستی دەكات. ئەگەر ئازادی بڕیاردانمان لابرد ئەوا دەبینین كە بەرپرساریەتی نامێنێت. دواجار ئەگەر خۆشەویستی یەزدان لابەرین دەبینی ژیان وشك و بێمانا دەبێت.

بەهەموو ئەوەی زانراوە لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە لەو ٢٥٠٠ ساڵەی كە لەنێوان ئێستا و كاتی دابەزینی تەوراتدا هەیە ئەستەمە بتوانین كەموكوڕیەك بدۆزینەوە لەو هەڵسەنگاندنەی كە بۆ مرۆڤ كراوە تیایدا.

## واتای مێژوو

بادەست پێبکەین بە جیاوازی نێوان ئەم دوو تێڕوانینە. یەکێك لە مێژوونوسان دەڵێت:

((بەپێی زۆربەی فەلسەفە و ئایینە کلاسیکیەکان دوا ڕاستی ئاشکرا دەکرێت کاتێك مرۆڤ هەڵدەسێت بە تێڕامانێکی ئەقڵانی، ئەو ڕووداوانە تێپەڕێنێت کە ئێمە ناوی دەبەین بە مێژوو چونکە ئامانج لەم کارە دەرککردنە بە ڕاستی بەبێ کاریگەری چارەنوس و قەدەری مرۆیی. بۆ نمونە لە هیندۆسیەتدا جیهانی ئەزمون و هەستپێکردنمایا بە خەیاڵ دادەنرێت، لەبەرئەوە مرۆڤی دیندار بەدوای ئازادبووندا دەگەڕێت لە ڕەوڕەوەی ژیان هەتاجیابێتەوە لە ڕۆحی جیهانی براهما، بەڵام فەیلەسوفە یۆنانیەکان سەیری ڕوداوەکانی جیهانیان دەکرد وەك دیاردەیەکی سروشتی هەروەك هاتن و تێپەڕبوونی چوار وەرزەکەی ساڵ، بەڵام فەیلەسوف دەتوانێت بەرزببێتەوە بەسەر خولە دوبارەبووەکانی مێژوو بۆئەوەی نیگاکانی جێگیر بکات لەسەر خاڵێکی جێگیر کە ناگۆڕێت. هەریەك لە تێڕوانینەکان بەشێوەیەکی فراوان لەبارەی جەختکردنەوەی تەورات بەوەی ألله بوونی هەیە لەنێو کۆتو بەندەکانی جیهانی گۆڕانکاری و ململانێکان، بەتایبەت خۆی ئاشکرا دەکات لەڕێگەی چەند ڕوداوێکی کەموێنەوە و دیاریکراوەوە کە دوبارەنابنەوە. سەبارەت بە تەورات مێژوو نە خەیاڵە نە دیاردەیەکی سروشتی دوبارەبووەیە بەڵکو مەیدانی چالاکیەکانی أللهیە))(٣)

چی لەژێر مەترسی لەناوچوندایە کاتێك گومان لەوە دەکەین مانایەك هەیە بۆ مێژوو لە بنەڕەتدا؟ ئەوەی لەژێر هەڕەشەی لەناوچوندایە بریتیە لە هەڵوێستمان بەرامبەر سیستمی کۆمەڵایەتی، هەموو ئەو شتانەی دەیگرێتەخۆی لەژیانی کۆمەڵایەتیدا. ئەگەر بڕیارماندا مێژوو هیچ مانا و ئامانجێکی دیاریکراوی نیە ئەوا سەرئەنجام چوارچێوە ڕۆشنبیری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتیەکانی ژیان شایستەی هیچ گرنگیپێدانێك نابن. وابیردەکەینەوە کێشەکانی ژیان لەشوێنێکی تردا حەشاردراوە هەتا ئەو ڕادەیەی تیایدا دەتوانین بەسەر بارو هەلومەرجە سەرخەکاندا سەربکەوین. هەتاکو شتەکان بەم شێوەیە ببینین ئەوا هیچ گرنگی نادەین بەو کێشانەی بەرەوڕویان دەبینەوە لەهەریەك لە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و شارستانی. هەروەها بەرامبەر بەو کێشانە هەست بە بەرپرسیاریەتی ناکەین.

گرنگیپێدانی عیبری بۆ مێژوو بەتەواوی پێچەوانەی ئەم هەڵوێستەیە. مێژوو سەبارەت بە جوولەکە گرنگیەکی زۆری پێدراوە چونکە ئەوان باوەڕیان وایە ئەو چوارچێوەیەی تیایدا دەژین کاردەکاتە سەر ژیان لە هەموو لایەنەکانەوە، چونکە هەرئەوە کێشەکانی دیاریدەکات هەروەها چارەسەرەکانیان ڕێکدەخات. ئەستەمە بتوانین بدوێین لەبارەی ئادەم و نوح و گرنگی نەدەین بە هەلومەرجە تایبەتیەکانیان کە پیایدا تێپەڕبوون. ئەو ڕوداوانەی لە تەوراتی عیبریدا باسکراون پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان هەیە بەو ژینگەیەی ئەم روداوانەتیایدا ڕوویداوە.

هۆکاری دووەم بۆ گرنگی مێژوو بریتیەلەوەی ئەگەر هەلومەرجیەکان شتێکی یەکلاکەرەوە بن سەبارەت بە ژیان ئەوا ئەمەش دەسەپێنرێت بەسەر کاری بە کۆمەڵدا. چەند کاتێك هەن تیایدا تاکە ڕێگە بۆ گۆڕینی شتەکان بریتیەلەوەی کەسەکان پێکەوە کاربکەن، واتە نەخشەو پلان دابنێن و ڕێکی بخەن دواتر پێکەوە کاربکەن بەشێوەی بەکۆمەڵ. چارەنوسی کۆیلە غیبرانیەکان لە میسر لە تەوراتدا بەشێوەیەك وێنانەکراوە

کە پشتبەستێت بە ئاستی بەرزبوونەوەیان بەسەر کۆیلایەتیەکەیاندا لەڕێگەی پەروەردەکردنی سەربەخۆیی ڕۆحدا بەشێوەیەك بتوانن بەرگەی کۆت و زنجیری سەر جەستەیان بگرن. ئەوان پێویستیان بەوەیە هەستنەوە و بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ لە کۆیلایەتی دەربچن و بەڕێبکەون بە ئاڕاستەی بیابان بۆ سەربەخۆیی.

هۆکاری سێیەم بۆ گرنگی مێژوو سەبارەت بە جوولەکە بریتیەلەوەی وابیردەکەنەوە کە بوارێك هەیە تێیدا بۆ هەلقۆستنەوە. لەبەرئەوەی مێژوو ألله بەڕێوەی دەبات کەواتە هیچ شتێك لە مێژوودا بەشێوەی ڕێکەوت ڕوونادات. دەستیەهوە سەرقاڵی کارکردنە لە هەریەك لەو ڕوداوانەی کە ڕوودەدەن–لە بەهەشت، ڕووداوی لافاو، دەرچوونی بە کۆمەڵ! لە میسر، نەفیکردن و ڕاگواستن بۆ بابل–هەریەك لەمانە زنجیرە ڕوداوێکن وەکو ئەزمونێکی فێرکارین بۆ نەتەوەی ألله.

دواجار مێژوو گرنگ بووە لەبەرئەوەی هەلەکانی ژیان هاوشێوەی یەکترنین. ڕووداوەکان وێڕای ئەوەی هەموویان گرنگن بەڵام لەڕووی گرنگیانەوە هاوشێوەی یەکترنین. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە هەموو مرۆڤێك لە هەرکات و شوێنێکدا بێت دەتوانێت بە ئاڕاستەی مێژوو بڕوات بۆئەوەی هەلێك بدۆزێتەوە کە چاوەڕوانیەتی هاوشێوەی هەموو هەلێکی تر لە کات و شوێنێکی تردا، بەڵکو هەموو هەلێك لە کات و شوێنی خۆیدایە و دووبارە بوونەوەی نیە. بەڵام هەندێك لەو هەلانە بە یەکلاکەرەوە دادەنرێن: ((چەند شتێك هەن لە ژیانی مرۆڤدا هەڵکشانێکە لەکاتی لافاودا دەکرێت سودی لێببینرێت، ببێتەهۆی ڕودانی شۆڕش)). لەبەرئەوە پێویستە گرنگی بدەین بە مێژوو زۆر بە وردی چونکە کاتێك هەلێکمان لە دەست دەچێت بۆ هەمیشە دەڕوات لە دەستمان و هەرگیز ناگەڕێتەوە. ئەمە کورتکراوەتەوە لە ڕوداوە مێژوویەکانی ژیانی عیبریەکاندا بەمشێوەیە: ١)بەشداربوونی ڕاستەوخۆی ألله لە هەندێك لە ئاستە هەستیارەکاندا. ٢)هەڵبژاردنی نەتەوەیەك بۆ تاقیکردنەوە بێوێنەکانی ألله. هەردوو خاڵەکە ڕوونکراوەتەوە لە بەسەرهاتی ئیبراهیمدا، بەوجۆرەی باسکراوە لە سفر التكوين١-١١دا بۆ خراپبوونی نەمانی چاکە لە جیهاندا: یاخیبوون (جواردنی بەروبوومی درختە قەدەغەکراوەکە)، دوابەدوای ئەوە کوشتن (قابیل هابیلی کوشت)، دواتر پەیوەندیە سێکسیە ناشەرعیەکانی نێوان مرۆڤەکان، داوتر بڵاوبوونەوەی زینا لەنێو نەوەکانی نوحدا، هەتاپێویستی کرد لافاوێك بێت و مەیدانی مرۆیی پاکبکاتەوە لەو پیسی و خراپەکاریە. لەنێو ئەم خراپەکاریەدا ألله سست و بێئاگا نەبوو، لە دواڕۆژەکانی دەوڵەتی سۆمەری جیهانی ألله بانگی ئیبراهیمی کرد، فەرمانی ۆپێدا کۆچبکات بەرەو زەویەکی نوێ بۆئەوەی نەتەوەیەکی نوێ بنیاتبنێ ئەم ساتەوەختە چارەنوسساز بوو چونکە ئیبراهیم هات بەدەم ئەم بانگەوازەوە ئیدی وەك کەسێکی سست و ناچالاك نەمایەوە بەڵکو بووبە یەکەمین عیبرانی واتە یەکەم کەس لە نەتەوەی هەڵبژێردراوی ألله.

دواتر دەگەڕێنەوە سەر بابەتی نەتوەەی هەڵبژێردراوی ألله بەڵام پێویستە لەسەرمان لێرەدا بپرسین کێ ئەم دانایی و ژیریەی بەخشی بە جوولەکە بۆ زانینی مانای مێژوو؟ پێشتر ئاماژەمان کرد بۆ جۆری ئەو داناییەی دۆزیانەوە لە مێژوودا. کەواتە چی وای لێکردن مێژوو بەو شێوە بەرجەستەکراوە ببینن بۆ ئەم داناییە؟

سەبارەت بە هیند چارەنوسی مرۆڤایەتی حەشاردراوە لە شوێنێك لە دەرەوەی مێژوو. جیهانێك هەیە مرۆڤایەتی دەگرێتە خۆی ئەویش جیهانی ناوەندە. چاکەو خراپە تێکڵ بەیەکتر بووە، لەگەڵ چێژ و ئازار، ڕاست و هەڵە بە ڕێژەی یەکسان هەروەك چنینی دوو ڕەنگ بەشێوەیەکی یەکسان لە پارچە قوماشێکدا. شتەکان بۆ هەمیشە بەو شێوەیە دەمێننەوە، هەموو بیرکردنەوەیەك بە پاککردنەوەی جیهان و گۆڕینی

سروشتی شتەکان تیایدا بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە لەڕووی بنەماوە. ئایینی پەرستنی هێزەکانی سروشت لەلای دراوسێکانی ئیسرائیل بە هەمان دەرئەنجام گەیشتبون بەڵام لە ڕێگەی جیاوازەوە. چونکە سەبارەت بەوان چارەنوسی مرۆڤایەتی خۆی حەشارداوە لەناو مێژوودا، بەمشێوەیە دەتوانین تێبگەین بۆچی گۆڕانکاری ڕوونادات لە مێشکی ئەو کەسانەی بیروباوەڕ و ئایینیان پەرستنی هێزەکانی سروشتە. کاتێك چاوەکانی مرۆڤ تەنها لەسەر سروشت بێت ئەوا ناگەڕێت بەدوای کامڵبووندا لە جێگایەکی تردا. هەروەها ناتوانێت بیرکردنەوەی فراوان بکات بۆ چاکترکردنی سروشت یان سیستمی کۆمەڵایەتی چونکە بەجۆرێك سەیری ئەم شتانە دەکات کە جێگیرن و ناکرێت لەلایەن مرۆڤەوە چاکسازیان تیادا بکرێت. میسریە دێرینەکان لەخۆیان نەدەپرسی ئایا خوداوەندی خۆر رع بەشێوەیەکی دروست هەڵدێت و تیشکدەداتەوە، چونکە زمانی سروشت بەمشێوەیە: چی بوونی هەیە نەك چی پێویستە بوونی هەبێت؟

تێڕوانینی ئیسرائیلیەکان بۆ مێژو جیاوازە لە تێڕوانینی هیند و ئایینەکانی پەرستنی چەند خوداوەندێك لە ڕۆژهەڵاتی دێریندا چونکە پشتی دەبەست بە چەند بیرۆکەیەکی لەبارەی یەزدانەوە. ئەگەر کێشەکە گەیشت بە ئاستی وروژاندنی دیمەنە ئاگاییەکان ئەوا ئیسرائیلیەکان بەڵگەیان بۆ هیندیەکان دەهێنایەوە بەوەی ألله خەڵکی دروستنەدەکرد وەك شتی مادی ئەگەر مادە ناگەوهەری بێت سەبارەت بە چارەنوسیان، جولەکە بەڵگەیان بۆ شوێنکەوتوانی ئایینی پەرستنی هێزەکانی سروشت دەهێنایەوە کە سروشت بۆخۆی بەس نیە و خودی خۆی بەڕێوەنابات چونکە ألله سروشتی دروستکردوە و ناکرێت سروشت جێگای ئەو بگرێتەوە کە دروستکراوی خۆیەتی. دەرئەنجامی پاراستنی جوداکردنەوەی تەواو لەنێوان ألله و سروشتدا دەرئەنجامێکی زۆر گرنگە، چونکە بەو مانایە دێت ناکرێت ألله بەرجەستە بکرێت بوونەوەرێکدا کە دروستکراوی خۆیەتی. ویست و ئیرادەی ألله لەسەروو هەمووانەوەیە. یەهودییەت مێژووی بنیاتنا وەك شتێکی گرنگ و لەهەمان کاتدا وەك شتێك دەکرێت ڕەخنەی لێبگیرێت. **ئەوانەی هیچ فێر نابن لە مێژوەوە دەبێت دووبارە ببێتەوە بەسەریاندا.**

هەموو ئەو ئایینانەی پەرستنی هێزەکانی سروشت دەوری یەهودییەتیان دابوو پاڵپشتیان دەکرد لەو هەلومەرجە. لەوانەیە بەدڵی ئەوان نەبووبێت بەڵام ئەو شتەی کاریگەر بوو لەسەر شوێنکەوتوانی ئایینی فرە خوداوەندی بریتی بوو لەوەی ئەو هەلومەرجە دەشێت بەرەو خراپتر بچێت چونکە هێزەکانی سروشت لە چەند خوداوەندێکدابوو بەپێی بیرکردنەوەی ئەوان بەوهۆیەوە مەترسیەکی هەمیشەیی هەیە بۆ هەڵگیرسانی جەنگ لەنێو ئەو خوداوەندانەدا بەم شێوەیە نارێکی و بێ سەروبەری ڕوودەدات. لەبەرئەوە ئاگایی ئایینی ئاڕاستەکراو بوو بۆ پاراستنی شتەکان بەو شێوەیەی کە هەیە. ئایینی میسری چەندین جار بەراوردی کرد لەنێوان کەسانی سۆزدار و کەسانی بێدەنگدا کەسانی بێدەنگی پێ باشتر بوو چونکە کێشە نانێنەوە. کەواتە سەیر نیە کە ئایینەکانی پەرستنی فرە خوداوەندی هەرگیز نەبووەتە هۆی ڕوودانی شۆڕش. وەك نەریتێك ئایینی هیندۆسی شێوازی تایبەت بەخۆی هەبوو چونکە ئەم جۆرە ئایینانە پەرستنی هێزەکانی سروشت هەمیشە لە گۆڕانکاری دەترسان و گۆڕانی گەوهەری کۆمەڵایەتیان بە شتێکی ئەستەم دەزانی.

بەپێچەوانەی ئەمەوە مێژووی یەهودییەت لە شڵەژانێکی بەردەوامدا بوو لەنێوان تواناکانی یەزدان و شتە نائومێدکەرەکانیدا کە دیاربوون. شڵەژانێکی توند هەیە لەنێوان ئەوەی پێویستە ببێت و ئەوەی لە بنەڕەتدا بوونەوەرە. لە سەرئەنجامی ئەمەوە یەهودییەت زەمینەیەکی سازاند بۆ شۆڕشی کۆمەڵایەتی. کاتێك

شـتەكان بـەپێی پێویسـت نـین ئـەوا گۆڕانكاریـەك بەدوایانـدا دێـت. ئـەم بیرۆكەیـە بـەروبوومی خـۆی دابەدەستەوە، چونكە چەند بزوتنەوەیەك دەركەوت بۆ چاككردنی باری كۆمەڵایەتی لەناو وڵاتانەی كاریگەر بوو بە تێڕوامینی یەهودییەت بۆ مێژوو، (ئەم تێڕوانینە كاریكردە سەر مەسیحیەت و بەڕادەیەكی كەم لەسەر ئیسـلام)، پێغەمبـەرانی نـەوەی ئیسـرائیل نمونەیـەك بـوون لەسـەر ئەمـە. ((لەڕاسـتیدا پێغەمبـەرانی یـەهوزا بـەهۆی پلەوپایەیانـەوە لـەناو خەڵكـدا هێزێكـی ڕامیـاری چاكسـازیان بنیاتنـابوو نـەدەكرا سـنورەكانی ببەزێنرێت لەو سەردەمەدا هاوشێوەی نـەبوو چونكە ناسراو بـوو بـە سـەربەخۆیی لـە ڕەخنەگرتنـدا. )). بە باوەڕی جێگیریان بەوەی شتەكان بەو شێوەیە نەبوون كە پێویستبوو بن، پێغەمبەرانی نـەوەی ئیسـرائیل بـە ناوی أللە كەشوهەوایەك لە چاكسازیان دروستكردبوو.

# واتای ڕەوشت

مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە ئەگەر جیاکرایەوە لە کۆمەڵگا لەدوای لەدایکبوونی ئەوا هەرگیز ناتوانێت ببێتە مرۆڤ، لەلایەکی ترەوە کاتێك لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا دەژی لە نەوەکانی مرۆڤ زۆربەی کات بەربەری دەبێت و وەکو ئاژەڵ ڕەفتار دەکات!. پێویستی بنەما ئاکاریەکان لەم ڕاستیەوە هەڵدەقوڵێت.

هیچ کەسێك یاسا ئاکاریەکانئەخلاقی خۆشناوێت هەروەك حەز بە ڕەنگی سور ناکات لە هێماکانی هاتوچۆدا، بەڵام نەمانی بەربەستە ئەخلاقیەکان واله پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان دەکات ئاڵۆز و ناڕێك بێت هەروەك ناڕێکی و قەرەباڵغی شەقامەکانی شیکاگۆ ئەگەر هەموو مرۆڤێك بە هەوەسی خۆی ئۆتۆمبێلەکەی لێبخوڕێت!

یاسای تەوراتی یەهودییەت ئەو بەندو کۆتە داناییانە لەخۆدەگرێت کە مرۆڤەکان ئازاد دەکات. دواتر ئاماژەدەکەین بەو یاساو بنەمایانە، بەڵام لە ئێستادا تەنها باسی ڕاسپاردە ئەخلاقیەکان دەکەین. بەپێی تێڕوانینی حاخامەکانی جوولەکە کتێبی پیرۆز زیاتر لە ٦١٣ ڕاسپاردەی تێدایە بۆ ڕێکخستنی هەڵسوکەوتی مرۆڤ. لێرەدا تەنها باسی چوار دانەیان دەکەین لە دە ڕاسپاردە چونکە کاریگەریەکی مەزنیان هەبوو لەسەر ڕەوشتی عیبرانی. دواتر مەسیحیەت و ئیسلام ئەم دە ڕاسپاردەیەی لەخۆگرت بەمجۆرە بووە بنەمای سەرەکی ڕەوشت بۆ زۆربەی جیهانی ڕۆژئاوا.

چوار جێگا هەن لە ژیانی مرۆڤدا ئەگەر لەژێر کۆنترۆڵ نەما چەندین کێشە دەکەوێتەوە بەهۆیەوە: هێز، سێکس، سامان و دارایی، قسە و گوفتار. لەسەر ئاستی ئاژەڵەکان دوانیان هیچ کێشەیەك دروست ناکەن. چونکە ئاژەڵان ناتوانن قسەبکەن، هەروەها سامان و دارایی هیچ بایەخێکیان نیە لەلای ئاژەڵان. بەڵام سێکس و هێز کێشە دەنێنەوە بەڵام بەڕادەیەکی زۆر نیە. بەڵام سەبارەت بە جیهانی مرۆڤ شتەکان بەشێوازێکی ترن ئەگەر دەست نەگیرێت بەسەر هەستەکانی بوغزوکینە و تۆڵەسەندنەوەدا ئەوا دەبێتەهۆی ڕودانی توندوتیژی کە دەتوانێت کۆمەڵگا پەرت و لاواز بکات. تاوانی کوشتن و پاڵنەری تۆڵەسەندنەوە لەوانەیە بەشێوەیەکی ناکۆتا بەردەوام بێت بەڕادەیەك لەوانەیە ببێتەهۆی تێکمدانی کۆمەڵگە بەتەواوی. هەمان شت سەبارەت بە دزیکردن و فریودان. لەڕاستیدا بوونی کۆمەڵگایەك تیایدا خەڵك بەویستی خۆیان کاربکەن ئەمە شتێکی خەیاڵیە. چونکە ئەم جۆرە بەرەڵاییە دەبێتەهۆی لەناوچوونی کۆمەڵگەکان و بەردەوامنەبوونیان، بە واتایەکی تر ئەگەر هەر کەسێك بە هەوەسی خۆی و بەبێ پەیڕەوکردنی یاساکان ڕەفتار بکات ئەوا مێژووی ئەو کۆمەڵگایە هەر زوو کۆتایی دێت و بەردەوام نابێت.

سەبارەت بە هێز ئەم ڕاسپاردانە دەڵێن دەکرێن کۆمەڵگاکان پێکەوە بجەنگن بەڵام لەناو یەك کۆمەڵگای دیاریکراودا کوشتن ڕێگەپێدراو نیە، چونکە دەبێتەهۆی تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵگا. لەبەرئەوە ڕاسپاردەکە دەڵێت ((کەس مەکوژە)). هەمان شت سەبارەت بە سێکس. دەکرێت ئاڵودەی کچان ببیت لەگەڵیان بدوێیت تەنانەت سێکسیان لەگەڵدا ئەنجام بدەیت بەڵام لە سنوری یاسادا واتا تەنها بۆ ئەو کەسانەی پەیوەندی هاوسەریان پێکەوە هەیە، واتە لەدەرەوەی ئەم پەیوەندیەدا ڕێگەپێدراو نیە، بەوهۆیەوە ڕاسپاردەکە دەڵێت ((داوێن پیس مەبە)). سەبارەت بە سامان و دارایی دەتوانیت بە خواستی خۆت دارایی ماڵت زیادبکەیت بەڵام ڕێگەپێدراو نیە ڕاستەوخۆ لە پارە و سامانی یەکێکی تر دزی بکەیت چونکە ئەمە دەبێتەهۆی دروست بوونی دوژمنایەتی و شەڕ و ئاژاوە بەجۆرێك کۆنترۆڵ ناکرێت، لەبەرئەوە ڕاصپاردەکە

دەڵێت ((دزی مەکە)). دواجار سەبارە تبە قسە و گوفتار پێویستە تەنها ڕاستیەکان بوترێت، ڕاسپاردەکە دەڵێت ((شایەتی درۆ مەدە لەسەر دراوسێکەت)) چونکە سزاکەی زۆر توند دەبێت.

دە ڕاسپاردەکە تەنها لەڕووی ڕەوشتەوە گرنگ نین بەڵکو گشتگیرن و یەکلاکەرەوەن بۆ زۆربەی کێشەکان. ئەمە بۆمان دەردەخات چۆن بەدرێژایی سێ هەزارساڵ بەسەر دابەزینی ئەم ڕاسپاردانە لەسەر شاخی سینا هێشتا کاریگەرن. هەر ئەمەشە کتێبی تەورات بانگەوازی بۆ دەکات و دوپاتی دەکاتەوە: ((پێغەمبەرێك نەهاتوە لە نەوەی ئیسرائیل وەکو موسا یەزدان ڕووبەڕوو لەگەڵیدا بدوێت))(سفر التثنية: ٣٤/١٠).

## واتای دادپەروەری

شارستانیەتی ڕۆژئاوا قەرزاری کۆمەڵە پیاوێکی مەزنە کە ئێمە ناویان دەبەین بە پێغەمبەر لە بیروباوەڕیاندا:

١) داهاتوی هەر نەتەوەیەك لەبەشێکی زۆریدا پشت دەبەستێت بە دادپەروەری لە سیستمە کۆمەڵایەتیەکەیدا،

٢) تاکەکان بەرپرسیارن لە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان هەروەك بەرپرسیارن لە چۆنیەتی هەڵسەوکەوتکردنیان.

لە ئەمڕۆدا کاتێك بە کەسێك دەوترێت پێغەمبەر وادەزانرێت پێشبینی ڕوداوەکانی داهاتومان بۆ دەکات بەڵام ئەمە واتاکەی نیە. وشەی پێغەمبەرprophet لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانیەprophetes کە پێکدێت لە proواتە لەبەر، phetesواتە دەدوێت، کەواتە مانای ئەم وشەیە بە زمانی یۆنانی: ئەو کەسەی دەدوێت بە ناوی کەسێکی ترەوە. ئەم واتایە بەتەواوی هاوشێوەی واتاکەیەتی لە زمانی عیبریدا. کاتێك ألله موسای ڕاسپارد بچێتە لای فیرعەون و داوای لێبکات کە عیبرانیەکان ئازاد بکات، موسا سکاڵای کرد لەلای خوداکەی و پێی وت ناتوانێت بەشێوازێکی باش قسەبکات ألله پێی وت: ((هارونی برات وەك پەیامبەرێك دەبێت بۆ تۆ))(سفر الخروج ١/٧) (واتە بەناوی تۆوە قسە دەکات).

ئەگەر واتای گشتی وشەی پێغەمبەر سەبارەت بە عیبرانیەکان بریتیبێت لە ((ئەو کەسەی دەدوێت بەناوی کەس و دەسەڵاتێکی ترەوە))، ئەوا ماما تایبەتیەکەی (کە بەکارهێنراوە بۆ ئاماژەکردن بە کۆمەڵێکی دیاریکراو لە ماوە تەوراتیدا) بریتیبوو لە ((ئەو کەسەی دەدوێت بەناوی ألله)). کەواتە پێغمبەر جیاوازی هەیە لە هەموو مرۆڤەکان تەنانەت جەستەشی دەکرێت ببێتە کەناڵێك ألله لەڕێگەیەوە بدوێت لەبارەی هەلومەرجێکی مێژوویی ڕاستەوخۆوە.

پێداچونەوە بە بزوتنەوەی پێغەمبەرایەتی لە ئیسرائیلی تەوراتیدا ئەوەمان پێ نیشان دەدات کە تاکە دیاردەیەك نەبووە. ئەگەر پێغەمبەرایەتی موسامان لەلایەك دانا چونکە بە تەنها جۆرێك پێکدەهێنێت، دواتر سەیری بزوتنەوەی پێغەمبەراتی ئیسرائیلمان کرد هەست بەوە دەکەین بە سێ ئاستدا تێپەڕبووە ألله کاری تێداکردوە لە هەریەکەیاندا بەشێوازێکی جیاواز.

ئاستی یەکەم ئاستی کۆمەڵەی پێغەمبەرایەتی بوو کە باسکراوە لە بەشی نۆیەم و دەیەم لە (سفر صموئیل)ی یەکەم. لەم ئاستەدا پێغەمبەرایەتی دیاردەیەکی بەکۆمەڵ بوو پێغەمبەران وەك چەند تاکێك نەناسرا بوون چونکە بەهرەکەیان موڵکی تاکە کەسێکیان نەبوو. بەشێوەی بە کۆمەڵ گەشتیان دەکرد. زانا دەروونناسەکان ناوی دەبەن بە جۆرێك لە مەستی بەکۆمەڵ. ئەم گروپە خۆیان سەرقاڵ دەکرد بە یارمەتی مۆزیك و سەماکردن هەتا وردەوردە بێئاگا دەبوون دەچوونە نێو جۆرە مەستیەکی ئیلاهیەوە (یەزدانی).

ڕەهەندێکی ئەخلاقی بوونی نەبوو لەم پێغەمبەرایەتی ئەم ئاستەدا. پێغەمبەران واخۆیان نیشان دەدا لەلایەن ألله دەستیان بەسەرداگیراوە تاکە بەڵگەیان لەسەر ئەمە بریتیبوو لەوەی ئەم ئەزمونە وزەی پێدەدان.

لە ئاستی دوەمدا ڕەوشت بەشداربوو ئەمە ئاستی پێغمبەرە تاکەکانی پێش سەردەمی نوسین بوون. ناوەکانیان بەمشێوەیە پێمان گەیشتون: ئیلیا ألیشع میخا أخیا[29]. . . و چەندانی تر، بەڵام کاتێك لە

[29] ناوەکانیان و هەواڵیان دەبینین لە سفر الملوك الاول لە تەوراتی عیبریدا

ئاستی پێش سەردەمی نوسیندا بوون مەستی ڕۆحی کاریگەر بوو، هەروەها هێز ڕۆڵی خۆی هەبوو ((سی ملیان دەبڕی. . . بەناو دۆڵ و شاخەکاندا دەڕۆیشتن. . ڕۆحی یەزدان هەڵیدەگرتن و دەیبردنە لوتکەی چیاکان. . ))(٥). بەڵام دوو شتی جیاواز هەیە. وێڕای ئەوەی ئەو پێغەمبرانە بە کۆمەڵ بوون دەیانتوانی لەگەڵ یەزدان بدوێن کاتێك بە تەنها دەبوون، دووەم ألله لەڕێگەی ئەوانەوە دەدوا بەشێوازێکی ڕوونتر وەك سۆزێك پاڵپشتی لە دادپەروەری دەکرد.

دوو ڕووداو هەڵدەبـژێرین لـەنێو کۆمەڵـە ڕووداوەکـەدا بۆئـەوەی ئـەم خاڵـە ڕوونبکەینـەوە. یەکـەم چـیرۆکی نابوت کە ڕازی نەبوو دارمێوی بنەماڵەکەی بداتە پادشا زۆردارەکە ئاخاب بەوهۆیەوە پادشا تۆمەتێکی بۆ هەڵبەست کە گوایە ئاژاوەی ناوەتەوە و ناوی ئەوی زڕاندوە، بڕیاریدا کە بەردباران بکرێت هەتا دەمرێت لەو سەردەمەدا تۆمەتی ناوزڕاندن تاوانێکی گەورە بوو، بەمجۆرە پادشا دەستی گرت بەسەر تەواوی ماڵ و سامانی نابوتدا. کاتێك ئەم هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ئیلیا یەزدان فەرمانی پێدا: ((بچۆرە لای ئاخاب پادشای ئیسرائیل کەلە سامیرەیە پێی بڵێ: یەزدان وەهای گوت: ئایا کوشتت و هەروەها ماڵ و سامانت بەی میراتی بۆ خۆت برد؟ لەو شوێنەی سەگەکان خوێنی نابوتیان لێسایەوە خوێنی تۆش دەلێسنەوە))(سفر الملوك الاول: ٢١/١٨-١٩).

ئەم چیرۆکە هەڵگری مانایەکی شۆڕشگێڕانەیە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی، چونکە چیرۆکێکە باس لەوە دەکات چۆن کەسێکی بێ پلەوپایەی فەرمی بەرەوڕووی پادشایەك دەبێتەوە و لایەنگیری کەسێکی زوڵملێکراو دەکات. هەرچەندە بگەڕێین لە تۆمارەکانی مێژوودا چیرۆکێکی هاوشێوەی ئەمە نادۆزینەوە. ئیلیا دەسەڵاتێکی فەرمی نەبوو هەتا بڕیارێکی وا بدات. شێوازی سروشتی هاوشێوەی ئەو ڕۆژانە پێویست بوو پاسەوانە تایبەتیەکانی پادشا بێن و هەر لەوێدا بیکوژن. بەڵام لەڕاستیدا ئەو هەواڵێکی پێڕادەگەیاند واتە لەبارەی دەسەڵاتێکەوە دەدوا کە موڵکی ئەو نەبوو، ئەوە ڕاستیەکی ئاشکرابوو تاڕادەیەك پادشا ئاخاب دانیبەوەدا نا ڕاگەیاندنەکەی ئیلیا دروستە و گومانی تێدا نیە.

هاوشێوەی ئەم ڕوداوە دەرکەوت بۆ جارێکی تر لەکێشەی پادشا داود و ژنێك. کاتێك داود لە سەربانی کۆشکەکەی ڕێی دەکرد چاوی کەوت بە ئافرەتێکی سەرنجڕاکێش خۆیدەشت ناوی بشسبعا، هەر زوو داوای کرد بیهێننەلای بۆئەوەی لەگەڵی بخەوێت بەڵام ڕێگرێکی لەبەردەمیدا بینی ئەویش هاوسەرەکەی بوو. سەبارەت بە خانەوادەی فەرمانڕەوا لەو سەردەمەدا ئەمە بەربەستێکی زۆر سادە بوو، بەمجۆرە پادشا داود بڕیاری دا مێردەکەی أوریا لەناوبەرێت بۆیە فەرمانی دەرکرد بێنێرنە بەرەکانی پێشەوەی جەنگ، فەرمانی دا بیخەنە ناوەڕاستی مەیدانی جەنگ دواتر پاشەکشێ بکەن بۆئەوەی لەلایەن دوژمنەوە بکوژرێت. هەموو شتێك بەگوێرەی پیلانەکە ڕووی دا بەڵام پێغەمبەر بەمکارەی زانی یەکسەر هەستی بەوەکرد داود بەمکارەی پەروەردگاری تورە کردوە بۆیە خێرا چووەلای پادشا داود پێی ووت: ((خودای ئیسرائیل بەمجۆرە دوا: من تۆم کردە پادشای ئیسرائیل و ڕزگارمکردیت لە دەستی شاول. . . ٩ بۆچی سوکایەتیت کرد بە وتەی خودا و بەبەرچاویەوە کارێکی وەها خراپت کرد؟ أوریات بە شمشێر کوشت و ژنەکەیت بۆ خۆت برد ١٠ لە ئێستا بەدواوە بۆ هەمیشە شمشێر ماڵەکەت جێناهێڵێت. . . خودا بەمجۆرە دوا: ئەوا من بڕیارم دا شەڕ و خراپەکاری باڵ بکێشێت بەسەر ماڵەکەتدا، لەپێشچاوتدا ژنەکانت دەبەم و دەیاندەمە کەسە نزیکەکەت بۆئەوەی بە ئاشکرا لەگەڵیان بخەوێت. ١٢ چونکە تۆ ئەم کارەت بە نهێنی ئەنجامدا بەڵام من ئەمەت بەسەردا دەهێنم بە ئاشکرا و لەپێشچاوی هەموو ئیسرائیل. . . . ١٤ جگەلەوە لەبەرئەوەی تۆ بەم کارەت

دوژمنانی خودات دڵخۆش کرد ئەو کوڕەی لە تۆ لەدایك دەبێت دەمرێت. )) (سفر صموئیل الثاني: ١٢/٧، ٩-١٢، ١٤).

ئەو خاڵەی لێرەدا چاوەڕواننەکراوە لەم دەقانەدا کاری پادشاکان نیە چونەکە ئەوان زۆر بە سادەیی ئەم کارەیان ئەنجامد دەدا. ئەو ڕوداوەی کە هاوشێوەی نەبوو بریتیەلە شێوازی بەرەنگاربوونەوەی پێغەمبەران بەرامبەر کارە خراپەکانی پادشاکان.

ئاستی سێیەمی بزوتنەوەی پێغەمبەرایەتی دەستپێکرد بە هاتنی پێغەمبەرە مەزنە نوسەرەکان: عاموس، هوشیا، ارمیا، اشعیا و ئەوانی تر. لەم ئاستەدا ئەزمونی پێغەمبەرایەتی خاڵی نەبوو لە مەستی و خۆشەویستی یەزدانی چونکە لە سفر حزليق: بەشی ١-٣، ارمیا: بەشی ١، اشعیا: بەشی ٦، باس دەکات لەوەی چۆن پێغەمبەران یەزدانیان بە پیرۆز زانیوە و پەرستویانە. هەروەك بەردەوامە لەم سەردەمەدا هەمان جەختکردنەوەی ئەخلاقی بۆ پێغەمبەرانی ئەو سەردەمە بەڵام لێرەدا بەرەوپێشچونێکی گرنگ ڕوویدا کاتێك پێغەمبەر ناثان و پێغەمبەر ايليا هەستيان کرد بە توڕەیی ألله بەهۆی کردەوە خراپەکانی مرۆڤەوە لە زوڵم و زۆرداری، عاموس و اشعیا هەستیان کرد بە ناڕازیبوونی ألله بەهۆی کردەوە خراپەکان و زوڵم و نادادپەروەری شاراوە لە کۆمەڵگادا لە بەرامبەردا ئەم پێغەمبەرانە هەستان بە بەرەنگاربوونەوەی ئەو زوڵم و نادادپەروەریە لە تەواوی دامودەزگاکی حکومەت و کۆمەڵگادا.

ئەم پێغەمبەرانە خۆیان بینیەوە لە سەردەمێکدا کەلێوانلێو بوو لە خراپترین جۆرەکانی نادادپەروەری کۆمەڵایەتی. سامان و دارایی وڵات تەنها لە دەستی چینی خانەدان و فەرانڕەوادا بوو، هەژاران هەروەك مەڕوماڵات ڕەفتایان لەگەڵدا دەکرا وەك کۆیلە دەفرۆشران و بازرگانیان پێوەدەکرا، هێندە بێنرخ سەیر دەکران تیایاندا بوو دەفرۆشرا بە جووتێك پێڵاو. سەردەمێك بوو فەرمانڕەواکان و کۆیلکانیان سزا دەدا بە ئارەزوی خۆیان، ژنان ملکەچی پیاوان دەکران، ئەو منداڵانەی نەخوازراو بوون فڕێ دەدران هەتا لە برساندا دەمردن.

ئەم یاخیبوونە و نەمانی ڕەوشتە هەڕەشەی دەکرد لە تەندروستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای هاوچەرخ ئەم هەلومەرجە یەکێك بوو لە گرنگترین دیمەنەکانی ژیانی ڕامیاری جوولەکە لەو سەردەمەدا. بەڵام ڕاستیەکی تر بوونی هەبوو. بەجۆرێك مەترسی ناوەکی لەگەڵ مەترسی دەرەکی خۆی ڕێکخستبوو، بەشێوەیەك هەردو دەوڵەتی یەهوزا و ئیسرائیل کەوتبوونە نێو بەرداشێکەوە لەلایەکەوە هەردو ئیمبراتۆریەتی مەزنی ئاشوری و بابلی لە ڕۆژهەڵات، لەلایەکی ترەوە میسر و لە باشورەوە فینیقیا و لەباکورەوە سوریا، هەردو دەوڵەتی یەهوزا و ئیسرائیل لە مەترسی لەناوچونی تەواوەتیدا بوون. لە چەند هەلومەرجێکی هاوشێوەدا نەتەوەکانی تری ناوچەکە دیاریکەری ڕێژەی قوربانیانی ئەو مەترسیە بوون. ئەگەر هێز یەکلاکەرەوەی ئەگەرەکان بێت ئەوا نەتەوەیەکی بچوکی وەك جوولەکە دەتوانێت گۆڕانکاریەکی زۆر کەم بکات، جوولەکەکان بیرکردنەوەیان وابوو هیچ ڕوداوێك بەبێ دانایی نیە، تەنانەت کاتێك شتێك ئەستەم دەبوو دەیانوت داناییەکی تێدایە. دواتر ئەوەی نەتەوەکانی تردەتوانن ڕوونی بکەنەوە لەبارەی ئەوەی هێز لە پێشترە، پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل هەڕەشەیەکی یەزدانی تێدا دەبینن کە بانگیان دەکات بۆ پاکژکردنەوەی ژیانیان: بەشێوەیەك جوولەکە دادپەروەری بڵاوبکەنەوە یان بەرەنگاری لەناوچوون ببنەوە.

ئەگەر ویستمان ئەمە ڕوونبکەینەوە دەڵێین بنەمای پێغەمبەرایەتی دەکرێت بەمشێوەیە دابنرێت: مەرجی سەرەکی بۆ سەقامگیری ڕامیاری بریتیەلە دادپەروەری کۆمەڵایەتی، چونکە وەك زانراوە زوڵم و زۆرداری

درێژە ناخایەنێت هەر زوو کۆتایی دێت، ئەگەر بمانەوێت ئەمە بەشێوەیەکی ئایینیانە شیبکەینەوە ئەوا کێشەکە بەمشێوەیە دەخوێنرێتەوە: الله پلەوپایەیەکی زۆر بڵندی هەیە. بەوهۆیەوە خۆڕاگر نابێت بەرامبەر بە گەندەڵی نادادپەروەری و زوڵم و بەدڕەوشتی. هەروەها ئەم بنەمایە ناگوجێت لەگەڵ خۆشەویستی یەهوە بۆ مرۆڤەکان. پێغەمبەران بە گشتی هاوڕابوون لەسەر قسەکردن لەبارەی خۆشەویستی یەزدان بۆ بەندەکانی، زیاتر لەوەی کە دەدوان لەبارەی دادپەروەری یەزدانیەوە. یەکێك لە حاخامەکانی جوولەکە ئەم پەیوەندیەی بەم شێوەیە باسکردوە:

یەکێك لە پادشاکان چەند دەفرێکی خاڵی هەبوو، وتی ئەگەر ئاوی گەرمیان تێبکەم دەتەقنەوە و تێکدەشکێن هەروەها ئەگەر ئاوی زۆر ساردیان تێبکەم بەهەمان شێوە دەشکێن و ورد دەبن! پادشاکە چی کرد؟ ئاوە گەرم و ساردەکەی تێکەڵ کرد و کردیە ناو دەفرەکانەوە بەم شێوەیە دەفرەکان نەشکان. پەروەردگار بە هەمان شێوە ڕەفتاری کرد وتی: ئەگەر جیهان دروست بکەم تەنها لەسەر تایبەتمەندی ڕەحم و بەزەیی ئەوا تاوان و گوناە بەشێوەیەکی بەرچاو زیاددەکات لە جیهاندا، ئەگەر تەنها لەسەر بنەمای دادپەروەری دروستی بکەم ئیتر چۆن ژیان بەردەوام دەبێت؟ کەواتە لەسەر هەردو تایبەتمەندی دادپەروەری و بەزەیی دروستی دەکەم بەڵکو بەو جۆرە بەردەوام بێت!(٦).

پێغەمبەرانی هەردو دەوڵەتی یەهوزا و ئیسرائیل کەسانی نمونەیی بوون لە هەموو مێژوودا. چونکە چەند وشەیەکیان وت جیهان نەیتوانی هەرگیز لەیادیان بکات. عاموس کە شوانێکی سادە بوو بەڵام پیاوێکی خاوەن پلەوپایە بوو بەتەواوی توانایەوە هاواری دەکرد لە بازاڕی شاری ئیل: ((با دادپەروەری ڕێبکات هەروەك ئاو بۆئەوەی دادپەروەری جێبەجێبکات وەك ڕوبارێکی بەهێز))[30]. اشعیا کوڕی شاری قسەزانی ڕۆشنبیر هاواردەکات و داوادەکات ((ئەو کەسەی دادپەروەری دێنێت بۆ تەواوی زەوی)). هوشع و میخا و ارمیا هەر کۆمەڵیەك بن پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل لە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا هەموویان سادەبوون. هەموویان باوەڕیان وابوو هەموو مرۆڤێك دروستکراو و بەندەی خودایەو مافی ئەوەی هەیە ڕێزی لێبگیرێت. پێغەمبەران چونەتە نێو شانۆی مێژوەوە وەك کەسانێکی نەناسراو، وەك هێزێکی گەوهەری سەرەکی. لە جیهاندا ژیان لەگەڵ هاونیشتمانیەکانیان جیهانێك سامان و دارایی و مەزنی هیچ بەهایەکی نەبوو لەلایان، جیهانێك پادشاکان تێیدا بچوك دەهاتە پێشچاویان هێزی مەزنی هیچ نەبوو ئەگەر بەراوردبکرایە بە دادپەروەری و بەزەیی، بەوهۆیەوە کاتێك پیاوان و ژنان گەڕانەوە بۆ سەر مێژوو بۆ گەڕان بەدوای دادپەروەریدا ئەوا دەیبیننەوە لە ڕاگەیاندنە ڕاشکاوەکانی ئەو پێغەمبەرانەدا.

---

[30] )ئاماژە بەم دەستەواژانە دەکات لە سفر عاموس: بەشی ٥: ((١٤ داوای خێر و چاکە بکەن نەك خراپەکاری بۆئەوەی بژین، یەزدان پشتگیریتان لێدەکات. ١٥ خراپەکاری سوك و ڕیسوا بکەن خێر و چاکەتان خۆشبوێت و دادپەروەری بڵاوبکەنەوە، بەڵکو پەروەردگار بەزەیی بێتەوە بە ئەوانەی ماونەتەوە لەماڵی یوسف. )).

## مانای ئازارچەشتن

لە سەدەی هەشتەمەوە هەتا سەدەی شەشەمی پ. ز. ، کاتێك هەردو دەوڵەتی یەهوزا و ئیسرائیل لەژێر هێرشە یەکلەدوای یەکەکانی سوریا و ئاشوریا و میسر و بابلدا بوون پێغەمبەران مانای ئەو کێشانەیان زانی کاتێك ڕێگای ألله بینی تیایدا بۆ جەختکردنەوە لەسەر داواکردنی دادپەروەری لە جوولەکە. ألله سەرقاڵ بوو بە ناکۆکیەکی مەزنەوە لەگەڵ نەتەوەکەیدا کاتێك زانی جوولەکە گرنگی نادەن بە ڕاسپاردە و ئامۆژگاریەکانی لە بەرامبەردا دوژمنانی ئیسرائیلی زاڵکرد بەسەر جوولەکەکاندا:

(ألله بەم شێوەیە دوا: بەهۆی یاخیبوونی ئیسرائیلەوە خەشم و قینم لانابەم لەسەریان، چونکە کەسی ڕاستگۆیان فرۆشت بەرامبەر بە زیو، کەسی هەژاریان گۆڕیەوە لەگەڵ جووتێك نەعلدا، ٧ ئەوانەی سەری هەژار پاندەکەنەوە لەسەر زەوی، ئازاری هەژاران دەدەن، کوڕ و باوك لەگەڵ یەك ئافرەتدا دەخەون، بەمچۆرە ناوی پیرۆزم لەکەداردەبێت. . .

١١لەبەرئەوە یەزدان ڕادەگەیەنێت پێتان: دوژمن دەست دەگرێت بەسەر تەواوی وڵاتدا، کۆشك و تەلارەکانتان تاڵان دەکەن. ))(سفر عاموس ٢/ ٦-٧ و ١١/٣).

ارمیا بەردەوامە لەسەر هەمانت هەڵوێست کە وابیردەکاتەوە ألله کاتێك جوولەکەکانی بینی وازیانهێنابوو لە چاکسازی و دادپەروەری بڕیاری دا ((. . ئەم شارە بکات بە نەفرەت بۆ هەموو نەتەوەکانی جیهان))(ارمیا ٦/٢٦).

دەکرێت ئەو ئازایەتیەی پێویستە هەبێت بۆ ڕاگەیاندنی ئەم شیکردنەوەیە سەبارەت بە ئیدانەکردن و تیاچوونی تەواو. چەندە ئاسانە وادابنێین ألله پشتگیریمان لێدەکات یان خۆمان ڕابهێنین لەسەر قوبوڵکردنی تێکشکان و دۆڕان.

بەڵام بەهەرحاڵ هێشتا نەگەیشتوینەتە لوتکە. نەدەکرا خۆمان بپارێزین لە دۆڕان. لەساڵی ٧٢١ پ. ز. ئیمبراتۆریەتی ئاشوری هێرشی کردەسەر مەملەکەتی ئیسرائیلی باکور بۆ هەمیشە سڕیەوە لەسەر زەوی، دانیشتوانەکەی کردە دە هۆزی ونبوو. دواتر لەساڵی ٥٨٦ پ. ز. نبوخذ نصر مەملەکەتی یەهوزای باشوری داگیرکرد بەڵام ژنانی سەرۆکەکەی پاراست و نەیکوشت، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری نەتەوەی یەهوزا وەك دیل بردنی بۆ وڵاتی بابل.

بەمجۆرە جوولەکە دوا هەلیان لەدەست دا بۆ ئەنجامدانی چاکسازی و سەرئەنجام سووك و ڕیسواکران. ئاشکرایە زۆربەی پێغەمبەران پێشبینیان کردە سەرئەنجامی زوڵم و زۆرداری هەر زەلیل بوون و دۆڕانە بۆیە بە نەتەوەکەیان وت: ((ئایا لەمە ئاگادارمان نەکردبوونەوە؟)) بەڵام ئەمە تێکەڵەیەك لە ئیدانەکردن و تۆڵەسەندنەوە نەبوو، بەڵکو بەشێکە لە زمان و ئەدەبیاتی پێغەمبەران. ڕاستی سەرسامکەر لە گەڕانی جوولەکە بەدوای واتای شتەکاندا بریتیەلەو ڕێگایەی پێغەمبەران پێی هەستاون لە هاوشێوەی ئەو کاتە ڕەشانەدا کە تیایدا مانای شتەکان دەگاتە قووڵترین جێگای بەهۆی بەردەوامی هەڵکۆڵین هەتا جۆرێکی نوێ لە دانایی بدۆزنەوە. لەڕاستیدا ئەگەر ئەو کارەیان نەکردایە ئەو مانای وابوو ڕازیبوون بەو تێڕوانینەی دەڵێت خوداوەندی سەرکەوتو بەهێزترە لە خوداوەندی دۆڕاو، ئەمە هەڵوێستێکە کۆتایی بە بیروباوەڕی تەوراتی دەهێنێت لەگەڵ کۆتایی هاتن بە گەلی جوولەکە. ڕەتکردنەوەی ئەم هەڵوێستە داهاتووی جوولەکەی ڕزگارکرد. لە سەدەی ٦ پ. ز. پێغەمبەرێك لە بەشەکانی کۆتایی سفر اشعیا لە وڵاتی بابل کاتێك دیلکرابوون نوسیویەتی یەهوە تێکنەشکێنراوە لەلایەن خوداوەندی بابلی مەردۆخەوە بەڵکو هێشتا مێژوو

تایبەتە بە یەهوە. ئەمە بەو واتایە دێت دانایییەك هەیە لە دۆڕانی جوولەکەکاندا، پێویستە دەرکبکرێت بەو دانایییە و بناسرێتەوە. ئەو دانایییەی اشعیای دووەم ڕوونی کردوەتەوە که سزا نەبووە. بەڵێ جوولەکەکان پێویستیان بەوە بوو لەم دۆڕانەیان پەند و عیبرەتێك فێربن.

لەسەر ئاستی فێرکاری چەند وانە و پەندێك هەن لەو ئازار و ئەشکەنجە چەشتنەدا، ناکرێت هیچ شتێکی تر هاوشێوەی ئەمەمان پێبدات. چونکە لەم حاڵەتەدا ئەزمونی دۆڕان و ڕاگواستن بەهای ڕاستەقینەی ئازادی ناساند لەلای جوولەکەکان، ئەو ئازادیەی ألله پێی بەخشیبوون پێویستبوو لەسەریان بەهاو نرخی بزانن و بیپارێزن بە تەواوی توانایانەوە، لەدوای ئەوەی لە دێرزەمانەوە تامی کۆیلایەتیان چەشتبوو لە میسر، جوولەکەنکان بەمجۆرە تاسەی دوری وڵاتی خۆیان دەردەبڕی:

((١ لەسەر کەناری ڕوبارەکانی بابل دانیشتین، گریان کاتێك ئۆرشەلیممان کەوتەوە یاد.

٢ لەوێدا گۆچانەکانمان هەڵواسی بە دارە بییەکانەوە.

٣لەوێدا ئەو کەسانەی نەفرەتیان لێکردین داوایان لێکردین سرودێکیان بۆ بڵێین پێیان وتین: یەکێك لە سرودە ئایینیەکانمان بۆ بڵێن!.

٤چۆن سرودی یەزدان بڵێن کاتێك ئێمە لەسەر ئاو و خاکی خۆمان نین؟

٥ئەگەر لەبیرم کردیت ئەی ئۆرشەلیم با لای ڕاستم شارەزایییەکەی لەبیربچێتەوە. ٦زمان بلکێت بەمەڵاشومەوە ئەگەر یادم نەکردیت و تۆم بە باشتر نەزانی لە لوتکەی خۆشیەکانم. ))المزامیر: ١٣٧/١-٦.

تاکە ڕستەیەك بەس بوو بۆ گواستنەوەی دڵتەنگی ئەو کێشەیەی تێیکەوتبوون: ((هەتا کەی ئەی خودا؟! هەتا کەی!؟)).

کاتێك کۆرش پادشای فارس بابلی داگیرکرد لەساڵی ٥٣٨ پ. ز. ، ڕێگەی دا بە جوولەکەکان بگەڕێنەوە بۆ فەلەستین، پێغەمبەران فێری وانەیەکی تر بوون تەنها ئازارچەشتن دەتوانێت شێوەیەکی تەواوی پێبدات، ئەوانەی بە باوەڕداری دەمێننەوە لەکاتی تەنگانەدا لەکۆتاییدا کێڵگەکانیان پێدەدرێتەوە.

((کۆت و زنجیری دیلی بشکێنن. بابل بەجێ بهێڵن.

بە دەنگی بەرز گۆرانی بڵێن بۆئەوەی لە تەواوی جیهان ببیسترێت

خودا یەعقوبی لە دیلی ڕزگارکرد. ))اشعیا ٤٨: ٢٠-٢٢.

ئەو شتەی جوولەکە فێری بوو لە بە دیلگرتنیان تاکە مانای تەنگانەکەیان نەبوو بەڵکو ألله بەکاری دەهێنان بۆئەوەی پەند و ئامۆژگاری بداتە مێژوو کە هەموو مرۆڤەکان پێویستیان پێی بوو، بەڵام لەبیری دەکەن و بەهۆی ئەو خۆشیەی ئێستا تێیدان. ألله خۆشویستنی ئازادی و دادپەروەری جێگیرکرد لە دڵی جوولەکەکاندا بۆئەوەی کاریگەریەکەی بمێنێتەوە لەسەر تەواوی مرۆڤایەتی.

((من یەزدانم تۆم بانگکرد بۆ سەر چاکسازی. دەستم گرتیت و تۆم پاراست و بوویتە ڕوناکی بۆ تەواوی نەتەوەکان بۆئەوەی چاوی نابینایان بکەیتەوە، بەندکراوان ئازادبکەیت، لە تاریکی دەریان بهێنیت. )) اشعیا ٤٢: ٦-٧.

ئەگەر بمانەوێت ئەمە ڕوون بکەینەوە دەڵێین قووڵترین مانا جوولەکە دۆزیویانەتەوە لە مەنفادا کاتێك ڕاگوێزران بۆ بابل واتای ئازار چەشتن بوو: بەو واتایە دێت ئازار بچێتە ناو ژیانی چەند کەسێك و بەرگەی بگرن بۆئەوەی ئەوانی تر ڕزگاریکرێن. اشعیای دووەم ئەم بنەمایەی بەستەوە بە ئەزمونی نەتەوەکەیەوە چونکە پێشبینی ئەوەی کردبوو ئەم نەتەوە بچوکەی سوکایەتیان پێکرد، لەبری ئەوان ئازاری دەچەشت:

((بەڵام ئەو دڵتەنگی ئێمەی هەڵگرت و بەرگەی ئازارەکانی گرتین، ئێمە وامانزانی خودا سزای داوە، بەڵام ئەو بریندار و تێکشکاو بوو بەهۆی تاوان و گوناهی ئێمەوە، بەهۆی برین و زامەکانیەوە ئێمە دەربازبووین.
هەمووومان وەکو مەڕومالاڵات بێئاگابووین هەریەکە ڕێگەی خۆی گرتەبەر، سەرئەنجام خودا باری ئەوی قورس کرد بەهۆی تاوانی هەمووومانەوە. ))اشعیا ٥٣/ ٤-٦.

## مانای چاوەڕوانکردنی مەسیحی ڕزگارکەر

وێڕای ئەوەی جوولەکە دەیانتوانی مانا و دانایی بدۆزنەوە لە ئازارچەشتنیان، بەڵام دانایی سەبارەت بە ئەوان لەوێدا کۆتایی نەهات بەڵکو گەیشتە لوتکە لە بنەمای پێشبینیکردنی هاتنی مەسیحی ڕزگارکەری چاوەڕوانکراو.

دەتوانین بگەین بەم بنەمایە بەدەستپێکردن لە ڕاستیەکی گرنگ. بیرۆکەی پێشکەوتن، واتە باوەڕهێنان بەوەی مەرجەکانی ژیان دەکرێت چاکبکرێت بەم واتایە دەشێت مێژوو چاکتر ببێت، ئەمە بیرۆکەیەك بو لە ڕۆژئاوا دروست بوو. ئەوانی تر کە گەیشتن بەم بیرۆکەیە لە ڕۆژئاوا وەریانگرت.

وێڕای ئەوەی ئەمە ڕاستیەکی سەرنجڕاکێشە بەڵام شایەنی شیکردنەوەیە. ئەگەر کورتمان کردەوە لەسەر ئەو دو شارستانیەتەی تر کە بەردەوام بوون لە مانەوە–شارستانیەتی باشوری ئاسیا کە هیند ناوجەرگەی پێکدێنێت و شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە چڕبووەتەوە لە چین(٧)–ئەوا هەست بەو دەکەین تێڕوانینیان بۆ شتەکان پێکهێنراوە لەلایەن کەسانی خاوەن دەسەڵاتەوە. بەپێچەوانەی ئەمەوە تێڕوانینی ڕۆژئاوا بۆ شتەکان یەکلاکەرەوە بوو لەلایەن جوولەکەوە، ئەوانەی لەڕووی ئاستی کۆمەڵایەتیانەوە لاوازکرابوون. لەوانەیە چینی فەرمانڕەوا ڕازی بن بەو هەلومەرجە بەڵام لاوازکراو و زوڵملێکراوەکان بەو جۆرە نەبوون هەتا وەرەیان نەڕوخێنرابوو ئەمە هەرگیز ڕووی نەدابوو لەلای جوولەکە واتا وره بەرزبوون. ئەمە هیوابەخش بوو بۆ جوولەکە بیرکردنەوەیان بەرەوپێش چوو. نەتەوەیەك بوون هەمیشە سەرقاڵی پێشبینیکردن بوون، نەتەوەیەك هەمیشە چاوەڕوانی باشتر بوون. بەهیوای دەربازبوون لە کۆیلایەتی و گەڕانەوە بۆ سەر زەوی بەڵێنپێدراو.

جوانە، جوانە کێڵگەکانی فراوانە
سەوز و گەشاوەیە،
کەنعان بەمشێوەیە دەهاتەپێشچاوی جوولەکە
لەوێدا ڕوباری ئەردەن دەهاتەخوارەوە

ئەگەر ویستمان کێشەکە کورتبکەینەوە: ئەوا لاوازکراوەکان تاکە ڕێگەیەکیان لەبەردەمدا بوو ئەویش بریتیەلە مەیلی لەڕادەبەدەری جوولەکە بۆ خەیاڵ–دواجار گواسترایەوە بۆ ڕۆژئاوا–بەرەو سەرئەنجامێك کە بەشێوەیەکی گشتی هەلومەرجی ژیان دەکرێت بەرەو باشتر بچێت.

هیوا وەڵامدانەوەیەکی زیاتر دەدۆزێتەوە لە دڵی مرۆڤدا کاتێك دەگۆڕێت بۆ شتێکی بەرجەستەکراو و هەستپێکراو، بەوهۆیەوە هیوای جوولەکە دواجار بەرجەستەکرا لە کەسایەتی مسیا (مسیح) چاوەڕوانکراو. وشەی مسیا وەرگیراوە لە وشەی (مشیح)ی عیبری: کەسی سڕدراو بە زەیت واتە ئەو کەسەی بە زەیت چەورکراوە، بەڵام کاتێك پادشا و کاهین و قەشەکان بە زەیت چەوردەکران ئەم دەستەواژەیە بووە نازناوێکی ڕێزلێنراو کە ئاماژەدەکات بۆ مرۆڤێك پلەوپایەی بەرزکرابێتەوە و هەڵبژێردرابێت، چونکە مشیح واتە کەسی هەڵبژێردراو. جوولەکە لە ماوەی دوورخستنەوە و ڕاگواستن و بەدیل بردنیان بۆ بابل ئاواتەخوازی

هاتنی ڕزگارکەرێك بوون جوولەکە دوورخراوەکان کۆبکاتەوە و بیانباتەوە بۆ نیشتیمانی خۆیان. دواتر نازناوی مشیخ لەدوای دووەم ڕوخاندنی هەیکەل لە ئۆرشەلیم(قودس) لەساڵی ٧٠ز. بەکارهێنرا بۆ ئاماژەکردن بە کەسێك جوولەکە ڕزگاربکات لەو پەرتبوونە.
وێڕای ئەوە کارەکان هەرگیز بەو سادەییە نەمانەوە بەڵکو لەگەڵتێپەڕبوونی کات بیرۆکەی مەسیحانیەت بووە بیرۆکەیەکی ئاڵۆز. تاکە ڕەگەزی بوژێنەرەوەی بریتی بوو لە هیوای هەمیشەیی، ئەم هیوایە دوو ڕەهەندی هەبوو: ڕەهەندی ڕامیاری نەتەوەیی (کە چاوەڕوانی سەرکەوتنی جوولەکە بوو بەسەر دوژمنانیاندا و دەربازبوونیان و پەیداکردنی شکۆ و ڕێز لەسەر ئاستی جیهانی) ڕەهەندی ڕۆحی جیهانی گشتگیر (تیایدا سەرکەوتنی ڕامیاری بەراوردکرا بە پێشکەوتنی ئەخلاقی لەسەر ئاستی جیهانی).
((شمشێر و ڕم و مەنجەنیقەکانیان لەجێگای خۆیدا دادەنێن، هیچ نەتەوەیەك شمشێر بەرزناکاتەوە بەسەر نەتەوەیەکی تردا، ئیتر مەشق ناکەن لەسەر جەنگ کردن. ))اشعیا ٢/٤.
ئەم سێ تایبەتمەندیەی بیرۆکەی مەسیحانیەت بە جێگیری مایەوە: هیوا، گەڕانەوە بۆ نیشتیمان، بەرزکردنەوەی جیهان، بەڵام لە نێو ئەم چوارچێوە جێگیرەدا چەند سیناریۆیەکی جیاوازی بۆ ئەنجامدرا.
یەکێك لە ناکۆکیە گرنگەکان کە پەیوەندی هەیە بەو ڕێگایەی کە سەردەمی مەسیحانی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. هەندێك پێشبینی دەرکەوتنی مەسیحیان دەکرد-کاهینێك یان پادشایەك بێت کە جێگری ألله بێت و حوکمی خودا جێبەجێ بکات-لەلایەکی ترەوە خەڵکانێك هەبوون وابیریان دەکردەوە ألله دەستبەرداری جێگری مرۆیی دەبێت و خۆی ڕاستەوخۆ دەستپێشخەری بکات. ئەم تێڕوانینەی دووەم ناونرا بە پێشبینی مەسیحانی کە هیواخوازبوون بەهۆیەوە: (سەردەمێك بێتەپێش تیایدا سەربەخۆیی ڕامیاری و کاملبوونی ڕەوشتی و بەروەکەت و خێر و خۆشی بڕژێت بەسەر نەتەوەی ئیسرائیلدا لەسەرخاکی خۆیدا، هەروەها بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی))(٨). تێڕوانینی هەمان مانای تێڕوانینی دووەم دەدات بە دەستەوە جگەلە زیادکردنی کەسایەتی مرۆڤی ڕۆحی: کەسایەتی ڕۆحی شکۆدار بۆ کەسی ڕامیاری کە دێت بۆ ئامادەکردنی جیهان بۆ مەملەکەتی ألله.
شڵەژانێکی تر هەیە ئەمە پێچەوانە دەکاتەوە لەنێو یەهودییەتدا بەشێوەیەکی گشتی. مەسیحانیەت هەوڵدەدات بۆ گەڕاندنەوەی هەلومەرجی ڕابردوو بە تایبەت مەملەکەتی داودیەت بەڵام بەشێوەیەکی نمونەیی. لێرەدا هیواکان گەڕانە دواوە بەشێوەی دوبارە بنیاتنانەوەی حاڵەتی سەرەکی شتەکان و ژیان بەو شێوەی باوباپیران تیایدا ژیاون. بەڵام مەسیحانیەت پاڵنەری یەهودی بۆ بەرەوپێش چوونی لەخۆگرت، لەبەرئەوە مەسیحیەت بەشێوەیەك وێنای شتەکانی دەکرد کە پێشتر نەبوون.
دواجار مەسیحانیەکان ناکۆك بوون لەبارەی سیستمێکی نوێوە: ئایا بەردەوام دەبێت لەسەر مێژووی پێشوو یان جیهان دەهەژێنێت و سەر لە نوێ بنیاتی دەنێتەوە، دواجار دەیگۆڕێت بۆ جۆرێکی تەواو جیاواز لە سەروو سروشتەوە؟. کاتێك هێزی جوولەکە لەبەردەم ئەوروپادا، هیوای گەڕاندنەوەی ئیسرائیل لە ڕووی ڕامیاریەوە بووە شتێکی ئەستەم، پێشبینیەکان هیوای بەرەوپێشچونی ڕامیاری خنکاند. بەوجۆرە پێشبینی کردن جێگای هیواکانی سەرکەوتنی سەربازی گرتەوە. سەردەمی مەسیحانی دێتەناو شانۆی ژیانەوە لە هەرساتێکدا بێت بەشێوەیەکی خۆڕسك و کتوپڕ. شاخەکان دەڕمێن و دەریاکان دێنەکوڵ و یاساکنی سروشت تێکدەچن و جێگای پێدەدرێت لە سیستمی یەزدانیدا کە ئەستەم بوو وێنابکرێت، بەڵام ((ئازارەکانی لەدایکبوونی سەردەمی مەسیحانی)) ئاشتی بەدوادا دێت. دواتر تەنانەت ئەم پێشبینی

**مەسیحانیەتە چەند ڕەگەزێکی تیایە وەك هاوسەنگکردنی مەترسی و تۆقاندن، پرسە و سەرەخۆشی و ڕزگاربوون و دەربازبوون.**

**لە هەریەك لەو سێ سیناریۆیەدا بۆ هیوای مەسیحانی جێگرەوەکان تێکەڵ کرا بوون بەشێوەیەکی ئاڵۆز، وێڕای ئەوەی ناکۆك بوون لە سروشتیاندا. بیرۆکەی مەسیحانیەت چالاکی خۆی پاراست بە دەستپێکردن لەو شڵەژانانەی ڕەگەزە دژبەیەکەکان دروستیانکرد، نازانین لە چ جێگایەکدا حاڵەتێکی پوخت لە بیرۆکەی مەسیحانیەت بدۆزینەوە لەنێو دەقەکانی تری بیرۆکەی مەسیحانیەتدا. ئاڕاستەکەی ڕوداوە مێژوویەکان دیاریان دەکرد لەگەڵ کەسایەتی ناوبراو بە مسیحی چاوەڕوانکراو، بەجۆرێك ژمارەیەك مەسیحی چاوەڕوانکراوی تر هەبوون کە ساختەبوون و ئەو نازناوەیان لەخۆیان نابوو، لە زۆر حاڵەتدا توانیان ژمارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتوو بۆ خۆیان کۆبکەنەوە. لەو ماوانەی کە ئیسرائیلیەکان ژیانێکی ڕامیاری سەربەخۆیان هەبوو لەسەر زەویەکی تایبەت بە خۆیان، جەختکردنەوە هەبوو لەسەر کامڵبوونی ئەخلاقی و بەخشینی دونیایی لەکاتێکدا لە سەردەمەکانی ملکەچکردن و ڕاگواستن و نەفیکردندا، سۆزێك هەبوو بۆ سەربەخۆیی سیاسی. لە سەردەمی سەربەخۆیی نیشتیمانیدا هیوا جیهانیەکان سەرەکی بوون بەڵام لەسەردەمی شڵەژان و کێشەکان و دڵتەنگی دا ڕەگەزی نیشتیمانی و نەتەوەیی زیاتر پەرەیدەسەند و بەهێزتر دەبوو. بەهەرحاڵ ڕەگەزی ڕامیاری بەدرێژایی مێژوو شانبەشانی ڕەگەزی ئەخلاقی ڕۆیشتوە، ڕەگەزی نەتەوەیی شانبەشانی ڕەگەزی جیهانی دەڕوات. تامەزرۆییە ڕۆحیەکان یەکیانگرت لەگەڵ ئامانجە ڕامیاریەکاندا هەروەها هیواکانیان یەکیگرت لەگەڵ هیواکانی جیهاندا بەشێوەیەکی بەرفراوانتر. هەردو بابەتەکە بزوتنەوەی زایۆنیست جووگەر گرتیەخۆی کە بریتیەلە بزوتنەوەیەکی ڕامیاری هاوچەرخ کە هەوڵیداوە بۆ تازەکردنەوەی ڕامیاری و ڕۆحی نەتەوەی جوولەکە[31] کە یارمەتی جوولەکەکانی دا بۆ گەڕانەوە بۆ فەڵەستین بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسرائیل لەساڵی ١٩٤٨ ز. دا.**

**لێرەدا دەگەڕێینەوەسەر بابەتی مەسیحانی کە تاکە هیوای جوولەکەکان بوو لە تاراوگەدا. ئەم بابەتە گوازرایەوەبۆ مەسیحیەت و شێوەی ئیمانی گرتەخۆی بە هاتنەوەی دووەمی مەسیح. وەك بیرۆکەیەکی پێشکەتنی مێژوویی دەرکەوت لە ئەوروپا لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینیدا، لە سەدەی نۆزدەیەمدا شێوازی دەربڕینی مارکسیەتی گرتەخۆی لە تێڕوانینی هانتی کۆمەڵگایەکی ناچینایەتی. بەڵام ئەگەر بیخوێنینەوە لە تێڕوانینە یەهودیەکەی یان مەسیحیەکەی یان عیلمانیەکەی نائایینیەکەیدا یان تێڕوانینی گومڕاییدا، بابەتەکە لەڕستەیەکدا حەشاردراوە ((ڕۆژێکی مەزن بەڕێوەیە!)). ئەمە ئەو ڕستەیە دەیڵێتەوە بەبەردەوامی.**

**مارتن لوسەر کینگ وتەکانی وەرگرتوە لە پێغەمبەر اشعیاوە کاتێك لەجەماوەرێکدا دەدوێت کە نزیکەی دووسەد هەزار کەس بوون هاتبوونە دەرەوە لە ڕێپێوانێکی مەدەنیدا لەساڵی ١٩٦٨دا: ئەمڕۆ من خەونێکم هەیە**

**خەونێکم هەیە ڕۆژێك دێت هەموو دۆڵ و شیوێك شکۆدار دەکرێت، چیاکان نزمدەکرێنەوە، شوێنە خواروخێچەکان ڕێك دەکرێنەوە، لەوێدا سەرکەوتنی یەزدان ئاشکرا دەکرێت و هەموو خەڵکی دەیبینن.**

---

[31] لەگەڵ ڕێزمان بۆ نوسەری ئەم کتێبە ئاشکرایە لەم بابەتەدا زۆر کاریگەرە بە پڕوپاگەندەی زایۆنیستی لە ئەمەریکا، وەك دیارە شارەزان لە گۆڕینی ڕاستیەکان و هەڵگێڕانەوەیان بەشێوەیەکی زۆر خراپ لە مێشکی خەڵکی ئەوێدا. ئەم ڕاستیە ئاشکرایە لەلای هەمووان کە بزوتنەوەی زایۆنیستی بزتنەوەیەکی ماددی داگیرکاریە زۆر دوورە لەوەی کە هەوڵبدات بۆ تازەکردنەوەی ئایینی یان ڕۆحی جوولەکە بە واتایەکی ڕوونتر ئامانجە ئایینیەکانی جوولەکەی قۆستەوە بۆئەوەی لەڕێگایەوە کۆیان بکاتەوە لە سەر زەوی فەڵەستین بە بەکارهێنانی خراپترین کەرەستە و بە ترس و تۆقاندن و خوێنڕشتن بۆ وەدەرنانی نەتەوەی فەڵەستین و بێبەشکردنی لەو زەویەی لەسەری ژیاون بەدرێژایی هەزاران ساڵ، دانای جوولەکە لە جێگای ئەوان و داگیرکردنی ئەو زەویە بەو بیانووەوە ئەویش کۆکردنەوەی جوولەکەککانی جیهانە لە جێگایەکی دیاریکراودا.

# پیرۆزڕاگرتنی ژیان

هەتا ئێرە لەگەڵ بیرۆکەکاندا مامەڵەمان دەکرد بۆ ناساندنی تێڕوانینی یەهودییەت، هەروەك دەرکەوت بۆ جوولەکە لە هەوڵدانیاندا بۆ دۆزینەوەی مانایەك بۆ ژیان بەگشتی. خستنەڕووی ئەو بیرۆکانە سودی پێبەخشیوین بۆ گەیشتن بەو مەبەستە، چونکە بیرۆکەکان تایبەتمەندی جیهانیان هەیە ڕوونی دەکەنەوە بۆ کەسانی دەرەوەی ئایینی یەهودییەتن. بەڵام کاتێك دەگەین بەم خاڵە پێویستە بوەستین لە لێکدانەوەی بیرۆکەکان و دەستبکەین بە خوێندنەوەی کارە یەهودییەکان.

پێویستە دەستپێبکەین بە خوێندنەوەی مەڕاسیم و ئاهەنگ و بۆنە ئایینیەکانی یەهودییەت، چونکە بەشێوەیەکی گشتی یەهودییەت ئایینێکی ئۆرسۆبراکسیە orthopraxis(ئایینی مەڕاسیم و ڕێوڕەسمە نەتەوەییەکان)زیاتر لەوەی ئۆرسۆدۆکسیە orthodoxy(ئایینی بیروباوەڕە نەتەوەییەکان). لەڕاستیدا ئەوەی جوولەکەکان کۆدەکاتەوە بریتیەلە کارەکانیان، زیاتر لە بیروباوەڕە جیاوازەکانیان کە باوەڕیان پێیەتی. بەڵگەیەك لەسەر ئەمە جوولەکەکان هەڵنەساون بە بڵاوکردنەوەی دەقی بیروباوەڕی فەرمی کە پێویستە دانی پێدابنرێت بۆئەوەی مرۆڤ بگەڕێتەوە سەر ئەم ئایینە. ئەمە لە کاتێکدا پەیوەستبوون بە هەندێك لە لایەنە پراکتیکیەکانەوە وەکو خەتەنەکردنی نێرینەکان گرنگیەکی یەکلاکەرەوەی هەیە بۆ بوون بە جوولەکە. ئەمە جەختکردنەوەیە لەسەر ئەنجامدانی کارەکانیان کە شێوازێکی ڕۆژهەڵاتی پێدەبەخشێت، لەبەرئەوەی ڕۆژئاوا ڕاهاتوە لەسەر جەختکردنەوەی لەسەر ئاینی بیروباوەڕی بە پێچەوانەی ڕۆژهەڵاتەوە کە نزیککردنەوەی بۆ ئایین ئەنجامدەدرێت لەڕێگەی ڕێوڕەسم و چیرۆکەکانەوە.

جیاوازیەکە لەنێوان ڕوون دروست abstract، مادی(بەچاو بینراو)concrete. کامیان نزیکترە لە ڕاستیەوە ئەفڵاتون یان دوستوفسکی؟ کام ئامراز باشتر خۆشەویستی دەردەبڕێت، وشەکان یان ماچکردن؟

پێشئەوەی بچینەسەر قسەکردن لەبارەی ڕێوڕەسمەکانی یەهودییەتەوە بەشێوەیەکی تایبەت، پێویستە قسەبکەم لەبارەی بابەتی مەڕاسیم و ڕێوڕەسمەکان بەشێوەیەکی گشتی، چونکە وێڕای ئەوەی ڕێوڕەسمەکان شوێنێکی گرنگیان هەیە لە هەموو ئایینێکدا، تائێستا لەبارەیانەوە نەدواوین بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. لەتێڕوانینی ئەقڵانیەتەوە ڕێوڕەسمەکان شتێکی بێمانایە سەرقاڵبوون پێوەی تەنها کات بەفیڕۆدانە. کەواتە ئامانج چیە لە پشت خەرجکردنی ئەو هەموو پارەیە لە مۆم کڕین و کتێب و نامیلکەی دۆعا و نزاکان و بخورد، هەموو ئەو کاتەی تەرخان دەکرێت بۆ ئەنجامدانی ئەو پەرستشانە، هەموو ڕێوڕەسمە ئایینیەکانی تر، هەموو ئەو وزەیەی بەکاردێت لە هەستان و دانیشتن و کڕنوشبردندا، سوڕانەوە بەدەوری ناوچە پیرۆزەکان و وتنی سرودە ئایینیەکان؟ لەوانەیە وابیربکەینەوە کە هیچ گرنگیەکیان نیە، وێڕای ئەوەی جۆرێك لە بێسەروبەری و هەرەمەکی تێدایە بەڵام شایەنی تێگەیشتنە لەلایەن ئەوانەی لە دەرەوەی ئەم ئایینەن. گۆڤارێکی میللی وێنەی سەرۆك وڵاتێك پیشان دەدات کە لوتی دەهێنێت بە لوتی پیاوێکی ئەسکیمۆ. سەبارەت بە ئەسکیمۆ لێکخشاندنی لەتەکان دادەنرێت بە یەکێك لە ڕێوڕەسمەکانی هاوڕێیەتی بەڵام سەبارەت بە ئێمە تەنها جۆرێکە لە گاڵتەجاڕی!

بەڵام وێڕای ئەوەی هەموو ڕێوڕەسمەکان تەنها وەکو کات بەفیڕۆدان دێنەپێشچاو، بەڵام لەڕاستیدا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە ژیاندا هیچ شتێکی تر جێگاکەی پڕناکاتەوە، ئو بەشێکە لە ژیان تەنها لە ئاییندا قەتیس نەبووە، چونکە یەکەم ڕێوڕەسمەکان ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشن و دوودڵی و دڵەڕاوکێی لێ دوور دەخەنەوە. هەندێك کات دڵەڕاوکێ سووك دەبێت، وەك لە حاڵەتی یەکترناسیندا. کاتێك من خۆم دەناسێنم بە کەسێکی

نەناسراو، نازانم وەڵامدانەوەی ئەو چۆن دەبێت بۆ من، نازانم چۆن بەرەوپێش بچم؟ پێویستە چی بڵێم؟ پێویستە چی ئەنجام بدەم؟ ڕێوڕەسمە ئایینیەکان ئەم کێشانە چارەسەر دەکات. ئەو پێمڕادەگەیەنێت سەرەتا من دەست درێژ بکەم بۆ تەوقەکردن و بپرسم: ((حاڵتان چۆنە؟)) یان ((من خۆشحاڵم بە ناسینتان)). بەم کارە دەرباز دەبم لە شڵەژان. ئەو ساتەم پێدەبەخشێت کە پێویستم پێیەتی بۆ بەدەستهێنانی ڕێگای هەڵسوکەوتکردنی دروست. ئێستا ئەو قورسیە کۆتایی هات و دوبارە هاوسەنگیم بەدەستهێنایەوە، ئامادەم بۆ دۆزینەوەی هەڵسوکەوتێکی ئازادانەتر.

ئەگەر پێویستمان بە ڕێوڕەسمەکان بێت بۆ یارمەتیدانمان لە هەلومەرجی سادەی وەکو یەکترناسین و خۆناساندن بە کەسێکی نوێ، چەندە پێویستمان پێی دەبێت کاتێك خۆمان دەبینینەوە لەو حاڵەتانەی لەوپەڕی شڵەژان و دڵەڕاوکێداین. مەرگ دادەنرێت بە یەکێك لە نمونە دیارەکان. کاتێك توشی سەرسوڕمان دەبین لەبەردەم ئەو ڕوداوە دڵتەزێنەدا، ئەوا بەتەواوی شکست دێنین ئەگەر بە تەنها جێهێڵراین. ئەمە ئەو هۆکارەیە وا لە مەرگ دەکات زیاترین مەڕاسیم بێت کە گرنگی پێدەدرێت گەر بەراوردمان کرد بە مەڕاسیمە جۆراوجۆرەکانی تر. ڕێوڕەسمەکان ئامادەکراون بۆ ڕێکخستنی بۆنەیەك، هەڵدەسین بە ئاڕاستەکردنی کارەکانمان و هەستەکانمان لەکاتێکدا بەرگەی تەنهایی ناگرین، ئەم کردارە قورسایی ئەو ڕوداوەمان لەسەر کەمدەکاتەوە. ((خۆڵەمێش دەگەڕێتەوە بۆ خۆڵەمێش، خاك دەگەڕێتەوە بۆ خاك))[٣٢]، ئەم ڕستەیە ڕوونی ناکاتەوە خۆڵەمێشی کێ؟ خاکی کێ؟ چونکە ئەمە بەسەر هەمووانـدا جێبەجێ دەکرێت، هەروەك ڕێوڕەسمەکان یارمەتیدەرن بۆ خۆڕاگری: ((خودا خۆی دەبەخشێت و خۆی دەیباتەوە، با ناوی خودا شکۆدار و پیرۆز بێت!)). دواجار ڕێوڕەسمی مردن دەخرێتەنێو چوارچێوە گشتیەکەیەوە کاتێك ئەو مردنە تایبەتیە پەیوەندی هەیە بە نمونە ڕاستەقینەکەی بوون و گەردونیەوە. کەسی مردو جێی خۆی دەگلرێتەوە لەنێو کۆمەڵەکەدا بەجۆرێك سەیردەکرێت کە هەنگاوی ناوە بۆ ڕێگای ناکۆتا لە ژیانەوە بەرەو مەرگ، لە مەرگەوە بەرەو ژیان بۆ جاری دووەم، لەم بەردەوامبوونەدا هەردوو ڕێگاکە بەرەو نەمری دەڕۆن. ڕیوڕەسمەکان قورسی و ناڕەڕەتی کۆسپی مەرگ کەمدەکەنەوە. جگەلەوە سودێکی ترمان پێدەبەخشێت چونکە هەرئەوە لە کاتە خۆشەکاندا ئەزمونەکەمان بەهێزتر دەکات و بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەوپایەی ئاهەنگ. وەکو بۆنەکانی لەدایکبوون و ژنهێنان، بەڵکو لەوە سادەتر بۆنەی کۆبوونەوەی خێزانی. لەو کاتانەی خێزان پشودەدات بۆیەکەمجار کە هەموو تاکەکان کۆدەبنەوە پێکەوە لەسەر خوان نان دەخۆن، ئەو کاتە نزای داواکردنی پیت و بەرەکەت کاریگەرتر دەبێت.

لەڕێگەی ئەو تێبینیانەوە سەبارەت بە ڕێوڕەسمەکان لە ژیاندا بەشێوەیەکی گشتی، ئێستا دەگەڕێینەوە سەر گرنگی ڕێوڕەسمەکان لە یەهودییەتدا، بەجۆرێك ڕێوڕەسمەکانی ئامانجی پیرۆزڕاگرتنی ژیانە بە واتای بەخشینی پیرۆزی بە ژیان، لە حاڵەتێکی نمونەییدا ئامانجی پیرۆزکردنی ژیانە بە گشتی. لە بەشی نۆزدەیەمی سفر اللاويين لە تەوراتدا ئەم خاڵە ڕوون دەکاتەوە کاتێك الله بە موسا دەڵێت: ((پیرۆزبن چونکە من پیرۆزم!))(اللاويين: ١٩/٤٤).

پیرۆزی بە واتای چی دێت و چی دەگرێتەخۆی؟ سەبارەت بە زۆرەبەی هاوچەرخەکان ئەم وشەیە بە وشەیەکی بێمانا دادەنرێت. بەڵام سەبارەت بەوانەی هەستدەکەن بە چالاکی بەڵگە یەزدانیەکان لە ژیانیاندا، دەتوانن هەست بکەن بەو فشارەی کاردەکاتە سەر ژیانیان لە هەموو لایەکەوەدواتر دەرکدەکەن بەو مانایەی

[٣٢] ڕستەیەکە قەشەی مەسیحی دەیڵێت کاتێك مەڕاسیمی بە خاکسپاردنی مردوویەك ئەنجام دەدرێت لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

که ئەفلاتون دەریدەبڕی کاتێك وتی: ((سەرەتا: لەرزت لێدێت، دواتر ترس و بیمێکی دێرین داتدەگرێت)). ئەوانەی ئەم ئەزمونانەیان تێپەڕاندەوە تێدەگەن لە نهێنی ئەو ملکەچیە کە رودولف ئوتو باسی دەکات لە کتێبی بیرۆکەی پیرۆز.
قسەکردن لەبارەی پیرۆزڕاگرتنی ژیان لە یەهودییەتدا واتە گەڕانەوە بۆ ئەو باوەڕەی کە هەموو ژیان تەنانەت بچوکترین بەشی ئەگەر بەشێوەیەکی دروست مامەڵەی لەگەڵدا کرا دەشێت سەیربکرێت وەك ڕەنگدانەوەی سەرچاوەی ناکۆتا بۆ پیرۆزی ئەویش ألله‌یە. ناوی ئەم تێڕوانینە یان مامەڵەکردنی دروست لەگەڵ ژیان بریتیەلە لەخواترسانی ڕاستەقینە، پێویستە ئەمە جیابکرێتەوە لە لەخواترسانی ڕووکەش و درۆینە ((وا نیشان بدەین کە لە خوا دەترسین لە هەمان کاتدا ڕاستگۆ نەبین لەو هەستەدا)).
لە یەهودییەتدا لەخواترسان ڕێگاخۆشکەرە بۆ هاتنی مەملەکەتی ألله بۆ سەر زەوی: واتە ئەو کاتەی هەموو شتێك پیرۆز و پاك دەبێتەوە، پیرۆزی هەموو بەندەیەکی خودا ڕوون و ئاشکرا دەبێت. نهێنی لە خواترسان دروست دەبێت لە بینینی هەموو جیهان وەك موڵکی ألله. مرۆڤێك کاتێك لە خەو هەڵدەسێت و ڕوناکی ڕۆژێکی نوێ دەبینێت سوپاسگوزاربێت و جوانی سروشت و دروستکراوانی خودا ببینێت و شکۆداری و مەزنی خودای لەلا ڕوونتر ببێتەوە. أبراهام هیشیل دەڵێت: ((سەبارەت بە مرۆڤی دیندار هەمووم شتەکان بەجۆرێك دێنەپێش چاوی کەلە پشتیەوەن، ڕوویان کردوەتە ألله)). دەستەواژەی خۆشیەکانی ژیان کە زۆربەیان دێتەلامان بەشێوەیەکی جودا لە هەوڵە تایبەتیەکانمان، هەروەها ئەمانە کۆمەڵە شتێکی سادە و سروشتین بەڵام نەبەستنەوەیان بە ألله هەڵەیەکی ئاشکرا و گەورەیە. لە تەلموددا باسکراوە ئەو کەسەی دەخوات و دەخواتەوە بەبێ ئەوەی سوپاسگوزاربێت و دۆعا نەکات بۆ ئەوەی بەرەکەت بکەوێتە ماڵ و سامانیەوە هەروەك ئەو کەسە وایە کە دزی لە موڵکی ألله بکات ! ئەم بابەتە لە یەهودییەتدا بەشێوەیەکی دوو ڕەهەند دەبینین: پێویستە چێژ وەربگرین لە خۆشیەکانی ژیان لە هەمان کاتدا پێویستە لەسەرمان شادومانیمان زیاتر بکەین لەڕێگەی سوپاسگوزاریەوە بۆ ألله بەرامبەر بەو بەخشینانە، هەروەها مرۆڤ شادومانیەکەی زیاتر دەکات کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانی ئەو خۆشیانە بەسەر دەبات.
یاسای یەهودییەت هەموو خۆشیەکانی ژیان بەپیرۆز دادەنێت: خواردن، ژن هێنان، منداڵەکان، سروشت، ئەو خەڵکی فێردەکات کە بخۆن و بخۆنەوە بەڵام سوپاسگوزاربن، فێریان دەکات شادومان بن لە دەوری تەورات سەما بکەن. یەهودییەت بەپێچەوانەی ئەوانەی ڕابردوو وەلا دەنێن و گرنگی پێنادەن لە هەموو ئایینەکانی تر زیاتر گرنگی بە مێژوو دەدات. پیرۆزی و مێژوو جوداکردنەوەیان نیە لە یەهودییەتدا.
تەنانەت کاتێك جوولەکە یادی کارەساتەکان دەکەنەوە کە بەسەریاندا هاتوە بەئاگان و دەزانن هەمیشە ألله لەگەڵیاندا بووە و هاوکاری کردون. یەکێك لە فەیلەسوفەکانی جوولەکە نوسیویەتی: ((ژیانی مرۆڤ بەپێی شەریعەتی ألله بریتیەلەوەی کە بژی لە ژیانی هەمیشەییدا))(٩).
بۆئەوەی پیرۆزی ببەخشین بە هەموو ژیان پێویستە پەیڕەوی شەریعەتی ألله بکەین: واتە تەورات. کاتێك کڵێسا یەهودییەکان یادی گەڕانەوە بۆ تەورات بکەن ئەم دێڕە دەخوێننەوە لە سفر الأمثال: ((درەختی ژیان موڵکی ئەو کەسەیە کە خۆی پێوەی جێگیر دەکات، خۆشبەختن ئەو کەسانەی خۆیان پێوەی جێگیر دەکەن))(الأمثال: ١٨/٣). مانایەکی گرنگ هەیە لەم وێکچواندنەدا چونکە درەخت ئاماژەیە بۆ خودی ژیان، واتە بۆ ئەو بەڵگەی ئەو موعجیزەیەی کە لەڕێگەیەوە توخمە دامرکاوەکانی خۆر و باران و خاك وەرگیراون دواتر گۆڕدراون بۆ نهێنی گەشەی ژیان، تەورات بەمجۆرەیە بۆ جوولەکە، بەوەی توانایەکی دروستکەرە کە

دەشێت پیرۆزی وەربگرێت و بیڕژێتەناو ژیانی ئەو کەسانەی بەبێ تەورات وەك بەردی وشك و ڕەق بوو، دواتر گۆڕی بۆ ژیانێکی پڕ لە شادومانی: ((ئەمە درەختی ژیانە بۆ ئەو کەسانەی خۆیانی پێوە جێگیر دەکەن)).

## سرووش

چـاودرێری جوولەکـەمان کـرد لـە شـیکردنەوەیان بـۆ ناوچـە سـەرەکیەکانی ئـەزمونی مرۆیـی، بینیمـان گەیشتبوون بە دەرکپێکردن بە تەواوی ماناکان کە دەیبینین لەلای دراوسێکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەڕاسـتیدا تێگەیشـتنیان بـۆ شـتەکان لەسـەروو دەرکپێکردنـی ئـەوانی تـرەوە بـوو. ئەمـە پرسـیارێك ئەوروژێنێت: چی ئەم دەسکەوتەی بەدەستهێنا؟ ئایا ئەمە بە ڕێکەوت ڕوویدا؟ ئایا جوولەکە بەڕێکەوت کەوت و خۆی لەناو گەنجینەی هێزی تێگەیشتندا دۆزیەوە؟ ئەگەر ئەوان گەیشتبن بەو قووڵیە لە ناوچەکانی ژیاندا، لەوانەیە ئەو ئەگەرە دروست بێت بەڵام کاتێك بەرزبوونەوە بۆ ئەو ئاستە لە لێهاتوویی و بلیمەتی سەبارەت بە هەموو کێشەیەك لە کێشەکانی ژیان ئەو ئەگەرە نادروستە. ئایا جێگرەوەی ئەوە بریتیەلەوەی جولەکە هەر بە شێوەیەکی خۆڕسك زیرەکتر بوون لە نەتەوەکانی تر؟ بیروباوەڕی یەهودییەت لە مرۆڤایەتیدا تاکە خێزانێك پێکدەهێنێت، کە ڕاگەیەنراوە لە چیرۆکی ئادەم و حەوائدا بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەو ئەگەرە ڕەت دەکاتەوە کە هەرلە سەرەتاوە ئەمانە نەتەوەیەکی ژیرتر و زیرەکتر بوون لە نەتەوەکانی تر. بەڵام وەڵامدانەوەی خودی جوولەکە بۆ ئەو پرسیارە بەم جۆرەیە: ئەوان گەیشتون بەو ڕادەیە لە زیرەکی لەڕێگەی سرووشی یەزدانیەوە. وشەی (الوحی) revelation واتە پەردە لابردن لەسەر شتێك و درکاندنی نهێنیەکەی. کاتێك یەکێکیان دەڵێت:: ((پێم ڕاگەیەنراوە یاخود سرووشم بۆ هاتوە)) ئەمە بەو واتایە دێت شتێك شاردراوە بووە ئێستا ڕوون و ئاشکرایە. سرووش وەك چەمکی ئایینزانی چڕدەبێتەوە لەسەر ئاشکراکردنی شێوازێکی دیاریکراو لە ڕاستی کە بریتیەلە ئاشکراکردنی سروشتی ألله و تواناکەی بۆ مرۆڤایەتی.

کاتێك دەرئەنجامەکان تۆمارکران لە کتێبێکدا، مەیلێك هەبوو بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ سرووشدا وەك دیاردەیەکی سەرزارەکی، واتا سەیری بکەین وەك ئەوەی ألله فەرمویەتی، بۆ پێغەمبەران یان کتێبی تەورات بەڵام ئەمە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە. چونکە خوداوەندی جوولەکە خۆی نیشاندا لەڕێگەی کردەوەکانیەوە، ئەم شێوازە دەرکەوت بە ڕوونی لە فێرکردنی موسا بۆ گەلەکەی: ((ئەگەر نەوەکانتان لە داهاتوودا پرسیاریان لێکردن: مەرجەکان و یاسا و ئەرکەکان کامانەن کە خودا فەرمانی پێداوین جێبەجێیان بکەین؟ لە وەڵامدا پێیان بڵێن: ئێمە کۆیلەی فیرعەون بووین لە میسر، خودا ڕزگاری کردین لە دەستی ئەو زاڵمە بە هێز و توانای خۆی. . )) (سفر التثنية: ٦/٢١-٢٢).

ڕووداوی هاتنەدەرەوە کە ألله جوولەکەکانی ڕزگارکرد لە دەستی فیرعەون و داروەدستەکەی ڕووداوێك بوو یەهوە بە کردار خۆی ئاشکراکرد بۆ نەتەوەی ئیسرائیل.

دروستە سفر التكوين باس لە ژمارەیەك سرووش دەکات کە دابەزێنراون لە پێش ڕووداوی هاتنەدەرەوەی بەکۆمەڵ لە میسر، بەڵام گێڕانەوەی ئەو سرووشە نوسراوەتەوە لە کاتێکی تردا لەژێر ڕۆشنایی ڕووداوی هاتنەدەرەوەی بە کۆمەڵدا. جوولەکە گومانیان لەوە نەبوو ألله لایەنێکی ڕاستەوخۆیە لە ڕاکردنی نەوەکانی ئیسرائیل لە فیرعەون. کارل مایر نوسیویەتی: (( بەپێی هەموو یاسا کۆمەڵایەتیە ناسراوەکان، پێویست بوو جوولەکە لەناوبچن هەر لە دێرزەمانەوە)). بەڵکو لەوانەیە کتێبی تەورات بۆ دوورتر لەوە ڕۆیشتبێت بە جەختکردنەوەی لەسەرئەوەی بەپێی هەموو یاسا کۆمەڵایەتیە ناسراوەکان نەدەکرا جوولەکە ببنە نەتەوەیەکی تایبەت و دیار لە بنەڕەتدا. بەڵام ئەو یاسایانە ڕاستیەکی ئاشکرا بوون. ،

کۆمەڵەیەکی زۆر بچوک توانی بچێتە نێو مێژووەوە لە فراوانترین دەرگاکانیەوە کەلەژێر زوڵم و زۆرداری فیرعەوندا دەیناڵاند، توانی مێژووی خۆی دروست بکات. کاتێك جوولەکە خاڵە لاوازەکانی خۆیان بۆ دەرکەوت بەراوردیان کرد بە مەزنی هێزی فەرمانڕەوا لە میسردا، بۆیان دەرکەوت ئەستەوە بتوانن بە هەوڵدانی خۆیان بە تەنها سەربکەون و ڕزگاریان بێت. ئەمە موعجیزە بوو: ((خودا لەو ڕۆژەدا نەتەوەی ئیسرائیلی ڕزگارکرد لە دەستی میسریەکان، دواتلر جوولەکەکان میسریەکانیان بینی بە مردووی لەسەر کەناری دەریا. هەروەها ئەو سزایەیان بینی کە خودا سەپاندی بەسەر میسریەکاندا. )) (سفر الخروج ١٤/٣٠-٣١). ((لەیادت بێت تۆ کۆیلە بوویت لەسەر زەوی میسر یەزدان تۆی ڕزگار کرد. . هەروەها یەزدان فیرعەون و داروەستەکەی کرد بە پەند لەپێش چاوتان))(سفر التثنیة ١٥/٥، ٢٢/٦)

کاتێك جوولەکەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا دەرکیان کرد بە ڕزگارکردنیان لەلایەن یەزدانەوە لە ڕووداوی هاتنەدەرەوەی بە کۆمەڵدا، دواتر دەستیان کرد بە پێداچونەوە بۆ مێژووی دێرینیان لەژێر ڕۆشنایی یارمەتیدانی یەزدانیەوە. کاتێك ئازادکردنیان بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا نەخشەی بۆ کێشرا لەلایەن ألله، ئەی چی دەوترێت دەربارەی زنجیرە ڕووداوێك کە تەنها بەشێوەی ڕێکەوت و بەخت بوو؟ جوولەکە دەستپێشخەری ألله بینیوە لە هە مو هەنگاوێکدا کە پێکەوە بوون. ئەمە تەنها هەڵچونێکی خۆڕسك نەبوو کە هانی ئیبراهیمی دا وڵاتی خۆی ئور جێبهێڵێت ڕێگای دوور بگرێت بەر کە دواجار گەیاندی بە کەنعان. یەهوە بانگهێشتی کرد بۆ ئەو شوێنە هاەتا ببێتە باوك بۆ نەتەوەیەك کە خاوەنی قەدەر و چارەنوسێکی مەزنن. بەوهۆیەوە ئەو هەموو ڕووداوە ڕوویدا لە مێژووی ئەو نەتەوەیەدا. ئیسحاق و یەعقوب پارێزران بە چاودێری یەزدان هەروەها یوسف پلەوپایەیەکی مەزنی پێبەخشرا لە میسر، بۆ خستنەڕووی ئامانجی پاراستنی نەتەوەی ألله لە قات و قڕی و برسیەتی. بەپێی ئەو تێڕوانینەی پخرایە ڕوو لە ڕووداوی چوونەدەرەوەی بە کۆمەڵدا، هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا بوو. هەر لە سەرەتاوە ألله سەرپەرشتی نەتەوەکەی دەکرد دەیپاراست و ئامادەی دەکرد بۆ ڕووداوی چوونەدەرەوەی بەکۆمەڵ، کە گەلی ئیسرائیلی پێکهێنا.

کەواتە دەڵێین ڕووداوی هاتنەدەرەوەی بەکۆمەڵ زیاتر بوو لە ڕێڕەوێکی مێژوویی سەبارەت بە نەتەوەیەك گۆڕا بۆ گەلێك. ئەوە ڕووداوێك بوو ئەو نەتەوەیە وای لێهات دەرك بكات بە ڕاستی ألله و تایبەتمەندیەکانی. بەڵام وێنەکە بەمشێوەیە دانرا بەوەی جوولەکە دەرکیان کرد بە تایبەتمەندیەکانی ألله، ئەمە بابەتێکە بەشێوەیەکی هەڵگەڕاوەیە. بەوەی ألله سروشتی خۆی نیشانی جوولەکە دا، سروشتی ألله دەرکەوت لە موعجیزەی هاتنەدەرەوەی بەکۆمەڵدا؟ یەکەم: یەهوە بەهێز بوو، ڕاستەوخۆ یارمەتی جوولەکەکانی دەدا، لە بەرامبەردا پێزانین و ڕازیبوونی جوولەکەکان دەرکەوتوە لە سرووده ئایینیەکانیاندا: ((خۆشبەختن ئێوە ئەی نەوەکانی ئیسرائیل، چ نەتەوەیەك وەك ئێوە ألله سەریخستوە؟ ألله زاڵی کردوون بەسەر دوژمنانتاندا. )) سفر التثنیة: ٢٩/٣٣. ئایا جوولەکەکان هیچ کارێکیان ئەنجامدابوو هەتا شایستەی ئەو ڕزگارکردنە بن؟ بەپێی کارکردنیان هیچیان ئەنجام نەدابوو هەتا شایستەی هەموو ئە وشتانە بن. سەربەخۆیی وەك بەخشینێك پێیان درا کە شایستەی نەبوون. ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرا بوو لەسەر خۆشەویستی یەهوە بۆ جوولەکەکان. چەند ساتێکێکی کەم پێش ئەوەی جوولەکە هەست بکات بەو خۆشەویستیە کە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بوو نەك تەنها بۆ ئەوان. کاتێك دەرکپێکردنیان بۆ خۆشەویستی ألله ڕەگوڕیشەی داکوتی، بەپەلە گەیشتن بە تێڕوانینی ئەو خۆشەویستیە کە ئاڕاستەکرابوو بەرەو ڕووی هەموو مرۆڤێك. بەڵام

ڕاستی خۆشەویستی ألله پێویست بوو دەرکی پێبکرێت کە هەموو جیهان دەگرێتەوە، ڕوداوی چوونەدەرەوەی بە کۆمەڵ ئەو خۆشەویستیەی یەزدانی بۆ ئاشکرا کردن.
وێڕای ئاشکراکردنی هێزی خۆشەویستی ألله، ڕووداوی چوونەدەرەوەی بە کۆمەڵ ئاشکرای کرد ألله زۆر گرنگی دەدا بە کاروباری مرۆڤەکان بەگشتی. لەکاتێکدا خوداوەندی نەتەوەکانی دراوسێ بەشێوەیەکی سەرەکی خوداوەندی سروشت بەرجەستەکردنی هەستەکانی ترس و تۆقاندن بوو کە ئەو نەتەوانە هەیان بوو بە ئاڕاستەی دیاردەکانی سروشت، لە هەمان کاتدا خوداوەندی ئیسرائیل لەڕێگەی گەردەلوال یان خۆرەوە نەهاتە لایان بەڵکو لەڕێگەی ڕووداوێکی مێژوویییەوە. ناکۆکی لە مانای ئایینی ئەم ڕووداوەدا یەکلاکەرەوە بوو. ئەو ألله ڕووداوی هاتنەدەرەوەی ڕێکخست گرنگی دەدات بە کارول\باری مرۆڤەکان بەڕادەیەکی زۆر وای لێدەکات پێشبکەوێت و هەڵسێت بە کارێك بۆ ڕزگارکردنیان لەو هەلومەرجە ناهەمووارە. ئەم دەرکپێکردنە بیروباوەڕی ئایینی ئیسرائیلیەکانی گۆڕی بۆ هەمیشە. چی دی جوولەکەکان بەشداریان نەدەکرد لە پەرستنی هێزەکانی سروشت. وایان لێهات هەست بکەن بە ئیرادە و توانای یەهوە و گوێگرتن لێی و هەوڵدان بۆی جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکانی. لەدوای ڕوداوی چوونەدەرەوەی بەکۆمەڵ لە میسر و ئاشکرابوونی توانای ألله بۆ جوولەکە، چاکی و گرنگیپێدانی بە چارەنوس و مێژووی مرۆڤ، چەند دەرکپێکردنێکی تر دەرکەوت لەلای جوولەکە سەبارەت بە سروشتی ألله و تایبەتمەندیەکانی. دەستپێکردن بە چاکەخوازی ألله بەپێی ئەوەی دەیەوێت خەڵکی بە هەمان شێوە باش بن لەگەڵ یەکتردا. لێرەوە قسەکردنی ألله دەست پێدەکات لەسەر شاخی سینا و لەگەڵ پێغەمبەر موسا کە دە ڕاسپاردەکەی بۆ دابەزاند لەبەر دەرئەنجامێکی سروشتی و پێویست بۆ ڕوداوی چوونەدەرەوە.
داواکاری پێغەمبەران بۆ دادپەروەری کۆمەڵایەتی فراوانکردنی داواکاری ألله بوو بۆ نەتەوەکەی لە پابەندبوون و دادپەروەری جێبەجێکردن لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی، چونکە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگە بەرپرسن نەك تەنها هەر تاکەکانی کۆمەڵگە. دواجار پێویستە ئازار و ئەشکەنجە هەڵگری مانایەك بن چونکە دروست نیە وابیربکەینەوە ألله نەتەوەکەی خۆی ڕزگارکرد بەشێوەی موعجیزە، دواتر دەستبەرداریان ببێت و وازیان لێبهێنێت بەتەواوی.
وێنەکە تەواو ڕوون بوویەوە لەپێش چاوی جوولەکە لە بیروباوەڕی المیثاق کە بە مانای بۆند و ڕێکەوتنێك دێت کە دەبەسترێت لەنێوان دوو کەسدا بەڵام تەنها لەمەدا کورتناکرێتەوە بەڵکو چەندین شتی تر دەگرێتەخۆی. چونکە لەکاتێکدا ڕێککەوتنێك پەیوەندی هەیە بەماڵێکەوە بۆ نمونە یان بە هبشێك لە ژیانی ئەو کەسانەی چوونەتە ناوی وە چەند لایەنێکی تر دەگرێتەوە وەکو ڕێککەوتنی ژنهێنان لەسەر پابەندبوون بە دەروون و ژیانەوە کە دوو کۆمەڵە پێکەوە دەبەستێتەوە، ئەم ڕێکەوتنە زۆرجار ماوەکەی دیاریکراو دەبێت و دوابەدوای ئەوەی هیچ گرنگیەکی نامێنێت، لەکاتێکدا میثاق بەردەوام دەبێت بە درێژایی ژیان هەتا مردن. سەبارەت بە جوولەکە خۆئاشکراکردنی ألله لەمیانەی ڕووداوی چوونەدەرەوەی بەکۆمەڵ بانگهێشتێك بوو بۆ میثاق.
دەکرا یەهوە بەردەوام بێت لە پیرۆزکردنی ئیسرائیلیەکان ئەگەر هەستان بە ڕێزگرتنی ڕاسپاردەکان و شوێنکەوتنی ئەو یاسایانەی کە پێیان درابوو:
((٤ ئێوە بە چاوی خۆتان بینیتان چی بەسەر میسریەکاندا هات، من هەڵمگرتن لەسەر باڵی داڵەکان و هێنامنن بۆ لای خۆم. ٥ ئێستا ئەگەر گوێتان لەدەنگم گرت و پەیمانی منتان پاراست ئەوا تایبەت دەبن لە

نێو هەموو نەتەوەکانی جیهاندا. چونکە هەموو زەوی موڵکی منە. ٦ ئێوە دەبنە نەتەوەیەکی پیرۆز بۆ من.
))(سفر الخروج ١٩/ ٤-٦).
کاتێك پەیوەندی نێوان ألله و نەوەکانی ئیسرائیل میثاق پێکهێنرا لە سیناء بەشێوەیەکی کامڵ. ئەوانەی تەوراتیان نوسیبوویەوە وایان لێهات ژیاننامەی ئیبراهیم پێغەمبەر خوا لێی ڕازیبێت دەبینیەوە لەسەر ڕۆشنایی میثاق. لە دوا ڕۆژەکانی دەوڵەتی سۆمەری جیهانیدا ألله ئیبراهیمی هەڵبژارد لەنێو هەموو نەتەوەکانی نێوان دوو ڕووبارەکە و میثاقی لەگەڵدا بەست. ئەو میثاقەی کە بریتی بوو لەوەی ئەگەر ئیبراهیم وەفادار بوو بەرامبەر بە ألله لە بەرامبەردا ألله نەك هەر زەویەکی بە پیتی دەداتێ بەڵکو نەوەکانی زۆر دەکات هەتا ژمارەیان ببێتە هێندەی دەڵکۆڵە لمەکانی ناو دەریا.
ئەم بەشەمان -بەشی یەهودییەت-دەست پێکرد بە قسەکردن لەسەر حەزی گەڕانی جوولەکە بەدوای واتاکانداز بەڵام کاتێك قووڵ بووینەوە لەسەر باسکردنی وردەکاریەکانی ئەم ئایینە گەیشتین بە ئاستێك بینیمان پێویستە سەرلەنوێ کلیلەکە لە قاڵب بدەینەوە، چونکە دەرکەوت گەیشتنی جوولەکە بە زانینی واتای هەموو شتەکان تەنها بەهۆی ژیریانەوە نەبوو بەڵکو سەرئەنجامی ئەوە بوو کە ألله ئەو مانایانەی بۆ ئاشکرا کردبوون لەڕێگەی سرووشەوە، لە ڕێگە قسەکردنەوە نا بەڵکو لەڕێگەی کارە سەرسامکەرەکانی یەهوە، کە دەست پێدەکات بە ڕووداوی هاتنەدەرەوەی بەکۆمەڵ لە میسر کە هێز و باشی و بەزەیی گرنگیپێدانی خۆی دەرخست بۆ خەڵك، لێرەوە زانیمان ئەوانی تر چۆن هاتن بەدوایدا.
بەڵام بۆچی بە تایبەت ئەم کارەی کرد لەگەڵ جوولەکەدا؟ وەڵامیان ئەمە بوو: ألله ئەوانی هەڵبژاردوە لەنێو تەوای نەتوەوەکانی تری جیهاندا. ئەمە هێندە سادە دێتە پێش چاو کەپێویستی بە تێڕامانی زیاتر هەیە.

## نەتەوەی هەڵبژێردراو"الشعب المختار"

چوارینەیەکی ناسراو هەیە دەڵێت:

چەندە سەیرە

لە أللە

کە جوولەکە

هەڵبژێرێت!.

گومانی تێدانیە بیرۆکەی ئەوەی خودای جیهانیان بڕیاربدات سروشتی پیرۆزی خۆی ئاشکرا بکات بەشێوەیەکی نمونەیی بۆ تاکە نەتەوەیەك، ئەمە دادەنرێت بەیەکێك لە قورسترین چەمکەکان کە دەشێت گرنگیان پێبدرێت لە خوێندنەوەی ئاییندا بەگشتی. ئەمە بیرۆکەیەکی ناڕێکە، تەنها لەبەرئەوە نیە کە بنەمایبێ لایەنی و دادپەروەری دەشکێنێت، بەڵکو لەبەرئەوەی زۆربەی نەتەوە دێرینەکان خۆیان بە خاوەن تایبەتمەندی داناوە، بۆ نمونە دەکرێت سەیری ژاپۆنیەکان بکەین کە ئەفسانەی دروست بوون دەڵێت ئەوان باوەڕیان پێیەتی: ئەمانە گەلێکن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە خوداوەندی خۆرەوە أماتیراسو هاتون واتە نەوەی خوداوەندی خۆرن!. کاتێك موسا بە جوولەکەی ڕاگەیاند: ((لەبەرئەوەی ئێوە نەتەوەیەکی پیرۆزن بۆ خوداوەندەکەتانت. خودا ئێوەی هەڵبژاردوە لەنێو هەموو گەلانی سەر ڕووی زەویدا)). (سفر التثنية: ٦/٧)، ئایا هۆکارێك هەیە بۆ بیرکردنەوە لەوەی ئێمە لەبەردەم شتێکداین زیاترە لە شۆڤێنیەتی ئایینی؟؟.

دروستە بیروباوەڕی جوولەکە سەبارەت بە هەڵبژاردنی یەزدانی بەشێوازێکی کلاسیکی دەستپێکرد، بەڵام بەشێوازێکی خێرا ئاڕاستەیەکی مەترسیداری گرتەبەر، چونکە بەپێچەوانەی هەموو نەتەوەکانەوە جوولەکەکان خۆیان نەبینیەوە لەوەدا کە جیاکراونەتەوە لەوانی تر بۆ پێدانی تایبەتمەندی، بەڵکو هەڵبژێردران بۆ مەبەستی خزمەتکردن، بۆئەوەی سەرقاڵی تێڕامان بن و ئازار بچێژن بەهۆی ئەو کێشانەی بەسەریاندا هات. کاتێك داوایان لێکرا: ((گوێڕایەڵی تەواوی وتەکانی خودا بن)) ئەوکات هەڵبژاردنەکەیان بەسەردا سەپێنرا بەشێوەیەکی قورستر لە نەتەوەکانی تر. حاخامەکانی جوولەکە بیردۆزێکیان هەیە دەڵێت: أللە تەوراتی بەخشی هەر لە سەرەتای جیهانەوە بەگشتی، بەڵام جوولەکە تاکە نەتەوە بوون ڕازی بوون ڕاسپاردە قورسەکان هەڵبگرن. بەمشێوەیە پیشانمان دەدەن کە أللە تەوراتی پێبەخشین وێڕای ئەوەی ئەوان قوبووڵیان کردبوو بێئەوەی دەرك بکەن بەوەی چ کارێکی قورسیان هەڵبژاردوە کە ئەنجامی بدەن! ((تەنها ئێوەم هەڵبژارد لەنێو تەواوی نەتەوەکانی جیهاندا بەوهۆیەوە سزاتان دەدەم لەسەر تەواوی تاوانەکانتان)) (سفر عاموس ٢/٣). ئەمە تەواوی کێشەکە نەبوو بەڵکو وەك بینیمان بیروباوەڕی سفر اشعیای دووەم سەبارەت بە ئازارچەشتن ئەوەی گەیاند کە جوولەکە هەڵبژێردراون بۆئەوەی ئازارەکان هەڵبگرن کە پێویست بوو دابەشبکرێت بەسەر زۆربەی مرۆڤەکانی سەر زەویدا.

ئەم باسە چەندە سادەیە بۆ بیروباوەڕی نەتەوەی هەڵبژێردراو! دواتر چەندە داواکاریەکانی قورس بوون؟ بەڵام هەتا ئێستا هێشتا بابەتەکە چارەسەر نەکراوە. چونکە ئەگەر وامان دانا أللە جوولەکەی بانگهێشت کردوە بۆ هەستان بەم کارە قورسە بەبێ هیچ پاداشتێك، ئەوا ڕاستیەکە بریتیەلەوەی ئەوان هەڵبژێردراون لەنێو هەموو خەڵکدا بۆ ئەم کارە. کتێبی پیرۆز هەڵناسێت بەهیچ هەوڵدانێك بۆ دوورخستنەوەی ئەم گومانە: ((٦ لەبەرئەوەی تۆ نەتەوەیەکی پیرۆزیت. خودا تۆی هەڵبژارد لەنێو تەواوی نەتەوەکانی تری سەر زەویدا. ٧ لەبەرئەوەنیە ئێوە کەمترین لە هەموو نەتەوەکانی تر. ٨بەڵکو لەبەرئەوەیە خودا خۆشی دەوێن

**هەربەو هۆیەوە لە میسر ڕزگاری کردن لە کۆیلایەتی لە ژێر دەستی فیرعەونی پادشای میسردا)) (سفر التثنیة: ٧/ ٦-٨).**

**گومانی تێدانییە مرۆڤی ئاسایی ناتوانێت ئەم هەڵبژاردنە قوبوڵ بکات بەڵکو هاوشێوەی ئەم جیاکردنەوەیە هەستی ڕقو کینە دەوروژێنێت لە مێشکیدا چونکە بەرکەوتنی دەبێت لەگەڵ هێزی هەستی دیموکراتی لەو کەسەدا. لەڕاستیدا ئەم کێشەیە ڕستەیەکی ئاینی دەوروژێنێت کە ناودەبرێت بە بیرۆکەی: ((ئابڕووبەرەی تایبەتمەندێتی)). ئەمە بیرۆکەیەکە وادادەنێت کردارەکانی ألله دەشێت ئەم چڕبکرێتەوە وەکو هاوێنەیەکی سوتێنەر لەسەر چەند کات و شوێن و نەتەوەیەکی تایبەت بە ئامانجی بەدیهێنانی چەند مەرامێکی مرۆیی بەشێوەیەکی جیهانی.**

**بەهەرحاڵ ناتوانین هاوشێوەی ئەم بیروباوەڕە ڕاست بکەینەوە. لەبری ئەوە دوو شت هەیە دەتوانین ئەنجامیان بدەین لەم بوارەدا: یەکەم، دەشێت تێبگەین بۆچی جوولەکە ڕاپێچکران بۆ گرتنەخۆی هاوشێوەی ئەم چەمکە؟ دووەم، ئەم چەمکە چۆن کاری تێکردن؟.**

**بەڵام سەبارەت بەو شتەی جوولەکە باسی لێوە دەکەن کە ئەوان هەڵبژێردراون ئەمە دەمانباتەوە بۆ ڕابردوو بۆ توانایەکی دیار کە هەڵدەقوڵێت لە ڕاستی مێژووی ئەوان کە پێشتر باسمان کرد: ئەویش توانای لەخۆبایی بوونی نەتەوەییە. نەتەوەی ئیسرائیل بینراوە لەڕێگەی چەند ڕوداوێکی نمونەییەوە کە تیایدا لە کۆیلایەتیەوە بەرزکراونەتەوە و سەرکەوتن بەسەر مەزنترین هێز و سوپای ئەو سەردەمەدا کە دارو دەستەکەی فیرعەون بوون بەم شێوەیە بوون بە نەتەوەیەکی سەربەخۆ و ڕێزلێنراو، دوابەدوای ئەوە ڕاستەوخۆ تێگەیشتنیان لە ألله زیاتر بوو لە نەتەوەکانی دراوسێیان کە هەڵقوڵاوبوو لە پێوەرەکانیان بۆ ئاکار و دادپەروەری کە هێشتا ڕکابەری جیهان دەکات هەتا ئەمڕۆ. بەدرێژایی سێ هەزار ساڵ کە دوابەدوای ئەوە هات، جوولەکەکان بەردەوام بوون لە بوونیان لەبەردەم دوژمنایەتی و چەند کێشەیەك کە وێنا ناکرێن بەشداربوون لە شارستانیەتدا زۆر زیاتر لە دوژمنەکانیان.**

**هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی چیرۆکی جوولەکە چیرۆکێکی ناوازە بوو. بەپێی سروشتی کارەکان پێویست نەبوو بتوانن ڕابکەن لە فیرعەون بە پلەی یەکەم. بۆچی یەهوە لەپێشچاوی ئەواندا خوداوەندی خێر و دادپەروەری بووە لەکاتێکدا شیموس خوداوەندی موابییەکان و خوداوەندی نەتەوەکانی وا نەدەهاتە بەرچاوی نەتەوەکانی دیکە؟ ئەمە پرسیارێکە وای لە فیلهاوزن کرد کە دادەنرێت بە یەکێك لە پشتیوانانی شیکردنەوەکانی سروشت، دەڵێت: ((ئەمە کێشەیەکە مرۆڤ ناتوانێت هیچ وەڵامێکی گونجاوی بۆ دابنێت)).**

**زۆربەی مێژوونوسان دانیاتن بەوەداناوە کە ناڕەزایی پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل لەسەر زوڵم و ناعەدالەتی کۆمەڵایەتی ((هاوشانی نیە لە جیهانی دێریندا))(١٠). ئەم بابەتە بەڕای یەکێکیان: ((بەپێی هەموو یاسا کۆمەڵایەتیەکان پێویست بوو جوولەکە لەناو بچوونایە هەرلە دێر زەمانەوە!))، لێرەدا وتەی نیکۆلاس بیریدابیف زیاددەکەین: مانەوەی بەردەوامی جوولەکە بەدرێژایی ئەو چەند سەدەیە شتێکە مێشك ناتوانێت وەڵامێکی بۆ دابنێت.**

**ئەگەر ئەو ڕاستی و بەڵگانە کە باسکران دروست بن ئەوا مێژووی جوولەکە نمونەییە، دوو ئەگەرمان لەبەردەمدایە. ئەم ڕێزلێنانە دەگەڕێتەوە بۆ خودی جوولەکەکان، یان دەگەڕێتەوە بۆ ألله. بەڵام سەبارەت بە جوولەکە ئەم ڕێزلێنانەیان گەڕاندەوە بۆ ألله. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی ئەم نەتەوەیە بریتی بوو لە ڕەتکردنەوەی بەردەوامی بۆ هەر شتێکی تایبەت کە بەتەنها لەم نەتەوەیەدا هەبێت لە نەتەوەکانی تردا**

بوونی نەبێت. بەپێی ئەفسانەی مدراشی، کاتێك ألله قوڕی هەڵگرت بۆئەوەی ئادەمی لێدروست بکات، ئەو قوڕەی کۆکردەوە لە هەموو ناوچە جیاجیاکانی سەر زەوی لە هەموو ڕەنگەکانی خاکی سەر زەوی، بۆئەوەی جێهانگیری ببەخشێتە ڕەگەزی مرۆیی. کەواتە پێویستە تایبەتمەندیەك هەبێت لە ئەزمونی جوولەکەدا کە گوایە ألله ئەوانی هەڵبژاردوە. ئەم واتایە سەرەتا وەك لە خۆبایی بوون دەردەکەوێت.

بەدڵنیاییەوە دەکرێت مرۆڤ نیگەران ببێت لەوەی نەتەوەیەك بە جیاواز دانراون و هەڵبژێردراون لە نێو هەموو نەتەوەکانی سەر زەویدا، دەشێت ألله بەپیرۆزمان بزانێت هئەو هەوایەمان پێببەخشێت کە هەناسەی پێ دەدەین و دەژین ئەمە سەرباری بەخشینەکانی تر. ئەگەلا ڕزگارکردن لە زوڵم و زۆرداری کارێکی ڕۆتینی بێت ئەوا جوولەکەکان لە ئازادبوونیاندا شتێکی گرنگیان نەدەبینی، هەستی مرۆڤ بەرامبەر بەو شتانەی دوبارە دەبنەوە ڕۆژانە وای لێدەکات بەجۆرێك هەست بکات کە ئەم بەخشینانەی ألله شتێکی ئاساییە و هەمووان دەگرێتەوە.

ڕای جوولەکە دەربارەی بیروباوەڕی هەڵبژاردن، هەندێکیان پێیان وایە ئەم بابەتە تایبەت بوو بە کات و شوێنێکی دیاریکراو و ئێستا کاریگەری نەماوە. بەڵام بەشێکی تریان پێیان وایە هێشتا کات ماوە بۆ چاکسازی لە جیهاندا، چونکە ألله هێشتا پێویستیەکانی نەتەوە تایبەتەکەی پڕ دەکاتەوە، بەجۆرێك کە ئەوان ئەو هێزەن کاریان پێدەکات بەدرێژایی مێژوو، سەبارەت بەو کەسانەی بیردەکەنەوە بەپێی ڕێکای دووەم ئەم وشانەی اشعیا تەنها تایبەت نین بە ڕابردووەوە بەڵکو واتاکەی هاوچەرخەو هێشتا بەردەوامە:

((گوێم لێبگرە ئەو جەزائیر

ئێوەش گوێگرن ئەی نەتەوە دوورەکان!

من پێش ئەوەی لەدایك ببم خودا بانگی کردم.

لە منداڵدانی دایکمەوە ناوی منی برد

٢ زمانمی تیژکرد وەکو شمشێر.

لە سێبەری دەستیدا کردمی بە تیرێك.

٣ پێی وتم: تۆ بەندەی منی ئیسرائیل کە شانازیت پێوە دەکەم. )). (اشعیا: ٤٩/١-٣).

## کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر لەسەر ئەم بەشە:

١-کتێبی روبرت ام. سیلتزر، ((نەتەوەی جوولەکە، بیوباوەڕی جوولەکە)) تەواوکەری ئەم بەشەیە چونکە گرنگیەکی زیاتر دەدات بە ماوەی دوای تەورات.

٢-بەڵام کتێبی گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان نوسینی باری هولز شێوازێکی جیاواز دەداتە دەقە یەهودیەکان بۆ خوێنەر.

٣-کتێبی پەرستنی یەهودییەت نوسینی ابراهام میلگرام لایەنە ئایینیەکەی بە وردی باسدەکات.

٤-بەڵام سەبارەت بە ڕەهەندە سۆفیگەریەکانی جوولەکە سەیری کتێبی داوود اریێل (توێژینەوەی سۆفیگەری بکە.

٥-سەبارەت بە هۆلۆکۆست و کاریگەریەکەی لەسەر بیروباوەڕی جوولەکە سەیری کتێبی میخائیل ماروس بکە لەژێر ناونیشانیالمحرقە فی التأریخ

## پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی یەهودییەت:

.1954); 204-5 ،1. the new yorker (december 4

the intellectual adventure of antient man (chicago; univercity of ،2. henri frankfort .363 ،1946) ،chicago press

rediscovering the bible 26-28 ،3. bernard anderson

.4. w. e albright in approaches to world peace 9

.5. see 1 kings 18;46 and 2 kings 2;16

where judaism differed ،6. quoated by aba hillel silver

٧. لێرەدا مەبەستم لە شارستانیەتەکانە کە خاوەنی شاری فراوانن و چەندین تۆمار و نوسراویان هەیە، بەم واتایە چەند بەشێکی تر هەن لە جیهان کە دەوڵەمەندن بە شارستانیەت و ڕۆشنبیری، کەلە بەرچاو دەگرێن لە بەشی نۆیەمی ئەم کتێبەدا لەژێر ناونیشانی ئایینە سەرەتاییەکان.

8. joseph klausner the messianic idea in israel

.9. abraham heschel

.10. g. ernest wright the old testament against its environment

## ٨

# مەسیحییەت

لەنێو هەموو ئایینە مەزنەکاندا مەسیحییەت لە ئەمڕۆدا دادەنرێت بە یەکێك لە بەربڵاوترین ئایینەکان. لەوانەیە ژمارەی شوێنکەوتوانی ئەم ئایینە هەندێك جار زیادەڕەوی تێدا بکرێت بەڵام تۆمارەکان وا نیشان دەدەن هەموو سێ کەس لەسەر زەوی یەکێکیان مەسیحیە، کە بە نزیکەیی ژمارەیان دەگاتە یەك ملیار و نیو(١).

نزیکەی هەزار ساڵ لە مێژوو هەمەچەشنیەکی دروستکردوە لەنێو ئەم ئایینەدا، لە قەشە بابوی گەورە لە کڵێسای قەشە بوتروس بۆ سادەیی کۆبوونەوەی شوێنکەوتوانی ڕێبازی لەرزێنەرەکان، لە ئاڵۆزی بیروباوەڕی قەشە تۆماس ئەکوینی بۆ سادەیی ڕۆحی ئەو کەسەی دەڵێت: ئەی خودا دەمەوێت مەسیحی بم، لە کڵێسای قەشە بولس لە لەندەن (کڵێسای ئەبرشی لە بەریتانیا) بۆ دایکە تێرێزا لە کوچە هەژارەکانی کەلکوتا، هەموو ئەمانە مەسیحیەتن. لەم پێکهاتە ئاڵۆزە زۆربەی کات کارەکەمان: ناساندنیەتی بە تەوژمە ناوەندیەکان کە ئەم ئایینە تونـدوتۆڵ دەکەن بەپلەی یەکەم، دواتر قسەکردن لەسەر سێ بەشە سەرەکیەکەی: کاسۆلیکی ڕۆمانی، ئورسوزکسی ڕۆژهەڵاتی، پرۆتستانتی.

## یەسوعی مێژوویی

مەسیحیەت لە بنەڕەتدا ئایینێکی مێژووییە بەو مانایەی کە ئەمە ئایینێکی پێکهێنراوە لەسەر بنەمای ئەقڵ و مەنتیق بەڵام لەسەر کۆمەڵە ڕوداوێکی بەرجەستەکراو کە بەڕاستی ڕوویانداوە لە مێژوودا. یەکێك لە گرنگترین ئەو ڕوداوانە ژیانی دارتاشێکی جوولەکەیە وەك لە زۆربەی شوێنەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە کە لە کادێندا لەدایك بووە، دواتر لەسێدارە دراوە وەك تاوانبارێك لە تەمەنی ٣٣ساڵیدا. لەژیانیدا زیاتر لە ٩٠ میل لە شوێنی لەدایکبوونەکەی دوور نەکەوتوەتەوە واتە گەشتی نەکردوە بۆ وڵاتانی تر. خاوەنی هیچ شتێك نەوبووە، لە خوێندنگا فێری خوێندنەوە و نوسین نەبووە، پەیوەندی بە سوپاوە نەکردوە، لەبری ئەوەی چەند کتێبێك بەرهەم بهێنێت هەموو ئەو کارەی کردوویەتی چەند هێڵێکی دروستکرد لەسەر لم. وێڕای ئەوە ڕۆژی لەدایکبوونەکەی دادەنرێت بە سەرەتای مێژووی هەموو جیهان، هەروەها ڕۆژی مردنەکەی بە ڕۆژێکی خەماوی دادەنرێت. ئەو کەسە کێ بوو؟

ئەو وردەکاریانەی پەیوەندیان هەیە بە ژیانی یەسوعەوە زۆر کەمن بەجۆرێك لێکۆڵەران لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا وایان بەبیرداهات کەسێکی وەها لەبنەڕەتدا بوونی نەبووە. بەڵام ئەمە ئەگەرێکە قابیلی قوبووڵکردن نیە، بەڵام کاریگەری کتێبی گەڕان بەدوای یەسوعی مێژووییدا نوسینی ئەلبیرت شویتنزر کە بەدرێژایی سەدەی ڕابردوو دەستی گرتبوو بەسەر جیهاندا سەبارەت بە یەسوع زانایانی کتێبی پیرۆزی والێکرد بیربکەنەوە لە دوو خاڵ: یەکەم ئێستا شتێکی وەها نازانن لەبارەیەوە کە شایەنی باس بێت، دووەم شتێکی دوپاتکراوەیە ئاماژە بەوە دەکات ئەو بیرکردنەوەی یەسوعی مێژوویی هەڵەیە کە جیهان زۆر خێرا کۆتایی پێ دێت. کاتێك ئەو بیرکردنەوانە شایەنی ئەوە نەبن کڵێسایان لەسەر بنیات بنرێت، خۆشبەختانە ((ئەو گومانە مێژوویەی کە وادادەنێت یەسوع بوونی نەبووە بەروە نەمان چووە))(٢). زانایانی کلاسیکی تێبینی ئەوەیان کرد ئەگەر هەمان پێوەری متمانەی مێژوویی جێبەجێ بکەن کە بەکاریان هێناوە لە کتێبی پیرۆزدا لە توێژینەوەکانی تریاندا لە تێڕوانینان بۆ جیهانی یۆنانی ڕۆمانی (کە تا ئێستا بە تێڕوانینێکی مێژوویی دروست دادەنرێت تاڕادەیەك) دەگۆڕێت بۆ گومان!.

کەواتە ئەو یەسوعە کێ بوو کە لێکۆڵەرانی پەیمانی نوێ قسەی لەسەر دەکەن سەبارەت بە گەڕانەوە بۆ بینینی؟ یەسوع لە فەڵەستین لەدایکبوو لەماوەی فەرمانڕەوایی هیرۆدۆسی گەورەدا لەوانەیە لە نزیکەی ساڵی ٤ ی زایینی گومانی تێدانیە ئەو کاتەی دیاریکراوە بۆ ساڵی زایینی کە دەست پێدەکات بە ڕۆژی لەدایکبوونی دوورە لە ڕاستیەوە بە چەند ساڵێك.

لە ناسیرە گەورە بوو یان لە یەکێك لە ناوچەکانی دەوروبەری، بەپێی بیروباوەڕی جوولەکە لەو سەردەمەدا وەك هەر جوولەکەیەکی تر یۆحەنا لەئاوی هەڵکێشا کە پێغەمبەرێکی ڕێنیشاندەر بوو خۆی تەرخانکردبوو بۆ ڕێنماییکردنی خەڵك، ناوچەکەی وروژاندبوو بە بابەتی نزیکبوونەوەی ڕۆژایی دوایی و لێپرسینەوە. لە سەرەتای تەمەنی سی ساڵیدا دەستیکرد بە کاری فێرکردن و چارەسەرکردن بۆ ماوەی نزیکەی سێ ساڵ بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ناوچەی جەلیل باکوری فەڵەستین. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات بەرەنگاربوونەوەی هاوڵاتیانی ئەو ناوچەیە و گومانەکانی ڕۆما سەبارەت بە ئەو ڕووی لە زیادبوون کرد کە لە کۆتاییدا بووەهۆی لە خاچدانی لەسەر بەرزاییەکانی ئۆرشەلیم (قودس). لەم ڕووداوانەوە دەست دەکەین بەباسکردنی شێوازی ژیانی بەشێوەیەکی گشتی.

ئەگەر ویستمان قسەکانمان کورت بکەینەوە، دەڵێین یەسوع کەسێکی گەڕۆکی خاوەن کاریگەری بوو لەسەر خەڵك بە ئاسانی دڵی ئەو کەسانەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا کە چاویان پێی دەکەوت وەك پێغەمبەرانی تری جوولەکە هێزیان لە پەروەردگار داوا دەکرد بۆ یارمەتیدانی کەسانی نەدار و هەژار و لێقەوماو لە هەمان کاتدا ڕێگای بۆ دادەنان بۆ چۆنیەتی بەسەربردنی ژیانیان. ئەم بابەتە باسدەکەین لەم سێ خاڵەدا:

١-ڕۆحی جیهان کە یەسوع ڕووی تێکردبوو کە هێزی پێدەبەخشی لە گەیاندنی پەیامەکەیدا.

٢-بڵاوکردنەوەی ئەو هێزەی پێی بەخشرابوو لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ کەمکردنەوەی ئازاری مرۆڤەکان.

٣-سیستمی کۆمەڵایەتی نوێ کە ویستی تازەی بکاتەوە.

((ڕۆحی یەزدان لەسەرمە. . . ))[٣٣]. بەپێی لۆقا، یەسوع نامەکەی دەستپێکرد بە ئایەتێك کە وەریگرتبوو لە سفر اشعیا وتی: ((ئەمڕۆ ئەم نوسراوە بە گوێکانتاندا درا)) (ئینجیلی لۆقا: ٤/١٢). کەواتە پێیویستە چاودێری ئەو ڕۆحە بین کە یەسوع هەستیپێکرد کە هێزی پێدەبەخشێت چونکە ناکرێت تێگەیشتنێك هەبێت بۆ ژیانی یەسوع و کارەکەی ئەگەر ئەم ڕۆحە دوورخرایەوە لێی و بەپێی پێویست گرنگی پێنەدرا.

ویلیەم جەیمس پێمان دەڵێت لە کتێبەکەیدا (هەمەچەشنی ئەزمونی ئایینی) کە سەلماندی یەکێکە لەو کتێبانەی زۆر دواوە لەبارەی گەوهەری ئایینەوە لە سەدەی بیستەمدا ((ئایین بە مانا بەرفراوانەکەی دەڵێت سیستمێکی نەبینراو هەیە چاکەکانمان شاردراوەتەوە لە پەیوەندیە دروستەکانمان لەگەڵیدا)).

هەتا سەردەمانێکی نزیك زانستی نوێ گومانی هەبوو لە ڕاستی بوونی بوونەوەرە نەبینراوەکان بەڵام لەدوای تێبینی ئیدینگتۆن جیهان زۆرتر دەشوبهێنرێت بە ئامێرێك نەك مێشك و ئەقڵ، لەدوای ڕاپۆرتی زانایانی فیزیایی فەلەکناسی ٩٠٪ی مادەی پێکهێنەری گەردون نەبینراوە، بەواتایەکی تر ئەو کارناکاتەسەر هیچ یەکێك لەو ئامێرانەی کاری پێدەکەن، ئەم گومانە زانستیە بەرەو نەمان چوو(٣). بەڵام خاڵە گرنگەکە لێرەدایە کلتوری کتێبی پیرۆز کە یەسوع لەبارەیەوە دەدوا ناکرێت بخوێنرێتەوە تەنها وەك وتووێژێکی بەردەوام نەبێت بۆ نەتەوەی عیبری لەگەڵ ئەو سیستمە نەبینراوەدا کە ولیەم جەیمس جەختی لەسەر دەکاتەوە. ئەو سیستمەیان ناونا ڕۆح (هەروەك باسکراوە لە ئایەتەکانی سەرەتای کتێبی پیرۆز لە سفر التکویندا، کە ڕۆحی ألله بەسەر ئاوە سەرەتاییەکاندا باڵدەکێشێت بۆئەوەی جیهان دروستبکات)، هەستیان بەوە کرد وایلێکردن وێنای بکەن وەکو فریشتە و سەرۆکی فریشتەکان و ساروفین[٣٤]. بەڵام سەنتەری ئەو ڕۆحە یەهوە وێڕای ئەوەی بینراوە بە بەرجەستەکراوی وەك شوانێك، پادشایەك، وەك یەزدان، باوك، خۆشەویست.

وێڕای ئەوەی ڕۆح وێناکراوە وەك ئەوەی لەسەر زەوی بێت بەڵام ئەو وێناکردنە تەنها بۆ جیاکردنەوەیەتی لە جیهانی دونیایی و بەرزبوونەوەی بەسەر زەویدا. جیهان و ڕۆح تەنها لەڕووی شوێنەوە لەیەك جودا نین بەڵکو لە پەیوەندیەکی بەردەوامدا بوون، وەك لەم ئایەتانەدا ڕەنگدەداتەوە: ((ألله لە باخی بەهەشتدا ڕێ دەکات)) و ((هەموو زەوی لێوانلێوە لە سەربەرزی ألله)).

ڕۆح تەنها لەڕووی شوێنەوە نزیك نەبوو بەڵکو دەکرێت بناسرێتەوە. زۆربەی کات ڕۆح دەستپێشخەری دەکات و بوونی خۆی ئاشکرا دەکات. بەڕاستی ئەو کارەی ئەنجامدا لەگەڵ پێغەمبەر موسا لەسەر شاخی سیناو، بەڵام بە دەنگێکی نزم قسەی کرد لەگەڵ ئیلیا، لەگەڵ پێغەمبەرانی تر قسەی کرد وەك نەڕینی شێر،

[٣٣] تەواوی ئایەتەکە وەك لە ئینجیلی لۆقادا تۆمارکراوە (٤/ ١٨-١٩): ((ڕۆحی یەزدان لەسەرمە، چونکە منی ڕاسپاردوە بۆئەوەی مژدە بدەم بە لێقەوماوان، منی ناردوە بۆئەوەی چارەسەری دڵشکاوان بکەم بۆئەوەی زیندانیان ئازاد بکەم، نابیناکان چاکبکەمەوە)).

[٣٤] یەکێکە لە فریشتەکانی پاسەوانی چینی یەکەمی عەرشی ألله بەپێی بیروباوەڕی دێرینی جوولەکە

خۆی ئاشکرا کردوە لەمیانەی چەند ڕوداوێکی دراماتیکیەوە وەك ڕوداوی چوونەدەرەوەی بەکۆمەڵی نەوەکانی ئیسرائیل لە میسر. لەکاتێکدا دەکرا مرۆڤ دەستپێشخەری بکات و پەیوەندی پێوە بکەن. کەرەستەکانی ئەو جۆرە پەیوەندیە ڕۆژووگرتن و خەڵوەت بوون، ئەو جوولەکانەی هەستیان بەو بانگەوازە کرد بەشێوەیەکی خێرا دەکشانەوە لە ژاوەژاوی جیهان کە ئاگایی دەشێوێنێت بۆئەوەی داوای یارمەتی لە خودا بکەن. ئەمە بیرکردنەوەیەکی خراپ نیە ئەگەر وادابنێین ئەوان لەڕێگەی ئەو شەونخونیەوە هەوڵیانداوە ڕۆحیان پاکبکەنەوە لە بوغز و کینە، چونکە کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ جیهانی دونیایی هەست بەوە دەکەن ڕۆحیان سەر لەنوێ هێز و توانای جارانی بۆ گەڕاوەتەوە.

گرنگترین ڕاستی کە یارمەتیدەرمانە بۆ تێگەیشتن لە پەیامی یەسوع و شێوازی ژیانی بریتیەلەوەی دەرکبەوە بکەین کە دەستی پێکردوە لە کلتوری ئایینی جوولەکەوە لەڕێگەی ئەو ناوەندانەوە کە لیێوانلێون لە ڕۆح. ئەو کەسەی ڕاستەوخۆ کاریگەری هەبوو لەسەری یۆحەنا معمدان بوو کە شایەتی دەدات بۆ هێزە ڕۆحیەکەی کەلە ڕێگەی لە ئاو هەڵکێشانیەوە چاوی ڕۆحی یەسوع کرایەوە، کە وای لێکرد ببینێت: ((ئاسمان کرایەوە، ڕۆحی قودس دابەزیە سەری بەشێوەیەکی بەرجەستەکراو لەسەر شێوەی کۆترێك)). کاتێك ڕۆحی قودس دابەزیە سەری و ڕێنیشاندەری بوو هەنگاو بنێت بەرەو بیابان، کەلەوێدا مایەوە بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەسەری برد بە نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن ئەو ڕۆحەی چووە ناوی یارمەتیدەری بوو، یەسوع لەدوای ئەم ئەزمونە توانی بگەڕێتەوە بۆ جیهان کە هێزی ڕۆحی داواکراوی پێبەخشرابوو.

((بە پەنجەی اللّٰه ئەهریمەنەکان وەدەربنێ))[35]. ئەگەر زانست ڕاستیە نەبینراوەکان ڕەتنەکاتەوە ئەوا پەرەیدەسەند بۆئەوەی هەل بدات بەو ئەگەرانە هەتا شتەکان بەهەمان شێوە بەهێز بن، بەجۆرێك ئەزمونە زانستیەکانی ئێستا پێشنیازی دەکەن((وزەی شاراوە لەناو سانتیمەترێك سێجا لە بۆشایی گەردوندا، گەورەترە لە هەموو ئەو مادەیەی دەیناسینەوە لە گەردوندا))(٤). هەرچیەك بێت چارەنوسی ئەو بیردۆزە تایبەتیانە، ئەوا جوولەکەکان باوەڕیان هەبوو بە سەرکەوتنی ڕۆح بەسەر سروشتدا بەبێ هیچ پێچ و پەنایەك. ئەو کەسایەتیانەی لێوانلێو بوون لە ڕۆح لە تەوراتدا خاوەنی هێزێکی کەم وێنەبوون. ئەگەر وتمان ئەمانە کەسایەتی کاریزمایی بوون(خاوەن هێزێکی کاریگەر) ئەوە مانای ئەوەیە خاوەنی هێزێکی کاریگەر بوون لەنێو خەڵکیدا، بەڵام ئەمە تەنها سەرەتایەکە. ئەو هۆکارەی وای لەو کەسایەتیانە کرد سەرنجڕاکێش بن بەهۆی ئەو توانایەی پێیان درا بوو. ئەوە شتێك بوو کەسانی ئاسایی خاوەنی نەبوون. ئەو شتە ڕۆح بوو. زۆرجار لە تەوراتدا باسکراون بەجۆرێك کە لێوانلێو بوون لە هێزی ڕۆح، هێزێك یارمەتیان دەدات بۆ کارکردنە سەر ڕێڕەوی سروشت و ڕوداوەکان. ئەوان نەخۆشەکانیان چارەسەر دەکرد، ئەهریمەنەکانیان دەردەکرد لەلەشی توشبووەکان، هەندێکجار گێژەڵوکەکان دادەمرکێننەوە، ئاوی دەریاکان دوو کەرت دەکەن، مردووان زیندوو دەکەنەوە. ئینجیل ئەم هێزانەی داوەتە پاڵ یەسوع بەشێوەیەکی چڕوپڕ چەندین جار ئینجیلەکان باس لەوە دەکەن مرۆڤەکان ڕوویان دەکردە ئەو بەهۆی ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی لەبارەیەوە بیستبوویان. لە ئینجیلی مەرقەسدا دەخوێنینەوە: ((لەکاتی هاتنی ئێوارەدا، کاتێك خۆر ئاوا بوو، خەڵکی هەموو ئەو کەسانەیان هێنا بۆلای کە نەخۆش بوون و ئەهریمەن چووبووە ناو لاشەیانەوە، هەتا هەموو دانیشتوانی شارەکە کۆبوونەوە لەلای دەرگای ئەو ماڵەی تسایدا نیشتەجێ بوو. )). (ئینجیلی مەرقەس ٣٢/١-٣٣). یەکێك لە زانایانی کتێبی پەیمانی نوێ دەڵێن:

---

[35] سەیری ئینجیلی لۆقا بکە: ٢١/١١

((وێڕای هەموو ئەوشتانەی موعجیزەکان دەیسەپێنن کە قورسە ئەقڵی هاوچەرخ باوەڕیان پێ بهێنێت، چونکە لەڕووی مێژووییەوە گومانی تیادا نیە یەسوع بەڕاستی لەو کەسانە بوو کە هەڵدەسن بە کاری چارەسەرکردن بەڕێگای دۆعا و نزا و پاڕانەوە لەکاری چارەسەرکردندا))(٥).
ئەو پسپۆڕە لەبواری پەیمانی نوێدا دەڵێت: مەسیح دەیتوانی بەو کارە هەستێت، ئەمە تەنها سەرنجی کەسانی لۆکاڵی کێش ناکات بۆلای خۆی بەڵکو ئەوەی وای لێکرد زیاتر لە ماوەی مانەوەی کاریگەر بێت و بەشێوەیەکی بەرفراوانتر بڵاوببێتەوە، چونکە ئەو ڕێگایەی کە ڕۆحی تیادا بەکارهێنا بۆئەوەی لەڕێگایەوە کاربکات، تەنها بۆ چارەسەرکردنی تاکەکان نەبوو بەڵکو بۆ چارەسەرکردنی مرۆڤایەتی بەگشتی بە دەستپێکردن بە گەلەکەی.
((مەلەکوتی اللّه بەڕێگاوەیە بۆ زەوی)). بارودۆخی جوولەکە لە سەردەمی یەسوعدا لەڕووی ڕامیاریەوە زۆر خراپ بوو. لە خزمەتکردنی ڕۆمادا بوون لەبەشێکی هەرەزۆری ئەو سەدەیەدا کە یەسوع تیایدا پەروەردە بوو، وێڕای لەدەستدانی سەربەخۆیی، ناچاربوون سەرانە بدەن بە ڕێژەیەکی زۆر زیاتر لەوەی کەلە توانایاندایە. چوار چارەسەر هەبوو بۆ کێشەکەیان: ڕاستگۆکان زۆر کەم و دابڕاو بوون پێیان باش بوو سود ببینن لەو هەلومەرجە، خۆیان ڕابهێنن لەگەڵ فەرمانڕەوایی ڕۆمانی و شارستانیەتی ئیغریقیدا. بەڵام هەڵوێستی دووەم هیواخواستن بوو بۆ گەنجامدانی گۆڕانکاری. هەریەك لە هەڵوێستەکانی تر دەرکیان بەوە کرد گۆڕان پێویستە لەلایەن یەهوە ئەنجام بدرێت، هەمووی وایداناوە جوولەکە پێویستی بە ئەنجامدانی کارێکە بۆ هاندانی دەستێوەردانی یەزدانی بەبەرژەوەندی خۆیان. دوان لەو هەڵوێستانە بزوتنەوەی تازەگەری بوون. وەهایان دادەنا جیهان زۆر لەوە پیسترە کە ڕێگە بدات بە جوولەکە بۆ تازەبوونەوە، لەبەرئەوە کێشەکەیان شکست پێهێنا لە بەرژەوەندی خۆیان بەتەواوی. پاشەکشەیان کرد بۆ چەند کۆمەڵگایەکی لەیەك دابڕاو کە لە کەلوپەلەکانیاندا بەشداری یەکتریان دەکرد، خۆیان تەرخانکردبوو بۆ ژیانێکی پڕ لە خواترسان و هاوسەنگی ئەخلاقی. بەڵام ئەوانی تر مانەوە لەلایەکی ترەوە لەنێو کۆمەڵگەدا بەرفراوان بوون بۆ دوبارە بوژاندنەوەی یەهودییەت لەڕێگەی پابەندبوونی تەواو بۆ یاسا و شەریعەتی موسای پێغەمبەر خوالێی ڕازی بێت، بەتایبە تیاساکانی تایبەت بە پیرۆزی. بەڵام هاوەڵانی هەڵوێستی چوارەم ئاماژەیان پێدەکرا بەناوی بەپەرۆش و توندڕەوەکان، وێڕای ئەوەی گومان هەیە لەوەی کە ڕێکخراو بن بەشێوەیەك شایستەی ئەو ناوە بن. ئەوان نائومێد بوو نلە ئەنجامدانمی گۆڕانکاری لەڕێگەی بەکارهێنای هێز و توندوتیژیەوە، لەبەرئەوە ناوبەناو کاری بەرگریکاریان ئەنجام دەدا، لوتکەکەی شۆڕشێکی کارەساتبار بوو لە ساڵ ٦٦-٧٠ زایینی. کە بووەهۆی ڕوخاندنی دووەم پەرستگا لە قودس.
یەسوع هات و هەڵبژاردنی سێیەمی خستەنێو ئەم گرژی و ئاڵۆزیەوە. بەپێچەوانەی هەندێکیان گۆڕانکاری دەویست، بەپێچەوانەی بیرکردنەوەیان مانەوەی ویست لە جیهاندا. بەپێچەوانەی پشتیوانانی هەڵبژاردنی سەربازی دەستخۆشی کرد لەو کەسانەی ئاشتەواییان دەویست تەنانەت ئامۆژگاری دەکرد بە خۆشویستنی دوژمنان. هەڵویستی نزیك بوو لە هەوڵویستی هەندێکیان کە جەختیان دەکردەوە لەسەر پیرۆزی یەهوە بەڵام یەسوع بەزەییەکەی و خۆشویستنەکەی خۆی دوپات دەکردەوە. بەدڵنیاییەوە ئەوانە نکوڵیان نەدەکرد لەم لایەنە بەڵکو یەکەمین کەس بوون جەختیان کردەوە لەسەر بەزەیی یەهوەبە هەمان شێوە یەسوع پیرۆزی یەهوەی دوپاتدەکردەوە، لەبەرئەوە جیاوازیەکی کەم دەردەکەوت لەنێوانیاندا بەڵام

لەکاتی جێبەجێ کردندا جیاوازیەکە گەورەتر دەردەکەوت بەجۆرێك نەدەکرا لە تاکە ئایینێکدا کۆبکرێتەوە، پێویستە لەسەرمان تێبگەین بۆچی بەو جۆرەبوو.

ئەو کۆمەڵە تێگەیشتنیان وا بوو بۆ یەهوە کە خوداوەندێکی مەزن و پیرۆزە، هەروەها بەردەوام بوون لە تێگەیستنی یەهودی بۆ خود. کاتێك یەهوە پیرۆز بوو ویستی جیهان بەهەمان شێوە پیرۆز بکات، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە جوولەکەی هەڵبژاردبۆئەوەی ببێتە کەرەستەیەك بۆ چاندنی پیرۆزی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. لەسەر شاخی سینا و یاسا و شەریعەتی پیرۆزی دابەزاند بۆئەوەی عیبرانیەکان ببنە نەتەوەیەك لە پیاوانی ئایینی. وتەی یەهوە: ((ببنە کەسانی پیرۆز لەبەرئەوەی من پیرۆزم!))(سفر اللاويين: ٤٤/١٩) بووە دروشمی فەریسیەکان. پەیوەست نەبوون بە پیرۆزیەوە و کەمتەرخەمی کردنیان بووە هۆی ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە جوولەکەکان چەشتیان لە سوکایەتی پێکردن و ڕاگواست و کۆیلایەتی، وابیریان دەکردەوە گەڕانەوە بۆ ئەو شەریعەت و یاسایە تاکە چارەسەرە بۆ ئازادبوونیا سەرلەنوێ و گەڕانەوەی ڕێز بۆیان.

یەسوع هاوڕا بوو لەسەر ئەوە بەڵام پێیی وا بوو جیاوازی چینایەتی لەو بەرنامەیەدا کارێکی نەشیاوە، دەیویست خەڵك بەیەکچاو سەیر بکرێن جیاوازی نەکرێت لەنێوانیادا. ئەم پۆلێنکردن و جیاکاریە بووە هۆی پەرتەوازە بوون و تێکچوونی جومگەکانی کۆمەڵگە.

کاتێك مەسیح وابیریدەکردەوە گرنگترین تایبەتمەندی یەهوە بەزەیی و خۆشەویستیە، ئەو بەربەستە کۆمەڵیەتیانەی وەك سوکایەتی پێکردن دەبینی بۆ ئەو بەزەیی و خۆشەویستەی یەزدانیە، بەوهۆیەوە ئەو بەربەست و جیاکاریانەی پێ باش نەبوو، بۆیە قسەی دەکرد لەگەڵ ئەوانەی سەرانەیان کۆدەکردەوە، نانی دەخوارد لەگەڵ دەربەدەرکراوان و تاوانباران و گوناهکاراندا. هەروەها کۆدەبووەوە لەگەڵ لەشفرۆشەکاندا، چارەسەری دەکرد لە ڕۆژانی شەممەدا کاتێك بەزەیی و خۆشەویستی هانی دەدا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. ئەمە ئەو کارە بوو کە کردی بە پێغەمبەرێکی کۆمەڵایەتی کە بەرەنگاری هەموو ئەو سنورانە دەبوەوە کە سیستمی فەرمانڕەوایی ئەو کاتە سەپاندبووی بەسەریاندا، بەرگری دەکرد لەو تێڕوانینە نوێیە بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی. یەسوع جوولەکە بوو زۆر بە قووڵی، لەهەمان کاتداهەڵویستی پێچەوانەی هەبوو لبەشێوەیەکی توند بەرامبەر بە یەهودییەت. واتە ڕەخنەی دەگرت لە چەند شتێك تیایدا لەوانە یاسای پیرۆزی و ئەو جیاکاریانەی دروست بوو بەهۆیەوە ئەمە کارێکی پێویست بوو بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی جوولەکە بەسەر نەتەوەکانی تردا ئەمە لە کۆندا بەڵام چاوپێکەوتنی لەگەڵ ألله داڕێنمایی کرد بۆ ئەو تێگەیشتنەی کە ئەو سیستمە لە پیرۆزی و پاکی بەو جۆرەی کە جێبەجێ دەکرا لەو سەردەمەدا چەندین دابەشبوونی کۆمەڵایەتی دروستکردبوو. گرنگە بڵێین ئەو جیاوازیە لەبارەی ڕەحم و بەزەیی ألله وە نەبوو بەڵکو سەبارەت بە ڕەحم و بەزەیی سیستمی کۆمەڵایەتی بوو کەبەهۆی ئەو یاسایی پیرۆزیەوە هاتبووە کایەوە. تێگەشتنی یەسوع بۆ ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیە بەهۆی ئەوە نەبوو کە بەزەیی تێدا نەبێت بەڵکو هۆکارەکەی ئەوە بوو کە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بەردەوام نەبوو. بەڵام بووەهۆی نیگەرانکردنی دەسەڵاتی فەرمانڕاوای ڕۆمانی لەو سەردەمەدا، کەبووە هۆی وەستاندنی یەسوع و زیندانی کردنی و دواتر لەخاچدانی بە تۆمەتی خیانەتکردن. لێرە بەدواوە داهاتوی نەتەوەی یەسوع پشتی بەست بە جیهانێکی فراوانتر کە جیهانی نەتەوەی یەهودی بوو. بەتێپەڕبوونی کات مەسیحیەکان دەستیان کرد بە خوێندنەوەی ئەم پەرەسەندنە کۆمەڵایەتیە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە. سەبارەت بەئەوان، سروشی ألله بۆ جوولەکە زۆر

گرنگترە لەوەی سنورداربکرێت بە کۆمەڵێکی دیاریکراوەوە وەك نەوەکانی ئیسرائیل. پەیامی یەسوع قاوغی یەهودییەت تێکدەشکێنێت کە سروشت حەشاردرابوو لەناویدا ئەو سروە ئازاد دەکات بۆ هەموو جیهان بەبێ جیاوازی. ئەگەر کێشەکەما بەم شێوەیە وێناکرد ئەمە بەو واتایە نایەت کە پێویستی مانەوەی جوولەکە ڕەتبکاتەوە، هەتا جیهان نوێ ببێتەوە پێویستی جیهان بۆ نەتەوەیەك لەو جۆرە شتێکی گرنگ و پێویستە.

# مەسیحی بیروباوەڕ

چۆن دەتوانین لە یەسوعی مێژووییەوە بچینە سەر مەسیح کە شوێنکەوتوانی وابیریان دەکردەوە کە ئەو ألله یە خۆی بەرجەستەکردوە لەسەر شێوەی مرۆیی؟ شوێنکەوتوانی یەسوع نەگەیشتن بەو تێگەیشتنە هەتا کاتی مردنی، بەڵام ئێمە دەتوانین تێبینی ئەو بکەین تەنانەت لەکاتی ژیانیدا لەلای شوێنکەتوانی.

دوای ئەوەی لە بەشی پێشودا هەوڵماندا ڕوداوەکانی ژیانی یەسوع شیبکەینەوە، ئێستا دەچینە سەر ئەو شێوازەی کە تیایدا دەردەکەوت بۆ شوێنکەوتوانی. ئێستا ئێمە لەسەر زەمینەیەکی توندوتۆڵترین چونکە ئەگەر ئینجیلەکان تەنها شتێکی کەم نیشان بدەن لە ڕوداوە مێژووییەکان، بەڵام ڕوون ئاشکرایە لە کاریگەری کردن لەسەر خاوەنەکانی. لێرەدا ئەم باسە دابەش دەکەین بۆ سێ بەش:

١-ئەوەی بینیان لە کردەوەکانی یەسوع.

٢-ئەو وتانەی کە بیستویانە.

٣-هەستکردنیان بەو شتەی یەسوع نوێنەرایەتی دەکرد. ((لەشوێنێکەوە بۆ یەکێکی تر دەڕێشت بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە)). دەستپێدەکەین بەو کارەی یەسوع ئەنجامی دا. ئەو گێڕانەوانەی کە ئەندامانی کڵێسا تۆماریان کردبوو لە ئینجیلەکانیاندا، لێوانلێوە لەوەی سەرسامان دەکات لەو کارانەی کە یەسوع پێی هەستا، چونکە لاپەڕەی ئینجیلەکان پڕە لە موعجیزە. وەك بینیمان ئەو موعجیزانە کاریگەر بوو لەسەریان، بەڵام هەڵەیە تەنها گرنگی بدەین بەم خاڵە، چونکە یەسوع ئەو موعجیزانەی بەکارنەدەهێنا بۆ خۆدەرخستن لەبەرچاو خەڵکدا و ناچاریان بکات هەتا باوەڕی پێبهێنن. زۆرجار شەیتان هانی دا بۆ ئەو کارە لەکاتی گەڕان بەدوای دۆزینەوەی ڕۆحدا کە لە گەیاندنی پەیامەکەیدا کاری بۆ کرد بەڵام یەسوع ئەو فریودانەی ڕەتکردەوە لەلایەن ئەهریمەنەوە. هەموو ئەو موعجیزانەی ئەنجامدا دوور لە قەرەباڵغی وەك بەڵگەیەك بۆ هێزی ئیمان. دەگەین بەو تێگەیشتنەی باشترین کارەکانی یەسوع ئەگەر ئەو جەختکردنەوەیەمان دانا لەو جێگایەی یەکێك لە قوتابیەکانی دایناپوو. جارێکیان بطرس قسەی دەکرد بۆ کۆمەڵێك لەدوای کۆچی مەسیح کارەکانی یەسوعی کورتکردەوە لە وتەکانیدا. ئەو کورتەیە چی بوو؟ بطرس وتی لەبارەی یەسوعەوە: ئەو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەچوو بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە (أعمال الرسل: ٣٨/١٠). یەسوع بە سادەیی هاتوچۆی دەکرد لەنێو خەڵکیدا، چارەسەری ئەوانەی دەکرد کە دەربەدەرکرابوون و کۆمەڵگا لەبیری کردبوون وەلای نابوون، یارمەتی دەدان لەسەر چوونەدەرەوە لە نائومێدی، ئەو لێرەو لەوێکاری چاکەی ئەنجام دەدا بەدڵسۆزی، وای لەوانە کردبوو کەلەگەڵیدا بوون هەمیشە هەست بکەن بەوەی کە ڕێزدارن، وابیریان دەکردەوە ئەگەر ألله بیویستایە خۆی نیشان بدات لەسەر شێوەی مرۆڤ ئەوا ئەو مرۆڤە وەکو یەسوع ڕەفتاری دەکرد. ((هیچ کەسێك وەك ئەو پێشتر نەدواوە)). وێڕای ئەوە یەسوع تاکە کەس بوو وای لە کەسانی ئەو سەردەمە بکات کە بە شێوەی ئەو ڕەفتار بکەن و فراوانتر بیربکەنەوە. هەروەك زانای جوولەکە جۆزێف کلاوسنر دەڵێت: ((ئەگەر هەریەك لە ڕێنماییەکانی یەسوع وەربگیرێت بەشێوەیەکی جودا، ئەوا هاوشێوەکەی دەبینین لە تەوراتدا واتە تەلمود، بەڵام ئەگەر هەموو ڕاسپاردەکانی بەسەریەکەوە وەربگیرێت، ئەوا جۆش و خرۆش و پێداگریەکی نوێی تیادا دەبینرێت، لەوە گرنگتر ئەو وتانە پێشتر بەکارنەهێنراون)). ئەو زمانەی یەسوع پێی دواوە دەیسەلمێنێت بە چاوپۆشیکردن لە پێکهاتە و ناوەڕۆکەکەی شتێکی سەرسامکەرە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە. ئەگەر سادەیی و مانای ژیانی ئاماژە بن بۆ ئەدەب و ڕەوشتی ئایینە مەزنەکان، کەواتە ئەمانە چەند تایبەتمەندیەکن بەسن بۆئەوەی

وشەکانی یەسوع بە نەمری بهێڵنەوە. بەڵام ئەمە تەنها سەرەتایەکە. وشەکانی هەڵگری مەزنی و ترپەیەکی نمونەیین. تەنانەت پیاوانی زانا دەستەوسان دەوەستن بەرامبەری. جۆری وشە ئاگرینەکانی یەکێك لە شاعیرەکان ناوی دەبات بە زمانە مەزنەکە. ((ئەگەر دەستت بووە هۆی ئەوەی بکەویت ئەوا بیبڕەوە. . . ئەگەر چاوی ڕاستت بووە بەربەست لەبەردەم تۆ و ئەوەی باشترە بۆت ئەوا هەڵیبکەنە و فڕێی بدە. . ))[36]، یەسوع دەفەرمێت: ((هەرکاتێك حوشتر توانی بچێت بەناو کونی دەرزیدا ئەوا دەوڵەمەند دەتوانێت لە دوای مردنی بچێتە ناو مەلەکوتی یەزدانەوە))[37].

یەسوع نەیویستوە بەمجۆرە کاریگەری هەبێت لەسەر گوێگرەکانی. بەڵکو تەنها مەبەستی گەیاندنی ئەو پەیامەبوو لەلایەن یەزدانەوە پێی سپێردرابوو. چونکە لەبری ئەوەی هەواڵ بدات بە خەڵك کە باوەڕی پێبهێنن بەڵکو بانگهێشتی دەکردن بۆی بینینی شتەکان بەشێوەیەکی جیاواز، دڵنیا بوو لەوەی ئەگەر ئەوان بەو کارە هەستان ئەوا هەڵسوکەوتیان ڕاستەوخۆ دەگۆڕێت بەو شێوەیەی کە دەگونجێت لەگەڵ تێڕوانینە نوێکەیان. ئەمەبوو پاڵی پێوە نا بۆ کارکردن لەگەڵ وێناکردنی خەڵکدا زیاتر لە کارکردنی لەگەڵ ئەقڵ و خواستەکانیان.

ئەگەر ئەوان بانگهێشەکەیان قوبووڵ کرد ئەوا ئەو شوێنەی بانگی دەکردن بۆی بەشێوەیەکی ڕاستەقینە دەردەکەوت. بەو هۆیەوە ئەو ڕاستیەی دروستی دەکرد زیاتر لە هەموو شتێك گرنگیان پێدەدا. یەسوع دەستکرد بە قسەکردن لەبارەی ((دەنکە خەردەل و دەنکۆڵەی خۆڵ))، ((لەبارەی کۆیلە و فەرمانڕەوا))، ((لەبارەی ئاهەنگ گێڕان و مەی خواردنەوە)).

ئەم تایبەتمەندیانە بەرچاوڕوونی بەخشی بە ڕێنماییەکانی و بەشێوەیەکی دروست، ئەو دەدوا لەبارەی ئەو شتانەی بەشێك بوون لە ژیانی گوێگرەکانی. بەڵام لەدوای ئەوەی کە دەیبردنە ئەو شوێنە و دەیگوت: ((ڕێنماییەکانم ڕاستن، لەبەرئەوە نیە کە لە منەوە گوێتان لێی دەبێت، تەنانەت لەبەرئەوە نیە کە لە ألله بە ئێوە دەگات لە ڕێگەی منەوە، بەڵام لەبەرئەوەیە دڵەکانتان شایەتی دەدات لەسەر ڕاست و دروستیان، وێڕای ئەوەی پێچەوانەی کلتور و نەریتی باوی ئەو سەردەمەن)).

ئامانج چی بوو لەپشت شێوازی بانگەوازی یەسوعەوە بەم جۆرە؟ بەگشتی ئەوەی کە تۆمارکرابێت لە پەیمانی نوێدا لە وتەکانی یەسوع دەکرێت بوترێت لە دوو کاتژمێردا، بەڵام وێڕای ئەوە لەوانەیە ڕێنماییەکانی یەسوع بەشێك بن لەو ڕێنماییانەی کە زۆرینەی خەڵك دوبارەیان کردوەتەوە بەدرێژایی مێژو: ((کەسە نزیکەکانت وەك خۆت خۆشبوێ))((کەواتە چۆنتان پێ خۆشە خەڵك مامەڵەتان لەگەڵ بکات بەوجۆرە لەگەڵ خەڵکیدا مامەڵە بکەن: بەکورتی ئەمە شەریعەت و یاسای پێغەمبەرانە کەلەلایەن ألله پێیان سپێردراوە))[38]. ((ئەی کەسە ماندووەکان وەرنەلام با لەبری ئێوە قورسایی سەرشانتان هەڵبگرم هەتا ئێوە پشوو بدەن وەرن با ئارامیتان پێببەخشم!))[39]، ((تەنها ڕاستی ئازادتان دەکات کەواتە هەوڵبدەن بیناسن. ))[40]. ((مەلەکوتی ئاسمانەکان وەکو گەنجینەیەکە لە کێڵگەیەکدا حەشاردرابێت، کاتێك کەسێك دەیدۆزێتەوە دوبارە دەیشارێتەوە لە خۆشیدا هەرچی موڵك و سامانی هەیە دەیفرۆشێت بۆئەوەی ئەو

---

[36] سەیری ئینجیلی مەتتا بکە: ٢٩/٥-٣٠.

[38] ئینجیلی مەتتا: ١٢/٧

[39] ئینجیلی مەتتا: ٢٨/١١-٣٠.

[40] ئینجیلی یۆحەنا: ٣٢/٨.

**کێڵگەیە بکڕێت. ))[٤١]، ((جوتیارێك کاتێك گەڕایەوە بۆ کێڵگەکەی. . . . )[٤٢] ((بازرگانێك بەدوای مرواری جواندا دەگەڕێت مرواریەکی زۆر گرانبەهای بەرچاو کەوت تەواوی سەروەت و سامانەکەی فرۆشت هەتا کڕی (مەلەکوتی ئاسمانەکان بەم شێوەیە). . ))[٤٣]، ((چیرۆکی سامری. . . ))[٤٤]**

**((کوڕێکی گەنج کە دوا منداڵی ئەو خێزانە بوو کە تەواوی میراتەکەی بەزیادەڕەوی خەرجکرد، کاتێك هەموو پارەکەی تەواو بوو قات و قڕی ڕووی کردە ئەو جێگایە بەو هۆیەوە ناچاربوو بچێتە لای یەکێك لە ماڵەکانی ئەو ناوچەیە بۆئەوەی یارمەتی بدەن، ناردیان بۆئەوەی ببێتە شوانی بەراز. هێندە برسی بوو حەزی دەکرد سکی پڕبکات لەو خواردنەی بەرازەکان دەیانخوارد. . ))[٤٥]. هەموو جیهان ئەم چیرۆکانە بەباشی دەزانن کەسانی گوێگر لەم چیرۆکانە دەیانوت: ((ئەم پیاوە قسە دەکات بە دەسەڵاتێکەوە کە پێشتر هیچ کەس بەم شێوەیە نەدواوە)).**

**ئەوان حەقی خۆیان بوو بەو جۆرە سەرسام بن. ئەگەر ئێمە ئێستا بەهەمان شێوە سەرسام نەبین. چونکە چەندین جار ئەم بەسەرهاتانەمان بیستوە. ئەم وتانە فێرمان دەکەن کە خراپە بە خراپە وەڵام نەدەینەوە، بەڵکو ئەگەر کەسێم زللەیەکی دا لە ڕوومەتی چەپمان ڕوومەتی ڕاستمان ئامادەبکەین بۆئەوەی بە هەمان شێوە لێی بدات[٤٦] وێڕای ئەوەی هەموو جیهان پێی باشە بەرانگاری خراپە ببینەوە بەهەموو شێوەیەك. بەڵام یەسوع فێرمان دەکات چۆن دوژمنەکانمان خۆشبوێت، دەستخۆشی بکەین لەو کەسانەی نەفرەتمان لێدەکەن، نزا و داوای لێخۆشبوون بکەین بۆ ئەو کەسانەی خراپ هەڵسوکەوت دەکەن لەگەڵمان و زوڵممان**

---

[٤١] ئینجیلی مەتتا: ٤٢/١٣.

[٤٢] دەقی پەندەکە بەمجۆرەیە: ((ئەوەتا جوتیارەکە چوە دەرەوە بۆ چاندن. ٤لەکاتێکدا سەرقاڵی چاندن بوو، چەند دەنکە تۆوێك کەوتە سەر ڕێگاکە، باڵندەکان هاتن و خواردیان. ٥هەندێکی کەوتە سەر زەویەکی پڕ لەبەرد و خاکی کەم بوو بەوهۆیەوە هەر زوو دەرهات بەڵام ٦خۆر وشکی کرد چونکە بەباشی ڕەگی دانەکوتابوو. ٧هەندێك لە تۆوەکان کەتنە ناو دڕك و داڵەوە بەو هۆیەوە هەر زوو وشك بوون و خنکان. ٨ هەندێك تۆو کەوتە سەر زەویەکی باش، هەندێکی سەد ئەوەندە و هەندێکی سی ئەوەندەی گرت))ئینجیلی مەتتا: ١٣/٣-٨.

[٤٣] ئینجیلی مەتتا ١٣/٤٥-٤٦.

[٤٤] تەواوی چیرۆکەکە بەمشێوەیە: ((٣٠یەسوع وەڵامی دایەوە: ((مرۆڤێك لە ئۆرشەلیمەوە بەرەو ئەریحا دەڕۆیشت کەوتە بەردەستی کۆمەڵە چەتەیەك هەرچی پێبوو بردیان و برینداریان کرد و لەنێوان مردوو ژیاندا جێیان هێشت. ٣١پیاوێکی ئایینی بەو ڕێگایەدا ڕۆیشت بینی بەڵام بەلایدا تێپەڕبوو و جێی هێشت. ٣٢بەهەمان شێوە لاویی یەك بەلایدا ڕۆیشت و هیچی نەکرد. ٣٣بەڵام سامریەك بەلایدا تێپەڕی کاتێك بینی چەمایەوە ٣٤ لێی نزیك بوویەوە برینەکانی تیمارکرد و پاکی کردەوە بە زەیت و سرکە و خستیی سەر پشتی ئاژەڵەکەی و بریە میوانخانیەك لەوێداچاودێری کرد. ٣٥بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی دوو دیناری دا بە خاوەن میوانخانەکە و پێی وت چەندی ترت تیادا سەرفکرد دەتدەمەوە لەکاتی گەڕانەوەمدا. ٣٦بەڕای ئێوە کام لەو ٣کەسە نزیکتر بوو لەو کەسەی کەوتە ژێردەستی چەتەکانەوە؟)) ٣٧دواتر وتی: ((ئەو کەسەی بەبەزەیی بوو لەگەڵی)). دواتر یەسوع پێ وت: ((تۆش برۆ بەو جۆرە ڕەفتار بکە. ))لۆقا: ١٠/٣٠-٣٧

[٤٥] ئەمە چیرۆکێکی درێژە کە ئەمە دەقەکەیەتی: ((١١وتی: مرۆڤێك خاوەنی دوو کوڕ بوو. ١٢ کوڕە بچوکەکە بە باوکی ووت: باوکە بەشە میراتەکەی خۆمم بدەرێ. باوکەکەش ڕازی بوو ئەوەی هەبوو دابەشی کرد بەسەریاندا. ١٣ دوای چەند ڕۆژێکی کەم کوڕە بچوکەکە هەموو پارەکانی کۆکردەوە و سەفەری کرد بۆ ناوچەیەکی دوور لەوێدا پارەکەی بەشێوەیەکی خراپ بەفیڕۆدا. ١٤ کاتێك هەموو پارەکەی سەرفکرد قاتوقڕی و برسیەتیەکی زۆر ڕووی کردە ئەو ناوچەیە و ئەویش هیچی بەدەستەوە نەمابوو هەتا خەرجی بکات. ١٥ ڕۆیشتە لای یەکێك لە ماڵەکانی ئەو ناوچەیە خاوەن ماڵەکە ڕازی بوو کارێکی پێبدات بۆیە ناردی بۆ ناو کێڵگەکەی هەتا بەرازەکانی بۆ بەخێوبکات. ١٦هێندە برسی بوو حەزی دەکرد تێربخوات لەو خواردنەی بۆ بەرازەکان دایاندەنا. ١٧ئەوکات بیری کردەوە و وتی: باوکم چەندە خزمەتکاری هەیە تێر نان دەخۆن و منیش لێرە وا خەریکە لە برسانا دەمرم!١٨هەر ئێستا دەڕۆمەوە بۆ لای باوکمن و پێی دەڵێم: ئەی باوکە من هەڵەم کرد بەرامبەر بە ئاسمان و تۆ. ١٩چیدی شایستەی ئەوە نیم پێم بوترێت کوڕی تۆ. بمکە بە یەکێك لە خزمەتکارەکانت. ٢٠هەستا و گەڕایەوە بۆ لای باوکی. کاتێك نزیك بوویەوە وباوکی چاوی پێکەوت بە شڵەژاوی ڕایکردە لای و کەوت و ئینجا هەستایەوە و کوڕەکەی ماچ کرد. ٢١کوڕەکەی پێی گوت: ئەی باوکە من هەڵەم کرد بەرامبەر بە ئاسمان و تۆ ئیتر شایستەی ئەوە نیم پێم بوترێت کوڕی تۆ. ٢٢ باوکەکە فەرمانی دا بە کۆیلەکانی: جلوبەرگەکانی بۆ بهێنن بالەبەریان بکات لەگەڵ ئەنگوستیلەیەك بۆ پەنجەی جووتێك پێڵاوی بۆ بهێنن هەتا لەپێیان بکات. ٢٣ کام کاوڕە قەڵەوە بیهێنن با سەری ببڕین و بیخۆین و شایی بکەین بەهۆی گەڕانەوەی تۆوە٢٤چونکە ئەم کوڕەم بە مردوو دانابوو ئێستا بە زیندوویی گەڕاوەتەوە بۆ لام. ئیتر دەستیان کرد بە شایی و خۆشی دەربڕین. ٢٥کوڕە گەورەکەی لەناو کێڵگەدا بوو. کاتێك گەڕایەوە و لە ماڵ نزیك بوویەوە گوێی لە دەنگی مۆزیك و سەما بوو ٢٦یەکێك لە کۆیلەکانی بانگ کرد وتی چی ڕوووی داوە؟٢٧ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: براکەت گەڕاوەتەوە و باوکت کاوڕە قەڵەوەکەی سەربڕیوە چونکە بە سەلامەتی گەڕاوەتەوە بۆ لای. ٢٨بەوهۆیەوە زۆر تووڕە بوو نەیویست بچێتە ژورەوە. بەو هۆیەوە باوکی هاتە دەرەوە داوی لێکرد بێتە ژورەوە. ٢٩ ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: ئەوەتا من چەندساڵێکە خزمەتت دەکەم و هەرگیز لە فەرمانت دەرنەچوم بەڵام تۆ هیچت پێنەبەخشیوم هەتا لەگەڵ هاوڕێکانم دڵخۆشی دەربڕم. ٣٠ بەڵام کاتێك ئەم کوڕەت گەڕایەوە کە هەموو سامانەکەتی برد و خەرجی کرد تۆ کاوڕی بۆ سەردەبڕیت و خۆشی و شادی دەردەبڕیت. ٣١ کوڕەکەم تۆ هەمیشە لەگەڵمدایت هەرچیم هەیە هی تۆیە. ٣٢ بەڵام پێویست بوو خۆشی دەربڕین چونکە ئەم برا ونبووت گەڕاوەتەوە کە بە مردوومان دانابوو هێشتا زیندووە)). ئینجیلی لۆقا ١٥/٣٢.

[٤٦] ئینجیلی مەتتا: ٣٩/٥.

لێدەکەن![47]. لەکاتێکدا هەموو جیهان وابەباش دەزانن مرۆڤ هاوڕێکانی خۆشبوێت و ڕقی لە دوژمنانی بێت. ئەو پێمان دەڵێت ألله خۆر هەڵدێنێت و باران دەبارێنێت بۆ خراپەکاران و چاکەخوازان بەبێ جیاوازی[48]، لەکاتێکدا جیهان ئەم کارە ناکات بەشی هەموو کەسێك بەیەکسانی نادات. ئەو پێمان دەڵێت زۆرێك لە لەشفرۆشەکان و دەربەدەرکراوان دەچنە ناو مەلەکوتی ألله لەپێش زۆربەی کەسە باشەکان بە ڕووکەشی واتە دووڕووەکان[49]هەروەها پێمان دەڵێت ڕێگای دەربازبوون زۆر بچوکە[50]هەروەها پێمان ڕادەگەیەنێت زۆر گرنگی نەدەین بە خۆراك و پۆشاك، باوەکو باڵندەکان بیربکەینەوە: نە دانەوێڵە پاشەکەوت دەکەن بە هەڵدەسن بە چاندنی، بەڵام بەهۆی متمانەبوونیان بە ألله هەر ئەو ڕزق و ڕۆزییان پێ دەدات[51].

ئەو پێمان دەڵێت تێپەڕینی حوشتر بەناو کونە دەرزیدا ئاسانترە لەوەی دەوڵەمەندێك بچێتەناو مەلەکوتی ألله[52] جیهان سەرسامە بە سامان و دارایی بەرز دەینرخێنێت. ئەو پێمان دەڵێت کەسانەی خۆشبەشت ئەوانەن کە بەبەزیین و دڵیان پاکە[53]. بەڵام جیهان وادادەنێت خۆشبەختەکان کەسانی دەوڵەمەند و بەدەسەڵات و خاوەن پلەوپایەن. فەیلەسوفی ڕوسی نیکولای برادابیف دەڵێت: ((بای سەربەخۆیی هەڵدەکات لەڕێگەی ڕێنماییەکانەوە کە جیهان دەهەژێنێت و وامان لێدەکات ئارەزوی دواخستنی کارەکان بکەین و بڵێین: هێشتا زووە، هێشتا زووە!)). هـ. ج. ویلز لەسەر حەقە کاتێك دەڵێت: ((ئەو پیاوە جۆرێك لە شێتی تێدابوو، یان هێشتا دڵەکانمان بچوکترن لەوەی بەرگەی پەیامەکەی بگرن!)).

بۆ جاری دووەم پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سەر بابەتە سەرەکیەکە کە ئەو ڕێنماییانە ڕوونی دەکەنەوە. هەموو شتێك کەل زاری یەسوع دەهاتەدەرەوە، ڕووکاری هاوێنەیەکی بەهێزی دروستدەکرد کە دەیەوێت چەقبینینی ئاگایی مرۆیی چڕبکاتەوە لەسەر گرنگترین ڕاستیەکانی ژیان: خۆشەویستی گشتگیری ألله بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، پێویستە مرۆڤ بۆ قوبوڵکردنی خۆشەویستی و بەخشینی بەوانەی دەوروبەری. یەسوع لە هەڵبژاردنیدا ألله ی خۆشدەویست کە پێداگری دەکرد لەسەر ڕزگارکردنی مرۆڤەکان، ئەو لە جوولەکە بوو بەڵام هوڕایان نەبوو وەك بینیمان ڕێگەی نەدا بە یاسای بەپیرۆزدانان، دواتر وتی ئەم کارە ڕێگری دەکات لە ڕەحم و بەزەیی ألله، هەروەك باسکراوە لە چیرۆکی ئەو شوانەی کە دەستبەرداری نەوەدونۆ مەڕەکەی بوو وای مەڕێکی کەوت کە ون بوو[54] یەسوع هەوڵدەدات ئەو خۆشەویستیەمان بۆ بگوازێتەوە کە ألله هەیەتی بەرامبەر بە هەموو تاکێك لە مرۆڤەکان. بۆئەوەی دەرکبکەین بەو خۆشەویستیە و لێیگەڕێین بچێتەناو مۆخی ئێسکمانەوە، پێویستە لەسەرمان بە تاکە ڕێگایەك وەڵام بدەینەوە: ئەوەش سوپاسگوزاری تەواوە بۆ بەزەیی و بەخشینەکانی ألله.

تاکە ڕێگا بۆئەوەی مانایەکی دروست بدۆزینەوە بۆ ئامۆژگاریەکانی یەسوع سەبارەت بە چۆنیەتی ژیان، بریتیەلەوەی کە سەیری ئەو ئامۆژگاریانە بکەین وەك ئەوەی لەو تێگەیشتنی خۆشەویستیەوە هەڵقوڵابن کە ألله هەیەتی بەرامبەر بە مرۆڤەکان، خۆشەویستیەك کە بەپێی کارەکانی مرۆڤ نیە کە وەکو پاداشتێك بێت.

---

[47] ئینجیلی مەتتا: ٥/٤٤.

[48] ئینجیلی مەتتا: ٥/٤٥.

[49] ئینجیلی مەتتا: ٢١/٢٨-٣٠.

[50] ئینجیلی مەتتا: ٧/١٣-١٤

[51] ئینجیلی مەتتا: ٦/٢٥-٣٠.

[52] ئینجیلی مەتتا: ١٩/٢٤.

[53] ئینجیلی مەتتا: ٥/٤-٨.

[54] ئینجیلی مەتتا: ١٨/١٢-١٤.

پێویستە جلەکنمان ببەخشین بەو کەسانەی پێویستیانە بۆچی؟ چونکە ألله هەموو شتێکی پێ بەخشیوین بەبێ هیچ بەرامبەرێك. پێویستە لەسەرمان ئەوەی میلێك بەرەوڕوومان دێت ئێمە دوو میل بەرەو لای بچین. بۆچی؟ چونکە لە ناخەوە دەزانین ألله چاوپۆشی لێکردووین و خۆڕاگربووە لەگەڵمان بۆ ماوەی لەوە درێژتر، هەروەها نزا و پاڕانەوە بکەین بۆ ئەو کەسانەی زوڵمیان لێکردوین؟ پێویستە لەسەرمان بەو کارە هەستین هەروەك یەسوع دەڵێت: ((بۆئەوەی ببنە بەندەی خودا پێویستە وەك ئەو کە خۆر هەڵدێنێت بەسەر پیاوچاك و خراپەکاراندا هەروەها باران دەبارێنێت بەسەر زاڵم و زوڵملێکراواندا. چونکە ئەگەر ئەوانەتان خۆشویست کە خۆشیان دەوێن چ پاداشتێکتان هەیە؟ ئایا ئەوانەی سەرانە لە خەڵکی وەردەگرن بەهەمان شێوە نین؟ئەگەر تەنها سڵاوتان لە براکانتان کرد ئەوا چ جیاوازیەکتان هەیە لەگەڵ وەسەنیەکان؟ کەوات ە ئێوە هەوڵبدەن کامڵ بن، هەروەك ئەوەی کە لە ئاسمانەکان کامڵە!))(ئینجیلی مەتتا: ٥/٤٣-٤٨).

ئێمە کاتێك دەڵێین ئەم ڕەوشتانە بەمانای کامڵبوون دێت لەبەرئەوەیە داوامان لێدەکات کە هەمووانمان خۆشبوێت بەبێ هیچ مەرجێك. بەڵام یەسوع لەوەڵامدا دەڵێت ئەو هۆکارەی کە هانمان دەدات بۆ ئەو جۆرە ڕەوشتە بریتیەلەوەی بەبێ تاقیکردنەوەی بەرامبەر خۆشەویستی پێ ببەخشین بەو جۆرەی کەلەلایەن ألله ئاراستەمان دەکرێت، تەنانەت ئەگەر هەستمان کرد کاریگەری خراپی دەبێت لەسەرمان، پێویستە پۆشاکەکانمان ببەخشین بە هەژاران کاتێك خۆمان پێویستمان پێیەتی، یەسوع یاسایەکی دادنەنابوو بۆ خۆپاراستن و چارەسەری کێشە ئەستەمەکان. ئەو شتەی دەیویست بیخاتەڕوو بریتیە لەوەی پێویستە بە هانای هەمووانەوە بچین بەبێ جیاوازی تەنانەت ئەوانەی هاوڕانین لەگەڵ بیروباوەڕەکانماندا، هەروەها پێویستە بیرنەکەینەوە لەوەی کە پێویستە بیبەخشین بڕەکەی چەندە زۆرە یان کەم.

هەتا ئێرە دواین لەبارەی کارەکاتنی یەسوعەوە لەگەڵ گوفتارەکانیدا. بەڵام ئەمە بەتەنها بەس نیە بۆئەوەی وا لە قوتابیەکانی بکات بەوجۆرە کاریگەر بن بە کارەکانی ئەگەر ڕەهەندی سێیەم زیادنەکەین بۆ کارەکانی؟ ئێمە سەرکەوتنی ئەومان بینی. دیستوفیسکی دەڵێت: ((لە جیهاندا تاکە کەسایەتیەك هەیە کە خاوەن جوانیەکی کەموێنە بێت: ئەویش مەسیحە. ئەو کەسایەتیە خۆشەویستە بەشێوەیەکی بێسنور. . . موعجیزەیەکی ناکۆتایە)).

بەدڵنیاییەوە کاریگەری ڕێنماییەکانی یەسوع تەنها بۆ فێربوون نیە بەڵکو لەبەرئەوەیە کە بەرجەستەکراو بوون لە ژیانیدا، وەك لە گێڕانەوەکانی ناو ئینجیلدا بەدەستمان گەیشتون هەموو ژیانی بریتی بوو لە بەخشین و خۆشەویستی بەبێ هیچ بەرامبەرێك، مرۆڤ تیایدا ناگەڕێت بۆ هیچ بەرچەوەندیەك. گەورەترین بەڵگە لەسەر خۆنەویستیەکەی، ئەستەمە بەوردی بزانین یەسوع چۆن بیری دەکردەوە لەوکاتەدا لەبارەی خۆیەوە. گرنگیدانەکەی لەبارەی ئەوە بوو خەڵکی چۆن بیردەکەنەوە لە ألله. دروستە ئەمە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێمان ڕادەگەیەنێت کە یەسوع خۆی بە بەندەی خودا دەزانی نەك خودا: ((بۆچی بە باشم دەزانن هیچ کەس باشتر نیە لە ألله؟))(i). ناتوانین تێبگەین لەوەی کە یەسوع دەیوت لەبارەی سادەیی و خۆنەویستیەوە، بەبێ ئەوەی هەست بکەین بەوەی چەندە یەسوع دوور بوو لە خۆبەزلزانین و بوغراییەوە. هەمان شت سەبارەت بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزیەکەیەوە. ئەوەی وتی لەبارەی ئەم بابەتەوە ناکرێت بوترێت تەنها لەلایەن کەسێکەوە نەبێت کە ژیانی خاڵی بێت لە فریودان. ڕاستی سەبارەت بە ئەو وەکو هەوا وابوو.

یەسوع دەردەوەیت لەنێو لاپەڕەکانی ئینجیلدا وەك پیاوێکی بەهێز و کامڵ. تێکەڵ بە خەڵك دەبوو ئەوانیش خۆشیاندەویست بە هەمان شێوەی خۆشەویستی ئەو بۆیان، کاریگەری هەبوو لەسەریان بەهۆی خۆشەویستی و بەزەییەکەیەوە.
ئەوان هەمیشە دوای دەکەوتن گوێیان لە ئامۆژگاریەکانی دەگرت، لەبەرامبەردا یەسوع بەهانایانەوە دەچوو بەبێ جیاوازی لەنێوان هەژار و دەوڵەمەند، گەورە و بچوك. بینیمان ئەو گوێی نەدەدا بە بەربەستەکان و چینەکانی کۆمەڵگە. ئەو منداڵانی خۆشدەویست. ئەو ڕقی لە زوڵم و زۆرداری بوو کە دەکرا لەلایەن ئەوانەی ناوی دەبردن بە کەمتر لەوانی تر(ئینجیلی مەتتا ٤٠/٢٥).
ئەو ڕقی بوو لە ڕوپامایی و دووڕوویی، ئەو بەتەواوی خۆی لەبیرکردبوو، وازی لە ژیان هێنابوو بۆئەوەی بە تەواوی لەژێر ئیرادە و خواستی ألله دا بێت، وەك یەکێك لە سرودەکاندا دەیڵێن: ((ئێمە پیرۆزی ئەوام نبینی. . . پڕە لە بەخشین و ڕاستی))(ئینجیلی یۆحەنا: ١٤/١). لەدوای چەند سەدەیەك ئەم شێوازە ئەم خاڵەی دەربڕی:

(i)ئینجیلی مەتتا: ١٧/١٩.

هەندێك دەڵێن هەرکاتێك ئەو بەشە هات
کاتێك ئاهەنگ دەگێڕدرێت بە بۆنەی لەایکبوونی ڕزگارکەرەکەمانەوە
بولبولی بەرەبەیان دەخوێنێت
دواتر دەڵێن ناکرێت ڕۆح لە جەستەی خاوەنەکەی بێتە درەوە
لە شەوانی ئارامدا ئەستێرەکان پێکدانادەن
تەنانەت جادووگەرەکان توانای جادووییان لەدەست دەدەن
کاتە پیرۆزەکان بەمشێوەیە جوانن.

## کۆتایی و سەرەتا

ئـەو شـێوازەی کـە پەیامەکـەی یەسـوع لەسـەر زەوی کۆتـایی پێهـات لـەلای هـەماون زانـراوە. لـەدوای تێکەڵبوونی لەگەڵ نەتەوەکەی لەکاری فێرکردندا بۆ چەند مانگێك، دواتر دەستبەسەرکرا و لەسێدارەدرا.

دەکرا ئەمە کۆتایی چیرۆکەکە بێت. مێژوو لێوانلێوە لەو کەسانەی توانای دۆزینەوەی ڕۆحانیان هەیە چەند بنەمایەکیان هەبوو لە ژیاندا. بەڵام لەم حاڵەتەدا مردنی یەسوع تەنها سەرەتایەکە. لەماوەیەکی کورتدا شوێنکەوتوانی دەیانوت ئەو لە قەبرەکەی دووبارە هەستاوەتەوە.

ئینجیلەکانی پەیمانی نوێ وردەکاری کەممان پێدەدەن لەبارەی ئەوەی لەو کاتەدا ڕووی دا واتە لە دوای لەخاچدان، لەڕاستیدا شوێنوەتوانی باوەڕیان وابوو مەرگ ئەوی بەتەواوی گیرنەداوە. دەیانگێڕایەوە کە خۆی نیشان داون وەك کەسێك کەلە ژیانیدا دیبوویان بەڵام بە شێوازێکی نوێ. ناتوانین ئەو شێوازە نوێیە دیاری بکەین، وەك لە یەکێك لە گێڕانەوەکاندا هاتوە ئەو دەرکەتوە بەشێوەیەکی جەستەیی خواردنی دەخوارد و ڕێگەی دەدا بە قوتابیەکانی دەست بدەن لە جێگای برینەکانی لەکاتێکدا گێڕانەوەکانی تر زیاتر خەیاڵی بوون، دەیانوت ئەو بە نێو دەرگا داخراوەکاندا دەڕۆیشت. گەر بمانەوێت بە وەفا بین بۆ گێڕانەکانی ناو ئینجیل ئەوا ئەم گێڕانەوانە بەڕوونی ئەوە پیشان دەدەن یەسوع بەو شێوازە جەستەییە نەبوو کە لە ژیانیدا هەیبوو چونکە ئەمە گەڕانەوە نەبوو بۆ ژیان. بەڵکو لەبری ئەوە ئەمە ژیانی نوێی یەسوع بوو، بەڵام زۆربەی کات نەبینراو بوو. ئاشکرایە شوێنکەوتوانی یەسوع بەشێوازێکی نوێ هەستیان پێ دەکرد. بەشێوەیك وایان دەزانی لە هەموو شوێنێکدا ئەو بوونی هەیە.

باوەڕهێنان بە هاتنەوەی یەسوع بووە هۆی بەرهەم هێنانی کڵێسا و زانستی ئایینی مەسیحی. ئەگەر ویستمان دەرکبکەین بە هێزی ئەو بیروباوەڕە مەزنە بۆ هاتنەوەی مەسیح، ئەوا پێویستە لەسەرمان تێبینی ئەوە بکەین تەنها پەیوەندیدار نیە بە لایەنی خێر و چاکەی گەردونەوە بەتەنها، هەروەها جەخت لەوە دەکاتەوە کە زۆر بە ئاشکرایی دەردەکەوێت کە خێر و چاکە لە کۆتاییدا براوەیە. ئەگەر لە خاچدانی جەستەکەی کۆتایی بێت، ئەوا ئەو چاکەخوازیەی یەسوع بەرجەستەی دەکرد بە جوانی دەمێنێتەوە. بەڵام بایەخی خێر و چاکەخوازی لەکوێدایە کاتێك سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت لەسەر زەوی، هێز هێزێك لەژێر ڕکێفیدا نیە؟ هاتنەوەی مەسیح باری گەردونی ژێروژوور کرد کاتێك خێر و چاکەی یەسوع خرابووە نێو خاچەوە، لەبری ئەوەی ئەو چاکەیە بەلاوازی بمێنێتەوە لەلای قوتابیەکانی بەپێچەوانەوە ئەو چاکەیە وا دەرکەوت کە بەهێزە و سەردەکەوێت بەسەر هەموو شتێکدا، بەڵکو بەسەرکەوتوویی دەرکەوت بەسەر ئەو شتەی کە لەلای خەڵك بە کۆتایی هەموو زیندوویەك دادەنرێت ئەوەش مردنە. ((ئەی گۆڕ کوا سەرکەوتنەکەت؟ ئەی مەرگ کوا پێوەدانەکەت؟)).

ئەم پەیامە چۆن دەستیپێکرد؟ چۆن دواجار دەستیگرت بەسەر جیهانی دەریای ناوەڕاست؟ ئەمە لێرەدا قسەی لەسەر دەکەین:

## موژده

باوەڕهێنان بەوەی یەسوع بەردەوام بووە لە ژیانی بەشێك لە شوێنکەوتوە دڵشکاوەکانی گۆڕی بۆ یەکێك لە کۆمەڵە چالاکەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ئەو کەسانەی کە قسە زان نەبوون بوونە کەسانی لێهاتوو بلیمەت لە قسەکردندا، دەستیان پێکرد لە شارستانیەتی ئیغریقی ڕۆمانیەوە قسەیان دەکرد لەبارەی شتێکەوە کە ناوی دەبرا بە ئینجیل، ئەمە وشەیەکی یۆنانیە ئەگەر ماناکەی وەربگێڕین واتا موژدە. دەستیان پێکرد لە ئۆرشەلیمەوە قودس لەماوەی نەوەیەکدا ئەم پەیامەیان بڵاو کردەوە لە هەموو شارێکی گەورەی ئەو ناوچەیەدا.

ئەو موژدەیە چی بوو کە بووە مامۆستایەك بۆ سەرەتای مێژووی ڕۆژئاوایی کە دابەشیکرد بۆ ساڵەکانی پێش زایین و دوای زایین، دواتر بووە هۆی دروستکردنی کڵێسای مەسیحی، ئایا موژدەی ڕێنماییەکانی یەسوع یاسای زێڕین[55]، ئامۆژگاری شاخەکە[56] بوو؟ نەخێر. پێشتر ئاماژەمان کرد بۆ هەموو ئامۆژگاریەکی ناو ڕێنماییەکانی یەسوع لە ئەدەبیاتی ئاینی ئەوانەی پێشوودا بوونی هەبووە. بولس نامەکەی کورتکردوەتەوە لە مەترسیەکانی کڵێساکانی سەرەتادا، دەزانێت یەسوع چ کارێکی فێرکردبوو وێڕای ئەوە هیچ شتێکی وەرنەگرتبوو لە لە وتەکانی یەسوع. وەك ئاشکرایە هەواڵە دڵخۆشکەرەکان بۆ ئەو بنەما ئەخلاقیەکانی یەسوع خودی خۆی نەبوو تەنانەت شێوازی ژیانەکەی نەبوو کە ئەو بنەمایانەی تیادا بەرجەستە کرابوو بەڵکو شتێکی تەواو جیاواز بوو.

ئەتواین ئەو شتە جیاوازە نزیك بکەینەوە لەڕێگەی ئەم هێمایەوە. ئەگەر لە دەورو بەری دەریای ناوەڕاست بژین لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سەردەمی مەسیحیدا، لەوانەیە چەند ڕوشاندنێك لێرە و لەوێ لەسەر دیواری ماڵەکان بینرابێت کە بەشێوەی ماسییەك دروستکرابوو.

تەنانەت ئەگەر لە چەند شوێنێك بمانبیایە پشتگوێمان دەخست وەك وێنەیەکی بێ بایەخ سەیرمان دەکرد، بەتایبەت ئەو ناوچانە زۆربەی کات ماسیان تیادا ڕاودەکرا بەشێوەی ڕۆژانە. بەڵام ئەگەر مەسیحی بووینایە ئەو وێنانەمان بە نیشانەی هەواڵی دڵخۆشکەر دادەنا. سەری ماسیەکە کەلەسەر دیوارەکە وێنەی کێشرابوو ئاماژەبوو بۆ شوێنی هەبوونی چەند کۆمەڵەیەکی مەسیحی کە چاوپێکەوتنی نهێنیان ئەنجام دەدا لەژێر زەویدا، چونکە لەو ساڵانەدا شوێنی مردوەکان تاکە جێگایەك بوو مەسیحیەکان دەیانتوانی تیایدا کۆببنەوە، چونکە کاتێك بە کەسێك دەوترا مەسیحی دەبوایە بخرایەتە بەردەمی شێرەکان بۆئەوەی وەك نێچیرێك بیخۆن، یان بە زیندویی دەیانسوتاند، لەبەرئەوە مەسیحیەکان ناچاربوون بە هێمای ئاڵۆزتر لە خاچ پێکەوە بدوێن یان کۆببنەوە، ماسی یەکێك بوو لەو هێمایانە چونکە وشە یۆنانیەکان بۆ ناوی ماسی هەمان وشەی یۆنانی بوو بۆ ڕستەی: ((یەسوعی مەسیح، کوڕی خودا، ڕزگارکەر)). ئەمە موژدەیەك بوو کە کورتدەکرایەو لە وێنەیەکی هاوشێوەی ماسیدا کەلەسەر دیوارەکان دەیانکێشا.

---

[55] مەبەست لە یاسای ئاڵتونی لە فێرکردنی یەسوعدا: ((هەموو ئەوەی دەتانەوێت خەڵکی لەگەڵ ئێوەدا ئەنجامی بدات ئێوەش وەها بن لەگەڵیاندا چونکە ئەمە ڕەوشتی لە پێغەمبەرەکانە. ))ئینجیلی مەتتا ١٢/٧.

[56] مەبەست لە ئامۆژگاری شاخەکە ئەو ڕاسپاردەیە مەسیح دای بە قوتابیەکانی لەسەر کێوی جەلیل کە بەم شێوەیە دەستیپێکردبوو: موژە بێت لە ڕۆح هەژارەکان چونکە مەلەکوتی ئاسمانەکان موڵکی ئەوانە، موژدە بێت لە خاوەن بەزەییەکان زەوی دەبێتە موڵکی ئەوان. . . ، هەروەها مەسیح تیایدا جەخت دەکاتەوە لە بەرەنگارنەبوونەوەی خراپە بە خراپە بەڵکو بە خێر و چاکە، هەروەها تیایدا گرنگترین ڕێنماییە ئەخلاقیەکانی ڕوونکردوەتەوە کەبە گەوهەری ڕەوشتی مەسیحی دادەنرێت. کەلە ئینجیلی مەتتادایە: بەشی ٥ و ٦ و ٧ و ئینجیلی لۆقا: بەشی ٦/ئایەتەکانی ٢٠-٤٩.

بەڵام ئایا مانای ئەم ڕستەیە چی بوو: ((یەسوعی مەسیح، کوڕی خودا، ڕزگارکەر))؟ لەوانەیە ئەوانەی لەسەر ئەم ڕستەیە پەروەردەکراون و گەورەبوون وەڵامێکی باشیان لەلابێت. بەڵام کاری ئێمە بریتیەلەوەی بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئەم ڕستەیە بۆئەوەی بتوانین تێبگەین لەو سەردەمەدا چ مانایەکی هەبووە بۆ پیاوان و ژنانی ئەو سەردەمە کە بۆ یەکەم جار وتویانە، چونکە هەموو مێژووی مەسیحییەت دروستبووە لە تێگەیشتن لە مانای ئەو ڕستەیە.

هەریەکە لە ئێمە بەانگهێشتکراوە بۆ ڕۆچوون بەناو بیرۆکەو پێناسەکان و زانستی ئایینزانیدا، بەڵام باشتر وایە بەڕێگایەکی تر دەستپێبکەین. بیرۆکەکان گرنگن لە ژیاندا بەڵام بەدەگەن دەمانگەیەنن بە خاڵی دەستپێکردن، چونکە خودی ئەم بیرۆکانە دروستدەبن لە ئەزمون و ڕوداوەکانەوە، کاتێك دادەبڕدرێت لە شوێنەکەی و هەڵدەکەنرێت وەك درەختێك. ئەوا دەستەوسان دەمێنینەوە لەبەردەم تێگەیشتن لە لاهوتی مەسیحی ئەگەر نەتوانین ئەزمونەکەی ببینین کە ئەو بیرۆکە ئایینیانە هەوڵیانداوە شیبکەنەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا.

ئەوانەی گوێیان لە قوتابیەکانی یەسوع بووە یان شوێنکەوتوانی کە موژدە بڵاودەکەنەوە بۆ یەکەمجار، کاریگەر بوون بەوەی بینیان لە حاڵی خۆیان زیاتر لەوەی بیستبوویان لە وتەکانی. ئەوان ژیانیان بینی کە دەگوازرایەوە لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دی لە پیاوان و ژنان کە زۆر ئاسایی بوون لە هەموو ڕووەکانەوە، جگەلەوەی لەڕاستیدا وادەردەکەوتن کە نهێنی ژیان بە ئاشتی و دڵخۆشیەوەیە. بێدەنگی تیایاندا ڕەنگی دابویەوە لەگەڵ سادەیی و شادومانی کە گوێگرانیان نەیانبیستبوو لە هیچ جێگایەکی تردا. چەندین پیاو و ژنیان لەبەردەمدا بوو لەو پڕۆژەیەدا سەرکەوتو بوو بوون، کە هەموو مرۆڤێك دەیەوێت سەرکەوتو بێت تیایدا، ئەویش پڕۆژەی خودی ژیانە.

بەشێوەیەکی دیاریکراو، دوو سروشت هەبوو لە ژیانیاندا. یەکەمین خۆشەویستی ئاڵوگۆڕکراوە، یەکێك لە کۆنترین تێبینیەکان لەبارەی مەسیحیەکانەوە کە بەدەستمان هێنا لەلایەن کەسێکی نەناسراوەوە: ((سەیربکە ئەو مەسیحیانە چۆن یەکتریان خۆشدەوێت)). ئەو شتەی خۆشەویستی ئاڵوگۆڕکراوی نێوانیانی تەواو دەکرد بریتیبوو لە نەمانی بەربەستە کۆمەڵایەتیەکان، ((هاوڕێیەتی و برایەتی نێوان خەڵك بەشێوەیەکی یەکسان بوو))، هەروەك یەکێك لە زاناکانی پەیمانی نوێ باسی دەکات(٦).

لێرەدا چەند پیاو و ژنێك هەن تەنها ناڵێن هەریەکەیان یەکسانە لەگەڵ ئەوی تردا لەبەردەم ألله دا بەڵکو جۆرە ژیانێك دەژین ئەو بیرکردنەوەیە بەرجەستە دەکات بەشێوەیەکی پراکتیکی تەواو. بەربەستە کۆمەڵایەتیەکان و ڕەگەز و پلەو پایەی کۆمەڵایەتی هیچ بایەخێکی نەبوو لەلایان. چونکە لە مەسیحیەتدا جوولەکە و نەتەوەیی، نێر و مێ، کۆیلە و ئازاد هیچ جیاوازیەکیان نەبوو بەڵکو وەك یەك سەیر دەکران. ئی. شیلیبیکس دەڵێت: (مرۆڤێك دڵتەنگ بێت لە سەردەمی یەسوعدا شتێکی ئەستەمە و بووونی نیە))(٧)، ئەمە ڕێنمونیمان دەکات بەرەو تایبەتمەندیەکی تر کە مەسیحیە یەکەمینەکان پێی ناسرابوون. جارێك یەسوع بە خوێنکارەکانی گوت: ((بەم شێوەیە قسەم لەگەڵ کردن بۆئەوەی شادومانیم لە ئێوەدا جێگیر بێت و خۆشیەکەتان کامڵ ببێت))(ئینجیلی یوحەنا ١١/١٥)، وا دەردەکەوت ئەو شوێنکەتوانە ئەو ئامانجەیان پێکابوو بەشێوەیەکی دروست. ئەو مەسیحیانە ژمارەیانزۆر نەبوو بەڵکو کەم بوون. هەروەها دەوڵەمەند و خاوەن دەسەڵات نەبوون بەڵکو بەپێچەوانە بەرەنگاری دوژمنکاری و کێشە دەبوونەوە زیاتر لە هەموو ژن و پیاوێکی ئاسایی.

ویڕای ئەوە لە کاتی دادگایی کردنیاندا خاوەنی ئاشتەواییەکی ناوەکی بوون و دڵیان خۆش بوو هیچ نیگەران و دڵگرانیەك ڕووی تێنەکردبوون. بولس نمونەیەکی زیندوە لەسەر ئەوە، ئەو مرۆڤێك بوو هەمیشە بەرەنگاری گاڵتەپێکردن و سوکایەتی دەبوویەوە، لە شارێکەوە بۆ یەکێکی تر دەبرا کەشتیەکەیان تێکدەشکاند، زیندانی دەکرا، بە قامچی لە پشتی دەدرا هەتا هەموو پشتی دەبووە شوێن قامچی، ویڕای ئەوە ژیانی لێوان لێو بوو لە شادی و کامەرانی: ((ئەو شادومانیەی کە ناتوانرێت وێنابکرێت))((سوپاس بۆ ئەو پەروەردگارەی کەسەرکەوتنی پێ بەخشین)) ((لە هەموو شتەکاندا ئێمە زیاترین لە سەرکەوتوەکان))((الله فەرمانی داوە بە ڕووناکی کە هەڵبێت و شوێنە تاریکەکانی ناو دڵەکانمان ڕووناك بکاتەوە)).

دڵخۆشی مەسیحیە یەکەمینەکان بەشێوەیەك بوو وێنا نەدەکرا، هەروەك دەردەکەوێت لە بەشی پێنجەمی پەیامی بولس بۆ دانیشتوانی ئەفسس، ئەوان سرودیان دەوت بە یاسای بڕیاردراو نا بەڵکو هەڵقوڵاوی ئەزمونەکەیان بوو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کە بەرگری لێ نەدەکرا.

ژیان بۆ ئەوان تەنها تێکۆشان نەبوو بەڵکو بووە سەرکەوتنێکی کە دەرکیان پێکردبوو و تیایدا دەژیان. ئەو شتە چیبوو ئەو کامەرانیەی خستبووە دڵی ئەو مەسیحیە یەکەمینانەوە؟ ئەو هەڵسوکەوتانە لە تەواوی جیهاندا خوازراوە و خۆشەویستە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە چۆن دەتوانین بەدەستی بهێنین؟. شیکردنەوەی ئەمە تا ئەو ڕادەیەی توانیمان کۆی بکەینەوە لە تۆماری پەیمانی نوێدا بریتیەلەوەی سێ قورسایی هەن هەڵگرتنیان ئاسان نیە، هەڵگیراون بەشێوەیەکی کتوپڕ لەسەر کۆڵیان.

یەکەمینیان ترسە، یەکێك لەوانە ترسان لە مەرگە. وتەیەکی پزیشك کارل جەنگ هەیە کە دەڵێت هەرگیز نەخۆشێکی تەمەن سەرو چلساڵی نەبینیوە کێشەکەی ئەوە نەبێت کە لە مەرگ نزیك بووەتەوە. ئەو هۆکارەی وای لە مەسیحیە یەکەمینەکان کرد لە شێرەکان نەترسن نەترسانیان بوو لە مەرگ، بەڵکو بە سرود گوتنەوە دەچونە ئەو جێگایەی شێرەکانی لێبوو، باوەڕیان بەوە هەبوو مەسیح پێی وتبوون: ((مەترسن من لەگەڵتانم))[57].

قورسایی دووەم کەلەسەر شانیان هەڵگیرابوو تاوان بوو ((هەستکردن بە تاوان و گوناه)).

ئەقڵانیەکان بیرۆکەی تاوان لە حاڵی کاڵبوونەوە و نەمان دا دەبینن، بەڵام زانایان هاوڕانین لەگەڵیاندا. ئەگەر دانمان نا بە بوونی هەستکردن بە تاوان لە ناخماندا یان نا ئەوە هەستپێکردنێکە هەڵکۆڵراوە لە قوڵایی حاڵەتی مرۆییدا، مرۆڤێك نیە بە نمونەیی دابنرێت سەبارەت بە ویژدانی بەشێوەیەکی کامڵ. ئەمە کورتنەکراوەتەوە لەسەر ئەوەی ئێمە کەمتر نمونەیین لەوەی ویژدانمان بەسەرماندا دەیسەپێنێت، بەڵکو ئێمە شکست دێنین لەناو خودی خۆماندا کاتێك دەستبەرداری بەهرەکانمان دەبین بەبێئەوەی پەرەیان پێبدەین، بە وەزهێنانمان لە هەلەکان و هەتا لەدەستیان دەدەین. لەوانەیە بتوانین پەشیمانی لە دەرونمان دووربخەینەوە لەبرئەوەی ئازارمان نەدات، بەڵام کاتێك کاتەکانی شەو دێت و خەومان لێ تێکدەدات:

. . . . . . . ئەو ئازارە پەرتکەرە بۆ دوبارە نواندنی ڕوداوەکان

بۆ هەموو ئەوەی پێی هەستاویت، هەموو ئەو شەرمەزاریەی هەستت پێکردوە

ئەو پاڵنەرانەی کە دۆزیتنەوە لە کاتێکی درەنگدا، بۆ ئاگایی

بۆ ئەو شتانەی خراپ بەکارهێنران و ئازاری ئەوانی تری دا

---

[57] ئاماژەیە بۆ دوا وتەی مەسیح: ((ئەوەتا من لەگەڵتانم لە هەموو ڕۆژەکاندا هەتا کۆتایی هانتی دونیا))ئینجیلی مەتتا ٢٨/٢٠

وێڕای ئەوە تۆ داتدەنا بە نمونەیەك بۆ كاری چاكە.
ت. ئێس. ئیلیۆت t. s. eliot
ئەگەر مرۆڤ ئازاد نەكرێت لە هەستكردن بە تاوان، ئەوا ئەم جۆرە هەستپێكردنە وزە بەدیهێنان كەم دەكاتەوە. بەڵكو دەكرێت بیگەیەنێتە حاڵەتی لەوە خراپتر وەكو حاڵەتی توڕەبوون لە خود و ئیدانەكردن و سەرزەنشت كردنی خود كە دواجار دەیبات بەرەو ئەوەی كۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت بە خۆكوشتن. بولس زۆر بەهێز هەستی دەكرد بە تاوان پێی ئەوەی لێی دەرباز ببێت: ((من چەندە مرۆڤێكی سەركەشم! كێ ڕزگارم دەكات لەم جەستەیەم جگە لە مەرگ؟))(نامەیەك بۆ خەڵكی رومە٧/٢٤).
بەڵام سێیەم ئازادبوون كە ئەو مەسیحیە یەكەمینانە هەستیان پێكرد و تاقیانكردەوە ئازادبوونیان بوو لە سنورە پەیوەستەكان بە منی باڵاوە. بەڵگەیەك نیە بانگهێشتمان بكات بۆ ئەوەی وادابنێین پێش ئەم ژیانە تازەیەیان ئەو پیاو و ژنانە زیاتر گرنگیان داوە بە خودی خۆیان نە بە ئەوانی تر. بەڵام ئەم گرنگیپێدانە بە خود هەرچەندە لاواز بێت، بەس بوو بۆیان هەتا وایان لێبكات هەستبكەن بەوەی خۆشەویستیان سنوردارە. ئەوان دەیانزانی ((نەفرەتی مرۆڤایەتی ئەوە نیە كە خۆشەویستی بكات، بەڵكو خۆی خۆشبوێت بە ڕێیەكی پێویست، بەڵام هەرگیز بەپێی پێویست خۆی خۆشناوێت بەڵكو زۆرجار لەوە زیاترە واتە خودپەرستە))(٨).
ئێستا ئەو نەفرەتە لابراوە لە دەرونیاندا لە ڕەگو ڕیشەوە بەشێوەیەكی كارا.
لەئێستادا قورس نیە بزانین چۆن ئازاد دەبین لەو هەستكردن بە تاوان و ترس و خودپەرستیە، دەشێت جۆرە هەستپێكردنێكمان پێ بدات بۆ سەرلەنوێ لەدایكبوونەوە. ئەگەر كەسێك هەبێت لەو بەربەستانە ئازادمان بكات ئێمە بەو كەسە دەڵێین ڕزگاركەر، مەسیحیەكان چۆن دەرباز بوون لەو قورسایی و ئاستەنگانە؟ ئەو كەسەی ناتراوە یەسوع چ پەیوەندیەكی هەیە بەو كرداری ڕزگاركردنەوە؟ تاكە هێز كە دەتوانێت ئەو گۆڕانكاریانە بەرهەم بهێنێت، بەو شێوەیەی كە باسمان كرد، بریتیەلە هێزی خۆشەویستی. مرۆڤایەتی پێویستی بە چاوەڕوانی بوو هەتا سەدەی بیستەم تا بزانێت كە وزەی خۆر قەتیسماوە لەناو گەردیلەیەكدا، بۆئەوەی ئەو وزەیە ئازاد بێت پێویستە لە دەرەوە ئەو گەردیلەیە بۆردومان بكرێت. هەروەها لەناو ناخی هەموو بوونەوەرێك مرۆییدا بەشێك لە خۆشەویستی بوونی هەیە كە زیندانی كراوە كە بەشداری پێدەكات لەگەڵ الله. دەكرێت چالاك بكرێت تەنها لەڕێگەی بوردومان كردنیەوە، مەبەستمان لێرەدا بریتیەلەوەی بە خۆشەویستی بۆردومان بكرێت. پرۆسەكە هەر لە منداڵیەوە دەستپێدەكات كاتێك پێكەنینی دایك بە دەم ڕۆڵەكەیەوە وا دەكات لە منداڵەكەی بە خۆشەویستی وەڵامی بداتەوە. مرۆڤی خۆشویستراو بەرهەم ناهێنرێت لەڕێگەی ئامۆژگاری و ترساندن بە یاساكانەوە. هەستی خۆشەویستی بەرهەم نایەت لە منداڵاندا تەنها كاتێك نەبێت كە خۆشەویستیان پێدەدرێت لەلایەن ئەوانی ترەوە، بەتایبەت گرنگترینیان خۆشەویستی دایك و باوكیەتی ئەوانەی پەروەردەی دەكەن. ئەگەر بمانەوێت قسە بكەین بەپێی زانستی پەرەسەندنی بوونەوەری تاكی ontogeny ئەوا خۆشەویستی دیاردەیەكی وەڵامدراوەیە. ئەمە كاردانەوەیەكی تەواوە.
بەڵكو ئەم نمونەیە یارمەتیمان بدات لە ڕوونكردنەوەی ئەم خاڵەدا بەشێوەیەكی دروست:
گەنجێكی شەرمن هەبوو لە یەكێك لە خوێندنگاكان كاتێك مامۆشتاكەیان هاتە ناو پۆلەوە بۆ پێشكەشكردنی وانەكەی بەم وتەیە دەستیپێكرد: ((دوێنێ چەند ڕستەیەكی واتادارم خوێندەوە كە دەشێت لە ژیانمدا بیریان لێبكەمەوە)). كوڕە گەنجەكە بەتودی لێی دەدا كاتێك مامۆستاكەی نمونەكانی دەگێڕایەوە بۆ

خوێنکارەکان، چونکە لەڕاستیدا گوێی لە وشەکانی بوو کە خۆی نوسیبووی و دابووی بە مامۆستاکەی لە هەفتەی ڕابردودا. کاتێك گەنجەکە ئەم ڕوداوەی گێڕایەوە وتی: ((هیچ شتێکم بیرنایەت لە ماوەی ئەو کاتژمێرەدا ڕوویدابێت هەتا کاتی لێدانی زەنگی کۆتایی وانەکە ڕایچڵەکاندم و لە بیرکردنەوەکانم دەریهێنام. ئەوە ڕۆژێکی خۆش بوو. هێندە شادومان بووم هەرچیەکیان داوابکردایە لێم لەو کاتەدا ڕەتمنەدەکردەوە، چونکە هیچ شتێکم نەدەویست. تەنها دەمویست ببەخشم بەو جیهانەی زۆر شتی پێبەخشیبووم)).

ئەگەر گەنجێك خۆی بینیەوە بەو شێوەیە بەهۆی گرنگیدانی بە مامۆستاکەیەوە بۆ ئەو، کەواتە ئەستەم نیە وێنا بکەین مەسیحیە یەکەمینەکان چیان بدەستهێناوە کاتێك دەرکیان بەوە کرد کە ألله خۆشیدەوێن. لەوانەیە ئەو وێناکردنە لێرەدا شکست بهێنێت، بەڵام لۆژیك و مەنتیق شکست ناهێنێت. ئەگەر ئێمە بە هەمان شێوە هەستمان بەوە کرد کە خۆشەویستین، نەك بەشێوەیەکی تیۆری بەڵکو بەشێوەیەکی چالاك لەلایەن کەسێکەوە هەموو هێز و کاملی لەخۆیدا کۆدەکاتەوە، ئەوا ئەم ئەزمونە خەمەکانمان دەتوێنێتەوە کاتێك هەست بە تاوان دەکەین وامان لێدەکات واز بهێنین لە خودپەرستی. هەروەك کییر کیگارد دەڵێت: ((ئەگەر دڵنیا بم لەوەی هەرچیەك ڕوویدات لە ئێستادا یان لە داهاتودا، هیچ شتێك جودام ناکاتەوە لە خۆشەویستی بێسنور بۆ بوونی ڕەها، چونکە ئەمە خۆشی و شادیەکی بێسنورم پێدەدات)).

خۆشەویستی أللهبە تایبەت ئەو شتە بوو کە ئەو مەسیحیە یەکەمینانە هەستیان پێکرد. ئەوان خۆشەویستی یەسوعیان تاقیکردبووەوە. کاتێك ئەو خۆشەویستیەیان پیٚ دەگەیشتنەدەکرا بوەستێنرێت چونکە بەربەستەکانی ترس و تاوان و خودپەرستی دەتواندەوە بەم جۆرە خۆشەویستیەیان دەوت خۆشەویستی مەسیحی. خۆشەویستی کلتوری دەوروژێنرێت لەڕێگەی باسکردنی تایبەتمەندیە خوازراوەکان بۆ ئەو کەسەی خۆشی دەوێت بەڵام ئەو خۆشەویستیەی کە مەسیح هەیبوو بۆ خەڵك هەمووانی دەگرتەوە یاخیبووان و تاوانباران و دەربەدەرکراوان و سامرییەکان [58]و دوژمنان. خۆشەویستیەك بوو کە چاوەڕوانی وەڵامدانەوە نەبوو بە هەمان خۆشەویستی. لە چەند ڕەستەیەکی ناوازەدا بولس باس لە خۆشەویستی مەسیح دەکات بۆ مەسیحیەکان بەجۆرێك ئەوان بیدەن بەوانی دیکە کاتێك هەست دەکەن پێی. بولس بۆ یەکەم جار بەم شێوەیە باسی دەکرد:

((٤خۆشەویستی زۆر خۆڕاگرە، میهرەبانە. خۆشەویستی ئیرەیی پێنابرێت. خۆشەویستی پێویستی بە شانازیپێوەکرد نیە. ٥بە شێوەیەکی نەشیاو ڕەفتار ناکات، بۆ بەرژەوەندی تایبەتی کارناکات. زوو هەڵناچێت، خراپە نادات پاڵ هیچ کەسێك. ٦بە زوڵم و زۆرداری دڵخۆش نابێت، بەڵکو بە حەق و ڕاستی شادومان دەبێت. ٧ ئەو هەموو شتێك پەردەپۆش دەکات، هەموو چاکەیەك دەخوازێت، بەرگەی هەموو شتێك دەگرێت. ٨ خۆشەویستی هەرگیز لەناوناچێت. بەڵام بەهرەکان بەرەو نەمان دەچن، بەهرەی زمانەکان بەرەو کەمبوونەوە دەچێت، زانست لەناو دەچێت))(نامەی بولس بۆ باوەڕدارانی کورنسوس: ١٣/ ٤-٨).

مەسیحیە یەکەمینەکان ئەو خۆشەویستیەیان دۆزیبوویەوە، هەستیان پێدەکرد بەجۆرێك کە چووەتە ناو ژیانیانەوە، سەرسامکەرە بە ڕادەیەك کە پێویستیان بە کەسێك بوو کە یارمەتیان بدات لە باسکردنی ئەو

[58] سامریەکان گروپێکی کەم بوون لە جولەکە دەربەدەرکراوەکان تەنها باوەڕیان هەبوو بە پێنج أسفارەکە هەیە و نکولٚ دەکەن لەوەی دوای ئەوە هاتوە بەو هۆیەوە جولەکەکان بە گروپێکی یاخیبوویان دادەنێن و پێیان باش نیە پەیوەندیان لەگەڵدا ببەستن.

هەستە جوانەدا. بولس لە كۆتايی يەكێك لە وتارەكانيدا سەبارەت بە مۆژدەدان گەڕايەوە بۆ وشەكانی يەكێك لە پێغەمبەران كە بەناوی خوداوە دەدوێت و دەڵێت: ((ئاگاداربن با ئەو بەڵايە نەتانگرێتەوە كە وتراوە لە كتێبی پێغەمبەراندا: سەيربكەن ئەی ئەو كەسانەی كەمتەرخەمن، سەرسام بن!چونكە من لەم ڕۆژانەدا كارێك دەكەم گەر كەسێك باسی بكات بۆتانباوەڕناكەن!))(أعمال الرسل: ١٣/٤٠-٤١).

## جەستەی نهێنی مەسیح

مەسیحیە یەکەمینەکان کە ئینجیلیان بڵاوکردەوە لە تەواوی ناوچەکانی دەریای ناوەڕاست وا هەست دەکەن کە کۆیکردونەتەوە. ئەوان هەرگیز وا هەستیان نەکردوە کە بەتەنهان، چونکە وابیریان دەکردەوە یەسوع لەناویاندا بووە وەك هێزێکی ڕاستەقینە هێز و چالاکیان پێدەبەخشێت. هەمیشە بیریان لەو وتەیەی دەکردەوە کە پێی گوتبوون ((چونکە هەرکاتێك دوو کەس یان سیان کۆبوونەوە بەناوی منەوە ئەوا منیش لە ناویاندا دەبم))(مەتتا ١٨/٢٠). لەبەرئەوە لەو کاتەدا ناودەبران بە کۆمەڵەی مەسیح چونکە وابیریان دەکردەوە کە یەسوعی ڕزگارکەر پێغەمبەرانی پێشخۆی هەواڵی هاتنیان داوە) هەروەها خۆیان ناونابوو ئیکلیسیا، ئەمە وشەیەکی یۆنانیە واتە بانگکراوەکان (ئەوانەی بانگکراون) یان هەڵبژێردراوەکان. هەڵبژاردنی ئەم ناوە جەخت دەکاتەوە لەوەی کە وا هەستیان کردوە بە تەنها کاریان نەکردوە واتە وابیریان کلردوەتەوە هەمیشە مەسیح لە ناویاندابووە.

دوای ئەوەی ئەو قوتابیانە بەتەواوی باوەڕیان هێنا بەو بابەتە، هاتنە دەرەوە بۆئەوەی ببنە خاوەنی جیهانێك باوەڕیان وابوو ألله پێشتر بۆئەوانی هێناوەتەدی. یەکێك لەو وێناکردنانە لەلایەن خودی مەسیحەوە بوو کاتێك وتی: ((من دار مێوم ئێوەش لق و پۆپەکانی))(ئینجیلی یۆحەنا ٥/١٥). ئاشکرایە ئەم دەستەواژەیە وەرگیراوە بەڵام هێزەکەی لەدەست دەدەین ئەگەر ئەو هەستە نەبینین کاتێك ئەو وتانە دەخوێنران لە کڵێساکاندا. شوێنکەوتوانی یەسوع سەبارەت بەم کێشەیە کاتێك دەڵێت: ((من دار مێوی ڕاستەقینەم. ٢هەموو لقێکم بەروبوم دەگرێت هەتا لێی بکرێتەوە زیاتر دەکات. ٣ئێوە ئێستا پاکن بەهۆی ئەو وشانەی کە پێم وتن. ٤جێگیربن لە مندا و منیش لەناوتاندام. ٥من دارمێو و ئێوەش لقەکانی. ئەوەی لە مندا جێگیر دەبێت منیش لە ئەودا بەرهەمێکی زۆر دەدات چونکە بەبێ من ناتوانن هیچ بکەن. )) (ئینجیلی یۆحەنا ١/١٥–٥).

قەشە بولس نمونەی مەسیحی وەك جەستەی مرۆیی باسکردوە لەبری داری مێو بۆئەوەی ببێتە هێما بۆ کڵێسا، ئەم لێکچواندنە نوێیەی پاراست لەسەر وێنەی دار مێو کە دەلالەتە لە بوونی مادەی ژیان کە لقەکانی بڵاو دەبنەوە و ژیان لە بەشەکانیدا جێگیر دەبێت لەگەڵ ڕێگەپێدانی بە هەمەجۆری گەڵاکانی، وەك بولس باسی دەکات وێڕای ئەرکی سەرشانی تاکە مەسیحیەکان ڕۆڵ و بەهرەکانیان لەوانەیە جیاواز بێت وەك جیاوازی ڕەنگی چاوەکان، بەڵام هەموویان لە یەك سەرچاوەن. ((هەروەك لە جەستەیەکی یەکێکماندا چەندین ئەندامی جیاوازی تێدایە بەڵام هەموویان بە یەك کار هەڵناسن، بە هەمان شێوە ئێمە زۆرین بەڵام یەك جەستەین لە مەسیحدا و چەند ئەندامێکین هەندێکمان تەواوکەری ئەوانیترین. ))(نامەی بولس بۆ خەڵکی رومە ٤/١٢–٥)، لێرەدا مەسیح و کڵێسا وەك دوو وشە بەکارهاتون کە یەك مانایان هەیە.

ئەم دەستەواژەیە لەلای مەسیحیە یەکەمینەکان وەك وێنەیەکی گونجاو دەرکەوت بۆ ژیانی هاوبەشیان لەگەڵ یەکتردا. کڵێسا جەستەی نهێنی هەناوی مەسیح بوو، مەبەست لێرەدا بە نهێنی هەناوی: سەرو سروشتیە و نهێنی و نادیارە، مەبەست لەوە نیە کە شتێکی خەیاڵی و نادروست بێت. شێوەی مرۆیی مەسیحی جێهێشتوە بەڵام بەردەوام بووە لە گەیاندنی پەیامەکەی کە هێشتا تەوا نەبوو، لەڕێگەی جەستەیەکی سروشتی نوێوە، ئەویش کڵێساکەیەتی کە بووە سەرۆکی. ئەو جەستە هەناویە نهێنیە هاتە ژیان لە ئۆرشەلیم قودس لەڕێگەی هێزێکی بوژێنەرەوەی ڕۆحی قودس، هەروەك قەشە أغسطینوس دەڵێت: ((ئەوەی ڕۆح وێنا دەکات سەبارەت بە جەستەی مرۆڤ، ڕۆحی قودس وێنای دەکات سەبارەت بە جەستەی

مەسیح کە کڵێسایە)). ئەگەر مەسیح سەری ئەو جەستەیە بێت و ڕۆحی قودس ڕۆحی بێت، کەواتە تاکە مەسیحیەکان خانەکانی ئەو جەستەیەن. لەسەرەتادا ژمارەیان کەم بوو بەڵام لەزیادبووندا بوون هەتا تەمەنی ئەو جەستەیە زۆر بێت. خانەکانی هەر ئەندامێك جودا نین بەڵکو چالاکی ژیانی وەردەگرێت لەکاتێکدا پێکەوە بەشدار دەبن لەی چالاکیەکانیاندا. ئەمە لێکچواندنێنی وردە بەتەواوی دەگونجێت لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا. ئامانجی مەسیحیەکان ئەنجامدانی ئەو کارانەیە بۆ پاراستنی جەستەی نهێنی هەناوی مەسیح هەتا بە زیندویی بمێنێتەوە، لەکاتێکدا خانەی تاکەکان دەکاتەوە لەگەڵڕۆحیاندا. ئەمە پرۆسەیەکی ئاڵوگۆڕکراوە مەسیحیەکان کۆدەکاتەوە لە خودی مەسیحدا، چونکە مەسیح لە ئێستادا بەیەکێك لە مانا گرنگەکانی کڵێسا. دەکرێت مەسیح هەڵبقوڵێت لەناخی هەموو مەسیحیەکدا بەشێوەیەکی کامڵ یامن بەشێوەیەکی بەش بەش بەپێی ئیمان و بیروباوەڕی. لەوانەیە هەندێك لە خانەکان بگۆڕێت و ببنە خانەی شێرپەنجەیی و هەڵگەڕێنەوە و ئەوانی تر لەناوبەرن. بەڵام هەتا ئەو ڕادەیەی ئەندامەکان تەندروست بن لە مەسیحیەتدا، ئەوا ترپەی ڕۆحی قودس تیایاندا لێدەدات. هەر ئەوەیە مەسیحیەکان پێکەوە دەبەستێتەوە بەجۆرێك مەسیح باسی دەکات ((ئایا نازانن جەستەتان ئەندامەکانی مەسیحن؟ ئایا ئەندامەکانی مەسیح دەگۆڕم بە ئەندامی زیناکەر؟ نەخێر حاشا!))(نامەی یەکەمی بولس بۆ خەڵکی کورنسوس ١٥/٦)((لەگەڵ مەسیحدا لەخاچدرام، لەدوای ئەوە من ناژیم، بەڵکو مەسیح دەژی لەمندا))(نامەی بولس بۆ خەڵکی غلاطیة ٢٠/٢).

بەپێی ئەم دەرکپێکردن و تێگەیشتنە بۆ کڵێسا، مەسیحیەکان بەجۆرێك سەیریان دەکرد کە دوو ڕەهەند لەخۆدەگرێت. تائەو ڕادەیەی مەسیح تیایدا پێکدێت لە ڕۆحی قودس کەلەناو خەڵکدا دەژی لێوانلێویان دەکات لە بەخشین و بەزەیی و خۆشەویستی، ئەمە ڕەهەندێکی نمونەییە. لەلایەکی ترەوە پێکدێت لە ئەندامە مرۆییە ناپاکەکان، چونکە هەمیشە کەمتەرخەمی دەکات لە کامڵبوونیدا(٩). ڕووی دونیایی کڵێسا هەمیشە لەبەردەم ڕەخنەگرتندایە. بەڵام هەندێك لە مەسیحیەکان وابیردەکەونەوە هەڵەکان بەهۆی ئەو ڕەگەزە مرۆییەوەیە کەلەڕێگایەوە کاردەکات.

ئایا ڕزگاربوون هەیە لە دەرەوەی جەستەی مەسیح، واتە لە دەرەوەی کڵێساکەی؟ ئەمە بابەتێکە مەسیحیەکان لەبارەیەوە ڕای جیاوازیان هەیە. هەندێك لە پرۆتستانتەکان ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە ڕزگاربوون بوونی نیە لە دەرەوەی کڵێسا چونکە بە جۆرێك لە ئیمبریالیەتی ئایینی دادەنێن. لەلایەکی ترەوە ئوصولیەکان دەڵێن هیچ کەسێك ڕزگاری بەدەست ناهێنێت جگەلەوانەی بە فەرمی پێیان دەوترێت مەسیحی. بەڵام هەندێك لە مەسیحیەکان وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە بە جیاکردنەوەی کڵێسای بینراو لە کڵێسای نەبینراو. کڵێسای بینراو پێکدێت لە ئەندامە فەرمیەکانی کڵێسا وەك ڕێکخراوێکی زەمینی، پاپا بیوسی نۆیەم pope pius IX لەبارەی ئەم تێڕوانینەوە دەڵێت((ئەوانەی کەمئەندامن لە ئەقڵدا نەزانن لەبارەی ئایینە پیرۆزەکەمانەوە)) بەڵام:

((یاسای سروشتی دەپارێزن بە فەرمانەکانی أللە کە نوسیویەتی لەناو دڵی هەموو مرۆڤێکدا، ئامادەن بۆ گوێڕایەڵیکردنی، ژیانێکی خۆش دەژین، بەیارمەتی ڕوناکی یەزدانی دەتوانن بگەن بە ژیانی هەمیشەیی. چونکە أللە ناخی هەموو مرۆڤەکان دەبینێت، لەبیرکردنەوەکانیان بەئاگایە، بە ڕەحم و بەزەییەکەی هەمووان دەگرێتەوە، هەرگیز بە سزایەکی هەمیشەیی مرۆۆ ئازارنادات، کاتێك بەشێوەی نائەنقەست تاوای ئەنجام دابێت)).

ئەمە بەئاشکرا بۆ ئەو کەسانەیە کە ئەندام نین لە کڵێسای بینراو، بەهەمان شێوە دەتوانن ڕزگاری بەدەست بهێنن(١٠). لەپشت کڵێسای بینراوەوە کڵێسایەکی نەبینراو هەیە کە پێکدێت لە هەموو ئەوانەی بیروباوەڕیان هەرچیەك بێت شوێنکەوتوی باشترین هێزی هیدایەتبەخش و ڕوناکین کە موڵکی خۆیانە. زۆربەی مەسیحیەکان بەردەوامن لەسەر ئەم واتا دووەمەی کڵێسا، ڕزگاربوون لەدەرەوەی نیە. زۆربەیان وابیردەکەنەوە ژیانی یەزدانی بە هێزترە لەڕێگەی کڵێسای بینراوەوە بەو کارانەی پێی هەڵدەسێت. چونکە ئەوان هاوڕان لەگەڵ بیرکردنەوەی جون دون john donne کە بەشێوەیەکی شاعیرانە دایڕشتوە لە سۆناتاکەیدا سەبارەت بە قیامەت و زیندوبوونەوە کاتێك لەبارەی مەسیحەوە دەڵێت:

هەمووی ئاڵتونێکی پاڵاوتە بوو کاتێك دانیشت، بەڵام کاتێك هەستا هەموو ڕەنگەکانی هەڵگرت. . .

جون دون ئەم ڕستەیە ئاڕاستەی زانایانی کیمیا دەکات لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە ئەوپەڕی هیواکانیان تەنها ڕێگایەك نەبوو بۆ دروستکردنی ئاڵتون بەڵکو کانزایەکی تریان دۆزیەوە ناویان نا ئیکسیر کاتێك دەخرێتە سەر هەر کانزایەك دەیگۆڕێت بۆ ئاڵتونی ڕاستەقینە. مەسیحی کەسێکە ئەو ئیکسیرەی دۆزیوەتەوە لە کەسایەتی مەسیحدا.

## مێشکی کڵێسا

ئەقڵی حەواریەکان و قوتابیەکان بەپلەی یەکەم کێشکرابوو بەرەو یەسوع، بەڵکو وەك بینیمان هەستەکانیان سەرەتا کێکشکرابوو بەرەولای مەسیح، واتە هەستکردنیان جۆرێك بوو کەلەلای کەسێك دەژین خۆشەویستی بێسنوری تیاکۆبووەتەوە لەگەڵ شادومانی و هێزی سروشت، بەجۆرێك کاریکردبووە قوتابیەکانی کە نهێنیەکی یەزدانی تیا ببینن. دوای ماوەیەك مەسیحیەکان هەستیان بەوە کرد پێویستیان بەوەیە تێبگەن لەو نهێنیە بۆئەوەی شیبکەنەوە بۆ خۆیان و ئەوانی تر بەمجۆرە زانستی ئایینزانیلاهوت مەسیحی لەدایکبوو، لەو کاتەوە بوو بە مێشك و دڵی کڵێسا.

ئێمە لەم توێژینەوەیەدا ناچارین چەند بابەتێك هەڵبژێرین لە لاهوتی مەسیحی، بۆیە تەنها باس لە سێ بیروباوەڕی لاهوتیەت دەکەین، ئەوانە: بیروباوەڕی بەرجەستەکردن و بیروباوەڕی تۆبەکردن و بیروباوەڕی سیانەی پیرۆز(باوك و کوڕ و گیانی پیرۆز).

ئەم سێ بیروباوەڕە والە توێژینەوەکەمان دەکات لاهوتی بێت، لەبەرئەوە پێویستەپێش باسکردنی پێویستە کەمێك بدوێین لەبارەی ئەو زانستەوە کە ناونراوە زانستی لاهوت. ئەقڵی نوێ زیاتر گرنگی دەدات بە زانستی دەرونزانی بەبەراورد بە زانستی لاهوت، شتەکانی پشت سروشت. ئەمە بەو مانایە دێت خەڵك بە مەسیحیەکانەوە زیاتر گرنگی دەدەن بە ڕێنماییە ئەخلاقیەکانی مەسیح زیاتر لە گرنگیدانیان بە بەڵگە لاهوتیەکانی قەشە بولس، چونکە ئەوان گرنگیەکی کەم دەدەن بە ئامۆژگاریەکانی سەر شاخەکە، بەڵام بەلایەنی کەمەوە ڕێزی لێدەگرن. بەڵام ئەو بیروباوەڕانەی ئێستا قسەیان لەسەر دەکەین بەلای ئەوانەوە بێزارکەر دێتەپێشچاو. بەڵکو تەنانەت زانایانی پەیمانی نوێ هەندێك کات لەم جۆرە هەستکردنە نزیك دەبنەوە تائەو ڕادەیەی هەوڵدەدەن جیاکاری بکەن لەنێوان ((ئایینی یەسوع)) و ((ئەو ئایینەی دەدوێت لەبارەی یەسوعەوە))، لەنێوان ((بنەما ئەخلاقیەکانی یەسوع)) و ((زانستی لاهوتی ئاڵۆزی بولس))، یان لەنێوان ((یەسوعی مرۆڤ)) و ((مەسیحی گەردونی))، .

وێڕای ئەوە تەنانەت زانایان دەتوانن خۆیان بدەن بەدەستەوە بۆ ئەو تێڕوانینەی وا دەبینێت گەوهەری ئایین تەنها ڕەوشتە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم تێڕوانینە هەڵەیە. دروستە ئایینە مەزنەکان هەمیشە بانگەواز دەکەن بۆ ژیانێکی ئەخلاقی، بەڵام گرنگیپێدانی سەرەکی تەنها ئەو بانگەوازە نیە. گرنگیپێدانی سەرەکی ئایین چەسپاندنی تێڕوانینی ڕاستیە کە ڕەوشت سەرچاوەی لێوە گرتوە، بەجۆرێك ڕەوشت زۆربەی کات دەرئەنجامی لاوەکیە. ئایین دەستپێدەکات بە ئەزمونکردنی: (بیروباوەڕ، ڕێوڕەسم و پەرستن، ئەزمونی ڕۆحی)). گرنگترینیان ئەزمونی ڕۆحیە(11). بەجۆرێك شارەزایی دەبێت لە کۆمەڵە شتێکی نەبینراودا بەوهۆیەوە کۆمەڵە هێمایەك پێکدەهێنێت کاتێك ئەقڵ هەوڵدەدات بیربکاتەوە لە شتە نەبینراوەکان و هێماکان، بەوهۆیەوە دواجار ئەقڵ چەند بیرۆکەیەك دەهێنێت بۆئەوەی جێگای ئەو شتە نەبینراوانە بگرێتەوە. ئەگەر ئەمە بخوێنینەوە بە ئاڕاستەی پێچەوانە تێدەگەین لە زانستی لاهوت بۆ ئەو پیرۆکانەی پەیوەستن بە هێماکانەوە کە ئەزمونی ئایینی پێمانی دەدەن. بەندەکانی یاسای ئیمانی مەسیحی بریتیە لە بناغەیەکی قووڵ لە زانستی لاهوتی مەسیحی چونکە ئەو هەوڵدانانە دەخاتەڕوو کە مەسیحیەکان داویانە بۆ تێگەیشتن لەو ڕوداوانەی تەواوی ژیانی گۆڕیون.

دەستپێدەکەین بە بیروباوەڕی بەرجەستەکردن کە پێویستی بە چەند سەدەیەك بوو هەتا جێگیر بێت. ئەم بیروباوەڕە دەڵێت ألله شێوازێکی مرۆیی وەرگرتوە لە یەسوعی مەسیحدا. جوخت دەاتەوە لەسەر ئەوەی

مەسیح خوداوەند-مرۆڤ بوو، واتە خوداوەندێکی تەواو بوو، مرۆڤێکی تەواو بوو لە هەمان کاتدا. ئەم بیروباوەڕە وادادەنێت مەسیح نیوەی مرۆڤ بووە نیوەکەی تری خوداوەند، یان خوداوەند بووە لە هەندێك لە لایەنەکاندا و مرۆڤ بووە لەلایەنەکانی تردا، کاتێك ئەقڵمان دژایەتی ئەمە دەکات هەر ئەمەیە یاسای ئیمانی مەسیحی ڕەتیدەکاتەوە. لە دەستەواژەکانی یاسای ئیمانی خلقیدونی[٥٩] ((یەسوعی مەسیح بە کەسێکی کامڵ دادەنرێت لە خوداوەندیەکەیدا هەروەك لە لایەنە مرۆییەکەیدا کامڵە، خوداوەندێکی ڕاستەقینە و مرۆڤێکی ڕاستەقینەیە. لەهەمان گەوهەری باوك لەلایەنی خوداوەندیەوە، لەهەمان کاتدا لە گەوهەری ئێمەیە لە لایەنە مرۆڤایەتیەکەیەوە)). چونکە ئەو مرۆڤە لە هەموو لایەنەکانەوە، بەڵام بەبێ تاوانە.
کڵێسا هەمیشە دانپیانانی هەبوە بۆ هاوشێوەی ئەم دوپاتکردنەوانە، بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەمەیە ئایا ئەمە دوا وشەیە لەسەر ئەم بابەتە؟ لەڕاستیدا دەتوانین بپرسین بە هەمان شێوە سەبارەت بە زانست.
کاتێك پێشنیاز دەکەین بەڵگەکان مەسیحیەکانی پەلکێشکرد بۆ بیروباوەڕێك کە دژبە مەنتیق و لۆژیکە، بەوەی مەسیح مرۆڤ و خوداوەند بوو لەیەك کاتدا، چونکە ئێمە لێرەدا سەبارەت بە ئەزمونێکی ئایینی قسەدەکەین، سەبارەت بە ڕۆح و کێشەکانی بوون. هاوشێوەی ئەم بەڵگەیە ناکرێت پێشکەش بکرێت بە ئاشکرا و گوێگرەکانی ناچاربکات کە ڕازی بن پێی، چونکە ناکرێت بگۆڕدرێت بۆئەوەی هەستی پێبکرێت.
بەڵام ئەگەر هەوڵماندا بۆئەوەی نزیك ببینەوە لە بەڵگە هەستپێکراوەکان کە مەسیحیەکان شوێنی کەوتبوون. کاتێك ئیمبراتۆری قستەنتین کۆمەڵەی نیقیەی بانگێهێشتکرد لەساڵی ٣٢٥. بەمەبەستی بڕیاردان سەبارەت بە مەسیح لە هەمان گەوهەری أللە و سروشتەکەی، یان لە گەوهەری هاوشێوەی أللە بەتەنها؟ سێ سەد قەشە و هاوەڵەکانیان لە هەموو ناوچەکانی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی بەڕێکەوتن بۆ ئەوەی لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەبن. گومانی تیادا نیە شێوەیان سەیر بوە چونکە زۆربەیان دەمامکیان پۆشی بوو تەنها چاویان بەدەرەوە بوو، دەموچاویان شێوێنرابوو و قاچ و دەستیان یان لێکرابوویەوە یان خوارخێچ بوو بەهۆی سزادانی توندی ڕۆمانیەکان لە سەردەمی دیوکلیتیانوس[٦٠]. ئاساییە ئەگەر پرس و ڕاوێژیان بەیەکتر کردبێت. بڕیاری کۆبوونەوەی نیقیە بریتی بوو لەوەی مەسیح هەمان گەوهەری باوك بوو، کە پەیوەندی هەیە بە أللە. بۆئەوەی تێبینی ئەو قسانە بکەین سەبارەت بە یەسوع بوو لەنێو مانا جیاوازەکانی وشەی خوداوەندا، گرنگترنیە لە مانای ((ئەو بوونەی مرۆڤ قوبوڵی دەکات بەشێوەیەکی تەواو)). کاتێك کڵێسا دەڵێت یەسوع لەڕاستیدا أللە بوو، چونکە یەکێك لەو مانایانەی دەیویست بیانخاتەڕوو بریتی بوو لەوەی ژیانی یەسوع نمونەیەکی کامڵە بۆ ژیانی مرۆیی. لاساییکردنەوەی کوێرانە بۆ وردەکاریەکان ناکرێت دروستکەر بێت، بەڵام لەوەی پەیوەندی هەیە بە خۆشویستنی یەسوعەوە دەکرێت ڕاستگۆیانە تەریب برکێت لەگەڵ ژیانی تایبەتیمان بەرەو أللە، چونکە هەڵسوکەوتەکانی بەهەمانشێوە یەزدانیە.
هەموو ئەمانە ڕوون و ئاشکرایە. بەڵام ئەگەر ویستمان قوولتر بڕوانینە بیروباوەڕی بەرجەستەکردن پێویستە خۆمان ئامادەبکەین بۆ ڕوداوی چاوەڕوان نەکراو کە توشی خورپەمان دەکەن. چونکە بیرۆکەیەك

---

[٥٩] واتە ئەو شتەی کە پاڵپشتی کراوە لە کۆمەڵەی خلقیدونی کەلە ساڵی ٤٥١ز بەستراوە بە فەرمانی ئیمبراتۆر مرسیانوس کە سەلمێنراوە هەردوو سروشتی خوداوەندی و مرۆیی لە مەسیحدا کۆبوەتەوە، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ مونوفیزیەت کە دەڵێت یەك سروشت لە مەسیحدا هەیە، لەسەر ئەم بنەمایە کڵێسای قیبتی دوو کەرت بوو کە ئەم بڕیارەی ڕەتکردەوە لەگەڵ ژمارەیەك لە کڵێسا ڕۆژهەڵاتیەکان وەك سریان و ئۆرسۆزکس و کڵێسای ئەرمەنی. . دواتر ناونرا کڵێسای ئۆرسۆزکسی ڕۆژهەڵاتی ناخلقیدونی، یان مونوفیزیەت کە دەڵێت تاککە سروشتێك لە مەسیحدایە.

[٦٠] دیوکلیتیانوس ئیمبراتۆری ڕۆمانی (٢٤٥-٣١٣) فەرمانڕەوایی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی کرد لە ماوەی نێوان ٢٨٤ بۆ٣٠٥ دواتر دەستبەرداری دەسەڵات دەبێت. وڵتی بەشکرد بۆ دوو بەش ڕۆژهەڵات لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا و ڕۆژئاوا لەژێر دەسەڵاتی ئیمبراتۆر ماکسیمیان. دیوکلیتیانوس دوا ئیمبراتۆری ڕۆمانی بوو کە بە توندی سزای مەسیحیەکانی دەدا.

دەبینین کە مرۆڤ دەتوانێت ببێتە خوداوەند ئەمەش شتێکی سەیرە و توشی شڵەژانمان دەکات. بەڵام بۆ ئەو سەردەمە ئاسایی بوە چونکە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان مرۆڤ و خوداوەند زۆر تەنك بووە بەڕادەیەك چەند کەسێك بانگەوازی خوداوەندیان دەکرد.
بیروباوەڕی بەرجەستەکردن لە مەسیحیەتدا شتێکی‌نوێ هەڵدەگرێت لە پەیامی مەسیحیەتدا، بەجۆرێك باس دەکات لە سروشتی ئەو خوداوەندەی بەرجەستەبووە، ئەو سروشتەی‌ویستی ألله ڕوون دەکاتەوە کەژیانێکی مرۆیی هەڵبژێرێت کە یەسوع وێنای کردوە، ئەمە تێگەیشتنێکی جیاوازی بەخشی بە مانای خوداوەندی بە بەراورد بە ماناکەی لە وڵاتی نێوان دوو ڕوبارەکە. لە تێڕوانینی مەسیحیەتدا ألله گرنگی دەدا بە مرۆڤایەتی بەجۆرێك وای لێەدات ئازاربچێژێت لەبری مرۆڤەکان. ئەمە شتێك بوو پێشتر نەبیسترابوو، هەتا ڕادەیەك کاردانەوەی شتێکی مەترسیدار بوو. پارێزکاران هەستیان بە هەڕەشە و مەترسی کرد کە ئەمە کوفر و گوناهە کە مەسیحیەکان هەڵگری بوون، کاتێك ئەم تێڕوانینە دەدرێتەپاڵ یەکسانی ڕادیکاڵی کە مەسیحیەکان هەڵگری بوون بەتەواوی ئەو پێشلێکاریانەی پیشان دەدا کە دژ بە خاوەنەکانیان دەکرا
بۆلەناوبردنی ئەم هەنگە نوێیە! ئەوەی ئاگایی مەسیحیەکان پیشان دەدات لەبارەی لاهوتەوە ڕاستیەکە بەدەگمەن دەیگەڕێننەوە بۆ ألله بەبێ ئەوەی بەڵێن ئەوەی لەبارەیەوە دەدوێن بریتیەلە ((خوداوەند و باوکی خودامان یەسوعی مەسیح)).
بەڵام سەبارەت بەوەی بیروباوەڕی بەرجەستەکردن جەختدەکاتەوە لەسەری سەبارەت بە مەسیح لێرەدا سەرسام دەبین چونکە ئەوەی دەیبینین جگەلە زیادەڕەوی لە خوادەوەندی یەسوع وادادەنێت یاسای ئیمان ئامانجی یەکەمی ئەم بیروباوەڕەیە بەو مانایەی مرۆڤێکی کامڵە بەهەموو واتایەکەوە. ئەمە شتێکە ڕێکدەکەوێت لەگەڵ ئەوەی وتمان لەبارەی تێکەڵبوونی خوداوەندی/مرۆیی لە تێگەیشتنی ئیغریقی_ڕۆمانیدا: خوداوەندی ئۆلۆمبیەت، نیوەی مرۆیی و نیوەکەی تری خوداوەند بوو، کە وێنەی پشتەوەی زۆربەی بیروباوەڕە ئاییینیە بەربڵاوەکانە. یەسوعی مەسیحی نەدەگونجا لەگەڵ ئەم چوارچێوەیەدا. وەك بینیمان لە حاڵەتە ئەمە تێکەڵبوون نەبوو خوداوەند/مرۆڤ لە جۆری یەکسانیدا بوو لەنێو هەردو پلەو پایەکەدا: هەندێکی مرۆڤە و هەندێکی خوداوەند! بەڵکو ئەمە پێکەوەلکاندی دووشتی ناچونیەك بوو: خوداوەندی ڕەها کە تێکەڵ بوو لەگەڵ مرۆڤایەتیەکی تەواودا، چونکە ئەمە ئەزمونی کڵێسایە کە مرۆیی تەواوی یەسوع لەژێر مەترسی لەناوچوندایە، کاتێك خهوداوەندیەکەی بەخێرایی ڕێی دەکرد بەڕادەیەك مەترسی هەبو لەسەر نەهێشتنی لایەنە مرۆییەکەی، جەختکردنەوە لەسەر مرۆڤ بوونی یەسوع یەکێکە لە گرنگترین دەقەکانی بیروباوەڕی مەسیحی:
((باوەڕمان بە یەك خودا هەیە، هەمووان ڕێکدەخات، بەدیهێنەری ئاسمان و زەویە. . . بە تاکە خوداوەندێك یەسوعی مەسیح تاکە کوڕی ألله. . . کە ڕۆحی قودسی تیادا هەڵگیراوە لە مریەمی پاك داوێندا، بەرجەستەکراوە، لەخاچدراوە لەسەردەمی بیلاتس بنتی دا، ئازاری چەشتەوە، مردووە، دواتر بەخاکسپێردراوە. . ))
تێبینی بکە یاسای بیروباوەڕی پێغەمبەرایەتی یەکەم بەو جۆرە کەمە باس لە خوداوەندی یەسوع دەکات. لە سەدەی دووەمدا خوداوەندیەکەی پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە نەبوو، ئەگەر یاسای بیروباوەڕی پێغەمبەری قورس بوو بێت بە هەڵگرتنی ئەو وشانە ئەوە سوربوون لەسەر مەسیحی مرۆڤ بە وانانی وشە. جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی بەڕاستی لەدایکبووە و ئازاری چەشتوە و مردوە و بەخاك شپێردراوە، واتە

ئەو ڕوداوانە تەنها نواندن بوون، یان کۆمەڵە ڕوداوێك بوون ألله ڕێکی خستبوون بۆئەوەی نیشانی بدات بە شـێوەی بەرجەسـتەکراوی مرۆیـی، بـەڵکو هاوشـێوەی ئـەم تێگەیشـتنە بەرپەرچـدراوەتەوە بـەوەی دوکیتریزمە[61]. مەسیح بە هەموو ئەو ئەزمونانەدا تێپەڕ بووە: سکپڕبوونی مریەمی پاکداوێن پێوەی، لەدایکبوون، ئازارەکان، مردن، بەخاکسپاردن بە هاوشێوەی ئەوەی ئێمە پێیدا تێپەڕدەبین. ئەو مرۆڤێکی ڕاستەقینە بوو.

ئایا ئەمە ڕاستیە؟ بەڵێ ڕاستیە!

ئەمە مەزنترین چیرۆکە

ألله پیاوێك بوو لە فەلەستین

ئەمڕۆ وا دەژی لەنێو نان و شەرابدا

christman ،john betijeman

ئەستەم نیە بتوانین بیربکەینەوە بۆچی کڵێسا هەستی بەوەکرد پێویستی بە پاراستنی مرۆڤایەتی مەسیح هەیە. پێویست بوو پردێك هەبێت هەردو کەنارەکە پێکەوە ببەستێتەوە: خودایەتی و مرۆڤ بوون، مەسیح ئەو پردە بوو کە مرۆڤایەتی بەستەوە بە ألله: ((ألله بووە بە مرۆڤێك بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێت ببێتە ألله!)) ئەمە ڕێگەی شیکردنەوەی ئێرینوس بوو بە شیکردنەوەی ئەو بابەتە. ئەگەر بواترایە مەسیح مرۆڤە بە تەنها ألله نیە لەوانەیە ئەو نکوڵیکردنە بوایەتە هۆی ئەوەی ژیانی نەبوایە بە نمونەی باڵا بە تەواوی، ئەو دانپیانانە کڵێسا خۆی لێدووردەخاتەوە بەوەی دەکرێت ڕێگاکانی تر باشتر بن. ئەگەر وترا ألله بەتەنها و مرۆڤ نەبووە لەوانەیە بوایەهۆی نکوڵیکردن لەوەی کە پەیوەندی هەیە بە ئێمەی مرۆڤەوە، واتە گرنگ نەدەبوو لەلایان، چونکە بەو جۆرە دەبێتە پێوەرێکی ڕاستەقینە بۆ ألله بە تەنها نەك بۆ مرۆڤ، چونکە لەوان نیە. دەکرا مەسیحیەکان وازبهێنن لە یەکێك لەو دوو بانگەشەیە خۆیان دەرباز بکەن بەڵام بەو جۆرە ناپاکیان دەکرد لەگەڵ کرۆکی ئەزمونە ڕۆحیەکەیاندا.

لێرەدا باس لە بیروباوەڕی کەفارەت atonementدەکەین. تێدەگەین مانا ڕاستەقینەکەی بریتیەلە ئاشتبوونەوە، بەدەستهێنانەوەی یەکبوون. مەسیحیەکان باوەڕیان بەوە بوو ژیانی مەسیح و مردنی نزیکبوونەوەیان دروستکرد لەنێوان ألله و مرۆڤایەتیدا، بە وشەکانی بولس: ((واتە ألله لە مەسیحدا ئاشتبوونەوەی بوو لەگەڵ جیهاندا، بەجۆرێك گوناهەکانیان خۆش دەبوو، پەیامی ئەم ئاشتبوونەوەی خستە نێوان دەستمانەوە. ))(٢کورنثوس ١٩/٥). چەند دەستەواژەیەك هەیە بۆ تێگەیشتنی کڵێسا لەم بیروباوەڕە: یەکێکیان یاساییە دەڵێت: ئادەم تاوانی کرد کاتێك لە ألله یاخی بوو لە بەری درەختە قەدەغەکراوەکەی خوارد لە بەهەشت. کاتێك تاوانەکەی ناڕاستەکراو بوو دژ بە ألله، قەبارەکەی زۆر تر بوو. پێویست بوو سزابدرێت، ئەگەر نا دادپەروەری ألله جێبەجێ ناکرێت. ئەم تاوانە پێویستی بە کەفارەتێکی ناکۆتا هەبوو، ئەمە جێبەجێ ناکرێت ئەگەر ألله ئەو تاوانەمان لەسەر لانەبات، سزای ئەو تاوانە مردنە مردنە، بەو جۆرە ئەو سزایەی جێبەجێکرد بەسەر مەسیحدا.

لەسەردەمە دێرینەکاندا ئەقڵ جیاواز بوو لە ئێستا، ئەم تێگەیشتنە بۆ بیروباوەڕی کەفارەت جیاواز بوو بەڵام دەستەواژەیەکی تر هەبوو لە جیهانی مەسیحیدا لەبارەی ئەم بابەتەوە بریتیەلە ((ئازادبوون لە

---

[61] (i)دوکیتیزم doccetismشتێکی داهێنراوە ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی دەڵێن جەستەی مەسیح تەنها تارماییەك بوو یان جەستەیەکی ڕاستەقینە بوو بەڵام وەك جەستەی ئێمە نەبوو بەڵکو جەستەیەکی ئاسمانی بوو، ئازارەکانی مەسیح شتێکی ڕاستەقینە نەبوو.

**کۆیلایەتی)). ئەو کۆیلایەتیەی مەسیح مرۆڤایەتی لێ دەربازکرد بریتیە لە ((بەندایەتی تاوان))، بەجۆرێك ناچارمان دەکات ئەم بابەتە چارەسەر بکەین.**

**دەتوانین دەستپێبکەین بەوەی وێڕای ئەوەی وشەی تاوان لە زمانی ئینگلیزیدا بە کۆ ناو دەبرێت واتە تاوانەکان، کە ئاماژەکردنە بە کارە تایبەتیەکان: لیستێکی دورودرێژە لە تاوان، ئەو یاسایانەی پێشێلکراون، گرنگترینیان یاسای ناو دە ڕاسپاردەکەیە، بەڵام مەسیحیەکان لە وشەی تاواندا شتێکی قووڵتریان هەستپێکرد. تیایدا مانای دابڕانیان بینی لە الله، قەشە ئۆگستینۆس ئەمەی شیکردوەتەوە بەم شێوەیە: ((الله خۆشبویٚ، هەرچیەك دەویٚت ئەنجامی بدە!)). کاتێك خۆشەویستیەك دەبێت لە قوڵایی دڵی هەمووماندا، ویستی چاکەخوازی بەشێوەیەکی خۆڕسك کاردەکات، پێویستمان بە یاسا نابێت. بەڵام زۆربەی کات بە پێچەوانەی ئەمەیە، گرنگیدانمان بە خۆمان وامان لێدەکات ئەوانی ترمان خۆش نەوێت، وێڕای ئەوەی ئێمە خۆمان خۆشناوێت بەڕادەیەکی زۆر. دڵەکانمان بەستراوە بە سروشتمانەوە بەشێوەیەکی فراوان.**

**کەواتە کۆیلایەتی ئێمەی بەستبوو بە خودی خۆمانەوە، لەگەڵ ئەو هەستکردن بە تاوانە کە هەمیشە بەدوامانەوەیە. لە ڕوانگەیەکی ترەوە: کۆیلایەتیمان و ئەسیربوونمان دەرئەنجامی دوورکەتنەوەمانە لە بەشداریکردنی ژیاندا. هەست بەوە ناکەین ئەم دوورکەتنەوەمان باش نیە بۆمان. بولس دانپیانانی هەیە لەم بارەیەوە دەڵێت: ((من چەندە مرۆڤێکی نائومێدم!))(رومیە ٢٤/٧). ئەمە ئەو هەستەیە زیندانیەکان هەیانە. بەشێکی زۆر لە نائومێدیان هەڵقوڵاوی هەستکردنیانە بەوەی هیچ چارەیەکی دیکەیان نیە چونکە ئەوان زیندانین، زیندان واتە نەبوونی توانای ئازادکردنی خود.**

**بولس بەردەوام دەبێت دەڵێت: ((چونکە ئەوەی ئەنجامی دەدەم توانام نیە بەسەریدا: چونکە ئەو کارە ناکەم کە دەمەوێت، بەڵکو ئەو کارە ئەنجام دەدەم کە ڕقم لێیەتی. ))(رومیە ١٥/٧). کاتێك دەرکبەوە دەکات دەبێتە مرۆڤێکی نائومێد: ((لەناو ئەندامەکانمدا ناموسێکی تر دەبینم دەجەنگێت لەگەڵ ئەو شەریعەتەی ئەقڵم دەیەوێت، دەمکاتە کۆیلەی ناموسی تاوان لەناو ئەندامەکانمدا. چەندە مرۆڤێکی نائومێدم! کێ ئازادم دەکات لە جەستەی ئەم مەرگە؟))(رومیە ٢٤/٧-٢٥). ئەمە هەمان هاوارە ئەو کەسە دوبارەی دەکاتەوە کە ئالودەی مادە هۆشبەرەکان بووە، کاتێك هەوڵدەدات لێیان دەرباز ببێت ناتوانێت بەڵکو خۆی وەك کۆیلەی ئەو مادانە دەبینێت، ئەگەر ئازاد بوونێك هەبێت ئەوا پێویستە لە دەرەوە بێت واتە لە هێزێکی سەروو توانای مرۆییەوە. لە مەسیحیەتدا دەوترێت هێزی سەرو توانای مرۆیی کاردەکات بۆ ئازادکردنی دەروون و دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەر زەمینەی بوونی ڕاستەقینەی کە بریتیەلە مەسیح. دەشێت مرۆڤ بڵێت ئەو هێزە اللهیە، بەڵام مەسیحیەکان لەك حاڵەتەدا دەڵێن ئەو ئامانجە بەدیهێنراوە لەلایەن الله لەڕێگەی مەسیحەوە.**

**سێیەم بیروباوەڕی گرنگی مەسیحیەت کە باسی دەکەین لە سیانەی پیرۆزدا.**

**دەڵێت الله تاکە کەسێکە لەهەمان کاتدا سیانە. نیوەی دووەمی ئەم بانگەوازە والە جوولەکە و موسوڵمانەکان دەکات بپرسن ئایا بەڕاستی مەسیحیەکان یەکتاپەرستن بەڕاستی؟!، بەڵام مەسیحیەکان دڵنیان لەوەی بەڕاستی یەکتاپەرستن، چونکە ئاو و سەهۆڵ و هەڵم سێ دۆخی جیاوازی ڕاستیەکی گەوهەرین بریتیەلە ئاو کە چەند شێوەیەکی جیاواز لەخۆ دەگرێت بریتیە لە شلە و ڕەق و گاز لەگەڵ ئەوەدا ناسنامەکەی پاراستوە لە پێکهاتەیەکی کیمیاییدا. ئەو شتە چیە مەسیحیەکان هاندەدات کە تێڕوانینێکی وەها شاز وەرگرن لەبارەی الله: یەك لە سیاندا؟؟ وەك هاوشێوەی ئەم کێشانە تێگەیشتن لەم ڤەمکە**

چڕکراوەتەوە لەسەر ئەزمونی ئایینی. ئەگەر بیروباوەڕی سیانەی لاهوتی دانەنرا بێت هەتا سەدەی چوارەمی زایینی، ئەمە بەو مانایە نایەت لەو سەدەیەدا پێکهێنراوە، بەڵکو ڕاستی ئەزمونە ڕۆحیەکان کە ئەم بیروباوەڕە کۆیکردوەتەوە بۆ کڵێساکانی سەرەتا، بەڵکو لە ڕاستیدا ئەم ئەزمونانە ئەو کڵێسایەی پێکهێنا. حەواریەکانی مەسیح و قوتابیەکانی، وەك جوولەکە دڵسۆز و دیندار بوون، باوەڕیان بە یەهوە هەبوو بەڵام وەك پێشتر بینیمان، وا یەسوعیان دەبینی کە درێژکراوەی ییەهوەیە لەم جیهاندا، لەگەڵ گەشەسەندنی ژیانی و پەیامەکەی بۆ کەسایەتی مەسیح شتێکیان زیاددەکرد لە ألله یان لەنێو بوونی یەزدانیدا. ئەمە بەو مانایە دێت ئەوان ئێستا دەتوانن دەرك بکەن بە ألله لە بیرکردنەوەکانیاندا بە ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگەی کوڕەکەیەوە، وێڕای ئەوەی ئەم دوانە زۆر نزیکن لەیەکەوە بەڵکو پێکەوە گرێ دراون بەڕادەیەك دەرئەنجامی دەرکپێکردنەکە چونیەکە. کاتێك ڕۆژی دورینەوە[٦٢] هات لەگەڵ خۆیدا

سەردانی سێیەمی هێنا:

((کاتێك ڕۆژی پەنجاهەمین هات، براکان پێکەوە کۆبوونەوە لەیەك جێگادا، ٢ لەپڕ دەنگێك هات لە ئاسمانەوە وەك ڕەشەبایەك، ئەوماڵەی پڕ کرد کە تیایدت دانیشتبوون. ٣ دوای ئەوە چەند زمانێکیان بینی وەك لە ئاگر دروستکرابن، دابەش بوو بەسەر هەریەکەیاندا، ٤ هەموویان پڕ بوون لە ڕۆحی قودس، بە چەند زمانێکی تر قسەیان دەکرد، هەروەها ڕۆح ئەمەی پێبەخشیبوون بۆئەوەی قسەی پێبکەن)) سفر أعمال الرسل: ٢/١-٤.

لەوانەیە ئەقڵی عیلمانی بڵێت ئەو قوتابیانە ئەو ئەزمونەیان بەرجەستەکرد و گۆڕیان بۆ بونەوەرێك بریتیەلە ڕۆحی قودس، دواتر ئەم شتەیان ناساند (واتە کەسایەتیەکی سەربەخۆیان پێبەخشی) کە کەسی سێیەمی سیانەی پیرۆزە. بەڵام قوتابیەکان بەدڵنیاییەوە ئەم شیکردنەوەیە ڕەتدەکەنەوە. ئەوان دەڵێن ئەگەر ئەو شیکردنەوەیە دروست بێت کاتێك یەسوع وتی: ((داوا لە باوك دەکەم یارمەتیدەرێکی ترتان پێ ببەخشێت بۆ هەمیشە، ئەوە ڕۆحی حەقە))(ئینجیلی یۆحەنا ١٦/١٤-١٧). وێڕای ئەوەی ئەم جەختکردنەوەیە تەنها لە کۆتایی دوا ئینجیلدا کە نوسراوەتەوە لەوانەیە جێگای گومان بێت. بەڵام ئەگەر قوتابیەکان ئەو وشانەیان خستەپاڵ یەسوع ئەوە بەهۆی ئەوەیە ئەو وشانە تێگەیشتنی قوتابیەکان نیشان دەدات بۆ ئەزمونی ڕۆژی دورینەوەجەژنی پەنجایی. بەتەواوی باوەڕیان بەوە هەبوو ئەوەی لەوێ بینیان هاتنی سێیەم کۆمەڵەی یەزدانی بوو واتە ڕۆحی قودس.

ئەمە ئەو هۆکارەیە هانی حەواریەکان و قوتابیەکانی دا هەتا لە ألله تێبگەن لە سێ کەسدا. بەڵام کاتێك ئەو تێگەیشتنەیان جێبەجێ کرد لەسەر بیروباوەڕەکەیان، ئەوا گەڕاندیانەوە بۆ دواوە بۆ سەرەتای زەمەن. دروستە کوڕ و ڕۆحی قودس لە بنەڕەتدا لە باوکەوە هاتونەتەدی، بەڵام ئەمە حاڵەتێکی کاتی نەبوو بەڵکو هەرسێکیان هەر لە سەرەتاوە پێکەوە بوون. لە ڕاستیدا مەسیحیەکان دوای ئەوەی چوونە ناو ئەو فرە جۆری سروشتی ألله ئیتر نەیاندەتوانی بیربکەنەوە لەوەی دەشێت ألله خوداوەندێکی کامڵ بێت بەبێ ئەوەی لە نێو ئەم فرە سروشتیەدا نەبێت. وەك باسمان کرد دوو ئایینە ئیبراهیمیەکەی تر: یەهودییەت و

[٦٢] ڕۆژی دورینەوە pentecost جەژنێکە جوولەکەکان ئاهەنگیان تیادا دەگێڕا کە دوای پەنجا ڕۆژ دێت لە جەژنی مەسیحیەکان، ئەمە وەك یادکردنەوەی پەیماننامەی سینائە لەنێونا ألله و ئیسرائیلدا، لەو کاتەدا لە قودس جەماوەرێکی زۆر لە جوولەکە کۆدەبوونەوە لە چەندین دەوڵەتەوە دەهاتن. لە یەکەمین کۆبوونەوەی حەواریەکاندا لەو ڕۆژەدا لەدوای هەستانەوەی مەسیح ڕۆحی قودس دابەزیە سەریان بە چەند زمانێکی وەك ئاگر بە زمانی نەتەوەکانی دراوسێیان قسەیان دەکرد، لەو ڕۆژەوە ئەم ڕۆژە بووە جەژنێکی مەسیحی.

ئیسلام، دژایەتی ئەم لاهوتە دەکەن بەڵام مەسیحیەکان خۆشیان دەوێت. ئەوان دەڵێن خۆشەویستی پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕکراوە، ناکرێت خۆشەویستی کامڵ بێت بەبێ بوونی خۆشویستراو. یەگەر خۆشەویستی یەکێك نەبێت لە تایبەتمەندیەکانی ألله ئەوا ناکرێت ألله خوداوەندێکلی ڕاستەقینە و کامڵ بێت، ئەمە داواکاریەکە دابینکراوە پێش بونیادنانی ئەم جیهانە ((هەروەك تیایدا هەڵمانبژارد لەپێش بونیادنانی جیهان))(نامەیەك بۆ خەڵکی أفسس: ٤/١) یەکێك لە ئایینزانە مەسیحیەکان ئەم خاڵەی ڕوون کردوەتەوە دەڵێت: ((ألله پێکهاتوە لە سێ کەسی یەزدانی هەریەکەیان ئەوی تری خۆشدەوێت، نەك هەر ئەوە بەڵکو بەشێوەیەکی نهێنی هەریەکەیان هاوشێوەی ئەوانی ترە))(١٢). یاسای بیروباوەڕی مەسیحیبەم شێوەیە باسی دەکات:

((باوەڕمان هەیە بە خوداوەندێکی تاك باوکی خاوەن توانای تەواو. . .

وە بە یەك خودا یەسوعی مەسیح تاکە کوڕی ألله. . .

وەبە ڕۆحی قودس خودای زیندووکەرەوە. . .

کە لەگەڵ باوك و کوڕدا کڕنوشی بۆ دەبرێت و بە گەورە دەزانرێت. . ))

# کاسۆلیکیەتی ڕۆمانی

هەتا ئێرە دوایین لەبارەی مەسیحیەتەوە بەشێوەیەکی گشتی. بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت هەموو مەسیحیەك هاوڕایە لەسەر ئەوەی وترا. مەسیحیەت زۆر ئاڵۆزە لەبەرئەوە پێویستە جەختبکەینەوە لەسەر ئەوەی پێشتر وترا تەنها تێگەیشتن بوو لە (سەرچاوەکانی مەسیحیەت). ئەمە واناگەیەنێت ئێمە هەوڵمانداوە بۆ شیکردنەوەی ئەو خاڵانەی تەواوی مەسیحیەکان هاوڕان لەسەری.

کاتێك لە مەسیحیەتی سەرەتاوە دێینە سەر جیهانی مەسیحیەتی هاوچەرخ دەبینین کڵێسای ئەمڕۆ دابەشبووە بۆ سێ بەشی گەورە: کاسولیکیەتی ڕۆمانی ناوەندەکەی ڤاتیکانە لە ڕۆما بڵاوبووتەوە لە ناوەڕاست و باشوری ئەوروپا، ئەیرلەندا، ئەمریکای باشور. ئۆرسۆزکسی ڕۆژهەڵاتی کە بەربڵاوە لە یۆنان و یەکێتی سۆڤیەتی جاران. پرۆتستانتیەت کە بەربڵاوە بەشێوەیەکی سەرەکی لە باکوری ئەوروپا و ئینگلتەرا و سکۆتلەندا و ئەمەریکای باکور.

هەتا ساڵی ٣١٣ز کڵێسا بەردەوام بوو لە بەرەنگاربوونەوەی زوڵم و زۆرداری ڕۆمانی. لەو ساڵەدا بە شێوەیەکی فەرمی داننرا بە ئایینی مەسیحیەتدا وەك ئایینێکی یەکسان لەگەڵ ئایینەکانی تری ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی، هێشتا سەدەیەکی بەسەردا تێپەڕ نەبوو مەسیحیەت بووە ڕێبازی فەرمی لە ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی لەساڵی ٣٨٠ز. جگەلە چەند جیابوونەوەیەکی بچوك، کڵێسا وەك یەك جەستە بەردەوام بوو هەتا ساڵی ١٠٥٤ز، ئەمە واتا هەتا نیوەی تەمەنی کڵێسا بەشێوەیەکی سەرەکی وەك یەك ڕێکخراو مایەوە. بەڵام لەساڵی ١٠٥٤ یەکەمین جیابوونەوە ڕوویدا دابەشبوو بۆ: کڵێسای ئۆرسۆزکسی یۆنانی لە ڕۆژهەڵات، کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمانی لە ڕۆژئاوا. هۆکارەکانی ئەم جیابوونەوەیە ئاڵۆزە لەڕووی لایەنە_جوگرافی، شارستانی، زمانەوانی، ڕامیاری، سەرەڕای کێشە ئایینیەکان_پێویست ناکات بچینە نێو ئەم وردەکاریانەوە بەڵکو لەبری ئەوە ڕوودەکەینە ئەم جیابوونەوە گەورەیە کە دەرکەوت لە کڵێسای ڕۆژئاوایی لەگەڵ دەرکەوتنی چاکسازی پرۆتستانتی لە سەدەی شەنزایەمدا. پرۆتستانتی چوار ڕێبازی گرتەبەر: معمدانیەت، لوسەریەت، کالفینیەت، ئەنجلیکانیەت، ئەم ڕێبازانە دابەشبوو بۆ چەند بەشێکی تر، هەتا ئاماری فەرمی ئێستا نزیکەی ٩٠٠ گروپی مەسیحی پرۆتستانتی هەن لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بە تەنها. لە ئێستادا بزوتنەوەی مەسکونیەت[٦٣] هەڵدەسێت بە دوبارە کۆکردنەوەی ئەو گروپانە. بەدەستپێکردن بەم ڕاستیانە ئێستا دەتوانین هەنگاو بنێین بەرەو گرنگییێدانی ڕاستەقینەمان ئەوەش هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە تێڕوانینی ئەم سێ لقە گەورەیە لە جیهانی مەسیحی هاوچەرخدا.

دەستپێدەکەین بە کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمانی بە کورتی باس لە دووچەمکی گرنگ دەکەین لە بەشەکانی مەسیحیەت: ئەوانیش: تێگەیشتنی کڵێسایە وەك دەسەڵاتی فێرکاری، تێگەیشتنی کڵێایە وەك کەرەستەیەکی نهێنیە پیرۆزەکان. کڵێسا وەك دەسەڵتێکی فێرکاری: سەرەتا ئەم تێگەیشتنە لەو وتەیەی دەڵێت ألله هاتوەتە سەرزەوی لە کەسی یەسوعی مەسیحدا بۆئەوەی خەڵکی بهێنێتە سەر ڕێگای ڕزگاری: واتە چۆن دەتوانن بژین لەم جیهانەدا، بۆئەوەی ببنە جێنشینی هەمیشەیی لەسەر جیهانی داهاتویان. ئەگەر ئەم ڕێنماییانە بەڕاستی دەرگای ڕزگاربوون بن ئەگەر کردنەوەی ئەو دەرگایە یەکێك لە هۆکارە

---

[٦٣] بزوتنەوەی مەسکونیەت ecumenical movement بزوتنەوەیەکی مەسیحی هاوچەرخی جیهانیە ئامانجی نزیککردنەوەی کڵێسا مەسیحیە جیاوازەکانە و کۆکردنەوەیانە لە یەك کڵێسادا، لەم بوارەدا چەندین سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێناوە.

سـەرەکیەکان بێـت بـۆ هـاتنی ألله بـۆ سـەر زەوی ئـەوا چاوەڕوان نـەکراوە ألـل دەرگایـەك بکاتـەوە بـۆ ئـەو مرۆڤانـەی لـەو سـەردەمەدا ژیـاون بەتـەنها. ئایـا نایـەوێت ڕیێنماییـەکانی بـەردەوام بێـت لـە جیهانـدا بـۆ هەمیشە؟ لەوانەیە خوێنەر بڵێت: ئایا ئەو ڕێنماییانە هەموویان بوونیان نەی لە کتێبی پیرۆزدا؟. لێرەدا دێینەسەر شیکردنەوەی ئەم بابەتە. دەستوری ویلایەتە یەکگرتوەکان ڕوون بەڕادەیەکی پێویست، بەڵام ژیانی کۆمەڵایەتی دەبێتە ژاوەژاو ئەگەر دەسەڵاتمان نەبێت بەسەر شیکردنەوەی ئەم دەستورە. هەمان شت دەسەپێنرێت بەسەر کتێبی پیرۆزدا، ئەگەر واز لەو کتێبە هێنرا بۆ شیکردنەوە تایبەتیەکان، ئەوا سەرئەنجام جەنگ ڕودەدات لەکاتی وتنی بیروڕاکانـدا!. گومـانی تێـدا نیـە ئەگـەر کڵێسـا وەك دەسـەڵاتێکی فێرکـاری هەڵنەسێت بە شیکردنەوەی کتێبی پیرۆز، ئەوا ئەمە دەبێتەهۆی کەوتنەوەی چەند دەرئەنجامێکی جیاواز، تەنانەت سەبارەت بە بابەتە گرنگەکان. کاتێك دوا سەرئەنجام بۆ وەڵامەکان سەبارەت بەم بابەتە باوەڕهێنان بێت بە چەندین وەڵام ئەوا دەبێتەهۆی لاوازبوونی بیروباوەڕی مەسیحی.

با نمونەیەك بهێنینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە. ئایا تەڵاقدان کارێکی ئەخلاقیە؟ بەدڵنیاییەوە دەبێت لە هـەموو ئایینێکدا بانگـەواز بکرێت بـۆ ڕێنمـونیکردنی ویـژدانی شـوێنکەوتوانی، وەڵامی دیاریکراو بـۆ ئـەم پرسیارە پەیوەستە بە گرنگی بابەتەکەوە. بەڵام ئەگەر وامان دانا ئێمە هەوڵدەدەین بۆ دەرهێنانی وەڵامێك لە کتێبی پیرۆزدا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. وەڵامەکە چی دەبێت؟ ئینجیلی مەرقەس لە مەسیحەوە بۆمان دەگوازێتەوە دەڵێت: ((هەر کەسێك ژنەکەی تەڵاقدا و ژنێکی تری هێنا وەك ئەوەیە داوێنپیسی کردبێت بەسەر ئەوەی یەکەمدا. ئەگەر ژنێك مێردەکەی تەڵاقدا و شوی بە یەکێکی تر کرد وەك ئەوەیە داوێنپیسی و زینای ئەنجام دابێت )). ئینجیلی لۆقا بە تەواوی لەگەڵ ئەمەدا هاوڕایە. بەڵام ئینجیلی مەتتا(٣٢/٥) بۆ ئەم یاسایە بەشێکی تر زیاد دەدات و دەڵێت: ((هەرکەسێك ژنەکەی تەڵاقدا–ئەوە داوێنپیسی کردوە–وا لە ژنەکەی دەکات داوێنپیسی بکات و هەرکەسێك ژنێکی تەڵاقدراو بهێنێت زینای ئەنجامداوە)). مەسیحی دەتوانێت بە چ دەرئەنجامێك بگات لەم بابەتەدا؟ ئەو ئەگەرانە چین لەم دەقەدا بەدەست دێت؟ ئایا دەشێت ژن و مێردێك هیچ کێشەیەکی گرنگ نەبێت لەنێوانیاندا جیاببنەوە و هەریەکەیان هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی تردا بکەن؟

ئەمە تەنها نمونەیەکە لەنێو کۆمەڵە پرسیارێکی زۆردا بۆ هەمیشە جێگەی گومانن، کاتێك دەبێتە کەرەستەی ڕێنمایی کردنمان کە بریتیە لە کتێبی پیرۆز و ویژدانمان بەتەنها. ئایا مەسیح لە کچێکی پاکداوێن لەدایکبووە؟ ئایا جەستەی بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان دوای مردنی؟ ئایا چوار ئینجیلە ڕەسەنەکە باوەڕپێکراون؟ ئەگەر دادگایەکی باوەڕپێکراومان نەبێت کە بتوانین پشتی پێ ببەستین لەم کێشانەدا ئەوا شیبونەوەی ئەخلاقی و لێکترازانی بیروباوەڕەکان دەبنە چەند دەرئەنجامێك کە ناتوانین لێیان دەرباز ببین. لەبەر ئەم هۆکارە بەتایبەت واتە بۆ خۆ پاراستن لەم لێکترازانە لەبیروباوەڕدا، مەسیح کڵێساکەی بنیات نا بۆئەوەی بەردەوام بێت لە نواندنی لەسەر زەوی، هەروەها بۆئەوەی دەسەڵاتێك هەبێت بۆ جیاکردنەوەی حەق و ڕاستی لە درۆ و چەواشەکاری لەو کێشانەدا، لە کێشەکانی مردن و ژیاندا. بەمجۆرە ژیان بدۆزینەوە لە وشە مردوەکانی کتێبی پیرۆزدا بۆئەوەی بەردەوام بێت لە ژیانی ئەمە مانای ئەو وشانەیە کە دراونەتە پاڵ یەسوع: ((١٨ هەروەها من پێت دەڵێم: تۆ بطرسیت و لەسەر ئەم بەردە کڵێساکەم دروست دەکەم لەگەڵ دەرگاکانی دۆزەخ کە توانات نیە بەسەریاندا. ١٩ کلیلی مەلەکوتی ئاسمانەکانت پێ دەدەم

هەموو ئەوەی دەیبەستێتەوە بە ئاسمانەکانەوە و هەموو ئەوەی لەسەر زەوی چارەسەری دەکەیت چارەسەر دەکرێت لە ئاسمانەکان. ))(ئینجیلی مەتتا ١٦/١٨-١٩).
لەکۆتاییدا ئەم بیرۆکەیە سەبارەت بە کڵێسا وەك دەسەڵاتێکی فێرکاری بیرۆکەیەکی پێکهێنا پاراستنی دەرگاکان. هەروەك هەموو نەتەوەیەك سەرۆکێکی هەیە ئایا ئیمبراتۆر بێت یان پادشا بەهەمان شێوە کڵێسا سەرۆکێکی سەر زەوی هەیە پێی دەوترێت پاپا بطرس لە ئەسقەفیەی ڕۆما جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەم بیرۆکەیە کاتێك پاپا بەشێوەیەکی فەرمی دەدوێت لەبارەی کێشەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت ألله دووری دەخاتەوە لە هەڵە. زۆرجار بەهەڵە تێگەیشتن هەبووە سەبارەت بەم بیروباوەڕە کە بانگمان دەکات بۆ جەختکردنەوە لەسەرئەوەی بێتاوانی بەهرەیەکی سنوردارە. ئەمە بەو مانایە نایەت پاپا خاوەنی داناییەکی کەموێنەیە، هەروەها مانای ئەوە نیە ألله یارمەتی پاپا دەدات لە زانینی وەڵامی هەموو پرسیارێکدا، مانای ئەوە نیە پێویستە لەسەر کاسۆلیکیەکان ڕاو بیروبۆچونی پاپا قوبوڵ بکەن لە کێشە ڕامیاریەکاندا. کاسۆلیکیەت دان بەوەدا دەنێت دەشێت پاپا هەڵە بکات بەڵکو دەکرێت تاوان و گوناه ئەنجام بدات، هەروەك دەکرێت هەڵە بکات لە ڕاو بیروبۆچونە مێژوییەکاندا. لەوانەیە کتێبێك بنوسێت هەڵەکمانی لەخۆبگرێت، هەروەها بێتاوان نیە تەنها لە دوو بازنەدا نەبێت: کێشەکانی بیروباوەڕ و بنەما ئەخلاقیەکان. بەتەنها لەم دوو بازنەیەدا بێ تاوانە، تەنها کاتێك بەشێوەیەکی فەرمی دەدوێت وەك مامۆستایەکی کڵێسا، ئەو بیروباوەڕە دیاری دەکات کە پێویستە هەمووان باوەڕی پێبهێنن یان بنەما ئەخلاقیەکان کە پێویستە پابەند بن پێوەی. کاتێك پاپا هەڵدەسێت بە شیکردنەوەی کێشەکان کە پەیوەندیان هەیە بە بیروباوەڕ و کێشە ئەخلاقیەکان زۆر بە وردی دوای ئەوەی سود وەردەگرێت لە هەموو یارمەتیەك لەلایەن ڕاوێژکارەکانیەوە، وەڵام دەداتەوە بەناوی کڵێسا. لە هاوشێوەی ئەم حاڵەتانەدا وەڵامێکی تەواو ناداتەوە بەڵکو کۆتا وەڵام دەاتەوە، چونکە ڕۆحی قودس پاپا دەپارێزێت لە هەڵە لەبەرئەوە ئەو وەڵامانە کڵێسا دوور لە هەڵەوە، دواتر دەبێتە ئەرك لەسەر هەموو کاسۆلیکیەك.
کڵێسا وەك کەرەستەیەکە بۆ نهێنیە پیرۆزەکان. بیرۆکەی دووەمی کاسۆلیکیەتی ڕۆمانی بریتیە لە بیرۆکەی کڵێسا وەك ئامرازێك بۆ نهێنیە پیرۆزەکان، کە زیاددەکرێت بۆ بیرۆکەی کڵێسا وەك دەسەڵاتێکی فێرکاری. بزانین چی پێویستە لەسەرمان ئەنجامی بدەین، ئەمە بەتەواوی جیاوازە لەوەی دەتوانین ئەنجامی بدەین، لێرەوە پێویستی نهێنیە پیرۆزەکان دەست پێ دەکات. کڵێسا یارمەتیدەرە لە هەردو بابەتەکەدا. هەڵدەسێت بە ڕوونکردنەوەی بەرنامە و بنەماکانی ژیان، هروەها یارمەتیمان دەدات بۆ ژیان بەپێی ئەو بنەمایانە. دووەم بەخشینی کڵێسا کەمتر نیە لەوەی یەکەم. مەسیح قوتابیەکانی بانگکرد بۆئەوەی بژین لە ئاستێکی مامناوەند لە خۆشەویستی و چاکەو خزمەتکردن. هیچ کەسێك ناڵێت کارکردن بەو جۆرە شتێکی ئاسانە. بەڵاك کاسۆلیکیەکان پێداگری دەکەن لەسەر ئەوەی ئێمە بەپێی پێویست گرنگی نادەین بەو هەلومەرجەی تێیداین تەنها کاتێك نەبێت کە دەرك بەوە دەکەین ئەم ژیانەی بانگمان دەکات بەبێ یارمەتیدان ئەستەمە، چونکە ئەو ژیانەی مەسیح و شوێنکەوتوانی باسی دەکەن ژیانێکی سەروو سروشتیە چونکە پێچەوانەی هاندەرە سروشتیەکانی مرۆڤە. چونکە خەڵك ناتوانن بژین لەسەروو سروشتی مرۆییەوە، بەتەواوی وەك ئەوەی فیل ناتوانێت ژیانێکی ئەقڵانی بژی. کەواتە پێویستمان بەیارمەتیدان هەیە کڵێسا وەك نوێنەری ألله لەسەر زەوی ئەم یارمەتیە دابین دەکات ئامرازەکەی لەم کارەدا بریتیە لە نهێنیە پیرۆزەکان.

لەسەدەی دوانزەیەمەوە ژمارەیەك نهێنی پیرۆز جێگیر کراون لە کڵێسای کاسۆلیکیەتی ڕۆمانیدا کە ژمارەیان حەوت دانەیە. ئەوەی سەیرە ئەم نهێنیانە هاوتای ساتەکان و پێداویستیە مەزن و گرنگەکانی ژیانی مرۆڤە. خەڵکی لەدایك دەبن، دەگەنە تەمەنی کامڵبوون، ژیانی هاوسەرگیری پێکدەهێنن یان تەواوی ژیانیان تەرخان دەکەن بۆ ئامانجێکی ژیانی دیاریکراو، دواتر دەمرنز لەم کاتەدا پێویستە کۆبکرێنەوە لە کۆمەڵگەدا هەرکاتێك لایان دا لێی، پێویستە لەسەریان نان بخۆن. نهێنیە پیرۆزەکان هاوشانێکی ڕۆحی دادەنێن بۆ ئەم ڕوداوە سروشتیانە، هەروەك پرۆسەی منداڵبوون مرۆڤ دەهێنێتە ناو جیهانی سروشتەوە، نهێنی لەئاوهەڵکێشانمنداڵ دەهێنێتە ناو سیستمی بوونەوە. کاتێك منداڵ تەمەنی کامڵبوون تێدەپەڕێنێت پێویستی بە بەهێزکردنی بیرکردنەوەیە بەوهۆیەوە نهێنی جێگیربوون وەردەگرێت. زۆرجار مرۆڤ ساتێکی بەسەردا دێت کاتێك گەنجە ژیان پێکدەهێنێت لەگەڵ ئافرەتێکدا لە نهێنی هاوسەرگیری، یان گەنجێك کچ بێت یان کوڕ ژیانی تەرخان بکات بە تەواوی بۆ ألله لەنێو کڵێسادا. لە کۆتایی ژیاندا نهێنی سڕینی نەخۆشەکان (هەروەها پێی دەوترێتنهێنی دوا سڕینی نەخۆش یە زەیت) بەوەی مرۆڤ چاوەکانی دادەخات بۆ دواجار لەسەر زەوی و ڕۆحی ئامادە دەکات بۆ دوا گەشتی.

لە هەمان کاتدا دوو ڕێوڕەسمی نهێنی هەن پێویستە ئەنجام بدرێن بەشێوەیەکی دوبارە بووە بەبەردەوامی. یەکێکیان نهێنی دانپیانان (هەروەها ناودەبرێت بە نهێنی تەوبە و پەشیمان بوونەوە لە ئەنجامدانی تاوان). هەتا مرۆڤ مرۆڤ بێت ئەوا ناتوانێت ژیان بەرێتەسەر بەبێ ئەوەی بکەوێتە تاوانەوە و لادانی نەبێت لە ڕێگەی ڕاست. ئەم لادانانە پەیوەستە بە چەند هەنگاوێکی دیاریکراوەوە کە گەڕانەوەی تاوانبار مسۆگەر دەکات بۆ ناو کۆمەڵگەی مرۆیی. کڵێسا فێرمان دەکات کاتێك مرۆڤ دان بە تاوانەکانیدا دەنێت بۆ ألله بە ئامادەبوونی یەکێك لە نوێنەرانی ألله، واتە قەشە، تەوبە دەکات و پەشیمان دەبێتەوە لە هەر تاوانێك ئەنجامی دابێت، بڕیار دەدات چیدی نەگەڕێتەوە سەر ئەنجامدانی ئەو جۆرە تاوانانە لە داهاتوودا، بەو جۆرە لێخۆشبوون هەیە بۆ تاوانەکەی، دواتر لێخۆشبوونی ألله پشتدەبەستێت بە ڕاستگۆیی لە پەشیمانبوونەوەی تاوانبار و نەگەڕانەوە بۆ سەری، خاڵیبوونی لە ڕووپامایی و درۆ، بەڵام قەشە هیچ کەرەستەیەکی نیە بۆ دیاریکردنی ئەوەی ئایا ئەو کەسە کە باس لە پەشیمان بوونەوەی دەکالت لە تاوان ئەنجامدان ڕاستگۆیە یان نا.

بەڵام نهێنی دووەم کە پێویستە دوپاتبکرێتەوە بەشێوەیەکی بەردەوام بریتیەلە نهێنی نەصرانیەت کە دادەنرێت بە ڕێوڕەسمێکی ئایینی گرنگ لە کڵێسای کاسۆلیکیەتدا، چەندین ناوی هەیە نهێنی سەرکەوتن، نهێنی ئەفخارستیا، قوربانی پیرۆز.

خاڵی ناوەندی لەم نهێنیەدا بریتیەلە زیندووکردنەوەی ڕووداوی دوا نانی ئێوارەی مەسیح: ((تیایدا یەسوع نانێکی هەڵگرت پیرۆزی کرد لەتی کرد و دای بە قوتابیەکانی وتی: وەریبگرن و بیخۆن. ئەمە جەستەی منە. دەفرێکی هەڵگرت سوپاسگوزاری کرد و پێی دان وتی: هەمووتان لێی بخۆنەوە چونکە ئەوە خوێنی منە کە دەڕژێنرێت لەبەر پاکبوونەوە لە تاوانەکان.)) (مەتتا: ٢٦/ ٢٦-٢٨). سەبارەت بە چەمکی کاسۆلیکی ئەم ڕووداوە کڵێسای کاسۆلیکی بەهەڵەی دادەنێت ئەو بۆنەیە لەڕووی ماناوە یادبکرێتەوە، قەشە لەڕێگەیەوە گرگنی بە ڕۆحیان دەدات وەك نمونیەك بۆ مەسیح. بەڵکو کڵێسای کاسۆلیکی ئەم ڕوداوە وەکو گواستنەوەی وزەی ڕۆحی ألله دەبینێت بۆ ڕۆحی مرۆڤ. بەشێوەیەکی گشتی ئەمە جێبەجێ دەکرێت بەسەر تەواوی نهێنیە پیرۆزەکاندا، بەڵام بەسەر نهێنی قوربانی پیرۆزدا دەچەسپێنرێت بەشێوەیەکی زۆر ناوازە. کڵێسای کاسۆلیکی دەزانێت لە قوربانی پیرۆزدا نان هەیە لەگەڵدەفری قوربانیدا، ئامادەبوونی

ڕاستەقینەی جەستەی مەسیحی مرۆیی و خوێنەکەی لەناو نان و شەرابدا دوو شتی پیرۆزن. ئەو وشانەی ((ئەمە جەستەمە. . . ئەمە خوێنمە. . . )) چەند وشەیەکی ڕوونە هیچ کێشەیەکیان نیە لەبارەی ئەم خاڵەوە. کاتێك قەشە ئەم وشانە دەڵێتەوە گۆڕانکاری ڕوو دەدات لە توخمەکاندا، ئەم گۆڕانکاریە تەنها لەڕووی ماناوە نیە. توخمەکان بەشێوەیەکی جیاواز نین چونکە شیکردنەوەی کیمیایی هیچ گۆڕانکاریەکی ئەوتۆ تۆمار ناکات. بەم واتایە توخمەکان دەمێننەوە وەك خۆیان لەکاتێکدا گۆڕانکاری ڕوودەدات لە مادده و گەوهەرەکەیدا واتە کارلێك ڕوو دەدات. دەتوانین بڵێین نهێنی ئەفخارستیا بەخشینی ألله دەگوازێتەوە هەروەك بەلەمێك کە سەرنشینەکانی دەگوازێتەوە لەکاتێکدا نهێنیە پیرۆزەکانی تر پێویستە هێزی ألله بەشداربێت تێیدا جگەلە کەرەستەکان، بەڵام لە نهێنی ئەفخارستیا خۆراکپێدانی ڕۆح بریتیە لە گواستنەوەی هێزی ألله چونکە هێزی ڕۆحی بوونی هەیە لە ڕەگەزە گوازراوەکاندا. گرنگی نهێنی قوربانی پیرۆز لە خۆراکپێدانی ژیانی ڕۆحی مەسیحیەکاندا هاوشانی گرنگی خواردن پێدانی جەستەییە.

قەشە فرانسیس دی سیل لەم بارەیەوە دەڵێت:

کاتێك دەمت دەکەیتەوە بۆ نانی ژیان کە لێوانلێوە لە بیروباوەڕ و چاکەخوازی وەریبگرە، بەوەی تێیدایە چونکە باوەڕدەهێنین بەهۆیەوە یەکترمان خۆشدەوێت. . . خۆت وەکو هەنگێك دابنێ کاتێك شەونمی بەرەبەیان کۆدەکاتەوە لەسەر گوڵەکان دەیگۆڕێت بۆ هەنگوین دەیباتەوە بۆ ناو شانەکەی، بەهەمان شێوە قەشە کاتێك لە کوشتارگە وەك شەونم ڕزگارکەری جیهان هەڵدەگرێت کە وەکو گوڵە دەیخاتە ناودەمتەوە (١٣).

ئەم ئامادەبوونەی ألله لە توخمەکانی نهێنی نەصرانیەتدا، جیایدەکاتەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە هەموو نهێنیەکانی تری ڕێوڕەسمە پیرۆزەکان بەڵام پەیوەندیە هاوبەشەکەی هەڵناوەشێنێتەوە چونکە هەریەکەلە نهێنیە پیرۆزەکان کەرەستەیەکن ألله لە ڕۆحی مرۆڤەکاندا هێزێك دەچەسپێنێت کە یارمەتیان دەدات بەردەوام بن لە ژیان لەم جیهانەدا بەجۆرێك دەیانکاتە کۆمەڵە کەسانێك ژیانی هەمیشەیی بەدەست بهێنن لە جیاهی داهاتویاندا.

کاسۆلیکیەت وادەبینێت مەسیح چوەتە پاڵ دەسەڵاتی کڵێسای فێرکاری، ئەمە ئەو کارەیە مەسیح سپاردی بە قوتابیەکانی کاتێك لە کۆتایی پەیامەکەیدا وتی: ((کەواتە بڕۆن هەموو نەتەوەکان فێربکەن بەهەموو ئەو شتانەی پێم سپاردون. ئەوەتا من لەگەڵتانم لە هەموو ڕۆژەکاندا هەتا ئاخر زەمان!))(ئینجیلی مەتا: ١٩/٢٨-٢٠).

## ئۆرسۆزکسی ڕۆژهەڵاتی

جیابوونەوەیەك ڕوویدا لەنێوان کڵێسای ئۆرسۆزکسی ڕۆژهەڵاتیدا کەلە ئێستادا نزیکەی ۲٥۰ ملیۆن ئەندام لەخۆ دەگرێت لەگەڵ کڵێسا ڕۆمانیدا بەشێوەیەکی فەرمی لەساڵی ۱۰٥٤ز. هەریەك لە کڵێساکان ئەوەی تر تاوانبار دەکات بەم جیابوونەوەیە. کڵێسا ڕۆژهەڵاتیەکان ئەمانە دەگرێتەوە کڵێساکانای ئەلبانیا، بۆلغاریا، جۆرجیا، یۆنان، ڕۆمانیا، ڕوسیا، صربیا، سیناو. لەگەڵ ئەوەی هەریەکەیان خۆی بەڕێوە دەبات بەڵام ئەندامەکانی خۆیان بە بەشێك دەزانن لە کڵێسای ڕۆژهەڵاتی.

کڵێسای ئۆرسۆزکسی لە زۆر بواردا زۆر نزیکە لە کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمانی، گومانی تێدانیە هەردو کڵێساکە هەتا نیوەی مێژوویان وەك یەك جەستە وەهان. کڵێسای ئۆرسۆزکسی باوەڕی هەیە بە هەمان حەوت نهێنیە پیرۆزەکە بەهەمان شێوە شیاندەکاتەوە. بەڵام چەند جیاوازیەك هەیە کە پەیوەندی بە دەسەڵاتی فێرکاریەوە هەیە. تەنانەت لەم خاڵەدا ئەگەر وازهێنرا لە کتێبی پیرۆز بۆ شیکردنەوە تایبەتەکان ئەوا بیروباوەڕی مەسیحی ئەو بانگەشە گومانانە نامێنن. بەوهۆیەوە کڵێسا بەرپرسە لە مسۆگەرکردنی پاراستن بە دەسەڵاتی فێرکاری، ألله یارمەتیداوە لەو کارەدا، ڕۆحی قودس دەیپارێزێت لە هەڵە. هەتائێرە کڵێسای ڕۆژهەڵاتی هاوڕایە لەگەڵ کڵێسای ڕۆمانیدا. بەڵام لە دوو خاڵدا ناکۆکن یەکێکیان پەیوەندی هەیە بە ماوەوە: چونکە ژمارەی ئەو کێشانەی پێویستی بە کۆبوونەوەیە دیاریکراون، بە بەراوردکردن لەگەڵ ژمارەیەکی گەورە لەو کێشانەی پێویستە بخرێنەڕوو لە کڵێسای کاسۆلیکی. لەڕووی بنەماوە کڵێسا دەتوانێت بیروباوەڕەکانی ناو کتێبی پیرۆز شیبکاتەوە بەڵام ناتوانێت دەست بە بیروباوەڕەکان بکات لە سەرەتاوە. لەڕووی پراکتیکیەوە کڵێسا هەستاوە بە کارکردن بەو مافەی پێی دراوە وەك دەسەڵاتێکی ڕێگەپێدراو لە شیکردنەوەی بیروباوەڕە پیرۆزەکان تەنها بۆ حەوت جار، ئەمە لەو حەوت کۆنگرەیەی بەسترا لەپێش ساڵی ۷۸۷ز. ئەمە واتە کڵێسای ڕۆژهەڵاتی وا بە پێویست دەزانێت هەموو مەسیحیەك باوەڕی پێبهێنێت، جگە لە ژمارەیەکی کەم. ئەگەر ویستمان بدوێین بەشێوەیەکی دیاریکراو ئەوا هەموو بڕیارەکان کە لەم حەوت کۆنگرەیەدا باسکراوە ڕەنگدانەوەیان هەیە لە یاساکانی ئیمان و بیروباوەڕدا، لەدەرەوەی یاساکانی ئیماندا پێویستیەك نیە بۆ ڕاگەیاندنی بیروباوەڕی زیادکراو سەبارەت بەکێشەکانی purgatory[٦٤] لێخۆشبوون (کڵێسای کاسۆلیکی دەیبەخشێت)، ئاوڵەمەی بێگەرد[٦٥]، بەرزکردنەوەی مەریەمی پاکداوێن بۆ ئاسمان لەدوای مردنی. سەبارەت بەم بیروباوەڕەی دوایی ئۆرسۆزکسی بەشێوەیەکی پراکتیکی خستویەتیە ناو بیروباوەڕیەوە بەبێ ئەوەی ڕایبگەیەنێت وەك بیروباوەڕێکی ئیمانی. کاسۆلیك ئەم بیروباوەڕانە بەرزڕادەگرێت وەك پەرەپێدانی بیروباوەڕ سەیریان دەکات، لەکاتێکدا ئۆسۆزکس بەشتێکی داهێنراوی دەزانێت. ئەگەر ئەم ناکۆکیە چڕبکەینەوە دەتوانین بڵێین کڵێسای لاتینی جەخت دەکاتەوە

---

[٦٤] purgatory: ئاستێك یان شوێنێکە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا تیایدا سزا دەدرێت تا ماوەیەکی دیاریکراو بۆ ئەوانەی شایستەی سزادانن لەو کەسانەی دەروونیان بە تەواوی پاکنەبووەتەوە، بۆئەوەی دەرونیان پاکببێتەوە دواتر ڕێگەیان پێدەدرێت بچنە ناو بەهەشتەوە، ئەمە بیروباوەڕێکە تایبەتە بە کڵێسای کاسۆلیکی لە بیروباوەڕێکی قووڵەوە کە پڕە لە بەزەیی ألله لەگەڵ بەندەکانیدا ئەمە بۆ ئەوە بوو ئەو کەسانە لە سزای هەمیشەییدا نەمێننەوە کە شایستەی سزای هەمیشەیی نین.

[٦٥] بیروباوەڕی ئاوڵەمەی بێگەرد immaculate conception وادادنەیت مەریەمی پاکداوێن لەدایك بووە تا مردنی هەڵگری هیچ تاوانێك نەبووە ئەمە بیروباوەڕێکە پاپا بیوس دایناوە لە ساڵی ۱۸٤٥ز. بەمجۆرە بوو بە بەشێك لە بیروباوەڕی کڵێسای کاسۆلیکی، لەکاتێکدا کڵێسای ئۆرسۆزکسی ئەمە ڕەت دەکاتەوە لەگەڵ هەموو کڵێساکانی پرۆتستانتی.

لەسەر پەرەسەندنی بیروباوەڕی مەسیحی، لەکاتێکدا کڵێسای یۆنانی جەخت دەکاتەوە لەسەر بەردەوام بوونی و پێداگری دەکات لەسەرئەوەی کڵێسا پێویستی بە کارکردن نیە بە دەسەڵاتەکانی لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەو یاسایانەی لە کۆنگرەکاندا دانراوە. لەم ناکۆکیانەدا دەسەڵاتی فێرکاری ئەکادیمی کڵێسا دێتەناو بابەتەکەوە. کاتێك دەگەین بە وێنەی کاسۆلیکی ڕۆمانی ئەوا بیردەکەینەوە لە سەدەکانی ناوەڕاست. بەڵام هاوشانەکی لە ئۆرسۆزکسی ڕۆژهەڵاتیدا بریتیەلە کڵێسای باوکان.

بواری دووەم کاتێك تێگەیشتنی کڵێسای ڕۆژهەڵاتیوەك دەسەڵاتێکی فێرکاری ناکۆکە لەگەڵ بیرکردنەوەی کڵێسای ڕۆژئاواییدا لەڕووی بیروباوەڕی ئاینیەوە. کڵێسای ڕۆمانی وەك پێشتر بینیمان لە دوا شیکردنەوەدا دەگەن بەو بیروباوەڕانە لەڕێگەی پاپاوە، بەجۆرێك ڕۆحی قودس ئەو بڕیارانە دەپارێزێت کە پاپا ڕایدەگەیەنێت لەبارەی هەڵەکانەوە. بەڵام کڵێسای ڕۆژهەڵاتی پاپای نیە. ئەگەر ویستمان جیاوازی نێوان دوو کڵێساکە کورتبکەینەوە. لەبری ئەوە کڵێسای ڕۆژهەڵاتی وابیردەکاتەوە ڕاستی أللە ڕاگەیەنراوە لەڕێگەی ویژدانی کڵێساوە، ئەم دەستەواژەیە بەکاردەهێنن بۆ ئاماژەکردن بۆ مەسیحیەت بە شێوەیەکی گشتی. ئەمە پێویستی بە بیرکردنەوەی زیاترە. هەمان شت پەیڕەو دەکرا لەلایەن ئەنجومەنی ئەکلیروسیەوە کاتێك هەموو قەشەکان کۆدەبنەوەئەوا بڕیارەکانیان ڕاستیەك بنیات دەنێت کە أللە دەیەوێت شایەنی گۆڕان نین(١٤). لێرەدا دروستە بڵێین ڕۆحی قودس بڕیارەکانیان دەپارێزێت لە هەڵە، بەڵام بەئاگاترە بۆ ڕۆحی کڵێسای ڕۆژهەڵاتی کە دەڵێت ڕۆحی قودس ئەقڵی مەسیحیەکان دەپارێزێت لە لادان بەرەو هەڵە، چونکە بڕیاری قەشەکان تەنها کاردەکات بۆ کۆکردنەوەی بیری مەسیحیەکان بەگشتی.

ئەم بابەتە دەمانبات بەرەو یەکێك لە جەختکردنەوەکانی کڵێسای ڕۆژهەڵاتی. لەڕاستیدا کاتێك کڵێسای ڕۆژهەڵاتی لە چەند لایەکەوە دەوەستێت لە ناوەڕاتی ڕێگاکەدا لەنێوان کاسۆلیکی ڕۆمانی و پرۆتستانتی، قورس بوو لەسەرمان ئەو خاڵانە دیاریبکەین کە جیای دەکاتەوە لەوانی تر بەشێوەیەکی ڕوون، بەڵام ئەگەر ویستمان دوان لەو خاڵانە هەڵبژێرین، یەوا یەکێك لەو تایبەتمەندیانە بریتیەلە تێڕوانینی گشتیمان بۆ بەشداربوون و یەکگرتوویی نێوانمان. وەك بینیمان سەیرکردنی کڵێسا وەك جەستەی هەناوی نهێنی مەسیح شتێکی اوبەشە لەنێوان هەموو مەسیحیەکاندا، هەروەها ئەم بەشانەی جەستە بەشدارە لە نەخۆشی و تەندروستی ئەو جەستەیەدا، بەهەمان شێوە ژیانی مەسیحیەکان پێکەوە بەستراوە لە یەك جەستەدا.

مەسیحیەکان باوەڕیان وایە ئەوان وەك یەك جەستە وەهان هەندێکیان دەبنە ئەندامی لەشی ئەوانی تر، بەڵام کاتێك ئەستەم دەبێت ڕۆبچین لەو بابەتانەی پەیوەندیان هەیە بە پابەندبوونیان بەم بیروباوەڕەوە، ئەوا دەتوانین بڵێین کڵێسای ڕۆژهەڵاتی زیاتر گرنگی دەدات بەم بیروباوەڕە بەبەراورد بە کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمانی یان پرۆتستانتی. هەموو مەسیحیەك کار دەکات بۆ ڕزگاربوونی بەهۆی پەیوەست بوونی بە کڵێساوە، بەڵام بەشێوەیەکی تاك کارناکات بۆئەوەی ڕزگاربوون دابین بکات بۆ ڕۆحی خۆی بەتەنها. لەلای بەشی ڕوسی ئۆرسۆزکسی وتەیەك هەیە لەبارەی ئەم بابەتەوە دەڵێت: ((دەکرێت مرۆڤ بە تەنها تاوانباربکرێت و لەناوبرێت، بەڵام ناکرێت ڕزگاری ببێت تەنها لەگەڵ ئەوانی تردا نەبێت. )). ئۆرسۆزکسی بۆ لەوە دوورتر دەچێت چونکە ئەو بەشێوەیەکی توند بیرۆکەی قەشە بولس جێبەجێ دەکات سەبارەت بە گەردون (هەموو گەردون دەژی لەناو ژاوەژاوە و ئازاردا چاوەڕوانە هەتا لە تاوان ڕزگاربکرێت واتە لە بەندایەتی کردنی تاوان ڕزگاری ببێت و تەنها بەندایەتی أللە بکات). کەواتە چارەنوسی تاك پەیوەستە بە کڵێساوە وەك هەمووان نەك هەر ئەوە بەڵکو کڵێسا بەرپرسیارە لە یارمەتیدان بۆ پیرۆزکردنی جیهان و

مێژوو. چاکبوونی هەموو شتێك لە جیهاندا تاڕادەیەك پەیوەستە بەو کارەی هەموو تاکێك ئەنجامی دەدات لەم کڵێسایەدا، یان ئەوەی لە نرخی کەمدەکاتەوە.
وێڕای ئەوەی دەرئەنجامی گرنگی ئەم هەستپێکردنە بەهێزە دەرئەنجامی ڕۆحیە کە ئانفا ئاماژەی بۆ کردوە، واتە کەمکردنەوەی خودپەرستی پیرۆز کە ڕزگاربوونی بۆ خۆی دادەنێت پێش هەموو کەسێك ئەوا چەمکەکە دوو دەرئەنجامی هەیە یەکێکیان پێشتر ئاماژەی بۆکرا کە بریتیەلە دەسەڵاتی فێرکاری کڵێسا بەوەی ویژدانی مەسیحیەکان بریتیەلە ویژدانی کڵێسا بەجۆرێك ئۆرسۆزکسی باوەڕی هەیە بەوەی ڕاستی تایبەت بەڕۆحی قودس دێتە ناو جیهانەوە و بڵاودەبێتەوە لە مێشکی مەسیحیەکاندا بەشێوەیەکی گشتی. تاکە مەسیحیەکان خانەکانی مێشکی مەسیح پێکدەهێنن کە بەهۆیەوە کاردەکەن بەشێوەی کۆمەڵ.
بەڵام لایەنەکەی تری ئەم خاڵە پەیوەندی هەیە بە بەڕێوەبردنەوە. لەکاتێکدا بەڕێوبەرایەتی کڵێسای ڕۆمانی بەشێوەیەکی ئاشکرا و ڕاشکاوانەیە، کڵێسای ڕۆژهەڵاتی زۆربەی بڕیارەکانی دەدات لەسەر بنەمانی کەسە عەلمانیەکان (واتە ئەو کەسانەی پیاوی ئایینی نین و لە کڵێسادا کارناکەن)، بۆ نمونە کۆمەڵە نوێژکەرەکان ڕۆڵێکی زیاتریان هەیە لە کاسولیکیەکان لە هەڵبژاردنی پیاوە ئایینیەکاندا، بەڵام هەستی بەشداریکردن لەلای کڵێسای ڕۆژهەڵاتی جارێکی تر بردی بەرەو هیدایەتی یەزدانی، تەنانەت کاتێك دەس دەبات بۆ ئەو کێشانەی پەیوەندیان هەیە بە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کڵێساوە هەروەها بڵاودەبێتەوە بەشێوەیەکی گشتی لەناو هەموو مەسیحیەکاندا زیاتر لەوەی ڕۆما ڕێگا دەدات بە پیاوانی ئایینی لە بوارە تایبەتیەکەیاندا کە ناکرێت دەستی بۆ ببرێت: وەك بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمە ئایینیەکان بەڵام لە دەرەوەی ئەم بوارەدا ئەو هێڵەی پیاوانی ئایینی جیا دەکاتەوە لە کەسانی ئاسایی هێڵێکی زۆر باریکە. لەم ڕووەوە ناکرێت قەشەکانی کڵێسای ڕۆژهەڵاتی بە ڕەبەنی بمێننەوە و ژیانی هاوسەری پێکنەهێنن.
پێشنیارمان کردوە لە ئایینەکانی ئاسیادا یەککگرتن گرنگترە لە تاکڕەوەی لە ڕۆژئاوادا، چونکە هیندۆسیەت کاردەکات لەسەر بنەمای تێکەڵکردن. ئەگەر دروست بێت بەشێوەیەکی نزیکەیی یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لە جەختکردنەوەی کڵێسای ڕۆژهەڵاتی لە مەسیحیەتدا زیاتر لە کڵێسای ڕۆژئاوایی، لەسەر سروشتی یەکگرتوویی کڵێسا ئایا لەڕێگەی یەکسانیەوە بێت بۆ هەموو شوێنکەوتوانی بەپێچەوانەی کاسۆلیکیەتەوە یان یەکگرتنیان لە یەك جەستەدا بە پێچەوانەی پرۆتستانی(١٥)، بە هەمان شێوە دەکرێت کڵێسای ڕۆژهەڵاتی کاریتێکرابێت بەهۆی گۆڕانی سەردەمەکانەوە، سەرئەنجامی ئەمە هاوشێوەی مەسیحیەتی سەرەتایی مایەوە. بەڵام بەهەرحاڵ هەوڵنادەین بۆ دۆزینەوەی ئەم ئەگەرە، بەڵکو هەنگاو دەنێین بەرەو پێشەوە بۆ ناسینەوەی کڵێسای ڕۆژهەڵاتی کەلە ڕووی جوگرافیاوە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە هاندانی دا ئەمە بەرنامەیەکی سۆفیگەریە کە دەگونجێت لەگەڵ هاوشانەکەیدا لە ئاسیا و دەنگدانەوەی هەیە لە چەند ناوچەیەکی جیهاندا.
مەسیحیەت وابیردەکاتەوە وەك هەموو ئەو ئایینانەی باسمان کرد ڕاستی پێکهاتوە لە دوو بەش سروشتی و سەروو سروشتی. لەدوای مردن دەچینە ناو ژیانی مرۆڤایەتیەوە بەشێوەیەکی گشتی بەرەو جیهانی سەروو سروشتی. بەڵام تەنانەت ئەم جیهانەی ئێستا دانەبڕاوە لەو جیهانەی سەروو سروشت. یەکەم نهێنی ڕێوڕەسمە پیرۆزەکان وەك بینیمان کەناڵێکە لەڕێگەیەوە دەگەین بە بەخشینەکانی سەروو سروشت کاتێك لەسەر زەویدان.

**ئەمە لەڕاستیدا بابەتی فێرکاری مەسیحیەتە بەگشتی بەڵام جیاوازیەکان کاتێك دێنەپێش  کە ئەپرسین تا چ ڕادەیەك هەوڵدان بۆ بەشکردنی ژیانی سەروو سروشتی بەشێکە لە بەرنامەی مەسیحیەت، لەکاتێکدا هێشتا لەسەر زەوین؟ کاسۆلیکی ڕۆمانی وابیردەکاتەوە سیانەی پیرۆز دەژی لەناو ڕۆحی هەموو مەسیحیەکدا، بەڵام زۆرجار هەست ناکرێت بەم ئامادەبوونە.  دەکرێت لەڕێگەی نوێژ و نزاکانەوە مرۆڤ ئامادەبکرێت بۆئەوەی سیانەی پیرۆز هەست پێبکات.  بەڵام ئەم حاڵەتانە دانانرێت بە مافێکی سروشتی کە هەموو سۆفیگەرێك دەتوانێت بەدەستی بهێنێت بۆ بەرزبوونەوەی لە حاڵەتێکی بێئاگاییدا بەڵکو ئەم حاڵەتانە بەشێوەیەکی گشتی وەك جۆرێك لە بەخشین دەمێننەوە، بەو هۆیەوە کڵێساای کاسۆلیکی ڕۆمانی هانی تاکەکانی نادات بۆ گەیشتن بەم حاڵەتانە بەڵکو قەدەغەیان دەکات.  بەڵام کڵێسای ڕۆژهەڵاتی هاندەری ژیانی سۆفیگەریە بەشێوەیەکی چالاکتر.  چونکە لە دێرزەمانەوە کاتێك بیابانی تەنیشت ئەنتاکیە و ئیسکەندەریە پڕە لەو سۆفیانەی دەگەڕێن بەدوای ڕووناکبوونەوەی ڕۆحیاندا، ئەم پڕۆژەی سۆفیگەریە گرنگی پێدرا لەژیانیاندا کاتێك ژیانی سەروو سروشتی جیهانی هەستەکان پڕ دەات لە هەموو ڕووەکانەوە، بەوهۆیەوە پێویستە بەشێك بێت لە ژیانی مەسیحی بەشێوەیەکی گشتی هەروەها دەبێت پەرەپێبدرێت لەسەر ئەزمونی ڕاستەوخۆ بۆ شکۆدارکردنی أللە.**

**ئایا ماسی بەرزدەبێتەوە بۆئەوەی بەدوای زەریادا بگەڕێت،**
**ئایا داڵ دەنیشێتەوە بۆ ئەوەی هەوا بدۆزێتەوە،**
**ئایا دەکرێت بپرسین لە ئەستێرە جوڵاوەکان**
**ئایا هەواڵیان هەیە لەبارەی تۆوە لەوێدا[٦٦]؟؟**
**ناکرێت کاتێك سیستمە سوڕاوەکان تاریك دەبن**
**هەستە بێ دەسەڵاتەکانمان بەرزدەبنەوە،**
**دەتوانین گوێبگرین لە جووڵەی پەڕی باڵندەیەك،**
**کاتێك لە دەرگا قوڕینەکانمان دەدەن کە داخراون.**
**فریشتەکان جێگا دێرینەکانیان دەپارێزن،**
**بەردێك لەوێدا دەسوڕێتەوە، یان دەست بە فڕین دەکات لەوێدا**
**ئەوە تۆیت، ئەمە ڕوخسارتە کە بووەتە شتێکی نامۆ**
**ئەمە شتێکە ڕووناکی لەدەستداوە[٦٧].**
**(فرانسیس طومسون، مەملەکەتی أللە).**

**تەسەوفی هەناوی بەرنامەیەکی پراکتیکیە تەنانەت بۆ کەسە عەلمانیەکان.  پێویستە ئامانجی هەموو ژیان یەکگرتن بێت لەگەڵ أللە.  وشەی theosisی یۆنانی لەبارەی ئەم بیروباوەڕەوە دەڵێت ئەم بەشداریکردنە شتێکی بەردەستە.  کاتێك چارەنوسمان بریتی بێت لە چوونەناو ژیانی سیانەی پیرۆزەوە واتە ئەو خۆشەویستیەی دەسوڕێتەوە بەبێ وەستان لەنێوان باوك و کوڕ و ڕۆحی پیرۆزدا، چونکە جووڵان بە ئاڕاستەی ئەم ئامانجە پێویستە ببێتە بەشێك لە ژیانی هەموو مەسیحیەك، چونکە کاتێك بەرەوپێش دەچین**

---

[٦٦] دەیەوێت بڵێت مرۆڤ دەگەڕێت بەدوای أللە لێرە و لەوێ دا، وێڕای ئەوەی لە قوڵاییەکانیدایە و نزیکترە لێوەی لە شا دەماری ملی، وەك ئەو ئاوەی دەوری ماسیەك دەدات و ئەو هەوایەی دەوری داڵێك دەدات. . . هتد.

[٦٧] واتە کەسی زانا أللە دەبینێت لە هەموو شتێکدا، چونکە هەموو شتەکان بەرزڕاگرتنی أللە تیایاندا بەدی دەکرێت.

**بۆ بەشداریکردن لە سیانەی پیرۆزدا ئەوا بەتوانا دەبین لەسەر ئەوەی ألله خۆشبوێت لەناخی دڵ و ڕۆح و ئەقڵماندا، هەروەها دراوسێکانمان خۆشبوێت وەك خۆمان. بەخشینەکانی سۆفیگەری هەناوی کراوەیە بۆ هەموو کەسێك کەواتە پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێك ژیانی تایبەتی بکاتە حەجێك بەرەو سەرکەوتن.**

## پرۆتستانتیەت

ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی دابەشبوون لەنێوان کاسۆلیکیەت و ئەوەی ناونرا پرۆتستانتیەت زۆرن، هەتا ئەمڕۆ جێی ناکۆکین. ئابوری ڕامیاری، نەتەوەیی، ڕەوتی تاکڕەوی لە سەردەمی ڕاپەڕیندا، دڵەڕاوکێی زیالەپێویست سەبارەت بە گەندەڵی پیاوانی ئایینی ناو کڵێساکان بەهۆی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتی ڕێگەپێدراو بۆیان. . هەموو ئەمانە ڕۆڵیان بینی لە ڕوودانی ئەو دابەشبوونەدا بەڵام بەهەرحاڵ ئەو هۆکارە ناشاردرێتەوە هۆکاری سەرەکی ئایینی بوو، ئەوە جیاوازی بیروڕای مەسیحیەکان بوو لەنێوان کاسۆلیکی و ڕۆمانی و پرۆتستانتیدا. کاتێك گرنگیدانمان لەم کتێبەدا تەنها لەسەر بیرکردنەوەکان بێت نەك لەسەر مێژوو ئەوا لەوە زیاتر ناڵێین لەبارەی هۆکارەکانی چاکسازی پرۆتستانتی. لەبری ئەوە تەنها باس لە کێشەکانی سەدەی شانزەیەم دەکەین مارتن لۆسەر، جۆن کالفن، چەندین کەسی تر تونێلێکی فراوانیان دروست کرد.

کڵێسای ڕۆژئاوایی چووەناو ئەو تونێلەوە وەك یەك نەتەوە بەڵام کاتی هاتە دەرەوەی چەندین بەشی لێ دروست بوو.

جیاوازی قووڵتر لەنێو کڵێساکانی پرۆتستانتیدا ناکۆکی تایفەگەرایی نین بەڵك ناکۆکین لەڕووی جەختکردنەوە و پابەندبوون بە بابەتە ئایینیەکانەوە. لەبری ئەوە بۆئەوەی زۆربەی بیروباوەڕ و ڕێوڕەسمەکان دووبارە باس نەکەینەوە باس لە دوو بابەتی گرنگ دەکەین

١- ڕاستی دەرخستن تەنها بە ئیمان.

٢-بنەمای ناڕەزایی دەربڕین.

چەمکی ئیمان. لە پرۆتستانیەتدا چەمکی ئیمان تەنها بیروباوەڕ نیە یان باوەڕهێنان بە بابەتێکی دیاریکراو، بەڵکو وەڵامدانەوەیەکی تەواوە بۆ خود بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، یان بەپێی وتەی ئیمیل برونر: ((کارێکی کامڵی کۆکراوەی کەسایەتیە))، دواتر ئیمان بەپێی ئەمە جوولەی ئەقڵە بە باوەڕهێنان و ڕازی بوون، بەشێوەیەکی تایبەتباوەڕی تەوا بەهێزی بەدیهێنەری ألله کە بێسنورە، لە هەموو شوێنێکدا بوونی هەیە. بەڵام ئەمە هەموو شتێك نیە، بەڵکو هەتا بیروباوەڕ ڕاستەقینە بێت پێویستە جوولەی هەستەکانی خۆشەویستی و متمانە لەخۆبگرێت، لەگەڵ ویستی ئەوی مرۆڤ ببێتە کەرەستەی ألله لە خۆشەویستیەکەیدا لەگەڵ مرۆڤەکان. کاتێك پرۆتستانتیەت دەڵێت مرۆڤەکان تەنا بە ئیمان دەتوانن ڕاستیەکان دەربخەن، هەروەها دەڵێت ژیانی نوێ بۆ دروستکردنی پەیوەندیەکی دروست پێویستە هەریەکە لە ئەقڵ و ویست و هەستەکان پێکەوە کاربکەن بۆ دروستکردنی ئەو پەیوەندیە لەگەڵ ألله، کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمانی بەشێوەیەکی زیاتر تێدەگات لە ئیمان بە هەمان ڕێگە.

ئیمان بەپێی ئەم پێناسەیە دیاردەیەکی تایبەتە مرۆڤ دەتوانێت قوبوڵی بکات لەڕێگەی دووبارەکردنەوە چونکە خۆشەویستی و خزمەت ناکرێت قوبوڵبکرێن. ئیمان لەکاتی وەڵامدانەوەیدا ئەو مرۆڤە دەکاتە بەندەی خودا. ئەمە لە وتەیەکی مارتن لۆسەردا خراوەتە ڕوو: ((هەموو مرۆڤێك پێویستە کاربکات بۆ ئەو ئیمان و بیروباوەڕەی هەیەتی، هەروەها پێویستە لەسەری کار بکانت بۆ مردنی. )).

بۆئەوەی هەست بیکەین بە هێزی جەختکردنەوەی پرۆتستانی لەسەر ئیمان پێویستمان بە جەختکردنەویە وەك ڕەتکردنەوەی ڕۆتینی ئایینی. ناڕازیبوونی مارتن لوسەر لەبارەی چاوپۆشیکردن بە بڕوای مارتن ئەو

ماوەیــە کەمدەکاتــەوە مرۆڤــەکان بەســەری دەبــەن لــە بەخشــین و چاوپۆشــیکردندا، ئەمــە هێمایەکــە بــۆ ناڕازیبوونێکی بەرفراوانتر لە چەندین جێگاوە. هیچ جۆرە ڕێوڕەسمێکی ئایینی دیاریکراو نیە نە نهێنی ئایینی یان تۆمارێك نیە بۆ کارە خێرخوازیەکان، هەروەها لیستێك نیە بۆ ئەو بیروباوەڕانەی پێویستە تاك هەیبێت بۆ گەیشتن بەو پلەوپایە ڕۆحیە یان ئەو حاڵەتە ڕۆحیە داواکراوە. پرۆتستانت ناڵێت هاوشێوەی ئەم کارانە هیچ گرنگ نیە سەبارەت بە ژیانی مەسیحیەت. بەڵام ئەوەی دەیانەوێت بیڵێن یارمەتی ئەم کارانە نادات بۆ ڕودانی گۆڕان لە دڵی باوەڕداردا. ئەمە مانای ئەو دروشمەیە کە هەموو گروپە پرۆتستانتیەکان لەسەری هاوڕان بریتیەلەمە: ((ڕاستی دەرخستن تەنها بە ئیمان)). ئەمە بەو مانایە نایەت بیروباوەڕەکان یان نهێنی ڕێوڕەسمە ئایینەکان گرنگ نیە، بەڵکو ئەگەر ئەو شتانە نەگونجێن لەگەڵ هەستی ڕاستەقینەی مرۆڤ بۆ خۆشویستنی ألله، وەڵامدانەوەی ألله بۆ ئەو خۆشەویستیە هەتا مێشك و دڵی هەموو مرۆڤێك بگرێتەوە، ئەوە بەس نابێت. هەمان شت سەبارەت بە کارە باشەکان، ئەمە لە هەڵوێستی پرۆتستانتیدا ڕوون نەکراوەتەوە بۆیە گرنگی پێنادرێت. بەڵکو ئەگەر تێی بگەین ئەمە پێویستی ئیمانە واتە کاتێك مرۆڤ تێدەگات لە ڕاستی ئیمان ئەوا کارە باشەکان خۆڕسکانە لێوەی هەڵدەقوڵێن(١٦)، لەکاتێکدا پێچەوانەی ئەمە ناکرێت گریمانەی بۆ دابنرێت، واتە کاری چاکە پێویستی بە بوونی ئیمان و بیروباوەڕ نیە. هەریەك لە قەشە بولس و مارتن لوسەر جەختکردنەوەیان هەیە لەسەر ئیمان بەوەی هۆکاری ئەوەیە هەموو کارە چاکەکان کە پێی هەستاون لە سەرەتای کارەکانیانەوە بە تەواوی توانایانەوە بەڵام نەیتوانی دڵەکانیان بگۆڕێت.

جارێکی تر لێرەدا سودوەردەگرین لە لێکچواندنی بە منداڵ لە ماڵەوەدا ئەمە نمونەیەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەدوێت لەبارەی یەکێك لە دیاردەکانی پابەندبوونی ئایینی مرۆییەوە تا ڕادەیەك وامان لێدەکات بگەڕێینەوە بۆی وە بەکاری بهێنین بۆ چەندین جار. دوای ئەوەی پێداویستیە جەستەییەکانی مرۆڤ دابین دەکرێت، منداڵ پێویستی بەوەیە پێش هەموو شتێك هەست بکات بە خۆشەویستی لەلایەن باوك و دایکیەوە. بولس و لوسەر و پرۆتستانت بەشێوەیەکی گشتی باوەڕیان هەیە بە پێویستی مرۆڤ بۆ شتێك لەمە بچێت لە تەواوی ماوەی ژیانیدا. بەوەی مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی لاوازە و زوو کاری تێدەکرێت بەو هێزانەی بەرەوڕوویان دەبنەوە، چونکە پێویستی ژیانیان بریتیە لەوەی ژینگەی سەرەکیان بناسنەوە، واتە بنەمای ئەو بوونەی لێوەی هاتوون(ألله) وە ئەوەی بۆی دەگەڕێنرێنەوە، کە لە بەرژەوەندی ئەواندایە زیاتر لەوەی دژیان بێت. ئەگەر بتوانن لەم کارە تێبگەن هەتا ئەو ڕادەیەی ئەو هەستە تەواوی بوونیان داگیر دەکات، ئەوکاتە ڕزگاریان دەبێت لە دڵەڕاوکێی ڕامیاری کە وایان لێدەکات هەوڵبدەن بۆ بڕینی ڕێگاکەیان هەتا بگەڕێن بەدوای هێمن و ئارامیدا. ئەمە ڕوونی دەکاتەوە بەتەواوی هەروەك چۆن منداڵێکی خۆشەویست دەبێتە یارمەتیدەر، بەهەمان شێوە پیاو یان ژن کاتێك هەستی خۆشویستنی ألله بەئاگای هێنهاوەتەوە وەڵامدانەوەی هەیە بۆ ئیمان، دواتر دەبێتە مرۆڤێك دەتوانێت خەڵکانی تری خۆشبوێت بەشێوەیەکی ڕاستەقینە. کلیلەکە لە ناخماندایە. ئەگەر ئیمان دابین کرا بۆ خۆشویستنی ألله بۆمان ئەوا هەموو شتێکی گرنگ بەدوای ئەمەدا دێت. بەڵام لەدوای نەمانی ئەمە هیچ شتێکی گرنگ ڕوونادات.

بنەمای نارەزایی دەربڕین. ئەو تێڕوانینەی تر کە پرۆتستانتی پێدەناسرێت نارەزایی دەبڕینە. ئەگەر ویستمان ئەمە دەربڕین لە ڕووی فەلسەفەوە، دەمانوت ئەمە ئاگادارکردنەوەیە لە گشتگیری و گۆڕینی بۆ لۆژیك، ئەگەر ویستمان ئەم بنەمایە لەڕووی ئایینیەوە بخەینەڕوو، دەڵێین ئەمە ئاگادارکردنەوەیە لە

پەرستنی بتەکان. خاڵەکە لێرەدا ئەمەیە: پێویستە دڵسۆزی مرۆڤ تەنها بۆ ألله بێت، بەڵام ألله لەپشت سروشت و مێژوەیە، بەو مانایە نا پەیوەندی پێوە نیە بەڵام بەو مانایەی خوداوەندی ناکرێت یەکسان بکرێت بە هەریەکەیان تەنانەت بۆ هەر بەشێك لەوان، چونکە جیهان سنورداره و کۆتایی دێتلەکاتێکدا ألله بێسنوره. هەموو ئایینەکان لەسەر ئەم ڕاستیانە هاوڕان، وێڕای ئەوە ئەمانە کۆمەڵە ڕاستیەکن قورسە مرۆڤ بیانپارێزێت، بەڕادەیەك مرۆڤەکان بەهەڵە تێدەگەن لە یەکسانی ألله بە کۆمەڵە شتێك دەیبینن و دەتوانن دەستیان لێبدەن، یان بەلایەنی کەمە یەکسانیەکەی دەچوێنن بە چەند شتێکی کورت و سنوردارەوە لە لۆژیکی بێسنور[٦٨]. کاتێك مرۆڤەکان ئەم هەڵەیان ئەنجامدا لەسەرەتای مرۆڤایەتیەوە، لەڕێگەی شکۆدارکردنی پەیکەرەکانیان و پەرستنی، واتە یەکسانکردنیان بە ألله، پێغەمبەران هەستاون بە ئیدانەکردنی ئەم گۆڕینە، ئەو کەسە لاوازانەیان ناوناوە بە بتپەرست. لە سەردەمەکانی تردا مرۆڤەکان وازیان هێنا لە دروستکردنی بت لە تەختە و بەرد و دواتر پەرستنی، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە بتپەرستی کۆتایی هاتوە. چونکە لەکاتێکدا جیهانی عەلمانی ڕوویکردە گۆڕینی دەوڵەت بۆ شتێکی بێسنور یان گۆڕینی دەروون بۆ شتێکی بێسنور، مەسیحیەکان کەوتنە ئەم داوەوە لە گۆڕینی بیروباوەڕەکان بۆ شتی بێسنور، هەروەها گۆڕینی نهێنی ڕێوڕەسمە ئایینیەکان و گۆڕینی کڵێسا و گۆڕینی کتێبی پیرۆز، یان گۆڕینی ئەزمونی ئایینی تاکە کەسی بۆ بێسنور. ئەگەر وامان دانا پڕۆتستانتی لە بایەخی بیروباوەڕ یان نهێنیە پیرۆزەکان و کڵێسا . یان گومانی ئەوە بەرێت ألله لەڕێگەیەوە کاردەکات، ئەوا دەکەوینە بە هەڵەتێگەیشتنێکی گەورەوە سەبارەت بە پڕۆتستانتی. کێشەکە لەدەوایە پڕۆتستانتی پێداگری دەکات لەوەی هیچ یەکێك لەو شتانە خودی ألله نیە، ئەم کارانە بەشێکە لە مێژوو چونکە بەشێك لە مرۆڤایەتی لەخۆ دەگرێت، لەبەرئەوەی مرۆڤەکان ناکامڵن کەواتە ئەم کەرەستانە ناکامڵن. بەڵێ کاتێك ئەو کارانە ئاماژە دەکات بۆ ألله ئەوا دەتوانن بایەخێکی گەورەیان هەبێت، بەڵام هەریەکەیان داوای تایبەتمەندی بت وەردەگرێت، دەبێتە شتێکی ئەهریمەنی خراپەکار، چونکە بەپێی کلتوری گواستراوە ئەمە ئەو شتەیە شەیتان وێنای دەکات: بوونەوەرێك لە فریشتە پلەی بەرزتر بوو بەڵام ڕازی نەبوو ببێتەی کەسی دووەم بەڵکو ویستی ببێتە کەسی یەکەم.

لەبەرئەوە پێویستە ئەمە ڕەتبکەینەوە، بەناوی ألله خاوەن دەسەڵاتی بێسنور، کە بەرزدەبێتەوە بەسەر هەموو سنورەکاندا. پێویستە چەند نمونەیك باس بکەین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بنەمایەی پڕۆتستانتی. ڕزای نابن بە بیروباوەڕی پاپا چونکە مافی ڕەخنەگرتن لە ڕاو بۆچوونەکان دەسڕێتەوە، ناتوانێت بشێوەیەکی تەواو ئەو مەترسیە لابەرێت کە هەڵەکان دروستی دەکەن. دەتوانین باوەڕبهێنین بە یاساکانی ئیمان هەتا دڵەکانمان ئارام بنەوە، ئەگەر وامان لێکرد لە سەروو توانی ڕەخنەگرتن، بەڵام خستمانە سەروو ڕەخنەگرتنەوە، ئەوا ماناکەی گۆڕینی شتێکی سنوردارە بۆ بێسنور، ماناکەی بەرزکردنەوەیەتی بۆ پلەوپایەیەك کە پێویستە پارێزراو بێت تەنها بۆ ألله.

ئەو نمونانەی پڕۆتستانتی بە بتپەرستی دەزانێت لە چەند کردارێکدایە لەلای ئایینەکانی تر پەیڕەو دەکرێت ئان گروپە مەسیحیەکانی دژ بەو، بەڵکو پێداگری دەکات لەسەرئەوەی پێویستی ڕەخنەگرتنی خودی دروست دەکات بۆ چاککردنی خودی پڕۆتستانی. پڕۆتستانی کار دەکات بۆ پیرۆزڕاگرتنی کتێبی پیرۆز. پڕۆتستانت باوەڕی وایە ألله لەگەڵ مرۆڤدا دواوە لەڕێگەی کتێبی پیرۆزەوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە

[٦٨] ئەمە ئایەتێکی قورئانمان بیردەخاتەوە ألله دەفەرمێت تیایدا: ((وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللّهِ إِلاَّ وَهُم مُّشْرِكُونَ))﴿يوسف: ١٠٦﴾

نایەت کتێبی پیرۆز بەرزبکەینەوە و ڕەخنەی لێنەگیرێت، پێداگری بکەین لەسەر ئەوەی هەموو وشەکانی لەلایەن ألله دواتر ناکرێت کتێبی پیرۆز هەڵەیەکی مێژوویی لەخۆ بگرێت، چونکە لەبیرکردنی ڕاستی تێدایە کاتێکی لەلایەن مرۆڤەکانەوە قسەی پێدەکرێت، ئەزمونە پێویستە لەلایەن ڕۆحی قودسەوە ئەنجام بدرێت. لەوانەیە بەو جۆرە بێت پێویستە ڕۆح بچێتە چوارچێوەی مرۆییەوە بەو مانایەی ڕاستی تەواو هەرگیز ناکرێت تێی بگەین.

پرۆتستانی هەوڵدەدات لەڕێگەی ڕەتکردنەوەی ئەم نمونانە لە گۆڕینی سنوردار بۆ بێسنور یەکەمین ڕاسپاردەی دە ڕاسپاردەکە بپارێزێت: ((هیچ خوداوەندێکی ترتنابێت لەبەردەممدا))(سفر الخروج: ٣/٢٠). ئەم ڕاسپاردەیە ئاوازێکی نێگەتیڤ لەخۆ دەگرێت بۆ زۆربەیان چونکە وشەی پرۆتستانت بەمانای ناڕەزایی دەربڕدێت بەشێوەیەکی سەرەکی ئاوازێکی نێگەتیڤ لەخۆدەگرێت. ئایا پرۆتستانتی ئەو کەسە نیە ناڕازیە لە شتێکی دیاریکراو؟ وەك بینیمان ئەم شتە دروستە، پرۆتستانت بەڕاستی هەستاوە بەم ناڕەزایی دەربڕینە بەشێوەیەکی بەردەوام دژ بە هەموو سنوربەزاندنێك بۆ پلەوپایەی ألله لەلایەن هەر کەسێکەوە بێت کە کەمترە لە ألله. بەڵام بنەمامی پرۆتستانتیەت دەکرێت بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە دابنرێت ببەوەی چۆن ئەم بنەمایە دەربڕین. ئەو ناڕازیە لەسەر پەرستنی بتەکان چونکە شایەتی دەدات لەسەر فەرمانڕەوایی ألله لە ژیانی مرۆڤایەتیدا.

بەڵام چۆن ألله دێتە ناو ژیانی مرۆڤایەتیەوە؟ پێداگریکردن لەسەرئەوەی ألله ناکرێت یەکسان بکرێت بە هیچ شتێك لە جیهالنی بەرجەستەکراودا کە ببێتەهۆی شڵەژاندنی خەڵك لەم گەردونەی ألله کە سنوری نیە، بەڵام بۆئەوەی یەزدانی بوون بگات بە ئاگایی مرۆڤ پێویستە چڕبکرێتەوە لە خاڵێکی دیاریکراودا.

لێرەدا تایبەتمەندی و پلەوپایەی کتێبی پیرۆز کە باسەکانی لەبارەی ألله دەردەکەوێت، کاتێك کاری کردوە لەڕێگەی نەتەوەی نەوەکانی ئیسرائیل، لەڕێگەی مەسیحەوە، لەڕێگەی کلێساوە، ئەمە ڕوونترین وێنەیە لەبارەی خۆشەویستی ألله، هەروەها چۆن مرۆڤەکان دەتوانن ژیانێکی نوێ بدۆزنەوە لەگەڵ ألله. بەم واتایە کتێبی پیرۆز سەبارەت بە پرۆتستانت شتێکی بێسنورە. بەو مانایەی کاتێك خەڵك دەیخوێننەوە هەست بە بەخشینەکانی ألله دەکەن لەگەڵ خۆشەویستی بۆ مرۆڤ. لێرەدا لە هەموو جێگایەك زیاتر مرۆڤەکان تێدەگەن لە ڕاستی سەبارەت بە ألله، نەك تەنها بە مێشکیان بەڵکو بەهەموو بوونیان. هیچ شیکردنەوەیەکی تر لەلایەن خەڵکەوە یان پیاوانی ئایینیەوە ناتوانێت جێگای کتێبی پیرۆز بگرێتەوە. پێویستە وشەی ألله بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بدوێت لەگەڵ ڕۆحی تاکدا، ئەمە تێڕوانینی پرۆتستانتیە لە جەختکردنەوەیدا لەسەر کتێبی پیرۆز وەك وشەی هەمیشە زیندوی ألله.

بەڵام ئایا ئەم تێگەیشتنە لەبارەی مەسیحیەتەوە لێوانلێو نیە لە مەترسی؟ پرۆتستانتەکان دەناسرێن بەم تایبەتمەندیە. چونکە بنەمای پرۆتستانتی پێداگری دەکات لەسەرئەوەی هەموو شتە مرۆییەکان ناکامڵن، بەوهۆیەوە پێویستە مرۆڤ ڕازی بێت بەم ڕاستکردنەوانە بۆ ڕۆحی قودس لەبری ئەوەی شتێك بسەپێنین بەسەر جیهانی مەسیحیدا کەلە ڕاستیدا سنوردارە. هەروەك خودی یەسوع دەڵێت: ((هێشتا زۆر شت ماوە پێتان بڵێم، بەڵام ئێستا ناتوانن بەرگەی بگرن. بەڵام کاتێك ڕۆحی حەق و ڕاستی ڕێنماییتان دەکات بۆ هەموو ڕاستیەك))(ئینجیلی یۆحەننا: ١٢/١٦-١٣). یەکێك لە هۆکارە گرنگەکان بۆ کەمتەرخەمی کردن لە پەرستنی ألله پاراستنی داهاتوە.

مەترسی دووەم بریتیەلەوەی مەسیحیەکان باوەڕیان بە چەند ڕاستیەك هەیە لەبارەی کتێبی پیرۆزەوە. هەبوونی ٩٠٠ گروپی پرۆتستانتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەتەنها نایسەلمێنێت ئەمە تەنها ڕاستیەکە بەڵکو دەیسەلمێنێت دەکرێت بەشێوەیەکی ئاشکرا بەرەو کامڵبوون بچێت پرۆتستانت پێداگری دەکات لەسەر ئەم خاڵە بەڵام ئەم سێ خاڵە زیاددەکات:

یەکەم: هەمەچەشنی پرۆتستانتی بەم قەبارە گەورەیە نیە کە سەدان ناوی هەبێت لەڕاستیدا ٨٥٪ پرۆتستانت تەنها ١٢ گروپن. ئەگەر ئەمەمان لەبەرچاوگرت کە پرۆتستانت جەختدەکاتەوە لەسەری، لەڕووی بنەماوە کێشەکە لەڕووی فرەجۆریەوە نیە بەڵکو سەبارەت بە ڕادەی مانەوەی پرۆتستانتە.

دووەم، زۆربەی دابەشبوونەکانی بەهۆی هۆکارە نەتەوەییەکانەوەیە لە ئەوروپا.

سێیەم، دواهەمین خاڵ و گرنگترینیان بەڵگەیە لەسەر فرە چەشنی لە پرۆتستانتیدا کە شتێکی خراپە؟ خەڵکی جیاوازن و هەلومەرجە مێژووییەکان جیاوازن کە دەبنە هۆی ڕودانی ئەم ناکۆکیانە. پرۆتستانت وابیردەکاتەوە ژیان و مێژوو دوو شتن هەمیشە لە گۆڕاندان. بەڵام ئەمە ناتوانێت دڵەڕاوکێی پرۆتستانتیەکان کەمبکاتەوە سەبارەت بە دابەشبوونە جەستەی مەسیح. بەڵام وابیرناکەنەوە کە خەڵك پێویستە پەیوەندیەکانیان بپارێزن لە بزوتنەوەیەکی دیاریکراودا بۆ سروشی بەردەوامی ألله: ((با لە کوێ بیەوێت هەڵدەکات و دەنگەکەی دەبیسترێت. . ))(ئینجیلی یۆحەننا ٨/٣).

کەواتە پرۆتستانت ڕازیە بەو تێڕوانینانەی کە دەورەدراوە بە مەترسیەکان کاتێك تاکەکان لە ململانێدان بۆ بڕیاردان ئایا ئەوان گوێیان گرتوە بۆ ویستی ألله بەشێوەیەکی دروست، مەترسی ئەم دابەشبوونانە کاتێك مەسیحیەکان وابیردەکەنەوە لە ألله و ویستی بە چەندین شێوە. بەڵام بەم مەترسیانە ڕازی دەبن چونکە پێویستی بەم کارە هەیە. ئەوان پێیان باشە سەبەخۆ بن لەبارەی بیروباوەڕەوە کە شایەنی هەڵەکردنە، تەنانەت کاتێك ألله شکۆدارە لەلایان. بیروباوەڕیان لە کۆتاییدائەو قورساییانە لادەبات کە ڕێگریان لێدەکات. کاتێك پرسیارکرا لە مارتن لۆسەر لەکوێدا دەوەستێت ئەگەر کڵێسا دەری کرد؟ لەوەڵامدا وتی: ((لەژێر ئاسماندا!)).

**<u>کتێبە پێشنیارکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر لەسەر ئەم بەشە:</u>**

١-سەبارەت بە خوێنەری گشتی کتێبی ((يسوع رؤية جديدة)) نوسینی مارکوس بورج کتێبێکی سودبەخشە بۆ تێگەیشتن لە ژیانی یەسوع و پەیامەکەی.

٢-بەڵام سەبارەت بەوانەی دەیانەوێت بەشێوەیەکی قووڵتر بخوێننەوە لەمبارەیەوە یسوع لە نوسینی ادوارد شیلبکس.

٣-کتێبی في ذكراها: اعادة بناء أنثوية للمصادر المسيحية الأصلية نوسینی: اليزابيت شوستر فيورينزا.

٤-کتێبی ظلال شخص الجليلي چیرۆکێکی مێژوویی کاریگەرە لەبارەی یەسوع و پەیامەکەیەوە زانایەکی ئەڵمانی نوسییەتی کە پسپۆڕە لە توێژینەوە لەسەر پەیمانی نوێ.

٥-نوسەرجاروسلاف بیلیکان تێڕوانینێکی گشتگیر بۆ فیکری مەسیحی دەخاتە ڕو لە کتێبەکەیدا يسوع عبر العصور.

٦-قەشەی ئەڵمانی هانز کونگ لەکتێبەکەیدا معنى أن أكون مسيحيا بیرکردنەوەی مەسیحی هاوچەرخ دەخاتەڕوو. ٧-٨-٩-سەبارەت بە سێ بەشە گەورەکەی مەسیحیەت ئەم کتێبانە پێشنیار دەکەین:

**روح الكاثوليكية نوسينى كارل آدم**

**الكنيسة الأورثوذكسية نوسينى تيموثي ويير.**

**الأيمان البروتستانتى نوسينى جورج و. فوريل.**

**١٠–دواجار سەبارەت بە سۆفيگەرى لە مەسيحيەتدا: سەيرى كتێبى لويس دويريوجيمس وايزمان ((نور من نور: مقتطفات أدبية مختارة من المستسيقا (التصوف الباطني)المسيحية))بكە.**

**پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی مەسیحیەت**

١. ئەم ژمارانە وەرگیراون لە کتێبی ساڵ بۆ ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی بۆ ساڵی ١٩٨٩ز.

2. marcus borg ،jesus: a new vesion p15

٣. سەیری بەشەکانی ((المعرفة المقصاة)) و ((ما وراء عقلیة الغرب الحدیثة)) بکە لە کتێبی د. هیوستن سمث. (ما وراء العقل بعد الحداثة)

4. b. alan wallace ،chosing reality p76

5. borg ،jesus p61.

6. elisabeth schussler in memory of her p159.

7. e. schillebeeckx ،jesus p201.

8. robert penn ،brother to dragons

٩. ئەم جیاکردنەوەیە ڕاستدەکات تەنها لەڕووی پراکتیکیەوە، بەڵام لەڕووی ئایینیەوە سەیری دیمەنی یەزدانی و مرۆیی دەکرێت وەك ئەوەی یەکیانگرتبێت و جوداکردنەوەیان ئەستەم بێت لە سروشتی مەسیحدا.

١٠. کۆنگرەی دووەمی ڤاتیکان ئەم هەڵویستەی دوپاتکردەوە ئەمە دەقەکەیەتی: ((هەروەها دەکرێت ئەوانە ڕزگاربوون بەدەست بهێنن. ئەوانەی لە هەوڵداندان لەڕێگەی کارەکانیانەوە بۆ کارکردن بە ویستی أللە هەروەك پێیان گەیشتوە لەڕێگەی ویژدانیانەوە))(لومن جنتیوم، الکنیسة، الفقرة ١٦).

11. m. lewis ،estatic religion

12. thomas corbishley ،roman catholicism p40.

13. fancis de sales ،introduction to the devoult life p 40-41.

١٤. کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمانی هاوڕایە لەوسەر ئەم خاڵە لەگەڵگشتگیرکردنی پاپا وەك پیاوێکی ئایینی لەو جۆرە کۆبوونەوانەدا. هەروەها وابیردەکاتەوە ئەو پیاوەئایینانە دوورن لە هەڵە کردن کاتێك کاردەکەن لەسەر بیوباوەڕێکی دیاریکراو چونکە لەلایەن یەزدانەوە سروشیان بۆ هاتوە بۆیە پێویستە لەسەر هەماون باوەڕی پێبهێنن. جیاوازیەکە شاردراوەتەوە لە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان پیاوی ئایینی و پیاوی ئاسایی.

١٥. ئەوەی سەرنجڕاکێشە دەبینین ئەم دوو ڕەنگدانەوەیە: واتە ڕەوتی سۆفیگەری و هەستکردن بە پەیوەندی نێوان ژیان و خەڵك دەردەکەون لە ئۆرسۆزکسی ڕۆژهەڵاتیدا، لە ڕۆمانکانی دوستیوفسکی و تولستویدا.

١٦. نامەی یەعقوب لە پەیمانی نوێ زۆر ڕوونە لەبارەی ئەم خاڵەوە.

# ٨

# ئیسلام

دەتوانین دەستپێبکەین بە قسەکردن لەبارەی هەلومەرجێکی سەیرەوە. لەنێو هەموو ئایینە ناڕۆژئاواییەکاندا. ئایینی ئیسلام نزیکترینیانە لە ڕۆژئاوا، لەڕووی جوگرافیا، بیروباوەڕەوە، چونکە ئیسلام لەڕووی ئایینیەوە سەر بە خێزانی ئایینە ئیبراهیمیەکانە، لەڕووی فەلسەفیەوە گرنگی دەدات بە فەلسەفەی یۆنانی. وێڕای ئەم نزیکیە لەڕووی شوێن و فیکرەوە، ئیسلام قورسترین ئایین بوو بۆ تێگەیشتنی لەلایەن ڕۆژئاواوە. نوسەرێك لە ڕۆژنامەیەکی ئەمەریکی دا نوسیویەتی: بە هەڵە تێگەیشتن ڕووی نەداوە لە هیچ جیگایەکی جیهان، بەشێوەیەکی ڕێکخراو و بێئومێد، وەك ئەوەی بەهەڵە تێگەیشتن کراوە بەرامبەر بەو پێکهاتە جوگرافی و ئایینی و شارستانیەی ناسراوە بە ئیسلام(١).

ئەمە جیاکاریەکی سەرسوڕهێنەرە کە سەرسامماں دەکات، وێڕای ئەوەی دەکرێت بەئاسانی شیبکرێتەوە. تەنها نزیك بوون گونجان و پێکەوەژیان مسۆگەر ناکات، بەڵکو لەو تراژیدیایەی تاوانەکانی کوشتن ڕوودەدات لەنێو خێزاندا، زۆر زیاتر لەوەی لە دەرەوەیدا ڕوودەدات. ئیسلام و ڕۆژئاوا دوو دراوسێن. بەڵام ئەم سنورە هاوبەشانە لەنێوانیاندا ململانێی دروست کردوە بەهۆیەوە چەندین جەنگ و پێکدادان ڕووی داوە، بەجۆرێك کار گەیشتوە بەوەی جەنگی گشتگیر ڕوو بدات لەنیبۆانیانا. بەڵام لایەنێکی دڵخۆشکەر هەیە لێرەدا، مەسیحیەکان و موسوڵمانەکان و جوولەکەکان بە ئاشتی شانبەشانی یەکتر ژیاون لە چەندین شوێن و کاتی باش لە مێژوودا، یەکێك لەو نمونانە ئیسپانیای ئیسلامیە (ئەندەلوس).

بەڵام بەشی گەورەی ئەو چواردە سەدەی پێشوو، ئیسلام و ئەوروپا دوژمنی یەکبوون و لە حاڵەتی جەنگدا بوون. بەدەگمەن لەلای نەتەوەکان وێنەیەکی دادپەروەرانە هەبووە لەبارەی دوژمنەکانە(٢). لەبەرئەوە لەم کتێبەدا هەوڵدراوە شێوازی مامەڵەکردن و ڕاستی ئیسلام بخرێتەڕوو، بەجۆرێك دەبێتە ئایینێکی شایستەی گرنگیپێدانی خوێنەران(٣).

بەهەڵەتێگەیشتنی ڕۆژئاوا دەستپێدەکات بە هەمان ئەو ناونانەی کە بۆ ئیسلامی دانابوو. هەتا سەردەمێکی نزیك ڕۆژئاوا ئیسلامی ناونابوو بە المحمدیە ئەمە ناوێکە ئیسلامی پیّ تاوانباردەکرێت. چونکە محمد صلی ألله علیە و سلم هەروەك موسوڵمانان دەڵێن ئەم ئایینەی دانەناوە بەڵکو ألله دایناوە. محمد صلی ألله علیە و سلم تەنها پەیامبەرێك بووە بۆ گەیاندنی ئەم ئایینە لە ألله بۆ خەڵك. دواتر ئەم ناوە شەڕانیە چونکە وادادەنێت ئیسلام چڕکراوەتەوە تەنها لەسەر مرۆڤێك محمد صلی ألله علیە و سلم زیاتر لە گرنگی دانی بە ألله. موسوڵمانا دەڵێن ناونانی مەسیحیەت شتێکی گونجاوە چونکە مەسیح ناوەندی بیروباوەڕی مەسیحیەتە چونکە مەسیحیەکان بە ألله ی دادەنێن. بەڵام ناونانی ئیسلام بە محمدیە هاوشێوەی ناونانی مەسیحیەتە بە بولسیە وەك ناونانێك بۆ قەشە بولس. ناوی دروست بۆ ئەم ئایینە بریتیەلە ئیسلام، ئەمە وشەیەکە لە چاوگی السلم هاتوە واتە ئاشتی بەڵام بە مانایەکی تر واتە خۆبەدەستەوەدان یان ڕازیبوون بەو هۆیەوە ماناکەی بەتەواویبەمشێوەی لێدێت: ئەو ئاشتیەی ڕوودەدات کاتێك مرۆڤ بەتەواوی خۆی دەدات بەدەستەوە بۆ ألله. ئەمە وادەکات ئیسلام و بودیزم کە پێکهاتوە لە (وشەی بدە کەبەمانای بەئاگاهاتنەوە

دێت) دوو ئایینن ناوەکەیان دێت لەو تایبەتمەندیەی کە دەیانەوێت شوێنکەوتوانیان پەیڕەوی بکەن، لێرەدا لە حاڵەتی ئیسلامدا تایبەتمەندی ئیسلام ژیانە بەکامڵی بەرەو الله. ئەوانەی پابەندن بەم تایبەتمەندیەوە ناویان دەبرێن بە موسوڵمانان.

## ڕابوردوو

فیلیب دەڵێت: ((سەبارەت بە ناوی عەرەب، ڕوناکیەك دەدرەوشێتەوە بۆ ئەوانەی جیهانیان ڕزگارکردووە. لەماوەی یەك سەدەدا لە بەرزبوونەوەی ئەم نەتەوەیەدا، عەرەبەکان بوونە فەرمانڕەوای ئیمبراتۆریەتێك کە لە

کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسیەوە هەتا شورای چین، ئیمبراتۆریەتێك گەورەتر لە ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی لەوپەڕی فراوانبوونیدا. لەو ماوەیەدا لە فراوانبوونی بێوێنەی ئەو ئیمبراتۆریەتەدا عەرەبەکان لە بیروباوەڕ و زمانیاندا ئایین ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو زیاتر لە ئیغریق و ڕۆم و ڕوس(٤) لە بەرزبوونەوەی عەرەبدا بۆ ئەو پلەوپایەیە لە مەزنی و شکۆداری)).

ئەگەر پرسیمان ئەم ئایینە چۆن پەیدابوو؟ ئەوانەی لەدەرەوەی بازنەی ئەم ئایینەن لە وەڵامەکانیاندا ئاماژە دەکەن بۆ تەوژمە کۆمەڵایەتی و ئایینیەکان کە بەربڵاو بوو لە دورگەی عەرەب لە سەردەمی محمد صلی ألله علیه وسلم ئەم تەوژمانە بەکاردەهێنن بۆ شیکردنەوەی ئەوەی ڕووی دا. بەڵام وەڵامدانەوەی موسوڵمانان جیاوازە. ئیسلام دەستیپێنەکردوە بە محمد صلی ألله علیه وسلم لە دورگەی عەرەبی لە سەدەی شەشەمی زایینیدا بەڵکو دەڵێن دەستیپێکردوە بە ألله ی خاوەند دەسەڵات ((هەر لە سەرەتای دروستکردنەوە لەلایەن ئلوهیم. . )) تەورات بەمشێوەیە دەدوێت، ئیسلام هاوڕایە لەسەر ئەم بابەتە بەڵام بەتەنها جیاوازە لە وشەی ألله. وشەی ألله پێکدێت لە زیادکردنی ئامرازی ناساندن ال بۆ وشەی اله، چونکە وشەی ألله واتە خودا نەك خوداوەند چونکە لەڕاستیدا خوداوەند بوونی نیە. لەکاتێکدا ئامڕای کۆکردنەوە هیم لادەبرێت لە ناوی أللهی عیبری ئلوهیم چونکە دوو وشەکە هاوشێوە دەبن ئلوە و ألله.

ألله جیهانی دروستکرد، دواتر مرۆڤی دروستکرد. یەکەم مرۆڤ دروستکرا ناوی ئادەم بوو. لە نەوەی ئادەم نوح هات کە یەکێك لە کوڕەکانی ناوی سام بوو. لێرەوە دەستەواژەی سامیەت هاتوە واتە ئەو نەتەوانەی بە ڕەڵەڵەك دەگەڕێنەوە سەر سامی کوڕی نوح. چونکە عەرەب بەهەمان شێوەی جوولەکە خۆیان بە نەتەوەیەکی سامی دادەنێن. ئەوان لە نەوەی سامن کە لە ئیبراهیمەوە سەرچاوەیان گرتوە. هەتا ئێرە عەرەب هاوڕایە لەگەڵ کلتوری جوولەکە و مەسیحی. لەڕاستیدا خۆبەدەستەوەدانی ئیبراهیم بۆ ألله و گوێڕایەڵی کردنی لەو تاقیکردنەوەیەی کە بە قوربانی کردنی کوڕەکەی کۆتایی دەهات ئەم ناوەی بەخشی بە ئیسلام. چونکە ئیبراهیم ڕازی بوو بە ویست و ئیرادەی ألله و گوێڕایەڵی کرد، بەوجۆرە بووە یەکەمین موسوڵمان. ئیبراهیم هاوسەرگیری کرد لەگەڵ سارە، بەڵام منداڵی نەبوو، بەو هۆیەوە هاوسەرگیری کرد لەگەڵ کەنیزەکەکەی هاجەر کە بووە دووهەمین ژنی، بۆئەوەی نەوەی هەبێت و ناوەکەی بەردەوام بێت. بەڕاستی هاجەر دووگیان بوو دواتر ئیسماعیل لەدایکبوو، دواتر سارە دووگیان بوو منداڵێکی بوو بەناوی ئیسحاق. دوای ئەوە سارە داوای لە ئیبراهیم کرد هاجەر و کوڕەکەی ئیسماعیل دوور بخاتەوە لە هۆزەکە. لێرەدا دەگەین بە یەکەمین جیابوونەوە لە گێڕانەوەی قورئانی و گێڕانەوەی تەوراتی. چونکە بەپێی گێڕانەوە قورئانیەکە ئیسماعیل و دایکی بران بۆ ئەو شوێنەی دواتر بووبە شاری مەککە. بەوجۆرە نەوەکانی لە دورگەی عەرەبی پەرەیان سەند بوون بە موسوڵمانانی یەکەمەکان. لەکاتێکدا نەوەکانی ئیسحاق کە مانەوە لە فەڵەستین ناسران بە عیبرانیەکان دواتر بوونە یەهودییەکان یان جوولەکەکان.

## دواهەمین پێغەمبەر

لە نەوەی ئیسماعیل لە دورگەی عەرەبی دەگەین بە نیوەی دووەمی سەدەی شەشەمی زایینی هەتا دەگەین بە محمد صلی ألله علیه وسلم ئەو پێغەمبەرەی لەڕێگەیەوە ئیسلامی دێرین دوا شێوازی وەرگرت. چەندین

پێغەمبەر هەبوون لە پێشیەوە ڕاستگۆ بوون، بەڵام محمدصلی ألله علیه و سلم لە لوتکەیاندا بوو بۆیە ناونرا بە دواهەمین پێغەمبەر، چونکە لەدوای ئەو هیچ پێغەمبەرێك نیە.

موسوڵمانان ئەو جیهانەی محمد صلی ألله علیه وسلم تیایدا لەدایك بوو باس دەکەن بە یەك وشە: الجاهلیه واتە نەزانی. ژیان لە هەلومەرجی بیاباندا هەرگیز هێمن و جێگیر نەبووە، چونکە نەوەکانی هۆزێك هیچ پابەندبوونێکی ئەخلاقیان نەبوو بۆ ئەوانەی لەدەرەوەی هۆزەکەیاندان. کەمی شتومەك لە بیاباندا وای لە بڕینی ڕێگاکە کرد کە ببێتە بەڵگەیەك لەسەر پیاوەتی و هێز. نەکرانەوەی ڕامیاری و داڕمانی سیستمی بەڕێوەبردن لە مەککە، نەمانی هیچ حوکمێکی ناوەندی لەلای عەرەب لە سەدەی شەشەمی زایینیدا ئەو نارێکیە کۆمەڵایەتیەی زیاتر کرد. مەستی و ڕابواردن کاری ئەوان بوو. هیچ ئایینێك پەیڕەوی نەدەکرا هەتا ببێتەهۆی ڕێکخستنەوەی ئەو هەلومەرجە. باشترین باسکردن بۆ ئەو ئایینە ڕێبازی فرە خوداوەندی ئەڕواحی[٦٩] animistic polytheismئەمە بیروباوەڕێك بوو پێی وابوو کە بیابانە لماویەکان پڕە لە ڕۆحی جنۆکەکان یان شەیتانەکان. ئەو بەرجەستەکردنە خەیاڵیانە هیچ ترس و بیمێکی نەخستبووە دڵی خەڵکەوە هەتا پابەندبوونی ئەخلاقیان تیابێت.

هەلومەرجەکان زۆر لەباربوون بۆ دۆزینەوەی ئاگرێکی هەمیشە ئامادە لەژێر خۆڵەمێشدا چاوەڕوانی دەرکەوتنی ڕق و کینەیە بۆ هەڵگیرسانی جەنگی خوێناوی لەنێو هۆزە ناکۆکەکاندا هەندێکجار درێژە دەکێشێت بۆ زیاتر لە نیو سەدە هەتا ڕۆحی سەدان ژن و منداڵ ببێتە قوربانی. زەمەن چاوەڕوانی ڕزگارکەرێك بوو. ئەم ڕزگارکەرە لەدایك بوو لە ساڵی ٥٧٠ز. لە هۆزێکی شەرەفمەندی مەککە. هۆزی قوڕەیش بوو. ئەم ڕزگارکەرە ناونرامحمد واتە زۆر سوپاسگوزارە. ئەمە ناوێکە لەوانەیە یەکێك بێت لەو ناوانەی جیهان کە زۆرترین جار بەکارهێنراوە. سەرەتای ژیانی پڕ بوو لە ناخۆشی و خەم بەجۆرێك پێش چەند ڕۆژێك لە لەدایکبوونی باوکی لەدەستدا، دواتر لە تەمەنی شەش ساڵیدا دایکی کۆچی دوایی کرد، دواتر باپیرەی کۆچی دوایی کرد کە کەفالەتی کردبوو لەدوای مردنی دایکی. دواتر مامی پەروەردەکردنی گرتەئەستۆ. وێڕای ئەوەی خراپی باری دارایی مامی ناچاری کرد سەرقاڵی شوانی مەڕوماڵات بێت لە بەیانیەوە هەتا ئێوارە بەڵام کەسێکی خۆشەویست بوو لە خێزانە نوێیەکەیدا. لێرەدا گێڕانەوە ئیسلامیەکە دەڵێت فریشتەکانی ألله ڕۆژێك دابەزیون دڵی محمد صلی ألله علیه و سلمیان کردوەتەوە و لێوانلێویان کردوە لە ڕوناکی.

تایبەتمەندیەکانی لە تەمەنی لاوێتیدا بەپێی کلتوری ئیسلامی بەمجۆرە بووە: کەسێکی دڵپاك بووە، خۆشەویست بووە لەلای هەموو ئەوانەی لە دەوری ژیاون، کەسێکی بەبەزەیی بووە. بەهۆی ئەوەی کە بە بێنازی باوك و دایکی گەورە بووە زۆر هەستیاربوو بەرامبەر بە ئازارەکانی خەڵك لە هەموو شێوازەکانیدا، هەمیشە ئامادەبوو بۆ یارمەتیدانی خەڵك بەتایبەت هەژار و لاوازەکان. بەهۆی ئەوەی کە هەستی بەبەرپرسیاریەتی دەکرد و دڵسۆز بوو و ئەمانەتی دەپاراست لەگەڵ گەورەبوونی لە تەمەنیدا دوو نازناوی مەزنیان لێنا ڕاستگۆ و دەستپاك. وێڕای ئەوەی کە گرنگی دەدا بە ئەوانی تر بەڵام بەشێوازی ئەوان بیری نەدەکردەوە، چونکە دوورکەوتەوە لە ڕێگا بۆگەنەکانیان. لەدوای ئاستی منداڵی دواتر بۆ ئاستی گەنجی و دوابەدوای ئەوە بۆ ئاستی کامڵبوون و پیاوەتی چەندین جەنگی بێمانا ڕوویدا لەنێونا ئەو هۆزانەی کە سەردانی مەککەیان دەکرد، کە بووەهۆی بێزاریەکی زۆر بەرامبەر بەو کۆمەڵگە بێ بەهایە. بەبێدەنگی

---

[٦٩] ڕێبازی أرواحی بریتیە لەو بیروباوەڕەی کەهەموو شوێنێکی ئەم گەردونە ڕۆحی هەیە.

دەستیکرد بە تێڕامان. کاتێك کامڵ بوو دەستی کرد بە سەرکردایەتی قافڵە بازرگانیەکان، لەتەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا دەستیکرد بە خزمەتکردنی قافڵەکانی بێوەژنێکی دەوڵەمەند لە خەڵکی مەککە ناوی خەدیجە بوو. دەستپاکی محمد صلی ألله عله وسلم کاریگەر بوو لەسەر خەدیجە بەڕادەیەکی زۆر، دواتر وێڕای ئەوەی بەتەمەن گەورەتر بوو لە محمد صلی ألله علیه وسلم بە پانزە ساڵ، خەدیخە بووە هاوسەری محمد صلی ألله علیه وسلم ژیانیان زۆر خۆش بوو لە هەموو ڕوویەکەوە. لەو ماوەیەدا محمد صلی ألله علیه وسلم (لەدوای دەستپێکردنی پەیامەکەی ) زۆر تەنها بوو بەجۆرێك زۆربەی هاوڕێکانی جێیان هێشت، لەسەرەتادا کەس باوەڕی پێنەدەکرد بەڵام خەدیجە باوەڕی پێهێنا بە دڵسۆزانە لەگەڵیدا ڕەفتاری دەکرد ڕۆحی هیوای تیادا داگیرساند، قورئان ئەمەی تۆمارکردوە( وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى )﴿الضحى: ٨﴾، (وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ) ﴿الشرح: ٢﴾( الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ) ﴿الشرح: ٣﴾واتە (تۆی بینی نازانی کتێب و ئیمان چیە، ئەوەی فێرکردیت کەنەتدەزانی، سەرکەوتووی کردیت بۆ باشترین کارەکان. تۆی بە هەژاری بینی ڕزق و بەخشینی پێدایت، دەروونتی دەوڵەمەند کرد بە خۆڕاگری و قایل بوون. بەم کارە قورسایی شەرشانتمان سووك کرد کە کۆڵی پشتتی قورس کردبوو.

ژنهێنانی محمد صلی ألله علیه و سلم پانزە ساڵ لە خۆئامادەکردنی بەدوای خۆیدا هێنا پێش ئەوەی پێغەمبرایەتیەکەی دەستپێبکات. کێوێك لەسەر کەناری مەککە هەبوو ناوی کێوی حەراء ئەشکەوتێکی بچوکی تێدابوو، محمد صلی ألله علیه وسلم بە گونجاوی دانا بۆ خەڵوەتەکەی، دەستیکرد بە چوون بۆ ئەو ئەشکەوتە لەوێدا سەرقاڵی تێڕامان بوو لە نهێنیەکانی چاکە و خراپە و بیرکردنەوە بێماناکانی نەتەوە نەزانەکەی، ئەو کوشتارەی دەکرا لەنێوان براکانی پێش خۆی: ((ئەو دڵە گەورەیەی هێندە هەستیار بوو لە بیرکردنەوەدا دەکوڵا، لە هەوڵداندا بوو بۆ گەیشتن بە ألله))(٥).

جنۆکەی بیابانەکان هیچ شوێنێکی نەبوو لەو گەڕانەدا. بەڵام زاتێکی تاکی یەزدانی جێگای گرتبووەوە. ئەوە ألله بوو(٦) allah دانیشتوانی مەککە دەیانپەرست نەك وەك تاکە یەزدانێك بەڵکو وەکو یەزدانێکی مەزن و سەرەکی دادەنرا بە دروستکەر و ڕۆژیدەری شکۆدار کە چارەنوسی مرۆڤەکانی بەدەستە، لەتوانایدا بوو هەستی ئایینی ڕاستگۆیانە دروستبکات لەگەڵ پەرستنێکی ڕەسەندا. لەو سەردەمەدا هەندێك کەس هەبوون سەرقاڵی تێڕامان بوون تەنها ألله یان دەپەرست و هاوەڵیان بۆ دانەدەنا، محمد صلی ألله علیه وسلم یەکێك بوو لەوانە. لەڕێگەی شەونخونیو بەئاگایی بەدرێژایی شەو کە هەندێك جار بەردەوام دەبوو هەتا بەیانی، ڕاستی ألله ڕوون و ئاشکرا بوو زیاتر و زیاتر بۆ محمد صلی ألله علیه وسلم. ألله لەلای محمد بەشێوەیەکی مەزن و شکۆدار دەرکەوت بە ڕاستی وەکو ژیان وەکو مەرگ وەك گەردون کە بەڕێوەی دەبات. ألله زۆر مەزنترە لەوەی گەلەکەی مەزەندەیان کردبوو. ئەو خوداوەندە نەبوو کە مەزنیەکەی هەڵقوڵابوو لە ئەشکەوتی حەراء بۆئەوەی ئاسمانەکان و زەوی پڕ بکاتەوە بەڵکو بەو مانایەی ألله واتە تاکە یەزدان کە بێ هاوتایە و هاوەڵی نیە. زۆر بەخێرایی دەنگدانەوەی ئەو ڕستەیە دوبارە بوویەوە لە زمانی عەرەبیبدا وەك هاوارێك هێز و گڕوتین دەداتە مرۆڤ کە توانی عەرەبەکان کۆبکاتەوە و وزەیەکیان پێبدات بۆئەوەی بگەن بە ئەوپەڕی کەنارەکانی جیهانی دێرین ئەوەش هاواری: لا الە الا ألله (واتە: هیچ خودایەك بوونی نیە جگەلە ألله). بەڵام هێشتا پێویست بوو لەسەر پێغەمبەر کە ئەو ڕاسپاردەیە وەربگرێت لەلایەن ألله لە نزیکەی ساڵی ٦١٠ز. سەردانەکانی محمد صلی ألله علیه وسلم بۆ ئەشکەوتی حەراء ڕوو لە زیادبوون بوو، ماوەی زیاتری دەخایاند هەتا ئەو فەرمانە یەزدانیەی پێدرا. ئەمە فەرمانێکی یەزدانی بوو کەلە دێرزەمانەوە درابوو بە

ئیبراهیم، موسا، صموئیل، اشعیا، عیسا. هەرچەندە ئەم بانگەوازە شێوازەکانی بگۆڕێت بەڵام لەناوەڕۆکدا هەمیشە یەك جۆر بووە. دەنگێك لە ئاسمانەوە دادەبەزی دەیگوت: ((تۆ ئەو کەسەی هەڵمبژاردوویت بۆ گەیاندنی پەیامەکەم)). لەشەوی قەدردا کە تیایدا ئاشتی باڵ دەکێشێت بەسەر جیهانی بوونەوەراندا، هەموو سروشتێك دەگەڕێتەوە بۆلای ألله، لەناوەڕاستی ئەو شەوەدا موسوڵمانان دەڵێن کتێبێك لە جیهانی غەیبەوە کرایەوە بۆئەوەی دابەزێتە سەر ڕۆحێکی ئامادەکراو. هەندێك دەڵێن لەساڵیادی ئەو ڕۆژەدا دەتوانرێت گوێبگیرێت بۆ گەشەی گژوگیا و قسەکردنی درەختەکان. ئەو کەسانەی ئەماەیان بەسەردا دێت دەبنە پیاوچاکانی ألله کەسانی زانا و لەخواترس، چونکە لەکاتی گەڕانەوەی ساڵانەی ئەو شەوەدا مرۆڤ دەتوانێت چەند شتێك ببینێت لەڕێگەی ڕووناکی ألله(٧).

کاتێك محمد صلی ألله علیه وسلم ڕاکشابوو لەسەر زەوی ئەشکەوتەکە، مێشکی لە تێڕاماندا ڕۆچووبوو، فریشتەیەك هاتە لای لەسەر شێوەی مرۆڤ پێی ووت: بخوێنە (ڕابگەیەنە یان بانگەواز بکە(٨))، محمد گوتی: ((من خوێندەوار نیم!!))، لەوکاتەدا هەروەك محمد دەڵێت: ((منی لەباوەشگرت بە توندی منی گوشی بەخۆیەوە، بۆ جاری دووەم دوبارە منی لەباوەشگرت بە توندی دواتر پێی گوتم، بخوێنە: منیش وتم: من خوێندەوار نیم!!، بۆ جاری سێیەم منی بە توندی گوشی و لەباوەشی گرتم دواتر وتی:

اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿العلق: ١﴾

خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿العلق: ٢﴾

اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿العلق: ٣﴾

الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿العلق: ٤﴾

عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿العلق: ٥﴾

کاتێك محمدصلی ألله علیه وسلم بەئاگاهاتەوە وا هەستی کرد ئەو وشانەی کە گوێبیستیان بوو وەك نەخش هەڵکۆڵراون لەسەر ڕۆحی. بەپەلە گەڕایەوە بۆماڵەوە، لەوێدا توشی لەرزێکی توند هات، بەوهۆیەوە داوای کرد دایبپۆشن، کاتێك لەو حاڵەتە بەئاگاهاتەوە هەواڵی دابە خەدیجە لەوانەیە ببێتە پێغەمبەر یان پیاوێك کە توشی شێتی بووە. لەسەرەتادا خەدیجە هەردوو هەڵبژاردنەکەی ڕەت کردەوە بەڵام کاتێك گوێبیستی تەواوی چیرۆکەکە بوو هەر زوو باوەڕی هێنا بە پێغەمبەرایەتیەکەی بەو جۆرە بووە یەکەمین کەسی هیدایەتدراو بۆ ئایینەکەی، ئەمە خاڵێکە موسوڵمانان ئاماژەی بۆ دەکەن وەك بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر، چونکە ژنی مرۆڤ کەسێکە لە هەمووان باشتر ئاگادارە لە ڕاستی مێردەکەی و ڕەوشتی، پێی گووت: ((مژدەم پێ بدە هاوسەرە خۆشەویستەکەم، خەمبار مەبە و نیگەران مەبە! چونکە دەبیتە پێغەمبەری ئەم نەتەوەیە)).

دەتوانین ئەو ئازارە ڕۆحیە وێنابکەین کە کاریکردە سەر محمد صلی ألله علیه وسلم لەدوای ئەو ئەزمونە ڕۆحیە. ئایا ئەو دەنگە بەڕاستی دەنگی ألله بوو؟ ئایا بۆ جاری دووەم دێتەوە؟ لە هەموو ئەوە گرنگ تر داوای چیم لێدەکات؟

ئەو دەنگە بۆ چەند جارێکی تر گەڕایەوە لای تەنها یەك فەرمانی پێکرد: ((يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنذِرْ. وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ. .))﴿المدّثر: ١-٣﴾. چیدی ژیانی محمد صلی ألله علیه وسلم موڵکی خۆی نەبوو. ئیتر بەتەواوی تەرخانکرا بوو بۆ ألله و بووە موڵکی مرۆڤایەتی. پێویست بوو لەسەری ئەم بانگەوازە بگەیەنێت و ئامۆژگاری خەڵك بکات بە ئامانجێکی جێگیر بە وشەکانی ألله کە بۆی دەگوازرایەو لەماوەی بیست و سێ

**ساڵدا، پێویست بوو لەسەری کە بیگەیەنێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو چەوساندنەوە بەردەوامە، ئەو سوکایەتیانەی دەکرا لەلای زۆرینەی نەتەوەکەی.**

**لێرەدا نادوێین لەبارەی ناوەڕۆکی ئەم سروشە بەڵکو دواتر باسی دەکەین. بەڵام لێرەدا پێویستە تەنها بدوێین لەبارەی ئەو وەڵامدانەوەی کە ورووژاندی، وە ئاماژە بکەین بۆ ئەو وتانەی ئەو سروشە کە ئاڕاستەکراو بوون بۆ مێشکی مرۆیی کە بینینی ئاینی ڕێنمایی دەکات.**

**لەسەردەمێکدا کە بارگاویە بە بیرکردنەوکانی سەروو سروشت. محمد ڕازی نەبوو بەوەی بێمێشکی مرۆڤەکان و خۆشباوەڕیان بەکاربهێنێت ئەوانەی تینووی ئایەت و موعجیزەکان بوون بە ڕاشکاوی پێی گوتن: ((ألله منی نەناردوە بۆ ئەوەی شتی سەرسامکەرتان نیشان بدەم بەڵکو منی ناردووە بۆئەوەی ڕێنمونیتان بکەم بۆ سەر ڕێگای هیدایەت و ڕاستی. . شکۆمەندی بۆ ألله من تەنها مرۆڤێکی پەیامبەرم!))(٩).**

**هەرلە سەرەتای گەیاندنی پەیامەکەیەوە هەتا کۆتایی محمد پەرپەرچدانەوەی هەبوو بۆ مەزنکردنی خۆی((قُل لاَّ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَفَلاَ تَتَفَكَّرُونَ ﴿الأنعام: ٥٠﴾))، ((قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي ضَلاَلَةٌ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴿الأعراف: ٦١﴾)) ((أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ ﴿الأعراف: ٦٢﴾)).**

((قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿فصلت: ٦﴾))(١٠).

**ئەگەر مرۆڤەکان ئایەت و بەڵگە و نیشانەیان بوێت، با ئەو ئایەتانە بەڵگەبن لەسەر مەزنی ألله. نەك مەزنی محمد. ئەم ئایەتانە مرۆڤ پێویستی بەوە نیە بۆ بینینیان زیاتر چاوی بکاتەوە. تەواوی گەردون بە بێدەنگی و بە ڕێکخراوی دەسوڕێتەوە لە سیستمێکی دانراودا.**

**ئەو سیستمەی باران دەبارێنێت بەسەر زەوی تینوودا، ئەو دارخومایانەی کە بەروبومە ئاڵتونیەکانیانەوە شۆڕبوونەتەوە، ئەو کەشتیانەی لە دەریاکاندا دێن و دەچن کە پڕن لە شتومەك. . ئایا دەکرێت ئەو ئایەتانە لە دروستکراوی خوداوەندە بەردینەکان بێت؟ چەندە گەمژەییە کاتێك مرۆڤێك داوای ئایەتێك یان بەڵگەیەك بکات لەسەر بوونی پەروەردگار کاتێك خودی پەروەردگار مەزنترین موعجیزەیە! محمد لەسەردەمێکی پڕ لە خۆشباوەڕی و گەمژەییدا فێری ڕێزگرتنی سیستمی بەڕێوەبردنی جیهان کرا کە هیچ جۆرە هەڵەیەك قوبووڵ ناکات، ئەم ڕێزگرتنە موسوڵمانانی ڕێنمونی کرد بەرەو زانستەکان پێشئەوەی مەسیحیەکان دەرکی پێبکەن بە چەندین ساڵ. جگە لە گەشتەکەی لە شەودا لە بیت المقدسەوە بۆ ئاسمانەکان(موعجیزی ألأسراء و المعراج) دواتر ئاماژەی بۆ دەکەین محمد صلی ألله علیه و سلم تەنها بانگەوازی بۆ یەك موعجیزە دەکرد کە خودی قورئانە. بە پشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەکی تایبەت توانی ئەم ڕاستیە بەرهەم بهێنێت، ئەمە ئەو ئەگەرە بوو هەرگیز پێی ڕازی نەبوو. بەڵام سەبارەت بە کاردانەوەی بەرامبەر بە پەیامەکەی کاردانەوەیەکی دوژمنکارانە بوو زۆر بە توندی بەرپەرچی درایەوە تەنها چەند کەسێك نەبێت کەلەگەڵیدا مانەوە. دەتوانین هۆکاری ئەو دوژمنایەتیە کورتبکەینەوە لە سێ خاڵدا:**

**١. هەڕەشە کرا لە پەیامە یەکتاپەرستیەکەی کە هیچ ڕێککەوتنێکی نەبوو لەگەڵ بیروباوەڕی ئەواندا کە هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، ئەو دەستکەوتە زۆرانەی سەرانەی گەورەی مەککە بەدەستیان دەهێنا لەو حاجیانەی سەردانیان دەکرد بۆ لای ٣٦٠ بت (هەریەکە بۆ ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ساڵی عەرەبی مانگی) لە مەککەدا!**

٢. ڕێنماییە ئەخلاقیەکانی داوای دەکرد سنور دابنرێت بۆ ژیان لەو بەرەڵایی و داوێنپیسی و چاوچڵێسی کە نەتەوەکەی تیایدا ڕۆچووبوون.

٣. پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە بانگەوازەکەیدا دەبوایە بەرەنگاری ئەو زوڵم و زۆرداریە ببێتەوە کە لەو سەردەمەدجا بەربڵاو بوو. پێغەمبەر ئامۆژگاری دەکردن بە پەیامێك زۆر دیموکراتیانە بوو لە ناوەڕۆکدا. ئەو پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی هەموو مرۆڤەکان لەبەر چاوی پەروەردگاردا یەکسانن. کاتێك ئەو ڕێنماییانە نەدەگونجا لەگەڵ تایبەتمەندی و حەزی سەرانی فەرمانڕەوای مەککەدا بەوهۆیەوە بەتەواوی ڕەتیان کردەوە. هێرشەکەیان دەستپێکرد بە گاڵتەپێکردن و سوکایەتی کردن و پێکەنین و جنێودان. کاتێك ئەو کەرەستانە بێ سوود بوون لە وەستاندنی ئەو بانگەوازەدا هەتا خەڵکی نەتوانن بچنەناو ئیسلامەوە، وشەکان قێزەونتر و ناشیرینتر بوون کە بەرامبەر بەم پەیامە پیرۆزە دەکران. دەستیانکرد بە بوختان کردن و هەڕەشەی ئاشکرایان دەکرد. کاتێك ئەمە شکستی هێنا پەنایان بردە بەر تۆقاندن و ئەشکەنجەدانی ئاشکرا. هەندێکیان پیساییان دەکرد بەسەری محمدصلی ألله علیه وسلم و هاوەڵەکانیدا لەکاتی نوێژکردنیاندا کاتێك لە کڕنووشبردندا بوون بۆ ألله، یان دڕك و داڵ دەخرایە سەر ڕێگەکەیان، یان بەردباران دەکران و بە دار و قامچی لێیان دەدرا، یان کەسە لاوازەکانیان زیندانی دەکرد و ئازار و ئەشکەنجەیان دەدان. ئەوانەی فرە خودایان دەپەرست و باوەڕیان بە ألله نەبوو کە محمد صلی ألله علیه وسلم بانگەوازی بۆ دەکرد هەوڵیان دا محمد و هاوەڵەکانی توشی برسیەتی بکەن لەڕێگەی ئابلۆقەدانی ئابووریەوە بە قەدەغەکردنی مامەڵەی کڕین و فرۆشتن لەگەڵیان. بەڵام هەموو ئەمانە سودی نەبوو بەڵکو بەمجۆرە ورە و پێداگری محمد و هاوەڵانی ڕوو لەزیادبوون بوو لە پابەندبوونیان بە ئایینە نوێیەکەیانەوە زۆر بەتوندی. ((زانایەکی ڕەخنەگر لە ئیسلام دەڵێت: هەرگیز ڕووی نەداوە، لەدوای مەسیحیەتەوە کە جیهانی بە ئاگا هێنایەوە لە خەوی بێئاگایی، کە خەڵکی هاوشێوەی ئەم بە ئاگابوونەی لە ژیانی ڕۆحی ئیماندا نەبینیبوو کە هاوڕێ بەرگەی هەموو ناڕەحەتیەك بگرێت لەپێناو هاوەڵەکەیدا لە قوربانیدان بەردەوام بێت))(١١). خودی محمد صلی ألله علیه وسلم نمونەیەك بوو بۆ شوێنکەوتوانی لەبارەی خۆڕاگریەوە، بانگەوازەکەی هەموو دڵ و ڕۆحی گرتبووەوە، گوێگرەکانی بانگ دەکرد بۆئەوەی وازبهێنن لەو کارە قێزەونانە و خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە. لەسەرەتادا دوژمنایەتیەکی توند هەبوو دژ بەئەو بەجۆرێك توانی تەنها ببێتە ڕێگەنیشاندەری ژمارەیەکی دیاریکراو لە خەڵك، ئەو هەوڵە کەماە لە سێ ساڵی سەرەتای بانگەوازەکەیدا تەنها بووە هۆی هیدایەتدانی تەنها چل کەس. بەڵام دوژمنانی نەیاندەتوانی دڵی دانیشتوانی مەککە داگیر بکەن و نەهێڵن گوێبیستی وتەکانی بن ز وردە وردە زۆر بەهێواشی بەڵام بەشێوەیەکی جێگیر و بەردەوام خەڵگانی خاوەن هێز و توانا و خاوەن پلەوپایە باوەڕیان هێنا بە ڕاستی پەیامەکەی هەتا لە کۆتایی دە ساڵی یەکەمی بانگەوازەکەیدا ژمارەی شوێنکەوتوانی گەیشتە چەند سەد خێزانێك، سەیری محمد صلی ألله علیه وسلم دەکرد وەك وتەبێژێکی ڕاستگۆی دەستپاك لەلایەن ألله.

## ئەو کۆچەی بووە هۆی سەرکەوتن

لەوکاتەدا سەرانی فەرمانڕەوای مەککە و دەوروبەری توشی دڵەڕاوکێ و ترس بوون. ئەوەی دەستپێکرد وەك بانگەوازێك کە بەوتەی ئەوان لە زاری کەسێکی نیمچەشێتەوە بوو بە بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە کە

هەڕەشەی دەكرد لە بوون و مانەوەیان لە دەسەڵاتدا، لەبەرئەوە بڕیاریاندا ئەو كەسە لەناو بەرن ئەم ئاژاوەیەی ناوەتەوە بەوتەی ئەوان بۆ هەمیشە. لەو كاتەی محمد صلی ألله علیه وسلم تیایدا ڕووبەڕووی مەترسیدارترین تەنگ و چەڵەمە بوویەوە كە هەڕەشەی دەكردە سەر پەیامەكەی، كۆمەڵێك ڕاسپێردراو لە خەڵكانی دیاری ناو مەدینە یەسرب كە دەكەوێتە دووری ٢٨٠ میل لەباكوری مەككە هاتن بۆلای محمد صلی ألله علیەوسلم بۆئەوەی گوێبیستی وتەكانی ببن و ببنە شوێنكەتووی ڕێبازەكەی. لەڕێگەی حاجییەكان و میوانانی مەككەوە ڕێنماییەكانی محمد صلی ألله علیه وسلم زەمینەیەكی پتەوی ڕەخساند لە مەدینە كە شەڕ و ناكۆكی ناوخۆیی تیادا هەبوو، كە بووە هۆی ئەوەی زۆر پێویستیان بە فەرمانڕەوایەكی بەهێز بێت بۆ ئەوەی سنورێك دابنێت بۆئەو ململانێیانە و ئاشتەوایی بڵاوبكاتەوە لەنێو خەڵكی یەسربدا، لە محمددا صلی ألله علیەوسلم ئەو كەسەیان دۆزییەوە كە بەدوایدا دەگەڕان. كاتێك محمد صلی الله علیەوسلم چاوی كەوت بە دوای وەفدی دانیشتوانی مەدینە باوەڕیان پێهێنا و پەیمانیان پێدا كە تەنها پەرست بۆ ألله ی تاكوتەنها ئەنجام بدەن، وە ڕێنماییەكانی ئیسلام دەپارێزن و شوێنی دەكەون، گوێڕایەڵی پێغەمبەرەكەیان دەبن لە هەموو ئەو فەرمانانەی پێیان دەكات بۆ كاری چاكە، بەرگری دەكەن لە پێغەمبەر و شوێنكەوتوانی هەروەك چۆن بەرگری دەكەن لە خێزان و منداڵەكانیان، محمد صلی ألله علیەوسلم لەلایەن ألله فەرمانی پێدرا كە بانگهێشتەكەیان قوبووڵ بكات و بچێت بۆ یەسرب. باوەڕدارانی خەڵكی مەككە دەستیانكرد بە كۆچكردن بەرەو یەسرب نزیكەی حەفتا خێزان كۆچیان كرد. كاتێك سەرانی مەككە هەستیان كرد بەم كۆچكردنە بەكۆمەڵە هەموو هەوڵێكیان دا بۆئەوی نەهێڵن محمد صلی ألله علیه وسلم پێیان بگات. بەڵام توانی بگاتە یەسرب بە هاوەڵی ئەبوبەكر، بەجۆرێك لەسەرەتای كۆچكردنەكەیاندا پەنایان بردە بەر ئەشكەوتێكی بچوك لەبەشی باشوری مەككە، كاتێك ئەسپسوارانی بێباوەڕەكان دەرچوون بۆئەوەی بەدوایدا بگەڕێن لە هەموو لاكانی دەروبەری مەككە، گەیشتنە نزیكی ئەو ئەشكەوتەی محمد صلی ألله علیەوسلم و هاوەڵەكەی ئەبوبەكر تیایدا خۆیان شاردبوەوە، بەوهۆیەوە هاوەڵەكەی ترسا و خەریك بوو نائومێد دەبوو لە ڕزگاربوون ووتی: ((ئەگەر یەكێك لەوانە سەیری قاچەكانی بكات ئەوا ئەمانبینێت))، بەڵام محمد صلی الله علیەوسلم دڵنیای كردەوە پێی وت: ((ئێمە تەنها دوو كەس نین، بەڵكو سیانین، چونكە ألله لەگەڵماندایە)). قورئان ئەمەی پشتڕاستكردەوە لە ئایەتێكدا دابەزی: ((إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا فَأَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُواْ السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿التوبة: ٤٠﴾)). بەڕاستی نەدۆزرانەوە، دوای سێ ڕۆژ دوای ئەوەی گەڕان بەدوایاندا كەمبوویەوە، محمد صلی ألله علیه وسلم و هاوەڵەكەی دوو حوشتریان بۆ دابینكرا بۆ بڕینی ڕێگایەكی مەترسیدار و چۆڵ بۆئەوەی بیانگەیەنێتە شاری مەدینە كە بڕیاربوو كۆچی بۆ بكەن. ئەوە ساڵی ٦٢٢ زایینی بوو. موسوڵمانان ئەم كۆچكردنەیان داناوە وەكو خاڵێكی گۆڕان لە مێژووی جیهاندا، بەوهۆیەوە بووبە ساڵی سەرەتای ڕۆژژمێری ئیسلامی. زۆر بەخێرایی ناوی یەسرب گۆڕا بۆ مەدینەی پێغەمبەر دواتلر ناوەكە كورتكرایەوە بۆ مەدینە بە تەنها.

لەكاتی گەیشتنی محمد صلی ألله علیه وسلم بۆ مەدینە ئەركە قورسە سەرەكیەكانی گرتەئەستۆ. ناچاربوو لە كاری پێغەمبەرایەتیەوە ڕووبكاتە كاری بەڕێوەبردن، ئەو ئامۆژگاریكەر و بانگخوازەی كە ڕووبەڕووی چەوسانەوە و سوكایەتی پێكردن دەبوویەوە لە شاری مەككە، لەڕووی ڕامیاریەوە شارەزا و لێهاتوو بوو لە مەدینە گۆڕا بۆ فەرمانڕەوزایەكی كاملی دەوڵەت، وەك سەركردەیەك دەمانبینی تەنها بەسەر دڵی كۆمەڵێك لە

شوێنکەوتوە دڵسۆزەکانیەوە نا بەڵکو سەرکردەیەك بوو بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی شارێکی کامڵەوە، بووە دادوەر و سەرکردەی سەربازی هەروەها بوو بە مامۆستایان.
تەنانەت دوژمنانی دانیان بەوەدانا ڕۆڵە نوێیەکەی بەشێوەیەکی زۆر باش گێڕا. وێڕای ئەوەی بەرەوڕووی کۆمەڵە کێشەیەکی ئاڵۆز بوویەوە سەلماندی سەرکردەیەکی سەرکەوتوە. بەردەوام بوو وەك دادوەرێك بەڵام بە ژیانێکی سادە هەروەك کاتی ژیان بەسەر بردنی لە مەککە. لەماڵێکی زۆر سادەی لە قوڕ دروستکراو دەژیا، مەڕەکەی بەدەستی خۆی دەدۆشی، ماڵەکەی کراوە بوو بەڕووی هەموو ئەوانەی دەیانویست سەردانی بکەن بەڕۆژ و بەشەو، زۆر بە باشی بەخێرهاتنی دەکردن. زۆربەی کات جلەکانی پینە دەکرد و دەیدورینەوە بەدەستی خۆی: ((هیچ ئیمبراتۆرێك تاجەکەی نەهێشتۆتەوە لەمێژوودا وەکئەوەی ئەم پیاوە پاراستویەتی کە خاوەنی جبەیەکی پینەکراوە بە گوێڕایەڵی شوێنکەوتوەکانی))(١٢). مێژوونوسە موسوڵمانەکان دەگێڕنەوە ألله کلیلی گەنجینەکانی سەر زەوی خستەبەردەمی بەڵام ڕەتی کردەوە و بڕیاریدا وەك بەندەیەکی سادە بژی.
کلتوری ئیسلامی فەرمانڕەوایی محمد صلی ألله علیه وسلم باس دەکات وەك تێکەڵەیەکی نمونەیی لە دادپەروەری و بەزەیی، دادگەری جێبەجێ کرد وەکو فەرمانڕەوای دەوڵەت، وەك پارێزەری ژیان و سەربەخۆیی گەلەکەی، دادگەری پێویستە بۆ پاراستنی سیستمی بەڕێوەبردن، جێبەجێکردنی سزاکان بەسەر ئەوانەی یاسا پێشێل دەکەن. بەڵام کاتێك خۆی بەرەوڕووی ئازاردان دەبوویەوە یان سوکایەتی پێکردنێك بۆخۆی تۆڵەی نەدەکردەوە بەڵکو بەوپەڕی سۆزەوە ڕەفتاری دەکرد تەنانەت بەرامبەر بە دوژمنانی. بەگشتی، دانیشتوانی مەدینەسەرکردەیەکیان تیادا دەبینی کە پێویست بوو خۆشیان بوێت و گوێڕایەڵی بکەن، چونکە وەك یەکێك لە مێژوونوسان باسیکردوە ((خاوەنی شکۆ و کاریگەریەکی زۆر بووە لەسەر خەڵك، هەروەها بەهۆی خانەدانی و چاکەکاریەوە کاری تێدەکردن تەنها بەرەو کاری چاکەی دەبردن))(١٣).
لەو دە ساڵەی کەلە ژیانی مابوو مێژووی کەسیەتی تێکەڵ بوو لەگەڵ مێژووی کۆمەڵگەی یەکگرتووی هاوبەشی دانیشتوانی مەدینەدا، ئەو شتەی پێغەمبەر صلی ألله علیەوسلم نوێنەرایەتی دەکرد بەهۆی کارکردن لە شێوازی فەرمانڕەوایی کردندابەشێوەیەکی جوان لە تێکەڵکردنی پێنج هۆزی دژ بەیەك لە هۆزەکانی دانیشتوی مەدینە. سیان لەو هۆزانە جوولەکە بوون ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو بەڵام دواجار سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە هەستاندنی هەستی هاونیشتیمانی بوون و هەستی هاوکاری کردن لەنێوان هۆزەکاندا، کە پێشتر نەناسراو بوو لەو سەردەمەدا هەتا ئەو کاتە. ناوبانگی بڵاوبوویەوە لەنێونا خەڵکدا بەو هۆیەوە لە هەموو ناوچەیەکی نیمچەدورگی عەرەبەوە دەهاتن بەرەو مەدینە بۆئەوەی ئەم پیاوە ببینن کە ئەم موعجیزەیەی ئەنجامداوە.
بەدوای ئەمەدا جەنگ ڕوویدا لەگەڵ دانیشتوانی مەککەدا کە بەرەنگاری موسوڵمانان بوونەوە بەناوی زۆربەی عەرەبەکانی نیمچەدورگەی عەرەب، وەك نوێنەری ئەقڵیەت و بیروباوەڕی دانیشتوانەکەی لە بەرەنگاربوونەوەی ئیسلامدا. لەساڵی دووەمی دوای کۆچکردندا دانیشتوانی مەدینە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا بەسەر سوپای مەککەدا کە ژمارەیان سێ ئەوەندەی سوپای موسوڵمانان دەبوو، موسوڵمانان ئەم سەرکەوتنەیان شیکردەوە وەك هێمایەکی ئاشکرا لەسەر ئەوەی فریشتەکانی ئاسمان جەنگیان دەکرد شانبەشانیان. بەڵام لە ساڵی دواتر پاشەکشەی بەخۆوە بینی لە سەرکەوتنی لە سەرکەوتنیان لە جەنگدا

تەنانەت محمد صلی ألله علیەوسلم بریندارکرا. دانیشتوانی مەککە بەردەوام نەبوون لە سەرکەوتنیان دوای دوو ساڵئابڵوقەی شاری دەینەیان دا وەك دوا هەوڵدان بۆ لەناوبردنی موسوڵمانان و ناچارکردنیان بۆ خۆبەدەستەوەدان. بەڵام شکستهێنانیان لەو هەوڵدانەدا ڕێڕەوی مێژوویی گۆڕی بۆ بەرژەوەندی محمد صلی ألله علیەوسلم بۆ هەتاهەتایە. لە ماوەی هەشت ساڵی دوای کۆچکردن لە مەککەوە بۆ مەدینە محمد صلی ألله علیەوسلم توانی شاری مەککە ڕزگار بکات لە گومڕایی و بتپەرستن بەڵام ئەم سەرکەوتنەی بەکارنەهێنا بۆ تۆڵەسەندنەوە لەوانەی سوکایەتیان پێدەکرد لە مەککەدا بەڵکو لێیان خۆشبوو. محمد صلی ألله علیەوسلم ڕێگای گرتەبەر بەرەو کەعبەی بەناوبانگ–ئەمە پەرستگایەکی شێوە شەشپاڵوویيە(دەوترێت ئیبراهیم و ئیسماعیل بنیاتیان ناوە)–هەموو بتەکانی ناوی شکاند، سەرلەنوێ تەرخانی کردەوە بۆ پەرستی ألله بەتەنها، داینا وەك ناوەندی ئیسلام دانیشتوانی مەککە ئایینی ئیسلامیان قوبووڵکرد بەڵام تیایدا نەمایەوە بەڵکو گەڕایەوە بۆلای پشتیوانانی لە مەدینە.

دوای دوو ساڵ واتە لەساڵی ٦٣٢ز (١٠ی کوچی)محمد صلی ألله علیەوسلم دەستیگرت بەسەر نیمچەدورگەی عەرەبدا. وێڕای هەموو هێز و سوپای هۆزە عەرەبییەکان نەیانتوانی بەو جۆرە یەکگرتویی دانیشتوانی ئەم نیمچە دورگەیە بپارێزن لەژێر تاکە دەسەڵاتێکدا بەوجۆرەی محمد صلی ألله علیە وسلم ئەنجامی دا. پێشئەوەی سەدەی حەوتەمی زایینی کۆتایی بێت، شوێنکەتوانی محمد صلی ألله علیەوسلم توانیان ئەرمینیا ڕزگار بکەن، لەگەڵ وڵاتی فارس، سوریا، فەڵەستین و عێراق و باکوری ئەفەریقا و ئیسپانیا، بەڵکو شاخەکانی بیرینیەیان بڕی بەرەو فەڕەنسا. ئەگەر شکستیان نەهێنایە لەسەر دەستی چارلز مارتل لەو جەنگەی ڕوویدا لەنزیك شاری تور لەساڵی ٧٣٣ز. ئەگەری ئەوە هەبوو هەموو جیهانی ڕۆژئاوا ئێستا موسوڵمان بوونایە.

لەماوەیەکی کورتدا لە ژیانی مرۆڤایەتی، محمد صلی ألله علیەوسلم توانی ((لە مادەیەك کە ئەگەری سەرکەوتنی کەم بوو نەتەوەیەك کۆبکاتەوە کە پێشتر هەرگیز یەکگرتوو نەبوون، وڵاتێك دروستبکات کە پێشتر لەڕوی جوگرافیەوە گرنگی پێنەدەدرا، هەروەها ئایینێك بنیات بنێت جێگەی ئایینی مەسیحیەت و یەهودییەت بگرێتەوە لە چەندین ناوچەی فراوانی سەر زەوی، هێشتا بەشێکی زۆر لە مرۆڤایەتی شوێنکەوتوی ئایینەکەی ئەون، بناغەی ئیمبراتۆریەتێکی دانا زۆر بەخێرایی دورترین سنورەکانی ناوچەکانی جیهانی گرتەوە لەو سەردەمەدا))(١٤).

ماکل هارتك لە کتێبەکەیدا سەد کەسی یەکەمین کە تەرخانی کردبوو بۆ باسکردنی مەزنترین سەد کەسی کاریگەر لەسەر ژیانی مرۆیی، محمدصلی ألله علیە وسلمی خستوەتە یەکەمین پلە. نوسیویەتی:
((کۆبوونەوەکەی کەموێنە بوو لەنێو کاریگەری ئایینی و جیهانگیریدا، محمدصلی ألله علیەوسلم دادەنرێت بە کاریگەرترین کەسایەتی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا))(١٥). شیکردنەوەی ئەوەی موسوڵمانان دەیبەخشن بۆ ئەم دەستکەوتە سادەیە. هەموو ئەمە کاری ألله بوو.

## موعجیزەی هەمیشەیی

ئەو تێکەڵەیە لە سەرسامی و ڕێزگرتن و خۆشەویستیەی کە موسوڵمانان هەستی پێدەکەن بەرامبەر بە محمد صلی ألله علیەوسلم ڕاستیەکی کاریگەر و سەرنجڕاکێشە لە ڕاستیەکانی مێژوو. موسوڵمانان سەیری دەکەن وەك پیاوێك لەژیاندا سودی وەرگرتوە لە فراوانترین بوارەکانی بەشێوەیەکی نمونەیی. چونکە تەنها

شوان و بزرگان و سەرباز و پێغەمبەر و سەرکردە و سۆفیەك نەبوو بەڵکو هەروەها بیٚ دایك و باوك بوو، چەندین ساڵ مێردی ژنێك بوو کە چەندین ساڵ لەخۆی گەورەتر بوو، دواجار بوە مێردی چەندین ژن هەندێکیان چەندین ساڵ لەخۆی بچوکتر بوون، زۆربەی کات باوکێك بوو کە (هاوسەرەکەی لەدەست دابوو).

لە هەموو ئەو ڕۆڵانەدا محمد صلی ألله علیەوسلم پیاوێکی نمونەیی بوو. هەموو ئەمانە ئامادەیی هەیە لە مێشکی موسوڵمانانداا کاتێك ناوی دەبەن دەڵێن (صلی ألله علیەوسلم). وێڕای ئەوە پلەوپایەی تێکەڵنەکراوە بە ناوەندی ئایینەکەیان کەلە وتەکانی ناوقورئاندا جێگەی بۆ دانراوە.

وشەی قورئان لە زمانی عەرەبیدا واتە خوێندنەوە. وەك گونجاندنێك لەگەڵ ناونانەکەی، قورئان یەکێك بوو لەو کتێبانەی زۆرترین کات دەخوێنرایەوە لە جیهاندا. بەدڵنیاییەوە یەکێکە لەو کتێبانەی لەبەردەکرێت لە جیهاندا، لەوانەیە ئەو کتێبە بێت زۆرترین کاریگەری هەیە لەسەر ئەوانەی خوێندویانەتەوە لە جیهاندا.

ڕێزلێنان و سەرسامبوون بە محمد صلی ألله علیەوسلم لە ناوەڕۆکی ئەو کتێبەدا هێندە مەزنە بەڕادەیەك دانراوە بە تاکە موعجیزەی گەورەألله کاری کردوە لەڕێگەی قورئانەوە، قورئان وەك ألله ناوی ناوە موعجیزەی هەمیشەیی ألهیە.

وێڕای ئەوەی خودی محمد صلی ألله علیەوسلم لە هیچ خوێندنگایەك نەیخوێندبوو، بەڵکو نەخوێندەوار بوو نەخوێندنەوەی دەزانی نە نوسین تەنانەت نەیدەزانی ناوی خۆی بنوسێت، وێڕای ئەوە کتێبێکی لەگەڵ خۆی هێنا کە زەمینەیەك مسۆگەر دەکات بۆ هەموو مرۆڤایەتی، لە هەمان کاتدا لە لوتکەی ڕەوانبێژیدا بوو، جوانیەکی بێوێنەی هەبوو، چونکە محمد صلی ألله علیەوسلم لەگەڵ هەموو موسوڵمانان باوەڕێکی تەواویان هەبوو بەوەی ئەم قورئانە زمان حاڵی بیروباوەڕەکەیانە کە دەڵێت: ((ئایا بەدوای موعجیزەیەکی مەزنتردا دەگەڕێن، ئەی بێباوەڕان! زمانی ئێوەمان هەڵبژارد بۆ ئەم کتێبە کە هیچ کەسێك ناتوانێت هاوشێوەی ئەم کتێبە بهێنێت، کە تاکە سورەتێکی هەموو دروشمە ئاڵتونیەکان بیٚ گرنگی بیٚ بەها دەکات؟))

قورئان دابەشدەبێت بۆ ١١٤ بەش یان سورەت بەشێوەیەکی پلەبەندکراو ڕێکخراوە لەڕووی قەبارەوە (جگەلە سورەتی یەکەمالفاتحة کورتە کە لە نوێژی ڕۆژانەی موسوڵماناندا دەخوێنرێت)، لەبەرئەوەی سورەتی ژمارە ٢ درێژیەکەی ٢٨٦ ئایەتە، دواتر سورەتی ژمارە ٣ درێژیەکەی ٢٠٠ ئایەتە، بەمجۆرە هەتا دەگەین بە سورەتی ژمارە ١١٤ کە تەنها ٦ ئایەتە.

موسوڵمانان مەیلی خوێندنەوەی قورئان دەکەن بەشێوەیەکی پیت بە پیت. قورئان پێکهاتوە لە پیتەکان و دەنگەکان بریتیەلە بەڵگەیەك بۆ ئەو گەوهەرەی سنوری نیە بۆ قورئان. قورئان موعجیزەیەکە لەنێو دیاردەیەکی پێکهاتو لە پیتەکان و دەنگەکان.

پیتەکانی قورئان دابەزیون بۆ سەر محمد صلی ألله علیەوسلم بە چەند بەشێك کە لەبەرکردن و مامەڵکردن لەگەڵیدا ئاسان بووە کە بە درێژایی بیست و سیٚ ساڵ دابەزیوە لەڕێگەی چەند دەنگێکەوە لەسەرەتادا هاوشێوەی دەنگی زەنگ بوو، دواتر بە پلەبەندکراوی چڕبوەتەوە بۆئەوەی ببێتە دەنگێکی تایبەت خۆی ناساند وەك دەنگی جبریل. محمد صلی ألله علیەوسلم هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو بەسەر کۆنترۆڵکردنی هاتنی وەحی بۆی، وەحی بۆ دەهات بەشێوەیەکی سەربەخۆ کەلە ویستی ئەودا نەبوو. کاتێك وەحی بۆ دەهات دەگۆڕا بۆ حاڵەتێکی تایبەت و ڕوون و ئاشکرا، ڕوخسار و دەنگی دەگۆڕان. وشەکان هێرشیان دەکردە سەر وە قورساییان هەبوو، ((إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلاً ثَقِيلاً ﴿المزّمِّل: ٥﴾)) کاتێك ئایەتەکان دادەبەزینە سەری و ئەویش لەسەر پشتی حوشترەکەی بوو، حوشترەکەی شپرزە دەبوو هەوڵی دەدا بەرگەی ئەو قورساییە

بگرێت لەڕێگەی ڕێك كردنەوەی قاچەكانیەوە. كاتێك وەحی زیادی دەكرد سكی حوشترەكە ل دەلكا بە زەویەوە و قاچەكانی دەنوشتانەوە. ئەو وشانە كە محمد صلی ألله علیه وسلم دەیگوتن كە لە حاڵەتی نیمچە ئاگاییدا بوو زۆربەی كات هاوەڵەكانی لەبەریان دەكرد و تۆماریان دەكرد لەسەر ئێسك و بەرگ و توێكڵی درەخت و گەڵاكانی درەخت و گەڵای دارخورما و جۆرە پێستێك كە بۆ نوسین بەكاریان دەهێنا لەگەڵ پاراستنی ألله بۆ ئەو دەقانە لەڕێگی ئەو پرۆسەیەوە.

قورئان پەیامی هەردو پەیمانی نوێ و كۆن پێكەوە دەبەستێتەوە، كە بە وەحی ألله دادەنرێن كە بۆ پێغەمبەرانی پێشو دابەزیوە، خۆی پێشكەش دەكات وەكو كامڵكەر و تەواوكەری ئەو دوو وەحیەی پێشوو: ((قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَى شَيْءٍ حَتَّىَ تُقِيمُواْ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيراً مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَاناً وَكُفْراً فَلاَ تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿المائدة: ٦٨﴾))[٧٠]

ئەمە بانگهێشتی جوولەكە و مەسیحیەكانی كرد بۆئەوەی بێنە ناو ئیسلامەوە لەژێر ناونیشانی أهل الكتابدا. ئەمە كاتێك وەحی قورئانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو. ئایینی وڵاتانی تر باس نەدەكرا، بەڵام هێمایەك هەیە بۆ بوونیان و لەڕووی بنەماوە بە دروست دەزانران، هەروەك ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەكات: ((وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاء رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ ﴿يونس: ٤٧﴾)) یان: ((وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيماً ﴿النساء: ١٦٤﴾))، بەڵام وێڕای ئەوە موسوڵمانان وابیردەكەنەوە پەیمانی كۆن زو پەیمانی نوێ هاوبەشن لە چەند كەموكوڕیەكدا كەلە قورئاندا نین. یەكەم ئەوان دەڵێن لەبەر چەند هۆكارێكی بارودۆخی هەردو پەیمانی نوێ و كۆن بەشێك لە ڕاستی دەخەنەڕوو. دووەم تەورات و ئینجیل بەشێوەیەكی بەش بەش لە كاتی دەماودەم كردنیان و گواستنەوەیاندا ماناكەی گۆڕدراوە ئەمە ئەو ڕاستیە دەخاتەڕوو كە دژبەیەكبوون و بەرهەڵستی یەكتری دەردەكەوێت لە گێڕانەوەی نێوان هەردو پەیمانی نوێ و كۆندا و لەنێوان گێڕانەوەكانی ناو قورئاندا. كاتێك قورئان پارێزراو و دوور بوو لەو دوو كەموكوڕیە، ئەوا بە دوا وەحی وتەی ألله و ویستەكەی دەنوێنێت. ئەمە خراوەتەڕوو لە ئایەتی سورەتی دووەمی قورئان كە دەڵێت: ((ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿البقرة: ٢﴾)).

بەڵام لەڕووكاری دەرەكیەوە شتەكان بەشێوەیەكی جیاواز دەردەكەون، چونكە لەڕووی دەرەكیەوە قورئان بەجۆرێك دەردەكەوێت كە تێیناگەین. هیچ كاتێك ڕووی نەداوە مرۆڤێك لە پشوی كۆتایی هەفتەدا كاتێك باران دەبارێت لە ماڵەكەیدا پەنا ببات بۆئەوەی پشوەكەی تەرخان بكات بۆ خوێندنەوەی قورئان. كارلیل دانی بەوەدانا خوێندنەوەی بۆ قورئان: ((خوێندنەوەیەكی هیلاككەر بوو هیچ كات قورسایی وا نەكەوتوەتە سەر شانی، چونكە ئەمە كتێبێكی هیلاككەرە، تەنها هەست بە بەرپرسیاریەتی واله هەموو ئەوروپیەك دەكات بتوانێت سەركەوتو بێت لە خوێندنەوەی قورئاندا)). هەروەها سیر ئیدوارد جیبون هەمان بیركردنەوەی هەیە بەنزیكەیی لەبارەی خوێندنەوەی قورئانەوە: ((تاكی ئەوروپی بەدواداچون دەكات بە نائارامیەوە بۆ ئەو وتە ئەدەبیانەی كە چیرۆكە بێ كۆتاییەكانی پێ نوسراوەتەوە، لێوانلێوە لە ئامۆژگاری بێوێنە كە هەستێك دەوروژێنێت بیرۆكەیەكی تێدایە لەنێو تەمومژدا هەندێكجار هەمان بیرۆكە دەبینینەوە لە تەمومژێكی دیكەدا!)).

---

[٧٠] لەوانەبوو یەكەمیان بوترایە بە وتەی ألله: ((نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ ﴿آل عمران: ٣﴾))، ((مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِ اللّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ﴿آل عمران: ٤﴾)). وتەی ألله: ((وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿المائدة: ٤٨﴾.

ئەو زمانەی قورئانی پیَ دابەزیوە کلیلی تێگەیشتنی ئەم مەتەڵە، فیلیب دەڵێت: ((هیچ نەتەوەیەك نیە لە جیهاندا وشەکان بیوروژێنێت، ئایا بە شێوەی زارەکی یان نوسراو گوازرابێتەوە، وەك نەتەوەی عەرەب. دەگمەنە هیچ زمانێکی جیهان توانای کاریگەری هەبێتلەسەر مێشکی بەکارهێنەرانی وەك کاریگەری زمانی عەرەبی)). جەماوەری قاهیرە یان دیمەشق یان بەغداددەکرێت هەستەکانیان بهێنرێتە جۆش هەتا بەرزترین پەلەی وروژاندنی سۆزداری بەچەند وشەیەك ئەگەر وەرگێڕدرانە سەر زمانەکانی تر ئاسایی دێنەبەرچاو. وەزن وقافیەی ئەو وشانە کاریگەرن هێندەی کاریگەری خەواندنی موگناتیسی لەڕووی هێزەوە. لێرەوە هێزی وەحی قورئانی تەنها لە مانای وشەکاندا نەشاردراوەتەوە بەڵکو لەو زمانەدایە ئەو مانایانەی تیادا بەرجەستەکراوە لەگەڵ ئەو دەنگەدا. قورئان هەر لە سەرەتاوە دیاردەیەکی دەنگی بوو، ئەوەی سەرەتا دابەزی ئەم ئایەتە بوو: ((اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿العلق: ١﴾))، چونکە ناوەڕۆك و تیانوس پێکەوە تێکەڵ بوون بەجۆرێك جیانابنەوە و وەرگێڕانەکان ناتوانن هەمان سۆز و جۆش و خرۆش بگوازنەوە لەگەڵ ئەو نهێنیانەی قورئان هەڵیان دەگرێت بە زامانە ڕەسەنەکەی. ئەمە بۆمان ڕوون دەکاتەوە بۆچی موسوڵمانان هەمیشە هەوڵدەدەن ئەوانی تر ئەو زمانە فێربکەن کە وابیردەکەنەوەألله پێی دواوە دواجار بەهێزێکی ڕاستەوخۆی بێوێنە، بەپێچەوانەی مەسیحیەکان کە کتێبەکەیان وەردەگێڕن بۆ سەر هەموو زمانە جیهانیە ناسراوەکان(١٦).

وێڕای ئەوە زمان تاکە بەربەست نیە قورئانی پێشکەشی دەکات بۆئەو کەسانەی هەوڵدەدەن بیخوێننەوە لەلایەن کەسانی بیانیەوە، چونکە لەڕووی پێکهاتەوە قورئان هاوشێوەی هیچ دەقێکی ئایینی تر نیە. بەپێچەوانەی ئۆپانیشادات (کتێبە هیندیە پیرۆزەکان) قورئان کتێبێکی میتافیزیقی پەتی نیە. هەروەها بیروباوەڕەکانی بنیاتنەنراون لەسەر بناغەی گێڕانەوەی دراماتیکی وەك لە داستانە هیندیەکاندا هەیە، هەروەها لەسەر بنەمای گێڕانەوەی مێژوویی دانەنراوە وەك لە تەوراتدا پشتی پێبەستراوە، هەروەها ألله دەرنەکەوتوە لەسەر شێوەی مرۆڤ هەروەك لە ئینجیلەکان و کتێبی هیندۆسیدالبها گافاد گیتادا هاتوە.

ئەگەر هێندە بەس بێت بۆ بەراوردکردنی بە کتێبە پیرۆزەکانی تر، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەگەر پەیمانی کۆن و پەیمانی نویَ دوو کتێبی مێژوویی بنبەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بیروباوەڕی بن بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئەوا قورئان کتێبێکی بیروباوەڕیە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و مێژووییە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، چونکە گرنگیدان و تێڕامانی سەرەکی بۆ زۆربەی قورئان لەسەر ڕاگەیاندنی تعاکو تەنهایی ألله و لەبارەی ئەوەیە کە ألله بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا و لە هەمووان زاناترە و لە هەمووان بەبەزەیی ترە، لە ڕاگەیاندنی پەیوەندی تەواوی نێوان ئەم بابەتانە سەرئەنجام ژیان خاوەنی مرۆڤایەتی دەبێت، بەڵام ڕووداوە مێژووییەکان تەنها سەرچاوەن لەو خاڵە بیروباوەڕیانەدا، هەتا ڕادەیك خەریکە گرنگی پێنادرێت. ئەمە پێمان دەڵێت بۆچی باسی پێغەمبەران کراوە لە قورئاندا بەبیَ ڕێکخستنی مێژوویی، بۆچی گێڕانەوەی ڕوداوە مێژووییەکان دوبارە دەکرێتەوە، لەبرئەم هۆکارە چیرۆکەکانی کتێبی پیرۆز تەوراتی کە قورئان ئاماژەیان بۆ دەکات بەشێوەیەکی کورت باسکراون. کاتێك پەیوەندی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان ألله و بەندەکانیدا خاڵێکی سەرەکی بێت وەك ڕوونکراوەتەوە لە قورئاندا ئەوەی لەم بابەتە دەرچێت تەنها ئاماژەی بۆ کراوە.

لەوانەیە ئەم ڕەخنەگرتنەی ڕۆژئاوا بۆ قورئان بە هەمان شێوەی کتێبە پیرۆزەکانی تر بێت کاتێك موسوڵمانان دەیخوێننەوە، ئەگەر بمانەوێت وتەکان کورتبکەینەوە لە پەیمانی کۆن و نوێدا ئەوا موسوڵمانان نائومێدی خۆیان نیشان دەدەن کاتێك ئەو دەقانە شێوازی وتەی یەزدانی وەرناگرن بەڵکو تەنها ڕوداوێکە و

گێڕدراوەتەوە. لە قورئاندا ألله دەدوێت بە زمانی ڕاناوی ڕێزمانی قسەکەری یەکەم، چونکە باس لە خۆی دەکات و یاسا و شەریعەتەکەی دەخاتەڕوو. بەوهۆیەوە موسوڵمان هەموو ڕستەیەکی قورئان وەك وەحییێك دەبینێت، وا هەست دەکات خودی وشەکان، تەنانەت دەنگەکەیان کەرەستەیەکی بەزەیی و بەخشینە.

((قورئان متمانەی نیە بەشتێك لە دەرەوەی بەرنامە و پەیڕەوی ئەو بێت، ئەو لەبارەی ڕاستیەوە نادوێت، بەڵکو خۆی خودی ڕاستیە))(١٧). لەبەراوردکردنێکی تەواوی لەگەڵ کتێبە پیرۆزەکانی یەهوییەت مەسیحیەتداکە وا دەردەکەون دورترن لە ألله چونکە لەبری ڕاگەیاندنی ڕاستەوخۆ لەلایەن ألله گێڕانەوەی مێژوویین.

دابەزینی ڕاستەوخۆی قورئان کێشەیەکی تر بۆ خوێنەر دروست دەکات کەمکراوەتەوە لە زۆربەی کتێبە پیرۆزەکانی تردا لەڕێگەی بەکارهێنانی زیاتر لە چیرۆکێك. یەکێك لە لێکدەرەوکانی قورئان ئەم خاڵەی ڕوونکردوەتەوە بەم شێوەیە: ((پەیوەست نەبوون بە دەقی قورئانیەوە، بەهۆی یەکسان نەبوون و ئەو هاوتانەبوونەیە لەنێوان ڕۆح و سەرچاوە سنوردارەکانی زمانی مرۆڤایەتیەوەیە. ئەمە هاوشێوەی ئەوەیە ئەگەر ألله بیەوێت هەزار ڕاستی بخاتەڕوو تەنها دە وشە بەکاردەهێنێت! لەبەرئەو هۆیە چەند ئاماژەیەك دەخاتەڕوو کە پڕن لە مانا و کورتکراونەتەوە))(١٨).

ئەگەر بەراوردکرنەکانمان خستەلاوە ئەستەمە بتوانین جەختکردنەوە زیادبکەین لەسەر ئەو شوێنەی قورئان هەیەتی لە شیکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامیدا. ئەو قورئانەی بەشێکی زۆری لەبەر دەکرێت هەر لە تەمەنی منداڵیەوە هەموو ئەو ڕوداوانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. لەبیرخەرەوەی باوەڕدار بۆ کارەکانی ڕۆژانە ڕێبەری بەکارهێنەرە بۆ ناساندن و گەرەنتی مانەوە، لە هەمان کاتدا نەخشەڕێگایە بۆ ویستەکانی. دواجار کۆمەڵێك لە وتەی تێڕامانە بەشێوەیەکی تایبەت قووڵدەبێتەوە بەشێوەیەکی ناکۆتا لە هەستی مرۆڤدا لەبیرکردنەوە لە شکۆداری ألله. ((وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً لاَّ مُبَدِّلِ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿الأنعام: ١١٥﴾)).

# چەمکە بیروباوەڕیە بنەڕەتیەکان

جگەلە هەندێك لە ناكۆكیە دیارەكان كە ئاماژەیان بۆ دەكەین، چەمكە لاهوتیە سەرەكیەكانی ئیسلام بەشێوەیەكی كرداری لەگەڵ چەمكە لاهوتیەكانی یەهودییەت و مەسیحیەتدا. بە كورتی لێرەدا باسی چەمگە لاهوتیە بیروباوەڕیە گرنگەكان دەكەین لە چوار خاڵدا:

١. ألله.

٢. جیهانی دروستكراو.

٣. دەرونی مرۆڤایەتی.

٤. ڕۆژی لێپرسینەوە.

هاوشێوەی هەموو ئایینە مێژۆیەكانی تر. هەموو شتێك لە ئایینی ئیسلامدا چڕبووەتەوە لە دەوری دوا ڕاستی ڕەها ألله، ألله شتێكی مادی نیە هەتا ببینرێت. سەبارەت بە عەرەب ئەمە شتێك نەبوو هەتا گومان وشك دروست بكات لەبارەی ڕاستی ألله، چونكە هەرگیز خۆیان نەداوە بە دەستەوە بۆئەوەی تەنها شتی بینراو ڕاستەقینەیە. یەكێك لەو ڕێزلێنانەی لە قورئان نراوە بەسەر محمد (صلی ألله علیەوسلم) ((وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿التكوير: ٢٤﴾)). لە كاتێكدا عەرەب لە بیاباندا دەژیان مانای بوونی دەستی نەبینراو كە گەردەلولەكان دەبات بەرێوە و گسكی بیابانەكان دەدات، یان ئەوەی تارمایی دروست دەكات كە گەشتیار هەڵدەخەڵەتێنێت هەمیشە لەپێشچاویاندا بوو.

كەواتە قورئانی جیهانی ڕۆح و تەنهایی ألله شتێكی نوێ نەبوو لەلای عەرەب. چونكە چەند كەسێكی خاوەن هەستی بەرز هەبوون ڕێبازی ڕاستیان پەیڕەو دەكرد لەپێش هانتی محمد (صلی ألله علیەوسلم). داهێنانی قورئان لە لابردنی بتەكاندا بوو، چڕكردنەوەی بیرۆكەی خودایەتی لە یەك خودادا كە نەبینراوە بۆ هەموو مرۆڤێك. بەم واتایە بەشداریكردنی بەردەوام كە ئیسلام پێشكەشی كردوە بۆ ئایینی عەرەبی بریتیبوو لە یەكتاپەرستی.

دەبێت ئەوە باسبكەین موسوڵمانان لە یەكتاپەرستیدا بەشداریكردنی ئیسلامی تەنها بۆ عەرەب نەدەبینی بەڵكو بۆ ئایین بەگشتی. موسوڵمامان پەیكەر و وێنە زۆرەكان لە هیندۆسیەتدا وەك بەڵگەیەك دەبینن كە هەرگیز هینۆسیەكان نەگەیشتون بە پەرستنی ألله تاكوتەنها. یەهودیەت لەسەر حەق بوو كاتێك زانی بەشێوەیەكی دروست شیما (وشەیەكی عیبریە)ی تایبەت بە ئەوانە: ((گوێبگرە ئەی ئیسرائیل!خودای تاكو تەنها خودامانە!)) بەڵام ئەم ڕێنماییانە سنورداربوو لە نەتەوەی ئیسرائیلدا. مەسیحیەكان بەشداربوون لە بە خودا زانینی مەسیح. ئیسلام ڕێز لە مەسیح دەگرێت وەك پێغەمبەرێك، ڕازیە بە لەدایكبوونی بەبێ باوك، ڕۆحی ئادەم و مەسیح بەو دوو ڕۆحە دادەنێت كە ألله بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ دروستی كردون(١٩): ((إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿آل عمران: ٥٩﴾))، بەڵام قورئان ڕەخنەدەگرێت لە هەردوو بیروباوەڕی بەرجەستەبوون و سیانەی پیرۆز چونكە دایان دەنێت بە دوو شتی داهێنراو كە جیاوازی نێوان ألله و مرۆڤ دەشێوێنێت. قورئان بەم شێوەیە وەڵامیان دەداتەوە: ((وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَداً *لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئاً إِدّاً *تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدّاً *أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَداً *وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَداً *إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً ﴿مريم: ٨٨-٩٣﴾)). هەروەها موسوڵمانان تامەزرۆی ئەوە نین بزانن شێوەی ألله چۆنە و وەك باوك سیەری بكەن و خۆیان وەك منداڵی ألله چونكە بەم كارەیان ألله دەخەنە پلەوپایەی مرۆڤەوە واتە لە پلەو پایەی كەمدەكەنەوە پەنا دەگرم بە ألله.

ئەگەر بچینە سەر باسکردنی قورئان بۆ سروشتی أللە، ئەو شتەی سەرسامیمان دەکات بریتیەلە مەزنی و توانای لەڕادەبەدەری أللە. لە ئایەتی ١٤٣ سورەتی الأعرافدا چیرۆکی داواکردنی موسا دەگێڕێتەوە کاتێك داوا دەکات أللە ببینێت، کاتێك أللە خۆی پیشانی شاخەکەی تەنیشتی دا، شاخەکە داڕما، موسا لەهۆش خۆی چوو(٢٠) ((لَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَـكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكّاً وَخَرَّ موسَى صَعِقاً فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ ﴿الأعراف: ١٤٣﴾)).

توانا و هێزێك بەم ڕادەیە واله مرۆڤ دەکات ترس دایبگرێت، دواتر زۆر ڕاستە کە دەوترێت موسوڵمانان لە أللە دەترسن. بەڵام ترسەکەیان بەجۆرێك نیە کە بەرامبەر زاڵم و چەوسێنەرەوە بێت بەڵکو بە پێچەوانەوە موسوڵمانان دەڵێن ئەم ترسە هەستکردنە بە سۆز و بەزەیی أللە کاتێك مرۆڤ بەرەوڕووی مەزنی أللە دەبێتەوە هێندەی تاوانەکانی مرۆڤ خودا لێخۆشبوونی هەیە بۆی بەڵام بە مەرجێك هاوەڵی بۆ دانەنابێت و بە تەنها ئەوی پەرستبێت، چاکە و خراپە گرنگیەکی زۆریان هەیە. وە هەڵبژاردنی هەریەکەیان دەرئەنجامی یەکلاکەرەوەی لەدوایە، بیروباوەڕ لە قورئاندا پلەوپایەیەکی یەکلاکەرەوەی هەیە وەك کەسێك بەسەر شاخێکدا سەربکەوێت هەموو هەڵەیەك سەرئەنجام کارەساتی دڵتەزێنی لەدوا دەبێت. لێرەدا بەکارێنانی توندی قورئان بۆ وێنەی بەهەشت و خۆشیەکانی و دۆزەخ و ناخۆشیەکانی، بەڵام دوای ئەوەی ڕازی بوو بە ترسانی لە أللە ئەو کات تێدەگات ژیان پڕە لە مەترسی پێویستە پابەند بێت بە ئایینی ئیسلامەوە هەتا سەرئەنجام سەرفراز بێت. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت وشەی ئیسلام لە چاوگی وشەی سلامەوە هاتوە کە بە مانای ئاشتی دێت.

پێویستە گرنگی بدەین بەم خاڵەی کۆتایی چونکە ئەو ترسەی أللە خستویەتیە دڵی مرۆڤەوە ڕێنمونی توێژەرەوەکانی قورئانی کرد لە ڕۆژئاوا بگەن بەو سەرئەنجامەی کەم ترسانە لە توڕەیی أللە بەسەر بەزەییەکەیدا زاڵە، موسوڵمانان بەجۆرێك سەیری أللە دەکەن کە دادوەرێکی توڕەیە و بێ بەزەییە. گومانی تێدانیە ئەمە خوێندنەوەیەکی زۆر هەڵەیە: چونکە بەزەیی و ڕەحمی أللە ١٩٢ جار لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە لەبەرامبەردا تەنها ١٧ جار باسی خەشم و قین و توڕەیی الله کراوە لە قورئاندا. لە قورئاندا باسی سیفاتەکانی أللە کراوە کە خودای جیهانیانە هەروەها ئەم سیفاتانەی باس دەکات:

پیرۆز و پاك لە هەموو عەیب و ناتەواویەك لە سیفەتەکانیدا، بێ عەیبی دڵنیاکەر، دڵنیاکەری دۆستەکانی کە لە سزا دورن، دەسەڵاتدار و پارێزەری شتەکان، پەنادەری پێ پەنا و بێ سەرپەرشتان، ڕێنیشاندەری گومڕاکان، ڕزگارکەر لە هەموو دەردو بەڵایەك، هاوەڵی بێ نەوایان، دڵخۆشکەری لێقەوماوان[٧١]، چاکە و خێر بەدەستی ئەوە، بەخشندە و لێخۆشبووە، بەبەزەییە بەرامبەر بە بەندەکانی، بیستەر، نزیکە لە ئیمانداران کاتێك پەنای بۆ دەبەن، لێخۆشبووی گوناهکارانە، داپۆشەری عەیب و کەموکوڕی بەندەکانیەتی، بەبەزەییە زیاترە لەبەزەیی هەموو بوونەوەران(٢١). بەهۆی بەزەیی أللە جیهانی قورئان دواجار جیهانی شادی و کامەرانیە. چونکە لەوێدا هەوا و خۆر و متمانە و پشتپێبەستن هەیە.

((وَالضُّحَى * وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى * مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى * وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَى * وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى * أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى * وَوَجَدَكَ ضَالّاً فَهَدَى * وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى ﴿الضحى: ١-٨﴾)).

---

[٧١] هەندێك لەم سیفاتانە کە نوسەر باسی کردون لە قورئاندا نین بەڵکو لە فەرمودە پیرۆزەکانەوە وەریگرتون. ئەوەی دەکرێت لێرەدا باس بکرێت لە سیفاتی جوانی و بەزەیی یەزدانی کەلە قورئاندا باسکراون تایبەتمەندیەکانی: الودود، الرؤوف، العفو، الغفور، الشکور، الولي. .

کاتێك موسوڵمان هەست بەوە دەکات دەژی لە کەشوهەوایەکی پڕ لە بەزەیی و ڕەحمی یەزدانی لە هەموو ساتێکدا دەتوانێت ڕاستەوخۆ بە دڵ و ڕۆحی ڕووبکاتە ئەو زاتە پیرۆزە و داوای لێبکات بۆئەوەی هێز و هیدایەتی پێببەخشێت بۆئەوەی بەردەوام بێت لە ژیانە ئاڵۆزەکەی. دەرگای ألله هەمیشە کراوەیە، چونکە مرۆڤ و ألله دوو شتی تەواو جیاوازن لە یەکتر، بەڵام هیچ بەربەستێك نیە کە لێکیان جیابکاتەوە:

((وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿الأنعام: ٥٩﴾))

((وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴿ق: ١٦﴾))

((وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى ﴿طه: ٧﴾))

((هَاأَنتُمْ أُوْلاء تُحِبُّونَهُمْ وَلاَ يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿آل عمران: ١١٩﴾)).

ئێستا دەتوانین لە چەمکی ألله بچینە سەر چەمکی لاهوتی ئایینزانی دووەم لە قورئاندا ئەویش جیهانی دروستکراوەکان. قورئان چەندین باسکردنی ناوازەی تیایە لەبارەی جیهانی دروستکراوەکانەوە. ئەگەر جیهان هەڵقوڵاو بێت لە ألله وەك لە دەقەکانی هیندۆسیەتدا نوسراوە، ئەوا گەردون بەپێی زانیاریەکانی ناو قورئان ألله دروستی کردوە بە ویستی خۆی:

((الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِم يَعْدِلُونَ ﴿الأنعام: ١﴾)). ئەمە ڕاستیەکە هەڵگری دوو دەرئەنجامی گرنگە. یەکەمیان جیهانی ماددی جیهانێکی ڕاستەقینەیە و گرنگە لە هەمان کاتدا. لێرەدا یەکێك لە سەرچاوەکانی زاستی ئیسلامی حەشاردراوە کە پەرەیسەند لە چاخە تاریکەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا بەشێوەیەك ڕووی نەداوە لە هیچ جێگایەکی تری جیهاندا، دەرئەنجامی دووەم بریتیەلەوەی کاتێك گەردون ألله دروستکراوی دەستی ألله کە کامڵە لە چاکە و خێر و زانست و تواناد‌ا، ئەوا جیهانی ماددی بەهەمان شێوە جیهانێکی پڕ لە خێر و چاکەیە. ((الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِن فُطُورٍ * ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِأً وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿الملك: ٣-٤﴾)). لێرەدا متمانەبوون بە دیاردە ماددیەکانی ژیان و بوون دەبینین بەجۆرێك خاڵی هاوبەش هەیە لەنێوان ئایینی ئیسلام و یەهودییەت و مەسیحیەتدا.

دەرونی مرۆیی یەکەمین شتە ألله دروستی کردوە، سروشتی ئەم مرۆڤەی دروستکرد وەك قورئان پێناسەی دەکات، بابەتی سێیەم لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا. لە سورەتی النحلدا ئەمە ڕوونکراوەتەوە ((خَلَقَ الإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿النحل: ٤﴾)). یەکەم شت تێبینی دەکەین لەم دروستکردنەدا پێکهێنانی دروست و سەلامەتە. دەکرا ئەم بیرۆکەیە بەدەست بهێنین بەبیرکردنەوە لە دروستکەری دانا و زانای مرۆڤ، وێڕای ئەوە قورئان ئەم بیرۆکەیەی دوپات کردوەتەوە و ڕوونی کردونەتەوە بە چەند دەستەواژەیەکی دیار کاتێك دەڵێت: ((لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿التين: ٤﴾)). ئەو وشەیەی قورئان بەکاری دەهێنێت بۆ خستنەڕووی سروشتی مرۆڤ لە حاڵەتە ڕاستەقینەکەیدا کە ألله هێنایە بوون بریتیەلە الفطرة، ئەم سورشتە تێکنەچوە بەو کارەساتانەی ڕوویانداوە. نزیکترین چەمکی ئیسلامی لە بیروباوەڕی مەسیحیەوە سەبارەت بە تاوان بریتیە لە بێئاگایی و بیرچوونەوە. مرۆڤەکان بێ ئاگا دەبن و بیریاندەچێتەوە کە سروشتیان لەسەر خێر و چاکەیە لە بنەڕەتدا، لەبرئەوە بانگ دەکرێن بۆ ڕێزگرتن لە خود و پاراستنی.

دوای ئەوەی بڕیاردرا کە ژیان بەخشینێکی یەزدانیە، دەتوانین هەنگاو بنێین بەرەو ئەرکەکان کە ئەم بەخشینە لەسەری داناوین، ئەوان دوو ئەرکن. ئەرکی یەکەم: سوپاسگوزاری لەسەر بەخشینی ژیان کە ألله پێی بەخشیوین. وشەی کافر واتە بێ باوەڕ لە زمانی عەرەبیدا بە مرۆڤێك دەوترێت سوپاسگوزار نیە بەرامبەر بە بەخشینەکانی الله پێی زیار لەوەی کە نکوڵی بکات لە بیروباوەڕێکی دیاریکراو. هەتا مرۆڤ هەست بکات بە سوپاسگوزاری ئەوا بەشێوەیەکی سروشتی پێویستە لەسەری لێگەڕێ ئەم چاکەیەی هەڵقوڵاوە بەرەو لای بڕژێتە ناو ژیانی ئەوانی ترەوە، چونکە پاراستنی ئەم بەخشینە شتێکی ناسروشتیە وەك کەسێك بیەوێت بوەستێت بەرامبەر بە شەپۆلە بەهێزەکان. قورئان پێمان ڕادەگەیەنێت بێباوەڕان بەرەکەت و بەخشین و بەزەیی ألله دادەپۆشن بەم کارەیان ناتوانن چێژوەرگرن لە پەیوەندیاندا لەگەڵ ئەو دروستکەرەوەی هەموو ساتێك پێیان دەبەخشێت.

دووەم ئەرك کە مرۆڤ هەستی پێدەکات بەرەوڕووی دروستکەری دەمانگێڕێتەوە بۆ ناوی ئایین. لە سەرەتای ئەم بەشەدا باسمان کرد کە ئیسلام واتە خۆبەدەستەوەدان ئێستا بەشێوەیەکی قووڵتر باس لەم تایبەتمەندیە دەکەین.

بیرۆکەی خۆبەدەستەوەدان بارگاوی کراوە بە مانای سەربازی بەڕادەیەك داوامان لێدەکات هەوڵ بدەین بۆ تێبینی کردنی ئەوەی لێرەدا خۆبەدەستەوەدان لە جۆرێکی جیاوازە مرۆڤ تیایدا بەشێوەیەکی خۆڕسك لە قووڵایی دڵیەوە دەیبەخشێت بۆ هاوڕێیەتی یان خۆشەویستیەکی مەزن. ولیەم جەیمس بۆمان ڕوون دەکاتەوە خۆبەدەستەوەدان چەندە گرنگە لە هەموو ئایینێکدا:

((کاتێك هەموو شتێك دەوترێت و هەموو شتێك ئەنجام دەدرێت، دواجار خۆمان دەبینینەوە کە شوێنکەوتوی ڕەهای گەردونین، وەستاوین لەسەر قوربانیەکان و جۆرێك لە خۆبەدەستەوەدان کە بەدوایدا دەگەڕێین بە مەبەست و خواست و پێی ڕازی دەبین بۆئەوەی پەلکێشمان بکات هەروەك ڕێگاکەمان بڕین بەروە جێگاکانی پشودان هەمیشەییمان. لەو حاڵەتە ئەقڵیانەدا ئەقڵ شکست دێنێت لە گەیشتنی بە ئایین، خۆبەدەستەوەدان پێشکەش دەکرێت وەك ڕاگەیاندنی ئەو پێویستیەی بەسەرماندا سەپێنراوە، قوربانیدان ئەنجام دەدرێت لەباشترین حاڵەتەکاندا بەبێ سکاڵا بەپێچەوانەی ئەمەوە یەکگرتن ڕوودەدات لە ژیانی ئایینیدا بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە لەنێوان خۆبەدەستەوەدان و قوربانیداندا بەجۆرێك دەستبەرداری هەندێك شتی پێویست دەبین کەلەوانەیە شادومانیمان زیاتر بکات. دواتر ئایین دڵخۆش و شادومانمان دەکات لەوە گرنگتر چیە؟))(٢٢).

لە تایبەتمەندیەکانی تری خۆبەدەستەوەدان بۆ ألله وتاری ئیسلامی بەمجۆرە باسی دەکات بەندایەتی بۆ ألله مرۆڤەکان ئازاد دەکات لە هەموو جۆرەکانی تر بەندایەتی کە دێنەسەر ڕێی مرۆڤ وەك بەندایەتی چاوچنۆکی و بەندایەتی دڵەڕاوکێ یان بەندایەتی ئارەزوەکان و پلەوپایە. هەروەها ئەوەی لێرەدا یارمەتیدەرە کە ئاڵوگۆڕ بکەین لەنێوان وشەی خۆبەدەستەوەدان و پابەندبوون، چونکە پابەندبوون جگەلەوەی وشەیەکی سەربەخۆیە یان مانای سەربازی خۆبەدەستەوەدان وانیشان دەدات جووڵە کردنە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە بەرەو پێشەوە زیاتر لەوەی وازهێنان بێت لە شتێك. لەم گۆشەنیگایەوە ئایینی ئیسلام دەردەکەوێت وەك ئایینێك کە هەوڵ دەدات بۆ پابەندبوونی تەواوی مرۆڤ، پابەندبوون هیچ شتێکی تیادا کۆت و زنجیر ناکرێت لە ألله واتە مرۆڤ پابەندەبێت بە هەموو بنەماکانی بوونی و ژیانی و سۆزداری و ماڵ و سەروەت و سامانی. . . هتد بۆ ألله وەبۆئەوەی ألله پێی خۆشە، ئەمە بۆمان ڕوون دەکاتەوە بۆچی کەسایەتی ئیبراهیم گرنگترین کەسایەتیە لە قورئاندا، چونکە ئەو سەرکەوتو بوو لە مەزنترین تاقیکردنەوەدا، لە خۆ ئامادەکردن بۆ قوربانی دان بە تاکە

کوڕەکەی کاتێك ألله داوای لێکرد ئەو کارە ئەنجام بدات، (ئەم ئامادەکاریەی جێبەجێ کرد بە پابەندبوون و خۆبەدەستەوەدانی ڕەها بۆ الله).
دوو تایبەتمەندی کۆتایی هەن بۆ دەرونی مرۆڤایەتی یارمەتیمان دەدەن لێرەدا بۆ چوونەسەر بیروباوەڕی لاهوتی کۆتایی ئەویش باوەڕهێنانە بە ڕۆژی دوایی، چونکە لەو ڕۆژەدا ئەو دوو تایبەتمەندیە دەجولێن و ڕزگاربوونی کۆتایی بەدەست دەهێنن. ئەو دو تایبەتمەندیە تاکی ڕۆح و ئازادیەکەیەتی.
بادەست پێ بکەین بە یەکەم تایبەتمەندیان:
گەیشتین بە بەشی ئیسلام لەم کتێبەدا دوای ئەوەی بنەمای خۆنەویستیno self مان زانی لە بوزییەتدا، بنەمای دەرونی کۆمەڵایەتی لەن کونفوشیەتدا، لەبەرئەوە توشی شۆك دەبین کاتێك هەست بەوە دەکەین ئەم جەختکردنەوەی قورئان دایناوە لەسەر تاکبوونی دەروون: کەسایەتیەکەی سەربەخۆیە و بەرپرسیاریەتەکەی سنوردارە. لەهیند ڕۆحی گەردونی نزیك دەبێتەوە لە هەموو شتێك لە قووتدانی خود و دەرونی تاك، لە چین دەرون بووەتە ژینگەیی هەتا ڕادەیەك ئەستەمە بتوانین دیاری بکەین لە کوێوە دەست پێدەکات و لە کوێدا کۆتایی دێت. بەڵام ئیسلام و هاوپەیمانەکانی (یەهودییەت و مەسیحیەت) ڕەنگدانەوەی ئەم هەڵقوڵانە نیشان دەدەن، بەجۆرێك سەیری تایبەتمەندی تاك دەکات تەنها وەك ڕاستیەك نا بەڵکو وەك تاکە چاکە لەڕووی بنەماوە. بەها و کامڵی گەورەیی ڕۆحی ڕوودەدات لەڕێگەی بەدیهێنانی هێز شاراوەی دەرونەوە کە موڵکی تایبەتی هەموو مرۆڤێکە، بە چەند ڕێگایەك کە پەیوەندیەکی تایبەتیان نیە بە دەروونەوە. ئەو تایبەتمەندی و توانایانە دەگۆڕێت لەوەی کە هەر دەرونێکی تر خاوەنیەتی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ژیاوە یان لە داهاتودا دەژی. هەروەك یەکێك لە فەیلەسوفە موسوڵمانە مەزنەکان ئەمەی ڕوون کردوەتەوە وتویەتی: ((ناوەندی ئەم ئەزمونە سنوردارە شایەنی شیکردنەوە نیە ئەمە ڕاستیەکی سەرەکی گەردونە. هەموو ژیانی تاك، شتێك نیە بە ناوی ژیانی جیهانی گشتگیرەوە، ألله تاکو تەنهایە، بەڵکو لە هەموو تاکەکان دەسەڵاتدارترە))(٢٣).
تاکی ڕۆحی مرۆیی تاکیەکی هەمیشەییە، چونکە هەر لەکاتی دروستبوونیەوە هەرگیز نامرێت، لەبەرئەوە هەست ناکرێت بە دەرکەوتنی وەك هەستی پێ دەکرێت لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا. حەسەنی بەصری دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم بەتەنها دەمریت دەچیتە ناو گۆڕەوە بەتەنها زیندوو دەکرێیتەوە بە تەنها وە لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت کە بە تەنها هەر خۆتی و کەسی ترت لەگەڵدانیە.
ئەمە دانپیانانێکە، ئەوی پابەند دەبێت پێوەی لە بەرپرسیاریەتی و کەسایەتی دەروونی تاکدا، ڕاستەوخۆ دەیبات بەرەو کێشەی سەربەخۆیی دەرون، دەبێت ڕازی بین بەوەی سەربەخۆیی و ئازایی مرۆیی لە ئیسلامدا، دەوەستێت لەبەردەم جۆرێك لە شڵەژان لەگەڵ توانای گشتی ألله کە پابەندی دەکات بەو قەدەرەی بۆی دانراوە. زانستی لاهوتی ئیسلامی ململانێیەکی زۆری کردوە لەگەڵ ئەم شڵەژانەدا بەبێ ئەوەی بتوانێت چارەسەری بکات لەڕووی ئەقڵیەوە. دواجار بڕیاری دا لەسەر ئەوەی قەدەری یەزدانی وەك نهێنیەك دەمێنێتەوە سەبارەت بە خەڵکی، ئەوانەی ئازادیەکی تاڕادەیەك پێویستیان پێدراوە لەگەڵ بەرپرسیاریەتێکی پێویستدا بۆ بڕیاردان لەسەر بابەتە ئەخلاقی و ڕۆحیەکان. ((وَمَن يَكْسِبْ إِثْماً فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ وَكَانَ اللّهُ عَلِيماً حَكِيماً ﴿النساء: ١١١﴾))، ((مَّنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً ﴿الإسراء: ١٥﴾))(واتە ئەو تەنها خۆی بەرپرسیاریەتی ئەو گومڕاییە هەڵدەگرێت).
بەڵام سەبارەت بە بابەتی لێپرسینەوەی لەگەڵ خودی خۆیدا، ئەوا مسوڵمانان وادادەنێن خەیاڵە وابیربکەینەوە دەتوانین دەرباز ببین بەبێ ئەوەی کەس هەستمان پێبکات هەتا بژین بەشێوەیەکی شیاو کە دوور بێت لە

ئازاردانی خەڵك. ئەوەی بیروباوەڕی ڕۆژی لێپرسینەوە جیادەکاتەوە بەو ڕووداوانەی ڕوودەدات لە پێشیەوە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە: ((إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ * وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ * وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ * وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ * وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ * وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ *. . . * وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ *. . . * وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ * وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ * عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ ﴿التكوير: ١-١٤﴾)). لەسەر ئەم بنەمایە قورئان ژیانمان بۆ وێنا دەکات وەك هەلێکی زێڕین کە تاکە هەلێك دەخاتە بەردەممان بۆ هەڵبژاردن بۆ هەمیشە. هەلی گەڕانەوە بۆ ژیان تەنانەت بۆ یەك ڕۆژ بۆ ئەوەی مرۆڤ سەر لەنوێ دەست بکاتەوە بە ئەنجامدانی کاری چاکە و ئەو هەلانە قەرەبوو بکاتەوە کە بەفیڕۆی داون، ئەمە شتێکە کە لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا سەرکەوتوو نەبوون تەمەننا دەکەن بۆ تاکە ڕۆژێك بێت بگەڕێنەوە بۆ ژیانی جارانیان هەتا کاری چاکە ئەنجام بدەن بەڵام هەرگیز ئەو هەلەیان پێنادرێت[72].

بەپێی دەرئەنجامی ئەو لێپرسینەوەیە ڕۆحی مرۆیی چارەنوسەکەی بەهەشت یان دۆزەخە، ئەم دوانە باسکراون لە قورئاندا لە وێناکردنێکی ورد و هەستپێکراو. لە بەهەشتدا ئێمە لەبەردەم کانیاو و پەری و باخچەی ڕازاوەداین کە ڕوبارەکان بەژێریاندا تێپەڕ دەبن، فەرش و سەرین و دەفری ئاڵتونی و خۆشترین بەتامترین خواردن و خواردنەوە و میوە و گۆشت. بەڵام لە دۆزەخ هەموو شتێك ئاگراویە، ئاگرێك بەردەکان هەڵدەوەشێنێت. ئەو وتەی دەڵێت ئەم شتانە تەنها کۆمەڵە هێمایەکن بۆ جیهانی دوایی ئەمە بەو مانایە نایەت دورکەوتنەوەی تەواو، بەڵام بابەتی ئەم کتێبە خستنەڕووی جیهانی دواییە بە وێنەیەکی زیندوو و کاریگەر: ((وَلِتَصْغَى إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُواْ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿الأنعام: ١١٣﴾)). ئەو جیاوازیە زەقەی کە هەیە لەنێوان دۆزەخ و بەهەشتدا لە قورئاندا ئامانج لێی بە ئاگاهێنانەوەی گوێگرە کە لە بێئاگایی ڕۆحی و بیرچونەوەدایە. ئەم کەرەستەیە کاردەکات لە ماوەکانی ئاگایی ڕۆحیدا. لە سەردەمە نوێکاندا لەوانەیە کاریگەری کەمتر بێت لەلای ئەو موسوڵمانانەی زیاتر گرنگی بە شتە دونیاییەکان دەدەن.

موسوڵمانە لیبراڵیەکان بەرگری دەکەن لە شیکردنەوەکانی قورئان سەبارەت بە وێناکردنی بەهەشت و دۆزەخ بەڵگە دەهێننەوە بە خودی قورئان: ((هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الألْبَابِ ﴿آل عمران: ٧﴾)).

ئەگەر ناکۆکی موسوڵمانانمان وەلانا لە شیکردنەوەی ئایەتەکانی بەهەشت و دۆزەخ ئەو بیرکردنەوەی هەموو موسوڵمانان کۆدەکاتەوەسەبارەت بە ژیانی دواییان بریتیەلەوەی هەموو کەسێك لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر کار و کردەوەکانی کە ئەنجامی داون لەسەر زەوی کە ژیانی دوایی دیاری دەکات بەپێی پابەندبوونی بەوەی اللە فەرمانی پێکردوە. ((وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنشُوراً *اقْرَأْ كَتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيباً ﴿الإسراء: ١٣-١٤﴾)).

دوا خاڵ کە پێویستە لێرەدا باسبکرێت: ئەگەر ئەم هەموو باسە لەبارەی ڕۆژی لێپرسینەوە وەك ئەوە بێت اللە ڕۆڵی تۆڵەکەرەوەیەك ببینێت بە تەنها ئەوا دەتوانین پەنا ببەینە بەر ئایەتەکانی قورئان لەم بڕیاردانەدا. لێرەدا

---

[72] ئەم مانایە دوبارە بووەتەوە لە زیاتر لە جێیەکی قورئانی پیرۆزدا: ((لِلَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ الْحُسْنَى وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً وَمِثْلَهُ مَعَهُ لاَفْتَدَوْاْ بِهِ أُوْلَـئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿الرعد: ١٨﴾)). ((إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُواْ بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿المائدة: ٣٦﴾)). ((وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿الأنعام: ٢٧﴾)). ((حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ *لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحاً فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿المؤمنون: ٩٩-١٠٠﴾.

هەموو مرۆڤێك خودی خۆی بڕیاری سزادانی خۆی دەدات.  ئەوەی بە مردن نامێنێت ئەو بەرگریکردنە خۆپەرستانەیە کە خزمەت بە خود دەکات کە دوای مردن مرۆڤ ناچاردەکات بە شێوەیەکی بابەتیانە ببینێت چۆن ژیانی بەسەر بردوە لە دونیادا.  لەسەر ڕۆشنایی ئەم بینینە بەجۆرێك ڕێگەنادرێت بەهیچ جۆرە تاریکی و گۆشەیەکی شاراوە، ئەوا کارەکانی خودی مرۆڤ هەڵدەسێتەوە هەتا تاوانباری بکات و ئەو کردەوانەی بەسەردا ساغ ببێتەوە.  کاتێك خود هەڵدەکەنرێت لە جیهانی درۆکان ئەوا هەموویان دەبنە هەڵم و نامێنن، ئەو ژیانەی مرۆڤ ژیاوە تێیدا هەمان ئەو ئاگرەن کە مرۆڤەکە دەخوات.

ألله، جیهانی دروستکراو، دەرون و خودی مرۆیی، ڕۆژی لێپرسینەوە:  ئەمانە خاڵە سەرەکیەکانی بیروباوەڕی ئایینی ئیسلام بوون کەلە قورئاندا بە چڕی و تەواوی وردەکاریەکانیەوە باسکراون.  بەڵام وێڕای گرنگیان قورئان دواجار کتێبێکە جەختدەکاتەوە لەسەر کردار زیاتر لە جەختکردنەوەی لەسەر بیرۆکەکان.  لەبەرئەوە ئەم دوو بابەتەی دوایی تەرخان دەکەین بۆ قسەکردن لەسەر کردار لە ئاییینی ئیسلامدا.

## پێنج بنچینەکە

ئەگەر پرسیارکرا لە موسوڵمان بە کورتی ئەو ڕێگایە باس بکات ئیسلام بۆ خەڵکی داناوە هەتا پێی بژین، لەوانەیە وەڵامەکەی بەمشێوەیە بێت: ئاینی ئیسلام فەرمانمان پێ دەکات و فێرمان دەکات کە بڕۆین بەسەر ڕێگەی ڕاستدا الصراط المستقیم ئەم ڕستەیە هاتوە لە سورەتی فاتحەدا:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين

الرحمن الرحيم

مالك يوم الدين

إياك نعبد وإياك نستعين

اهدنا الصراط المستقيم

صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين.

ئەم سورەتە ناونراوە بە ترپەی دڵی وەڵامدانەوەی موسوڵمان بۆ ألله. بەڵام پرسیارێك کتوپڕ دێتە ئاراوە: بۆچی الصراط المستقیم یەکێك لە ماناکانی ئەم ڕستەیە واتە ڕێگای ڕێك و دوور لە پیسی و گەندەڵی. بەڵام دەستەواژەکە هەڵگری مانایەکی ترە، واتایەکە شتێکی بێ وێنە دەدوێنێت لە ئیسلامدا.

ڕێگای ڕاست و ڕەوان ڕێگایەکی ڕاستەوخۆیە، سادە و ڕوونە بە بەراورد لەگەڵ هەموو ئاینەکانی تر ئاینی ئیسلام زۆر بەڕوونی ڕێگەی ژیان باس دەکات کە پێشنیازی دەکات بۆ مرۆڤ، زۆر بەوردی دیاری دەکات لەڕێگەی چەند فەرمانێکی ڕوونەوە. هەموو کارێکی سەرەکی پۆلێن دەکرێت بەپێی پێوەرێکی پلەبەندکراو لە قەدەغەکراو دەستپێدەکات دواتر بێزراو دواتر ڕێگەپێدراو دواتر خۆشویستراو دواتر پابەندکراو یان ئەرك.

ئەمە تامو چێژێك دەبەشێتە ئاین و لەوانی تر جیای دەکاتەوە.

موسوڵمانان زۆر بە باشی دەزانن لەوێدا دەوەستن. دەڵێن ئەمە یەکێکە لە خاڵەکانی هێزی ئاینەکەیان. ئەوان دەڵێن وەحیی ألله بۆ مرۆڤایەتی پەرپێدانێك پێشکەش دەکات لەڕێگەی چوار ئاستی سەرەکیەوە:

یەکەم: ألله ڕاستی یەکتاپەرستی و تاکو تەنهایی ألله دەخاتەڕوو لەڕێگەی ئیبراهیم پێغەمبەرەوە علیە صلاة و السلام. دووەم: ألله دە ڕاسپاردەکەی خستوەتە ڕوو لەڕێگەی موسا پێغەمبەرەوە علیە صلاة و السلام.

سێیەم: ألله یاسای ئاڵتونی خستوەتە ڕوو لە لایەن عیسا پێغەمبەرەوە علیە صلاة و السلام کە دەڵێت پێویستە بە جۆرێك مامەڵە بکەین لەگەڵ خەڵکیدا بەو جۆرەی پێمان خۆشە مامەڵەمان لەگەڵدا بکرێت. هەریەك لەو سێ پێغەمبەرە ڕاستگۆ و دڵسۆز بوون، هەریەکەیان دیارترین تایبەتمەندیەکانی ژیانیان خستوەتە ڕوو کە لەلایەن ألله پێیان سپێردراوە. بەڵام لێرەدا پرسیارێك دەمێنێتەوە: چۆن پێویستە لەسەرمان دراوسێکەمان خۆشبوێت هەروەك خۆمان خۆشدەوێت؟ کاتێك ژیان ئاڵۆز دەبێت پێویستی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەرکەوت، لێرەدا قورئان هات بەم وەڵامدانەوە ڕوونەوە. ((سەرکەوتنی ئیسلام و مەزنیەکەی دەستپێدەکەن لەو شوێنەی هەموو هەستەکانی تیادا بەرجەستەکراوە لەگەڵ ڕێنماییەکانی یەسوعی مەسیح بە چەند یاسایەکی ئاشکرا و دیاریکراو))(٢٥).

کەواتە ناوەڕۆکی ئەو ڕێگە ڕاستە چیە کە ئەرك و فەرمانەکانی مرۆڤ ڕوون دەکاتەوە؟ لێرەدا ئەم بابەتە دابەش دەکەین بۆ دوو بەش. لێرەدا باسی پێنج بنچینەکەی ئاینی ئیسلام دەکەین واتە بنەماکانی ڕێکخستنی ژیانی تایبەتی موسوڵمانان لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنیان لەگەڵ ألله. لەکاتێکدا بەشی دووەم تەرخان دەکەین بۆ ڕێنماییە کۆمەڵایەتیەکانی قورئان.

یەکەم بنچینەی بیروباوەڕی ئیسلام یان دانپیانانی ئیمان کە ناونراوە بە شایەتمان. هەموو ئایینێك دەقێکی ئیمانی هەیە بۆ ئاڕاستەکردنی ژیانی شوێنکەوتوانی. ئیسلام لێرەدا کاتی زۆر بەفیڕۆ نادات لە وشەی زۆردا. دانپیانانی ئیمانی سادەیە و ئاشکراو دیاریکراوە. کۆکراوەتەوە لە یەك ڕستەدا: أشهد ان لا اله الا ألله و أشهد أن محمد رسول ألله. بەشی یەکەمی ئەم دانپیانانە بنەمای سەرەکی یەکتاپەرستیە. لا اله الا ألله واتە هیچ خودایەك نیە شایستەی پەرستن بێتجگەلە خودای ڕاستەقینەی تاکو تەنها: ألله. چونکە ئەمە وشەیەکە بڵاو نیە لەناو خەڵکدا کە تایبەت بێت بە بونەوەرێکی دیاریکراو. بەڵام جەختکردنەوە و دانپیانانی دووەم واتە بەشی دووەمی شایەتمان محمد رسول ألله ئیمانداری موسوڵمان تۆمار دەکات بە ڕاستگۆیانە ڕەسەنی پەیامی محمد صلی ألله علیه وسلم حەق و ڕاستگۆیانەیە کەلە قورئاندا بۆمان گوێزراوەتەوە.
پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك چ پیاو بێت یان ژن کە ئەم شایەتمانە بڵێت بەشێوەیەکی دروست و هێواش لە کانگای دڵیەوە و بە دەنگێکی بەرز لەگەڵ دەرکپێکردنێکی تەواو بە ماناکەی و باوەڕبوونی تەواو بە ڕاستیەکەی. لەڕاستیدا موسوڵمانان ئەم شایەتمانە دەهێنن بە زۆری بە تایبەت نیوەی یەکەمی لا اله الا ألله. لەکاتی هەموو تەنگانەیەکدا وە لە هەموو ساتێکدا کە مرۆڤ هەست بە هەڕەشە و مەترسی بکات مرۆڤ ئەم دەستەواژەیە دەڵێت لا اله الا ألله بە هەردو لێوی. کاتێك توڕەیی باڵی کێشا بەسەر کەسێکی لەخواترسدا، ئەوا لەپڕ دەردەکەوێتوەك لە توڕەبوونەکەی وەستابێت کاتێك ئەم شایەتمانە دەڵێت، بەمجۆرە توڕەبوونەکەی دادەمرکێتەوە و سنورێك دادەنێت لەبەردەم توڕەبونەکەیدا. ئافرەت کاتی لەدایك بوون کاتێك هاوار دەکات لە پڕ بێدەنگ دەبێت کاتێك ئەو وتە جوانەی بیردەکەوێتەوە، ئەو خوێندکارەی دەچەمێتەوە بەسەر مێزی تاقیکردنەوەدا کاتی تاقیکردنەوەدا سەری بەرز دەکاتەوە و ئەو وشانە دەڵێت بەمشێوەیە هەستێکی ئارامبەخش دایدەگرێت و لە دڵەڕاوکێ ڕزگاری دەبێت، ئەو شایەتمانە دوا وەڵامی هەموو پرسیارەکانە(٢٦).
بنچینەی دووەم لە ئایینی ئیسلامدا بریتیە لە نوێژخوێندن کە ئەرکێکی سەرەکیە، قورئان باوەڕداران بانگ دەکات بۆئەوەی نوێژەکانیان ئەنجام بدەن و بیانپارێزن بە بەردەوامی ((اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿العنكبوت: ٤٥﴾))، ((فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَاذْكُرُواْ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِكُمْ فَإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَّوْقُوتاً ﴿النساء: ١٠٣﴾)).
ألله هانی موسوڵمانان دەدات لەسەر پاراستنی نوێژەکانیان و جێگیر بوون لەسەریان ((الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ ﴿المعارج: ٢٣﴾))، ((وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿المعارج: ٣٤﴾))، لەبەرئەوەی هەمیشە ژیانیان لەسەر ڕوانگە دروستەکە بهێڵنەوە کە بەندایەتیە بۆ ألله. قورئان دادەنرێت بە وانەیەك کە قورسە و پێویستە لەسەر خەڵك فێری بن، وێڕای ئەوەی ئاشکرایە لەلای خەڵك ئەوان دروستکراون لەلایەن ألله، خۆیان دروست نەکردوە هەروەها جیهانیان دروست نەکردوە، وا دەرناکەون ئامادە بن خۆیان بخەنە جێگەی شتەکان، بژین هەروەك ئەوەی خۆیان فەرمانڕەوایی خودی خۆیان بکەن. ئەمە ئاژاوە و وێرانکاری بەرهەم دەهێنێت.
کاتێك دەپرسین بۆچی موسوڵمانان نوێژ دەکەن؟ وەڵامەکە بریتیەلەوەی ئەوان بەو کارە هەڵدەسن وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ پاڵنەری سروشتی ژیان لەوەی مرۆڤ هەستێت بە پێشکەش کردنی سوپاسگوزاری لەسەر بوونی بۆ ئەو زاتەی هێناویەتیە بوون و دروستی کردوە. بەڵام وەڵامەکە لەوە قووڵترە کە وتمان پاراستنی ژیانیان بۆ هەمیشە لە ڕوانگەیەکی دروستدا واتە بەندایەتی کردن بۆ ألله کە دانپیانانی مرۆڤە بە بەندایەتیەکەی

بۆ ألله كە دروستی کردوە. لە ئەنجامدانی ئەم کارە بەشێوەیەکی پراکتیکی ڕەنگدەداتەوە لە خۆبەدەستەوەدان بۆ ویستی تەواوی ألله پەروەرێن و خاوەنی ڕاستەقینەی ڕۆحی.
چەند جار پێویستە لەسەر موسوڵمان نوێژ بخوێنێت؟ چەند دەقێك هەن لە قورئانەوە دەدوێن لەبارەی ئەم خاڵەوە زۆر بە وردی. یەکێك لە ڕووداوە یەکلاکەرەوەکان لە ژیانی محمد صلی ألله علیه وسلمدا هەواڵمان پێ دەدات لە گەشتی شەوڕەوی (الأسراء و المعراج)دا بەروە ئاسمانەکان. لە شەوێك لە شەوانی ڕەمەزاندا محمد صلی ألله علیه وسلم بە سواری ئەسپێکی سپی سەرسوڕهێنەری باڵدار برا، لە شاری مەدینەوە بە فڕین بردی بەرەو شاری قودس دواتر لەوێوە بەرزکرایەوە لەڕێگەی هەر حەوت ئاسمانەکەوە بۆ لای زاتی ألله کە فەرمانی پێدا موسوڵمانان با پەنجا جار نوێژ بکەن لە ڕۆژێکدا. لەڕێگای گەڕانەوەیدا بۆ زەوی، لە ئاسمانی سێیەمدا وەستا، کاتێك ئەم هەواڵەی دا بە موسا پێغەمبەر علیه صلاط و سلام لەوەڵامدا بە سەرسوڕمانەوە موسا پێی وت: پەنجا جار لە ڕۆژێکدا! ئەمە بەپراکتیکی سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای کەمکردنەوەی لێبکە، محمد صلی ألله علیه وسلم گەڕایەوە و پەروەردگار ژمارەی نوێژەکانی بۆ کەمکردەوە بۆ چل جار لە ڕۆژێکدا بەڵام موسا بەمە ڕازی نەبوو و پێی وت: من ئەو خەڵکە دەناسم دوبارە بگەڕێوە، ئەم کارە چوار جار دوبارە بوویەوە کە ژمارەی نوێژەکان کەمکرایەوە بۆ سی دواتر بۆ بیست دواتر بۆ دە دوای ئەوە بۆ پێنج جار، تەنانەت ئەم ژمارەی کۆتایی موسای توشی شۆك کرد پێی وت: گەلەکەت ناتوانن بەردەوام بن لەسەر ئەم پێن جار نوێژ خوێندنە لە ڕۆژێکدا، من خەڵکمن تاقی کردوەتەوە هەموو ئەوەی لە توانامدا بو ئەنجامم داوە بۆئەوەی نەوەکانی ئیسرائیل کۆنترۆڵ بکەم لەبەرئەوە بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگار دوای کەمکردنەوەی لێ بکە. بەڵام محمد صلی ألله عایە وسلم ئەم داوایەی ڕەت کردەوە و وتی بە موسا: زۆر داوام کردوە لە پەروەرێنم هەتا وام لێهات شەرمی لێ دەکەم و من بەوە ڕازیم، ژمارەی نوێژەکان لە ڕۆژێکدا بۆ پێنج جار وەك خۆی مایەوە(٢٧).
کاتەکانی ئەم پێنج نوێژە ڕوون کرایەوە و دیاریکرا لە قورئاندا: لەکاتی شەبەقی بەربەیان، کاتێك خۆر دەگاتە چەقی ئاسمان، کاتێك خۆر لاردەبێتەوە بەرەو لای شەو واتە کاتی عەسر، دواتر کاتی خۆرئاوابوون، دواجار کاتی دەستپێکردنی شەو پێش خەوتن.
ئەم خشتەیە پابەند نیە بەکاتەوە بەشێوەیەکی نەگۆڕ چونکە قورئان بەشێوزەیەکی ڕوون دەڵێت: ((وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوّاً مُّبِيناً ﴿النساء: ١٠١﴾)). بەڵام لە هەلومەرجی سروشتیدا پێویستە پابەند بن بە کاتەکانی نوێژخوێندنەوە. لەکاتێکدا لە ئایینی ئیسلامدا ڕۆژێك دیاری نەکراوە لە ڕۆژەکانی هەفتەدا بۆئەوەی بەتەواوی جیابکرێتەوە لە ڕۆژەکانی تر هەروەك ڕۆژی شەممە لەلای جوولەکەکان و یەکشەممە لەلای مەسیحیەکان. بەڵام ڕۆژی هەینی زۆر نزیکە لەوەی ببێتە ڕۆژی جەژن لە هەموو هەفتەیەکدا لەلای موسوڵمانان. هەروەها پەرستشی بەکۆمەڵ لە ئایینی مەسیحی و جوولەکەدا جەخت نەکراوە لەسەر پابەندبوون پێی بەڵام لە ئایینی ئیسلامدا موسوڵمان بانگهێشتکراوە بۆئەوەی لە مزگەوتدا نوێژبخوێنێت هەر کات لە توانایدا بوو، زۆر جەختکراوەتەوە لەسەر نوێژی نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی کە پێویستە بە کۆمەڵ بکرێت.
ئەو کەسانەی سەردانی وڵاتە ئیسلامیەکان دەکەن شایەتی دەدەن یەکێك لەو دیمەنانەی کە هەڵسوکەوتێکی ئایینی جێدەهێڵێت بەشێوەیەکی جوان و کەموێنە لە هەموو جیهاندا بریتیەلە سەیرکردنی منارەی مزگەوتەکان

که ڕوونکراونەتەوە بە ڕوناکیەکی کەم سەدان نوێژخوێن تیایدا دەوەستن شانیان ناوە بە شانی یەکترەوە کڕنوشبردن بۆ پەروەردگاریان دوبارەدەکەنەوە بە ئاڕاستەی مەککە.
وێڕای ئەوەی موسوڵمانان لەسەرەتادابە ئاڕاستەی قودس نوێژیان دەخوێند، بەڵام وەحییێکی قورئانی دواتر فەرمانی پێ دان بە ئاڕاستەی مەککە نوێژەکانیان بخوێنن. دەرکپێکردنی موسوڵمانان لە هەستانیان بەو کارە لە هەموو شوێنەکانی جیهاندا هەستێکیان لەلا دروست دەکات کە مرۆڤ بەو کارە هەڵدەسێت لەگەڵ کۆمەڵێکی جیهانیدا کاتێك بە تەنها نوێژدەخوێنێت لەماڵەکەیدا. جگە لە بابەتی ئاڕاستەی قیبلە قورئان باسی شتێکی دیاریکراو ناکات لەبارەی وردەکاریەکانی ئەو نوێژە، لێرەدا ڕێنماییەکانی محمد صلی ألله علیەوسلم هاتن بۆئەوەی ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە. لەپێش نوێژخوێندنەوە دەستنوێژگرتن هەیە کە بریتیە لە شتنی ژمارەیەك لە ئەندامەکانی جەستە بۆ پاککردنەوەی جەستە و ڕۆح. دواتر نوێژ دەستپێدەکات بە حاڵەتی وەستان بەڕێزەوە بەڵام دەگاتە لوتکەی کاتێك نوێژخوێن کڕنوش دەبات و ناوچەوانی دەخاتە سەر زەوی. ئەمە پیرۆزترین ساتە لە نوێژخوێندندا چونکە هەڵگری هێمایەکە. لەلایەکەوەجەستە لە کڕنوشبردندایە لە حاڵەتی کۆرپەلەییدا هەروەك ئامادەبێت بۆئەوەی سەرلەنوێ لەدایك ببێتەوە. لە هەمان کاتدا جەستەی لە کەمترین ڕووبەردا جێگەدەکاتەوە بۆئەوەی بیسەلمێنێت هیچ نیە لەبەردەم زاتی ألله. بەڵام سەبارەت بە ناوەڕۆکی نوێژ بابەتەکانی سەرەکین ستایشکردنی ألله و سوپاسگوزاری لەسەر بەخشینەکانی و نزا و پاڕانەوەیە. یەکێك لە موسوڵمانان دەڵێت: هەر باڵندەیەك کاتێك دڵۆپە ئاوێك دەخواتەوە چاوەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمانەکان وەك سوپاسگوزاریەك بۆ ألله، موسوڵمانان بە هەمان شێوە ئەو کارە دەکەن پێنج جار لە ڕۆژێکدا.
بنچینەی سێیەم لە ئایینی ئیسلامدا چاکە کردن و بەخشینی بەشێك لە سامان و داراییەکەیەتی(زەکات).
شتە ماددیەکان گرنگن لەم جیهانەدا، بەڵام هەندێك لە خەڵك زیاتر موڵك و سامانیان هیە لەوانی تر. بۆچی؟ ئایینی ئیسلام گرنگی نادات بەم پرسیارە تیۆریە. بەڵام لەبری ئەوە ڕوودەکاتە بابەتێکی پراکتیکی کە خستنەڕووی ئەوەیە کە پێویستە ئەنجام بدرێت سەبارەت بەم نایەکسانیە. وەڵامەکەی زۆر سادەیە: پێویستە لەسەر ئەوانەی موڵك و سامانیان زۆرە یارمەتی ئەوانە بدەن کەمدەرامەت و دەستکورت و هەژارن. ئەم بنەمایە دیموکراتیەت گرتویەتیە خۆی بەڵام بەشێوەیەکی عەلمانی وەك مانای دەوڵەتێك کە ئاستێکی ژیانی گونجاو دابین بکات بۆ هەموو تاکەکانی ناو کۆمەڵگە. قورئان ئەم بنەما سەرکیەی پێشکەش کردوە لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا وەك ئەرکێك لەسەر دەوڵەمەندەکان بۆ کەمکردنەوەی ئەو هەلومەرجە قورسەی کە هەژار و نەداران تیایدا ژیان بەسەر دەبەن.
ئەگەر وردەکاریەکانمان خستەلاوە ئەو ژمارەیەی قورئان دایناوە بۆ ئەو بڕە یەکسانە بە ٢. ٥٪[٧٣] لەوانەیە ئەم بڕە زۆر کەم بێت ئەگەر بەراوردکرا بە دەیەکی ئەوەی پێویستە بدرێت لە یەهودیەت و مەسیحیەتدا (کە دەدرێت بۆ پاراستنی ڕێکخراوە ئایینیەکان زیاتر لەوەی تەرخانی دەکەن بۆ یارمەتیدانە مرۆییەکان، لێرەدا بەراوردکردنەکە دروست نیە)هەتا تێدەگەین ئەم ڕێژەیە پەیوەندی نیە بە داهاتی ماددیەوە بەتەنها بەڵکو پەیوەندی هەیە بە موڵك و ماڵەوە. هەژاران خاوەنی هیچ شتێك نین، بەڵام هەموو ئەوانەی لە چینی مامناوەند و

---

[٧٣] ألەڕاستیدا قورئان ئەم ڕێژەیەی دانەناوە بەڵکو سوننەت دایناوە وێڕپای ئەوەی ڕێژەی ٢. ٥٪ بۆ زەکاتی پارەی نەقد و ئاڵتون و زیو و مادە بازرگانیەکانە بە تەنها، بەڵام ڕێژەی زەکات لە بەروبومە کشتوکاڵیەکان ١٠٪ ئەگەر زەویەك بێت بە ئاوی ئاسمان واتە باران ئاو بدرێت بەتەنها یان ٥٪ ئەگەر ئاو بدرێت لەڕێگی ئامێرەکانەوە. هەروەها ڕێژەی زەکات لە مەڕومالات و مانگا و حوشتردا جیاوازە بەپێی هەر جۆرێکبەگشتی زیاترەلە ٢. ٥٪.

باڵان له كۆمەڵگەدا پێویسته ساڵانه یەك له چلی نرخی شتومەكەكانیان ببەخشن به هەژاران[٧٤]، ئێستا پێویسته ئه پارەیه بدرێت بەكام هەژار و نەدار؟ هەروەها ئەمه ڕوون كراوەتەوە: پێویسته بدرێت بەی‌و هەژارانەی كه زۆر خێرا پێویستیان بەو یارمەتیەیه، بدرێت به كۆیلەكان بۆئەوەی بكڕدرێن و ئازاد بكرێن له كۆیلایەتی، بدرێت به قەرزارەكان ئەوانەی لەتوانایاندا نیه قەرزەكانیان بدەنەوە، گەشتیارە بێگانەكان كه پارەیان لێبڕاوە هەتا دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، ئەوانەی هەڵدەسن به كاری كۆكردنەوەی ئەو زەكاتە.

بنچینەی چوارەم له ئایینی ئیسلامدا بریتیەله بەڕۆژووبوون له مانگی ڕەمەزاندا. مانگی ڕەمەزان پیرۆزترین مانگه له ڕۆژژمێری ئیسلامیدا، چونكه لەم مانگەدا محمد صلی ألله علیه وسلم یەكەم وەحیی پێگەیشت لەلایەن ألله، هەر لەم مانگەدا دوای ده ساڵ هەستا به كۆچكردنه مێژووییەكه له مەككه وه بۆ مەدینه. لەبەرئەوە پێویسته لەسەر هەموو تاكێكی موسوڵمانی لەش ساغ (تەندروست، ئەوانەی نەكەوتەونەته تەنگانەیەكەوە وەك جەنگ یان سەفەركردن بەمەرجێك نەتوانێت دوای بخات)، پێویسته لەسەریان بەڕۆژووبن له ماوەی ئەو مانگەدا وەك یادكردنەوەیەك بۆ ئەو دوو بۆنه مەزنه. هەر له شەبەقی بەرەبەیانەوە هەتا ئاوابوونی خۆر نابێت هیچ جۆرە خواردن و خواردنەوەیەك بخواتەوە و دوكەڵی جگەره ین نێرگەله هەڵبمژێت، دوای ئاوابوونی خۆر دەتوانن نان بخۆن بەبێ زیادەڕەوی. كاتێك ساڵ له ڕۆژژمێری ئیسلامیدا ساڵی مانگی القمریه ئەوا ڕەمەزان به درێژایی ساڵدا دەسوڕێتەوە واته هەموو ساڵێك له كات و وەرزێكی دیاریكراودا نیه. كاتێك دەكەوێته وەرزی زستانەوە نابێته كارێكی قورس و گران. بەڵام كاتێك دەكەوێته لوتكەی گەرمای وەرزی هاوینەوە مانەوه به ڕۆژ له حاڵەتی چالاكیدا بەبێ ئەوەی تەنها دڵۆپه ئاوێك بچێته ناو گەرووی مرۆڤەوە دەبێته كارێكی تاڕادەیەك قورس.

كەوایه بۆچی قورئان داوای كارێكی وەها گرانمان لێ دەكات؟ یەكەم: لەبەرئەوەی بەڕۆژووبوون یارمەتی مرۆڤ دەدات و هانی دەدات بۆ بیركرنەوە، هەروەك هەموو جوولەكەیەك كاتێك بەڕۆژوو دەبێت له كیبوردا شایەتی دەدات لەسەر ئەمه و پشت ڕاسی دەكاتەوە كه بەڕۆژووبوون یارمەتی دەره بۆ زیاتر بیركردنەوە. دووەم: بەڕۆژووبوون فێرمان دەكات چۆن جڵەوگیری نفس بكەین و دەرونمان كۆنترۆڵ بكەین، ئەو كەسەی دەتوانێت مەرجەكانی بەڕۆژووبوون جێبەجێ بكات بەهەمان شێوە دەتوانێت دەستبگرێت بەسەر دەرونیدا گۆنەگرێت بۆ داواكاریەكانی واته حەز و ئارەزوەكانی، بەڕۆژووبوون وامان لێدەكات زیاتر پەیوەست بین به پەروەردگار و دروستكەرمانەوە ألله. ملرۆڤەكان هێندەی پەڕەی كاغەز لاوازن، وێڕایا ئەوە هەندێك جار شانازی به بوونی خۆیانەوە دەكەن و خۆبه گەورە زانن. بەڕۆژووبوون واله مرۆڤ دەكات هەست به بێ دەسەڵاتی و لاوازی خۆی بكات، وا له مرۆڤ دەكات تەنها پشت به ألله ببەستێت له بەڕێوەبردنی سەرجەم كارەكانیدا. دواجار بەڕۆژووبوون واله مرۆڤ دەكات زیاتر هەستیاربێت بەرامبەر به تاكەكانی كۆمەڵگه هەروەها بەزەیی و ڕەحمی مرۆڤ بەهێزتر دەكات. تەنها ئەو كەسانەی برسیەتیان چەشتوە مانای برسی بوون دەزانن. ئەو كەسانەی بۆ ماوەی بیست و نۆ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبن له ساڵێكدا گونجاوترن بۆئەوەی بەوپەڕی ئاگاییانەوە گوێ بگرن بۆ كەسێكی برسی كاتێك داوای خواردنی لێ دەكات.

---

[٧٤] لەوانەیه مەبەستی له شتومەكه بازرگانیەكان بێت لەگەڵ بەروبومی كشتوكاڵی و مەڕوماڵات، هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ بازرگانیان پێوە دەكات و سود له قازانجەكەی وەردەگرێت، ئایا بینا و خانوبەرە بێت كه بەكرێیان دەدات، یان بەلەم یان كارگه هتد. . . گومانی تێدانیه هەموو ئەمانه دەركردنی زەكات لێیان پێویسته. بەڵام ئەم شتومەكانەی مرۆڤ بەكاریان دەهێنێت بۆ كاری ڕۆژانەی و بازرگانیان پێوە ناكات وەك ماڵەكەی و ئۆتۆمبیلەكەی شتومەكی ناو ماڵەكەی ئایینی ئیسلام زەكاتی لەسەر دانەناوە بەدڵنیاییەوە.

بنچینەی پێنجەم لە ئاییني ئیسلامدا بریتیەلە ئەنجامدانی فەریزەی حەج، داواکراوە لە هەموو موسوڵمانێکی نێر یان مێ کە باری تەندروستی باش بێت، باری دارایی بەپێی پێویست بێت. هەستێت بە سەفەرکردن بۆ مەککە یەك جار لە هەموو تەمەنیدا. چونکە لە مەککەدا لوتکەی وەحیی یەزدانی دابەزیوە و تیایدا بۆ یەکەمجار قورئان ڕاگەیەنراوە. ئامانجی سەرەکی لە حەجکردن قوڵکردنەوەی وەفاداری و دڵسۆزیە بۆ ألله، ویست و ئیرادەکەی کە خستویەتیە ڕوو لەڕێگەی وەحیەوە. بەڵام ئەم پەرستشە چەند سودێکی تری هەیە، بۆ نمونە یەکسانی مرۆیی بیری مرۆڤەکان دەخاتەوە. کاتێك حەج کەرەکان دەگەنە مەککە هەڵدەستن بە لابردنی جلوبەرگە ئاساییەکانیان کە پلەو پایەی کۆمەڵایەتیان پێی دەناسرێتەوە وە دەزانرێت لە چ وڵاتێکەوە هاتون، دواتر دوو پارچە قوماش لە خۆیان دەئاڵێنن کە نەدوراوە وەك خاوایە. دواتر هەموو ئەوانەی دەگەن بە ناوەندی زەوی ئیسلام لە جیهاندا واتە کەعبە جلوبەرگێکی سپی لەبەردەکەن کە سادەیە و هاوبەشە واتە هەموویان هەمان جۆر جلوبەرگ دەپۆشن. بەمجۆرە پلەوپایەی کۆمەڵایەتی لەنێوانیاندا نامێنێت، چونکە پادشا و هەژار لەبەردەم ألله دەوەستن لە یەك مرۆڤایەتیدا، لە دڵسۆزیاندا هاوبەشن. هەروەها حاجییەکان زانیاری وەردەگرن لەبارەی چەندین وڵات و نەتەوەی ترەوە، کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان تێگەیشتنێکی باشتریان هەیە بۆ یەکتر. پێنج بنچینەکەی ئیسلام کۆدەبێتەوە لەو شتانەی خموسوڵمانان ئەنجامی دەدەن بۆ پاراستنی ماڵی ئیسلام، لێرەوە ئەو بنچینانە ناونران بە چەند ئەرکێکی وەك پایە کە خانوو یان چادری پێ دادەنرێت. هەروەها چەند شتێك ئەنجامدانیان قەدەغەکراوە وەکو: قومارکردن، دزی کردن، درۆکردن، خواردنی گۆشتی بەراز، خواردنەوەی مەی و بێهۆشکەرەکان، ئەنجامدانی کاری سێکسی لەدەرەوەی چوارچێوەی ژنهێنان یان هاوڕەگەزبازی ژن و ژن یان پیاو و پیاو. هەموو موسوڵمانێکی پارێزکار ئەگەر کەوتە یەکێك لەو شتە قەدەغەکراوانەوە ئەوا تاوان و گوناهێکی ئەنجامداوە. جگەلە دەرکردنی زەکاتی ماڵ و چاکە و بەخشین ئەو بنەمایانەی باسمان کردن تایبەتە بە ژیانی تایبەتی تاکی موسوڵمانەوە. لەبەرئەوە لێرەوە دەچینە سەر ڕێنماییە کۆمەڵایەتیەکانی ئاییني ئیسلام.

## ڕێنماییە کۆمەڵایەتیەکان

((ئەی خەڵکینە! گویٚ لە وتەکانم بگرن و بە ئاگاییەوە! وەك دەزانن هەموو موسوڵمانێك برای موسوڵمانی ترە، ئێوە ئێستا هەمووتان برای یەکترن)) ئەم وشە دیارانە کورتەی ئەو قسانەیە کە پێغەمبەر صلى ألله عليه وسلم ووتی لە حەجی ماڵئاواییدا کە ئەنجامی دا لە مەککەدا لەپێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات، یەکێك لە بەهاکانی ئیسلام و بەهێزترین جەختکردنەوەکانی: بنەمای برایەتی نێوان باوەڕدارانە. بیرۆکەی نەتەوەیی لەم دوو سەدەیەی دواییدا ڕۆڵێکی وێرانکەری بینی دژ بەم بەها نموونەییە لەسەر ئاستی ڕامیاری، بەڵام لەسەر ئاستی گشتی ئەم بیروباوەڕە مایەوە وەك برایەتیەکی مرۆیی دروست بەشێوەیەکی ڕوون. ((یەکێك لە ئیسلامیە دیارەکان دەڵێت: شتێك هەیە لە ڕۆشنبیری ئایینی ئیسلامدا کاریگەرە لەسەر هەموونا تەنانەت جوتیار و فرۆشیارە گەڕۆکەکان، لەڕووی کەرامەت و ئەدەب و ڕەوشتەوە لە ڕێزگرتنی ئەوانی تردا کە هاوشێوەی نابینرێت لە شارستانیەتەکانی تردا))(٢٨).

ئەگەر حاڵی عەرەب لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا لەپێش هاتن و پاش هاتنی ئیسلام بەراورد کرا، ئەوا خۆمان دەبینین ناچارین بپرسین ئایا مێژوو هاوشێوەی ئەم پێشکەوتنە ئەخلاقیەی بەخۆوە بینیوە لەلای زۆربەی نەتەوەکانی هاوشێوەی ئەم ماوە کورتە. لەپێش محمد صلى الله عليه وسلم لەڕاستیدا هیچ جۆرە ڕێکخستنێك نەبوو کە سنور دابنێت بۆ توندوتیژی نێونا هۆز و عەشیرەتەکان. ستەم و زۆرداری لە سامان و دارایی و موڵك و ماڵدا وەك سیستمێکی سروشتی سەیر دەکرا. ئافرەت وەك کاڵایەك سەیر دەکرا زیاتر لەوەی وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. لەبری ئەوەی بڵێین پیاو لەتوانایدا بوو ژمارەیەکی بێسنور لە ئافرەت بخوازێت، گونجاوترە بڵێین زۆر دەگمەن بوو بڵێین پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتاندا پەیوەندیەکی کاتی بوو لەدوای ژنی یەکەم یان دوەم بەدەگمەن ژنهێنان مانایەکی دەبوو بەشێوەیەکی دروست. کوشتنی منداڵەکان بە تایبەت کچەکان کارێکی باو بوو، مەیخواردنەوە و سەرخۆشی و بێ ئاگایی و قوماربازی و ئەوانەی پێشتر ئاماژەمان پێ کردن بەربڵاو بوو بەشێوەیەکی فراوان. بەڵام لەماوەی نیو سەدەدا گۆڕانکاریەکی کەم وێنە ڕوویدا سەبارەت بەو کارە پیس و گڵاوانە.

یەکێك لەو کارانە یارمەتیدەر بوو لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا کە نزیك دەبێتەوە لە ئاستی موعجیزە لە ئایینی ئیسلامدا بریتیبوو لەوەی پێشتر ئاماژەمان پێ کرد لە ڕوونی دیاریکردنی ڕێنماییەکانی ئیسلام. موسوڵمانا دەڵێن ئامانجی سەرەکی ئیسلام لە بابەتی پەیوەندی نێوان تاکەکاندا ئەو ئامانجەیە عیسای مەسیح و پێغەمبەرانی تر بانگەوازیان بۆ کرد: واتە خۆشەویستی برایانەی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە (هەموو تاکێك بەرامبەرەکەی خۆش بوێت و خێری بۆ بوێت هەروەك بۆ خۆی دەوێت و پێی خۆشە). شتێکی ناوازە هەیە لە ئیسلامدا بریتیە لە پەند و ئامۆژگاری بەڵام ڕێنماییە تێرو تەسەلەکان خراونەتە پێش چاومان بۆ بەدیهێنانی ئەو پەند وئامۆژگاریانە. وەك پێشتر بینیمان لە بیردۆزی ئیسلامدا سەبارەت بەم خاڵە. ئەگەر پەیامی عیسای مەسیح درێژ نەبووایە یان جوولەکەکان لاواز نەبونایە لە پەیمانەکانیاندا ئەوا دەکرا عیسا ڕێنماییەکانی ڕێبکبخات بەشێوەیەکی باشتر. بەڵام کاتێك کارەکە بەم جۆرە بوو، ئەوا بە ناکامڵی مایەوە. دانرابوو بۆ مامۆستایەکی تر کە دێت ئەو یاسا ئەخلاقیانە ڕێك دەخات بەشێوەیەکی دروست))(٢٩). قورئان ئەو مامۆستایە بوو. وێڕای ئەوە ڕێبەرێکی ڕۆحی بوو، چونکە قورئان پێکهاتوە لە پوختەیەکی یاسایی بەڕێوەبردن. کاتێك ئەمە زیاد دەکەین بۆ ڕێنماییەکانی کە لە ژماردن نایەن کەمتر لە فەرمودە دروستەکانی پێغەمبەر محمد صلى ألله عليه وسلم ئەوا سەرسام نابین بەوەی دەبینین ئایینی ئیسلام ڕوونترین ئایینە و لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە کامڵە.

موسوڵمان هەرگیز ناتوانن تێبگەن لەو ڕۆژئاواییانەی کە ئایین وەك ئەزمونێکی تاکەکەسی دەبینن، چونکە ئایینەکەیان بانگیان دەکات بۆ بنیات نانی سیستمی کەمەڵایەتی لەسەر شێوازێکی دیاریکراو. ئیسلام ئیمان و بیروباوەڕ دەخاتە پاڵ ڕامیاری، ئایین دەخاتە پاڵ کۆمەڵگە بەجۆرێك کەلەیەکتر جودا نابنەوە.
بواری یاسای ئیسلامی فراوانە. هێندە بەسە بۆمان کە ئامانجەکەمان بگەیەنین لەم کتێبەدا بەندەکانی یاسای ئیسلامی کورت دەکەینەوە لە چوار ناوچەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا:

## ١–ئابوری

ئیسلام بەتەواوی گرنگی دەدات بە بناغەی ماددی ژیان. ئەگەر پێداویستیە جەستەییەکان دەستەبەرنەکرێن.
یەکێك لە شوێنکەوتوانی محمد صلی ألله علیه وسلم بەرەو لای ڕایکرد هاواری کرد و وتی: دایکم مرد، باشترین چاکە چیە ئەنجامی بدەم بۆئەوەی ڕۆحی ئاسودە بکەم؟ پێغەمبەر صلی ألله علیه وسلم یەکسەر وەڵامی دایەوە:
(ئاو. بیرێکی بۆ هەڵبکەنە و ئاو پێشکەشی تینوان بکە).

هەروەك تەندروستی هەموو بونەوەرێکی زیندو پێویستی بەوە هەیەخۆراك بگات بە هەموو ئەندامەکانی لەشەی. بە هەمان شێوە تەندروستی کۆمەڵ پێویستی بە دابەشکردنی شتومەکە مادیەکانە بەشێوەیەکی بەرفراوان و گونجاو. ئەمە بنەما ئابوریەکانی ئیسلامە، هیچ جێگایەکی تر نەماوە بە هاوشێوەی ئەم جێگایە تیایدا باس لە دیموکراسی ئیسلام بکرێت. ئەو قورئانەی تەواو کراوە بە فەرمودەکان پێشنیازی ئەوە دەکات بەربەستە چینایەتیەکانی ئابوری بشکێنرێت بۆ کەمکردنەوەی ستەمە کۆمەڵایەتیەکان کە کۆمەڵەی بەرژەوەندیە تایبەتیەکان پێی هەڵدەستن.

ئەو نمونەیەی ئابوری ئیسلامی دەجولێنێتبریتیە لە کۆئەندامی سوڕانی خوێن لە جەستەدا. چونکە تەندروستی مرۆڤ پێویستی بە هاتن و چونی خوێنە بە ئازادی و زۆر بە خێرایی، هەر وەستان یان خاوبوونەوەیەك لە هاتوچۆی خوێندا لەوانەیە ببێتە هۆی ڕوودانی نەخۆشیەك یان مردن بەهۆی کڵۆت بوون و وەستانی خوێن و گیرانی بۆریەکانی خوێن. هەمان شت سەبارەت بە جەستەی ڕامیاری کە تیایدا سامان و دارایی جێگای خوێن دەگرێتەوە، لەسەر ئەو بنەمایەی سامان و دارایی بریتیەلە ماددەی ژیان و دەمارەکانی. هەتا ڕێزبگیرێت لەم وێکچواندنە یاسا دادەنرێت بۆ سوڕانی سامان و دارایی لە کۆمەڵگەدا بەشێوەیەکی چالاك، چونکە ئیسلام لاری نیە لەسەر هاندان بۆ قازانج کردن وەك ڕێگری نادات لە ڕکابەری ئابوری یان بازرگانی هەتا مرۆڤ شارەزا و لێهاتو تربێت لەو بوارەدا باشترە.

ڕێگەدان بەم شتانە بە ڕادەیەکی گەورەوای لە هەندێك کرد زۆر دوور بڕوات کە باسی قورئان بکرێت وەکو کتێبی پیاوە بازرگانیەکان. قورئان ڕێگری ناکات لە کارکردن بە شێوەیەکی چالاك زیاتر لە هاوسێکانی هەروەها ڕێگر نیە لەبەردەم بەدەستهێنانی هاوشێوەی ئەو خەڵکەلەسەر داهاتی گەورەتر لەوانی تر. تاکە شتێك جەخت دەکاتەوە لەسەری بریتیەلە ڕکابەری بەڵام هاوسەنگ بکرێت، واتە با خوێنهێنەرەکان بە کراوەیی بمێننەوە بە بەزەیی و ڕەحم بۆئەوەی بگات بە وردترین مولولەی خوێن. ئەم مولولانە خۆراکیان پێ دەدرێت لەڕێگەی بڕی تایبەتکراو بۆ هەژاران وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە خاوەن سامان و داراییێن پێویستە لەسەریان بڕێك پارە بدەن بەشێوەیەکی ساڵانە لە شتومەکەکانیان بۆئەوەی دابەشبکرێت بەسەر کەمدەرامەتاندا.

بەڵام سەبارە بە نەهێشتنی کلۆتبوونی خوێنواتە هەڵئاوسان و چەقبەستویی سامان و دارایی لە دەستی تاقم کەسێکی دیاریکراوداقورئان ڕوویکردوەتە مەترسیارترین نەفرەتی ئابوریلەو کاتەدا ئەویش دەستبەسەراگرتنی میراتە واتە ماف و حەقی ئەوەی کوڕە گەورە دەست بگرێت بەسەر تەواوی میراتی باوکیدا، ئەو دیاردەیەی لەناوبرد بەتەواوی. دیاردەی دەستبەسەراگرتنی میرات لە سەردەمی پێش هاتنی ئیسلامدا باو بوو هەروەها پارە و سامان لەلای چەند کەس و کۆمەڵێکی دیاریکراو قەتیس مابوو. ئیسلام ئەم کارەی قەدەغە کرد وە میراتی کرد بە مافێکی هاوبەش هەمووان تیایدا یەکسان بن چ کوڕ یان کچ. ف. س. نورس روب باس لە

دابەشکردنی میرات دەکات لە ئیسلامدا دەڵێت: جێبەجێ کردنی یاسای ئیسلامی توانی لە هۆزێکدا نزیکەی ٥٣٠٠٠ دۆلار دابەشبکات بەسەر ٧٠ کەسی خاوەن میراتدا بەیەکسانی.

چەند ئایەتێك هەن لە قورئاندا بەتوندی وەرگرتنی سود ڕیبا قەدەغە دەکەن. لەو سەردەمەدا ئەم قەدەغە کردنە تەنها کارێکی مرۆیی نەبوو بەڵکو زۆر دادپەروەرانە بوو، چونکە قەرزەکان بەکاردەهێنران بۆ یارمەتیدانی نەخۆش و دەستکورت و لێقەوماوان لەکاتی ڕودانی کارەساتە سروشتیەکاندا. بەڵام لەگەڵ سەرکەوتنی سەرمایەداری پارە مانایەکی نوێی بۆ دروست بوو بەجۆرێك پارە لە ئەمڕۆدا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت وەك سەرمایە بۆ کاری بازرگانی، لەم هەلومەرجەدا پارە وەرگرتن بە قەرز زیادی کرد. ئەمە سود بەو کەسە دەگەیەنێت کە پارەی لێ وەردەگرێت بە قەرز بەشێوەیەکی ڕوون. بەوهۆیەوە زوڵم و ستەمە ئەو کەسەی پارە بە قەرز وەردەگرێت بڕێك لە پارەکەی لێ ببڕین وەك سود. ئەو ڕێگایەی موسوڵمانان ئەم هەلومەجەیان پێ گونجاندبوو بریتی بوو لەوەی ئەو کەسەی قەرزەکە دەدات ببێتە شەریکی ئەو کەسەی کە قەرزی پێدراوە لە بازرگانیەکەیدا. کاتێك سەرمایەداری نزیك بوویەوە لەم شێوازە موسوڵمانا ڕێگریان نەکرد لەم شێوازەی، واتە سەرمایەدار بەشداربێت لە قازانجی وەبەرهێندا، لەنێو ڕێنماییەکانی ئیسلامدا. بەڵام زیادەڕەوی سەرمایەداری بابەتێکی ترە. موسوڵمانان وابیردەکەنەوەدەکرێت یەکسانی و دادپەروەری بەرپا بکرێت ئەگەر کار کرا بە قورئان بەشێوەیەکی دروست، هاوسەنگی دەداتە ئەو زیادەڕەویە لە سەرمایەداریدا.

## ٢-هەلومەرجی ئافرەت

ڕێگەپێدانی ئیسلام بە زیاد لە یەك ژن هۆكاری سەرەكیە وای لە ڕۆژئاوا كردوە ئیسلام تاوانبار بكات بە ستەمكردن لە ئافرەت و بە كەم زانینی. ئەگەر ئەم كێشەیەمان چارەسەر كرد لەڕووی مێژوییەوە، دواتر بەراوردكاریمان كرد لەنێوان هەلومەرج و باری ژیانی ئافرەت پێش محمد صلى ألله عليه وسلم وە دوای هاتنی، ئەوا بەشێوەیەكی ئاشكرا دەبینین ئەم تاوانباركردنە زۆر هەڵەیە. ڕێكخستنی ژن هێنان لە ماوەی نەزانی پێش ئیسلامدا زۆر بێ بایەخ بوو بەجۆرێك تەنانەت تێبینی نەدەكرا. ئافرەت وەك كەمتر لە شتومەك سەیر دەكرا، مامەڵەیان لەگەڵ دەكرا بەو جۆرەی كە باوك یان مێرد پێی خۆش بوو. ئافرەت ماف و حەقی نەبوو لە میراتدا، زۆربەی كچە تازە لەدایكبووەكانیە زیندویی لە چاڵ دەنران.

لە هاوشێوەی ئەو هەلومەرجەدا تەنانەت لەدایكبوونی كچ وەك عەیبە و ئابڕووچوون سەیردەكرا، چاكسازیەكانی قورئان باری ئافرەتی بەرەو باشتر برد بەشێوەیەكی ئاشكرا و ڕوون. ئیسلام حەق و مافی میراتی بە ئافرەت بەخشی، دروستە هێندەی پیاو وەرناگرن هەمیشە، بەوەی كچ نیوەی حەقی كوڕی هەیە، بەڵام ئەمە شتێكی دادپەروەرانەیە ئەگەر سەیری حەقیقەت و ڕاستی كچان مان كرد، بەپێچەوانەی كوڕانەوە هیچ بەرپرسیاریەتیەكیان لەسەر شان نیە بەرامبەر بە خێزان و كەسە نزیكەكانیان. هەروەها قورئان مافی تەواوی هاوڵاتی بوونی داوە بە ئافرەت لە فێربوون و كاركردن، مافی هەڵبژاردن و دەنگدانبەم كارە بواری دا بە دادپەروەری تەواوی ژن لەگەڵ پیاودا. بەجۆرێك دوپاتكراوەتەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەگەڵ پەرەسەندنی كلتور و نەریتەكانی نەتەوە ئیسلامیە جیاوازەكان تەنانەت لەسەر سەردەمی هاوچەرخ و نوێدا گونجاندویەتی(٣٠).

موسوڵمانان دەڵێن ئەگەر سەدەیەكی تر تێبپەڕێت و ئافرەت نەگات بە هەمان باری ئافرەت لە ڕۆژئاوا لەژێر سێبەری ئایینی ئیسلامدا ئەوا دەكرێت بڵێین ئیسلام بەرپرسە لەوەی ئافرەتی موسوڵمانی بێبەش كردوە لە پەرەسەندنی پیشەسازی واتە ئیسلام ڕێگر نیە لەبەردەم بەرەوپێشچونی باری ئافرەت لە وڵاتە ئیسلامیەكاندا.

بەهەرحاڵ گەورەترین یارمەتیدانی ئیسلام بۆ ئافرەت بەیاساكردنی پرۆسەی هاوسەرگیریە كە بە كارێكی پیرۆزی دادەنێت بەپلەی یەك وە دەیكات بە بوارێكی یاسایی بۆ پەیوەندی سێكسی بەشێوەیەكی تەندروست(٣١).

ئەگەر تێگەیشتین لەوەی ئیسلام ئایینێكە سزای بەردباران كردن دەدات بەسەر كەسی زیناكەردا هەتا مردنی ئایینێكە سەماكردنی تێكەڵی قەدەغەكردوە دەرك بەوەدەكەین تاوانباركردنی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام بەوەی ئایینێكە ڕیكلام بۆ سێكس دەكات كارێكی هەڵەیە. دووەم ئایینی ئیسلام داوا دەكات ئافرەت ڕای خۆی بگەیەنێت پێی ئەوەی بدرێت بەو پیاوەی بڕیارە هاوسەرگیری لەگەڵدا بكات، تەنانەت كەسی دەسەڵاتدار ناتوانێتئافرەتێك بكاتە هاوسەری خۆی هەتا بەشێوەیەكی ئاشكرا ئەو ئافرەتە ڕازیبوونی خۆی ئاشكرا بكاتز سێیەم ئیسلام بەتوندی جەخت دەكاتەوە لەسەر گرێبەستی هاوسەرگیری. وێڕای ئەوەی محمد صلى ألله عليه وسلم تەڵاقدان و جیابوونەوەی قەدەغە نەكردوە بەڵام وەك دوا چارەسەری داناوەوە جەخت دەكاتەوە لەسەر ئەوەی هیچ شتێك ألله توڕە ناكات هێندەی وازهێنان لە پەیوەندی هاوسەرگیری. چەند بەند و یاسایەكی داناوە بۆئەوەی پرۆسەی ژنهێنان بە سەلامەتی بمێنێتەوە. داوادەكرێت لە پیاوەكان بڕێك پارە پێشكەش بكەن لەكاتی ئەنجامدانی گرێبەستی هاوسەرگیریدا كە هەردو لا لەسەری ڕێك دەكەون، وەمافی ئەوەی هەیە هەمووی وەرگرێت واتە ئافرەتەكە لە حاڵەتی جیابوونەوەدا واتە تەڵاقدان. تەڵاقدان پێویستی بە پێدانی هەلی گەڕانەوە هەیە لە سێ ماوەی لەیەك جیا لە هەریەكەیاندا داوادەكرێت دادوەری بكرێت لەلایەن دوو دادوەرەوە یەكێكیان لە خێزانی

پیاوەکە بێت و ئەوی تر لە خێزانی ژنەکە بۆئەوەی هەوڵ بدەن بۆئەوەی پێکیان بهێننەوە. وێڕای ئەم ڕێگایانە چەند شتێکی تر دەگیرێتە بەر بۆ ئەوەی کەمترین ڕێژەی تەڵاق ڕوو بدات لە کۆمەڵگەدا، هەروەها حەق دراوە بە ژن داوای چارەسەری ئەو ناکۆکیە بکەن بەشێوەیەك هیچ کەمتر نیە لەوەی بە پیاو دراوە.
بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە قسەی لەسەر بکەین کێشەی زیاد لە یەك چنە. دروستە قورئان ڕێگە دەدات بە پیاو کە ببێتە خاوەنی ١-٤ ژن لیەك کاتدا، بەڵام زۆر بەوردی باس لەوە کراوە کە یەك ژنی حاڵەتێکی نمونەییە. ئەمە پشتڕاست کراوەتەوەلە قورئاندا ((وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ ﴿النساء: ٣﴾))، چەند برگەیەکی تر هەیە لە قورئاندائەم دادپەروەریە ڕوون دەکاتەوە لەبارەی پێداویستیە ماددیەکانەوە بەڵکو خۆشەویستی و ڕێزلێگرتن دەگرێتەوە. لەڕووی ڕێکخستنی مادیەوە هەموو ژنێك پێویستە ماڵێکی تایبەت بە خۆی هەبێت. مەرجی دووەم واتە دادپەروەری و یەکسانی لە ڕێزگرتن و خۆشویستندا هەندێك لە دادپەروەران دەبات بەرەو ئەوەی بڵێن قورئان لەڕاستیدا بانگمان دەکات بۆ یەك ژنی بەجۆرێك ئەستەمە ئەو سۆز و خۆشەویستیە دابەشبکەین بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوان زیاتر لە یەك ژندا. هاوشێوەی ئەم شیکردنەوەیسە هەیە لەلای موسوڵمانان لە سەدەی سێیەمی کۆچیەوە هەروەها ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر قوبووڵ دەکرێت. بۆ خۆپاراستن لە هەڵە تێگەیشتن زۆربەی موسوڵمانان مەرجێکی تر دادەنێن بۆ زیاد لە یەك ژن کە بریتیەلە ڕازی بوونی ژنی یەکەم بەشێوەیەکی فەرمی لە هێنانی ژنی دووەم لەڕاستیدا زیاد لەیەك ژن بووەتە شتێکی دەگمەن لە جیهانی ئیسلامی هاوچەرخدا.
بەڵام وێڕای ئەوە ڕاستیەك دەمێنێتەوە قورئان بەڕاستی ڕێگەی داوە بە زیاد لە یەك ژن ((فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ . ﴿النساء: ٣﴾))، کەواتە چی بوترێت لەبارەی ئەوەی محمد صلى ألله عليه وسلم زیاد لەیەك ژنی هەبووە؟ موسوڵمانان هەردوو حاڵەتەکە وەك نمونە و بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی ئیسلام ئایینێکی لاستیکیە لەتوانایدایە بەرەوڕووی هەلومەرجە جۆراوجۆرەکان ببێتەوە بە چەند یاسایەکی جیاواز.
چەند حاڵەتێك هەن لە کەموکوڕی مرۆیی هیە کە زیا لە یەك ژن لەڕووی ڕەوشت و ئەخلاقەوە بەباشتر دادەنرێت. لەسەر ئاستی تاك ئەم هەلومەرجانە ئەگەر هات بەسەر ژنێك لە سەرەتای شووکردنیەوە وەك ئیفلیجی یان هەر شتێك ڕێگری بکات لە ئەنجامدانی پەیوەندی سیکسی. لەسەر ئاستی کۆمەڵ حاڵەتی جەنگ کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان لەناو دەچن ناچارمان دەکات هەڵبژاردن بکەین لەنێوان ڕێگەدان بە زیاد لەیەك ژن یان قەدەغە کردنی دواتر شوونەکردنی ڕێژەیەکی زۆر لە کچان و بێبەشبوونیان لە بوون بە دایك لەوانەیە ناچارمان بکات بۆ ڕێگەدان بە زیاد لە یەك ژن نەك هەر ئەوە بەڵکو ببێتە بەپرسیاریەتیەکی گەورە. چونکە بڵاوبوونەوەی کاری لەشفرۆشی بەهۆی دەستنەکەوتنی سێکس بە شێوەیەکی شەرعی لەم حاڵەتەدا دەبێتە دیاردەیەکی ئاشکرا. موسوڵمانا لە بەرگری کردنیان لەم کێشەیە ئاماژە دەکەن بۆئەوەی ماف دراوە بە ژنی یەکەم جیاببێتەوە ئەگەر ویستی. دواجار موسوڵمانان دواون لەبارەی ئەوەی تێرکردنی سێکسی ئافرەت یەکێکە لە مافەکانی ژن بەسەر مێردەکەیەوە، وێڕای ئەوەی باسیان لەوە کردوە پاڵنەری سێکسی لەلای پیاو بەهێزترە لە هی ژن. دوروسی بارکرد نوسیویەتی: ((پیاوان زیاد لە یەك ژنیان پێویستە بە سروشتیان، وە ژنان پێویستیان بە یەك مێرد هەیە بەپێی سروشتیان)). ئەگەر بنەمایەکی بایۆلۆجی هەبێت بۆ ئەمە ((لەبری ئەوەی ڕێ بدرێت

به هەوەسی سێکسی پیاو کە ملکەچ نەبێت بۆ یاسایەکی دیاریکراو ئەوا یاسای ئیسلام چوارچێوەیەکی داناوە بۆ زیاد لە یەک ژن. قاڵبێك دەدات بەو توانا سێکسیەی پیاو بۆئەوەی بپارێزرێت بۆ بنیانتانی ئایین))(٣٢).
بەڵام سەبارەت بە حیجابی ئافرەتان و دوور خستنەوەیان لە ژیانی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی گشتی ڕێنماییەکانی قورئان بەسودن تەنها دەڵێت: ((يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً ﴿الأحزاب: ٥٩﴾)). حاڵەتەکانی توندڕەوی پەیوەندی هەیە بە کلتور و نەریتی شوێنە جیاوازەکانەوە زیاتر لەوەی ئەرکێکی ئایینی بێت.
لێرەدا پێویستە بدوێین لەبارەی سزاکان لە ئایینی ئیسلامدا لەسەر کێشە کۆمەڵایەتیەکان چونکە وەك ەوترێت ئایینی ئیسلام لە سزاداندا زیادەڕەوە. ئێرە شوێنی گونجاوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، دیارترین نمونە لێرەدا سزای زینایە. کەتیایدا ئیسلام هەمان سزای یاسایی جوولەکە دوبارە دەکاتەوە بە بەردبارانکردنی زیناکەرە هەتا مردن، دوو سزا هەیە لە قورئاندا باسکراون بڕینی دەستی دز و جەڵد لێدان لەسەر سەرپێچیەکان. گومانی تێدا نیە ئەم سزایانە زۆر توندن بەڵام دانراون بۆ جوختکردنەوە لەسەر ئەو تاوانانەی شایستەی ئەو سزایەن. بەزەیی محمد صلی ألله علیه وسلم دەست بە جووڵە دەکات بۆئەوەی ئەم سزایانە سوك بکات کاتێك بە هاوەڵەکانی وت: ((خۆتان بپارێزن لە سنوربەزاندن بە گومانەکانتان)). هەروەها یاسای ئیسلامی هەموو کەرەستەیەك بەکاردەهێنێت بۆ خۆپاراستن لە سزادان، بەبێ ئەوەی بەگشتی لەکاربخرێت. بۆ نمونە ڕەجم و بەردبارانکردنی زیناکەر بەشێوەیەکە نیمچە ئەستەمە کە مەرج دانراوە بۆ بوونی چوار شایەتی باوەڕپێکراو پێویستە ئەو کردارەیان بینی بێت زۆر بەوردی. هروەها جەڵد لێدان دەکرێت ئەنجام بدرێت بە شتێکی سوك، هەروەها دز دەستی نابڕدرێت ئەگەر لەبەر نەبوونی پێویستیەکی ڕاستەقینە ئەو کارەی ئەنجام دابێت.

## ٣-پەیوەندیە نەتەوەییەکان

ئیسلام جەخت دەکاتەوە لەسەر یەسانی نێوان نەتوەکان ((پلەیەکی باشی بەدەست هێناوە لە پێکەوەژیانە نەتەوەکان))(٣٣). دوا هەڵبژاردن بۆ ئەم خاڵە بریتیەلە ژنهێنانی نێوان نەتەوە جیاوازەکان، موسوڵمانا وا دەبینن ئیبراهیم نمونەیەکی دیارە لەسەر ئارەزوو و ئامادەبوونی لە هێنانی هاجەر کە لە نەتوەیەکی ڕەشپێست بووز کاتێك ئیسلام سیەری کرد وەك ژنی دووەمی لەبری ئەوەی وەك کەنیزەکێك سەیر بکرێت. دروستە لەژێر فەرماندەیی ئیلیجا محمد سەرۆکی بزوتنەوەی موسوڵمانە ڕەشپێستەکان لە ئەمەریکا دەجەنگان دژ بە سپی پێستەکان، بەڵام کاتێك ملکولم ئێکس ڕۆیشت بۆ ئەنجامدانی حەج لە مەککە لەساڵی ١٩٦٤، تێگەیشت لەوەی ڕەگەزپەرستی دژ بە سپی پێستەکان بەهیچ جۆرێك جێگای نابێتەوە لە ئایینی ئیسلامدا(٣٤). موسوڵمانان پێیان خۆشە هەمیشە باسی یەکەم بانگخوێنیان بکەن بیلالی حەبەشی بوو کە هەمیشە دۆعای دەکرد بۆ ئەوەی خودا هیدایەتی قوڕەیش بدات کە سپی پێست بوون کە بە توندترین شێوە بەرەنگاری موسوڵمانە یەکەمیەکان دەبوونەوە و زۆربەی کۆیلەکانیان ڕەشپێست بوون. ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی ئیسلام بەردەوامە لە بڵاوبوونەوەی لە ئەفەریقا پەیوەندی نیە بەم تۆمارە ئایینیەوە لەبارەی ئەم کێشەیەوە لە ئایینی ئیسلامدا.

## ٤-بەکارهێنانی هێز

موسوڵمانان دەڵێن بیرۆکەی ڕۆژئاوا کە بەربڵاوە لە ئیسلامدا کە تێبینی دەکەن کاتێك دەچن بۆ ڕۆژئاوا بریتیەلە بیرکردنەوەی ڕۆژئاواییەکان بەو جۆرەی موسوڵمان پیاوێکە کە شمشێرەکەی دەرهێناوە، کۆمەڵێك لە ژنەکانی دوای کەوتون!. گومانی تێدانیە هەر لە دێرزەمانەوە یەکێك لە مێژوونوسان وتویەتی: ((مەسیحیەکان دوو تایبەتمەندی محمد صلی ألله علیه وسلم بە گرنگ دەزانن لە ژیانی سێکسی و بەکارهێنانی هێز لە بڵاوکردنەوە و بونیادنانی ئایینەکەیدا))(٣٥). موسوڵمانا هەست بەوە دەکەن ئەو بیرکردنەوەیە وەك تۆمەتێك دادەنرێت بەرامبەر بە محمد صلی ألله علیه وسلم و قورئانی پیرۆز. ئاماژەکراوە بۆ پەیوەندیە سێکسیەکان لێرەدا دەدوێین لەبارەی بەکارهێنانی هێزەوە.

موسوڵمانان دەڵێن ئێمە داندەنێین بەوەی قورئان ئامۆژگاری ناکات بەوەی مرۆڤ ڕومەتی چەپی حازر بکات بۆ ئەو کەسەی لە ڕومەتی ڕاستی داوە، نە بە ئاشتەوایی تەواو و ڕەتکردنەوەی بەکارهێنانی چەك بەشێوەیەکی ڕەها. بەڵام فێری لێبوردنمان دەکات بەوەی مرۆڤ بە چاکە وەڵامی خراپە بداتەوە کاتێك هەلومەرجەکان گونجاو بن-((وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿فصلت: ٣٤﴾-(( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوّاً لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ وَإِن تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿التغابن: ١٤﴾))، بەڵام لێرەدا شتێك هەیە جیاواز لە بەرەنگارنەبوونەوەی خراپە. دوور لە داوای موسوڵمان بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی بێ ڕەحم و بەزەیی، قورئان ڕێگەدەدات بە سزادانی تاوانباران و ستەمکاران ئەوانەی بە ئەنقەست و بەشێوەیەکی ئاشکرا ستەم و زوڵم دەکەن لە خەڵك واتە ئازاری خەڵکی دەدەن بە کارەکانیان: ((الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿الحج: ٤٠﴾))(i). ئەوان وابیردەکەنەوە ئەمە دادپەروەری داوای دەکات: دەڵێن ئەگەر بنەمای مامەڵەکردنمان لابرد لەو ژیانەی بە دادپەروەری دەمێنێتەوە ئەوا دەبینین بنەما ئەخلاقیەکان کاریان پێناکرێت. ئەگەر بنەمای دادپەروەریمان فراوان کرد بەپێی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوا یەکێك لەو بەرنامانەی جێبەجێ دەکات بریتیەلە جهاد هەوڵ و تێکۆشان، مانای ئیسلامی بۆ جەنگی پیرۆز ئەو کەسەی تیایدا شەهید دەکرێت دەچێتە بەهەشتەوە. موسوڵمانان جەخت دەکەنەوە لەسەر هەموو ئەو شتانە وەك بەشێکی چەسپاو بە ئیسلامەوە، بەڵام ئێمە هێشتا دوورین لەو تۆمەتەی کە دەڵێت ئیسلام بڵاوبووەتەوە سەرەتا بە شمشێر و دواتر جێگیر بووە بە هێزی شمشێر.

محمد صلی ألله علیه وسلم چەندین کلتوری تایبەت بە مامەڵەکردن لە کاتی جەنگدا دانا: ڕێزگرتن لە ڕێکەوتننامەکان، قەدەغەکرنی خیانەت و بێوەفایی، نەشێواندنی جەستەی مردوەکان و نەبڕینەوەی قاچ و دەستی برینداران و دانەوەی جەستەی مردوەکان بە کەسوکارەکانیان، پێویستە منداڵ و ژن و کەسانی بەتەمەن پارێزراو بن لە کاتی جەنگ دا، هەروەها پێویستە باخ و بێستان و بەروبومە کشتوکاڵیەکان بپارێزرێن لەگەڵ پەرستگا و شوێنە پیرۆزەکان. وێڕای ئەوە ئەمە خاڵە گرنگەکە نیە. پرسیاری گرنگ لێرەدا پێناسەکردنی جەنگی دادپەروەرانەیە. بەپێس شیکردنەوەی مانای وشەکان لە قورئاندا جەنگی دادپەروەرانە پێویستە بەرگریکردن بێت یان بۆ لابردنی زوڵم و ستەم بێت: ((وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ ﴿البقرة: ١٩٠﴾)). دوژمنایەتی دڕندانەی وەسەنیەکان بتپەرستان کاتێك هێرشیان کردە سەر محمد صلی ألله علیه وسلم و هاوەڵەکانی محمد صلی ألله علیه وسلم ناچارکرد شمشێرەکەی بەکاربهێنێت

بۆ پاراستنی بۆ بەرگریکردن لە خۆی، ئەگەر بەو کارە هەڵنەستایە ئەوا خۆی و هاوەڵەکانی دەسڕدرانەوە لەسەر ڕووی زەوی و لەناودەبران. چەند پێغەمبەری تر هەبوون بەرگری کردنیان ڕەت کردەوە و بە شەهیدی مردن، ئەمە بەو مانایە نایەت محمد صلی ألله علیه وسلم هاوشێوەی ئەوان دەستەوسان بمێنێتەوە. کاتێك شمشێرەکەی هەڵگرت بۆ بەرگری کردن لە خۆی لەگەڵ هاوەڵەکانی هەتا کۆتایی جەنگا. ئەمە هەموو مسوڵمانان دانیان ناوە بەم ڕاستیەدا، بەڵام پێداگری دەکەن لەسەر ئەوەی ئایینی ئیسلام کاتێك بڵاو بوویەوەهەندێك جار لەڕێگەی بەکار هێنانی شمشێرەوە بووە بەڵام زۆربەی کات به تەواوی ویست و خواستەوە قوبوڵکراوە چونکە نمونەیەکی ئەخلاقی پێشکەش کردوە.

ئایەتە قورئانیەکان کە دەدوێن لەبارەی بابەتی هیدایەتدان بە ئیسلام دەڵێت:

((لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿البقرة: ٢٥٦﴾)).

((وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿المائدة: ٤٨﴾.

موسوڵمانان ئەوە ڕوون دەکەنەوە محمد صلی ألله علیه وسلم کاتێك دەستوری دانا بۆ مەدینە بنەمای لێبوردەیی ئایینی بۆ زیادکرد کە ڕایگەیاند لەو ئایەتانەدا. سەیری ئەو دەستورە دەکەن وەك یەکەمین دەستور بۆ ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی مرۆڤایەتیدا و نمونەی ڕەسەن و باوەڕپێکراو بۆ هەموو دەوڵەتە ئیسلامیەکانی دواتر. ئەم دەستورە ئەو جوولەکانەی دەگرتەوە کە لەو کۆمەڵگەیەدا نیشتەجێبوون پارێزراو بوون لە سوکایەتی پێکردن و ستەم لێکردن، هەمان مافی باوەڕدارانیان هەبوو: ((جوولەکەکان. . . هەموو ئەوانەی دانیشتووی یەسربن مەدینە، . . . ڕێوڕەسمی ئایینی خۆیان بەڕێوە دەبەن بە تەواوی ئازادی بەهەمان شێوەی موسڵمانان))[٧٥]

(هەمان ماف دراوە بە مەسیحیەکان، بەجۆرێك یەهودییەت و مەسیحیەت دوو ئایینی تر بوون کە لە مەیدنە شوێنکەوتووی هەبوو). تەنانەت نەتەوە کراوەکان ڕێگە دەدرا بە نەوەکانیان سەربەخۆ بن لە بیروباوەڕ و پەرستنیاندا بەمەرجێك جزیە باج بدەن لەبری زەکات کە موسوڵمانان دەیدەن بە هەژاران، دواتر سەیری هەموو دەستوەردانێك لە ئازادیەکانیان دەکرێت وەکو سنوربەزاندنی ڕاستەوخۆی ڕێنماییەکانی یاسای ئیسلامی.

ئەگەر یەکێك پرسیاری کرد لەبارەی پێوەرێکی ڕوونتر لەم هەڵوێستەی ئیسلام سەبارەت بە کێشەی لێبوردنی ئایینی محمد صلی ألله علیه وسلم دەفەرمێت: ((چۆن خەڵکی بە زۆرەملێ لەسەر ئایینێك جێگیر دەکەن لەکاتێکدا ئیمان و بیروباوەڕ تەنها لەلایەن ألله دێت؟))(٣٦). . جارێك کاتێك وەفدێك لە پشتیوانان سەردانی محمد صلی ألله علیه وسلمیان کرد، بانگی کردن بۆئەوەی نوێژەکانیان لە مزگەوتەکەی ئەودا ئەنجام بدەن پێی فەرمون: ((ئەمە جێگایەکی تەرخانکراوە بۆ ألله)).

ئەوەی باسکراوە لەڕووی تیۆریەوە لەبارەی کەسایەتی محمد صلی ألله علیه وسلم. ئایا موسوڵمانان تا چ ڕادەیەك ژیاون و بەتەواوی بنەماکانی لێبوردنی ئایینیان جێبەجێ کردوە ئەمە پرسیارێکە جێدەهێڵرێت بۆ

---

[٧٥] ئەو دەستەواژانەی هاتون لە ژیانی پێغەمبەردا صلی ألله علیه وسلم کە ئیبن هیشام نوسیویەتی بەشی ٢ لاپەڕەی ٥٠٣: (ئەو جوولەکانەی شوێنمان دەکەون ئەوا سەرکەوتن بۆ ئەوانە و ستەمیان لێناکرێت، ئاشتەوایی موسوڵمانان یەکێکە. . جوولەکەکان لەگەڵ موسوڵماناندا سامان و داراییان خەرج دەکەن لەبەرئەوەی جەنگاوەرن جولەکەانی بەنی عوس نەتەوەیەکن لەگڵ موسوڵماناندا جوولەکە ئایینی خۆیان هەیە و موسوڵمان ئایینی خۆی تەنها ئەوانە نەبێت ستەم دەکەن تاوان ئەنجام دەدەن تەنها زیان بەخۆی و خێزانەکەی دەگەیەنێت. . پێویستە جوولەکەکان باج بدەن و موسوڵمانا زەکات بدەن وە سەرکەوتنێك لەنێوانیاندایە لەسەر ئەوەی جەنگا لەگەڵ خاوەنی ئەو پەرتوکە وە هەروەها ئامۆژگاری و هاوکاریکردنی یەکتر لەنێوانیاندایە بەبێ ئەوەی تاوان ئەنجام بدەن).

مێژووی ئاڵۆز تاڕادەیەکی دوور، دورتر لەوەی بتوانین وەڵامێك بەدەست بهێنین لەبارەی ئەم بابەتەوە.  چونکە لەڕووی پۆزەتیڤانەوە موسوڵمانا ئاماژە دەکەن بۆ  سەدە دوورودرێژەکان کە مەسیحیەکان و جوولەکە و هیندۆس تیایدا ژیاون لە ڕۆژهەڵات و لە ئیسپانیا و لە هیند ژیانێکی سادەدا وبە سەربەخۆیی لەژێر فەرمانڕوایی ئیسلامدا.  تەنانەت لەژێر فەرمانڕەوایی خراپترین فەرمانڕەوادا، مەسیحی و جوولەکەکان  پلەو پایەی گرنگیان پێدەدرا و بەشێوەیەکی گشتی سەربەخۆیانە پەیڕوەی ئایینی تایبەت بە خۆیان بوون.  موسوڵمانا بیرمان دەخەنەوە مەسیحیەکان نەك موسوڵمانا هەستاون بە دەرکردنی جوولەکەکان لە  ئیسپانیا لە سەدەی پانزەیەمدا، ئەو جوولەکانەی دەژیان لە یەکێك لە سەردەمە زێڕینەکانیانداڵەژێر فەرمانڕەوایی ئیسلامدا لە ئەندەلوس.  بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بەڵگەیە بیرمانە ئیسپانیا و ئەنادۆڵ چەند بابەتێکیان ئاڵوگۆڕ کرد لە هەان کاتدا کە مەسیحیەکانی ئیسپانیا موسوڵمانانیان دەرکرد لە مۆریس لەکاتێکدا سەرکەوتن ئەو شوێنەیان ڕزگار کرد کە دواتر بە دەوڵەتی تورکیا ناسرا.  ئەگەر بەراوردی ڕوداوەکانی هەردو حاڵەتەکەمان کرد دەبینین هەموو موسوڵمانێکی ئەندەلوس یان دەرکراوە لە ئیسپانیا یان سەری پەڕێندراوە بە شمشێر، یان  ناچارکراوە واز لە ئایینەکەی بهێنێت و ببێتە مەسیحی.  لەکاتێکدا کوسی کڵێسای ئۆسۆزکسی ڕۆژهەڵاتی لە ئەستەمبوڵ ماوەتەوە هەتا ئەمڕۆ.  لەڕاستیدا ئەگەر بەدوای جیاوازیا بگەڕێین، ئەوا موسوڵمانان تۆماری مەسیحیەکان بە تۆمارێکی ڕەشتر ناو دەبەن لەم بابەتەدا.

ئەوان دەپرسن کێ بوون ئەو کەسانەی خەڵکی بانگهێشت دەکەن بۆ بەشداریکردن لە جەنگی خاچپەرستەکاندا بەناوی ئەمیری ئاشتیەوە؟ کێ  دادگاکانی پشکنینیان دامەزراند، کەرەستەیەکیان دروستکردبوو بۆ ئازاردان کە جەستەی کەسەکەیان لەسەر دادەنا وە هەرچوار پەلەکەیان دەقرتاند، وە ئامێرێکی تر کە کەسی سسزادراو لەسەری دادەنرا و پەلەکانی ڕادەکێشرا بۆ ئەوەی بپچڕێن و بمرێت و دواتر دەیانسوتاند.  ئەماتنە وەك کەرەستەی ئایین بەکاریان دەهێنان بەم کارەیان ئەوروپایان لەناو برد و نوقمی خوێناوی شەڕێکی ئایینیان کرد؟ مێژوونوسان هاوڕان سەبارەت بە بڕیاردانیان لەبارەی ئەم بابەتەوە.  ئەگەر تۆمارێك دابنرێت سەبارەت بەم بابەتی کەرەستەی ئەشکەنجەدانانە ئەوا تۆماری ئیسلام سیەبارەت بە بەکارهێنانی هێز هیچ کات تاریکتر نەبووە لە تۆماری مەسیحیەکان.

ئەگەر بەراوردکاریەکانمان وەلانا، ئەوا موسوڵمانان ڕازین بەوەی تۆماری تایبەتی ئەوان لەبارەی بەکارهێنانی هێزەوە هیچ کات نمونەیی نەبووە.  هەموو ئایینێك بەکارهێنراوە لەهەندێك لە ئاستەکانیدا بەشێوازێکی خراپ لەلایەن ئەو کەسالنەی شوێنکەوتوی ئەو ئایینەن، بەکاریان هێناوە وەك کەرەستەیەك بۆ داپۆشینی ڕق و کینەیان و دانانی دەمامکێکی ئایینی لەسەری بۆ شاردنەوەی، ئیسلام بێبەری نیە لەم یاسایە.  زۆرجار سەرکردە فێڵبازەکان فرەمانڕەوای دەوڵەت بوون بەهانەی ئایینیان هێناوەتەوە بۆئەوەی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان بەدی بهێنن بەناوی ئایینەوە.  ئەوەی موسوڵمانا ڕەتی دەکەنەوە لەم بابەتەدا دەکرێت کورتبکرێتەوە لە سێخاڵدا:

یەکەم:  ئەوان ڕەتی دەکەنەوە تۆماری ئیسلام دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی تێدابێت زیاتر لە ئایینەکانی تر جگەلە بوزییەت.

دووەم:  ئەوان ڕەتی دەکەنەوە مێژووی ڕۆژئاوا کە دادپەروەرانە لەبارەی ئیسلامەوە قسەیان کردبێت کاتێك دواون لەبارەی بەکارهێنانی هێزەوە لە ئیسلامدا(٣٧).  ئەوانەڵێن وێناکردنیان بۆ بابەتی جهاد هەوڵ و تێکۆشان هەڵەیە.  چونکە جیهاد لەلای ڕۆژئاواییەکان هەمیشە وێنەی دەمارگیرە توڕەکان دروست دەکات کە هانی خەڵ

دەدەن بۆ بەشداری کردن لە جەنگە پیرۆزەکاندا وە بەڵێنیا پێدەدەن ڕاستەوخۆ دەبرێنە ناو بەهەشتئەگەر لەو جەنگەدا کوژران. بەڵام لەڕاستیدا بەم شێوەیە:

١-وشەی جهادواتە بەکارهێنانی وزە، بەڵام کاتێك جەنگ پێویستی بە کاری قورس بێت بەپلەیەکی نمونەیی، ئەوا ئەم وشەیە بەستراوەتەوە بە جەنگەوە لە پڕۆسەی فراوانکردنی ماناکانیدا. مانای ڕاستەقینەی وشەی جیهاد بەکارهێنانی وزە، دواتر کورتنەکراوەتەوە لە کوشتندا بەڵکو دەچێتەناو شێوازە جیاوازەکانی بەکارهێنانی وزەوە لە گوێڕایەڵی ألله و جەنگان لەگەڵ هەوەس و ئارەزوەکاندا، بەکارهێنانی وزە لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیدا بە قەڵەم و زمان و کارەکانی خێر، دواتر وشەی جیهاد هات لە قورئاندا بەم هەموو مانایانەی دواییەوە، زۆر بەکەمی بە مانای کوشت و جەنگان هاتوە.

٢-پێناسەکردنی جەنگە پیرۆزەکان لەئیسلامدا هاوشێوەی پێناسەی جەنگە دادپەروەرانەکانە لە مەسیحیەتدا کە لە مەسیحیەتدا ناودەبرێت بە جەنگی پیرۆز.

٣-مەسیحیەت بەهەمان شێوە ئەو کەسانەی لەو جەنگانەدا دەمرن بە شەهید ناویان دەبات وە بەڵێنی ڕزگاربوونیان پیێ دەدات.

٤-فەرمودەیەکی پیرۆز هەیە کە گواستراوەتەوە لە محمد صلی ألله علیه وسلم کە باسدەکات لە جهاد النفس واتە جەنگردن لەگەڵ نەفس و هەوەس و حەز و ئارەزوەکاندا وە پەلەیەکی بەزی پیێ دەدات زیاتر لە جەنگان دژ بە دوژمنە دەرەکیەکان.

پێغەمبەر صلی ألله علیه وسام دوای ئەوەی لە جەنگ گەڕایەوە کەلەگەڵ سەرانی کوفری ناو مەکە بەجەنگ هاتبوو وتی: ((گەڕاینەوە لە جیهادی بچوکتر بۆ جیهادی گەورەتر))واتە لە جەنگ لەگەڵ دوژمنانی دین بۆ ناو خودی خۆمان.

سێیەم: موسوڵمانان ڕەتی دەکەنەوە پەڵەی ڕەش هەبێت لە تۆمارەکەیاندا کە ئایینەکەیان تاوانباربکات، ئەو ئایینەی نمونە باڵاکەی دەردەکەوێت لە سڵاوکردنی سەرەکیدا السلام علیکم واتە ئاشتەوایی باڵبکێشێت بەسەرتاندا.

## سۆفیگەری

هەتا ئێستا باس لە ئایینی ئیسلام کرا وەك یەك پارچە و خاوەنی یەك دیمەن، بەڵام لەڕاستیدا بەو جۆرە نیە چونکە ئیسلام وەك هەموو ئایینێکی تر دابەشبووە بۆ چەند گروپ و ڕێبازی جیاواز. گروپی سەرەکی مێژوویی بریتیەلە ڕێبازی گشتی سوننەکان ئەهلی سوننە (واتە شوێنکەوتوانی نەریتی پێغەمبەری، مانی وشەی سوننە: واتە خوو نەریتە گوازراوەکان، ڕێژەیان دەگاتە نزیکەی ٨٧٪ی تەواوی موسوڵمانانی جیهان، گروپی دوەەم بریتیەلە شیعە (واتە پشتیوانان و شوێنکەوتوان، بئەم ناوەیان لێنرا چونکە پشتیوانانی عەلی بوون کوڕی مامی محمد صلی ألله علیه و سلم و زاوای پێغەمبەر بوو، ئەم دەستە و تاقمە واتە شیعەکان وابیردەکەنەوە پێویست بوو محمد صلی ألله علیه وسلم دوای مردی ڕاستەوخۆ دەبوایە سەرکردایەتی موسوڵمانانی بسپاردایە بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب، بەڵام سێ جار ئەمە تێپەڕێنرا پێشئەوەی خەڵکی هەڵیبژێرن بۆ سەرکردایەتی، دوای ماوەیەك کوژرا.

لەڕووی جوگرافیەوە شیعەکان کۆبوونەتەوە لە دەوری عێراق و ئێران لەکاتێکدا سوننەکان بڵاوبوونەتەوە لە (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تورکیا/ ئەفەریقا)، بۆ ڕۆژهەڵات (بەناو نیمچە کیشوەری هیندی کە پاکستان و بەنگلادیش دواتر مالیزیا دواتر ئەندەنوسیا کە تەنها بۆ خۆی هێندەی ژمارەی دانیشتوانی وڵاتە عەرەبیەکان موسوڵمانی تێدایە). لێرەدا ئەو جیابوونەوە مێژووییە چڕدەبێتەوە لەدەوری ململانێی ناوەکی سەبارەت بە دەسەڵات، بۆئەوەی لەبری ئەوە دابەشبوونەکان کاریگەری جیهانی هەبێت. ئەمە دابەشبوونێکی ستونیە لەنێوان سۆفیگەری ناوەکی لە ئیسلامدا ئەوەی ناسراوە بە سۆفیگەری، لەنێوان زۆربەی باوەڕدارانداکە وەك موسڵمانی باش دادەنرێن بەڵام سۆفی نین.

وشەی سۆفی لە صوف واتە خوریەوە هاتوە دای سەدەیەك یان دوو سەدە لە مردنی محمد صلی ألله علیه وسلم ئەو کەسانەی هەڵگری پەیامە ناوەکیەکەی ئیسلام بوون ناونران بە سۆفیگەری چونکە زۆربەیان جلوبەرگی خوری زبریان دەپۆشی وەك خۆ جیاکردنەوە لە فەرمانڕەوا و جێنشینەکان کە قوماشی حەریریان دەپۆشی.

ئەوان نیگەران بوون لە نزیککردنەوەی ئایینی زۆربەی خەڵك بۆ ئیسلام(واتە گرنگیدانیان بە لایەنە دونیاییەکان زیاتر لە لایەنە ڕۆحیە قوڵەکانی ئایینی ئیسلام) هەوڵیاندا ڕۆحی ئیسلام پاکبکەنەوە لە ناخەوە. ویستیان سەرلەنوێ سەربەخۆیی و خۆشەویستیەکەی بەدەستبهێنێتەوە، وە تامو چێژەکەی جارانی بۆ بگەڕێننەوە.

پێویستە دیاردەکان بچنە ناو کارە ناوەکیەکانەوە، ماددە بۆ مانا، هێمای دەرەکی بۆ ڕاستی ناوەکی، ئەوان دەیانوت: دەفرەکەت کەمتر خۆشبوێت زیاتر گرنگی بدە بەو ئاوەی لەناویدایە.

سۆفیگەری وا دەبینێت ئەم جیاوازیە لەنێوان ناوەوە و دەرەوەدا، لەنێوان ئاو و ئەو دەفرەی تێیدایە، بیرۆکەکە پێکهاتوە لە خودی قورئان، کە ألله خۆی پێشکەش دەکات کە (هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿الحديد: ٣﴾). موسوڵمانان ڕازی نین بە جیاکردنەوەیە بەڵام سۆفیەکان وەك جیاوازیەکی گرنگ بینیان.

تێڕامان لە ألله شوێنێکی گرنگی هەیە لەناو ژیانی هەموو موسوڵمانێکدا، بەڵام سەبارەت بە زۆربەی خەڵك، ئەم تێڕامان و پەرستنە ڕکابەری دەکات لەگەڵ داواکاریەکانی تری ژیاندا لەسەر کاتی موسوڵمان بەشێوەیەکی یەکسان. ئەگەر بۆمان زیادکرد کە ژیان پێویستی بە کاتێکی زیاتر هەیە ئەوا ڕاستترە بڵێین هەموو موسوڵمانێك کاتی پێویستی نیە بۆئەوەی شتێکی زیادە بکەن بۆ پاراستنی شەرع کە ژیان ڕێکدەخات. بیروباوەڕ و ئیمان و دڵسۆزیان کارێکی بێ سود نیە، بەڵکو پاداشتی ئەو کارە وەردەگرن لە کۆتاییدا، پاداشتێکی گەورە بە

هاوشێوەی پاداشتی سۆفیگەری. بەڵام سۆفیگەری زیاتر بە پەرۆش بوو و کەتر خۆڕاگربوو بۆ گەیشتن بەم پاداشتە. ئەوان دەیانویست بگەن بە أللە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەم ژیانەی ئێستایاندا.
ئەمە پێویستی بە پەرەپێدانی ڕێگاکەیان بوو لە پەیڕەویکردنی ئەم ڕێگایانە لەبارەی سەرکردە ڕۆحیەکان شێخەکان، چەند ئەڵقەیەکیان دروستکردوە لە سەدەی دوانزەیەمی زایینیەوە هەتا ئەمڕۆ لەسەر شێوەی چەند ڕێباز و تەریقەتێك، ئەندامی ئەم تەریقەتانە ناوی الفقیر مسکێنە واتە ئەو مرۆڤەی خاوەنی ماڵ و پارە نیە، بەڵام مانایەکی تری هەیە واتە هەژار لەڕۆحدا ملکەچ بۆ ویستی أللە. وێڕای ئەوە ئەم فەقیرانە دەیانەوێت زیاتر پابەندبن بە سیستمی ژیانێکی قورسترەوە کە ئامانجەکەی زیاتر ڕۆحانیە. دەکرێت ئەم ڕێگایە بچوێنرێت بە گروپی ڕاهیبەکانی مەسیحیەتی کاسۆلیکی کە سەرقاڵی تێڕامانن. بەڵام لە سۆفیگەریدا ژن هێنان هەیە بەپێچەوانەی ڕاهیبەکان، وە هەروەها گۆرشەگیر نین و لە ژیانی گشتی جیانابنەوە بەڵکو ژیانی سروشتی خۆیان بەسەر دەبەن لە کاری جۆراوجۆردا بەشداری دەکەن وەك کەسانی ئاسایی، هەڵدەستن بە نوێژەنکردنەوە و خزمەتکردنی خەنەقاکانیان بۆئەوەی هەستن بە زیکر و دۆعا و خوێندنەوەی سرودە ئایینیەکان بەشێوەی کۆمەڵ و بەدەنگی بەرز، گوێگرتن لە وانە و وتاری شێخەکانیان، هەموو ئەمانە بە ئامانجی گەیشتن بە أللە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. دەڵێن ئەو مرۆڤەی ئاگای لە ئاگر نیە دەکرێت بە چەند پلەیەك بیناسێتەوە: پلەی یەکەم لەبارەیەوە ببیستێت، پلەی دووەم ببینێت، پلەی کۆتایی بسوتێت بەهۆی گەرمیەکەیەوە. سۆفیەکان ویستیان بسوتێن بە شەوق و دیداری أللە.
ئەمە دبەستە سۆفیگەری سێ تەریقەتی پێکهێنا. دەشێت ئەم تەریقەتانە ناوبنرێت بە سۆفیگەری خۆشەویستی و سۆفیگەری مەستی و سۆفیگەری ژیری.
ئەگەر بە یەکەم تەریقەت دەستمان پێکرد دەڵێین عیشقی سۆفیگەری بۆ سرودە ئایینیەکان بەناوبانگە لە هەموو جیهاندا. ئافرەتێکی پیرۆزی دیار دەرکەوت لە سەدەی هەشتی زایینیدا ناوی رابعە العدویە بوو لە شەونخونی و بێداری دا بەتەنها هەندێکجار بە درێژایی شەو بێدار دەبوو. خۆشەویستی أللە بوونی هەیە لە ڕاستی گەردوندا، مرۆڤ ئەگەر هەست بەو خۆشەویستیە نەکات و تیایدا ڕۆنەچێت وەدواتر ڕەنگدانەوەی نەبێت لەو کەسەوە بۆ ئەوانی تر ئەوا جوانی شکۆداری ژیانی لەدەست داوە. لەبەرئەوەی خۆشەویستی ڕوونترە کاتێك دڵدار و خۆشویستراوە ئامادەنیە، بەخۆرێك تاسە و تامەزرۆیی دووری ئەو هەستەکان دێنێتە جۆش هەتا ڕادەیەك ناتوانرێت بیرکردنەوە لە خۆشەویست لەیادبکرێت. بۆ ئەم مەبەستە شاعیرانی فارس چەند هۆنراوەیەکی دابڕانیان نوسیوە بۆ قووڵکردنەوەی خۆشەویستیان بۆ أللە و زیاتر نزیك ببنەوە لێی. لەم بەکارهێنانەدا جلال الدین رومی دەنگێکی سکاڵاکەرە بۆ نەی بۆئەوەی ئەم بابەتە هێمابکات وتویەتی:
گوێبگرە لە چیرۆکی شمشاڵ چۆن دەدوێت و لەبارەی دابڕانەوە سکاڵ دەکات،
لەو کاتەی بڕدراوە لە دارستانی قامیشەکان هەموو پیاو و ژنێك یەکتریان خۆشدەویێت بەهۆی ناڵەو دەنگمەوە، سنگێکم دەوێتدابڕان ئازاری دابێت، تەنها ئەوە تێدەگات لەوەی دەیڵێم لە ئازارەکانی تامەزرۆیی و تاسەی هەموو مرۆڤێك کە دوور خرابێتەوە لە سەرچاوەی جێگە ڕەسەنەکەی، ئارەزووی گەڕانەوە بکات بۆ گەڕانەوە بۆ زەمەن و کاتی جارانی،
گریان و شینی شمشاڵ کە بڕدراوە و جیاکراوەتەوە لە کەناری ڕووبارەکە، بەپێی ئەمە بۆ جیابوونەوەی ڕۆح لە سەرچاوە پیرۆزە یەزدانیەکەی، ئەمە سۆفیگەری خستە حاڵەتێك لە وروژان و ئازارەوە. هیچ شتێك لە بووندا ناتوانێت ئەو ئازارانە کەمبکاتەوە جگەلە خۆشەویستی بێ وێنە أللە زۆر مەزن باڵادەست بەسەر هەمواندا کە وا

له خۆشەویستی مرۆیی دەکات وەك خۆشەویستی بولبول بێت بۆ گوڵ یان خۆشەویستی بولبول بێت بۆ گوڵ.
وێڕای ئەوە رومی دڵنیامان دەکاتەوە کە مرۆڤ ئەو خۆشەویستیە بەدەست دەهێنێت وەك دەرئەنجامی پاداشتێك، دەڵێت:
هەرگیز ناتوانێت خۆشەویستی بکات و داوا بکات بەبێ ئەوەی ئەویش بە هەمان شێوە داواکراو بێت لەلایەن خۆشەویستەکەیەوە. کاتێك هەورەبروسکەی خۆشەویستی دەدات لەو دڵ، بزانە خۆشەویستیەك هەیە لەو دڵەدا، زۆر ئاگاداربە لەو دەقەی کە دەڵێت: ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿المائدة: ٥٤﴾)).
بەڵام ڕاستی تەواو هێشتا نەزانراوە و دەرکی پێنەکراوە، چونکە ألله بوونەوەرەکانی خۆشدەوێت زۆر زیاتر لەوەی کە خۆشیان دەوێت. ألله لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەڵێت: ((ئەگەر بەندەکەم بستێك لێم نزیك بێتەوە من گەزێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بە ڕۆیشتن هات بۆ لام بە ڕاکردن دێمە بەرەو لای))(٣٨). رابعە العدویە باس لە بەیەکگەیشتنی نێوان ئەو دوو ڕۆحە دەکات یەکێکیان سنوردارە و ئەوی تر بێسنورە:
ئەی پەروەرێنم ئەی یەزدان!چاوەکان خەوتن ئەستێرەکان دیارنەمان جووڵەی باڵندەکان کەمبوویەوە لە هێلانەکانیاندا، دڕندەکان چونەوە ناو جێگەی حەوانەوەیان. تۆ ئەو دادپەروەریەی کە گۆڕانی بەسەردا نایەت ەتا هەتایە دەمێنێت فەنابوونی نیە. پادشاکان دەرگاکانیان داخست لەرێگەی پاسەوانەکانیانەوە، بەڵام دەرگاکانی تۆ کراوەن بۆ داواکاران. ئەی پەروەردگارم! هەموو خۆشەویستێك لەگەڵ دڵدارەکەیدایە ئەوا من تەنهام لە نێو دەستەکانتدام.
جۆری دووەم لە نزیکبوونەوەی سۆفیگەری لە حزوری یەزدانی ناومانننا بە مەستی واتە حاڵەتی چوونەدرەوەی مرۆڤ لە خودی خۆی، چونکە ئەم ڕێگایە دەرگایەك دەکاتەو بۆ ئەزمون و شارەزایی جیاواز لە لێهاتوویی ئاسایی، تەنها بەپلە نا بەڵکو لەڕووی جۆرەوە. گەشتی شەڕەی پێغەمبەر صلی ألله علیه وسلم بۆ حەوت ئاسمانەکە بۆ حزۆری پیرۆزی ئیلاهی، ئەو شتەیە سۆفیگەری بەکاری دەهێنێت لەم بوارەدا. هیچ کەسێك ناوتوانێت بڵێت پێغەمەبر صلی ألله علیه وسلم دەرکی بە چی کرد لەو ئاسمانانەدا لەو شەوەدا بەڵام دەتوانین دڵنیا بین لەوەی بینینەکانی نمونەیی بوون. سۆفیەکان ناڵێن ئەو شتانەیان بینیوە کە محمد صلی ألله علیه وسلم بینیوسیەتی لەو شەدوەدا بەڵام بەو ئاڕاستەیە دەجوڵێن زۆرجار وایان لێدێت نازانن کێن؟ و لەکوێن؟ و چیان بەسەر هاتوە؟. لە دەستەواژەی دەروونناسیدا گۆشەگیر دەبن و بەتەواوی بێئاگا دەبن لە جیهان بەربەراورد بە مرۆڤ کە هەستی پێ دەکات لە حاڵەتی سروشتیدا.
ئەو حاجیانەی گەشتیان کردوە بۆئەوی‌ەی چاویان بکەوێت بەو کەسانەی سەرقاڵ ئەم جۆرە سۆفیگەریەن دەگێڕنەوە لەڕووی بێڕێزیەوە نا بەڵکو لەڕووی سەرقاڵبوونیانەوە دەڵێن هەستمان بە بوونیان نەکردوە چونکە چونەتە درەوە لە ژیان و ئەوەی تێیدایە. هەوڵدان بۆ گەیشتن بەم حاڵەتە. حاجیەك دەگێڕێتەوە کە هەوڵیداوە بۆ چواکەوتن بە یەکێك لەو کەسانە ی سەرقاڵی ئەم شێوازەن لە سۆفیگەری بەناوی نوری دەگێڕێتەوە حاڵەتی ئەم کەسە بەجۆرێك بوو تەنانەت یەك موو لە لەشی جووڵەی نەدەکرد. دەڵێت: ((کاتێك پرسیارم لێکرد لەکێوە ئەم تێڕامانە قووڵ فێر بوویت وتی: لە پشیلەیەکەوە کە لەبەردەم کونی مشکێك وەستابوو بەڵام تێڕامان و چەقبیینی ئەو زیاتر بوو لە هی من!))(٣٩). وێڕای ئەوە کاتێك دەگەن بەو حاڵەتە کەسەکە هەستی پێ دەکات وەك بەخشین و دیاریەك. ئەو ڕستەیەی لاهوتی سۆفیگەری بەکاری دەهێنێت بریتیەلە: بەزەیی ڕژێنراو

بەتەواوی لەجێی خۆیدایە. چونکە سۆفیگەری وادەبینێت لەگەڵ هەستکردنیان بە گۆڕان هەست دەکەن بەوەی ئیرادە و ویستیان هەڵواسراوە و ألله کۆنترۆڵی دەکات. سۆفیگەری شەو کەسانەی بەرەو لای خۆی کێشیان دەکات ڕێزیان لێدەگرێت، بەڵام کاتێك بە کەسانی بێئاگا ناودەبرێن حەز دەکەن بگەڕێنەوە سەر ئەو حاڵەتەی کە خۆیانی تیادا دەبینن، واتە حاڵەتی بە ئاگاییئەگەر بمانەوێت زمانێکی ئاسان بەکاربهێنین دەڵێین بەرزبوونەوە پێویستە گەوهەری بێت و جودا بێت واتە کورتکراوەبێت لەسەر ئاگایی و ئەقڵ. واتە ألله کە پێی دەگەین جودا لە جیهان پێویبستە هەستی پێبکەین یان پێی بگەین لە چوارچێوەی جیهاندا بە هەمان شێوە. لەم حاڵەتەی دوایی پێویستی بی مەستی و خۆشەویستی نیە بەڵکو ڕێگایەکی ڕاستەوخۆیە پێویستە پەروەردە بکرێت لەناو خودی مرۆڤەکاندا وە ئەمە دەمانبات بەرەو نزیککردنەوەی سێیەم کەبریتیەلە ڕێگای ژیری دەرکپێکەر.

ئەم ڕێگایە وەك دوو ڕێگاکەی تر زانیاری بۆ مرۆڤ دەهێنێت بەجۆرێکی جیاواز، چونکە عیشقی سۆفیگەری دەبێتەهۆی زانینی ناو دڵ، خۆشەویستی و مەستی زانینی هێزی تێگەیشتن، چونکە تیایدا ڕاستیەکان نابینرێن بەڵام سۆفیگەری دەرکپێکردن زانینی ئەقڵانی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت کە سۆفیگەری ناوی دەنێت بەو زانینەی بەدەست دێت لەڕێگەی ئەندامێکەوە ناوی دەبات بە چاوی دڵ(٤٠). کاتێك ڕاستیەکان بە زانین بەدەست بێنئەوا چاوی دڵ مادی نیە چونکە ڕکابەری ناکات لەگەڵ چاوی جەستەیی بینراو کەلە حاڵەتی کارکردنی سروشتیدا دەمێنێتەوە بۆ بینینی شتە مادیەکان. ئەو کارەی ئەنجامی دەدات شتەکان دادەپۆشێت بە ڕوناکیەکی ئاسمانی.

ڕێگای سەرەکی کە سۆفیگەری بەکاری دەهێنێت بۆ تێپەڕاندنی ئەم نواندنە بریتیە لە دەستنیشانکردن بە هێما ئەوان شتە بینراوەکان بەکاردەهێنن بۆ قسەکردن لەبارەی شتە نەبینراوەکانەوە. دەستنیشان کردنی شتەکان بە هێما بەشێوەیەکی گشتی زمانی ئایینە ئەمە سەبارەت بە ئایین وەك ژمارەکانە بۆ زانست. بەڵام سۆفیەکان بەکاری دەهێنن بە پلەی نمونەیی، چونکە لەبری ئەوەی بوەستێت لەلای شتێکی ڕۆحیدا کە بە هێما ئاماژەی بۆ دەکات ئەوان بەکاری دەهێنن وەك ڕێگایەك بۆ گەیشتن بە شتێکی بڵندترتێکی جیاوازی ڕاستیدا. سۆفیگەری دەڵێت هەموو ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان بەلایەنی کەمەوە حەوت مانای ناوەکی لەخۆدەگرێت دەشێت ئەم ژمارەیە بگات بە حەفتا مانا.

بۆ ڕوونکردنەوەیئەم خاڵە دەڵێین: سەبارەت بە هەموو موسوڵمانان داکەندنی پێڵاو پێشچوونە ناو شوێنی نوێژکردنی ناو مزگەوت وەك هێمایەکە بۆ مزگەوت بە پیرۆز زانینی، ئەمە هێمایەکە بۆ قەدەغەکردنی هێنانە ژوورەوەی ژاوەژاو لە دەرەوە بۆ ناو ئەو شوێنە پیرۆزەی تەرخانکراوە بۆ خوداپەرستی. سۆفی ئەم هێمایە قوبوڵ دەکات بەشێوەیەکی گشتی بەڵام بەردەوام دەبێت لەسەری بۆ ئەوەی لەم کارەدا مانایەکی تر ببینێت کە خۆی دەبینێتەوە لە هەموو ئەو شتە نامۆیانەی پەیوەندی نێوان ڕۆح و ألله دەپچڕێنێت. بۆ نمونە داوای لێخۆشبوون استغفار هەموو موسوڵمانێك داوای لێخۆشبوون دەکات لە ألله هەتا لە تاوانەکانی خۆش ببێت بە تایبەتی، بەڵام سۆفی کاتێك وشەی استغفار دەڵێت أستغفر ألله العظيم ئەوا تکادەکات وەك داوایەکی زیادکراو هەتا خودا لێی خۆش ببێت وەك بوونێکی جودابوو لە ألله. ئەمە لەوانەیە نامۆ بێتە بەرچاو. بەڵام لەڕاستیدا موسوڵمانای ڕووکەش لەمە تێناگات. بەڵام سۆفیگەری درێژکردنەویەکی تیادا دەبینێت بۆ فێرکاری رابعە العدويه کاتێك وتی: ((خودی بوونت بۆ خۆی تاوانێکە، بەراورد ناکرێت بە هیچ تاوانێکی تر)). چونکە وشەی ex-istence بەو مانایە دێت کە مرۆڤ لە دەرەوەی شتێکی دیاریکراو بێت. ئەو شتە لەم نمونەیەدا بریتیەلە ألله، چونکە خودی بوونی ex-istence جودابوونەوەیە.

بۆ خۆپاراستن لەم جودابوونەوەیە سۆفیگەری پەریداوە بە بیروباوەڕی فەنابوون، بۆئەوەی ببێتە پێناسەیەکی لۆژیکی بۆ هەوڵەکانیان، ئەوان سرودناڵێن بۆئەوەی بێئگابن، بەڵکو بۆ کۆتایی هێنان بە ئاگایی ناو خودی خۆیان، واتە ئاگایی مرۆڤ وەك خودێکی جودای ڕۆچوو لەناو خشتەی کارەکانی. دەڵێن ئەگەر ئەم فەنابوونە بهێنرێتە دی ئەوا سەیری ناو خودی خۆیان دەکەن کە بەتاڵکراوە لە هەوەس و حەزەکانیان وەك هیچی تیادا نادۆزنەوە جگەلە خۆشەویستی ألله. سۆفیەکی مەسیحی ئەم خاڵە ڕوون دەکاتەوە بەم ڕستەیە:
ألله کە خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی بێسنورە لە هەمخو شوێنێکدا بوونیان هەیە، ناکرێت بێت بۆ سەردانت تەنها کاتێك نەبێت کە خودی تۆ لەوێدایت. (ئەنجیلوس سیلیسیوس).
دەتوانین ئاماژە بکەین بۆ ڕێگای فشاردانانیان بۆ شایەتمانی ئیمانی کە دەڵێت لا الە الا ألله بۆئەوەی ماناکەی بەم شیوەیە بێت هیچ شتێك بوونی نیە جگەلە ألله. ئەمە بێمانا دێتە بەرچاو بۆ موسوڵمانی ڕووکەش، ئەگەر بەڵکو بێمانابوونی لەبەرئەوەیە کە زۆر شت هەن لەبووندا مانایەی خوێندنەوەی سۆفیگەری بۆ ئەم ڕستەیە وەك ڕەتکردنەوەیە بۆ تایبەتمەندی و سیفەتی دروستکردن لەلایەن ألله. بەڵام سۆڤ مەبەستی لەوەیە باس لەو سەربەخۆییە بکات کە خەڵکی دەیدەنە پاڵ شتەکان و گومانی ئەوە دەبەن کە سەربەخۆ بێت و پەیوەندی بە ألله نەبێت. یەکتاپەرستی سەبارەت بە ئەوان بە مانای شتێك لە بیرۆکە زیاتر دێت کە دەڵێت دوو خودا بوونیان نیە، ئەمە بیرۆکەیەکە بە شتێکی ڕوونی دادەنێن. کاتێك بەرزدەبنەوە بۆ مانای بوونی ئیمان بە ألله ئەوا ڕازی دەبن بەوەی پێویستە هیچ نەدەین بە خۆمان جگە لەوەی بەندایەتی بکەین بۆ ألله ی تاکوتەنها. بەڵام دەڵێن ئێمە دەستمان گرتوە بە مانای تەواوی ئەو ڕستەیە تەنها کاتێك نەبێت کە هەسدەسێت بە پێدانی شتی تر بە خۆمان کاتێك ڕێگە دەدەین بەو شتانە کە سەرقاڵمان بکەن. بۆنمونە کاتێك بیردەکەینەوە لەوەی ڕوناکی بەهۆی کارەباوەیە ئەوا لەڕووی بیروباوەڕەوە هاوەڵمان بۆ ألله داناوە شرك چونکە ألله بەتەنها کارەکان بەڕێوە دەبات پێویستی بە هاوەڵ و یارمەتیدەر نیە.
هێمادارکرن وێڕای هێزەکەی زۆرجار کاردەکات بسەربەخۆیانە کاردەکات، لەبەرئەوە سۆفیگەری تەواوی دەکەن بە یادکردنەوەی ألله زیکر بەوەی یادی ألله دەکەنەوە بە دووبارەکردنەوەی ناوی ألله. فەرمودەیەکی پێغەمبەر صلی ألله علیە وسلم ئەمە دووپات دەکاتەوە ((هەموو شتێك پێویستی بە ڕەونەقپێدانەوە هەیە، پۆڵیشکردن و ڕەونەقپێدانی دڵەکان بە زیکر و یادکردنەوەی ألله دەبێت)) واتە هەموو شتێك کە ژەنگ هەڵدەهێنێت شتێك هەیە بۆ پۆڵیشکردن و دوبارە ڕەونەقپێدانەوەی. ئەو شتەی ژەنگی سەر دڵەکان لادەبات یادکردنەوەی ألله یە.
یادکردنەوەی ألله لە هەمان کاتدا خۆنەویستی و لەبیرکردنی خوودە لەبەرئەوە سۆفیگەری بریتیەلە دوبارە کردنەوەی ناوی ألله وەك باشترین کەرەستە بۆ ئاگادارکردنی خود بەرەو ألله. ئەگەر ناوی ألله بە تەنها بهێنن یان بە کۆمەڵ، بە دەنگی بەرز بێت یان نزم، ئەوان هەوڵ دەدەن هەموو ساتێکی بەتاڵی ڕۆژانەیان پڕبکەنەوە بە زیکری ألله. دواجار ئەم کارە لە ئەقڵی نائاگاییدا بە جۆرێك دەبێت کە زیکر و یادی ألله لێی هەڵدەقوڵێت زۆر بە ئاسانی وەك جریوەی بولبولەکان.
لەو بابەتانەی پێشودا باسمان لە مانا و گەوهەری سۆفیگەری لەڕووی ناوەڕۆکەوە، بەڵام باسی ئەوە نەکراوە بۆچی ئەم بەشە بەستراوەتەوە بە دابەشبونەکانی نێو ئیسلام؟ لەوەڵامدا دەڵێین چونکە لەلای موسوڵمانان دوو ڕای جیاواز هەیە سەبارەت بە سۆفیگەری. ئەمە بەهۆی ئەوەیە خودی سۆفیگەری تێکەڵەیەکە. بەدەستپێکردن بە بنەمای ئەوەی شکۆدار ئەوانەی خوار خۆیان ڕادەکێشن بۆلای خۆیان سۆفیگەری هەندێك کات کەسانی بێ نرخ و بایەخ کۆبوونەتەوە لە سۆفیگەری بە هیچ جۆرێك سۆڤ نەبوون تەنها بەناو نەبێت بۆ نمونە هەندێك لە

تەریقەتەکانی سۆفیگەری دەڵێت هەژاری و سواڵکردن وەك سیستمێکی پەروەردەییە، بەڵام لە هاوشێوەیەی ئەو ڕێگایانەدا تەنها هەنگاوێك مابوو لەنێوان سۆفیە ڕاستەقینەکان و سواڵکەرە ڕاستەقینەکان کە هیچ پەیوەندیەکیان نیە بە ڕاستی سۆفیگەرەیەوە تەنها بە ناو نەبێت. هەروەها هەندێك جار سیاسەت دەستتێوەردانی هەبوە لەم بابەتانەدا. لەم دواییانەدا هەندێك کۆمەڵە دەرکەوتن لە ڕۆژئاوا خۆیان ناونا بە سۆفیگەری وێڕای ئەوەی هیچ پەیوەندیەکیان نیە بە بیروباوەڕی پیرۆزی ئایینی ئیسلامەوە.
سروشتیە ئەم لادانانە ببینین لەنێوان ئەوانەی ڕەتی دەکاتەوە، بەڵام ئەم کارە کورتنەکراوەتەوە لەسەر ڕەخنەگرتن لەو لادانانە بەڵکو تەنانەت سۆفیگەری ڕەسەن لە بنەڕەتدا جێگەی ناکۆکی و ململانێی نێوان موسوڵمانان بوو لەنێوان ئەوانەی ڕەتی دەکەنەوە وئەوانەی قوبووڵی دەکەن. بۆچی؟ لەبەرئەوەی سۆفیگەری خۆرێك لە سەربەخۆیی تێدایە ویژدانی موسوڵمانەکان ناتوانێت قوبوڵی بکەن. کاتێك سۆفیەکان ئاسمانیان بینی لەڕێگەی پەنجەرەی سەقفی بیروباوەڕی ئیسلامی کلتوریەوە باوەڕیان وابوو چەندین ئاسمانی تر هەن کە ڕێگەدراوە بکرێنەوە هەتا ببینرێن. کاتێك جلال الدینی رومی ئەمەی دوپات کردەوە: ((من نە موسوڵمانم نە نەصرانی نە جوولەکە نە زەردەشتی، نە لە زەویم نە لە ئاسمان، نە جەستەم نە ڕۆحم))، دەتوانین تێبگەین لەوەی ترسی موسوڵمانە ڕووکەشەکان لەوە بوو بیروباوەڕە چەسپاوەکەیان لابدات لەو سنورەی ڕێگەپێدراوە، بەڵکو پشتڕاستکردنەوەی ابن عربی هەژاندنی زیاتری بیروباوەڕی تێدابوو کاتێك وتی:

دڵم وای لێهاتوە شایەنی هەموو وێنەیەك بێت چونکە لەوەڕگایە بۆ ئاسکەکان و پەرستگایە بۆ ڕاهیبەکان

ماڵێکە بۆ بتەکان و کەعبەیە بۆ زیارەتکاران ڕاپەڕەکانی تەوراتە و پەڕەکانی قورئانە

باوەڕم بە ئایینی خۆشەویستیە و ڕووم کردوەتە بارگەکانی چونکە خۆشەویستی ئایینمە و بیروباوەڕمە

هەروەها سەبارەت بە جەختکردنەوەی هەلاج کە لەسەر حەقە کاتێك دەڵێت: من حەقم، من حەقم واتە من أللە م(٤١)، چونکە هەموو شیکردنەوەکانی سۆفیگەری کە ویستویەتی ڕوونی بکاتەوە ئەو ویستویەتی ئاماژە بکات بۆ گەوهەری ئیلاهی، ئەوانەی ئەم وتانەیان بیست وەك کوفر وایە. سۆفیگەری ئەو سنورانە دەبەزێنێت کە ئیمانی باوەڕدار دەپارێزێت. بەم کارە دەجولێت بەرەو ناوچەیەك کە سنوری نیە، ئەمە ناوچەیەکە تێربوون و کامڵبون بۆ هەندێکیان دەهێنێت، بەڵام مەترسیە بۆ سەر ئەوانەی ئامادەنین بۆ ڕێنماییەکانی. بەبێ ئەوەی سۆفیگەری ماناکانی بیروباوەڕی ئایینی ڕەتبکاتەوە کە باوەڕداری ئاسایی وەك ڕاستی حاشاهەڵنەگر.
سوفیەکان لە ئازادی و بیروڕادا سەربەستن بەڵام باوەڕدارە ئاساییەکان بنەمای ئاساییان هەیە کە هیچ تەمومژێکی تیادا نیە، بۆ ڕزگاربوون بیروباوەڕیان بۆ ئەو ڕێنماییانە لاوازە وەك گاڵتەجاڕی دێتەبەرچاو لەبەرئەم هۆکارە زۆربەی شێخەکان بەشێك لەبیروباوەڕیان تەنها بەو کەسانە دەڵێن کە باوەڕیان پێیەتی. ئەمە ئەو هۆکارەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ڕەوتە ئایینیەکان سەیری سۆفیگەری دەکەن بە گومانەوە. جۆرێك لە شڵەژان هەیە کە بەدرێژایی سەدەکان ماوەتەوە لەنێو دەسەڵاتە ئایینیەکانی نێو سۆفیگەریەوە. بەڵام ڕێبازێکی ناوەکی کە دژ بە سۆفیگەریە یارمەتی کۆمەڵگا ئیسلامیەکانی داوە بۆ جڵەوگیرکردنی سۆفیگەری، بەبێئەوەی ئەم ڕێبازە توانای تەواوی هەبێت بۆ ڕێگەگرتن لە گرتنەبەری ڕێگەی سۆفیگەری.

بەگشتی ڕێبازی ناوەکی و ڕووکەش کاریان بریتیەلە هاوسەنگ ڕاگرتنی ڕاستی لە ئیسلامدا بەڵام ئەم بەشە لەم کتێبەدا دوا وتە دەهێڵێتەوە بۆ ڕێبازی ناوەکی سۆفیگەری.

یەکێك لە کەرەستە فێرکاریەکان کە شوێنکەوتوانی ئەم ڕێبازەی پێ دەناسرێتەوە کە هێشتا ئاماژەمان بۆ نەکردوە بریتیەلە بەکارهێنانی سۆفیگەری بۆ هونەری گێڕانەی بیرۆکەکانیان ئەم چیرۆکە بیروباوەڕی سۆفیگەری دەخاتەڕوو لە فەنابووندا واتە بەرزبوونەوی دەرونی سنوردار بۆ فەنابوون و توانەوەی لە ألله.

((کانیاوێك دەهاتە خوارەوە لە شاخێکی دوور تێدەپەڕی بەناو شوێنە جیاوازەکانی شاردا دواجار گەیشت بە لمی بیابان. وەك ئەو هەموو شوێنانەی بڕیبوو بە هەمنا شێوە لێەدا هەوڵی دا ئەم دوا بەربەستە ببڕێت، بەڵام هەستی بەوە کرد هەرچەندە بەخێرایی بڕوات بەناو لمەکەدا ئاوەکەی بڵاو دەبوویەوە، وێڕای ئەوە باوەڕی بەوە هەبوو ئەمە چارەنوسیەتی دەبێت بەم بیابانەدا تێپەڕ ببێت، بەڵام ڕێگای تێپەڕینەکەی نەدەزانی. لەو ساتەدا دەنگێك لە دەرەوەیبیابانەکە هات و وتی: با بیابانەکان دەبڕێت بەهەمان شێوە کانیاوەکان دەتوانن ببڕن و پیایدا تێپەڕبن.

کاتێك کانیاوەکە ڕەتی ئەم دەنگەی دایەوە وتی: من تەنها بەسەر ڕووی لمەکەدا تێدەپەڕم دەبینم ئاوەکەم هەڵدەمژرێت لەکاتێکدا با بە ئاسماندا دەفڕێت ئەمە وای لێدەکات بە بیابانەکاندا تێپەڕ ببێت، ئیتر من چۆن بتوانم وەك ئەو بم؟؟

دەنگەکە لە وەڵامدا پێی وت: بەهەمان ئەو ڕۆیشتنەی پێی ڕاهاتوویت ناتوانیت تێبپەڕیت چونکە بەم جۆرە یان لەلایەن لمەکەوە هەڵدەمژرێیت یان دەبیتە زۆنگاو دەبێت ڕێگە بدەیت بە با بتبات بۆ ئەو جێگایەی مەبەستت ڕۆیشتنە بۆی.

بەڵام چۆن ئەم کارە ڕوودەدات؟

دەنگەکە لە وەڵامدا پێی وت: بەوەی ڕێگە بدەیت بە با ئاوەکەت هەڵبمژێتز

کانیاوەکە بەم بیرۆکەیە ڕازی نەبوو چونکە دواجار نەیدەویست لەلایەن هیچ یەکێك لەوانە هەڵبمژرێت، چونکە نەیدەویست سەربەخۆییەکەی لەدەست بدات.

لەو کاتەی سەربەخۆییەکەی لەدەست دەدات چۆن دەتوانێت ئەوە مسۆگەر بکات دوبارە بگەڕێتەوە سەر حاڵەتی پێشووی یان لەدەستی بدات بۆ هەمیشە؟.

لم وتی: با دەتوانێت بەم کارە هەستێت ئاوەکە بەرز دەکاتەوە لەسەر شێوەی هەڵم دواتر ڕێگەی پێدەدات بکەوێتەوە سەر زەوی لەسەر شێوەی دڵۆپە ئاوی باران بەم جۆرە دوبارە دەبێتەوە بە کانیاو.

چۆن دڵنیابم لەوەی ڕاستگۆیت لە قسەکانتدا؟

چونکە ئەگەر باوەڕم پێنەکەیت دواجار دەبیتە زۆنگاوێك. تەنانەت ئەمە پێیستی بە چەند ساڵێکە. دواجار زۆنگاو دوبارە نابێتەوە بە کانیاو.

بەڵام ناکرێت وەك کانیاوێك بمێنمەوە؟

بیابان بە چرپەوە پێی وت: تۆ بەهیچ یەکێك لەو حاڵەتانە ناتوانیت وەك خۆت بمێنیتەوە لەبەرئەوە بەشە سەرەکیەکەت بۆ شوێنێکی دوور دەبرێت، دواجار کانیاوێك پێکدەهێنێتەوە بە هەمان ناوی خۆت ناودەبرێیت چونکە هەتا ئەمڕۆ نازانین کام بەشت سەرەکیە

کاتێك کانیاوەکە گوێی لەم قسانە بوو تێگەیشت ڕێگەیەکی تری لەبەردەمدا نیە بۆیە بوو بە هەڵم با لەگەڵ خۆی بردیبۆ شوێنە بڵندەکان کاتێك گەیشتە لوتکەی شاخێك بوو بە باران و گەڕایەوە سەر شێوەیەکەی سەرەتای
لەو کاتەدا کانیاوەکە وتی: بەڵێ ئێستا فێربووم ناسنامە ڕاستەقینەکەم کامەیە
کانیاوەکە لە حاڵەتی فێربووندا بوو بەڵام لمەکە پێی وت: ئێمەین کە ئەو شتانە دەزانین، چونکە ڕۆژانە لەبەرچاوماندا ڕوودەدات چونکە درێژدەبینەوە شانبەشانی ڕوبار بە درێژایی ڕێگاکە بە ئاڕاستەی شاخەکە ئەمە بۆمان ڕون دەکاتەوە بۆچی وتراوە ئەو ڕێگایەی پێویستە کانیاوی ژیان بیبڕێت و بەردەوام بێت تیایدا بۆی نوسراوە گەشت بکات بەسەر بیاباندا))(٤٢).

## ئیسلام بەرەو کوێ؟[٧]

بۆ ماوەیەکی دورو درێژ لەو کاتەوەی محمد صلی ألله علیه وسلم گەلەکەی بانگکرد بۆ یەکتاپەرستی و تەنها ألله بپەرستن، موسوڵمانان ڕۆحی پێغەمبەرەکەیان بە گەورە زانی بەسەرسامیەوە سەیریان دەکرد. سەرکردەکانیان یەکەم کەس بوون دانیان بەوەدا نا پەیڕەوی کردنی ئەمە دواتر گۆڕدرا بۆ تەنها دانپیانان بە ئیمان، ئەو جۆش و ڕۆشە لاواز بوو بەرەو کەمی چوو.

بەڵام ئەگەر سەیری ئیسلاممان کرد بەشێوەیەکی گشتی، ئەوا دەبینین ئەم ئایینە جوانترین دیمەنەکانمان نیشان دەدات بە درێژایی مێژوو. پێشتر دواین سەبارەت بە مەزنیەکەی و ئاستەکانی سەرەتای دروست بوونی، ئەگەر بەردەوام بین لەسەر مێژووەکەی دەبینین چەند ئاستێك هەن بۆ ئیمبراتۆریەتی ئیسلامی کە تیایدا فراوان بووە تەنها دوای یەك سەدە لە کۆچی محمد صلی ألله علیه وسلم، لە کەنداوی بیسکی لە ئەندەلوس هەتا ڕوباری سند و تخوم لە چین، وەلە دەریای ئارال لە ناوەڕاستی ئاسیا هەتا ڕوباری نیل لە ناوەڕاستی ئەفەریقا. گرنگتر لەوە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی ئیسلامە واتە پەرەسەندنی ڕۆشنبیری مەزن و دەرکەوتنی ئەدەبیات و زانستی پزیشکی و هونەری بیناسازی، شکۆداری دیمەشق و بەغداد و میصر، مەزنی ئیسپانیا لەژێر فەرمانڕەوایی موسوڵماناندا. دواتر چیرۆکی پاراستنی فەیلەسوف و زانا گەردونناسەکانی ئیسلام دەبینین لەسەر چرای زانست و فێربوونی ڕۆشن کە ئامادەیە بۆ داگیرسان لە مێشکی ڕۆژئاواییدا کاتێك بەئاگاهاتەوە لە خەون و متبوونە دورودرێژەکەی.

بەڵام ئەمە کورتە چیرۆکێك بوو لەبارەی ڕابردووی ئیسلامەوە چونکە چەند ئاماژەیەك هەیە لەسەر ئەوەی ئیسلام ئەمڕۆ سەرکەوتن بەدەست دێنێت دوای چەندین سەدە لە سستی کە داگیرکەر کاریگەریەکی زۆری هەبووە لەسەر ڕووداوەکانی. ئیسلام بەرەوڕووی کۆمەڵە کێشەتیەك بووەتەوە چۆن دەتوانێت بەوردی باسی پەرەسەندنی پیشەسازی بکات کە بەگشتی پێشوازی لێکرد وە بە ڕۆژئاوایی کردنی شتەکان کە بەهیچ جۆرێك پێی ڕازی نەبوو، چۆن بۆ جارێکی تر ئەو یەکبوون و یەکڕێزیە بەدەست دێنێت بەهێزەوە لەنێو چوارچێوەی ئیسلامدا، لەگەڵبوونی هێزی نەتەوەیی و دەمارگیری کە دژبە یەکبوون و یەك ڕیزی ئیسلامیە؟ چۆن دەتوانێت ئەو ڕاستیە بپارێزێت لە سەردەمی فرەیی و سەردەمی ڕێژەیی لە هەموو شتەکاندا؟!

بەڵام ئیسلام دوای ئەوەی خۆی دەربازکرد لەژێر چەپۆکی داگیرکەردا ئەمڕۆ بە هەندێك لە جۆش و خرۆشەوە جموجوڵ دەکات کە لە سەردەمی سەرەتای دروسبوونیدا هەیبوو. لە مەغریب و جەبەل تاریق لەسەر زەریای ئەتڵەسی، بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات و بە تێپەڕبوونی بە باکوری ئەفەریقادا هەتا دەگات بە نیمچە کیشوەری هیندی کە (پاکستان و بەنگلادیش) دەگرێتەوە و هەتا دەگات بە کۆتایی سنورەکانی ئیندۆنیسیا، ئیسلام لە ئەمڕۆدا هێزێکی کاریگەری پێکهێناوە لە جیهانی هاوچەرخدا، ژمارەی شوێنکەوتوانی لە ئەمڕۆدا دەگاتە ٩٠٠ ملیۆن موسوڵمان لەنێو تەواوی دانیشتوانی سەر گۆی زەویدا کە گەیشتونەتە ٥ ملیار کەس، واتە لەنێو پێنج یان شەش تاکدا یەکێك لەوانە موسوڵمانە لەسەر گۆی زەوی، ئەم ئایینە ڕێبەری مرۆڤایەتی دەکات بەرەو ألله بەشێوازێکی بێوێنە لە وردەکاری و ڕوونیدا. ئەم ڕێژەیە ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندایە.

هەموو ڕۆژێك لە کاتە جیاوازەکانی سەو و ڕۆژدا گوێمان لەم وشانە دەبێت کە لە بڵنگۆی مزگەوتەکانەوە دەوترێتەوە(ئەمڕۆ لە وێستگەی ڕادیۆ و کەناڵەکانی تەلەفزیۆندا بە هەمان شێوە گوێبیستی دەبین) بانگخوێنەکان پێی بانگ دەدەن، موسوڵمانان بانگهێشت دەکەن بۆ نوێژخوێندن، دەڵێن:

**الله أكبر        الله أكبر**

**أشهد ان لا اله الا الله**

**أشهد أن محمدا رسول الله**

**حي على الصلاة**

**حي على الفلاح**

**الله أكبر        الله أكبر**

**لا اله الا الله**

**کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر بۆ ئەم بەشە**

١-ئەگەر باوەڕی ئیسلامیمان ناسی بەوەی قورئان بەرەوڕوی شێواندن دەبێتەوە ئەگەر وشە بە وشە وەربگێڕدرێت نەك بەشێوەی ڕستە، بۆیە پێمان باشە وەرگێڕانی محمد بیکتال بخوێننەوە کە ناوی ناوە ماناکانی قورئانی پیرۆز the meaning of the glorious koran

وەك یەکێك لەی باشترین وەرگێڕانەکان کە نزیك دەبێتەوە لە ماناکانی قورئان.

٢-٣-کتێبی بیت الاسلام لەنوسینی کینیس کراگ و کتتێبی تقلید الاسلامی نوسینی ڤیکتۆر دانر تێڕوانینێکی جوان دەدەنە ئەم ئایینە.

٤-٥-بەهەمان شێوە کتتێبی حسین نصر مثل و حقائق الاسلام و کتێبی عبد الحليم محمودالعقيدة الاسلامية.

٦-باشترین توێژینەوەی میتافیزیقی بۆ بیروباوەڕی سۆفیگەری کتێبی فهم الاسلام understanding islamە لە نوسینی فریشتوف شوانە.

کە یەکێك لە زانائیسلامەکان دایدەنێن بە باشترین کاری ئینگلیزی لەسەر مانای ئیسلام و لەبارەی خستنەڕووی هۆکاری ئیمان و باوەڕهێنانی موسوڵمانان بەم ئایینە بەڵام ئەمە کتێبێکە پێویستی بە ڕۆشنبیریەکی بەرزی خوێنەر هەیە.

٧-بەڵام ئاسانترین کتێب بۆ خوێنەری ئاسایی بریتیەلە کتێبی التصوف sufismنوسینی ویلیام ستودارت، کتێبی ماهو التصوف؟ what is sufism?نوسینی مارتن لینگس.

٨-سەبارەت بە کتێبی گەورەترین شاعیرانی سۆفیگەری جلال الدين رومی کتێبی السر المفتوح open secretپێشنیازدەکەین لە نوسینی هەریەك لە جون موین و کولمن بارك و کتێبی الضحك العذب delicious loughterنوسینی کولمن بارك

٩-دەتوانین کاسێتی ڤیدیۆیی بەدەست بهێنن کە ئامادەم کردوە ماوەکەی سی خولەکە، ناونیشانەکەی islamic mysticism; the sufi way واتە سۆفیگەری ئیسلامی: تەریقەتی سۆفیگەریز

١٠-دواجار چێژی چیرۆکەکانی سۆفیگەری دەکرێت تاقی بکرێتەوە لەڕێگەی کۆمەڵەی ئیدریس شاه حکايات الدراويش tales of dervishes.

**پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی ئیسلام:**

**1**-meg greenfield ،newsweek(march 26 ،1979. p116

٢-کتێبی نورمان دانیل بەوردی باسی (الاسلام و الغرب: صناعه الصوره) islam and the west: the making of an imageچۆنیەتی دەرکەوتنی وێنەی شێوێندراوی ئیسلام دەکات کە بڵاو بوو لە ڕۆژئاوا بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ.

3-philip hitti ،history of the arabs ،1937 p 3-4

4-thomas carlys description in the hero as prophet in heroes and hero-worship.

٥-لە زمانی عەرەبیدا وشەی بێ لایەن بوونی نیە نە نێر بێت نە مێ، بەڵکو هەموو وشەیەك دەبێت یان نێر بێت یان مێ، بەهەمان شێوە ڕاناوەکان، لەبەرئەوە أللە ڕاناوی نێری پێدراوە وەك بەدواداچوونی من لە ڕێزمانی زمانی عەرەبیدا لە قورئانی پیرۆزدا.

6-see charles le gai eaton ،islam and the destiny of man p 103

٧-مانای وشەی اقرأ بریتیەلە أتل واتە بخوێنە، بەڵام کاتێك محمد صلی ألله علیه وسلم ئەرکی گەیاندنی پەیامەکەی وەردەگرێت فیکتۆر دانر دەڵێت ماناکەی بریتیلە ڕاپبگەیەنە. سەیری کتێبی the islamic traditionبکە

٨-هەروەها أمیر علی وەریگێڕاوە لە کتێبەکەیدا بەناوی روح الاسلام the spirit of islam

٩-أمیر علی روح الاسلام ل٥٢.

١٠-سیر ویلسام مویر، هەروەك وەرگیراوە لە کتێبی أمیر علی روح الاسلام ل٣٢.

١١-وەرگیراوە لە کتێبی روح الاسلام لە نوسینی أمیر علی ل٥٣.

١٢-أمیر علی روح الاسلام ل٥٢.

١٣-فیلیب هیتی العرب: تأریخ مختصر philip hitti; the arabs: a short history

14-michael h. hart the 100: a ranking of the most influential persons in history

15-edward cibbon ،the decline and fall of the roman epmire

١٦-زمانی ئیسلام لە ئەمڕۆدا دادەنرێت بە یەکێك لە ئاسانترین ئەو بابەتانەی ناکۆکیان لەسەر لە بیروڕای نێو زاناکانی. چونکە لە کاتێکدا موسوڵمانانی شوێنکەوتوی بیروباوەڕی ڕەسەنی ئیسلام وا دادەنێن خوێندنەوەی قورئان دەبێت بە زمانە ڕەسەنەکەی بێت، هەندێك لە زانایان دەڵێن لە هەندێك حاڵەتدا دەکرێت ئەو کەسانەی زمانی عەرەبی نازانن قورئان بخوێننەوە بە وەرگێڕدراوی بۆ سەر زمانی تایبەت بە خۆیان.

17-kenneth cragg ،trans ،reading in the qur'an

18-frithjof schuon ،understanding islam

١٩-((قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَلِكِ اللّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ إِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿آل عمران: ٤٧﴾)).

٢٠-طبري فەرمودەیەك لە سنن دەگێڕێتەوە لەبارەی ئەم ڕوباوە، دەگێڕێتەوە ألله شاخەکانی دروست کردوە تەنها بە پەنجە بچووکەکەی.

٢١-أمیر علی روح الاسلامل١٥٠.

٢٢-کتێبی ویلیام جیمس تنوعات تجربه الدینیه the varieties of religious experience.

٢٣-السید محمد اقبال أسرار النفس

٢٤–وەرگیراوە لە کتێبی روح الاسلام لە نوسینی أمیر علی ل١٩٩

٢٥–أمیر علی روح الاسلام ل١٧٠

٢٦–gai eaton، islam and the destiny of man

٢٧–فەرمودەیەکی پیرۆزی محمد صلی ألله علیه وسلم گێڕدراوەتەوە لە کتێبیمشکاة المصابیح وەرگێڕانی جیمس روبسون (لاهور شیخ محمد أشرف ١٩٦٥) فەرمودەی ١٢٢٦٤–١٢٢٦٧

٢٨–bernard lewis، the atlantic monthly (september 1990)

٢٩–أمیر علی روح الاسلام ل١٧٣.

٣٠–لەمیانەی ئەم نوسینەوەیەدا دەبینین سەرۆك وەزیرانی پاکستان، سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن لە بەنگلادیش هەردوکیان ئافرەتن. ئیسلام مافی تەواوی داوە بە ئافرەت هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە، لەکاتێکدا ئەو ئافرەتانەی هاوسەرگیریان کردوە ئەم مافەیان پێ نەدرا لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەتا سەدەی بیستەم.

٣١–لەدەرەوەی سنوری کۆیلەیی. پێویستە ئەمە زیادبکەین بۆ ئەم بوارەکۆیلایەتی بەهۆی فرە چەشنی لە شێوازەکانی لە ڕووی مێژووییەوە زۆر ئاڵۆزە. سەیری کتێبی برنارد لویس بکە ace and slavery in the middle east.

٣٢–vector danner the islamic tradition

٣٣–kenneth cragg، the house of islam

٣٤–see malcolm X، the aoutobiography of malcolm X

٣٥–daniel، islam and the west

٣٦–وەرگیراوە لە کتێبی أمیر علی روح الاسلام ل٢١٢.

٣٧–نورمان دانییل لە کتێبەکەیدا islam and the west پشتگیری موسوڵمانا دەکات لەم بابەتەدا.

٣٨–فەرمودەیەکی قودسی وتەیەکی پێغەمبەر دادەنێت بە باوەرپێکراو لە دەرەوەی قورئاندا، ألله دەدوێت وەك ڕاناوی قسەکەر.

٣٩–gyprian rice، the persian sufis

٤٠–پەیوەندی نێوان مەعریفەی ئەقڵی و مەعریفەی بینراو بە چاو، وتووێژێك دەردەکەوێت لەنێوان فەیلەسوفی موسوڵمان ابن سینا و سۆفی هاوچەرخ أبو سعید. ابن سینا وتی (ئەوەی من دەیزانم، ئەو دەیبینێت)). أبوسعید لە وەڵامدا وتی((ئەوەی من دەیبینم ئەو دەیزانێت)).

٤١–الحق لێرەدا بەکارهێنراوە بریتیەلە یەکێك لە ٩٩ ناوە پیرۆزەکانی ألله.

٤٢–idries shah، tales of the dervishes

# ٩

# ئایینە سەرەتاییەکان

ئەم کتێبە باسی ئایینە مەزنە مێژووییەکانی کرد، ئەو ئایینانەی خاوەنی دەقی پیرۆزە کە نەوە بە نەوە گوازراونەتەوە و بەدرێژایی سەردەمەکان لە پەرەسەندندایە، چونکە مەسیحیەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەمان کلێسای ئێس
تا نیە، هەروەها کونوشیەتی نویٚ هەمان کونفوشەت نیە کە دامەزرێنەرەکەی فێری خەڵکی کردوە، ئەمە ڕێگر نیە لەبەردەم هەریەك لەو دوو نمونەیە، بێگومان بەردەوامیەکی بەهێز هەیە کە بە ڕوونی جیادەکرێتەوە.
ئایینە مێژوویەکان تەواوی زەویان داپۆشیوە بە نزیکەیی بەڵام لە هەمان کاتدا بەپێی کاتەکانی هاتنیان ڕێکنەخراون  چونکە بوونیان هەیە لە پێش زیاتر لە چوار هەزار ساڵ ئەمە هیچ نیە ئەگەر بەراوردی بکەین بە سی ملیۆن ساڵ پێش ئێستا کە ئایینەکانی پێش ئەمان تیایدا هەبوون.  لەو ماوە دورودرێژەدا خەڵکی لەگەڵ ئاییندا ژیاون بەشێوازێکی جیاواز، شێوازێك ڕۆڵی گرنگی بینیوە لە پێکهێنانی هەست و تێگەیشتنەکانیاندا.
ئەم شێوازە ئایینە ناو دەنێین بە سەرەتایی چونکە لە سەرەتاوە هاوتوە بەڵام ناوی دەنێین ئایینەکانی پێشئێستا، چونکە کۆبوونەوەکانیان هەمیشە بچوك بوون، هەندێك جار ناوی دەبەین بە ئایینە زارەکیەکان چونکە نوسین نەزانراو بوو لەلای شوێنکەوتوەکانی.  هێشتا ئەم شێوازە لە ژیانی ئایینی بەردەوامە لە هەندێك شوێنی ئەفەریقا و ئوستورالیا و ئاسیای باشور و دورگەکانی نزیك بە زەریای هادی و سیبیریا و نێونا هیندیە سورەکانی ئەمەریکای باکور و باشور.  ژمارەی ئەم کۆمەڵانە کەمدەکات ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، بەڵام ئێمە ئەم کۆتا بەشە تەرخان دەکەین بۆ ئەم بابەتە، یەکەم لەبەرئەوەی ڕێزگرتن و پێزانینمان نیشان بدەین بۆیان بۆ ڕۆشنکردنەوەی دیمەنەکانی و جیاوازی لەگەڵ ئایینە مێژووییەکان کە هەتا ئێرە لەم کتێبەدا باسکراون.
ئایینی خەڵك چۆن بوو لای ئەو کەسانەی لە کۆمەڵەی بچوکدا دەژیان کە بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان پەرەیان پێداوە بەبێئەوەی پشت ببەستن بە نوسینەوە؟ لێرەدا هەوڵ دەدەین چاوپیاخشاندنێکی خێرا بکەین لەبارەی ئایینی مرۆیی لە یەکەمین شێوازەکانیدا وە خۆمان دەپارێزین لە ناکۆکیە ناوەوە و دەرەوەی ئەو ئایینە.  ئەم توێژینەوەیە تەنها ڕاهێنانێکی ئەکادیمی نیە، چونکە دەشێت دڵنیا بین لە پاشماوەکانی ئەم شێوازە لە ئایین کەهێشتا لەژیاندا ماوە وەك شوێنەواری دەرونی لە قوڵاییەکانی ئەقڵی نائاگاییماندا.  هەروەها دەتوانین شتی لێوە فێرببین چونکە لەوانەیە ئەو هۆزانە چەند تێڕوانین و داناییەکیان هەبووبێت ڕێگەی داوە بە شارستانیەتە پیشەسازیەکان هەوڵ بدەن بۆ مانەوەیان.

## ئەزمونی ئوستورالی

باواز بهێنین لە بڕیاردانی پێشوەختی هەڵە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا بەردەوام بوو بەوەی هەموو شتێك بۆ ماوەیەك باشترە لەوەی پێشتر لەسەری بووە، ئەمە تێڕوانینێکە لەوانەیە دروست بێت ئەگەر بەکاربهێنرێت بۆ تەکنەلۆژیا چونکە ڕۆژلە دوای ڕۆژ بەروە پێشتر دەچێت، بەڵام نادروستە و ناگونجێت لەگەڵ ئاییندا، مێژوو ئەو ڕۆڵە کۆمەڵایەتیانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە زیاتر جیادەکرێنەوە هەتا کۆمەڵگەکان بەشونما بکەن لەڕووی قەبارە و ئالۆزیەوە، لەگەڵ ئەو گەشەسەندنە هێڵی جوداکەرەوە دەردەکەوێت لەنێوان پیاوی ئایینی و پیاوی ئاساییدا، دابەشکردنەکانی نێوان شتی پیرۆز و شتی دونیایی. لەم بوارەدا کۆمەڵگە دواکەوتوەکان وەکو کۆمەڵگە بایۆلۆجیەکانن کە لە پەرەسەندن دان لەڕووی ئەندامەوە لە هەردو حاڵەتەکەدا ژیان بوونی هەیە هەر لە سەرەتاوە بەڵام لەحاڵەتی ئاییندا هەڵەیە وادابنێین کە دەربڕینە مێژووییەکان شکۆدارترن لە دەربڕینە کۆنەکان. ئەگەر ﷲ لە پەرەسەندندا نەبێت، کەواتە بەوجۆرە دەردەکەوێت کە هاوشێوەیی ئایینی گەشەناکات لە هیچ ڕوویەکی گرنگەوە. مرسیا ئیلیاد گەیشتوە بەو تێگەیشتنەی کە نەتەوە ڕەسەنەکان لە دێرزەمانەوە زیاتر ڕۆحانی بوون لە نەوەکانی دوای خۆیان. کاتێك ئەو نەتەوە دێرینانە چەرمی گیانلەبەرانیان لەبەر دەکرد لەگەڵ گەڵای درەختەکاندا وە لەبەروبوومەکانی زەویان دەخاورد بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هەروەها خۆی قورس نەکردبوو بە کەرەستە دەرەکیەکان وە وابەستە نەبوو پێوەیان. وێڕای ئەوە لەوانەیە هەموو ئەو شتانەی گەشە دەکەن لە ئایینە مێژووییەکاندا پێشتر هەبووە لە ئایینە سەرەتاییەکاندا، بەشێوازی کاڵ و لاواز بەڵام قابیلی گۆڕینە.

تایبەتمەندی بێدەنگی جیاوازیەکان لە ئایینە سەرەتاییەکاندا سەرەتایەکی گونجاومان پێ دەدات بۆ بابەتەکەمان کە ڕوون کراوەتەوە بەشێوازێکی زۆر باش لە ئایینی دانیشتوانی ڕەسەنی ئوستورالیادا.

ئوستورالیا تاکە کیشوەرە کە نەکەوتوەتەبەر شارەزایی و لێهاتوویی سەردەمی بەردینی نوێ، کە دەستی پێکردوە لە چەند شوێنێکی تر لەنزیکەی ١٠٠٠٠٠سالْ پێش زایینی، کە داهێنانی کشتوکاڵ کردنی بەخۆوە بینیوە وە بەکارهێنانی پەرەپێدراوی بەرد. ئەم جیاکردنەوەیە دانیشتوانی ئوستورالیا دەخاتە نزیکتریم شوێن لە دانیشتوانی ڕەسەنی سەر زەوی، جگەلە هۆزە کەمەکان لە فیلیپین کە ناسراون بە هۆزی تاسادی کە گومان هەیە لە ڕەسەنایەتیەکەیان. جیهانی ئایین لای دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئوستورالیا یەك جیهانە. دەبینین ئایینە سەرەتاییەکانی تر هاوشێوەی ئایینی دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئوستورالیایە لەم ڕووەوە، بەڵام سەردەمی کۆن لای دانیشتوانی ڕەسەنی ئوستورالیا جیادەکرێتەوە بەوەی زۆرترین دابەشبوونی تیایە وە زۆر ئاسانتر دەردەوێت بەبەراورد بە هاوشێوەکانی لەڕووی سەرەتایی بوونیەوە.

ئەو جیاکردنەوەیەی مەبەستمانە لێرەدا بریتیەلەوەی لەنێوان ژیانی سروشتی دانیشتوانی ڕەسەندا هەیە ئەمە زانایانی ڕەسەنایەتی مرۆڤ ئەنسرۆپۆلۆجیا ناوی دەنێن ((جیهانە ئەفسانەییەکەیان))، بەڵام ئێستا دەستیان کردوە بە بەکارهێنانی دەستەواژەی دانیشتوانی ڕەسەن بۆ خۆیان ئەمە: خەونێکە. بۆ ئەم دەستەواژە پۆزەتیڤەی دوایی بریتیەلە ئاماژەکردنی بۆ ئەوەی دوو جیهان بوونی نیە بەڵکو لەبری ئەوە یەك جیهان هەیە دەتوانین تاقی بکەینەوە بە چەند ڕێگایەکی جیاواز.

جیهان دەپێورێت بەو پێوەرەی دانیشتوانە ڕەسەنەکان تاقی دەکەنەوە بە کات واتە بە سوڕانەوەی چوار وەرزەکە، نەوەکان کە دێن و دەچن. لەم کاتەدا باکگراودنی ئەم پرۆسەیە بەردەوامە بەشێوەیەکی ناکۆتا، جێگیر و بەردەوامە. کات بەرکەوتنی نابێت لەگەڵیدا چونکە ((ئامادەیە لە هەموو زەمەن و کاتێکدا)). جیهانی

باكگراوند ئەم کەسایەتیە ئەفسانەییانە دەناسێنێت. وەك خوداوەند! کە بەشێوەیەکی زۆر وەك ئێمەیە لەگەڵ ئەوەی لە هەمان کاتدا گەورەترە لە ژیان. ئەو شتەی پلەیەکی نمونەییمان دەداتیٚ بریتیلەوەی بنیاتنراوە وەك کرداری نمونەیی کە لە ژیانی ڕۆژانەدا هەن. ئەمانە کەسایەتی بلیمەت بوون چونکە لەو قاڵبەدا دانرابوون وە دواتر خرابوونە نمونەی هەلومەرجی ژیانی سەرەکی و چالاکیە بنەڕەتیەکانی وەك ڕاوکردن، کۆبوونەوە، خۆشەویستی. ئێمە مەیلی ئەوە دەکەین بڵێین کاتێك ئارونتا arunta (تاکەکانی نەتەوەی ڕەسەنی ناوەڕاستی ئوستورالیا) دەچون بۆ ڕاو بوێرانە ڕاویان دەکرد بەڵام ئەمە جیایان دەکاتەوە لە شێوازە ریان. باشترە بڵێین دەچنە قاڵبە نمونەییەکەیان بە ڕادەیەکی تەواو بەجۆرێك هەریەکەیان دەبنە ڕاوچیەکی نمونەیی هیچ جیاکردنەوەیەك نامێنێتەوە. هەمان شت سەبارەت بە چالاکیەکانی تر، بە دەستپێکردن بە دروستکردنی تۆڕ هەتا چالاکیەکانی تر. کاتێك کارەکانیان جێبەجیٚ دەکرد وەك هەندێك لە پاڵەوانەکانیان ئارونتا هەست دەکەن بەوەی بەڕاستی زیندون چونکە لەم ڕۆڵانەدا بە نەمری دەمێننەوە. ئەو بۆنانەی دێنە دەرەوە بەم شێوازە هیچ مانایەکی نیە، چونکە کات زۆر بەخێرایی ئەو بۆنانە لەبیردەباتەوە وەك هەر نەبووبێت.

لەوەی تێپەڕی ببینین کە ئایین بە پەرستش دەستپێناکات، بەڵکو بە بەشداریکردن لە هەر کارێکدا بە دەستپێکردن بە نمونە ڕەسەنەکان، ژیانی مرۆڤ هەمووی ڕەسەنایەتی تێدایە، بە پێوەری ڕەسەنایەتیەکەی دەبێتە شتێکی پیرۆز. قەسە ناکرێت لەگەڵ بوونەوەرە ئەفسانەییەکاندا یان دەستەمۆبکرێن یان لێیان بپارێیتەوە. ئەو هێڵەی مرۆڤ جیا دەکاتەوە لەو بوونەوەرە ئەفسانەییانە هێڵێکی فراوانە لەڕووی بنەماوەبەڵام دەشێت بسڕدرێتەوە بە ئاسانی چونکە ڕاستەوخۆ دیارنامێنێت کاتێك زەمەن دەبێتە ئێستا. لێرەدا پیاوە ئایینیەکان بوونیان نیە هەروەها نە مزگەوت هەیە نە کڵێسا. تاکە شتێك بوونی هەیە خەونێکە هەوڵدەدرێت خۆمانی لەگەڵدا بگونجێنین.

هاوشێوەکانی ئەم خەونە زۆر بەخێرایی زیاددەکەن بەڵام لەگەڵ سنوری جیاکەرەوەدا وەك نمونەی ڕەسەنی ئورالی. وێڕای ئەوەی ئەم جیاوازیە، بەڵام تاکە جیاوازیە لە نەتەوە سەرەتاییەکاندا کە دواتر باسیان دەکەین. سەبارەت بەوەی لەم بەشەدا باسی دەکەین سیما و دیاردە هاوبەشەکانی ئایینە سەرەتاییەکانە، وەك کۆمەڵێکی جیاواز لە ئایینە مێژووییەکان کە پێشتر باسکران لەم کتێبەدا. لێرەدا باس لە سەرزارەکی و ڕێگا جیاوازەکانی دەکەین کە شوێنیان پیٚ وێنا دەکرد چەند خاڵێکی هاوبەش دەردەکەوێت کاتێك دیاری دەکرێت بۆ بینینی جیهان.

## سەرزارەکی، شوێن، کات

سەرزارەکی. پێشتر ئاماژەمان کرد بۆ ئایینە سەرەتاییەکان شوێنکەوتوانی نوسین و خوێندنەوەیان نەدەزانی. گومانی تێدا نیە ئێستا خوێندنەوە و نوسینیان پێگەیشتوە، بەڵام ئەگەر تەنها کەمێك لە توێژینەوەکەمان دەگۆڕێت، چونکە کاتێك خوێندنەوە و نوسینیان پێگەیشت سەرۆکی ئەو ئایینانە بیروباوەڕی خۆیان دەپارێزن وە ڕێگە نادەن بنوسرێتەوە و خوێندنەوەی بۆ بکرێت. ئەوان نوسین و تۆمارکردن بە ئەفسانەیەکی زیندوو دادەنێن، لە چەند وشەیەکی مردودا کە ژیانی تێدا نیە، ماناکەی زیندانەکەی و خوێندنەوەی ئەوەی گرنگی پێ دەدەین، ئەمە ئاسان نیە سەبارەت بە ئێمە و هەموو ئەو نەتەوانەی گرنگی دەدەن بە خوێندنەوە و نوسین وە لە مەبەستیان تێدەگەین. بەڵام ئەگەر هەوڵماندا لەوانەیە بتوانین تێبگەین لە هۆکاری ئەوەی نوسین بە هاوشانی کارە سەرزارەکیەکەیان نازانن بەڵکو بە هەڕەشەکردنی دادەنێن بۆ سەر تایبەتمەندیەکانی ئەو ئایینە. دەکرێت دەستپێ بکەین بە جووڵەی وشەکان و هەمەجۆری بەکارهێنانەکانی، سەبارەت بە وشە نوسراوەکان. وشەکان بەشێکن لە ژیانی قسەکەر، بەپێی ئەمە ئەو بەشداری دەکات لە چالاکی ژیاندا، ئەمە وای لێ دەکات نەرمی تێدا بێت وای لێ دەکات بەوردی گرنگی بدات بە پێوەری قسەکەر و لەسەر پێوەری بیستەر بەبێ جیاوازی.

بابەتەکان ناسراوەکان دەتوانن زیندوبکرێتەوە بە خوێندنەوەیەکی نوێ بۆی. دەکرێت بە تۆنێکی نەرم بوترێت بە دوپاتکردنەوەی هەندێك لە وشەکان، هەتا وشەکان نزیك ببنەوە لە سنوری سرود، لێرەدا گێڕانەوەی چیرۆکەکان دەبێتە هونەرێکی شکۆدار. دەکرێت شێوازی گوتنەکە و ڕێگای پێشکەشکردنەکە والە کەسایەتیەکان بکات باسبکرێن وەك کەسایەتی زیندوو، کاتێك لاسایی ڕۆیشتنی گیانلەبەران دەکرێتەوە و دەنگەکانیان لاسایی دەکرێتەوە ئەوا لێرەدا هەست دەکەین لەسەر تەختی شانۆیەکین، بەڵکو تەنانەت دەکرێت بەکاربهێنرێت بۆ ئاماژەکردن بۆ چیرۆکخوان بۆ پچڕاندنی چیرۆکەکە بۆ ئەوەی سەرقاڵ بێت بە نوێژێکی تایبەت. هەموو ئەمە ڕوون و ئاشکرایە. بەڵام هێشتا بۆمان ڕوون نەکراوەتەوە بەشێوەیەکی پێویست بۆ بلیمەتی هونەری سەرزارەکی سەرەتایی. چونکە بۆ دوورتر لەوە نەڕۆیشتوین بەوهۆیەوە دەرگاکە بە کراوەیی جێدەهێڵین لەبەردەم پارێزەران لەبارەی نوسینی ئەوانەی وەڵام دەدەنەوە: ((باشە با خاوەنی دووان بین: سەرزارەکی و نوسین!)) ئەوەی بە دڵنیاییەوە ئایینە مێژووییەکان پێی هەستاون چونکە نوسینە پیرۆزەکانیان بەشداری دەکات لە بەکارهێنانی شانۆ و ئامۆژگاری و سرودەکان. بەتەواوی تێناگەین لە سەرزارەکی سەرەتایی تەنها ئەگەر بکەم وێنەییەکەی بەرچاو نەگرین، چونکە کاتێك نوسین دەهێنرێت ئەوا نوسین چاکە جێناهێڵێت وە هەروەها تایبەتمەندیەکی سەرزارەکی دوای خۆی ناهێڵێتەوە بەڵکو هەڵدەسێت بە جیاکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی بە چەند ڕێگایەکی گرنگ.

گرنگترین سود کە پێمان دەبەخشێت پشتبەستنە بە وتەی سەرزارەکی، پەروەردەکردنی لە هزری مرۆییدا. ئەو کەسانەی نوسین و خوێندنەوە دەزانن هزریان بەرەبەرە لاواز دەبێت، بە زمان حاڵی خۆیان دەڵێن: ((بۆچی خۆم هیلاك بکەم بە لەبەرکردنی شتەکان لەکاتێکدا دەتوانم لەبەردەممدا بیانبینم، لە هەرکاتێکدا کە پێویستم پێیانە، نوسراونەتەوە لە شوێنێکدا؟)). قورس نیە شتەکان ببینین بە جیاوازیەکی تەواو کاتێك کتێبخانەکان دابین نەکرابن. هزری کەسانی کوێر بۆ نمونە زۆر بەهێزە، دەکرێت ئەم ڕاپۆرتە باسبکەین کە بڵاوکراوەتەوە لە گۆڤاری نیو هبراید ((کاتێك منداڵەکان فێردەکرێن لەڕێگەی گوێگرتن و بینینەوە. . بەبێ نوسین، هزریان بە تەواوی وەری دەگرێت بەشێوەیەکی گواستراوەی دروست. . هەموو منداڵێك فێری هەزار ئەفسانە دەبێت، (زۆرکات وشەکانی نمونەیین، لەوانەیە چیرۆکەکە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك درێژببێتەوە) ئەمە کتێبخانەیەکی

تەواو پێکدەهێنێت. )) چۆن بیردەکەنەوە لە ئێمە؟ ((دانیشتوانە ڕەسەنەکان فێری نوسین و خوێندنەوە دەبن زۆر بە ئاسانی و خێرایی، لەدوای کاریگەری سپی پێستەکان لەسەر ئەوەی‌کە سەیری نوسین دەکەن وەك کەرەستەیەکی بێ سوود. ئەوان دەڵێن: ئایا مرۆڤ دەتوانێت شت بەبیری خۆی بهێنێتەوە و قسە بکات؟))(١).

بۆ یارمەتیدانمان لەسەر تێگەیشتن لە چۆنیەتی ژیان بە بێ نوسین، لەوانەیە هەوڵبدەین باپیرانمان وێنابکەین وەك چەند کۆمەڵە کۆترێکی نامەبەر، هەموو ئێوارەیەك کۆدەبنەوە لەدەوری ئاگرەکەیان، دوای تەواوکردنی کاری ڕۆژانەیان. هەتا نەوەکانیان فێری دەبن زۆر بە قەرسی بە دەستپێکردن لە چارەسەرکردن بە ڕووەکەکان هەتا وروژاندنی ئەفسانەکان، کە تۆمارکراوە لە مێشکیاندا بە کۆمەڵ، تەنها لەوێدا و لەهیچ جێگایەکی تردا نین. کەواتە شانازی دەکەن بە میراتی ئەوەی پاراستویەتی لە وتەکانیاندا؟ ئایا بە پیرۆزیان نەزانیوە بەشێوەیەکی هەمیشەیی و بەردەوام، هەموو تاکێك گێڕانەوی ئەوی تر ڕاست دەکەنەوە؟

خاڵی گرنگ کە پێویستە لەسەرمان لێرەدا دەرکی پێبکەین بریتیەلە کاریگەری ئەم چاوپێکەوتنانە کە زنجیرەیەکی بەردەوام پێکدێنێت لە خوێندنەوە و هاندان بۆئەو کەسانەی تیایدا بەشدار دەبن. هەموو تاکێك زانیاری دەداتە خەزینەی مەعریفە و زانستی زیندوو، لەکاتێکدا لەبەرامبەردا هەڵقوڵانی پۆزەتیڤانە خۆبەدەستەوە دەدات بۆ ئەو زانیاریانەی ژیانی پێکدەهێنێت و ئامادەی دەکات. هەموو ئەندامێك لە هۆزدا دەبێتە کتێبخانەیەکی گەڕۆك کەلەسەر زەوی دێت و دەچێت. هەتا دەرکبکەین بەوەی ئەمە چۆن دەبێتە جێگرەوەی تایبەتمەندیەکانی خوێندنەوە، دەکرێت گوێبگرین بۆ کەسێکی سەرکەش لە ئەفەریقا سەرقاڵی گەشت و گەڕانە کاتێك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ((ئەو هاوڕێیەم کە متمانەم پێی دەکرد پیاوێکی بەتەمەن بوو نەخوێندنەوەی دەزانی نە نوسین، وێڕای ئەوەی زۆر شارەزا بوو لە چیرۆکەکانی ڕابردوودا. سەرۆکە گەورەکان گوێیان لێدەگرت وەك ئەوەی جادوویان لێکرابێت. بەڵام لەسەر کاریگەری سیستمی پەروەردە و فێرکردن کە تازە بوو بۆ ئەو شوێنە، ئەمە مەترسیەکی زۆر گەورەیە بۆ سەر لەناوچوونی زۆربەی چیرۆکەکان))(٢).

گەشتیارێکی تر ئاماژەی کرد بۆ ئەفەریقیا وتی: ((بەپێچەوانەی سیستمی ئینگلیزی کە مرۆڤ تیایدا دەتوانێت لە ژیانی بەردەوام بێت بەبێ ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە شیعرەوە، سیستمی ئوراوون oraonی ناو هۆزەکان شیعر بەکاردەهێنێت وەك پاشگرێکی چالاك بۆ سەماکردن و ژنهێنان و چاندنی دانەوێڵە و بەروبوومەکانی تر. ئەمانە کۆمەڵە کردارێکن هەموو ئوراوون بەشداری تیا دەکەن وەك بەشێك لە ژیانی ناو هۆزەکەیان. ئەگەر ویستمان ئاماژە بکەین بۆ یەك هۆکاری دابەزینی ڕۆشنبیری لادیکە لە ئینگلیزیدا، ئەوا پێویستە لەسەرمان بڵێین ئەوە فێربوونی خوێندنەوە و نوسینە!))(٣).

وێڕای ئەوەی سەرزارەکی و لەبەرکردنی وشەکان هزری مرۆیی دەپارێزێت، بەهەمان شێوە دەیپارێزێت لە لاوازبوون و فەوتان. یەکەمیان هەستکردنە بە پیرۆزی لەڕێگەی کەناڵە زارەکیەکانەوە. کاتێك نوسین دەتوانێت ململانێ بکات لەگەڵ واتاکاندا بەشێوازێکی ڕوون و ئاشکرا، ئەوا دەقە پیرۆزەکان مەیلی ڕاکێشانی هەیە بەرەو پلەیەك لە شکۆمەندی دەیکاتە کەناڵێك لەتوانایدایە سەربکەوێت بەسەر هۆکارەکانی تردا بۆ دۆزینەوەی یەزدانی و گەیشتن پێی. بەڵام زارەکی orality ناکەوێتە ناو ئەم تەڵەیەوە. شاردنەوەی دەقەکانی واتە ئەفسانەکانی چاوەکان بە کراوەیی جێدەهێڵێت بۆ سڕینەوەی شتە پیرۆزەکانی تر، سروشتی سەرەتایی، هونەری پیرۆز، یەکێکن لەو نمونە سەرەکیانە لەسەر ئەم بابەتە. لە چاخەکانی ناوەڕاستدا کاتێك ئەورووپا کەمتر زانیاریان هەبوو لەسەر نوسین و خوێندنەوە بەبەراورد بە چین ((مرۆڤی نەزان و نەخوێندەوار دەتوانێت مانای

شته هەڵکۆڵراوەکان بخوێنێتەوە کە ئێستا تەنها زاناکانی شوێنەوارزانی دەتوانن بیخوێننەوە و ماناکەی شیبکەنەوە))(٤).

دواجار کاتێك نوسین سنورێکی نەبێت ئەوا دەتوانێت زیادبکات هەتا ئەو خاڵەی خەڵك کۆڵان و ڕێگاکانیان ون دەکەن کەبێ کۆتایین. مادەی دووەمی دێت بۆئەوەی ئەوە بشێوێنێت کە گرنگەن. ئەوکاتە مێشکەکان پڕ دەبن لە زانیاری و بەرتەسك دەبنەوە لەڕێگەی پسپۆڕیەوە. یادەوەری پارێزراوە لەم جۆرە ئیفلیجیە چونکە زامنکەری ژیانە، چونکە ژیان پێویستی بە کارکردنە لە هەموو بۆنەیەکدا دواتر ئەوەی بێ سودە و گرنگی نیە زۆر بەخێرایی لەناو دەبرێت.

دەتوانین تایبەتمەندیەکانی شتی زارەکی کورتبکەینەوە بە قسەکانی بول رایدن: ((گومڕایی لە هەموو ١ژیانی دەرونی ڕۆحیماندایە، هەروەها لە هەمووو درکپێکردنمان بۆ ڕاستیە دەرەکەیەکان، کە دروست بوون لەدوای داهێنانی ئەلفوبێ ی نوسین، هەموو مەیلێك بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بیرکردنەوەمان بۆ زانینی هەموو ڕاستیەکان، هەرگیز دەرناکەوێت لەنێو هۆزەکاندا))(٥).

**شوێن بەرامبەر بە بۆشایی ئاسمان.** تایبەتمەندی دووەمی ئایینە سەرەتاییەکان پەیوەستبوونیانە بە شوێنەکانەوە. ئەو شوێنە بۆشایی ئاسمان نیە. بۆشایی بەتەنها، کاتێك شوێن بەرجەستەکراوە. هەموو ڕووبەرێکی ناو بۆشایی ئاسمان هاوشێوەی ئەوەیە کە باسمان کرد، بەڵام دوو شوێن بوونیان نیە کە هاوشێوەی یەکتر بن. هەروەك ستیڤن فۆستەر دەڵێت شوێنێك نیە وەکوماڵەوە بێت.

زۆربەی ئایینە مێژووییەکان پەیوەندیان هەیە بە چەند شوێنێکی دیاریکراوەوە، یەکەم شت کە بە بیرماندا بێت لێرەدا هەردو ئایینی یەهودییەت و شینتۆییشنتو أو شنتوية) باليابانية :(神道 : ئایینێکە دەرکەوت و پەرەیسەند لە ژاپۆن. ئایینی شینتۆ-کاریگەریەکی گەورەی جێهێشت لەسەر بیرکردنەوەی ژاپۆنی-بڵاوبوویەوە هاوشانی ئایینەکانی تر. ئەم ئایینە ڕێنمایی دیاریکراوی نیە. ئەو شتەی وای لێکرد نەریتە ئایینیەکانی تر بکاتەوە بەبێ ئەوەی تایبەتمەندی و ڕەسەنایەتیەکەی لەدەست بدات. شینتۆ و نەریتەکانی هەمیشە ماونەتەوە لە دیاردەکانی ژیانی ڕۆژانەی ژاپۆنیدا، هەردوکیان وەك ئایینێکی سەرەتایی دەستیان پێکرد. بەڵام هیچ جۆرە ئایینێکی مێژوویی نیە پەیوەندی بە شوێنێکی دیاریکراوەوە هەبێت وەك ئەو پەیوەندیەی ئایینە سەرەتاییەکان هەیانە بە شوێنی دەرکەوتنیانەوە بۆ یەکەم جار.

دوو چیرۆك هەن کە هاتون لە هۆزی ئونونداجان onondaganەوە لە ((هاو دی نو ساو نی)) hau de no sau nee((شەش هۆزە نیشتەجێبووەکە لە نیویۆرك))، دەتوانن یارمەتیمان بدەن لە ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە.

ئورلین لیون یەکەم تاکی هۆزی ئونونداجان بوو کە لە خوێندنگا دەیخوێند. لەکاتی گەڕانەوەی بۆ ناوچە تایبەتیەکەی شوێنی نیشتەجێ بوونی هیندیە سوورەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکان، لەیەکەم پشوویدا مامی پێشنیاری بۆ کرد لەگەڵی بچێت بۆ ڕاوی ماسی لە دەریاچەکە. کاتێك کوڕی براکەی لە ناوەڕاستی دەریاچەکەدا بوو دستی کرد بە پرسیارکردن لێی: ((باشە ئۆرین! لە خوێندنگا بوویت وادیارە ئێستا زیرەك بوویت بەهۆی ئەو زانیاریانەی لەوێ فێریان کردوویت، باشە با ئێستا پرسیارێکت لێبکەم: تۆ کێیت؟)) ئورین بەم پرسیارە سەرسام بوو دەستی کرد بە بیرکردنەوە لەوەڵامدا بە مامی وت: ((مەبەستت چیە لەوەی من کێم؟ بۆچی ئەم پرسیارە؟ من بە دڵنیاییەوە کوڕی براکەتم)) مامی ئەم وەڵامەی ڕەت کردەوە دوبارە هەمان پرسیاری کرد. دوای ئەوە کوڕی براکەی ئەم وەڵامانەی پێ وت: کە ئەو ئورین لیونە تاکێکی هۆزی ئونونداجان، هەروەها وتی ئەو مرۆڤە. . . . . هتد. بەبێ ئەوەی مامی بە هیچ یەکێك لەو وەڵامانە ڕازی ببێت!. کوڕەکە ماوەیەك

بێدەنگ بوو دواتر پرسی لە مامی: ((کەواتە من کێم بەڕای تۆ؟)) لەوێدا مامی پێی وت: ((ئەو کەندەڵانە بەرزە دەبینی لەوێدا؟ ئەوی ئۆرین! تۆ وەکو ئەو کەندەڵانەیت. ئەو سنەوبەرە بەرزە دەبینیلەسەر ئەوپەڕی کەناری دەریاچەکە؟ ئەی ئۆرین! تۆ ئەو سنەوبەرەیت. ئەو ئاوە دەبینی بەلەمەکەمانی هەڵگرتوە؟؟ ئەی ئۆرین! تۆ ئەو ئاوەیت!))(٦).

چیرۆکێکی تر دێت لە هەمان هۆزەوە. نوسەری چیرۆکەکە دەچێتە ناو ئاهەنگێکی ئاینیەوە. لە مەڕاسیمی ئاهەنگ گێڕانەکەدا دەستیان کرد بە نزا و پاڕانەوە بۆ ماوەی ٥٠ خولەك، گێڕەرەوەی چیرۆکەکە دەڵێت هیچ یەکێك لە بەشداربوانی ئاهەنگەکەی نەبینی چاو بتروکێنێت بەدرێژایی ئەو ماوەیە، بەڵکو هەمووان سەیری دەوری خۆیان دەکرد بە چالاکیەوە. کاتێك پرسیارم کرد لەبارەی ناوەڕۆکی ئەو نوێژەوە پێی وتم هەموو نوێژەکە تەرخان کرابوو بۆ دوان لەبارەی ەمو شتێکی ئەو دیمەنەوە، چ گیاندار بێت یان بێ گیان، لەگەڵ ڕۆحە نەبینراوەکانی ناو ئەو شوێنە، بانگهێشتکرابوو بۆئەوەی لەو بۆنەیەدا بەشداربن، وە مەڕاسیمەکانی پیرۆز بکەن. هەڵەیە وابیربکەینەوە کە گرنگیدان بە وردەکاریەکان لەم چیرۆکەدا بۆ شوێنی باوباپیرانە کە مرۆڤ گەمارۆ دەدات لە سنورێکی دیاریکراودا. کاتێك یەکێك لە ئەندامەکانی هۆزی کورنایئوستورالی دەچێت بۆ گەشت وەرزەکان و درەخت و بەردە گەورەکان شایستەی بەراوردکردن نین بە هی شوێنی خۆیان کە یادەوەری ڕوداوە ئەفسانەییەکانی بیردەخاتەوە. ئەندامەکانی هۆزی نافاجوس پێویستیان بەوە نیە ماڵەکانیان جێ بهێڵن بۆئەوەی هەستکردنیان بۆ شوێن زیادبکات. کاتێك هەڵدەسن بە دروستکردنی ماڵەکانیان لەسەر شێوەی جیهان ئەوا ماڵەکانیان دەبێتە هەموو جیهان بۆیان، بەجۆرێك کۆمەڵەکەی ماڵەکەیان ناودەنێن بە ناوی خوداوەندەکانیانەوە کە گەردونی ڕاگرتوە، دواتر ناودەنرێن بە خوداوەندی زەوی و شاخی مێیینە و ئاوی مێیینە. . هتد.

نوسەر کلود لیفی ستراوس لە کتێبەکەیدا هزری دڕندە وشەی بیرمەندێك بەکاردەهێنێت کە تیایدا ئاماچە دەکات بۆ شێوەی ڕوون ئاماژە دەکات بۆئەوەی ((هەموو شتەکان پیرۆزن، بۆیە پێویستە شوێنی تایبەتیان هەبێت)). ئەم تێبینیە دەیەوێت بیسەلمێنێت شوێنەکان سیمای پیرۆزییان هەیە.

لیفی ستراوس بەردەوام دەبێت لە قسەکانی دەڵێت: ((ئەوەی وا دەکات شتەکان پیرۆز بن، بوونیانە لە شوێنی تایبەت بە خۆیان، چونکە ئەگەر لابرا لە وشوێنەکەی تەنانەت بەبیرکردنەوە ئەوا هەموو سیستمی گەردون تێك دەچێت))(٧).

زەمەنی هەمیشەیی. بەپێچەوانەی ئایینە مێژوویەکانی ڕۆژئاوا کە سەیری پێشەوە دەکات وەك تێڕوانینی مەسیحییەت، دیمەنێك دەداتە ئایینە سەرەتاییەکان کە سەر بە ڕابردوون. ئەمە بیرکردنەوەیەکی هەڵە نیە لە ڕوانگەی ڕۆژئاواوە کە زەمەن بە هەڵەیەکی بەردەکوام دادەنێت، ڕێگایەکی تر نیە بۆ قسەکردن لەبارەی ئەم خاڵەوە. بەڵام لەلای ئایینە سەرەتاییەکان مانای زەمەن تەواو جیاوازە، بەجۆرێك زەمەن هێڵێك نیە لە ڕابردووەوە دەست پێبکات و بەرەو داهاتوو بڕوات دوای ئەوەی بە ئێستادا تێپەڕ دەبێت، بەڵکو تەناەت بەشێوەی سوڕ نیە، وەك ئەوەی ئایینە ئاسیاییەکان سەیری دەکەن وەك چۆن جیهان دەسوڕێتەوە زەمەن دەسوڕێتەوە وەك سوڕانەوەی وەرزەکان. زەمەن لەلای ئایینە سەرەتاییەکان شتێکی کاتی نیە بەڵکو هەمیشەییئەزەلیە!. لەوانەیە قسەکردن لەبارەی زەمەنەوە لەلای ئایینە سەرەتاییەکان گرنگیدان بێت بە پلەبەندی هۆکاری شتەکان، لەبری پلەبەندی زەمەنی بۆ ڕوداوەکان، چونکە ڕابردوو سەبارەت بە نەتەوە سەرەتاییەکان واتە ماوەی نزیکتر لە قەدەغەکردنی شتەکان لە سەرچاوەی بوونیان و هۆکارەکەیان. بەڵام ئەم

سەرچاوەیە لەپێش ئێستاوەیە  چونکە ڕابردوو بەبەردەوامی سەیر دەکرێت وەك سەردەمی زێڕین.  کاتێك پرۆسەی  دروستکردنی یەزدانی  هیچ شێواندنێکی زەمەنی تیا نەبوو ئەوا جیهان  بەو جۆرەیە پێویستە لەسەری بێت.  ئەم یەزدانە بەردەوامی هەیە لەبوونیدا بەڵام ئەمە گرنگیپێدان ناگوازێتەوە بۆ ئێستا، بەڵام ئەم حاڵەتە وەك خۆی نەماوەتەوە چونکە  هەندێك دیاردەی لاوازی تیا دەرکەوتوە لەبەرئەوە پێویستە هەنگاوبنرێت بۆ بەدەستهێنانەوەی جیهان و گەڕاندنەوەی  بۆ خاڵەتە ڕاستەقینەکەی.  میرسیا ئیلیاد نوسیویەتی:  ((مرۆڤی باوەڕدار لە سەردەمە دێرینەکاندا وابیردەکاتەوە جیهان هەموو ساڵێك نوێ دەبێتەوە، بە مانایەکی تر  ئەو هەموو ساڵێك پیرۆزی یەکەمین جاری بەدەست دەهێنێتەوە، ئەو پیرۆزیەی خاوەنی بوو کاتێك دەرکەوت لەدەستی بەدیهێنەردا بۆ یەکەمجار))(٨).  چەند کوشتارگەیەك و پەیکەرێك دانرا بۆئەوەی چیرۆکی گەردون بگێڕێتەوە، لەوێدا خەڵك بە دڵسۆزیەوە بپاڕێنەوە و داوای لێخۆشبوون بکەن بەو وشانەی خوداوەند دایناون لەسەرەتای دروستکردنی جیهانەوە.  دەتوانین ئەم مەڕاسیمە بچوێنین بە  بە تاوەرەکانی پەیوەندی تەلەفۆنی کە هێزی گەیاندنی پەیوەندیەکان زیاد دەکات.  سەمای هەتاو لای هیندیە سورەکان  بە سەمایەك دادەنرێت بۆ جیهان و تازەکردنەوەی ژیان.

ئەرکەکانی تاك بە هەمان شێوە پێویستی بە نوێکردنەوە هەیە.  بۆ نمونە لە دورگەی تیکوبیا ی بولینزی مەڕاسیمێکی تایبەت هەیە بۆ چاککردنەوەی بەلەمەکان.  لەم مەڕاسیمەدا بەلەمەکان چاك ناکرێنەوە بۆئەوەی دوبارە کاریان پێ بکرێتەوە بەڵکو وەك مەڕاسیمێکی ئایینی:  ((بەپێی چەند تایبەتمەندیەکی دیاریکراو هەروەك لە ئەمرۆدا دەڵێین لەم حاڵەتەدا واتە ئەو ڕێگایەی  ئالیەتی چۆنیەتی چاککردنی بەلەمەکان دەخاتەڕوو بۆئەوەی ئەمەمان فێربکات)).  ئەم مەڕاسیمە وزەی پێ بدرێتەوە لەم چالاکیەدا، وەك هەڵگری مانای جەختکردنەوە  لە مەترسی ئەوەی خەڵك بیریان بچێتەوە.

ئەگەر لێرەدا سەرکەوتوو بووین لەوانەیە شتێکی گرنگمان نەوتبێت لەبارەی ئایینە سەرەتاییە جیاوازەکانەوە بۆ کات، چونکە ئایینە مێژووییەکانبە هەمان شێوە مەڕاسیمی تایبەتیان هەیەبۆ نوێکردنەوە، لەڕاستیدا ئەم تایبەتمەندیە ئایینە مێژوویەکان وەك میراتی بۆیان ماوەتەوە لە ئایینە سەرەتاییەکانەوە و پاراستویەتی، چونکە هەموویان بۆنەیەکیان هەیە بۆ نوێکردنەوە، هەروەك هەموو ئایینەکان جەژنیان هەیە کە ئامانج لێی نوێکردنەوە و سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەیە.

بۆنەکانی ئایینی تاوییەت لە تایوان بۆ نمونە هەڵدەسێت بە چالاککردن و نوێکردنەوە لەڕێگەی چەند مەڕاسیمێکەوە کە بەردەوامە بە درێژایی شەست ساڵ، چونکە بەتەواوی پێویستی بە سروشتە بۆ نوێکردنەوەی ژیانی لە هەموو وەرزێکی بەهاردا، هەروەها پێویستە گەردون نوێبکرێتەوە لەسەر ماوەیەکی  کاتی ژیانی مرۆیی، هەموو تاکێك بەشدار دەبێت لەم مەڕاسیمانەدا دەشێت  ئامادەکاری بکرێت بۆ ئاستێکی دیاریکراو لە سوڕی گەردونی بۆ چەندین ساڵ، ئەمە بڕێکی زۆر پارەی تێدەچێت.

ئەگەر ویستمان یەکێك لە سیما سەرەتاییەکانی زەمەن بناسینەوە کە سیمایەکە ئایینە مێژوییەکان وازیان لێهێناوە، دەتوانین ڕووبکەینە ئەو ڕێگایەی ئایینە سەرەتاییەکان گرتبوویانە بەر بۆ پۆلێن کردنی پلەوپایەکان بەپێی نزیکیان لە سەرچاوە یەزدانیەکانەوە.  شوێنکەوتوانی ئایینە  سەرەتاییەکان سەیری گیانلەبەرانیان دەکرد لەنێو ڕێزگرتن و بەپیرۆز زانینیدا، بەهۆی ئەوەی پێشتر لە بووندا هەبوون، لەنێو گیاندارانداا گەمژەیی سەگی ئاوی و نەتەوەی وینی باجو ((نەتەوەیەکی سیوانن وە بەشێکن لە هیندیە ڕەسەنەکانی ئەمەریکا لە بنەڕەتدا لە ڕۆژهەڵاتی ویسکونسین نیشتەجێن، ئێستا لە ویلایەتی نبراسکا دەژین)).  ئەم نەتەوەیە

وابیردەکەنەوە ئەم گیانداره دواهەمین بووە کە دروستکراوە لەلایەن یەزدانەوە. هەمان ئەم بنەمایە دەچەسپێت بەسەر جۆرەکانی مرۆڤایەتیدا، بەجۆرێك سەیری سەرپەرستیارانی ئەم جۆره مرۆڤایەتیە دەکرێت بە چاوی ڕێزلێنانەوە زیاتر لە نەوەکانیان. نەتەوە سەرەتاییەکان ڕێزیان دەگرت لە باوباپیرانیان بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر.

نەتەوە ئاسیاییەکان هەمان هەستیان هەیە واتە بەشێوەی ئەوان ڕێزدەگرن لە باوباپیرانیان تا ڕادەی پەرستنی باوباپیران، لەم بوارەدا دەشێت ئاماژە بکەین بۆ تاوییەت لە چین و شنتویی لە ژاپۆن، ئەم دوو ئایینە مێژوییە دادەنرێن بە نزیکترین لە ئایینە سەرەتاییەکانەوە. بەڵام بۆئەوەی دەرنەچین لە بابەتی ئایینە سەرەتاییەکان دەڵێین بۆ دوور ناچین کاتێك دەڵێین شوێنکەوتوانی ئایینە سەرەتاییەکان سەیری یەزدانیان دەکەن بەو شێوەیەی کە باوباپیرانیان سەیریان کردوە. ئەم بووە بە پردێك کە نەوەکانی ئێستا دەبەستێت بە باوباپیرانە پیرۆزەکانیانەوە، هاوشێوەی ئەمە بوونی هەیە لە شنتویی بەجۆرێك ئیمبراتۆری ژاپۆن دادەنرێت بە کوڕی خوداوەندی خۆر ئاماتیراسۆ لەکاتێکدا نەتەوەی ژاپۆن بە نەوەی ناڕاستەوخۆی دەزانن. کاتێك باوباپیران لەلاە ئەو کەسانە لە پلوپایەی نزیك بە یەزدانن لە نەوەی ئێستادا، ئەوا سەیردەکرێنبەجۆرێکمیراتگری بەشێکی زۆری سیفەتە باشەکانی یەزدانن، ئەمە جۆرە هەڵسوکەوتێك دروست دەدات پێویستە ڕێزی لێبگیرێت. کاتێك باوباپیران دوور بوون لە ئاڵۆزیەکانی ژیان بەوهۆیەوە شوێنکەوتوانی ئایینە سەرەتاییەکان گومانی ئەوە دەبەن لە زۆربەی ڕووەکانەوە کامڵ بوون، ئەم ئەگەرە هەڵنەقوڵاوە لە بنەما و بیرۆکەی فرۆیید لەبارەی پێدانی تایبەتمەندی نمونەیی بۆ کەسایەتی باوکایەتی، بەڵکو لە شوێنی قووڵتری درکپێکردنەوە واتە لە دانپیانانی بوونەوە نزیکە لە سەرچاوەکەوە واتە بەشێوەیەکی باشتر و نمەنەیی تر. هەرچیەك بێت هەموو ئەوەی وتراوە لەبارەی باوباپیرانەوە دەچەسپێت بەسەر نەوەی ئێستادا کاتێك دەبنە باپیرە و داپیرە. تەنانەت کاتێك پیردەبن و لاواز دەبن وەك منداڵیان لێدێت لەبیرکردنەوەدا، شوێنکەوتوانی ئایینە سەرەتاییەکان مەیلی ئەوە دەکەن سەیربکرێن بەرەو پێش چوون لە تێگەیشتنیان یان لە ماف فیردەوسیدا کە دانراوە پێش دروستکردنی جیهان، بلاك ئیلیك یەکێك لە شوێنکەوتوانی ئایینی شامانی لە ئۆگلالاسیوکس کاتێك نزیك بوویەوە لە مردن ئارەزوی یاری کردنی هەبوو لەگەڵمنداڵاندا دەیوت: ((هەندێك شتی هاوبەش هەن لەنێوانماندا، چونکە تازە هاتوون لە مەزنی نهێنیەوە، منیش وا خەریکە دەگەڕێمەوە بۆی!)).

ئێستا دەچینە سەر دوو تایبەتمەندی ئایینە سەرەتاییەکان کە بەرجەستەدەکرێن لە تێڕوانینی گەردونیاندا. لە وێنەکێشانمان بۆ تێڕوانینی گەردونی ئایینە سەرەتاییەکان کەمتەرخەمین ئەگەر ماینەوە لەسەر تایبەتمەندیە جێگیرەکان کە دەربڕینەکانی دۆزیەوە لەلای هەموو ئایینێك لە ئایینە سەرەتاییەکان.

## جیهانی سەرەتایی

یەکێك لە شوێنە بەسوودەکان کە دەتوانین لێوەی دەستپێبکەین بنچینەی نەتەوە سەرەتاییەکان لەخۆ دەگرێت لە جیهاندا. ئیمان و بیروباوەڕ لای ئەم نەتەوانە دەستپێدەکات بە ڕەگداکوتان لە هۆزدا، بەجۆرێك تاك لە دەرەوەی هۆزەکەی خاوەنی ناسنامەیەکی سەربەخۆ نیە تەنها بەشێوەیەکی زۆر لاواز نەبێت. تۆڕی پەیوەندیەکانی هۆز پاڵپشتی ئەو تاکانە دەکات و وزەیان پێ دەدات لەڕووی دەرونیەوە. هەروەها هەموو دیمەنەکانی ژیانیان چالاك دەکات. جیابوونەوەیان لە هۆز هەرەشەی مەرگیان لێدەکات تەنها لەڕووی جەستەوە نا بەڵکو بەهەمان شێوە لەڕووی دەرونیەوە. لەوانەیە ئەو نەتەوانە سەیری هۆزەکانی تر بکەن وەك بێگانە تەنانەت هەندێك جار وەك دوژمن، بەڵام سەبارەت بە هۆزە تایبەتەکەی هەست بە حاڵەتێکی لەی پەیوەندی دەکات وەك پەیوەستی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ بەیەکەوە.

بەڵام سەبارەت بە خودی هۆزەکە ڕەگی داکوتاوە لە سروشتدا، لێرەدا جێگیری و ڕەگداکوتان هێندە بەهێزن تا ئەو ڕادەیەی هێڵی جوداکەرەوەی نێوان سروشت و هۆز زۆر بە ئەستەم هەستی پێ دەکرێت.

لەڕاستیدا، ئەم حاڵەتە وەك ئەوە وایە گیاندارێك یان ڕووەکێك دروشم و هێمایەك دادەنێت بۆ خێزان یان هۆزەکەی. تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی ئیمان و بیروباوەڕ بە بوونی پەیوەندیەکی شاراوە لەنێوان کۆمەڵەکەدا وە کسیستمێکی کۆمەڵایەتیە بنیاتنراوە لەسەر بنەمای ئەو دروشمە. ، بالێرەدا ئاماژە بکەین بۆ ئەو ڕێگایەی کە دەیگرینەبەر. پێچەوانەی ڕەگداکوتان لە جیهاندا بریتیە لە جودابوونەوە لە جیهانەکەی. گونجاوە بڵێین نەتەوە سەرەتاییەکان بە تەواوی بێ ئاگان لە جودابوونەوەی گیانلەبەرەکان ئەمە وایان لێدەکات بە کۆمەڵ ژیان دڵیان خۆشبکات، دواتر ڕێز لەو تاکانە دەگرن لە هەمان هۆزن و ئازاریان نادەن، لە هەمان کاتدا ئەم کارە وەك پاڵەوانێکە کە ئەندامەکانی هەمیشە باسکردنی بەرزڕادەگرن، هەروەهائەم هێزیان پێ دەدات بەجۆرێك ئەندامەکانی بەپرسیارن لە تەندروستی ئەو کۆمەڵەیە. هەموو ئەمانە هەڵقوڵاون لە بیروباوەڕیان بەوەی کە سەر بەسیستمێکی یەگکرتوون. مەڕاسیمی زیاکردنی ئەم پۆلێنکاریە بۆی دەستگرتن بەسەر سروشتدا نیە بەڵکو وەك پێداویستی مرۆیی بۆ پاراستنی سیستمی سروشتی. ئەمانە ڕێگای هاوکارین لەگەڵ سروشتدا، کاتێك پێویستە باران ببارێت ئەم مەڕاسیمە کاردەکات بۆ هێشتنەوەی سیستمی سروشت بەشێوەیەکی هاوسەنگ: ئەمە مەڕاسیمی هاوکاریە. خاوەنی دوو لایەنە: لایەنی ئابوری و لایەنی دەرونی. کاتێك ڕاستی ئەم پێداویستیانە دەردەکەوێت پاڵپشتی دەکات لە کردارەکانی سروشتکەلەڕووی ڕۆحیەوە متمانەی پێ دەکەن، هیواکانی داهاتوو نوێ دەکاتەوە.

ئەم کارە بەربڵاو نیە لە نێو نەتەوە سەرەتاییەکاندا، بەڵام هەموو ئەو نەتەوانە لەگەڵیدا بەشدارن لە گرنگی نەدان بە دابەشبوونی نێوان گیاندارەکان/مرۆڤدا. زۆرجار ئەو کۆمەڵە ئاژەڵ و باڵندانە ناو دەبرێن بە نەتەوە لە هەندێك حاڵەتی تردا هەندێك لە گیانداران دەتوانن ئاڵوگۆڕی شێوەیان بکەن لەگەڵ یەکتردا واتە بگۆڕێن بۆ مرۆڤ و بە پێچەوانەوە. بەهەمان شێوە جیاکردنەوەی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ و ڕووەك دوور دەخرێتەوە بەجۆرێك سەیری ئەو ڕووەکانە دەکرێت کە خاوەنی ڕۆحە هاوشێوەی ئاژەڵ و مرۆڤەکان. ئەم چیرۆکە دەتوانێت ئەم خاڵە ڕوون بکاتەوە، باوکی قوتابیەك لەم چیرۆکەدا ژیاوە جارێك بەشی هونەری زانکۆی ئەریزۆنا خولێك دەکرێتەوە بۆ فێربوونی دروستکردنی سەبەتە، بەشەکە داوای کرد لە هیندیە سورەکان هەتا کەسێکی ڕاهێنراو بنرێن بۆ ئەم مەبەستە. بەڵام خولەکە بەتەواوی گۆڕا بۆ گەشتی نێو دارستانەکان بۆ لێکردنەوەی ڕووەکەکان کە پێویستن بۆ دروستکردنی سەبەتە، بەجۆرێك ئافرەتێکی پیر بە درێژایی ئەو کاتە چیرۆکی ئەفسانەیی

دەگێڕایەوە لەبارەی ئەو ڕووەکانەوە کە سرود دەڵێن  بەجۆرێك دواجار کاتێك نەمایەوە بۆ دروستکردنی سەبەتە!.
پێشکەوتنی سروشتی بۆ ئەو بەشەی پێشوو  دەمانبات بۆ خاڵێکی سروشتی کە پێویستە لەسەرمان ئاماژەی بۆ بکەین تەنانەت هێڵی جیاکەرەوەی نێوان زیندد/مردوو، ئەمە هەڵەیەکی ئاشکرا نەبوو لە ئایینە سەرەتاییەکاندا بەڵکو هێڵێکی زۆر باریك بوو.  چونکە تەنانەت بەردەکان بە زیندوو دادەنرێن لەژێر چەند هەلومەرجێکدا وادادەنرێت توانای قسەکردنی هەیە، لە هەندێك حاڵەتدا یەزدان بوون دەنرێتە پاڵ تاشە بەردی ئایرس لە ئوستورالیا.  ئاسانە ببینین چۆن ئەم جودابوونەوەیە ڕەگێ داکوتان بەرهەم دێنێت.
نەتەوە سەرەتاییەکان کوێر نین لەبەردەم جیاوازیەکانی سروشتدا، بەڵکو بە پێچەوانەوەبە بەاشی دەزانێت کە بەناوبانگە لە توانای درکپێکردندا.  بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدا بریتیەلەوەی ئەم نەتەوانە ئەو جیاوازیانە وەك پردێك دەبینن  لەبری ئەوەی وەك بەربەستێك بێتە پێش چاویان.  خولەکان بەڕێوە دەبرێن بە هاوەڵی ئاهەنگگێڕان لەڕێبگەی یادکردنەوەی خولەکان و پاڵپشتیکردنیانەوە، وە بە گونجاندن لەگەڵمرۆڤ و ژینگەی دەوروبەری، لەگەڵ بوونی ئەفسانەکان کە جەخت دەکەنەوە لەسەر پێکەوە ژیان لە کاتێکدا لە هەموو بۆنەیەکدا نێر و مێ بەشدارە لە هێزی ژیانی گەردونی.  هەموو بونەوەرەکان دادەنرێن بە خوشك و برا.
هەموو شتێك بە زیندو دادەنرێت بەجۆرێك لە جۆرەکان هەمووان پشت بە یەکتر دەبەستن.  لەگەڵ بەردەوام بوونمان لەم تێڕامانەدا خاڵێك دێتە پێش سیستمەکە نیشان دەدات، کاتێك دەست بە بیرکردنەوە دەکەین لەبارەی نەتەوە سەرەتاییەکانەوە نا بەڵکو لەبارەی سروشتەوەکە بەدوای خۆیدا دەگەڕێت کاتێك پەلدەکێشێت بۆئەوەی بچێتە ناو قوڵایی نەتەوەکانەوە، کاتێك هەڵدەقوڵێت لە ناخیانەوە بۆئەوەی بناسرێتەوە لەلایەن ئەوانی ترەوە.  ئەگەر بچینە سەر بونیادنانی جیهان بۆ چالاکیە مرۆییەکان  ئەوا بەتەواوی توشی پەشۆکان دەبین لەبەردەم دابەشکردنی ئەو چالاکیانە لەلایەن چەند دەستەیەکی سەربەخۆوە.  بۆ نمونە ((لەلای هەموو زمانەکانی هیندیە سورەکان لە ئەمریکا وشەی هونەر بوونی نیە چونکە هەموو شتەکان لەلای ئەوان هونەرە))(٩).
هەروەها هەموو شتێك لای ئەوان ئایینیە.  ئەمە واتە ئەگەر ویستمان  زانیاری وەرگرین لەبارەی ئایینە سەرتاییەکانەوە، دەتوانین دەستپێبکەین بە هەرشتێك بمانەوێت، بۆ نمونە دەتوانین بە وێنەکێشانی سەر دیواری ئەشکەوتەکان دەست پێبکەین یان سەما کردن و شانۆگەری و هۆنراوە و شیعر یان گۆرانی یان شوێنی نیشتەجێبوونیان، بەڵکو تەنانەت کەرەستەکان کە بەدەستی خۆیان دروستیان کردون.  یان دەتوانین بدوێین لەبارەی کرداری ڕۆژانەیان کە تێبینی دەکرێت یچ جۆرە جودابوونەوەیەکی نیە لەنێوان شتی پیرۆز و دونیایی.
بۆ نمونە ڕاوچی دەچێتە دەرەوە بە مەبەستی کەمکردنەوەی برسیەتی هۆزەکەی بەتەنها، بەڵکو کۆمەڵە کردارێکی تێڕامان ئەنجام دەدات، هەموویان  پڕن لە پیرۆزی.  لێکۆڵەرێکی کە ژیاوە لەگەڵ بلاك ئیلك یەکێکە لە شوێنکەوتوانی ئایینی شامانی بۆ ماوەی چەند ساڵێك جەخت دەکاتەوە لەسەر ڕاو وەك گەڕانی ژیان بەدوای ڕاستی ڕەهادا.  نەیوتوە ڕاو تەنها گەڕانە بەڵکو وتویەتی بەڕاستی گەڕانە  بەدوای ڕاستی ڕەهادا.  گەڕان پێویستی بە نوێژکردن و نزاکردنە بۆ پاککردنەوەی قوربانیەکە.  ((ئەو ڕێگایانەی دەگیرێنە بەر بە چالاکی هێمان بۆ ئامانجەکە، گەیشتنی کۆتایی بە نێچیرەکە یان ناسینەوەی درککردنە بە ڕاستی، کە دادەنرێت بە دوا ئامانجی ژیان))(١٠).
هەتا ئێرە ئاماژەمان کرد بۆ نەبوونی دابەشکردنە توندەکان لە جیهانی ئایینە سەرەتاییەکاندا، بەڵام لێرەدا ئامادەنەبونێکی تر هەیە:  نەبوونی هێڵی جیاکەرەوەی نێوان ئەم جیهانە و جیهانەکەی تر کە بەرامبەری

دەوەستێت. ئەم دابەشکردنە لە ئایینە مێژووییەکاندا دەرکەوت زۆر بە ڕوونی و چەندین دەرئەنجامی لێکەوتەوە(١١).

ئەفلاتون لەبارەی ئایینی یۆنانیەوە دەڵێت جەستە وەك قەبر وایە. چەند نوسینێکی پیرۆزی عیبری جیاوازیەکی زەق دەخەنەڕوو لەنێوان جیهانی دروستکراو و یەزدانی بەدیهێنەردا. سەبارەت بە هیندۆسی جیهانی مایا واتا خەیاڵ ئەو ڕاستەقینە نیە تەنها بەشێوەیەکی پەراوێزخراو نەبێت. بوزا جیهان دەچوێنێت بە خانویەکی گڕگرتوو کە پێویستە ڕابکەین لێی. گێڕانەوەیەکی متمانەپێنەکراو هەیە کە دەدرێتە پاڵ یەسوع: ((جیهان پردێکە. پیایدا تێبپەڕە نەك ماڵەکەتی لەسەر دروست بکەیت)). قورئان جیهان دەچوێنێت بە ڕووەکێك (سەوز بوو) بەڵام زۆر بەخێرایی زەرد بوو کاتی چنینەوەی بەروبوومەکەی هات و بوو بە پووش و کا و با خەیکە دەیبات. لە ژاپۆن مامۆستا تاییشی جیهان بە درۆیەك دادەنێت کە بەرامبەری هیچ شتێك نیە جگەلە تاکە ڕاستیەك ئەویش بوزایە. کەمکردنەوەی بەها و بایەخی جیهان شتێکە دەردەکەوێت بەشێوازێکی دیار لە هەموو ئایینە مێژووییەکاندا.

بەڵام ئەم جیاکردنەوەیە هەرگیز دەرناکەوێت لە ئایینە سەرەتاییەکاندا، بۆ نمونە هیچ شتێك نیە هاوشێوەی بیرۆکەی دروستکردنی گەردون بێت لە نەبوونەوە بۆ بوون. نەتەوە سەرەتاییەکان ڕوودەکاتە ئیمان و بیروباوەڕ وەك تاکێکی تەنها دەیانپارێزێت وەك ئەو منداڵدانەی کۆرپە دەپارێزێت. چونکە وایان بیردەکردەوە گەردون بوونی هەیە بۆ دڵدانەوەیان بکات. هەروەها هیچ بەرنامەیەکیان نیە بۆ دژایەتی کردنی یان ڕاکردن لێی. وە نە بە تاراوگەی دەزانن و نە بە شوێنی حەجکردنی دادەنێن، بەڵام ماڵێکە و چەند ژورێك هەندێکی نەبینراوە بەڵام ژورەکان جیاوازن. نەتەوە سەرەتاییەکان گرنگیان داوە بە هێشتەوەی پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتی و گەردونی. وە بە دەستهێنانی خێر و چاکە-باران، بەروبوم، منداڵەکان-هەروەك خەڵکی گرنگی دەدەن بە هەموو شوێنێك. بەڵام ئامانجی لەوە گرنگتر کە دەستی گرت بەسەر ئایینە مێژووییەکاندا بوونی نیە لەو ئایینانەدا، بەجۆرێك ژیانی دوای مردن مەیلی ئەوە دەدکات ببێتە نیوە بوونێکی سێبەری لە شوێنێکی نادیاردا.

## هزری هێمایی

کورتەی ئایینە سەرەتاییەکان تا ئێستا باسکراوە دابەشکردنە ناوەکیەکانی کاتین، ڕاستیەك نیە ئەم جیهانە بگۆڕێت بۆ جیهانێکی ڕێژەیی. بەڵام هەموو ئەوەی باسمان کرد تەنها چەند سفرێکی پشت فاریزەیە ئەگەر ژمارەیەکی ترمان دانەنا لەپاڵیدا. واتە ئەگەر نەچینە ناو بیرۆکەی سەرچاوەی یەزدانیەوە کە ئەو هۆزانە دایان دەنا بە سەرچاوەی ئەو جیهانە یان لە چەند نوسراوێکی تردا خوداوەندێکیان بۆ ئەم جیهانە داناوە لە نارێکیەوە سیتمی جیهانیان گۆڕیوە بۆ ۆسیستمێکی ڕێك و جێگیر. بوونی ئەو خوداوەندە بابەتی گەڕانی ئیمان هێنان و باوەڕهێنان بە ألله دوخاتەڕوو لە ئایینە سەرەتاییەکاندا، ئەمە کێشەیەکە پێویستە تاوتوێ بکرێت زۆر بە چاودرێری و وردیەوە چونکە زۆر نادیارە.

بیرۆکەیەکی بڵاو هەیە ئایینە سەرەتاییەکان بە هاوەڵ دانەر بۆ ألله دادەنێن ئەمە بە تەواوی هەڵە نیە ئەگەر مەبەست لە فرە یەزدانی هێمایەك بێت بۆ ألله ی تاکو تەنها کە پیرۆزیەکەی دەبینرێت لە چەند شوێنێکی پیرۆزدا. بەڵام ئەمە هیچ پەیوەندیەکی نیە بە هاوەڵ دانانەوەکە کتێبی پیرۆز تەورات و ئینجیل لەگەڵی جەنگاون و دژایەتیان کردوە، هەروەا ئەم تێگەیشتنە پێچەوانەی بیرۆکەی بوونی ڕەها نیە فرە خوداوەندی تەنها چەند دەربڕنێکە بۆی.

ولیەم سمیس لە ئینسایکلۆپیدیاکەیدا کە دوانزە بەرگە بەو سەرئەنجامە گەیشتوە کە هەموو هۆزێك ناسرابوو هەتا کاتی نوسینی ئەو کتێبە باوەڕی هەبوو بە خوداوەندی بەدیهێنەر کە گەردون بەڕێوە دەبات. بۆ نمونە هۆزی یوروبا لە ڕۆژئاوای ئەفەریقا ((ئولودیماف)) دەخەنە پلەوپایەی خوداوەندی بچوك نزمتر لە پلەوپایەی ئۆریسا نەتەوەی ئوسانوبا ئیدۆ و ئیبۆ تێکەڵ بەیەکتر ناکەن تەنانەت کاتێك شمدیت کەمێك زیادەڕەوی کرد لەم بابەتەدا، چونکە ئەمە هیچ ناگۆڕێت لە ڕاستی بەابەتەکە چونکە کێشەکە نەتەوەکانی پێشوو بەشێوەیەکی ڕوون داندەنێن بە بونەوەری شکۆدار کە هەڵدەسێت بە ڕێکخستنی کاری خوداوەند، ئیدی ناوێکی بۆ دابنێن یان نا.

ئەم بەڵگەیە پێشنیاری کارێك دەکات وەك ئەو خوداوەندە وەك هەنورمەند نافاجو کارل جورمان ئاماژەی بۆ کردوە:

((هەندێك لە لێکۆڵەرەوان لە ئایینی نافاجو باس لەوە دەکەن شوێنکەوتوانی باوەڕیان بە خوداوەند نەبوو چونکە ناوێکیان بۆ دانەنابوو. لەڕاستیدا بەم جۆرە نیە. بونەوەری شکۆدار ناونەنرابوو چونکە ناتوانێت درکی پێبکرێت. زۆر بەسادەیی هێزێکە درکی پێناکرێت ئەوان دەیانپەرست لەڕێگەی بونەوەرەکانیەوە چونکە بۆ خۆی هەموو شتێکە لەم جیهانە دروستکراوەدا. هەموو شتە جیاوازەکانی جیهان لەناخیدا هەڵگری بەشێکە لە ڕۆحەکەی))(١٣).

هەریەك لە ئێمە ئەگەر ویستی ئەمە ناوبنێت بە یەکتاپەرستی ڕاستیەکە دەمێنێتەوە وێڕای ئەوەی ئایینە سەرەتاییەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر تەنهایی خودا بەشێوازێك کە هاوچەرخ نیە، لە هەندێك حاڵەتدا وا دەردەکەوێت پەردە دادەنێت لەبەردەم ئەم یەکبوونەدا، چونکە هیچ شتێك ناگرێتەوە دەکرێت بەراورد بکرێت بە هیچ شتێك یان بچوێنرێت بە حاڵەتی فرە یەزدانی لەلای ئەوروپیە یەکەمیەکان. هەموو ئەوەی لەم بابەتەدا هەیە کە پیرۆزە یان یەزدانیە یانواکان وەك نەتەوەی سیوکس ناوی دەنێن پێویستی بەوە نیە بیبەستینەوە بە شێوەی هاوچەرخ یان هەستپێکراو بە بونەوەرێکی شکۆدارەوە کە دەکرێت جیابکرێتەوە چونکە لێرەدا شتێك هەیە لەوانەیە لەناوبچێت بەم پێکەوە بەستنە کە بریتیەلە لابردنی پیرۆزی لەو شتانەی کە دوورن لە ألله کە هەتاوە

بە دەرهێنانی و دروستکردنی. ئەمە دەمانبات بۆ ئەو جێگایەی لەوانەیە تاکە سیما و تایبەتمەندی بێت بۆ گرنگی ڕۆحانی بوونی ئایینە سەرەتاییەکان، کە بریتیەلە هزرە هێماییەکەی(١٤).
بینینی شتە هێماییەکانی جیهان ڕەنگدانەوەن بۆ سەرچاوە یەزدانیەکەیان. چ لەڕێگەی دیاریکردنی ئەو سەرچاوەیە بێت یان دیاری نەکرێت، چونکە شتەکانی جیهان کراونەتەوە لەسەر ڕوناکی ئەو. بینینی فیزیایی ئاوی دەریاچەیەك لە بوون پێشکەش دەکات، چونکە هەتا چاو ڕاستی ئەو شتەمان بۆ بگوازێتەوە ئەوا جەستەی ئاو ڕاستیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە وەك لیستێکی سەربەخۆی بوون. بە دەستپێکردن لەم هێڵەوە بیرکرنەوەی هاوچەرخ بەردەوام دەبێت لە ڕێگاکەی بەڵگە دەهێنێتەوە بەوەی ئاو پێکهاتوە لە ئۆکسجین و هایدرۆجین. ئەگەر مەبەست لە شیکردنەوەی هەڵەی ڕۆحی بێت ئەوا دەشێت ئاو مانایەکی خوازراوی بدرێتە پاڵ. وێڕای ئەوە تازەگەری جیاناکرێتەوە لە هیچ پەیوەندیەکی بوون لەنێوان شتە مادییەکان و سەرچاوە ڕۆحیەکەی دا لە سەرو سروشتەوە. لەم تێڕوانینەوە نەتەوە سەرەتاییەکان میتافیزیکیان بە باشتر دەناسی لە خەڵکی ئێستا وێڕای ئەوە ئەم ناسینە بە چەند دەستەواژەیەکی ئەفسانەیی بوو. کاتێك زانایانی مرۆیی ڕایانگەیاند سەبارەت بە نەتەوەی ئەلگۆنکوین هۆزێکی هیندیە سورەکانی باکوری ئەمەریکان: ((هیچ مانیتو واتە ڕۆحێك نەبوو لە دەرەوەی جیهانی بینراودا. )). ئەمە بە سادەیی واتە هەستیان بە ڕاستی ئەوە نەدەکرد سەبارە تبە هزری سەرەتایی، جیهانی دیاردە دەرەکیەکان هیچ بوونێکی سەربەخۆی نەبوو. وەك هاوڕێ بلاك ئیلیك ئەم خاڵەی ڕوون کردوەتەوە بەم شێوەیە:
((زۆر قورسە سەبارەت بەو کەسانەی سەیری ئەم شتە گوازراوانەی هیندیە سورەکان دەکەن لە دەرەوە یان لەڕێگەی ئەقڵی فێرکراو بەشێوەیەکی هاوژەرخ وا تێبگات هیچ شتێك هاوشێوەی دەرکەوتنی خود نیە، بەڵام هەموو شتێك بەسادەیی سێبەرێکی ڕەنگپەڕیوی ڕاستیە. بۆ ئەم هۆکارە هەموو بونەوەرێك بریتیەلە واکان واتە پیرۆز خاوەنی وزەیەکە کە دەگونجێت لەگەڵشکۆداری ڕاستی ڕۆحیدا کە ڕەنگدانەوەیەتی. هیندی سور سادەیە لەبەردەم هەموو جیهانی دروستکراو چونکە هەموو شتە بینراوەکان لە پێش ئەودا دروستکراون، دواتر بەتەمەنترن لە ئەو بەوهۆیەوە شایستەی ڕێزلێگرتنن))(١٥).
لێکۆڵەر لە مۆزیکی کۆن لە بەرزاییەکانی ئاندس لە کۆلۆمبیا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەم خاڵە دەڵێت: ((هەموو کەسە سەرەتاییەکان شتی زۆریان بە کەم زانیوە، بەو مانایەی دیمەنی سروشتی سەبارەت بەوان ڕەنگدانەوەی ڕاستی بڵند بووە پێکهاتبوو لە ڕاستی سروشتی، دەتوانین بڵێین ئەوان شتێکیان زیادکرد بۆ ڕاستی سروشتی کە ڕەهەندێکی ڕۆحی بوو کە مرۆڤی هاوچەرخ لەدەستی داوە))(١٦).
پۆڵ ڕایدن هاوشێوەی هەموو زانایانی مرۆیی هەڵسوکەوتێکی هەلبەی هەبوو کە وای دەزانی هەموو تاکەکانی نەتەوە سەرەتاییەکان سۆڤ بوون، پێداگری کرد لەسەر ئەوە بەتەواوی وەك دەبینین لە ئێستادا: ((دوو شێواز لە هەڵسوکەوتهەیە: پیاوی زانست، بیرمەند، واتە شێوازی ژیانی هاوچەرخ دەتوانین ناوی ببەین بە ئاستی جوڵاو، ئەو شێوازەی پێویستی بە شیکردنەوەیە و چێژ دەردەکات لە جۆرێك لە جۆرەکانی بیرکرنەوە بە تێڕامانەوە. )). وێڕای ئەوە بۆ چرکەیەك ئەوە ڕەت ناکاتەوە سۆفیگەری هەناوی و هێمایی بەکارهێنراون بەشێوازێکی دەماودەم لەلایەن نەتەوە سەرەتاییەکانەوە وەك ئەوەی ئەوروپیەکانی ڕۆژئاوا بەکاری دەهێنن لە ئێستادا. . . ئێمە ناتوانین درك بکەین بە مرۆڤی سەرەتایی و تێی بگەین، هەتا بەتەواوی تێنەگەین لە ماناکانی سۆفیگەری هەناوی و هێمایی کە زۆربەی کات چالباکیەکانی لە خۆ دەگرێت))(١٧).

نمونەیەك بۆئەو شتەی ئاماژەی بۆ دەكات دەتوانین باسی پیاوی ئەو هۆزە بكەین كە ئاماژەی كرد بۆ ئەڵقەكانی تۆڕی جاڵجاڵۆكە نێچیری پێوە دەلكێت، بەڵام تیرەكانی ئەو تۆڕە بەو شێوەیە نین، ئەمە واتە وەك دەڵێت  ئەگەر لە لایەكی تری ژیان ڕێگا ببڕیت ئەوا گەمارۆ دەدرێیتبەڵام ئەگەر جوڵیتەوە بەرەو چەقەكەی ئەوا گەمارۆ نادرێیت.

پێویست ناكات ئەم بەشەی كتێبەكە كۆتایی بێت بەبێ ئەوەی باس لە شێوازێكی تایبەت لە كەسایەتی سەرەتایی بكەین ئەوە شامانە كە هێمایی تێدەپەڕێنێت و درك بە ڕاستیە ڕۆحیەكان دەكات بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ.  دەتوانین شامان وێنابكەین وەك زانایەكی ڕۆحی زانایەك دەناسرێتەوە وەك كەسێكی خاوەن بەهرە و شارەزایی نمونەیی، ئایا لە مۆزیكی مۆزاتدا بێت یان لە شانۆگەری شكسپیر یان لە هەر بابەتێكی تردا هەتا ئەو ڕادەیەی سەر بە پەلیەكی جیاوازە لە مەزنی.  شامانیەكان كاتێك بەرەوڕووی لێدانی جەستەیی و سۆزداری توند دەبونەوە لەژیانی سەرەتاییاندا لەتوانایاندا بوو خۆیان چارەسەر بكەن بە چەند ڕێگایەك كە هێزە دەرونی، تەنانەت هێزە گەردونیەكان هەندێك جار دەكەتە ژێر ڕكێفیانەوە، ئەم هێزانە یەارمەتی دەدان لە مامەڵە كردن لەگەڵ هەریەك لە ڕۆحە پاكەكان و ڕۆحە پیسەكان، وزە ڕادەكێشن لە ڕۆحە پاكەكان و دەجەنگن لەگەڵ ڕۆحە پیسەكان.  شامانیەكان زۆر سەرقاڵن بە كاری چارەسەركردنەوە، وا دەردەكەوێت ئەوان خاوەنی وزەی وەهان یارمەتیان دەدات شتە ونبوەكان بدۆزنەوە.

# کۆتایی

لەنێو ئایینە سەرەتاییەکان و ئایینە مێژووییەکاندا وا دەردەکەوێت کات بە بەرژەوەندی ئایینە مێژوییەکانە، چونکە وێڕای ئەوەی ملیۆنەها کەس هەن لە ئەمڕۆدا دەیانەوێت شێوازی ژیانی سەرەتایی بەردەوام بێت، بەڵام زۆر دوورە ئە شتە ڕوو بدات. شارستانیەت فریودەرە ناوتانین نەتەوە سەرەتاییەکان گەمارۆ بدەین کە هاتا ئێستا ماونەتەوە، وە ڕێگری بکەین لێیان لە گۆڕانیان بەرەو شارستانیەتی نوێ، بۆئەوەی بیپارێزین وەك کەرەستەی توێژینەوە لای زانا مرۆییەکان، یان بۆئەوەی ڕۆڵێکی ڕۆمانسی بگێڕێت وەك یٚمایەك بۆ فیردەوسە ونبووەکەمان. ئەم بابەتەی کۆتایی تەرخان دەکەین بۆ خستنەڕووی چۆنیەتی هەڵسوکەوتی پیشەسازیەکان بەرامبەر سەرەتاییەکان وەك ئەو ماوە کورتەی ماویانە لسەر زەوی.

ئایینە مێژوییەکان تاڕادەیەکی زۆر وازی هێناوە لە مەبەستە موژدەبەریە کۆنەکەیان سەبارەت بە بتپەرستەکان، هەروەها لە کۆندا ئاماژەیان بۆ کراوە بە سوکایەتی پێکردنەوە. بەڵکو ئەگەر هەڵوێستێك هەبێت ئەوا بەندۆڵی کاتژمێر بە پێچەوانەوە دەسوڕێتەوە واتە بە باش باسکردنی ئایینە سەرەتاییەکان. دوای ئەوەی نەتەوە شارستانیەکان ترسان لە بەردەوامی کۆمەڵگە تەکنەلۆژیەکان وە نەبوونی هێزێك بۆ لەناوبردنی دانیشتوانی سەر زەوی، ئەو کەسانە دەستیان کرد بە بیرکردنەوە لە ئەگەری بوونی ڕێگایەکی جیاوازی گەوهەری بۆ ژیان، لەم بوارەدا سەرقاڵ بوون بە نەتەوە سەرەتاییەکانەوە بۆ پاڵپشتیکردن لەم هیوایە. هەستکردن بە تاوان هاتە ناو بابەتەکەوە، بەجۆرێك نەوەی ئەو کەسانەی خاوەن هێزبوون ئەو ڕێگایەیان بینی کە باوباپیرانیان خاوەنی هێز بوون تیایدا، بە سوکایەتی کردن بەو کەسانەی لاواز بوون، چۆن هەستان بە ماڵوێرانکردن و لەناوبردنیان واتە هەستی زۆربەی ئەمریکیە هاوچەرخەکان بە تاوان بەهۆی ئەوەی باوباپیرانیان ئەنجامیان داوە لە پرۆسەی لەناوبردنی بەکۆمەڵی یندیە سورەکان و بە تاڵانبردنی ماڵ و سامانیان. ئەگەر تێبگەین لە بیرکردنەوەی ئەم ڕزگارکەرانە وە بە لەبەرچاوگرتنی هەستی ئەوانەی لاواز بوون و بێ دەسەڵات بوون ئەوا دەپرسینئایا دەکرێت کارەکان بە پێچەوانەوە بەڕێ بکرێن؟ لەڕاستیدا کوشتارگەی هۆلۆکۆست و دواتر سوتاندنیان ڕوداوێکی جیهانی بوو کەتیایدا نازییەکان بە سەرکردایەتی هیتلەر هەستان بە سوتاندنی ملیۆنەها کەس لە جوولەکەکان لە جەنگی جیهانی دووەمدا. . مەبەست لەوەیە ئەوەی کرا بەرامبەر بە دانیشتوانی ڕەسەنی ئوستورالیا هاوشێوەی ئەم کارە بوو.

بەڵام لە ڕووە پۆزەتیڤەکەیەوە دەتوانین ئاماژە بکەین بۆئەوی هەڵە بووین لە هەڵسەنگاندنمان بۆ ئەو نەتەوانە. نەتەوە سەرەتاییەکان نە دڕندەن نە شارستانین بەڵکو لەڕووی دڵڕەقیەوە لە ئێمە باشترن. هەروەها دواکەوتوو نین بەڵکو جیاوازن، لاواز نین بەڵکو تەنهان ئەگەر درکمان کرد بەم کارە، وازمان هێنا لە سوکایەتی کردن بە نەتەوە سەرەتاییەکان دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ساتەوەختی ڕێزگرتن لەو کەسانە چونکە تایبەتمەندیەك هەیە بەشێوەیەکی فراوان ڕوون نەکراوەتەوە.

بێ ئومێدی لە بیرکردنەوە و هەڵەکانی ژیانی پیشەسازی، هروەها ئەوەی بەرهەم دێت لە دابڕانی نێوان مرۆڤ و سروشت، بەروبوومی ئەم دابڕانە، هەموو ئەمە لەلامان دروست بوو وەك کاردانەوەیەك بۆ وێنەی نەتەوە دێرینەکان کە نەتەوەی سروشتین. ئێمە سەیریان دەکەین وەك خوشك و برا ئەوانەی دەژین بەپێی ڕێگەی سروشت و هاوسەنگی سروشت ناشێوێنن وەك نەتەوەیەك لە ڕاوچیەکان کە پەیوەندیان هەیە بە جادوو و ئەفسانەوەئەمانە دوو شتن سەیریان دەکەین وەك چۆن باوباپیرانمان سەیریان کردون. هۆکارێکی قوڵ هەیە

**لەپشت ئاگایی ئەم بیرکردنەوەیەوە. هەموو نەتەوەیەك پێویستی بەوەیە بیرکردنەوەی باشی هەبێت سەبارەت بە هەڵسوکەوتەکانی.**

**ئەوەی هیواخوازین ڕوویدات ئامادەبین بۆ وازهێنان لە بڕیارداری نادروست سەبارە تبە نەتەوە سەرەتاییەکان لەلایەکەوە، لەبارەی پێدانی وێنەیەکی نمونەیی لەلایەکی ترەوە. ئەگەر ئامادە بووین بۆ ئەم کارە لەوانیە بتوانین پێکەوە بژین بە ڕێزگرتن لە یەکتر وەك وتراوە: ((لە کۆتاییدا، لەوانەیە برای ڕاستەقینەی یەکتر بین. )). ئەگەر لەم کارەدا سەرکەتوو بووین هێشتا کات ماوە بۆئەوەی شتێك فێر بین لەو نەتەوە سەرەتاییانەوە. ئەگەر کەموکوڕی ئەو نەتەوانەمان لەلایەك دانا ڕۆمانسی نابینئەگەر جەخت بکەینەوە لەوەی جۆن کولییە وتی: ((ئەوان شتێکیان هەبوو کە جیهان لەدەستی داوە: سۆز و ڕێزگرتنی کۆن ون بوون لە کەسایەتی مرۆیی ئێستادا، لەگەڵ سۆز و ڕێزگرتنی کۆن ونبوون بەرامبەر بە زەوی و تۆڕی ژیان. کاتێك ئەو سۆزەیان پاراست وەکو چرایەکی پیرۆز پێش سەردەمی بەردین. کەواتە پێویستە لەسەرمان کاربکەین زۆر بە دڵسۆزی بۆب تازەکردنەوەی ئەو سۆز و ڕێزگرتنە لە نێوانماندا))**(١٨).

**کتێبە پێشنیازکراوەکان بۆ خوێندنەوەی زیاتر لەبارەی ئەم بەشەوە:**

١-ڕاپۆرتی ڕۆبەرت بیلا لەبارەی پەرەسەندنی ئایینیوە لە کتێبی ورا ءالایمان نمونەییە بۆ باسکردنی نەتەوە سەرەتاییەکان.

٢-کتێبی سام غیل (مابعد البدائی) چەندین هەڵە ڕاستدەکاتەوە کە کراوە بەرامبەر بە نەتەوە سەرەتاییەکان.

٣-٤-سەبارەت بە ئایینە ئەفریقیەکان سەیری کتێبی نویل کینغ الکون الافریقی بکە.

٥-کتێبی جۆزێف ئیبس بروان ((التراث الروحي للهندي الأمريكي)) بە تێروتەسەلی باس لە کلتورە ئایینیەکانی هیندیە ئەمریکیەکان دەکات.

٦-کتێبی فریتشوف شوان ((الشمس المریشه))قوڵایی میتافیزیقی باس دەکات بە وێنە و وشە.

**پەراوێزەکانی نوسەر بۆ بەشی ئایینە سەرەتاییەکان:**

1-tom harisson ،savage civilization

2-h. st. barhe baker african drums

3-w g archer journal of the bihor and orissa research society

4-edward prior and arthur gardner

5-paul radin primitive man as philosopher

٦-چیرۆکێکە نوسەر ئۆرین لیونز بۆی گێڕامەوە.

7-claude levi-strauss ،the savage mnd

8-mircea eliade the sacred and the profane

9-jamake highwater ،the primal mind

10-reported by joseph epes brown ،the supernatural legacy of the american indian

١١-ئەم بەشە لە ڕاپۆرتی ڕۆبەرت بێلا تطور الدینی وەرگیراوە.

12-abridged in english as wilhem schmidt ،the origin and grouth of relegion

13-qouted in joseph epes brown 'modes of contemplation through action

14-as in frithjof schoun's chapter on the symbolic mind'

15-as in frithjof schuon's the symbolic mind

16-francious petiperiee 'the symbolic landscope of the musicas'

17-radin primitive man

18-john coller ،indian of the america.

# شیکردنەوەی کۆتایی

---

پرسیاری ڕوون لێرەدا لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بریتیەلە: ئەو دەرئەنجامە چیە کە دەستمان کەوتوە؟ ئایا هیچ دەرئەنجامێکی سودبەخشمان پێ دەدات؟
شتێکی چاوەڕواننەکراوە ئەگەر هەندێك ڕاستیمان دەست نەکەوتبێت بەدرێژایی ئەم توێژینەوەیە، بۆ نمونە: جۆرەکانی یۆگا کامانەن، شیکردنەوەی بوزا بۆ تێکچونی ژیان چیە، نمونەی باڵای مرۆڤی ڕاستەقینە چیە لەڕوانگەی کونفوشیوسەوە، هێماکانی یینگ/یانگ لە تاوییزمدا بە چ واتایەك دێن، مانای وشەی ئیسلام چیە، ئەو مانایە چیە جوولەکەکان دۆزیانەوە لە ڕووداوی چوونەدەرەوەی بەکۆمەڵ لە میسر، ئەو موژدەیە چی بوو کە مەسیحیە یەکەمینەکانی وروژاند و شادومانی خستە دڵیانەوە. . . بەم جۆرە. گومانی تێدا نیە نابێت گرنگی نەدەین بەم ڕاستیانە، مێشك کاتێك پڕ دەبێت لە زانست و زانیاری لەسەر ئەم ڕاستیانە چێژ دەداتە چیرۆکی ژیان کە لە ژیاندا پێیدا تێپەڕ دەبین. بەڵام ئەمە هەموو شتە داواکراوەکەیە؟.
لەوانەیە چەند پرسیارێکی نوێ دەربکەوێت لە میانەی ئەم خوێندنەوەیەدا، لەوانەیە هەندێك لە پرسیارەکان پێداگری تێدا بێت. لەڕاستیدا سیان لەو پرسیارانە بەرەوڕوومان دەبنەوە. ئەم توێژینەوەی پێ تەواو دەکەین.
پرسیاری یەکەم: چۆن دەتوانین وێنەیەکی تەواو بخەینەڕوو بۆ بەراوردکردن لەنێوان ئەو ئایینانەی لەك کتێبەدا باسمان کردون، ئەو شتە چیە پێی گەیشتوین سەبارەت بە پەیوەندی نێوانیان؟
پرسیاری دووەم: ئایا ئەو ئایینانە بە دەنگێکی بەرز دەدوێن لەبارەی کێشە دیاریکراوە گرنگەکانەوە؟
پرسیاری سێیەم: پێویستە چۆن مامەڵە بکەین لە جیهانێکدا کە چەندین ئایینی تێدا پەیڕەو دەکرێت، ئەمە ئەگەر ئەو کەسە لە بنەڕەتدا پەیڕەوی یەکێك لەو ئایینانە بکات؟

## پەیوەندی نێوان ئایینەکان

ئەوەی پەوەندی هەیە بەم پرسیارەوە: چۆن بەراورد بکەین لەنێوان ئایینەکاندا؟ سێ وەڵام هەیە بۆ ئەم پرسیارە.

وەڵامی یەکەم دەڵێت یەکێك لە ئایینەکانی جیهان بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا باڵا دەستە. لەڕاستیدا لە ئێستادا دوای ئەوەی ماوەی نێوان نەتەوەکان کەمبوەتەوە نزیك بوونەتەوە لە یەکتر وەڵامێکی لەو جۆرەمان نەبیستوە، بەڵام بەهەرحاڵ وەك وەڵامێکی گرنگ دەمێنێتەوە پێویستە بەکەم دانەنرێت.

لەبەشی سەرەتای ئەم کتێبەدا وتەیەکی ئارنۆڵد توینبی باسکرد دەڵێت: ((لەنێو هەموو زیندەوەراندا کەسێك نیە زانیاری تەواوی هەبێت کە یارمەتی بدات بۆئەوەی بە متمانەوە قسە بکات لەبارەی بوون یان نەبوونی ئایینێك کە لەسەروو ئایینەکانی تری جیهانەوە بێت)). ئەم پرسیارە بە کراوەیی دەمێنێتەوە. دروستە ئەم کتێبە شتێکی تێدا نیە کە ئایینێك لە ئایینێکی تر جیابکاتەوە، بەڵام ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی خودی ئەم کتێبە: بەوەی کتێبێکە خۆی دەپارێزێت لە بەراوردکردن لەنێوان ئایینەکاندا لەڕووی بنەماکانیەوە. هیچ شتێك لە توێژینەوەی بەراوردکردن لەنێوان ئایینەکاندا پێویست بەوە ناکات هێڵی کۆتایی ئەم کێبڕکێیە ببڕێت ئەگەر ڕکابەرەکان گەیشتن بەو هێڵە ئەوا هاوشانی یەکترن لەڕووی پلەوپایەوە.

هەڵوێستی دووەم بەپێچەوانەی هەڵوێستی یەکەمە کاتێك جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی هەمووو ئایینەکان لەڕووی بناغەو گەوهەرەوە وەك یەکن. ئەم هەڵوێستە داندەنێت بە بوونی جیاوازیەکاندا بەڵام وا دەبینێت ئەمانە چەند جیاوازیەکی سادەن، بەبەراوردکردن لەگەڵ ڕاستیە مەزنە جێگیرەکاندا کە ئایینەکان لە دەوری کۆ دەبنەوە.

ئەم هەڵوێستە وادەردەکەوێت پێداگری دەکات لەسەر یەکگرتوویی مرۆڤایەتی بەڵام کاتێك بەتێڕامانەوە پشکنینی بۆ دەکەین هەست بەوە دەکەین فریودەرە. چونکە تەنها کاتێك ئەو باسە گشتیانە تێدەپەڕێنین هەست دەکەین بەوەی ئەم هەڵوێستە لە بنەڕەتەوە ڕۆدەچێت کاتێك بەرەو ڕووی ڕاستی جیاوازی نێوان ئایینەکان دەبێتلەو بابەتانەی ئایینەکان سەرەکین، بەتەواوی وەك جیاوازی لەو شتانەی کە شایەنی تاوتوێکردنن. لەسەر ئەم بنەمایە دابەشبوون ڕوویدا لەنێوان بوزییەت و هیندۆسیەتدا، لەسەر هەمان بنەما جیابوونەوە ڕوویدا لەنێوان یەهودییەت و مەسیحییەت و ئیسلامدا. ئەلێکساندەر کامڵ هەوڵیدا لە سەدەی نۆزدەیەمدا پرۆتستانت کۆبکاتەوە لەسەر بناغەی ڕازی بوونیان بە کتێبی پیرۆز وەك سەرچاوەیەك بۆ ئیمان و ڕێکخستن. بەڵام سەرسام بوو کاتێك تێگەیشت لەوەی سەرکردەکانی ئەم دەستەو تاقمانە ئامادەنەبوون بۆ ئەو بنەمای یەکگرتنەی کە بۆ ی پێشنیازکردبوون، کە گرنگترە لەلایان لە بیرکردنەوە جیاوازەکانیان. چی ڕووی دا لە کۆتاییدا؟ ئایا ئەم کارەی کامبڵ کۆتایی هات بە دەرکەوتنی دەستەو تاقمێکی نوێلەسەر لیستی گروپەکانی پڕۆتستانتی، کە بریتیەلە کۆمەڵەی قوتابیانی مەسیح (کڵێسای مەسیحی)!. لەسەر ئاستی جیهانی پەیامی بەهائی ألله بۆ هەمان دەرئەنجام. بەهائیەت بووە ئایینێکی نوێ زیادکرا بۆ ئایینەکانی تری جیهان، وێڕای ئەوەی دروست بوو بۆ یەکخستنی ئایینەکان لەسەر بنەمای بیروباوەڕە هاوبەشەکانیان.

ئەم هەڵوێستی دووەمە هیوایەك بەهێزی دەکات کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە ئایینێکی جیهانی، پێویستە ڕەگەزی مرۆیی وەبیری خۆمان بهێنینەوە لەم هاوکێشە ئایینیەدا. زۆربەی خەڵك ئارەزوی ئەوە دەکەن کە شوێنکەوتویان هەبێت، پێیان باشە کە سەرکردەی کۆمەڵەیەك بن، ئەگەر چی بچوك بێت، نەك سەرکردەی دووەم بن لەناو کۆمەڵەیەکی گەورەدا! ئەمە بۆمان دوپات دەکاتەوە ئەگەر ئایینێکمان بەدەستهێنا ئەمڕۆ ئەوا زۆر بە خێرایی دەبینین بۆ سبەی بووەتە دوو ئایین!

هەڵوێستی سێیەم چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ئایینەکان دەچوێنێت بە پەنجەرەیەکی شوشەی ڕەنگاوڕەنگ بەشەکانی هەڵدەسن بە دابەشکردنی تیشکی خۆر بۆ چەندین ڕەنگی جیاواز. ئەم ڕێگە دەدات بە جیاوازیە بنەڕەتیەکانی نێوان ئایینەکان بەبێ ئەوەی ئاماژە بکات بۆ بایەخی ئەو ئایینە. کاتێك نەتەوەکانی جیهان جیاوازن گەر بەراوردکران بە یەکتر لەڕووی سروشت و هەڵسوکەوتیانەوە، ئەوا دەشێت کاری تێبکرێت لەو ڕێگایەی ڕۆحی تیا دەردەکەوێت، بەجۆرێك دەتوانن سەیری ڕۆح بکەن لە گۆشەنیگای جیاوازەوە بۆ نمونە.
ئەگەر ویستمان ئەم بابەتە دەربڕین بە زمانی وەحیی، دەڵێین بۆئەوەی خەڵك بتوانێت گوێیان لە ألله بێت و تێی بگەن پێویستە وەحیی یەزدانی بە هەمان دەربڕین بێت کە گوێگرەکانی بەکاری دەهێنن. لێرەدا قورئان بەڵگەیەکی زۆر نزیکە لەم بیرۆکەیەوە، دەڵێت: ((وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ فَيُضِلُّ اللّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿إبراهيم: ٤﴾)).
دوای ئەوەی سێ ڕێگای ڕوونمان خستەڕوو بۆ باسکردنی پەیوەندی نێوان ئایینەکان. ئێستا دەچینە سەر خستنەڕووی ئەوەی ئایینەکان بەشێوەی کۆمەڵ بیڵێن بە جیهان بەگشتی.

## یاسای دانایی ئایینی

لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا پرسیارێکمان خستەڕوو کە کرابوو لەلایەن ت. س. ئیلیوت: ((کوا ئەو زانینەی ونبوو لەنێو زانیاریەکاندا؟ کوا ئەو داناییەی ونبووە لەنێو زانیندا؟))
تەنانەت لەپێش ئەمە لە دەستپێکی کتێبەکەدا وتەکانی ئی. ف. ئوماخەر دەخوێنینەوە کە دەڵێت: ((ئێمە پێویستمانە بە ئازایەتیە بۆ ئەوەی بگەڕینەوە سەر یاسای دانایی مرۆیی بۆئەوەی سودیان لێوەربگرین)). ئەو یاسایانە بوونە بابەتی ئەم کتێبەمان، کەواتە ئەو داناییە چیە پێشکەش بە جیهانی دەکات؟(١)
لە کێشە کلتوریەکەدا وادانراوە ئەم یاسا ئایینیانە سروشتی کۆتایی ڕاستی دەخەنەڕوو. بەڵام لە سەدەی شانزە و حەڤدەی زایینیدا زانست دەستی کردبە دروستکردنی گومان لەبارەی ئەم بابەتەوە، دەڵێت هەموو ئەوەی لە توانای کتێبە پیرۆزەکاندایە بریتیەلە جەختکردنەوەی تایبەت بەخۆی و بەرگری کردن لێی، لەکاتێکدا تاقیکردنەوەکان دەتوانێت بیردۆزە زانستیەکان بەسلمێنێت. بەڵام دوای سێ سەدە لە شڵەژان و ناکۆکی لە بیروڕادا لەبارەی ئەم خاڵەوە، ئێستا دەبینین ئەم بەڵگانە چەند تایبەتمەندیەکی بەنرخن بۆ ڕاستی چونکە لە مستی زانست دێتە دەرەوە وەك هاتنەدەرەوەی ئاو لە کونەکانی تۆڕی ڕاوچی.
کەواتە دەتوانین ڕووبکەینە کوێ بۆ گەیشتن بە هیدایەت لەبارەی شتە گرنگەکانی ژیان؟ درکپێکردنکمان ناتوانێت یارممەتیدەر بێت لەم بوارەدا، بۆ جاری دووەم دەرگاکە دەکاتەوە بۆ یاساکانی دانایی. پێکهاتەی ئەم یاسایانە هەمیشە دانایی نین. زانستی نوێی کۆزمۆلۆجیا پێویستە دوبارە هەڵسەنگاندن بکات بی هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتیەکان وەك پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە نێر و مێ لەژێر ڕوناکی پەیوەندی بۆ دادپەروەری کۆمەڵایەتی.
بەڵام ئەگەر هەستاین بە ڕێکخستنی کلتوری ئایینەکانی جیهان چەند ڕاستیەکی لێ دەردەهێنین لەبارەی ڕاستی و چۆنیەتی مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵیدا لە ژیاندا، ئەوکاتە ئەو دەرئەنجامانە وەك دانایی وان بۆ مرۆڤایەتی.
تایبەتمەندیەکانی دانایی کامانەن؟ لە خشتەی ڕەوشتە بەرزەکاندا دە ڕاسپاردەکە چیرۆکی ڕۆشنبیری هاوبەشمان پێ ڕادەگەیەنن. پێویستە لەسەرمان خۆمان بپارێزین لە کوشتن و دزی و درۆ و داوێنپیسی زیناکردن. ئەمە کەمترین سنوری ڕێنیشاندانە بەڵام وێڕای ئەوە کەم نیە، دەتوانین دەرك بکەین بە گرنگیەکەی ئەگەر تەنها بیرمان کردەوە لەوە جیهان چەندە باشتر دەبێت ئەگەر هەموو خەڵك ڕێزیان گرت لەو ڕاسپاردانە و پابەندبوون پێوەی.
ئەگەر دەستمان پێکرد لەم یاسا ئەخلاقیەوە بۆ شێوازی مرۆڤ کە پێویستە لەسەر نەتەوەکان تێبکۆشێت بۆئەوەی پێی بگەن ئەوا بەرەوڕووی سیفەتە باشەکان دەبینەوە کە یاساکانی دانایی نیشانمان دەدەن کە لە بنەڕەتدا سیانن: بێ فیزی، چاکە، ڕاستگۆیی. مانای بێ فیزی سوکایەتی کردن نیە بە خود بەڵکو توانینی مرۆڤە بۆئەوەی خۆی وەك خەڵکی ببینێت و خۆی لەوان بە گەورەتر نەزانێت. چاکە دەستپێدەکات بەوەی چیمان بۆ خۆمان پێ خۆش بێت بۆئەوانی تر بە هەمان شێوە بێت. ڕاستگۆیی واتا وتنی ڕاستیەکان و نەشاردنەوەیان. کاتێك مرۆڤ ژیانی دەگونجێنێت لەگەڵ ڕاستی شتەکان بەو جۆرەی کە هەیە ئەوا بە خۆشی دەژی.
بەرزڕاگرتنی ئایینە ئاسمانیەکان بەشێکە لەو کارە چاکانە، بەڵام لەگەڵ پێویستی زاڵبوون بەسەر بەربەستەکاندا. بوزا ئەو بەربەستانە ناودەبات بە: ((چاوچنۆکی، ڕقوکینە، خەیاڵ)) سێژەهرەکە. بەو بڕەی مرۆڤ ئەو ژەهرانە لاببات ئەوکاتە خۆڕسکانە بێفیزی، چاکە، ڕاستگۆیی جێگای دەگرێتەوە. تاوییەتی فەلسەفی بەئاگایە بۆ مانای ڕاستەقینەی هێز و چالاکی.

کاتێك دەچینەسەر تێڕوانینی یاساکانی دانایی بۆ سروشتی شتەکان، ئەوا سێ خاڵ هەیە پێویستە جێبەجێ بکرێن لەم بوارەدا.

ئایینەکان دەستپێدەکەن بە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی ئەگەر توانیمان وێنەکە ببینین بە ڕوونی، ئەوا بە کاملتر دەیبینینژیان تێڕوانینێکی گشتیمان پێنادات، بەڵکو هەموو ئەوەی دەیبینین پەرتکراو و ناڕێکە، هەروەها گرنگیپێدانمان دەشێوێنێت. کاتێك سەریی شتەکان دەکەین ژیان وەك پارچە قوماشێکی ڕەنگاو دێتەبەرچاوکاتێك لە دیوە هەڵەکەیەوە سەیری دەکەین، بەشێوەیەکی گشتی ناڕێکە.

لە ڕوانگەی مرۆڤایەتیەوە یاساکانی دانایی هەوڵ دەدەن بۆ تێگەیشتن لە مانای تەواوی ژیان. کاتێك جوانی و گونجاندن دروستبێت لەڕێگەی پێکەوە بەستنی پارچەکانی قوماشەکە ئەوا دیزاینەکە مانا دەبەخشێت بەو پارچە قوماشانە که ئێمە دەرکمان پێ نەکردوە. دەتوانین بڵێین ئەمە چەند بەشێکی وێنەیەکە وە بریتیەلە کرۆکی ئەو شتەی ئایین دەیخوازێت. بابەتی پێکەوە بەستن و یەکگرتن بریتیە لەو تامو چێژەی کەلە دەربڕینەکانیدایە.

ئەگەر دیزاینێکی گەورە هەبێت بۆ هەموو شتەکان ئەو کاتە کاملترن بەڵکو جوانتر دەیبینین. بە نمونە هێنانەوەی پارچە قوماشەکە وەك هێمایەکە بۆ یەکگرتویی جیهان، ئەوا زانستی فیزیای گەردونی بەکاردەهێنین بۆ دەربڕینی ئەم خاڵە: بایەخ و چاکی ڕاستی چونکە ئەگەر گەوهەری زانستی گەردونناسی وادابنێت گەردون گەورەترە لەوەی مرۆڤ بتوانێت هەستی پێبکات. تی ئان، تاو، براهمان، نیرڤانا، god، اللّٰه: هەموویان هەڵگری ناسنامەیەکن بوونی کاملی ڕەها. ئەمە وا دەکات لە یاساکانی دانایی چالاك بن لە دەرونی مرۆڤایەتیدا، چونکە یەکگرتوویی گەردون وادەکات ئێمە ببینە بەشێك لە گەردون، دواتر بەهاکەی هەڵدەقوڵێت لە گەردوندا.

گەورەیی و مەزنی دەرونی مرۆڤایەتی وەك ئایینەکانی جیهان باسی دەکەن لێرەدا ئەمانە دێنێتە بیرمان ئاتمان، سروشتی بوزا یەکێك لە وتەکانی قەشەیەك دێتە بیرمان کە فریشتەکان ڕێزیان لە مرۆڤ ناوە.

لەپشت یەکگرتویی شتەکانەوە یاساکانی داناییدەڵێن: ڕاستی پڕە لە ئاڵۆزی. ئێمە بە ئاڵۆزی لەدایك دەبین، لەگەڵ ئاڵۆزیەکان دەژین، بە ئاڵۆزی و نادیاری دەمرین، پێویستە لەسەرمان بۆ جاری دووەم وشەی نادیاری ڕزگار بکەین بەجۆرێك وشەی ئاڵۆزی بەراوردکراوە بە تاوانەکانی کوشتن کە ئەمانە لەبنەڕەتدا نادیار نین.

ئەوی تا ئێستا پێی گەیشتوین کاملترە بەهۆی خاڵە هاوبەشەکانی یاساکانی داناییەوە. سەبارەت بە هەڵسوکەوتی ئەخلاقی و کارە چاکەکانی مرۆڤایەتی. لە ناوەندی ژیانی ئاییندا شێوازێکی تایبەت هەیە بە شادومانی و کامەرانی کۆتایی دڵخۆشکەر دادەنێت بۆ سەرەتا دڵتەزێنەکان. لە ژیانی ئێستادا چەند هێمایەك هەن بۆ شادی، بەڵام بەبەردەوامی ناتوانین ئەم شادیە بهێڵینەوە. ئایین پێمان ڕادەگەیەنێت هەلێك هەیە لەبەردەم مرۆڤدا بۆئەوەی بگات بە ڕوناکی جێگیر و بەشێوەیەکی بەردەوام.

بەڵام جیهان بە مانا فراوانەکەی ڕزای نیە بەم تێڕوانینە کەواتە پێویستە لەسەرمان چی بکەین؟ چۆن دەتوانین هەڵسەکەوت بکەین لە جیهاندا کە چەندین ئایینی تێدایە؟ چارەسەر بریتیەلە گوێگرتن.

## گوێگرتن

ئەگەر یەکێك لە یاساکانی دانایی سەرنجمان ڕابکێشێت ئەوا گوێی بۆ دەگرین، بەشێوەیەکی کوێرانە نا بەڵکو بەڕۆحێکی ڕەخنەگرانەوە بەڵام ڕەخنەی دروستکەر نەك ڕوخێنەر، چونکە ڕوداوە نوێکان فێری ئەرکە نوێکانمان دەکەن، چونکە هەموو شتێك کۆتایی هەیە و سنوردارە و بیٚ کەمو کوڕی نیە لە هەندێك لایەنەوە.
وێڕای ئەوە ئێمە گویٚ دەگرین بۆ یاسای دانایی، تێدەگەین ئەمە ڕاستیەك لەخۆ دەگرێتدەکرێت پێی هەستین لە ماوەی ژیاندا.
بەڵام گوێناگرین لە بیروباوەڕ و ئایینەکانی تر، بۆ نمونە عیلمانیەکان نائایینیەکان گوێیان بۆ ناگرین، چونکە ئەم سەردەمە وامان لیٚ داوا دەکات. بەو هۆیەوە کۆمەڵگەی ئەمڕۆ ناتوانێت بەپێی نەریتی تاك بێت چونکە جیهان بووەتە گوندێکی بچوك. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بچوکتر دەبێتەوە، بەجۆرێك تێگەیشتن تاکە شوێن دەبێت کە ئاشتی تیادا بەرقەرارە. ئێمەی مرۆڤ ئامادە نین بۆ بڕینی دوریەکان کە زانست دروستی کردون. کیٚ لە ئێمە لە ئێستادا ڕازیە بە یەکسانی تەواو لەنێوان هەموو نەتەوەکاندا؟ کیٚ لە ئێمە هەست بەوە ناکات دەیەوێت میلێك ببڕێت بۆئەوەی سەربکەوێت بەسەر نەتەوەیەکی تری بێگانەدا؟
هەندێك لە ئێمە لە ژیانی بەردەوام بووە بەدرێژایی ئەم سەدەیەسەدەی بیستەم کە دادەنرێت بە خوێناوی ترین سەدە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەگەر بمانەوێت ئەم خوێن ڕشتنە بە ژانی دوبارە لەدایکبوونەوە دابنێین ئەوا پێویستە لەسەرمان هاوشانی پەرەسەندنی زانستی بڕۆین، کاربکەین بۆ چەسپاندنی ئاشتەوایی، ئاشتیەك لەسەر بنەمای تێگەیشتنی ئاڵوگۆڕکراو. چونکە تێگەیشتن دەبێتەهۆی ڕێزگرتنی تاکەکان لە یەکتر، ڕێزگرتن ڕێگاخۆشکەرە بۆ رخۆشەویستی کە تاکە هێزە دەتوانێت ترس و گومانەکان بڕەوێنێتەوە، والە خەڵك دەکات لەسەر ئەم زەویە کاربکەن بۆ خزمەتکردنی یەکتر.
کەواتە تێگەیشتن دەتوانێت بمانبات بۆ خۆشەویستی، بە پێچەوانەوە دروستە واتە ئەمە پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕکراوە. بۆیە پێویستە لەسەرمان گوێگر بین بۆئەوەی تێبگەین، بەڵام پێویستە بە دەستپێکردن بە خۆشەویستی گوێبگرین هەتا تێبگەین لە هەموو یاساکانی دانایی، چونکە ئەستەمە یەکمان خۆشبوێت بەبێئەوەی بەئاگاداریەوە گویٚ بۆ یەکتر بگرین. ئەگەر ڕاستگۆ بین لەگەڵ ئەم ئایینانەدا ئەوا پێویستە لەسەرمان بە ڕاستگۆیانە گوێبگرین بۆ ئەوانی تر، بەتەواوی وەك هیواداریین کە ئەوانی تر بەهەمان شێوە گوێمان بۆ بگرن.
تۆماس میرتون ئەم خاڵەی باسکردوە: ((ألله لە سیٚ شوێندا لەگەڵماندا دەدوێت: لە کتێبە پیرۆزەکانەوە، لە ناخماندا، لەدەنگی بێگانەکاندا)). پێویستە خاوەنی لێبوردن بین بە هاوشێوەی بەخشین.
عیسا (علیە الصلاە والسلام)دەفەرمێت: ((تەنانەت ئەو کەسەی گەیشتوە بە بەرزترین لوتکە، پێویستە بەردەوام بێت لە فێربوون و ئاگاداری خۆی بێت. ))
ئەگەر لە ئایینەکانی ترەوە وتەی هاوشێوەی ئەمە باس نەکەین لەبارەی ئەم خاڵەوە هیچ هۆکارێکی لە پشتەوە نیە تەنها لەبەرئەوە وشەکان دوبارە دەبنەوە، چونکە هەمووومان هەمان کارمان پێباشە.

کۆتایی هات

**پەراوێزەکانی نوسەر لەبارەی بەشی شیکردنەوەی کۆتایی**

١. فەلسەفەی کلتوری شانبەشانی ئایین ڕێگای بڕیوە، بەڵام تازەگەری لەیەکی جیاکردونەتەوە، بۆیە پێویستە ئاماژە بکەین بۆ شوماخەر هەتا سەردەمی دیکارت دەچێتە ناو پێکهاتەی یاساکانی دانایی ئایینەکان، سەیری کتێبەکەی بکە دلیل الحیران وە هەردو ڕاپۆرتی الفلسفة الغربیة دیانة عظیمة و السامی والمقدس لە کتێبی ئالان ئۆلسۆن و لیروری رونر.

پاشکۆ

## وەرگێڕانی گرنگترین ئەو کەسانەی نوسەر باسی کردون و وتەکانی بەکارهێناون وەك بەڵگە(١)

١. ئەبراهام هیشیل abraham joshua heschel (١٩٠٧–١٩٧٢) حاخامێکی جوولەکەی ئەمریکیە. لە ڕەچەڵەکدا پۆڵەندیە. لەدایکبووە لە وارسۆ بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێناوە لە فەلسەفەدا لە زانکۆی بەرلین. لەوێ خوێندویەتی دواتر چوەتە زانکۆی فڕانکفۆرت. دواتر نازیەکان دەریان کردوە لە پۆڵەندا ئنجا لە وارسۆ خوێندی دواتر چوە لەندەن. دواجار کۆچی کرد بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەساڵی ١٩٤٠، لەوێ بوو بە مامۆستای کۆلێژی عیبری یەکگرتو لە کینتاکی لە ویلایەتی ئۆهایۆ، دواتر بووە پڕۆفیسۆر لە بواری ڕەوشتی یەهودییەت و تەسەوفی یەهودی لە پەیمانگایەکی یەهودی بۆ ئامادەکردنی پیاوانی ئایینی لە شاری نیویۆرك. زانا و فەیلەسوف و پیاوێکی ئایینی بوو ناوبانگی پەیداکرد بەهۆی خستنەڕووی هەستەکانی تەسەوفی یەهودی و فەلسەفەی ئایین، بەۆی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانیەوە. هەوڵی دا بیروباوەڕب هاوسەردەمەکانی بجوڵێنێت کەماددە دڵەکانی ڕەق کردبوون، بە پشتبەستن بە سەرچاوە کلتوریەکانی ئایینی جوولەکە لەم بوارەدا ژمارەیەك کتێبی نوسی: (الأرض ملك ألله) ١٩٥٠ (بحث الأنسان عن ألله: دراسة في صلاة رمزية) ١٩٥٤، (ألله يبحث عن الأنسان: فلسفة يهودية) ١٩٥٦ (الأنبياء) ١٩٦٢. گرنگیپێدانە ئایینیەکانی ڕەنگیداوەتەوە لە بزوتنەوەی مافە شارستانیەکانی هاوڵاتی ئەمریکی، بزوتنەوەی دژ بە جەنگ. لە زۆربەی کۆڕەکان لەبارەی گفتوگۆر نیوّنا ئایینەکان.

٢. ئارسەر شۆپنهاوەر arthur schopenhauer (١٧٨٨–١٨٦٠) فەیلەسوفێکی ئەڵمانیە ناسراوە بە فەلسەفە ڕەشبینانەکەی. زۆر گرنگی داوە بە توێژینەوە لەسەر فەلسەفەی هیندۆسی و بوزی و عیرفانی هەناوی لە کتێبەکەیدا العالم كأرادە و فكرە وەك چەند ڕەگەزێك بۆ فەلسەفە ڕەشبینانەکەی. بەجۆرێك ڕۆیشتوە بۆ ڕاستی هەوانی بۆ هەموو دیاردەکانی مادیی بوون کە بریتیەلە ویست و ئیرادە، ڕاستی ڕەها بریتیەلە ئیرادەی گەردونی گشتگیر. هۆکاری ئازارەکانی مرۆڤ بریتیەلە ئیرادەی کە پەلکێشی دەکات بۆ تێرکردنی ئارەزوەکانی لە کۆمەڵە شتێکدا کە نابێتە هۆی تێربوونی لەڕاستیدا، بۆیە ئارەزوی تێربوون دەبێتەهۆی گەڕانەوە بۆ لەدایکبوون، ژانی دوبارە لەدایکبوونەوە، مەبەست لە ڕزگاربوون و دەستگرتن بەسەر ئەقڵدا هەتا دەوەستێت و هەموو ئارەزوەکان دەمرن لە ئیرادەکەیدا، ئەمە کاریگەریەکەی بەهۆی فەلسەفەی بوزیەوەیە. سەرکەوتو بوو لە خستنەڕووی بەراوردکردنی بە مەسیحیەت ئەم بیرکردنەوانەی کاریگەر بوون لەسەر فەیلەسوفی ئەڵمانی نیتچە.

٣. ئارنۆڵد جۆزێف توینبی arnold joseph toynbee(١٨٨٩–١٩٧٥): فەیلەسوف و مێژونوسی بەریتانی. خوێندویەتی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. ناوبانگی پەیداکرد بە بیرۆزەکەی لەبارەی ڕابردوو کە تیایدا باس لە شارستانیەتە یەکلەدوای یەکەکان دەکات. بیردۆزی (ڕکابەری و وەڵامدانەوە) التحدي و الأستجابة لە کتێبەکەیدا دراسە للتأريخ کە پێکهاتوە لە دوانزە بەرگ. پوختەکەی ئەمەیە شارستانیەت دروست نابێت هەتا ژینگەکە لەبار نەبێت بۆ ڕکابەری نەتەوەیەکی دیاریکراو، تەنها کاتێك نەتەوەیەك ئامادەکاری کردوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم ڕکابەریە، شارستانیەتەکان دەڕوخێن کاتێك بلیمەتی بەرەو نەمان دەچێت. کاری کردوە لە وەزارەتی ناوخۆی بەریتانی لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم و جەنگی جیهانی دووەمدا وە بووە نوێنەری ئینگلتەرا لە وتووێژەکانی ئاشتی دا کە ڕووی دا لەدوای هەریەك لەو دوو جەنگە. هاوسەردەمەکانی سەرسام کرد بەهۆی قووڵی شیکردنەوەکانی و فەلسەفە کۆمەڵایەتیەکەی. بەڵام هەندێکیان ڕەخنەیان لێگرت بەهۆی بانگهێشتکردنی بۆ نێگەری لەسەر بنەمای ئایین.

٤. ئەفلاتون plotinus: (٢٠٥؟–٢٧٠؟ز. ) فەیلەسوفێکی ڕۆمانیە. لەدایکبووە لە ئەسیوت/میسر. لەماوەی ملکەچی بۆ حوکمڕانی ڕۆمانی. دادەنرێت بە یەکێك لە نوێنەرانی ئەفلاتونیەتی نوێکراوە noe-platonism.

١. ئەو سەرچاوانەی ئەم وەرگێرانانەی لێ وەرگیراوە بریتیەلە: ئینسایکلۆپیدیای ئینکارتای ئەمریکی، ساڵی ٢٠٠٤، ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی ٢٠٠٣، ئینسایکلۆپیدیای فەلسەفی و مورد.

لە ئیسکەندەریە خوێندنی تەوا کردوە، دواتر ڕۆیشتوە بۆ ڕۆما، نوسیویەتی لەبارەی دانایی فیساغۆرسی و ئەفلاتۆنیەتەوە. کاریگەریەکەی لەسەر گوێگرانی زۆر بەهێز بووە هەتا ڕادەیەك هەندێکیان تەواوی سامانەکەی دەدا بە هەژارەکان و کۆیلەك
انی ئازاد دەکردئەوەی لە ژیانی ماوە بۆ خوداپەرستی تەرخان دەکرد. ئەفلاتون نەخشەی دانا بۆ بنیاتنانی کومنولسی شیوعی لەسەر نمونەی دەوڵەتی ئەفلاتون، بەڵام ئەم پرۆژەیە شکستی هێنا بەهۆی دژایەتی کردنی ڕاوێژکارەکانی، لە کۆتاییدا ئەفلاتون وتی مرۆڤ پێکهاتوە لە دوو ڕەگەز یەکێکیان سەر بە جیهانی ماددەیە و ئەوی تر سەر بە جیهانی ئەقڵی گشتیە. کاتێك ماددە سەرچاوەی هەموو جەنگەکان بێت ئەوا پێویستە لەسەر مرۆڤ هەوڵبدات بۆ دەرباز بوون لە ڕەگەزە ماددیەکەی لەڕێگەی تێڕامانەوە بۆ ئەوەی ڕەگەزە ڕۆحانیەکەی بگاتە ئاستی یەکگرتنی تەسەوفی لەگەڵ اللە.
٥. ئەلبێرت شویتزر albert schweitzer(١٨٧٥–١٩٦٥) لاهوتی و فەلسەفی و مۆزیکژەنی ئەڵمانی. لەدایکبوو لە باوکێکی کاهن، لاهوت و مۆزیکی خوێند چەندین پارچە مۆزیکی دانا. لە تەمەنی سی ساڵیدالە لاهوت و مۆزیکەوە چوە سەر خوێندنی زانستی پزیشکی مرۆییەوە پسپۆڕی بەدەستهێنا لە نەشتەرگەریدا بۆئەوەی خزمەتی خەڵك بکات لەم بوارەدا، وەك پزیشکێکی تەشتەرگەری چووە گابون لە ئەفەریقا لەمیانەی کارێکی موژدەریداتەبشیری بۆ گەیاندنی ئایینی مەسیحی لەشاری لامبرانی نەخۆشخانەیەکی دروستکرد هەزاران نەخۆشی تیادا چارەسەر کرد. لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا خۆی و خێزانەکەی زیندانی کران کە پەرستارێکی ئەڵمانی بوو لە یەکێك لە سەربازگە فەڕەنسیەکاندا، لەوێدا دوو کتێبی نوسیانحطاط الحظارة و اعادة احیائها و الحضارة و الأخلاق. بەجۆرێك سەیری شارستانیەتی ڕۆژئاوای دەکرد کەلە حاڵەتی ڕۆرچووندایە بەهۆی نەمانی خۆشەویستیەوە، زیندوکردنەوەی دەکرێت ئەگەر مرۆڤ گەشەی کرد لە ڕێزگرتن لە ژیانی مرۆڤایەتی، بەزەیی و خۆشەویستی بۆ هەموو شێوازەکانی ژیان. لەساڵی ١٩٥٢ خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنا بۆ ئاشتی، لە هەموو ئەوروپا ناوبانگی دەرکرد وەك فەیلەسوفێکی مرۆڤدۆست و زانایەکی مۆزیك. لە ئەفریقا کۆچی دوایی کرد لەساڵی ١٩٦٥ لە شاری لامبرانی.
٦. ئەلدوس هکسلی aldous huxley(١٨٩٤–١٩٦٣): ڕۆماننوس و شاعیر و نوسەر و ڕەخنەگری ئینگلیزی. خاوەنی زیاتر لە ٤٥ کتێبە. هێرشی کردە سەر ماددی بوونی زانستی کە هەڕەشەیە بۆسەر بەا مرۆڤایەتیەکان بە گەورەترین مەترسی. سۆفیگەری ڕۆژهەڵات کاریگەر بووە لەسەری لە دوا ئاستەکانی ژیانی ئەدەبی.
ناوبانگی دەرکرد بەهۆی ڕۆمانەکەی (العالم الجدید الشجاع) brave new world ساڵی ١٩٣٢ تیایدا بە شێوازێکی گاڵتەئامێز کۆمەڵگەی داهاتوو وێنادەکات وەك گەردەلولێك.
٧. ئەلفرێد نۆرپ وایتهێد alfred north whitehead(١٨٦١–١٩٤٧): زانایەکی بەریتانیە لە بیرکاری و میتافیزیقیادا. دادەنرێت بە یەکێك لە مەزنترین فەیلەسوفەکانی سەدەی بیستەم. خوێدویەتی لە کۆلێژی سالوس لە زانکۆی کامبردج دواتر بووە مامۆستای بیرکاری لەماوەی ساڵەکانی ١٨٨٥–١٩١١، دواتر میکانیکی

خوێند لە زانکۆی لەندەن هەتا ساڵی ١٩٢٤، دواتر چووە ویلایەتە یەکگرتوەکان بۆئەوەی ببێتە پرۆفیسۆری فەلسەفە لە زانکۆی هارڤارد دواتر بووە مامۆستای فەخری لەوێ مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد. وێڕای ئەوە ئەلفرێد زانیاری هەبوو لە فەلسەفە و ئەدەبدا. بەجۆرێك لەگەڵ برتراند راسل کتێبێبی بنەماکانی بیرکاری نوسی لە سێ بەرگدا. هەستا بە شیکردنەوەی فەلسەفی دوو کتێبی نوسی لەمبارەیەوە مبادئ المعرفة الطبیعیة و مفهوم الطبیعة. لە کۆتایی ژیانیدا فەلسەفەکەی تەرخان کرد بۆ میتافیزیقیا و ئایین، چەند کتێبێکی نوسی لەم بوارەدا العلم و العصر الحدیث دین في حالة الأحداث الرمزیة: معناها و آثارها وظیفة العقل أنماط التفکیر، هتد. . .

٨. ئیدمۆن ویلسۆن edmund wilson (١٨٩٥–١٩٧٢) نوسەر و ڕەخنەگرێکی ئەمریکیە زۆربەیان دایدەنێن بە سەرداری ئەدەبی ئەمریکی هاوچەرخ. لەدیکبووە لە ویلایەتی نیوجێرسی لە زانکۆی برینستون دواتر بووە سەرنوسەری کۆمەڵە گۆڤارێك. یەکەم کاری کتێبی قلعة آکسل کە بریتیەلە شیکارێکی ڕەخنەگرانە بۆ کاریگەری لەسەر شاعیری ئینگلیزی ت. س. ئیلیۆت. کتێبی جۆراوجۆر لە کورتە چیرۆك بۆ ڕۆمان و شیعر و دراما و مێژوو و وەرگێڕانەکان. بەشێوەیەکی سەرەکی ڕەخنەگرێکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیە.

٩. ئیمیرسۆن: ناوی تەوای رالف والدو ئیمیرسۆن ralph waldo emerson(١٨٠٣–١٨٨٢) نوسەر و شاعیری ئەمریکی، سەرۆکی بزوتنەوەی فەلسەفی بڵندە transcendentalism. لە بۆستن لەدایکبووە باوباپیرانی کاهنی پرۆتستانت بون، کاریگەر بوو بە خوێندنگا فکریەکان وە ڕۆمانسی ئینگلیزی، ئەفلاتونی نوێ، فەلسەفەی هیندۆسی. لاهوتی خوێند بۆ ماوەیەکی کورت بووە سەرۆکی کڵێسای یەکتاپەرستی لە بۆستن. بەناوبانگترین کتێبەکانی الطبیعة ١٨٣٦ کە فەلسەفەکەی تیادا ڕونکردوەتەوە. هەروەها چالاکوانێکی بەهێز بوو لە بزوتنەوەی نەهێشتنی کۆیلایەتی لە ئەمەریکا.

١٠. برتراند راسل bertrand russel (١٨٧٢–١٩٧٠) زانستی بیرکاری و فەیلەسوفی بەریتانی، مرۆڤدۆست، بانگخواز بۆ ئیسلام. ئەم کەسە لەگەڵ ئەلفرێد وایتهێد زانستی بۆژیکیان دانا لە دەرئەنجامدا ئەم کتێبانەی نوسی الدین و العلم و تأریخ الفلسفه الغربیه. خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنا لە ئەدەبدا لەساڵی ١٩٥٠ نازناوی پاڵەوانی مرۆڤایەتی و ئازادی ڕادەربڕین بەدەستهێنا. لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردودا سەرکردایەتی بزوتنەوەیەکی کرد بۆ نەهێشتنی چەکی ئەتۆمی لە بەریتانیا. زیندانی کرا دوای بەشداری کردنی لە یەکێك لە خۆپیشاندانەکان لە دژی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی وێڕای ئەوەیتەمەنی لەو کاتەدا ٨٩ ساڵی تێپەڕاندبوو.

١١. بنجامین فرانکلین (١٧٠٦–١٧٩٠): سیاسەتمەدار و زانا و داهێنەر و نوسەری ئەمریکی، دادەنرێن بە دیارترین ڕوخسارەکانی مێژووی ئەمریکی. تێکۆشا بۆ سەربەخۆیی و بەشداربوو لە دانانی دەستوری ئەمریکی. چەندین تاقیکردنەوەی ئەوەنجامدا لە بواری کارەبادا، دژە هەورەبروسکەی داهێنا. ژیاننامەی خۆی نوسی بە ناونیشانی سیرة الذاتیة.

١٢. ت. س. ئیلیوت (١٨٨٨–١٩٦٥): نوسەری ئەمریکی. دادەنرێت بە یەکێك لە مەزنترین شاعیرەکانی ئەمریکا لە سەدەی بیستەمدا. شیعرە بەناوبانگەکەی الأرض البوار کاریگەر بوو لەسەر کۆمەڵگە لەو سەردەمەدا. ئیلیوت درامایەکی نوسی لەڕێگەی شانۆکانیەوە هەوڵیداوە بۆ دوبارە زیندوکردنەوەی درامای شیعری لەلای حەماوەرەکەی. خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنا لە ئەدەبدا.

١٣. تولستوی (١٨٢٨–١٩١٠): ڕماننوس و فەیلەسوف و چاکسازی کۆمەڵایەتی ڕوسی. دادەنرێت بە یەکێك لە مەزنترین ڕۆماننوسەکانی جیهان، دیارترین ڕۆمانەکانی الحرب و السلم أنا کارینینا اعتراف البعث.

**١٤. توماس ئەکینوس (١٢٢٥–١٢٧٤): قەشە و فەیلەسوف و لاهوتی وئیتالی. پەیوەندی کرد بە کلێساوە لە ساڵی ١٢٤٣ دواتر چوە پاریس بووە قوتابی قەشە ئەلبێرت. دواتر بووە مامۆستا لە زانکۆی پاریس کاریگەرترین کتێبەکانی الخلاصە اللاهوتیە.**

**١٥. توماس ئی کیمبیس (١٣٨٠؟–١٤٧١ز): قەشە و نوسەری ئەڵمانی کتێبی تقلید المسیحی نوسیوە نوسسنەکانی ڕێبازی تازەگەری بەهێزکردنی داهێنا. ئەمە بزوتنەوەیەکی چاکسازی ئایینی ڕۆحیە ناوەندی کارکردنیان هۆڵەندای ئێستا بوو.**

**١٦. جورج بیرناردشو (١٨٥٦–١٩٥٠): نوسەری شانۆی ئینگلیزی لە ئیرلەندا لەدایکبووەز دادەنرێت بە یەکێك لە نوسەر دیارەکانی شانۆ لە سەدەی نۆزدەیەمدا. دیارترین کارەکانیی قیصر و کلیوباترا الانسان و السوبرمان منزل الحسرات جان دارك.**

**١٧. جوزیف کامبل (١٩٠٤–١٩٨٧): نوسەری ئەمریکی ناسراوە بە نوسینە ئەفسانەییەکانی. لەدایکبووە لە نیویۆرك لە زانکۆی کۆلۆمبیا خوێندویەتیەن بیردۆزێکی انا کە دەڵێت هەموو ئەفسانەکان پێکەوە بەستراون و خاڵی هاوبەشیان تێدایە.**

**١٨. جولیان هوکسلی (١٨٨٧–١٩٧٥): زانای زیندەوەرزانی بەریتانی و نوسەر، ناوبانگی پەیداکرد بە خستنەڕووی چەمکی زانستی بۆ خەڵکی لەڕێگەی نوسینەکانیەوە. لە لەندەن لەدایکبوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد خوێندنی تەوا کردز بووە یەکەم سەرۆکی ڕێکخراوی پەروەردەیی و زانست و ڕۆشنبیری لە یونسکۆ لە ساڵی ١٩٤٧–١٩٤٨. لە کتێبەکەیدا دین من دون وحی پێشنیازی کرد مرۆڤەکان دەتوانن ڕزگارکەرێك بۆ خۆیان بدۆزنەوە لەڕێگەی تێڕامان لە چارەنوسیان، پەیوەندیەکی گرنگی دروستکرد لەنێوان بیردۆوزی پەرەسەندن و زانستی بۆماوەییدا.**

**١٩. جون دیوی (١٨٥٩–١٩٥٢): فەیلەسوفی ئەمریکی و زانای دەروونناسی و مامۆستای زانکۆو ڕاوێژکاری پەروەردەییز دکتۆرای بەدەست هێنا لە زانکۆی جون هوبکنز. بیردۆزێکی پەروەردەیی دانا لەبارەی پێویستی فێربون بەبەکارهێنانی چەند چالاکیەکی جۆراوجۆر لەبری شێوزای کلتوری گەیاندنی زانیاریەکان. شوێنەوارێکی دیاری جێهێشت لەسەر زانستی دەروونناسی و خوێندنگا و کۆمەڵگا و هتد. .**

**٢٠. جون ویتیە (١٨٠٧–١٨٩٢): شاعیرێکی ئەمریکیە لە ویلایەتی ماساتشوسیت، دەستیکرد بە نوسینی شیعرەکان لە تەمەنێکی زوو. زۆر بە قووڵی پەیوەست بوو بە ئایینەوە لە شوێنکەوتوی گروپی لەرزێنەرەکان بوو یەکێکە لە گروپە زیندووکەرەوەکانی مەسیحیەت کە بانگەواز دەکات بۆ گەڕانەوەی مەسیحیەت بۆ سادەییەکەی سەرەتای، حیزبی سەربەخۆیی دامەزراند بۆ ماوەی سی ساڵ کاری کرد بۆ کێشەی ڕزگارکردنی کۆیلەکان، نەهێشتنی کۆیلایەتی لە بنەڕەتەوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان، پێدانی سەربەخۆیی تەواو بۆ ڕەش پێستەکان.**

**٢١. جیمی والکەر (١٨٨١–١٩٤٦): سیاسەتمەدارێکی ئەمریکیە، بووە نوێنەری ئەنجومەنی پیران لە ساڵی ١٩١٥ بۆ ١٩٢٥.**

**٢٢. دوستوفسکی (١٨٢١–١٨٨١): نوسەرێکی ڕوسیە سزای لەسێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا بەهۆی چالاکی کۆمەڵایەتی بەڵام چەند ساتێك پێش جێبەجێ کردنی فەرمانەکە وەستێنرا نەفی کرا بۆ سیبیریا. ئازاری جەستەیی و دەرونی زۆری چەشت، دەستی کرد بە چیرۆك نوسین لە بەرهەمەکانی الجریمە و العقاب الاحمق الاخوە کارامازوف، گرنگی دانی بە کێشە ئایینیەکان و سیاسی و ئەخلاقیەکان لە کارەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.**

٢٣. ديوكليتيانوس (٢٤٥-٣١٣): ئيمبراتۆرێکی ڕۆمانیە فەرمانڕەوایی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی کرد لە ماوەی نێوان ٢٨٤ بۆ ٣٠٥ دواتر دەستبەرداری دەسەڵات بوو. دوا ئیمبراتۆر بوو کە مەسیحیەکانی دەچەوساندەوە.

٢٤. زورو، هنری دیفید (١٨١٧-١٩٦٢): نوسەر و فەیلەسوفی ئەمریکی لە شوێنکەوتوی ڕێبازی سروشتی naturalism هەروەها باوەڕی هەبوو بە گرنگی تاك و بەرژەوەندیەکانی لە کۆمەڵگەدا.

٢٥. روبرت ئینگرسول (١٨٣٣-١٨٩٩): پارێزەرێکی ئەمریکیە یەکێکە لە و کەسانەی تێڕوانی دوژماننەی هەیە بەرامەبەربە ئایین، بیروباوەڕێکی تایبەت بە خۆی هەبوو کە تیێدا شادومانی تاکە چاکەیە. باشترین ڕێگا بۆ ۆشادومانی بریتیەلەوەی خەڵکانی تر دڵخۆش بکەین.

٢٦. روبرت بن وارن (١٩٠٥-١٩٨٩): ڕۆماننوس و شاعیری ئەمریکی بەرگری دەکات لە شەرفمەندی مرۆڤایەتی لەبەردەم چەوساندنەوە و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات. نازناوی یەکەم شاعیری ناوازەی بەدەست هێنا لە ویلایەتە یەکگرتوەکان.

٢٧. رینیە گینون: فەیلەسوفی فەڕەنسی هاوچەرخی سۆفی. بە قووڵی ڕۆچووە لە توێژنەوەی ئایینەکانی ڕۆژهەڵتدا بە تایبیەت فەلسەفەی هیندۆسی و بوزی و تاویی. هەروەها تەسەوفی ئیسلامی خوێندوەتەوە دواتر بووە موسوڵمان نواوی گۆڕا بۆ عبد الواحد یحیا، چەندین نوسینی هەیە لەبارەی شیکردنەوەی فەلسەفەی هیندۆسی و چەندین نوسینی تر.

٢٨. سبینوزا، باروخ: فەیلەسوف و بیرمەندی ئایینی هۆڵەندی، جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی ئەقڵ لە ڕەوشتدا و پشت سروشت. لە گرنگترین نوسینەکانی کتاب الاخلاق.

٢٩. سیمون ویل: فەیلەسوفی فەڕەنسی و چالاکوانی سیاسی اکاری کرد بۆ سەرخستنی ئامانجەکانی شیوعیەت لە نوسینەکانی فی انتظار ﷲ الحاجة للجذور.

٣٠. شانکارا: فەیلەسوف و بیرمەندی ئایینی هیندی ڕێبازی ئەدفایتا فیدانتای پەرەپێدا کە دادەنرێت بە سیستمێکی فەلسەفی لە هیندۆسیەتدا.

٣١. گریگوری نازیانزین: یەکێکە لە قەشەکانی کڵێسا و یەکێکە لە چوار لاهوتیە یۆنانیەکە لە تورکیا لەدایکبووە ژیانی تەرخانکرد بۆ پەرستن ڕقی لە ژیانی ناو کۆمەڵگابوو مەیلی گۆشەگیری دەکرد.

٣٢. فرانسیسی یەکەم: پادشای فەڕەنسا ناوبانگی پەیداکرد بەهۆی ڕکابەریکردنی ئیمبراتۆریەتی هابزبورغی ڕۆمانی پیرۆز چارلی پێنجەم هەروەها گرنگی دەدا بە ئەدەب و چاکسازی لە حکومەتدا.

٣٣. سیگمۆند فرۆیید: پزیشکی نەخۆشیە دەماریەکان نەمساوی جوولەکە. دادەنرێت بە بەناوبانگترین زانایانی دەروونناسی ڕێگای شیکاری دەرونی دانا جەختی کردەوە لەسەر ئارەزوی سێکسی نائاگایی لە دروستبوونی کەسایەتیدا، گرنگیەکی زۆری دا بەو بابەتە بەناوبانگترین کارەکانی دراسات في الهستیریا تأویل الاحلام.

٣٤. قبلای خان: سەرکردەیەکی سەربازی مەغۆلەکانە بنیاتنەری ئیمبراتۆریەتی مەغۆلیە لە چین. گرنگیەکی زۆری داوە بە هونەرە چینیەکان بووە بوزییەکی دڵسۆز دوابەدوای ئەوە ئایینی بوزییەتی کردە ئایینی فەرمی لە چین. وێڕای ئەوەی ڕێگەی بە پەیڕەوکارانی ئایینەکانی تر داوە هەتا لەسەر ئایینەکانیان بەردەوام بن.

٣٥. کارل جنك: پزیشکێکی دەرونی سویسریە شیکردنەوەی بۆ شڵەژانە سۆزداریەکان کردوە وەك هەوڵ!دان بۆ گەیشتن بە کاملً بوونی ڕۆحی. چەندین توێژینەوەی کردوە لەبارەی پەیوەندی نێوان چارەسەرکردنی دەرونی و بیروباوەڕی ئایینی.

٣٦. كارل ڕۆجەر: پزیشکێکی دەرونی لائەمریکیە پەرەی دا بە بەرنامەکانی شیکردنەوەی دەرونیگرنگی دەدا بە پەیوەندی نێوان نەخۆش و چارەسەرکەری دەرونی.
٣٧. کریستوفەر ئیشروود: نوسەرێکی ئەمریکیە لە بەریتانیا لەدایکبووە لە زانکۆی کامبردج خوێندنی تەواو کردوە، گرنگی داوە بە ئایینی هیندۆسی و خوێندنەوەی.
٣٨. کیبلینگ جوزیف رودیارد: نوسەر و شاعیری بەریتانی لە بۆمبای هیند لەدایك بووە زۆربەی تەمەنی لە هیند و بۆرما بەسەر بردوە لەماوەی داگیرکاری بەریتانی بۆ ئەو ناوچانە.
٣٩. کیرکیگارد، سورین ئوبی: فەیلەسوف و بیرمەندی ئایینی دانیمارکی، لە کۆپنهاگن لەدایکبووە، لە نوسینەکانیدا ڕەخنەگرتنێك زۆر هەیە بۆ کۆمەڵگەی ئەوروپی نوێ لە کتێبەکەیدا العصر الحاضر ئیدانەی ئەو کۆمەڵگەیە دەکات بەهۆی نەمانی خۆشەویستی و بەزەیی و باوەڕهێنان بە بەها پیرۆزەکان.
٤٠. مارشال: ژەنەڕاڵ مارشال سەرۆکی ئەرکانی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمداز
٤١. ماك گافی: زانای ئایینی ئەمریکی گرنگیەکی زۆری داوە بە فەلسەفەی ئەخلاقی، نوسینەکانی چەندین وانەی لەخۆ گرتوە لە ئەدەب و ئەخلاق و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی.
٤٢. ماکس مولر: زانای زمانەوانی بەریتانی لەدایکبووی ئەڵمانیا، دیارترین کەسە لە شیکردنەوەی زمانەوانی و مێژویی لە توێژینەوەی ئایینەکان. لە گرنگترین کارەکانی: محاضرات في علم اللغة و المدخل الى علم الدين.
٤٣. هنری برجسون: فەیلەسوفی فەرەنسی لەدایکبووە لە دایك و باوکێکی جوولەکە بەڵام دواتر بووە مەسیحی کاسۆلیکی، گرنگی داوە بە کێشە سیاسیەکان و ئەخلاقیەکانی دەوڵەتان. خەڵاتی نۆبڵی بەدەستهێنا بۆ ئاداب لە ساڵی ١٩٢٧ز.
٤٤. هوبز توماس: فەیلەسوفی ئینگلیزی بیردۆزێکی دانا لەبارەی خەڵکەوە کە بە سروشتیان دەترسن لەوە توشی ئازار بن، هەڵدەدەن بۆ بەدەستهێنانی شتە بەسودەکان لەبرئەوە پێویستە ملکەچی دەسەڵاتی دەوڵەت بن لە کێشە دونیایی وئاییینیەکاندا بۆئەوەی پارێزراو بن و توشی کێشە نەبن.
٤٥. هیگڵ: فەیلەسوفی ئەڵمانی خاوەنی فەلسەفەی دیالکتیکی.
٤٦. هیوم دایڤید: فەیلەسوف و مێژوونوسی سیاسی سکۆتلەندی لە گرنگترین کارەکانی: بحث فی الفهم البشري.
٤٧. ولیەم تمبل: سەرۆکی کڵێسای ئەنجلیکانی لە گرنگرین نوسینەکانی العقل الخلاق ، الطبيعة و الانسان و ألله.
٤٨. ولیەم جەیمس: فەیلەسوفی ئەمریکی و زانای دەرونی لە نیویۆرك لەدایکبووە.
٤٩. ویلز: نوسەر و فەیلەسوفی ئینگلیزی بەناوبانگی بەدەست هێنا بەهۆی ڕۆمانەکانی لەبارەی خەیاڵی زانستی و پێشبینیەکانی سەبارەت بە ڕودانی جەنگ لە سەدەی بیستەمدا و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا.
٥٠. ویلهاوزن: زانای ئەڵمانی پسپۆڕ لە کتێبی پیرۆزدا، بیروڕاکانی هەرای نایەوە لە ناوەندە مەسیحیەکاندا بەڵکو بەرەوڕووی ڕەخنەگرتن بوویەوە.
٥١. یوحنا: سۆفی و شاعیری ئیسپانی باس لە ڕێگابڕینی ڕۆح دەکات بەرەو ألله بۆئەوەی بگات بە یەکگرتنی هەناوی.

## نوسەر لە چەند دێڕێکدا:

هۆستن سمیس لەدایکبووە لە شاری سوشوو لە ساڵی ١٩١٩ لە چین لە خێزانێکی پڕۆتستانی ئەمریکی باوك و دایکی کاریان دەکرد بۆ گەیاندنی ئایینی مەسیحی لە چین. هەر لەمنداڵیەوە گرنگی دا بە فەلسەفە و ئایینە جیهانیەکان، لەگەڵ خێزانەکەی گەڕایەوە بۆ ئەمریکا لە تەمەنی پانزە ساڵیدا بۆئەوەی لەوێ خوێندن تەوا بکات بگات بە پلەی دکتۆرا لە فەلسەفەدا لە زانکۆی شیکاغۆ لە ساڵی ١٩٤٥. دواتر ببێتە مامۆستای فەلسەفە و زانستی ئایینەکان لە ژمارەیەك لە زانکۆکانی ئەمریکا: زانکۆی واشینتۆن، پەیمانگای ماساچوسیت بۆ تەکنەلۆژیا، زانکۆی سیراکیوز، زانکۆی بیرکلی.

لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردودا لە ئەمریکا ناوبانگلی پەیداکرد بەهۆی چەند زنجیرە باسێکی دۆکومێنتاریەوە، گرنگترینیان: ئایینەکانی مرۆۋ زانست و بەرپرسیاریەتی مرۆیی گەڕان بەدوای ئەمریکادا لەگەڵ چەند فیلمێکی دۆکومێنتاری لەبارەی هیندۆسیەت و بوزییەتی تبت و سۆفیگەری کە چەندین خەڵاتی جیهانی بەدەست هێنا.

گرنگترین کتێبەکانی:

–أديان الأنسان

–الحقيقة المنسية: رؤية المشتركة لأديان العالم

–وراء العقل بعد التحديث.

–لماذا الدين ضرورة؟.

**ئەم کتێبە**

"کتێبی ئایینەکانی جیهان بەوە دەناسرێتەوە کە تەنها باس لە هەمو ئایینێك ناکات بە مەبەستێکی ئەکادیمی بۆ گرنگترین کتێب و گروپ و شوێنی بڵاوبوونەوەی بە ژمارە و چەند زانیاریەکی دیاریکراو. . . بەڵکو گرنگی دەدات بە هەمو ئایینێك وەك چۆن شوێنکەوتوویەکی ئەو ئایینە کە باوەڕی پێی هێناوە گرنگی پێ دەدات، بەم کارەی خوێنەر دەباتە ناو گەوهەری ئەو ئایینە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. ڕێنماییەکان و بەرنامە و بیروباوەڕی ئەو ئایینە شی دەکاتەوە لەڕووی فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و دەروونیەوە، بەپشتبەستن بە شارەزایی و لێهاتوویی نوسەر لە فەلسەفە و زانستی دەروونناسیدا. نوسەر بە هەمو ئەم کارانە هەڵدەسێت وەگك شوێنکەتوویەکی دڵسۆزی هەریەك لەو ئایینانەی لە کتێبەدا باسی کردوون. گومانی تێدا نیە نوسەر "هۆستن سمیس" شوێنکەوتووی ڕێبازی سۆفیگەریە وەك باسمان کرد چووەتەناو هەندێك لەم ئایینانەوە چووە ئەو وڵاتانەی ئەم ئایینانەی تیادا پەیرەو دەکرێت، بووەتە قوتابی گەورەترین زانایانی ئایینی لەو وڵاتانەدا هەروەها سوودی لێوەرگرتوون. لێرەدا تایبەتمەندی دووەکی ئەم کتێبە دەردەکەوێت کە بریتیە لە ڕاستگۆیی. کاتێك نوسەر هەڵدەسێت بە شیکردنەوەی ڕێنماییەکانی هەمو ئایینێك لە سەرچاوەکانی خودی ئایینەکانەوە لە زمانی پیاوانی ئایینی باوەڕدار بەو ئایینانەوە. وەك ئاشکرایە پیاوی ئایینی لە هەموان ڕاستگۆیانەتر گەوهەری ئایین باسدەکات.

بەپوختی کتێبی "ئایینەکانی جیهان" بەپلەی یەکەم خاوەن مەبەستێکی ئایینیە و ئامانجێکی ڕۆحی لە پشتە. کە تەواوی ئەو ئەزمونە ڕۆرحیانە دەخاتە بەردەستی خوێنەر کە نوسەر بەدەستی هێناوە بەدرێژایی زیاتر لە پەنجا ساڵی تەمەنی. لەم ڕێگەیەوە خوێنەر بەشێوەیەکی قوڵتر بیردەکاتەوە لە فەلسەفەی ژیان و بوون. بەدەرککردنێکی فراوانتر بۆ کێشە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ لەڕووی دەرونی و کۆمەڵایەتیەوە بە دۆزینەوەی چارەسەرە جیاوازەکان کە هەریەك لە ئایینە جیهانیەکان پێشنیازی دەکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو جۆرە کێشانە. "